## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە



# پەسڵان

- لێو تۆلستۆی
- وەرگێڕانی: ئەمین گەردیگلانی
- نەخشەسازی ناوەوە: ڕێدار جەعفەر
- بەرگ: ڕێمان
- نرخ: (١٠٠٠٠) دەهەزار دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠١٤
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانەی: موکریانی (هەولێر)
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٦٦) ساڵی (٢٠١٠)ی پێ دراوە.

MUKIRYANI

زنجیرەی کتێب (٨٢٣)

ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## ساڵژمێری ژیان و نووسینەکانی لیۆنیکۆلایۆڤیچ تۆلستۆی

1982) ڕۆژی بیست و هەشتەمی مانگی ئووت (9 سپتامبر) لە گوندی "یاسنایا پۆلیانا"، ملکی کۆنت نیکۆلایۆڤیچ تۆلستۆی هەڵکەوتوو لە 110 کیلۆمەتریی مۆسکۆ، لیۆ چوارەمین منداڵی بنەماڵەی «نیکۆلایۆڤیچ» و ماریا نیکۆلایۆڤنا، لە دایک بوو.

1830) دایکی کۆچی دوایی کرد.

1837)بنەماڵەی تۆلستۆی کۆچ دەکەن بۆ مۆسکۆ و لەوێ باوکی دەمرێ.

1840) یەکەمین ئەزموونی ئەدەبیی تۆلستۆی بە ناوی «وەسفی ت. ئا. ئێرگووسکۆڤیا» بڵاو دەبێتەوە.

1844) لە زانکۆی قازان لە کۆلیژی زمانەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا بەشی تورکی و عەرەبی دەست دەکا بە خوێندن.

1885) داوای کرد بگوێزرێتەوە بو کۆلیژی ماف.

1847) بێ ئەوەی بڕوانامە وەرگرێ دەستی لە خوێندن هەڵگرت و ڕووی کردە ڕابواردن و خۆشگوزەرانی، دوای ماوەیەک گەڕایەوە بۆ "یاسنایا پۆلیانا" ملکی باوکی.

1850)یەکەمین ئەزموونی بنەوەشیی ئەدەبی بە ناوی «چیرۆکی ژەنیارە ناوچەییەکان» دەنووسێ.

1851) گەلاڵەی ڕۆمانێک لە چوار قۆناخدا "منداڵی"، "مێرمنداڵی"، "خۆناسین" و "گەنجی" دەست پێدەکا. هەر ئەو ساڵە بە ویستی خۆی دەچێتە ڕیزی ئەرتەشی قەفقازەوە و لە بەرەڤانی کردنی شاری سباستۆپۆلدا بەشداری دەکا.

1852) "هێرشی شەوانە". "کازاخەکان". کە یەکێک لە شاکارەکانی نووسەرە.

1853) "بیرەوەرییەکانی نیشانە دانەرێک".

1854) "کانییەک لە لێڕەواردا".

1855) زنجیرە چیرۆکی "سباستۆپۆل"ی نووسی کە لەوێدا باسی ئازایەتی و غیرەتی سەربازەکان دەکات لە کاتی بەرەڤانی قارەمانانە لە شاری "سباستۆپۆل". دوازدەهەمی نوامبری ئەو ساڵە دەچێ بو پترز بۆرگ. لەوێ لەگەڵ "تۆرگنیف"، "گێنچارۆڤ"، "پترچۆڤ"، "چڕنیشڤسکی"، "سالتیکۆڤ شێچرێن"، "ئاسترۆڤسکی" و ... ئاشنا دەبێ.

1856) "دوو سوارە نیزام"، "بۆران"، "سەردانی سەربازخانە"، "بەرەبەیانی یەک خان"، "ڕاو" دەنووسێ. ئەو کە زۆر هۆگری باشتر بوونی ژیانی گوندنشینەکان بوو، دەیهەوێ ئەوان لە بەندی "سێرواژەکان" ڕزگار بکات، بۆیە بەشێک لە زەوی و دارستانەکانی دەدا بە ڕەعیەتەکانی خۆی.

1857) سەفەر دەکات بۆ وڵاتەکانی فەڕەنسا و سویسڕا و ئاڵمان، لە ژێر کاریگەریی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەورووپادا «هەستی ئازادی دەنووسێ». بەڵام لەو ماوەیەدا کە لە پاریس بوو چاوی بە دیمەنی دڵتەزێنی کوشتی کەسێک بە گیۆتین دەکەوێ، هەر بۆیە هەستی ڕق و بێزاری ناخی دادەگرێ

و دەستەوبەجێ لە پاریس دەڕوا. تۆلستۆی سروشتی سویسڕای بە دڵە و بەو بۆنەوە چیرۆکی "لووسرێن" دەنووسێ کە لەودا بێ بەزەییانە داب و نەریتی کۆمەڵگای بۆرژوازی دەداتە بەر ڕەخنە.

1857) "ئالبێرت". "دەستنووسەکانی شازادە نۆخلیدۆڤ".

1858) چیرۆکی «سێ مەرگ» دەنووسێ کە سەبارەت بە مەرگی بەژانی نەجیبزادەیەک و مەرگی ئارامی مووژیکێک و مەرگی پڕ شکۆی دارێکی لە ڕیشە دەرهاتووە.

1859) ڕۆمانی "هاوسەر گیریی بەختەوەرانە".

1860) نیکۆلای برای مرد و ئەو ڕووداوە تۆلستۆی وەها هەژاند بناغەی ئیمانی خستە لەرزین و حاشای لە هۆنەر کرد. لەو کاتەدا دەنووسێ: «ڕاستەقینە شتێکی ترسناکە... بەڵام بێگومان هەتا کاتێک کە ئەم مەیل و داخوازییە بۆ دۆزینەوە هەیە، هەوڵ دەدەین بیدۆزینەوە و بە وردی باسی بکەین. ئەمەش تەنیا شتێکە کە لە واتای ڕەوشت و ئاکار بۆ ئێمە ماوەتەوە. ئەمەش بێگوان تەنیا کارێکە کە ئەنجامی دەدەم. بەڵام نەک بە شێوەی هونەری ئێوە. چونکە هونەر درۆیەکە و بەس، منیش ئیتر توانایی ئەوەم نییە ئەم درۆ جوانەم خۆش بووێ.» قوتابخانەیەک لە "یاسنا پۆلیانا" بۆ منداڵی ڕەعیەتەکان دروست دەکات و خۆی دەبێتە مامۆستایان و دڵسۆزانە دەرسیان پێدەڵێ و هۆگریان دەبێ.

1860) دیسان سەفەر دەکا بۆ ئاڵمان، سویسڕا، فەڕەنسا، بەریتانیا و بەلژیک. لە لەندەن چاوی بە "هەرزەن" نووسەری شۆڕشگێڕی ڕووس دەکەوێ کە لەوێ پەنابەر بوو و چاپخانەی ئازادی ڕووسی دامەزراندبوو. دەست دەکات بە نووسینی ڕۆمانی «دکابریستەکان» و یەکەم بەشی ڕۆمانی

«شەڕ و ئاشتی» و «پۆلیکۆشکا» کە ئەم ڕۆمانەی دواییان دیسامبری 1862 تەواو دەبێ.

1861) «تەشی ڕێسەکان» و «چیرۆکی ئەسپێک» دەنووسێ.

1862) «تیخوون و مالانیا» و « گۆرانی ئاشقانە» دەنووسێ. هەر لەو ساڵەدا گۆڤاری «یاسناپۆلیانا» لە بواری ڕاهینانـدا بڵاو دەکاتەوە، لەو گۆڤارەدا زنجیرە وتارێک دەنووسێ کە لەودا ڕوانگەی خۆی سەبارەت بە عاملاندن و ڕاهێنان بەیان دەکات. هەر لەو ساڵەشدا لەگەڵ کچێکی هەژدە ساڵانی جیرانیان بە ناوی "سووفی ئاندریۆڤنا" کە کچی پزیشکێک بوو بە ناوی "ئا. بێهر" کە پێشتر دڵی پێوەی بوو، زەماوەند دەکات، ڕەنگدانەوەی ئەم دڵدارییەش دواتر لە کتێبی "ئاناکارینا"دا خۆی نواند و لەڤین و کیتی و ئەوینەکەیان، کتومت تۆلستۆی و سووفین. ساڵی 1863 یەکەم کوڕی بەناوی «سێرگی» لە دایک بوو، تۆلستۆی سێزدە منداڵی بوو کە پاشەبەرەکەیان «ئیڤان» ساڵی 1888 لە دایک بوو.

1863) ڕۆمانی «پۆلیکۆشکا» دەنووسێ.

1864) دەستی کرد بە نووسینی ڕۆمانی شەڕ و ئاشتی کە یەکێک لە گەورەترین ڕۆمانەکانی دنیا دێتە ئەمار و ساڵی 1869 تەواوی کرد.

1865) یەکەم کۆمەڵە بەرهەمی تۆلستۆی لە دوو بەرگدا بڵاو کرایەوە.

1867) دەچێ بۆ «بوردودینۆ» و بە وردی هەموو بوارەکانی گۆڕەپانی شەڕ لێکدەداتەوە.

1869) دوو چاپی جیاواز لە ڕۆمانی «شەڕ و ئاشتی» دێتە بازاڕەوە. گۆڤاری «ڕۆڤسکی ئەرخنۆڤ» وتارێکی تۆلستۆی بە ناوی "چەند وتە سەبارەت بە کتێبی شەڕ و ئاشتی" بڵاو دەکاتەوە. تۆلستۆی وێڕای وەڵام دانەوەی ڕەخنەگرەکان، ڕەسەنایەتیی بەرهەمەکەی و سەرچاوەی مێژوویی

کەڵک لێ وەرگیراو ناو دەبات و ڕوانگەی فەلسەفیی خۆی سەبارەت بە مێژوو بەیان دەکات.

1870) وەرگێڕانی "ئەوسانەکانی ئیزۆپ". "چیرۆکی پەریان". "باسی فیزیا". "ئاژەڵناسی". "گیاناسی". "مێژوو". "شیعری حەماسی".

1971-1972 چەند چیرۆک بۆ منداڵان دەنووسێ.

1872) «دیلی قەفقاز». «خودا ڕاستییەکان دەبینێ». «دوو هاوسەفەر».

1873) بابەتێک سەبارەت بە "قاتوقڕیی ساراما". دەستی کرد بە نووسینی ئاناکارنینا و ساڵی 1876 تەواوی کرد.

1878) یەکەم بیرەوەرییەکان. «دکابریستەکان» بەشی دووهەم. «دکابریستەکان» بەشی سێهەم.

1879) دانپیانان. من کێم؟ هەر لەو ساڵەدا گۆڕانی بیر و باوەریی ئایینی بە کەماڵ دەگات و بەو ئاکامەش دەگات کە یاساوڕێسای ئایینی و کلیسا لەگەڵ ئەندێشەکانی ئەو یەک ناگرێتەوە.

1880) «ڕەخنەی خواوەندە دەمار گرژەکان»، «بەرەڤانی لە کچۆڵەیەک». و «کازاخی ڕاکردوو». «لە کاتی تاقیکردنەوەی فەڵەمێکدا». «سەرەتای چیرۆکێکی خەیاڵی». «سەبارەت بە ڕووس». «چیرۆکی چاخی پێتری مەزن».

1881) وەرگێڕانی چوار ئینجیل. «خەڵک بەچی دەژین؟»

1882) دەست دەکات بە کاری کشتوکاڵ، جلوبەرگی وەرزێڕان لە بەر دەکات و تەنانەت واز لە گۆشت خواردن دێنی و دەست دەکات بە گیا خواردن.

1882) بەرخۆدانی نەرێنی لە هەمبەر ستەمدا، هەر وەها وتارێکی نووسی سەبارەت بە سەر ژمێری.

1883) «کلیسا و دەوڵەت».

1884) «ئیمانی من چییە»ی نووسی. «یاداشتەکانی شێتێک». دەست دەکات بە نووسینی ڕۆمانی "مەرگی ئیڤان ئیلیچ" و ساڵی 1886 تەواوی دەکات.

1885) "دەبێ چبکەین". کۆمەڵە چیرۆکیک بۆ چاپ لە "پۆ سێردنیک" ئامادە دەکات: «دوو برای ئاڵتوونی»، «ئیلیاس»، «ئەوین لە کوێیە»، «خودا لەوێیە»، «ئاگری کوژاوە هەرگیز هەڵناکرێتەوە»، «شاندۆل»، «دوو پیرەپیاو»، «کۆنت ئیڤان»، «یەک مرۆڤ چەندەی زەوی پێویستە» و...

1886) «ئێمە کێین»، «توانایی شەوە زەنگ»، «سەبارەت بە ئیمانی».

1887) دەست دەکات بە نووسینی ڕۆمانی «سۆناتی کرۆڤیتزێر » و 1889 تەواوی دەکات؛ لەو ڕۆمانەدا وەها بە توندی ڕەخنە لە ویست و بیرۆکەکانی چینی دەسەڵاتدار دەگرێ کە دایرەی سانسۆڕی ڕووسیا ڕێگە بە چاپ کردنی نادات.

1888) وتارێکی لە سەر ژیان و هۆنەری گۆگۆل نووسی.

1889) وەک سەرەتای سێیەمین دەوەرەی ژیانی تۆلستۆی دێتە ئەژمار و دەکەوێتە ژێر گوشار و قەیرانی قووڵی ئایینییەوە.

1889). «پەروەردە و بارهێنان». «شەیتان».

1890) «کاتی ئەوەیە بەخۆدا بێینەوە»، «جوانی لە هۆنەردا». ڕۆمانی «باوکە سێرگی».

1891 «سەبارەت بە هۆنەر و ناهۆنەر». «یادمانەکانی دایک». «سەبارەت بە قاتوقڕی». «یەکەم پلەی قاڵدرمە». «سەعات فرۆش».

1892) شانۆنامەی «کمیدیای زانین»ی ئەو دەکرێتە شانۆ و دەچێتە سەر پەردە. دەست دەکات بە نووسینی «دەبێ چبکەین؟» و ساڵی 1886

تەواوی دەکات. بنەماڵەی تۆلستۆی لە شەقامێک بە ناوی "خاموونیکی" لە مۆسکۆ نیشتەجێ دەبن کە ئێستا کراوەتە "مۆزەخانەی تۆلستۆی".

1893) «ڕەوشت و ئایین»، «بایەخی ئەوین». پێشەکییەک بۆ کۆ بەرهەمی "گی دو مۆپاسان" دەنووسێ.

1894) ڕۆمانی «ئاغا و نۆکەر» و «ورەی مەسیحایی و نیشتمانپەروەری» دەنووسێ.

1895) چەند وتار سەبارەت بە «بەرخودانی نەرێنی». «فێڵ و تەڵەکەی کلیسا». «بۆخەڵکی چین». «ئەمە شەرمەزارییە» لە م وتارەی دواییدا سزادانی جەستەیی کرێکار و جووتیاران ئیدانە دەکات.

1896) دەست دەکات بە نووسینی ڕۆمانی «حاجی مراد» و هەتا ساڵی 1904 دەخایێنێ.

1897) «نیشتمانپەروەری». «ئاشتی نامەیەک بۆ لیبرالەکان» و «هونەر چییە؟»ی نووسی.

1898) شانۆنامەی «تەرمی زیندوو» دەنووسێ. هەر ئەو ساڵە دەچێتە هانای خەڵکی لیڤەوماوی "تۆلا" کە بە هۆی قاتوقڕییەوە لە ژیانێکی تاڵ و نالەباردا بوون و وتاری «قاتوقڕی» دەنووسێ. دوای مشتومڕ و دەمەتەقێ لەگەڵ ڕەخنەگری ناودار "ئا. کوویی" دەستی کرد بە نووسینی نۆڤلێتی «کوویی».

1899) بە هەموو توانایەوە دەست دەکات بە نووسینی دوایین شاکاری خۆی، ڕۆمانی «پەسلاّن»؛ دەچێ بۆ سەردانی بەندییەکان و لەگەڵ بەندییە سیاسییەکان دادەنیشێ و سەبارەت بە بیروباوەڕ و ئامانجەکانیان زانیاری کۆدەکاتەوە. «کۆیلەیی سەردەمی ئێمە». «ڕاهێنانی مەسیحی». «نامەبۆ ئەفسەرێک» و نامە بۆ سویدییەک سەبارەت بە کۆنفرانسی لاهە دەنووسێ.

1901) "سێنت سینۆد" کەسایەتیی پایەبەرزی کلیسای ئۆرتۆدۆکسی ڕووس، بەهۆی بیروڕای پڕ لە دژایەتیی تۆلستۆی سەبارەت بە کلیسای ئۆرتۆدۆکس، مەسەلەی بێبەری کردنی ئەو لە کلیسا ڕادەگەیێنێ و تۆلستۆی وتاری «وەڵام بۆ سێنت سینۆد» دەنووسێ و بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە: «ڕاستە من لەگەڵ بیروباوەڕەکانی کلیسای ئێوە ناکۆکم، بەڵام ئیمان و باوەڕم بە خودایەک هەیە کە بۆ من ڕۆح و ئەشق و جوانییە و بوون و بنەمای هەموو شتێکە.» خەڵک دەڕژێنە شەقامەکان و لایەنگریی خۆیان لە تۆلستۆی دەردەبڕن. دوای ماوەیەک بە هۆی نەخۆشییەوە دەچێ بۆ "گاسپارا" لە "کەریمە". بیست و شەشەمی مارس نامەیەک بۆ "نیکۆلای دووهەم" دەنووسێ و داوای لێدەکات یاسای خاوەنداریێتیی زەویوزار هەڵوەشێنێتەوە، چونکە ستەمێکە لە خەڵک دەکرێ و ناهێڵێ بە ویست و ئامانجەکانی خۆیان بگەن؛ چونکە زەویوزار هی ئەو کەسەیە وا کاری لە سەر دەکات.

1902) دەگەڕێتەوە بۆ گوندی "یاسنا پۆلیانا".

1903) «دوای ڕێوڕەسمی سەمای بالە» دەنووسێ کە نووسراوەیەکە سەبارەت بە سەربازێک. «سەبارەت بە شەکسپیەر» و «چیرۆکی دڵداری». «کار». «مەرگ و نەخۆشی».

1905) «ئاسارهادۆن پاشای ئاسووری». «سێ مەسەلە بۆ ئاشتی خوازانی سیاسی». «سەبارەت بە کاری جەستەیی». بە پەرۆشەوە دەڕوانێتە ئەو ڕووداوە سیاسیانەی کە شەڕی ڕووس و ژاپۆنی لێ دەکەوێتەوە و وتارێک دەنووسێ لە ژێر سەردێڕی: «واباشە ئاقڵ بن و بەخۆدابێنەوە».

1906) « بۆچی؟»، وتاری «دیاردەی شۆڕشی ڕووسی»،«داردەستی سەوز»، پێشەکییەک بۆ "دۆچێتشکا" نۆڤلێتی چێخۆڤ و چەن بابەتیش سەبارەت بە بزووتنەوەی کۆمەڵایەتیی ڕووسیا دەنووسێ.

1907) دەست دەکات بە نووسینی نۆڤلێتێک بە ناوی «لە دنیادا مرۆڤی خاوەن توانا هەیە». وتارێک سەبارەت بە هۆکاری بارودۆخی تاڵ و دڵتەزێنی ئەمڕۆی وڵاتە مەسیحییەکان و بە تایبەت خەڵکی ڕووسیا.

1908) «توانایی منداڵی» ( ئیلهام وەرگرتن لە ڤیکتۆرهۆکۆ). «لەوە زیاتر ناتوانم بێدەنگ بم». «چاکەکاری». «دڵسۆزی گورگ». «بیرەوەریی دادگایی سەربازێک». «یاسای زوڵم و یاسای دڵسۆزی».

1909) «جینایەتکاران کێن؟» ،«پاول گۆدریاچ»، «گەلاڵەی وتوویژ لەگەڵ ڕێبوارێک»، «سروودی گوند نشینەکان» دەنووسێ.

1910) «سێ ڕۆژ لە گوند». «سەبارەت بە شێتی»، «ڕێگای ژیان»، «زەویی پڕپیت و بەرەکەت» دەنووسێ. هەروەها سەبارەت بەو کارەساتەی لە کاتی ڕێوڕەسمی تاج لە سەرنانی نیکۆلای دووهەمدا لە "خدینسکۆیاپۆلیە" ڕووی دا و لەو ڕووداوەدا کە خەڵک بۆ وەرگرتنی دیاری لە دەستی تێزار بە سەر و کۆڵی یەکتردا هەڵدەڕووچکان، چەند کەس کەوتنە ژێر پێ و گیانیان لە دەست دا، تۆلستۆی بابەتێکی بە ناوی "خدینکا" نووسی. ناوبانگی تۆلستۆی هەمووسنوورەکانی جیهانی تێپەڕاند. تەنانەت گاندیی گەنج کە بەرهەمەکانی ئەوی خوێندەوە کەوتە ژێر کاریگەریی بەرخودانی نەرێنی و ئارامی ئەو، بەڵام تۆلستۆی خۆی لەو کاتەدا لە هەموو شتێک بێزار و جاڕز بوو، بە کچەکەی دەڵێ: «ڕۆحێکی قورسم هەیە.» لە یادداشتەکانیشیدا دەنووسێ: «زۆر تاسەباری ڕۆیشتم...» بۆیە نیوە شەوێک هەڵدەستێ و "یاسنایا پۆلیانا" بەجێدەهێڵێ. دوای ماوەیەک تووشی هەناسەسواری دەبێ و بە ناچاری لە وێستگەی "ئیستاپۆڤ" لە سەر ڕێگای "کۆرسک" دەمێنێتەوە؛ دەنووسێ: «ڕۆحی من بە هەموو توانای خۆیەوە بۆ تەنیایی و حەسانەوە دەگەڕێ، بۆیە بۆ هەڵاتن لە دەست ئەو کێشە ئاشکرایەی لە نێوان ئیمان و

ژیانـدایە دەبـێ هەوڵ بـدەم و خـۆم دەربـاز بـکەم. لە ئاکامـدا "رزگـاری" بەرەوپیـری دێ. ڕزگـاری ناوێـک بـوو کە تۆلسـتۆی لە مەرگـی نـابوو؛ لە کۆتاییدا سـەعاتی شەشـی ڕۆژی یەکشـەممە بیستی نۆڤامبری 1910 چاوی لێک نا و ماڵئاوایی لە ژیان و نووسین کرد. جیهانیش کە لە دەرگانەی شـەڕ و براکـوژییەکی گەورەی مێـژوودا سـاتە پـڕ لە خەم و دڵەخورپەکـانی ڕادەبـوارد، بـۆی دەرکەوت یەکێـک لە گەورەتـرین خەمخـۆر و ڕێنـوێن و پێغەمبەری ئاشـتی و پـاکیی خـۆی لە دەسـت داوە؛ پیرەپیـاوێکی مەزن کە لە سووچی ماڵێکی گوندی "یاسنایاپولیانا" سـرووودی ئەشق و خۆشەویستیی و برایەتیی بە گـوێی خەڵکی چەواشـە و گـومڕای سـەدەی بیسـتەمدا دەخوێند، جگە لە تەرمێکی سڕ و بێ گیان و خەزێنەیەکی بەنرخی ئەدەب و حیکمەت هیچ شـتێکی دیکەی لـێ نەمـاوەتەوە و ڕۆمەن ڕۆلان گـوتەنی: «تەمەنێک کە 82 ساڵ گۆڕەپانی تێکۆشانی پیرۆز بوو» کۆتایی هات.

## پێشەکی

تۆلستۆی بێ گومان یەکێک لە گەورەترین نووسەران و فەیلەسووفانی سەدەی بیستەمە و ئاشق و لایەنگری لە ڕادە بەدەری هەیە و ناوبانگی هەموو سنوورەکانی جیهانی بڕیوە. سەد و چەند ساڵ دوای مەرگیشی هێشتا نووسەرێکی تر لە پانتای جیهاندا هەڵنەکەوتووە بە ڕادەی ئەو خۆشەویستی خەڵک و کۆمەڵگای وێژە و ئەدەب بێ. ئەو تەنانەت لە کاتی ژیانشیدا کە لە گوندێکی چکۆڵە دەژیا، دەستە دەستە لایەنگرانی بۆ سەردانی ئەو پێغەمبەرەی "یاسناپۆلیانا"، دەچوون بۆ ئەو گوند چکۆلە و دوورەدەستە و ئەو مەڵبەندە لە سایەی بوونی ئەو گەورە پیاوەوە بووبووە ناوەندێکی پیرۆز و ژوانی قەڵەم؛ بۆیە هەمیشە پڕ بوو لە ڕۆشنبیر و بیرمەند و خەڵکی ئەدەبدۆست و یاری قەڵەم.

تۆلستۆی جگە لە جیهانبینی و ڕاوانگەی ڕوووناکی بۆ ژیان و مرۆڤدۆستی،خاوەنی فەلسەفەیەکی ئایینی تایبەتی مەسیحی بوو کە بەدوور لە هەموو فێڵوتەڵەکە و دەهۆ و مەرایی و درۆودەلەسەیەک بوو. تۆلستۆی لە هەموو ماوەی تەمەنیدا هەوڵی دەدا دینی مەسیح بەو جۆرە بە خەڵک بنوێنی کە حەزرەتی عیسا و بەر لە ئەو دا مەزرێنەرانی تر وەک «ژان باتیست»[1] هێنابوویان و بانگەشەیان بۆ دەکرد. هەر بۆیە تۆلستۆی لە سەر ئەو باوەڕە

---

1. jean Batiste کەسێک کە عیسای سەرانشۆ کرد و بە ناوی مەسیحی بە خەڵکی ناساند.

بوو کە دینی سەرەتای مەسیح بەرهەقە و لە زۆربەی کتێب و نووسینەکانیدا لێـــی دەدوێ. لە یادداشـــتەکانی ڕۆژانەی خۆیـــدا لەو بـــارەوە دەڵـــێ: «ئەندێشـەیەکی مەزن تەواوی ڕۆحـی داگرتـووم و هەسـت دەکەم لە ڕێگـای ئەو ئەندێشـــەیەدا ئامـــادەم ژیـــانی خـــۆم بـــکەمە قوربـــانی، ئەم ئەندێشـــەیە، بنـــاغەدانەری ئـــاینێکی نـــوێ، ئـــایینزای مەســـیح بەڵام ئـــایینزایەکی بەری لە دەمارگرژی و ڕێسـای وشـک و تەمـومژاوییە... بۆ یەکێتـی خەڵـک لە ڕێگـاتی ئـایینەوە، دەبـێ بە ویژدانێکـی پـاک و ڕوونـاکەوە هەنگـاو بنێـی و پـێ بنێیـتە گۆڕەپانی کردەوەوە.»

لە شوێنێکی تردا دەنووسـێ: «ئیمـان وزەی بزوێنەری ژیـانە و بە بـێ ئەو نـاتوانی بژیـی. بیروبـاوەڕی ئـایینی لە گۆڕەپـانی بەرینـی ئـاوەز و ئەندێشـەی مرۆڤـدا سـەرهەڵدەدا و وەڵامێـک کە ئـایین بە دێـوەزمەی ژیـانی دەداتەوە، قووڵترین و ژیرانەترین وەڵامە.»

تۆلســـتۆی بیـــرۆکە و ڕاهێنـــانی مەســـیح بە پێـــنج خـــاڵ دابەش دەکـــا: بەربەرەکـانێ لەگەڵ تونـدوتیژی، پـارێزکردن لە داوێـن پیسـی، نەخـواردنی سوێند، وەڵام نەدانەوەی خراپە بە خراپە، دوژمنایەتی نەکردن لەگەڵ خەڵک.»

تۆلسـتۆی تەنیـا ئیمـانی بە مەسـیح نەبـوو، بەڵکـوو ئیمـان و بـاوەڕی بە تەواوی ئەو ڕێبەرە عەقڵییـانە بـوو، کە بۆ بەختەوەریـی ڕاسـتەقینەی خەڵکـی تێدەکۆشـن و یاساوڕێسـایەکی تـازە دادەهێـنن. هەر بـۆیە خـۆی بە مریـد و ڕێبەری بیرمەنـدانی گەورەی وەک برەهمەن بـوودا، لائوتسـە[٢]، کونفۆسیۆس، زەردەشت، ئیسایی[٣] و ...دەزانی.

2 ـ Lao-Tseu فەیلەسووفی گەورەی چینی 600 ساڵ بەر لە مەسیح لە دایک بووە.

3 ـ Isaie یەکێک لە چوار پێغەمبەری گەورەی یەهوود لە سەدەی هەشتەمی بەر لە زایین و نووسەری کتێبێک بە ناوی (کتێبی ئیسایی).

هـاودەردییەکی بێ وێنە کە تۆلستۆی بۆ خەڵک هەستی پێدەکرد، بۆ ساتێک ئەوی لە هەوڵ دان بۆ بەڕێوەبردنی یاسای خودایی ئەشق و برایەتی پاشگەز نەدەکردەوە. دەتوانین ئەوەش بڵێین تا ئێستا هیچ کەس وەک تۆلستۆی بە شادی خەڵک شاد نەبووە و بە خەم و پەژارەی خەڵک فرمێسکی هەڵنەوەراندووە. هاودڵی و دڵسۆزیی ئەو بۆ خەڵک نەک هەر لە نووسینەکانیدا بەڵکوو لە ژیانی ڕۆژانەشیدا ڕەنگی دابۆوە. لەگەڵ جووتیاران و ڕەعیەتەکانی یاسنا پۆلیانا جۆرێک هەڵسوکەوتی دەکرد کە هەموو ئەویان بە یار و خەمخۆری خۆیان دەزانی. دەرسی بە منداڵی وەرزێرەکان دەگوت، یاریی لەگەڵ دەکردن، هەوڵی دەدا سەرچاوەی خەم و ئازارەکانی خەڵکی گوندەکەیان بدۆزێتەوە و بە دڵسۆزی و هاوخەمی و یارمەتیدان هیوایان پێ ببەخشێ و هێمنایەتی بخاتە ماڵ و دڵەکانیانەوە.

پەسلان دوایین بەرهەمی گەورە و شاکاری تۆلستۆیە و ڕۆمن ڕۆلان گوتەنی: «وەسیەت نامەی هونەریی ئەوە». بە نووسینی ئەو ڕۆمانە هەست دەکەی نووسەر کە بە نووسینی «کازاخەکان» و «شەڕ و ئاشتی» دەستی پێکردووە بە چ کەماڵێک گەیشتووە و فایلی مەزن و دەوڵەمەندی پڕلە هەست و ڕەوشت و جوانی و هونەر و مرۆڤدۆستی دەپێچێتەوە و خۆی بۆ سەفەری ڕزگاری ئامادە دەکا. ئەو لە کاتی نووسینی پەسلاندا 70 ساڵی تەمەن بوو و بیرو ڕۆحی ئێستا بە سەر هەموو کەس و هەموو شتێکدا زاڵ بوو. قارمانی ڕۆمانەکە ژنێکە بە ناوی ماسلۆڤا و پیاوێک بە ناوی نۆخلیدۆڤ. هەر وەک لە شاکارەکانی دیکەشیدا خوێنەر بۆی دەردەکەوێ "ئۆلێنین"ی ڕۆمانی «کازاخەکان» و "لەڤین"ی ڕۆمانی «ئاناکارنینا» و "سێرگی میخائیلۆڤیچ"ی ڕۆمانی «هاوسەرگیریی بەختەوەرانە»، تۆلستۆی خۆیەتی و ڕۆح و هەست و ویستەکانی خۆی لە زمانی ئەوان و ئاکار و

ڕەوشــتیاندا نوانــدووە؛ لەم ڕۆمــانەی «پەســڵان»یــش دا "نۆخلیــدۆڤ: هەر خۆیەتی، بە خوێندنەوەی ژیاننامەی ئەو گەورە پیاوە و شاکارەکانی بۆمان دەردەکەوێ، تۆلســتۆی دەیــهەوێ لە ڕێگــای نووســینەوە دنیــای دەروون و ڕۆحــی مەزنــی خــۆی پیشــان خەڵکــی بــدات و لەڕاســتیدا دەتــوانین بڵــێن نووسینەکانی ئاوێنەی ڕۆحی ئاشق و ڕووناک و ناسکی خۆیەتی.

لەم دوایــین بەرهەمەیــدا بەڕوونــی لە خــۆبردوویی و فیــداکاری و ڕۆحــی گەورە و فەلســەفیی تۆلســتۆیمان بــۆ دەردەکەوێ و تێــدەگەین کە ئەشــق و خۆشەویسـتی چـۆن لەگەڵ ژیـان و گیـان و ئەندێشـیەی ئەو ئـاوێتە بـووە و سەرلەبەری تەمەنی خۆی بۆ تەرخـان کردووە. بۆیە بە دڵنیـاییەوە دەتوانین بڵێن تۆلستۆی پێغەمبەری پاکی و ڕاستییە. ڕۆمـانی پەسـڵان ئـاوێنەی هەمـوو زوڵم و ستەم و بێ عەداڵەتییەکانی ئەو سـەردەمەی ڕووسـیایە و نیشـاندەری ئەو تاریکی و شەوە ڕەشانەیە کە کلیسا و حوکومەتی ئەو کات خەڵکیان تێدا دیل و دەستبەسەر کردبوو، ڕاشکاوانە هاوار دەکات کە دەسـەڵات چ تاڵاوێک بە گەرووی خەڵکدا دەکات و دەسەڵاتداران چەندە لە بیری کەیف و نەهەنگ و خۆشــــگوزەرانی دان و چــــۆنیش خەڵکــــی ڕەشــــوڕووت و هەژار دەچەوسێننەوە، تەرم و ئێسکی خەڵکی دەکەنە بەردەباز بۆ پەڕینەوە بەرەو دەسەڵاتی زیاتر و کاژڵاکی سەری هەژاران دەکەن بە پلله بۆ سـەر کەوتـن و گەیشتن بە ئامانج و ئاواتەکانیان. هەر بۆیە ئەو ڕۆمانە لە سـەر دەمـی خۆیدا ڕێگەی بڵاوکـردنەوەی پـێ نەدرا و چەنـدین سـاڵ دوای مەرگـی تۆلسـتۆی و گۆڕانی حوکوومەت بڵاو کرایەوە.

لە تەمەنـی نۆزدە سـاڵیدا ڕۆمـانی ئاناکارنینـام خوێندەوە و بە پێـی بیـر و زانیـاریی ئەو سـەردەمە زۆرم چێـژ لـێ وەرگـرت، لە خوێندەوەی دووبارەیدا ســـاڵی 2008 بڕیارمـــدا وەربگێـــڕمەوە. لە دوای وەرگێڕانـــی ئاناکارنینـــا

ئەوەندەی دیکە ئاشقی تۆلستۆی بووم و چێژم لە بیروباوەڕ و فەلسەفەی ئەو گەورە پیاوە وەرگرت. بۆیە هاتمە سەر ئەوەی هەموو بەرهەمەکانی وەرگێڕمەوە. تا ئێستا «ئاناکارنینا» و، «مەرگی ئیڤائیلیچ»، «هاوسەرگیریی بەختەوەرانە» و «باوکە سێرگی»، «ئاغاو نۆکەر»، «دیلی قەفقاز»، «کازاخەکان»، «شەیتان» و «پەسلان»م وەرگێڕاوەتەوە ئەگەر تەمەن مەودا بدات «شەڕ و ئاشتی» و «حاجی مراد» و «سۆنات کورتێزیر» و «پۆلیکۆشکا» و بەرهەمەکانی دیکەشی وەردەگێڕمەوە.

بەو هیوایەی توانیبێتم وەرگێڕێکی ئەمانەتدار بم و ڕۆحی ئەو گەورە پیاوەی مێژوو لە خۆم ڕازی بکەم و ئاشقانی هونەر و ڕێبازی تۆلستۆی لێم دڵمەند نەبن.

ئەمین گەردیگلانی

هاوینی 2013 بۆکان

# یەک

سـەدان مـرۆڤ لە پـاوانێکی بەرتەسـکدا کۆبـوونەتەوە و دەسـت لە ئەدگـاری سروشـت وەردەدەن و خـاک بە بەرد و چەو دادەپۆشـن؛ بەڵام تۆوەکـان لە کـاتی خۆیاندا چەکەرە دەدەن، شینکە لێو بە خاکەوە دەنێن و دەرسکێن. لەگەڵ ئەوەشـدا بە دووکەڵــی خەڵــووز و نەوت ڕمــوودەی دەکەن و دار و دەوەن لە بــێخەوە هەڵـدەکەنن و پەلەوەر و ئـاژەڵان دەتـارێنن، بەڵام بەهـار دێ؛ بە دەشـت و بیابانـدا تێدەپەڕێ و خۆ دەکا بە شـارەکاندا لەگەڵ هـاتنی بەهـار گژوگیا لە هەمـوو لایەکەوە سەر هەڵدەدەن و زەوی و هەوا گەشـاوە و پڕ بەرامە دەکەن. کەنـاری شـەقامەکان بە گـوڵ دەڕازێنەوە، گیـاوگژی خۆڕسـک لە درزی سەنگفەڕشـەکانەوە دێنە دەرێ، کـاژ و سـپیدار بە گەلای تەرچـک و پڕ بەرامەی بەرەو باوەشـی ئاسـمان هەڵدەچن. چرۆ بەسەر لقی زیزفۆنەوە گۆپکە دەکا و خۆی ئامادە دەکا بـۆ پشـکووتن. قشـقەڕە و کوکوختی و کۆتر و چۆلەکە، وەکوو هەمـوو بەهارێـک شـاد و چـالاک خەریکـی هـێلانە چـێ کـردنن. مێشــەکان بە تینـی هەتـاو دەبـووژێنەوە و دەسـت دەکەن بە ویزەویز. پەڕۆک و مارومێروو، ئاژەڵ و گژوگیا گەشـە و شـادی دەزێتە ناخیـان و بەدەم بەهـارەوە زەردە دەگـرن، مەخـابن لەو وەرزە پـڕ گەشەونەشـەیەدا، مرۆڤـی خۆپەرەسـت بیـر لە مەرایـی و ئـاژاوە دەکـاتەوە؛ لە هەمـبەر ئەم هەمـوو جـوانییەی

بەهار و بەیانیی پڕ لە ئاونگ و بەرامەدا، کە جیهان بۆ باوەشی ئاشتی و شادی و سازگاری و ئەوین بانگهێشتن دەکا، کەمتەرخەم و بێ موبالاتە؛ تەنیا بیر لە داونانەوە بۆ هاوڕەگەزەکانی و پلەوپایە و بەرژەوەندی خۆی دەکاتەوە.

لەو بەهارە جوان و ڕازاوەیەدا، بەندیخانەی پارێزگا بەری لە شادی و گەشەونەشە بوو. لە نووسینگەی بەندیخانەدا بە گەرمە باسی نامەیەکیان دەکرد کە ڕۆژی ڕابردوو لە خانەی دادەوە هاتبوو، لەو نامەیەدا نووسرابوو کاتژمێر نۆی بەیانی بیست و هەشتی ئاڤریل، دوو ژن و یەک پیاوی بەندی ببەن بۆ دادگا. هەروەها لە نامەکەدا هاتبوو کە یەکێک لەو دوو ژنە کە تاوانەکەی قورسترە، بە جیا و بە قۆڵبەست کراوی بیهێنن.

سەرپاسەوان بۆ هێنانی ئەو دوو ژنە لە دالانێکی تاریکەوە تێپەڕی و چوو بۆ نێو بەندیخانەکە. زیندانەوان ژنێکی سەر سپی بوو، بە پشتێن و حەمایلی شین و سەرقۆڵی کەلبەدوون کراوەوە مات و بێ تاقەت لەوێ دانیشتبوو. چاوێکی لە سەرپاسەوان کرد و گوتی:

ـ هاتووی ماسلۆڤا ببەی؟

بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێ لە جێی خۆی هەستا و دەرگای بەندەکەی کردەوە. دەنگێکی وشک لە دالانەکەدا بوو بە زایەڵە و بۆگەن لە بەندەکانەوە بەرەو دەرێ لوول بوو.

ـ ماسلۆڤا خۆی ئامادە بکات بۆ دادگا!

سروە بۆنی بەهاری دێنا بۆ حەوشەی بەندیخانەکە، بەڵام لە دالانە تەنگ و تاریکەکاندا هەوای بۆگەن و قێزەون چڕ بووبۆوە. بۆنی پیسی و دەرمانی گەماربەر و زبالە تێکەڵ بووبوو و ئەوەی لە دەرەوە دەهاتە ژوورێ بۆگەن کاس و وڕی دەکرد. تەنانەت زیندانەوانی سەرسپی کە خووی بەو شوێنە ڕموودەیە گرتبوو، کاتێک بۆ سەردان دەچووە ژوورێ هەموو گیانی دادەگیرا.

ـ ماسلۆڤا، زووکە، خۆت مەگنخێنە!

لە دوورەوە دەنگەدەنگ دەهات. ژنان پێکەوە قسەیان دەکرد و بە پێخاوسی بە نێو بەندەکەدا دەهاتن و دەچوون. زۆری نەخایاند ماسلۆڤا گورج و خێرا هاتە دەرێ. هێشتا جحێڵ بوو، خڕپلانە و مەمک قوت. بەسەر چاکەت و تەنوورە سپییەکەیدا ڕووپۆشێکی خۆڵەمێشی بەندیخانەی لەبەرکردبوو. گۆرەوییەکانی دەزوو بوون و کەوشەکانی خواروخێچ. لە کەلێنی لەچکەکەیەوە چەند تیسک لە قژە ڕەشەکەی هاتبووە دەرێ. ڕەنگی هەڵبزرکابوو. شەش مانگ لە شوێنێکی داخراودا مابۆوە و تیشکی هەتاو و هەوای پاک لە ڕووخساری نەکەوتبوو. وەک پەتاتەیەک وابوو کە چەند مانگ لە هەمباردا مابێتەوە. دەستەکانی ناسک و درێژۆکە بوون. سووچێکی لاملە سپییەکەی لە ژێر ملیوانەی کراسەکەیەوە دیار بوو. چاوەڕەشەکانی ترووسکەی وریاییان لێ دەباری. یەکێک لە چاوەکانی شیرین خێل بوو.

سینگی دەرپەڕاندبوو و سەری بەرز ڕاگرتبوو. گەیشتە نزیک زیندانوانەکە، گتێکی گرت. پیرێژنێکی دەمووچاو چرچولۆچ بە دوایدا هەڵات تاکوو شتێک بە گوێیدا بچرپێنێ، بەڵام زیندانەوان قۆڵی ماسلۆڤای گرت و کێشایە دەرێ و دەرگای بەندەکەی پێوەدا. پیرێژن دەمووچاوی بە دەربیجەی بەندەکەوە نووساند و هاواری کرد:

ـ لە بیرت بێ قسەی زیادی نەکەی؛ هەر ئەوە بڵێ کە پێشتر گوتووتە.

ـ چ جیاوازییەکی هەیە؟ خۆ لەوە زیاتر بە قوڕدا ناچمە خوارێ!

سەرپاسەوان ئیتر ماوەی پێ نەدا بیە تووڕەیی گوتی:

ـ زووکە، ڕێکەوە!

ماسلۆڤا بە دوایدا ڕۆیشت. ورد و خێراخێرا هەنگاوی دەنا. بە قاڵدرمە بەردینەکاندا داگەڕان و بە دالانی بەندیخانەی پیاواندا تێپەڕین. ئێرەش لە بەندی

ژنـان پـڕ ژاوەژاو و قیژەونتـر بـوو. لە پشـت دەربـیجەی هەر بەنـدیکەوە کەسـیک ڕاوەسـتا بـوو و چـاوی لە دەرێ دەکرد. هەتـا نووسـینگەی گرتووخـانە مەودایەکـی کەمیان مابوو، بەرپرسی نووسینگەکە لە پشت میزەکەی دانیشـتبوو، هەر کە چـاوی بە ماسلۆڤا کەوت نـامەیەکی دا بە یەکیک لەو دوو سـەربازەی کە چەک لە شـان لە نزیکی ڕاوەستا بوون، نامەکە بۆنی توونتی لێ دەهات:

- بیبەن.

سـەربازیک کە سـوورەکارە و خولیرکـاوی بـوو و لە گوندنیشـینانی دەوروبەری نیژنی نۆوگورووود بوو، نامەکەی وەرگرت و خستیە نیو گیرفـانی سـەرقۆڵییەوە، لە بەندییەکەی ڕوانـی و چـاوی لە هاوقەتـارەکەی قرتاند کە لە خیڵـی چووئـاش[4] بـوو. هەرسـیکیان لە دەرگـای بەنـدیخانەکە چـوونە دەرێ و بەرەو شار وەڕیکەوتن.

ڕیبواران، لە عارەبانەچی و دووکاندارەوە بگرە، هەتـا دەگاتە فەرمـانبەر و کریکـار و خزمەتکـار، کاتیـک ئەو ژنەیـان لە نیـوان دوو سـەربازی چەک لە شـاندا دی واقیـان وڕمـا. هینـدیکیان دەکەوتـنە گۆمی بیروخەیـاڵەوە، سـەریان دەلەقانـد و لە دڵـی خۆیانـدا دەیـانگوت: «حەتـمەن دزیـی کـردووە یـان پیـاوی کوشتووە و تووشی ئەم بەڵایە هاتووە!» منداڵان بە ترس و لەرزەوە چاویـان لیدەکرد و لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت: «نابێ بترسن. ئەم دوو سـەربازە پیشـی پێ دەگـرن و نـاهیڵن ئـازاری کەسـیک بـدات!» وەرزیرێـک کە کۆڵیکی ئیزنـگ هینـابوو بـۆ شـار و فرۆشـتبووی، ئیسـتا دەچـوو لە قاوەخـانەیەک دانیشـێ و چـایەک بخـواتەوە، کە چـاوی پیـی کەوت زۆری بەزەیـی پییـدا هـات. چـووە

---

4 ـTchouach خیڵیکن لە باکووری ڕووسیا و نزیک فەنلاند دەژین و خەڵکیکی وردیلە و کز و ڕەنگ بزرکاون.

پێشیّ خاچی خۆی کێشا و یەک کۆپکی لە گیرفانی دەرهێنا تاکوو بیداتیّ. ماسلۆڤا سوور هەڵگەڕا، سەری داخست و لەبن لێوەوە شتێکی گوت.

ماسلۆڤا هەستی دەکرد تەواوی خەڵک چاویان لەو بڕیوە. نەی دەویست چاولەچاوی خەڵک بکات. هێندیّ جار بەلا چاوێک لە خەڵکەکەی دەڕوانی. ئەم ڕوانینانەش ئەوی ڕازی دەکرد. بە سروەی بەهاری کە لەگەڵ هەوای بۆگەنی بەندی خانە زۆر جیاواز بوو، گەشابۆوە؛ بەڵام چونکە ماوەیەک بوو بەڕێدا نەڕۆیشتبوو، کەوشە ڕەق و خواروخێچەنەکانی بەندیخانەش لاقی دەگوشی و ئازاری دەدا. بۆیە هەوڵی دەدا هەنگاوی سووکتر هەڵێنێتەوە. لە بەر دووکانی گەنم فرۆشێک، چەند کۆتر دانیان دەخوارد و بەدوای یەکدا هەڵدەهاتن، لەناکاو هەڵفڕین. باڵی یەکێکیان لە ڕوومەتی دراو و شنەی هەڵفرین ڕوخساری لاواندەوە. زەردەیەکی گرت و دیسان گەڕایەوە بۆ دنیای ڕاستەقینە و هەناسەیەکی هەڵکێشا.

## دوو

سەربردەی ئەو ژنە زۆر سادە بوو. دایکی و دایەگەورەی لە مەزرایەکی گەورە گاوان بوون کە خاوەنەکەی دوو پیرەکچی دەوڵەمەند و خانەدان بوون. دایکی زۆر ژنێکی دڵتەڕ بوو. هەر جارەی ئاشقی پیاوێکی ڕێبوار دەبوو و دەستی لەگەڵ تێکەڵ دەکرد. زۆر جاریش زگی پڕ دەبوو. کە منداڵیشی دەبوو بە پێی داب و نەریتی گوندەکە، منداڵەکەی سەرانشۆ دەدا. بەڵام ئەو کە بۆ بژێوی ژیان ناچار بوو شان بداتە بەر کاری تاقەتپڕووکێن، نەیدەتوانی بە باشی بە منداڵەکانی ڕابگا و زۆر زوو دەمردن.

پێنج منداڵی بەساوایی مردن. منداڵی شەشەم کە یادگاری پیاوێکی ڕێبواری تاجیک بوو نێوچاوانەکەی هێنای و زیندوو مایەوە. بەسەر

هاتەکەشی بەم شێوەیە بوو، ڕۆژێک یەکێک لەو دوو خوشکە قەیرەیە چوو بۆ گەوڕەکە تاکوو ژنە گاوانەکە سەرکۆنە بکات کە بۆچی قەیماخی ئەو ڕۆژە تامی جارانی نەبوو، بەجێی ژنە چاوی بە منداڵێکی ساوا کەوت و سەری سووڕما کە بۆچی ئەو ژنە منداڵە شیرەخۆرەکەی لە گەوەڕەکە بە جێی هێشتووە و ڕۆیشتەوە بەدوایی کاری خۆیدا. هێندێ لە ژوور سەری منداڵەکە ڕاوەستا و چاوی لە جووڵە و باڵەتەپێی کرد.

منداڵەکە هێندە جوان و لە بەردڵان بوو ڕوحمی بۆی بزووت.

دایکی ڕازی کرد و منداڵەکەی برد بۆ سەرانشۆ و بووبە دایەخێوی.

هەر بۆیە ئەو منداڵە کە لە مەرگ ڕزگاری بووبوو، ناویان نا «ڕزگار بوو».

کاترین ماسلۆڤا سێ ساڵی تەمەن بوو کە دایکی نەخۆش کەوت و کۆچی دوایی کرد. دایە گەورەشی گاوان بوو و نەیدەتوانی ئاگاداریی لێ بکات. ئەو دوو قەیرە کچە چونکە خوویان بە منداڵلەکە گرتبوو، سەر پەرشتی ئەویان وەئەستۆ گرت.

کچۆڵە وردە وردە گەورە بوو. کیژێکی چاوڕەش و جوان و لە دڵا شیرین، بۆ ئەو دوو خوشکە چاکەکارەش بوو بە هۆی شادی و دڵحەسانەوە. سوڤیا ئیڤانۆڤنا، یەکێک لەو دوو خوشکە کە دایەخێوی ئەو منداڵە بوو، زۆر مێهرەبان و بە بەزەیی بوو بەڵام خوشکە گەورەکەی ماریا ئیڤانۆڤنا زۆر تووڕە و بە پرتەوبۆڵە بوو. سۆڤیا خوێندنەوە و نووسینی فێری ئەو کچە دەکرد و ئەوی بۆ بوونە خاتوونێکی ماقوڵ و خانەدان پەرەوەردە دەکرد، بەڵام ماریا بە پێچەوانەی ئەو لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەو کچە دەبێ جۆرێک پەروەردە بکرێ کە لە داهاتوودا ببێتە خزمەتکارێکی باش و دڵسۆز. هێندێ جار بەهانەی پێدەگرت و دەیگوڕاند بە سەریدا، کە ڕقیشی هەڵدەستا،

لێی دەدا و داخی دڵی خۆی پێ دەڕشت. هەر بۆیە کاترین ماسلۆڤا بە دوو شێوە ڕاهێنان گەورە بووبوو؛ نیوەی خانم بوو، نیوەی خزمەتکار. لە ماڵێدا کاری گەسک لێدان، تۆزتەکێن، لێنانی قاوە، پاکوخاوێنی و چنینی میزی خواردن لە ئەستۆی ئەو بوو. هێندێ جاریش لەلای ئەو دوو خوشکە دادەنیشت و کتێبی بۆ دەخوێندنەوە. ئەوان نە وەکوو خانەدانەکان بە کاترینیان دەگوت کاتیا و نە وەک کچە کڵفەتێک کاتینکا؛ پێیان دەگوت کاتیووشا، کە نە ئەمیان بوو نە ئەویان. چەند خوازبێنیشی بۆ هات. ئەو تامی ژیانی ئاسوودەی چێشتبوو، قەت ئامادە نەبوو ببێتە ژنی جووتیارێکی ئاسایی و هەموو تەمەنی بە دژواری و چارەڕەشی ڕابوێرێ.

شانزدە ساڵانە بوو کە بۆ یەکەم جار عاشق بوو و برازای ئەو دوو پیرەکچە هات بۆ گوند چەند مانگ لەوێ مایەوە. ئەو کوڕە گەنج و خوێندکاری زانکۆ بوو. نەیهێشت هیچ کەس لە ڕازی ئەو ئاگادار بێ و شەوانی زۆر بە یاد و خەیاڵی ئەوەوە خەو دەیبردەوە. دوو ساڵ بە سەر ئەو ڕۆژانەدا تێپەڕی کە پڕ بوون لە خەون و خەیاڵی شیرین. کۆنتی لاو کە چوو بۆ سەربازی، جارێکی تر هاتەوە بۆ گوندەکە و ماوەی چوار ڕۆژ لە لای پوورەکانی مایەوە. ئەو لەو ماوە کورتەدا کچەی هەڵفریواند و دوایین شەو هەتا بەیان لەگەڵی ڕابوارد و کاتی ڕۆیشتن گەڵایەکی سەد ڕۆبڵیی پێدا.

دوای پێنج مانگ زگپڕ بوونەکەی لە چاوی دا و ئیتر بۆ شاردنەوە نەدەبوو. وەهاش دڵناسک و جینگزی بووبوو لەڕێوە دەرهەڵدەبوو و ڕقی هەڵدەستا. هیچ ئاواتێکی نەبوو جگە لەوەی هەرچی زووتر لەو سەر شۆڕییە ڕزگاری بێ. ڕق و شێواوی وای لێکرد بەگژ ئەو دوو خوشکەدا چوو و ڕووهەڵماڵدراوانە داوای لێکردن حیساب و کیتابەکەی بۆ بکەن و ئازادی بکەن. ئەو دوو خوشکەش جگە لەوە هیچ چارەیەکیان نەبوو.

کاتێک لەو ماڵە هاتە دەرێ و لەگەڵ دژواری بەرەوڕوو بوو، زۆری داخ وخەفەت خوارد بەڵام پەشیمانی سوودی نەبوو. بۆ بژیوی ژیانی لە ماڵی ئەفسەرێکی شارەوانی بوو بە خزمەتکار، بەڵام لەوێ زۆری تاقەت نەهێنا و ڕۆیشت. چونکە ئاغا پەنجا و چەند ساڵەکەی تەماحی تێکرد بوو. ڕۆژێک باوەشی بە ماسلۆڤادا کردبوو و بە زۆر ویستبووی دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکات، بەڵام ماسلۆڤا چونکە جحێڵ و بە هێز بوو پاڵێکی بە پیرە پیاوەوە نا و فڕێیدا بۆ سووچێک و تخێڵی کرد. دوای ئەو ڕووداوەش ئتیر لەو ماڵەجێی پێ لێژ بوو. زۆری نەما بوو بۆ کاتی زایمانەکەی. چوو بۆ گوندێکی نزیک شار و لە ماڵی بێوەژنێکدا کە لە باڕێک کاری دەکرد و مامانێکی شارەزاش بوو، ژوورێکی بەکرێ گرت و هەر لەوێ مایەوە هەتا منداڵەکەی بوو. بەڵام بەداخەوە دەستی ڕمووەدەی مامانەکە ئەوی تووشی یاوی مندڵدان کرد. ناچار بوون منداڵەکە بنێرن بۆ دایەنگە کە لە ڕێگا گیانی لە دەست دا.

ڕۆژێک کە ماسلۆڤا پێ نایە ئەو ماڵەوە، سەد و بیست و حەوت ڕۆبڵی پاشەکەوت هەبوو، کە سەد ڕۆبڵی لە بری لە دەستدانی کچێنی بە دەست هێنا بوو و بیست و حەوت ڕۆبڵیشی پاشەکەوتی کار و زەحمەتەکانی بوو. ڕۆژێک کە دەیویست لەو ماڵەبڕوا، تەنیا شەش ڕۆبڵی بۆ مابۆوە. پارەی بە دەستەوە نەدەما، یان هەڵەخەرجی دەکرد یان دەیدا بە هەژار و ئاتاجەکان. خاوەن ماڵەکەشی لەو ماوەیەدا حیسابێکی زۆری خستبووە سەر شانی. چل ڕۆبڵی کرێ خانوو لێ وەرگرتبوو، چل ڕۆبڵیشی وەک قەرز لە چنگی دەرهێنا بوو. بیست ڕۆبڵیشی وەک حیسابی کڕینی جلوبەرگ و شیرینی و بردنی منداڵەکە بۆ دایەنگە لێ سەندبوو و بەو شێوەیە گیرفانی ماسلۆڤای هەڵتەکاندبوو.

ماسـلۆڤای دەسـتتەنگ و بـێکەس ڕۆیشـت بە دوای کـاردا و زۆر سـووڕایەوە. جەنگەڵبانێک وەک خزمەتکار وەریگرت. ئەو پیـاوە ئەگەر چـی ژنیشـی بـوو، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە بە دەوریدا دەهات و مرووی لێ خۆش کردبوو. بەڵام ماسلۆڤا خۆی بە دەسـتەوە نەدا. کـابرای جەنگەڵبـان زۆر کـارامە و فێڵەبـاز بـوو. خـۆی بە دار و بەرددا دەدا بۆ ئەوەی دەسـتی لەگەڵ تێکەڵ بکات. ژنەکەی کە سووسـەی کردبـوو، وەک نیسـێ بە دوایانەوە بـوو. ڕۆژێ لە قوژبنێـک بەسـەریاندا دەچێ. هەر دوو ژنە ئاوقای یەک دەبن و دەستیان لە قژی یەکتر گیـر دەکەن؛ لە ئاکامـدا ماسـلۆڤایان دەر کـرد و هەقدەسـتی ئەو ماوەیەشـیان نەدایە. ژنەی لـێ قەومـاو کە هـیچ ماڵوحـاڵێکی نەبوو. پەنای بۆ ماڵی پووری برد. میردەکەی پووری سـەحاف بـوو. مـاوەیەک بـوو کارەکەی لە برەو کەوتبوو، بە هۆی چارەڕەشییەوە ڕووی لە ئەلکۆل کردبوو و ئەو تۆزە داهاتەش کە بووی لەو ڕێگایەدا داینـا. ژنەکەی بەناچـاری لە ماڵێدا دەزگـایەکی دانا و لەو ڕێگایەوە بژیوی بنە مـاڵەکەی دابین دەکرد. پووری پێداگریی کرد کە لە لای ئەو بمێنێتەوە و لە کاروباری جلشۆریدا یارمەتیی بدات، بەڵام ماسلۆڤا ئاگـای لە کاری دژواری جلشۆری هەبوو، بۆیە نەچووە ژێر باری داواکارییەکەی پـوورییەوە. دوای حەوتوویەک بێکاری، نووسینگەی کـار دۆزینەوە نـاردی بـۆ مـاڵی خانمێک کە دوو کــوڕی خوێنــدکاری دواناوەنــدیی هەبــوو. حەوتــوویەکی نەخایانــد کــوڕە گەورەکەیان کە تازە ڕیش و سمێڵی هاتبوو، دەستی لە دەرس و قوتابخانە هەڵگرت و شێتانە ئاشقی ماسلۆڤا بوو. کوڕە وەها هێمنایەتیی ماڵەکەی شـێواند دایکـی ناچـار بوو ماسلۆڤا جواب بکات.

دیسـان بە دوای کـاردا هەڵخـولا و هەمـوو ڕۆژێـک سـەری لە نووسـینگەی کار دۆزینەوە هەڵدێنا. هەر لەو هاتووچۆیانەدا بوو لەگەڵ ژنێکی قۆڵ بە بازن و قامک پڕ لە ئەنگوسـتیلە ناسـیاویی پەیدا کـرد. ئەو ژنە کاتێـک بەسـەرهاتی ماسلۆڤای بیست، بانگهێشتنی کرد بۆ ماڵەکەی خـۆی. ماسـلۆڤا قەبـووڵی کـرد

و ڕۆژێک چوو بۆ ماڵەکەی. ژنە زۆر بە گەرموگوڕی میوانداریی لێکرد و شەراب و شیرینیی بۆ هێنا. سەعاتێکی نەخایاند پیاوێکی جێکەوتووی کەڵەگەتی سەر ماشوبرنجی خۆی کرد بە ژووریدا، لە پاڵ ماسلۆڤادا دانیشت و سەری گاڵتە و پێکەنینی کردەوە. ژنە پیاوەکەی بردە ژوورێکی دیکە و سرتاندی بە گوێیدا: «ناشارەزایە و لە گوندەوە هاتووە بۆ ئێرە!» دوای چەند خولەک گەڕایەوە بۆ لای ماسلۆڤا و گوتی: «ئەو پیاوە نووسەرە و وەک دەڵێن پارەی لە پێستە گامێشدایە، بۆیە داوات لێدەکەم دڵی ڕازی بکەی.»

ماسلۆڤا دڵی کابرای نووسەری ڕازی کرد و نووسەری دەوڵەمەند بە بیست و پێنج ڕۆبڵ ناز و خۆشەویستییەکەی قەرەبوو کردەوە و بەڵێنی پێدا دیسان دێتەوە بۆ سەردانی. ماسلۆڤا بەو پارەیە قەرزەکەی پووری دایەوە و کراس و کڵاوێکی جوانی بۆ خۆی کڕی. دوای چەند ڕۆژ، نووسەری زەنگین دیسان ناردی بە شوێنیدا و ئەمجارەش بیست و پێنج ڕۆبڵی پێدا و پێشنیاری پێکرد خانوویەک بەکرێ بگرێ و وەک پاشماڵەی ئەو لەو ماڵەدا دانیشێ. ماسلۆڤا قەبووڵی کرد. خانوویەکی بەکرێ گرت و بوو بە پاشماڵەی نووسەری خۆشگوزەران.

چەند مانگی نەخایاند دیسان ماسلۆڤا ئاشقی گەنجێکی هەرزە بوو، ئەو کوڕە فەرمانبەری نووسینگەی بازرگانییەک و دراوسێی ماڵەکەیان بوو. ئەو گەنجە فەرمانبەرە ئەگەرچی بەڵێنی هاوسەرگیریی بە ماسلۆڤا دابوو، لە ناکاو ڕۆیشت بۆ سەفەر و ئیتر نەگەڕایەوە. ماسلۆڤا دەیویست گرێبەستی خانووەکە تازە بکاتەوە و بە شێوەی سەربەخۆ بژی، بەڵام پۆلیس لە کاروبارەکەی ئاگادار بووبوو و بە شێوەی فەرمی پێی ڕاگەیاند کە دەبێ پسوولەی زەردی مۆڵەتی لەشفرۆشی وەرگرێ و بەردەوام سەردانی پزیشکی ژنان بکات. بە ناچاری گەڕایەوە بۆ لای پووری. پووری کە بە

کراسی هەورێشم و کڵاوی جوانەوە دیتی، بەڕێزەوە وەریگرت و پێی وابوو خوشکەزاکەی لە نێو چینی دەوڵەمەندی کۆمەڵگادا جێگای خۆی کردۆتەوە و لە خۆی ڕانەدی داوای لێ بکات لە کاروباری جلشۆریدا یارمەتیی بدات. ماسلۆڤاش ئیتر ئامادە نەبوو لە شوێنێکی وەک جلشۆری کار بکات، چەندین کاتژمێر لە نێو هەڵم و سابووندا ئارەق بڕێژێ، تانە و تەشەری ژنانی نەخۆش و بێچارەی جلشۆرییەکە تامڵ بکات و لە بەیانییەوە هەتا شەوێ بشوات و ئوتوو بکات و تەنانەت لە سەرما و سەغلەتی چلەی زستانیشدا لەبەر پەنجەرەی ئاوەڵا جلوبەرگی چڵکن هەڵگوڵۆفێ و زووخاوی ڕەش هەڵێنێ و زمانی نەگەڕێ.

سەرلێشێواوییەکەی زوو کۆتایی هات. ژنێک کە کچانی عازەبی هەڵدەفریواند و لە داوی دەخستن، بە ملۆمۆکردن شوێنەکەی ئەوی دۆزییەوە. ماسلۆڤا کە لە چنگ سەرگەردانی وەزاڵە هاتبوو بە ناچاری خۆی بە دەستەوەدا. ماوەیەک بوو کە فێری دووکەڵ بووبوو، جاروبار شەڕابیشی دەخواردەوە. شەڕابیشی نەک لەبەر تام و سەرخۆش بوونەکەی، بەڵکوو بۆ لەبیر بردنەوەی چارەڕەشییەکانی خۆی دەیخواردەوە. کاتێک سەرخۆشییەکەی نەدەما و وشیار دەبۆوە، خەم دایدەگرت و بۆی دەردەکەوت کە چ ژیانێکی پووچ و فەوتاوی هەیە.

ژنە سەرەتا پووری ماسلۆڤای ڕازی کرد، پاشان چووە بن گوێی ماسلۆڤا و پێی گوت ئەگەر ژنێکی باش و گوێڕایەڵ بێ، دەیبا بۆ یەکێک لە جندەخانە نمرە یەکەکانی شار و دەرووی سامان و خۆشگوزەرانی بە ڕوویدا دەکرێتەوە. ماسلۆڤا تەنیا دوو ڕێگای لەبەر دەم بوو: یەکیان ئەوەی ببێتە خزمەتکارێکی بێ نرخ و بەردەوام لەگەڵ پیاوانی ماڵێ لە کێشە دابێ و ببێتە ژێر چەپۆکەی ئاغا و خانم و منداڵە تاقانەکانیان، دووهەم ئەوەیە کە ببێتە

لەشفرۆشی فەرمی و لە ژێر چاوەدێریی یاسا و ڕێسادا کار بکا و کەسپێکی پڕ داهات و دڵنیا و دایمی هەبێ؛ دوای هێندی بیر کردنەوە ڕێگای دووهەمی هەڵبژارد.

پێی وا بوو بەو کارە تۆڵە لە جەنابی نووسەر و لاوی فەرمانبەری نووسینگە و هەموو ئەو کەسانە دەکاتەوە کە فریویان داوە، لەوە بە دواوە لە زلکاوی هەژاری و دەستەنگی ڕزگاری دەبێ. دەیتوانی هەر جلوبەرگێک حەزی لێیبوو بیکڕێ، جلوبەرگی مەخمەر و ئارمووش بپۆشێ، کراسی چەسپ و شەوچەپکەن لە بەر بکات و قۆڵی سپی و ناسک و مەمکی قوت و ڕووتی وەدەربخات. زیاتر لە هەموو شتێک حەزی لە کراسی هەوریشمی زەرد بوو بە پەڕاوێزی مەخمەری ڕەشەوە. کەڵکەڵەی ئەوشتانە دڵی داگرتبوو. هێندەی پێ خۆش بوو، لە هەمبەر زمانلووسییەکانی ئەو ژنەدا هیچ چەشنە خۆڕاگرییەکی نەکرد و بڕوبیانوی نەهێنایەوە، هەر ئەو شەوەش لەگەڵیدا چوو بۆ لەشفرۆشخانەی کیتایۆڤ.

لەو کاتەوە ماسلۆڤا بە شێوەی فەرمی بوو بە لەشفرۆش؛ کەسپێکی دەست پێ کرد کە لەگەڵ بەرژەوەندی کۆمەڵگا و ئەحکامی خوایی سازگار نەبوو بەڵام چونکە دەوڵەتەکان ناچارن پارێزگاری لە قازانج و بەرژەوەندیی کۆمەڵگا بکەن، ڕێگای پێدەدەن و پشتیوانیی لێ دەکەن. جێگای ئاماژەیەئەو کەسانەی دەکەونە سەر ئەو ڕێگایە، لە هەر دە کەس نۆ کەسیان تووشی نەخۆشی مەترسیدار دەبن، زوو پیر و لاکەوتە دەبن و مەرگی زووڕەس بەرۆکیان دەگرێ. ژیانی شەو و ڕۆژی ئەو ژنانە بە شێوەیەکی یەکهاوی تێدەپەڕێ: شەوێ لەگەڵ پیاوان هاوسەرینی و نزیکی دەکەن و مەی دەنۆشن و بەرەبەیانی خەوێکی قورس دایاندەگرێ، دەرنگانی لە پێخەف دێنەدەرێ، خواردن و خواردنەوە، بە خاولیی حەمام و جلوبەرگی خەوەوە بە نیو ژووری خەوەکەدا دێن و دەچن؛ لە کەلێنی

پەردەکانەوە چاو لە کۆلاَن دەکەن، لەگەڵ یەکتر دەمەتەقێ دەکەن، ڕۆنی بۆندار لە لەشیان هەڵدەسوون، جلوبەرگی نوێ تاقی دەکەنەوە، لەگەڵ خانم چەلەحانێ دەکەن، لە بەر ئـاوێنە دادەنیشـن و بە دەوری خۆیانـداد دێـن، خۆیـان تیفتـیفە دەدەن، خواردنی چەور و شیرین دەخۆن، جلوبەرگی پڕ زریقەوبریقە و جەستە نوێن لەبەر دەکەن، شەوانە دەچن بۆ هۆڵی پڕ نەخشونیگاری جندەخانە،لە ژێر شۆقی چلچراکان دادەنیشن و چاوەڕوانی مشتەری دەبن، سەما دەکەن، گوێ بۆ ئـاوازی دێمـودە ڕادەگـرن، جـگەرە دەکێشـن و مەشـرووب دەخـۆنەوە، لەگەڵ هەموو جۆرە پیاوێک دەست تێکەڵ دەکەن، لەگەڵ پیر و گەنج و نێوان ساڵ، پیـاوانی ڕەبەن و خـاوەن ژن؛ ئەرمەنـی، جـوولەکە و تاتـار، هەژار و دەوڵەمەنـد، ساغ و نەخۆش، پیاوانی مەست، پیاوانی هەوەسباز، پیاوانی تووڕە و تۆسن، پیـاوانی نەرم و نیـان، دەوڵەتـی و لەشـکری، خوێنکـاری زانکـۆ و قوتـابیی دواناوەنـدی و لەگەڵ هەمـوو کەسـێک و لە هەمـوو چینێکـی کۆمەڵگـا و لەگەڵ هەمـوو چەشـنە کـردار و لەگەڵ هەمـوو شـکل و قەلافەتێـک هاوبـاوەش دەبـن... بەرەبەیـانی خەویـان لـێ دەکەوێ... ئەوەیە چیرۆکـی ژیـانی ئەو ژنـانە، کە هەمـوو ڕۆژێ دووپات دەبێتەوە و جگە لەوەش هەموو حەوتوویەک بۆ قایم کردنی پێگە و بـارودۆخی خۆیـان دەبـێ سـەردانی کاربەدەسـتانی دەسـت ڕۆیشـتووی شارەوانی و فەرمانبەرانی پایەبەرزی دەوڵەت بکەن و بە باشترین و شیرینترین نـاز و کەشمونەشمەوە بچنە ئامێزیـان و هەمـوو حەوتـوویەک بۆ پشکنین بچنە لای پزیشـک. ئەم پشـکنینانەش هێنـدێ جـار جیـددی و بـڕی جـاریش لە گـۆترە ئەنجام دەدەرێ و پەردەی شەرم و حەیا دەدڕێنێ؛ کە دیارە شـەرم و فهێت نەک هەر خشـڵ و زەمبەری مرۆڤە بەڵکوو زۆربەی ئاژەڵەکانیش لێی بێ بەش نین. دوای ئەو پشکنینانە دیسـان ئەو کـارە درێـژەی هەیە. هـاوین و سـتان جیـاوازی نییە، ڕۆژانی دەوام و پشودان بۆ ئەوان وەک یەک وایە.

ماسلۆڤا حەوت ساڵی ڕەبەق بەو شێوەیە ڕایبوارد. لەو ماوەیەدا دوو جاری جندەخانە گۆڕی و چەند مانگ لە نەخۆشخانە کەوت. حەت ساڵ دوای دەستپێکردنی لەشفرۆشی و هەشت ساڵ دوای یەکەم دەست تێکەڵ کردنی پڕ تاوان و لە دەست دانی کچینی، لە تەمەنی بیست و شەش ساڵیدا کەوتە بەندیخانە و شەش مانگ لەگەڵ دز و جەردە و پیاو کوژەکان لە بەند دابوو و ئێستا لە نێوان دوو سەربازی چەک لە شاندا بەرەو دادگا دەچوو.

## سێ

لەوکاتەدا دوو پاسەوانی چەک لە شان ماسلۆڤایان بە پێیان و شەکەت و ماندوو بە ڕێگایەکی دوور و درێژدا دەبرد بۆ دادگا، پرنس دیمیتری ئیڤانۆڤیچ نۆخلیدۆڤ تازە لە خەو هەستا بوو، لە سەر پێخەفە نەرمەکەی هەنیشکی دادابوو. ئەو برازای ئەو دوو قەیرە کچە بوو کە ماسلۆڤایان لە ماڵی خۆیاندا گەورە کردبوو، هەر ئەو کوڕە بوو کە یەکەم جار کچەی لە خشتە برد و دەستی لەگەڵ تێکەڵ کرد. نۆخلیدۆڤ قۆپچەی بەرگە خەوە هەوریشمینە هۆڵەندییەکەی کردبۆوە و جگەرەی دەکێشا. چاوی لە سووچێک بڕیبوو. ڕووداوەکانی دۆیشەو و کارەکانی ئەمڕۆی بیری بە خۆیەوە خەریک کردبوو. شەوی ڕابردوو میوانی بنەماڵەی کۆرچاگین بوو. گومان دەکرا کە ئەو بەم زووانە لەگەڵ کچە تاقانەکەی ئەو بنەماڵە دەوڵەمەند و ناودارە زەماوەند بکا. هەودای خەون و خەیاڵەکانی تێک هاڵا بوون. قونچکە جگەرەکەی فڕێ دا و دەستی برد کە لە قووتووی زێوینی جگەرەکەی، کە لە سەر مێزێکی چکۆڵەی پاڵ چرپاکە داندرا بوو، جگەرەیەکی دیکە هەڵگرێ.

بەڵام وەک ئەوەی پەژیوان بوو بێتەوە، دەستی کێشا دواوە و لاقە نەرم و سپییەکانی بە لێواری چرپاکەدا شۆڕ کردەوە و لە سەر تەرکی ژوورەکەی دانان. نەعلەکەی لەپێ کرد و هەستا سەر پێ هێواش و گورج چوو بۆ ژوورەکەی تەنیشت کە بۆنی عەتر و ئۆدکلۆن لە پانتا و دار و دیواری دەهات. بە ئاوی سارد و لفکە و سابوون خۆی شۆرد. جەستەی سپی و ماسوولکەداری هێندێکی پیو و چەوری لەخۆ گرتبوو. بە خاولییەکی ڕەنگین سەر و گیانی وشک کردەوە . ڕووشۆرییەکی مەڕمەڕەی لە سووچی ژوورەکەوە بوو. چووە بەر ئاوینەکە و بە گەردەیەکی سپیی بۆنخۆش دەم و ددانی شۆرد. بۆنی لەدەستی دا، ژێر نینۆخەکانی خاوێن کردەوە کە ماوەیەک بوو هێشتبوویەوە، دەستی بە ملە ئەستوورەکەی و. شانوباهۆ بەهێزەکەیدا هێنا و ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی تر. جلوبەرگی جوان و خاوێن و مۆدەی نوێ و کەوشی بۆ یاغ کراو و بریقەداری بۆ ئامادە کرابوو. کراس و قات و بۆینباخ و قۆپچەی سەر قۆڵی لە باشترین و گرانباییترین جۆر بوون. تا ماویەک لەمەوبەر بۆ هەڵبژاردنی جلوبەرگ و بۆینباخ زۆر ورد بین بوو بەڵام بەنێیک بوو گوێی بەم شتانە نەدەدا و زۆر کەم گرینگی پێدەدا.

دوای لە بەر کردنی جلوبەگ ڕۆیشت بۆ هۆڵی نان خواردن کە پڕ بوو لە کەلوپەل. شەوی ڕابردوو چەند کەسی لادیی تەرکی دارینی ژوورەکەیان شۆرد بۆوە و ترووسکەی دەهات. مێزێکی لاکێشی داری بەڕوو کە ڕوومێزییەکی زۆر ناسک و خاوێنی بەسەردا کێشرابوو، لە نێوەڕاستی هۆڵەکە داندرابوو. پێچکەی کورسی و مێزەکان وەک قاچی شێر تاشرا بوون. ناشتایی لە سەر مێزەکان کە ئامادە کرا بوو: یەک قاوەخۆری زێوێن هەڵمی بۆنخۆشی لێ هەڵدەستا، قەندانی زێوێن ، کووزووی سەر تویێ شیر، دەفرێکی پڕ لە تۆشە و دەفرێکی تر پڕ لە نانی تازە بوو. چەند نامەی

گەیشتوو، ڕۆژنامەی بەیانی و دوایین ژومارەی گۆڤاری فەرەنسیی «دوو جیهان» یش لە سەر مێزەکە داندرابوون. کۆنت نۆخلیدۆڤ دانیشت و یەکەم نامەی هەڵپچڕی. هێشتا یەکەم دێڕی نەخوێندبۆوە کە ژنێکی قەڵەو و بە ساڵاچوو هات بۆ نێو هۆڵەکە. جلوبەرگی ڕەشی لە بەردا و تۆڕێکی ڕشیشی بەسەریدا دابوو. ئاگراڤنا پترۆڤنا هەموو ماوەی تەمەنی لە خزمەت دایکی ئەودا تێپەڕ کردبوو. زۆر نەبوو دایکی نۆخلیدۆڤ مرد بوو و ئاگراڤنا ئێستا کەیبانووی ماڵەکەی بوو. ئەم ژنە ماوەی دە ساڵ لە خزمەت دایکی نۆخلیدڤدا، لە وڵاتەکانی دەرەوە مابۆوە و وەک خاتوونێکی بەڕێز و خانەدانی لێ هاتبوو.

ـ ئەم کاتەت باش، دیمیتری ئیڤانۆڤیچ!

ـ سپاس ئاگراڤنا... هەواڵی تازە چییە؟

ئاگراڤنا نامەیەکی دایە دەستی.

ـ خزمەتکاری شازادە گۆرچاکین بەیانی زوو ئەم نامەیەی هێنا و لە دەرەوە چاوەڕوانی وەڵامە.

نۆخلیدۆڤ نامەکەی لێ وەرگرت. ئاگراڤنا بزەیەکی مانادار نیشتە سەر لێوی، دەتگوت دەیهەوێ تێی بگەیێنێ کە لە هەموو شتێک ئاگادارە و دەزانێ کە ئەم نامەیە بووکەخانی داهاتوو، شازادە خانم میسی ناردوویەتی، بەڵام بۆی دەرکەوت نۆخلیدۆڤ نایەوێ لە بەر چاوی ئەو شتێک وەڕووی خۆی بێنێ. بزەکەی کاڵ بۆوە!

ـ بە خزمەتکارەکەی شازادە کوورچاگین دەڵێم چاوەڕوانی وەڵام بێ.

ئاگراڤنا ماهووت سڕێکی لە سووچی ژوورەکەی هەڵگرتەوە و لە جێگای خۆی داینایەوە و لە ژوورەکە چووە دەرێ. نۆخلیدۆڤ پاکەتە بۆنخۆشەکەی هەڵپچڕی. نامەکە لە سەر کاغەزێکی ئەستووری زێڕکفت نووسرا بوو:

«... ئەمڕۆ بیست و هەشتەمی ئاڤریلە و تا ئەو جێیەی ئاگادارم لە سەر بانگهێشتنی دادگای تاوانەکان دەبیّ بچی بۆ دادگا و لەگەڵ لیژنەی داوەری هاوکاری بکەی. کەوایە، کاتی ئەوەت نییە بێی بۆلام و ئەو جۆرەی کە هەستی ناسکی تۆ دەخوازێ و بەڵێنیت بە من داوە، لەگەڵ ئاغای کۆلۆکسۆڤ بچین بۆ پیشانگای وێنەگەری؛ مەگین لەبەر دڵی من بڕیار بدەی و لە چوون بۆ دادا پاشگەز بییەوە و سێسەد ڕۆبڵ جەریمە بدەی کە پارەی کڕینی ئەسپێکە. شازادە م. ک.»

لەو دیوی کاغەزەکەش نووسیبووی: «دایکم داوات لێدەکا کە ئەمڕۆ بێی بۆ لامان. هەر کاتێک بێی بۆ ئێمە سەربەرزییە. لەبەر ئێوە خواردن درەنگتر ئامادە دەکەین! م. ک.»

نۆخلیدف نێو چاوانی تێک نا. هەستی دەکرد ئەم نامەیە یەکێک لەو گەوەی زنجیرانەیە کە لە دوومانگ لە مەوبەرەوە لە قاچی ئالاوە و دەیهەوێ ئازادیی لێ زەوت بکات و بیخاتە داوی زەماوەند کردنەوە. ئەو شتە کە نەیدەهێشت زووتر بڕیار بدا عەشقەکانی ڕابردووی نەبوو؛ تەنانەت ماسلۆڤای هەر لە بیر نەمابوو کە کچێنی و ئابڕووی بە تالان برد بوو. عەشقەکانی ڕابردوو بەسەر چوو بوون؛ بەڵام ئێستا لەگەڵ ژنێکی مێرددار کەینوبەینی ئەویندارانەی هەبوو، ئەویش بەر بەستێکی گەورە بوو لە سەر ڕێگاکەیدا. ئەگەر چی ئیتر لە لایەن ئەوەوە هیچ حەز و تامەزرۆیییەک لە ئارادا نەبوو، بەڵام شەرم و حەیا نەیدەهێشت تەکلیفی خۆی لەگەڵ ئەو ژنە یەکلایی بکاتەوە. نۆخلیدۆڤ لە هەمبەر ژناندا زۆر شەرمن و بە حەیا بوو، ڕەنگە هە ئەو شەرمنییەش بوو بێتە هۆی ئەوەی سەرنجی ژنان بۆ لای خۆی ڕاکێشێ و گڕی هەوەسیان بگەشێنیتەوە . دوایین گراوی ئەو هاوسەری مارشاڵێک بوو کە پلەوپایەی مارشاڵی بە خەڵات وەرگرتبوو، بە

پشــگیریی نۆخلیــدۆڤ و هاوڕێیــانی بە نــوێنەری ئەنجــومەنی خانەدانەکــان هەڵبژێردرابوو. ئەو ژنە بە هەزار مەکر و ناز و نیمناز ئەوی خستبووە داوی ئەشقی خۆیەوە و پێکەوە زۆریان ڕابواردبوو. ئەگەرچی نۆخلیدۆڤ فریوی مەکروفێڵەکانی ئەوی خواردبوو، بەڵام لەو کاتەوە مەسەلەی زەماوەندەکەی وەڕاســت گەڕابــوو، بە پێویســتی دەزانــی پێوەنــدیی خــۆی لەگەڵ ژنەکەی مارشاڵ بپسێنێ.

خودا و ڕاستان ئەو ڕۆژە نامەیەکی لە مارشاڵی مێردی ژنەش بە دەست گەیشتبوو. نۆخلیدۆڤ کاتێک مۆر و خەتی مارشاڵی بەسەر پاکەتی نامەکەوە دی، ترسی لێ نیشت. لەوە دەترسا نهێنییەکەی ئاشکرا بووبێ؛ بەڵام کاتێک نــامەکەی هەڵپچــڕی، دڵــی حەســایەوە. مارشــاڵ داوای لێکردبــوو لە کــۆڕی تــایبەتی نــوێنەرانی پارێزگــادا بەشــداری بکــات کە مــانگی مەی پێکــدێ و لەو کۆڕەدا پشتگیریی لێ بکات؛ لەو کۆڕەدا بڕیار بوو سەبارەت بە بارودۆخی فێرکــردن و بارهێنــان و کەرتــی ڕێگاوبــان بکــۆڵنەوە و بڕیــاری گرینــگ بــدەن، ئاساییشە ئەو جۆرە بڕیارانە دژایەتیی نوێنەرانی خۆپارێزی لێ دەکەوتەوە.

مارشــاڵ ســەر بە لایەنــی لیبراڵ بــوو و لە ســەر ئەو بــاوەڕەش بــوو کە بە هاوکــــاریی هـــــاوبیرانی سیاســــــیی خــــۆی دەتــــوانێ لە هەمــــبەر ئەو کۆنەپەرەستییەکدا ڕاوەستێ کە لە سەردەمی ئەلکساندری سێهەمەوە سەری هەڵــدابوو. ئەو لە هەمــوو شــتێکدا خــۆی بە خــاوەن بڕیــار دەزانــی، بەڵام سەبارەت بە هەست و سەرەڕۆیی ئاشقانەی ژنەکەی هیچی نەدەزانی!

نۆخلیــدۆڤ زۆر کــات و ســاتی تــاڵی لە مــاوەی کەینوبەینە ئاشــقانەکانیدا لەبیــر بــوو. مــاوەیەک پێــی وابــوو مارشــاڵ بە کــارەکەی زانیــوە و خەریکــی مەشــقی تیرهــاوێژی بــوو تــاکوو خــۆ بــۆ دۆئێــل ئامــادە بکــات. ڕۆژێــک کە لەگەڵ ژنەکەی مارشــاڵ چووبــوون بــۆ باخێک، لەگەڵ ژنە کێشــە و دەمقڕەیــان لــێ پەیــدا بووبــوو.

ژنەش بە هەڵەداوان ڕۆیشتبوو بۆ ئەو سەری باخەکە و وستبووی خۆی بخاتە نێو هەسێڵەکەوە و خۆی بخنکێنێ. هەشت ڕۆژ دوای ئەو ڕووداوە، نامەیەکی بۆ هاوسەری مارشاڵ نووسی و داوای لێکرد بۆ هەمیشە خۆشەویستییەکەیان لە بیر بەرێتەوە، چونکە لە بەرژەوەندیی هەردووکیان دایە؛ بەڵام هەرچی چاوەڕوان بوو وەڵامی بۆ نەهاتەوە. هاوسەری مارشاڵ نە لەو ڕۆژانەدا هاتبوو بۆ لای و نە بە پساندنی پێوەندییەکەش ڕازی بووبوو. نۆخلیدۆڤ لەم لاولا بیستبوویەوە کە لەم دواییانەدا ژنە لەگەڵ ئەفسەرێکی لاو کلکیان تێک هاڵاندووە. ئەم هەواڵە ئەگەرچی تووشی ئێرەیی کردبوو بەڵام بە هیوا بوو بەم شێوەیە ژنە دەستی لە کۆڵ بکاتەوە و لە دەستی ڕزگار بێ. نامەیەکیشی لە لایەن گزیرەکەیەوە بە دەست گەیشتبوو کە داوای لێکردبوو سەرێک لەو مڵکە بدات کە تازە وەک بەشەماڵی دایکی پێی براببوو، تاکوو بۆی مەعلووم بکات کە چۆن کاروباری ئەو مڵکە بەڕێوەبەرێ. بە بڕوای گزیرەکەی، بەڕێوەبردنی مڵکەکە دوو ڕێگای هەیە: یان دەبێ درێژە بە سیاسەتی ئێستا بدات کە لە کاتی ژیانی دایکیدا بووە، یان دەبێ باجی زیاتر لەو وەرزێڕانە وەرگرێ کە لە سەر زەوییەکانی کار دەکەن و لە هەر شوێنێک بە پێویستی زانی کرێکار بگرێ تاکوو خۆیان کشتوکاڵ بکەن و داهاتی زەوییەکانیش زۆر زیاتر دەبێ. گزیرەکەی لە کۆتاییدا داوای لێبووردنی کردبوو کە ناردنی سێ هەزار ڕۆبڵ لە بەشی ئاغا وەدرەنگ کەوتووە و ڕوونی کردبۆوە کە جووتیارەکان قیستەکانیان لە کاتی خۆیدا نەداوە، بۆیە ناچار بووە بە شێوەی فەرمی سکاڵا لە دژی جووتیارەکان بەرز بکاتەوە و هیوادارە بە زووترین کات ئەو قیستانە وەرگرێ و بەشی ئەرباب بە پۆستەدا بنێرێتە خزمەتی حەزرەتی مەزن.

نامەکەی گزیر لەگەڵ ئەوەدا کە شادی کردبوو لە ناخی دڵیەوە ئازاری دەدا. ئەگەرچی هەستی بە غووروور دەکرد کە خاوەنی مڵکێکی ئاوا بەرین و پڕ داهاتە، بەڵام لە دڵەوە ڕازی نەبوو. وەبیری هاتەوە کە ئەو کاتەی

خوێندکاری زانکۆ بوو یەکێک لەو کەسانە بوو کە بە شانازییەوە لایەنگریی لە هێربێرت سپێنسەر[5] دەکرد. ئەم بیرمەندە لە کتێبی «هاوسەنگیی کۆمەڵایەتی»دا بە وردی شرۆڤەی کردووە کە عەدالەتی کۆمەڵایەتی لەگەڵ ملکایەتیی زەوی بە هیچ شێوەیەک یەک ناگرێتەوە و ئەم فەلسەفەیە لەو سەردەمەدا وەها کاری تێکرد کە تێزی زانکۆی لە سەر ئەو بنەمایە نووسی. ڕواڵەتەن هەموو شتێک لە سەر کاغەز جوان و دڵگرە، بەڵام لە کاتی کردەوەدا، کێوێک لە کۆسپ و تەگەرە ڕێگات لێ دەتەنن. سەفا و ڕاستی تافی لاوی تێی گەیاندبوو کە زەوی نابێ ببێتە کەرەسەی چەوساندنەوەی ڕەعیەت و وەرزێڕەکان؛ بەڵام ئێستا کە ملکێکی زۆری بە میرات پێگەیشتبوو چۆن ڕازی دەبوو لە دووسەد هێکتار زەویوزاری میراتی چاوپۆشی بکات؟ ئاواتە دڵگرەکانی سەردەمی زانکۆ ئیتر هەستی نەدەبزواند. ئەم زەویوزارە تەنیا کەرەسەی بژیوی ئەو بوو. نەیدەویست ببێتە فەرمانبەری دەوڵەت و بە دەرماڵەیەکی مەمرەمژی ژیان ڕابوێرێ. نەیدەویست دەست لە ژیانی پڕ بریقوباق و کەیف و خۆشی و ئاسوودەیی هەڵگرێ. ئەو بیروباوەڕەی لە تافی لاوی و کاتی زانکۆدا هەیبوو، ئاسەواریشی نەمابوو. ئەو جۆرە خۆنواندن و قسەی کەڵە کەڵە و کاری سەیر و سەمەرەی تایبەتی ئەو سەردەمە بوو. ئەگەر ئەو کاتە ئەندێشەکانی "هێربێرت سپێنسەر" و "هانری جۆرج" قانعیان کردبوو کە ملکیان لەگەڵ عەدالەتی کۆمەڵایەتی یەک ناگرێتەوە، ئەمڕۆ گزیرەکەی بۆ بەهرە وەرگرتنی زیاتر لە زەویوزار و دەسترەنجی ڕەعیەتەکان ئاگاداری دەکردەوە. لەگەڵ ئەوەدا خەونەکانی ڕابردووی بەبا چووبوو، هەستێکی تاڵ و نادیار ئازاری دەدا.

---

5 ـ H.spenser بیرمەندی کۆمەڵناسی بریتانی (1820ـ 1903) کە ئەندێشەی ڕێفۆمخوازی هەبوو.

# چوار

نۆخلیدۆڤ قاوەیەکی خواردەوە و هەستا بچێت بۆ ژووری کارەکەی تاکوو وەڵامی نامەی شازادە میسی بنووسێتەوە و جارێکی تر بانگهێشتنامەکەی دادگا بخوێنێتەوە. ژووری کارەکەی دیوار بە دیواری کارگەی وێنە گەرییەکەی بوو. لەم کارگەیەدا چەند وێنە و تابلۆ بە دیوارەکانەوە هەڵواسرا بوون و تابلۆیەکی نیوەچڵیش هێشتا لە سەر سێپەکەکە بوو کە دوو ساڵی کار لە سەر کردبوو. هەر کاتێک دەستی بە کارێکی نوێ دەکرد، دڵنیا بوو کە زۆر زوو شاکارێک دەخوڵقێنێ، بەڵام دوای چەند ڕۆژ بێ توانایی خۆی بۆ دەردەکەوت. ئەو داماوییە لە بواری هونەردا زۆری ئازار دەدا. وێدەچوو پێی وابێ ڕۆحی ناسکی و هونەری پڕ بەهرەی لە هیچ چوارچێوەیەکدا ناگونجێ.

حەوت ساڵ لەمەوبەر بەو هیوایە وازی لە خزمەتی ئەرتەش هێنا کە بەهرەی هونەریی خۆی تاقی بکاتەوە. ماوەیەک لە لووتکەی خەیاڵاویی هونەرەوە چاوی لە هەموو شتێک دەکرد و هەموو چەشنە کەسپێکی بەلاوە سووک و بێ نرخ بوو، بەڵام ئێستا بۆی دەرکەوتبوو کە تووشی چ هەڵەیەک بووە. هەر کاتێک پێی دەنایە کارگەی هونەرەکەی دڵی دەگیرا. ئەوڕۆژەش بە

دڵتەنگی و بێ تاقەتییەوە چووە نێو کارگەکە و بەبێ ئەوەی لەوێ ڕاوەستێ گەڕایەوە بۆ ژووری کارەکەی کە گەورە و دڵفەرێح بوو، لە باری ڕازاوەییشەوە هیچ کەموکووڕییەکی نەبوو.

بانگهێشتنامەکەی دادگای لە چەکمەجەی «کارە خێراکان» دەرهێنا. بۆی دەرکەوت دەبێ سەعات دەی بەیانی لەوێ ئامادە بێ. دڵی ئاسوودە بوو. دانیشت کە نامەیەک بۆ شازادە میسی بنووسێ و سپاسی لێ بکات بۆ بانگهێشتنەکە، بەڵام هەرچی دەینووسی بە دڵی نەبوو. لە پێشدا نامەکەی پڕ خۆشەویستی نووسی. پێی باش نەبوو. دڕاندی، نامەیەکی دیکەی نووسی، زۆر وشک و فەرمی بوو، ئەوەشی بە دڵ نەبوو. قامکی بە زەنگەکەدا نا. خزمەتکارێک بە بەرهەڵبێنەی خۆڵەمێشینەوە هاتە ژووری، ڕیشی بە باشی تیفتیفە دابوو، لەشساغ و جیددی دیار بوو.

- ڕاسپێرە فەیتوونێک بێنن.

- بە چاوان گەورەم.

- بە خزمەتکارەکەی بنەماڵەی گۆرچاکین بڵێ لە زمانی منەوە سپاس لە شازادە میسی بکات و پێی ڕابگەیێنێ کە کارەکەم تەواو بوو، خۆم دەکەیەنمە ماڵیان.

- بە چاوان حەزرەتی مەزن!

نۆخلیدۆڤ پێی وابوو کارێکی باشی نەکردووە، بەڵام چیی پێ دەکرا؟ تاقەتی نووسینی نە بوو! لەوەش زیاتر دەرفەتی نەبوو. لە ماڵێ هاتە دەرێ، فەیتوونێک لە بەر دەرگا چاوەڕوانی بوو. فەیتوونەوانەکەی دەناسی. هەرکە ئەسپەکان وەڕێکەتن، فەیتوونەوان ئاوڕێکی دایەوە و لەگەڵ ئەوەی چاوی لە کۆنت نۆخلیدۆڤ کرد، زەردەیەکی گرت:

ـ حەزرەتی مەزن! دۆیشەو کاتێک گەیشتمە بەر دەرگای ماڵی گۆرچاکین، تازە تەشریفتان لەوێ ڕۆیشتبوو. دەرگاوانەکە گوتی حەزرەتی مەزن تازە تەشریفی ڕۆیشتووە.

نۆخلیدۆڤ بە خۆی گوت: «تەنانەت عەرەبانە چییەکانیش ئاگایان لە هاتوچۆی من بۆ ماڵی گۆرچاکین هەیە. چبکەم؟ یانی دەبێ لەگەڵ شازادە میسی زەماوەند بکەم؟» هیچ وەڵامێکی نەبوو. پرسیارە بێ وەڵامەکانی تەنیا یەکێک و دووان نەبوون؛ هاوسەرگێری بۆ ئەو قازانجێکیی هەبوو: یەکچاو دەبۆوە. بەرنامەی بۆکات و شەو و ڕۆژکانی خۆی دادەنا و ژیانی هاوبەش ئەوی بەرەو ئاکار و کردەوەی باش دەبرد. لە هەمووشی گرنیگتر حەزی دەکرد ببێتە باوک و ژیانی مانایەکی تازە لە خۆ بگرێ، بەڵام وەک هەموو پیاوە ڕەبەنەکان لەوە دەترسا ئازادییەکەی لە دەست بدات و هەوساری کاروبارەکانی خۆی بداتە دەستی ژنێک. ژن هێشتا بەلای ئەوەوە بوونەوەرێکی پڕ لە ڕاز و نهێنی بوو و تووشی دردۆنگی و پەشوکاویی دەکرد.

پرنسسی خۆشەویستی کە ناوی ماری و بە میسی بە ناو بانگ بوو، لە تۆرەمەی شازادەکان بوو. کە شمونەشم و قسە کردن و پێکەنین و خوڵقوخووی وەک شازادەکان دەچوو: بە باشی لە نۆخلیدۆڤ تێ دەگەیی و ڕێزی بۆ دادەنا. نۆخلیدۆڤ وتە و ڕەفتاری ئەوی بە دڵ بوو و پەسنی دەدا. تەنیا نیگەرانی ئەو ئەوەبوو کە شاکچی بیست و حەوت ساڵان لەوانەیە بەر لە ئەو دڵی بە پیاوێکی دیکەوە بووبێ. غیرەتی پیاوانەی ڕێگای پێ نەدەدا کە هاوسەرەکەی کەسێکی دیکەی خۆش بوێ. یانی باشتر نەبوو کچێکی کەم تەمەنتر بۆ هاسەری هەڵبژێرێ، بۆ ئەوەی لە ڕابردووی ژیانی دڵنیا بێ؟ هۆکاری ڕازی و دژواز پێکەوە یەکسان بوون و دانوویان پێکەوە نەدەکوڵا.

نۆخلیـدۆڤ چیرۆکـی گوێـدرێژەکەی[6] بوریـدانی وەبیرهـاتەوە و پێکەنـی. نەیدەزانی چبکا؛ زەماوەند بکات یان نەیکات؟ بڕیاردان هەروا ئاسان نەبوو.

بەخۆی دەسەلماند کە هەتا ئەو کاتەی ماریا ڤاسیلیڤنا هاوسەری مارشاڵ وەڵامـی نەداتەوە و بە شـێوەی فەرمـی پێوەنـدیی لەگەڵ نەپسـێنێ، نـابێ لە زەماوەند کردن پەلە بکا. بەرژەوەندیی لەوەدا دەدی کە جارێ دەست ڕاگرێ و ئەمڕۆ و سبەینێ بکات و دەوروبەرییەکانی چاوەڕوان و هیوادار ڕاگرێ!

فـاتوونەکە بە تـایەی جیـرەوە، بە بـێ تەقوکـوت بەسـەر سەنگفەرۆشـی شەقامدا دەڕۆیشت و هیچ کەس نەیدەزانی مێشکی نۆخلیدۆڤ چیی تێدایە و بیر لە چی دەکاتەوە. کاتێک گەیشتە بەر بینـای خـانەی داد، بیری عەشق و زەماوەندی وەلانا. «ئێستا کاتی کارێکی جیددتیرە! دەبێ لە لیژنەی داوەریدا لە ڕووی ویـژدانەوە بیـروڕای خـۆم دەربـڕم. پێمـوایە ئەمـڕۆ لە دادگـا ڕووداوێکـی سـەیر و سـەرنج ڕاکـێش دەبیـنم.» لە فەتیـوونەکە دابەزی و ڕۆیشت بۆ نێو بینای خانەی دادگا.

6 ـ Buridan بیرمەنـدی فەڕەنسـی سـەدەی چـواردەهەم. بـۆ نوانـدی دوودڵیـی فەلسـەفی، کەرێک بـۆ نمـوونە دێنێـتەوە کە بەیەک ڕادە برسـی و تینـووە. سـەتڵێک ئـاو و تـوورەکەیەک جۆی لە یەک کاتدا لە دوو لاوە بۆ دادەنێن نازانێ کامیان هەڵبژێرێ و بۆ کام لا بڕوا!

# پێنج

کاتێک نۆخلیدۆڤ چووە نێو بینای خانەی دادگاوە، دالانەکان پڕ بوون لە خەڵک و جمەی دەهات. پێشخزمەت و فەرمانبەرانی خانەی داد، هەر کام بە باوەشێک فایل و پەروەندە و حوکم و نامەی ئیدارییەوە، دەهاتن و دەچوون. تاقمێک بە پەلە و هەڵەداوان و هێندێ کەسیش تاقەتیان نەبوو هەنگاو هەڵێننەوە و لاقیان لە عەرزی دەخشاند. پارێزەر و دادپرس و دادیار و کارڕێکخەرەکان هەرکام لە سووچ و قوژبنێک خۆیان خافڵاندبوو. دادیاران و ستەمکاران، بێ تاوان و تاوانباران شان بە شانی یەک دەڕۆیشتن یان لە سەر کورسییەکان چاوەڕوان دانیشتبوون. نۆخلیدۆڤ ژووری دادگاییکردنەکەی لە پێشخزمەتێک پرسی.

ـ چ دادگایەک؟ یاسایی یان تاوانەکان؟

ـ من لە لێژنەی داوەری دام.

ـ کەوایە دەبێ بچی بۆ دادگای تاوانەکان... بە دەستە ڕاستدا برۆ، پاشان بای دەوە بۆ لای چەپ، دەرگای دووهەم.

لەبەر دەرگاکە دوو کەس لە ئەندامانی لێژنەی داوەری ڕاوەستا بوون. یەکێک لەوان بازەرگانێکی کەڵەگەت و ڕووخۆش و قەڵەو بوو. دیار بوو بەیانی تێروپڕی نان و مەشرووب خواردووە و شاد و کەیفخۆشە. دووهەمی

جووڵەکە بوو و حیسابداری بازەرگانییەک. خەریک بوون باسی نرخی خورییان دەکرد. کاتێک بازەرگانی مەشرەف خۆش بۆی دەرکەوت کۆنتی ئەندامی لێژنەی داوەرییە، بە دەستی نەرم و گۆشتنی دەستی ئەوی گوشی.

ـ بەخێر بێی، شادین بە بینینت! وادیارە تەنیا ئێمە نیین کەوتووینە نێو ئاورەوە. منیش بچووکی ئێوە باکلاشۆڤی بازرگانم و ئەندامی یەکێتیی خاوەنکاران. تکایە ئێوەش ناوی بە ڕێزتان بفەرموون.

دوای ئەو ناسیارییە، هەرسێکیان پێکەوە چوونە ژووری لێژنەی داوەری. ئەندامانی لێژنەی داوەری هەموویان هاتبوون. جگە لە یەکیان کە جلوبەرگی سەربازیی لەبەرکردبوو، ئەوانی دیکە هەموویان جلوبەرکی ئاساییان لەبەردابوو، هێندێکیان دڵەدوای کار و کەسپەکەیان بوون، هێندێکیشیان بە دڵ پێیان خۆشبوو بۆ بە شداریکردن لە بیروڕادەربڕینێکی ئاوا گرنیگ بانگێشتن کراون. چەند کەسیان کە یەکتریان دەناسی، پێکەوە سەری قسەیان کردبۆوە. باسی بەهاری زوو ڕەس و بارودۆخی کەسپوکاری خۆیان دەکرد. نۆخلیدۆڤ چاوەڕوان بوو هەموویان لە دەوری ئەو کۆببنەوە و ڕێزی بۆ دانێن. خۆی لەوانی دیکە بە زیاتر دەزانی و پێی وابوو بۆ هەمووان شانازییەکی گەورەیە کە لەگەڵ کەسایەتییەکی باڵای وەک ئەو هەستن و دانیشن. بەڵام ئەگەر کەسێک لێی بپرسیبایە بۆچی خۆت لە خەڵک بە زیاتر دەزانی، وەڵامێکی ئەوتۆی نەبوو ئەو قەناعەتە بە بەرانبەرەکەی بێنێ. لە تەواوی ماوەی تەمەنیدا کارێکی بەرچاوی ئەنجام نەدابوو؛ تەنیا شانازی ئەوە بوو کە دەیتوانی زۆر بە باشی بە زمانی فەڕەنسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی قسە بکات. جلوبەرگ و بۆینباخ و قۆپچەکانی سەر قۆلی باش و گرانبایی بوون. بۆیە پێی وابوو هەر ئەو شتانە بۆ جیاوازیی ئەو بەسن و

ئەگەر بە ئاستەم بیزانیبایە کەسێک دەیهەوێ کەسایەتی بەرزی ئەو بە کەم بزانێ، لە ڕێوە هەڵدەچوو.

لەو تاقمەدا تەنیا کەسێک ئەوی دەناسی؛ کە ناوی پیتێر گراسیمۆڤیچ یان شتێیەکی لەو شێوەیە بوو. قەتیش ئەو پیاوەی بە شیاوی ئەوە نەزانیبوو کە ناوەکەی فێر بێ. ئەو چەند ساڵ لەمەوبەر مامۆستای خوشکەزاکانی کۆنت نۆخلیدۆڤ بووە و ئێستا لە قوتابخانەی دواناوەندیی وەرزش مامۆستا بوو. گراسیمۆڤیچ کە بە پێی خووخدە لەگەڵ هەموو کەس خۆمانە قسەی دەکرد، کاتێک چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوت، هات بۆلای.

ـ دیمانەت بەخێر، یانی ئەوە تۆی؟ کەوایە تۆش کلکت بە تەڵەوە بووە؛ بەڕاستی چاک پێوە بووین.

کۆنت نۆخلیدۆڤ گرژ بوو.

ـ گرینگ نییە؛ ئەمە خۆی جۆرێک ئەرکە! گراسیمۆڤیچ دای لە قاقای پێکەنین.

ـ ئەرک! ئەرک! ئەو قسە قۆڕە! برسییەتی و بێ خەویت نەکێشاوە کە ئەرکت لە بیر بچێتەوە!

گراسیۆڤیچ هەروا پێدەکەنی و نۆخلیدۆڤ نەیدەویست لەوە زیاتر دەم بنێتە دەمی و لێی دوور کەوتەوە. چەند کەس لە نەدامانی لێژنەکە لە دەوری پیاوێکی کەڵەگەت و تەڕپۆش کۆ بوو بوونەوە و ئەویش بە گوڕوتینێکی تایبەتەوە باسی وردەکاریی پەروەندەیەکی دەکرد کە ئەو ڕۆژە بڕیار بوو لە دادگا لێی بکۆڵنەوە. وەک قازییەکی کارامە یان پارێزەرێکی شارەزا قسەی دەکرد. دەتگوت ئەو تەنیا کەسێکە لەو ڕووداوە ئاگادارە. ئەوانی دیکە نەیان دەزانی ئەو ڕۆژە چ کەسانێک لە سەر کورسیی تۆمەت دادەنیشن. نۆخلیدۆڤ ئەگەر چی لە هەمووان درەنگتر هاتبوو، دیسان ناچار بوو ماوەیەک ڕاوەستێ هەتا دانیشتنی دادگا دەست پێدەکا؛ چونکە یەکێک لە قازییەکانی دادگا نەهاتبوو.

# شەش

سەرۆکی دادگا زۆر زوو گەیشتبووە دادگا. پیاوێکی کەڵەگەت و قەڵەو و مووی لاڕوومەتی ماشوبرنجی بوو. ئەگەرچی ژنی هەبوو بەڵام دڵتەڕ و تۆلاز بوو، ژنەکەشی لە خۆی دڵتەڕتر؛ هەردووکیان ئاگایان لە کاری یەکتر بوو بەڵام ڕێگایان لە یەکتر نەدەگرت. بەیانیی ئەو ڕۆژە جوانە ژنێکی سویسی پەیامی بۆ ناردبوو: «بەرەو پترزبۆرگ دەڕۆیشتم و لێرە لام دا، لە کاتژمێر سێ هەتا شەشی دوانیوەڕۆ لە هوتێل ئیتالیا چاوەڕوانت دەبم.» ئەم ژنە کلارا پەرستاری سویسی بوو. کە هاوینی ساڵی ڕابردووی لەگەڵ ئەوان ڕابواردبوو. ئێستاش سەرۆکی دادگا لە بیری ئەوەدابوو ئەمڕۆ زووتر بۆ دانیشتنی دادگا دەستبەکار بێت و بە پەلە تەواوی بکات، بۆ ئەوەی لە کاتی خۆیدا بگاتە لای ئەو شەنگەژنە مێهرەبان و قژ خەنییە و ئەشقە گەرموگوڕەکەی هاوینی ڕابردوو سەر لە نوێ بژیێنێتەوە.

سەرۆکی دادگا بە پێی خدەی هەموو ڕۆژێکی، دەرگای ژوورەکەی لە نێوەوە داخستبوو و دەمبێلەکانی لە چەکمەجەی مێزەکەی دەرهێنا بوو و بەبێ ڕاوەستان دەستی کردبوو بە وەرزش. بیست جار بۆ سەرێ، بیست جار بۆ خوارێ، پاشان سێ جار دانیشت و هەستایەوە. لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە هیچ شتێک بەقەد حەمامی ئاو و وەرزش بۆ لەباریی ئەندام و

لەشساغی بەقازانج نییە. چەند جار بە دەمبێلەکانەوە بە توندی بە دەوری خۆیدا هەڵسوورا. کەسێک لە دەرگای دا و بەپەلە دەمبێلەکانی خستەوە نێو چەکمەجەکە و دەرگاکەی کردەوە.

ـ ببوورە جەنابی سەرۆک!

یەکێک لە قازییەکان بوو. وردیلە و چاویلکە لە چاو؛ کاتژمێرێکی ئاڵتوونی لە دەستدا بوو، ئاڵەتی و بێ تاقەتی دەنواند.

ـ ماتڤێ نیکیتیچ دیسان وەدرەنگ کەوتووە؟

ـ ئەوە هەر کاری ئەمڕۆی نییە. هەتا کۆتایی تەمەنی هەروا دەبێ.

قازی بە تووڕەیی دانیشت و قوتووی جگەرەکەی دەرهێنا.

ـ بەڵێ جەنابی سەرۆک، وەدرەنگ دەکەوێ و خەجاڵەتیش ناکێشێ.

قازی بە ڕواڵەت پیاوێکی ڕێکوپێک بوو. بەیانیی ئەو ڕۆژە لەگەڵ ژنەکەی کێشەیان لێ پەیدا بووبوو. ژنەکەی هەر سەرەتای مانگ مووچەکەی شینخۆر کردبوو و هەڕەشەشی کردبوو کە «ئەمڕۆ و شەوێ چاوی بە فراوێن و شێو ناکەوێ!» ئەویش لە وڵامدا گوڕاندبووی: «بەڵێ! هەر ئەوەیە ئاکامی تەمەنێک ئارەق ڕشتن و ژیانی شەرافەتمەندانە!» ئێستاش کە سەرۆکی دادگای لە هەمبەر خۆیدا دەدی کە لەش ساغ و ڕووخۆش، دەستە سپیوسۆڵ و نەرمەکانی لە سەر مێزەکە داناوە، داخی لێ دەهات. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەرێ! ئەم پیاوە هەمیشە شاد و دڵخۆشە، منیش بەردەوام دەبێ داخ و دیق لە دڵمدا بێ و زووخاوی ڕەش هەڵێنم!»

نووسیاری دادگا هاتە ژوورێ و پەروەندەی ئەو ڕۆژەی لە سەر مێزی سەرۆک دانا. سەرۆک جگەرەیەکی داگیرساند.

ـــ سپاس. بە بڕوای ئێوە کە پەروەندەکەتان خوێندۆتەوە مەبەستی سەرەکی چییە؟

- بەبڕوای من دەرمانداو کردن بە مەبەستی کوشتن دەسپێکێکی باشە.

سەرۆکی دادگا بیری کردەوە، ئەگەر بەم شێوەیە بڕواتە پێشێ دانیشتنەکە بەر لە کاتژمێر چوار کۆتایی پێ دێ و لە کاتی خۆیدا دەگاتە لای کلارای جوان و نازەنین.

- بەڵێ. ئاوا باشترە. خەبەرتان لە ماتڤی نیکیتیچ هەیە؟

- هێشتا هیچ هەواڵێکمان پێ نەگەیشتووە!

- بێرێوە هاتووە؟

- بەڵێ، ئاغای بێرێوە لێرەیە.

- لە زمانی منەوە بە بێرێوە بڵێن بە باس و لێکۆڵینەوە لە سەر دەرمانداو کردن دەست پێدەکەین.

بێرێوە دادوەری لێکۆڵینەوە بوو و دەبوو بەرگری لە سکاڵانامەکە بکا. نووسیار کاتێک لە ژووری سەرۆک هاتە دەرێ، لووتی بە لووتی ئەودا تەقی. سەری بە خوزداگرتبوو و هێشتا دەرفەتی نەکردبوو قۆپچەی جلە فەرمییەکانی دابخا. جانتایەکی گەورەی نابووە بن باخەڵی و بەهەڵەداوان دەڕۆیشت.

- سەرۆکی دادگاه دەیهەوێ بزانێ ئێوە ئامادەن؟

- من هەمیشە ئامادەم. دیارییان کردووە بابەتەکە لە سەر چی دەبێ؟

- کوشتن بە هۆی دەرمانداو کردن.

- زۆرباشە.

دادوەر وشەی «زۆرباشە»ی بەدەمدا هات بەڵام بیروباوەڕی وا نەبوو و هێشتا مێشکی بە باشی کاری نەدەکرد، چونکە شەوی ڕابردوو چاوی لە سەر یەک دانەنابوو. لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دێرین کۆبوبوونەوە، شەرابیان خواردبۆوە و قوماریان کردبوو. کاتژمێر دووی نیوە شەویش چوو بوون بۆ

خانەی لەشفرۆشان. ـ ئەو شوێنەی کە هەتا شەش مانگ لەمەوبەر ماسلۆڤا لەوێ کاری دەکرد. ـ تەنانەت دەرفەتی ئەوی نەبووبوو جارێک پەروندەکە بخوێنێتەوە و ئێستا دەیویست بەرلە دەست پێکردنی دادگا، چاوێک بەو سکالانامەیەدا بخشێنێ، کە یەکێک لە یاریدەدرەکانی ئامادەی کردبوو. نووسیاری دادگا لەوە ئاگادار بوو و بە ئانقەست پێشنیاری کردبوو کە سەرەتا بە لێکۆڵینەوە لە سەر دەرمانداو کردن دەست پێ بکەن و بەو شێوەیە هەمووان بخاتە داوەوە. ئەم پیاوە لە لیبراڵەکان بوو و هەوڵی دەدا پلەوپایەیەکی گرینگ بە دەست بێنێ. بەڵام پارێزەر بە پێچەوانە لە خۆپارێزە کۆنەپەرستەکان بوو. وەکوو تەواوی ئەو ئەڵمانییانەش کە لە دامودەزگای ڕووسەکان کاریان دەکرد، دەمارگر و سەختگیر بوو.

ـ جەنابی دادوەر! بۆ پەروەندەی سکۆپتسییەکان[7] چ بڕیارێک دەدەن؟

ـ چەند جارم گوتووە کە نامەوێ دوور لە چاوی شاهیدان پەروەندەکەم ببەم بۆ دادگا.

ـ پێموا نییە شاهید پێویست بێ.

ـ وا نییە. من ئامادەم لە هەموو دادگایەک قسەی خۆم بسەلمێنم.

دادوەر بە ئانقەست پەروەندەی سکۆپتسییەکانی دەخستە دواوە و بیانووی ئەوەی دێنایەوە کە شاهیدان گوێڕایەڵی ئەو نین. دڵنیا بوو ئەگەر ئەم پەروندەیە لە دادگایەک و لە هەنتەشی لێژنەی داوەرانی ڕوناکبیردا بێتە ئاراوە، فحێڵ بوونی تۆمەتبارانی لێ دەکەوێتەوە. بەم شێوەیە لەگەڵ

7 ـ Skoptsy تاقمێک بوون کە کۆمەڵگایان بە گەندەڵ دەزانی و نەیادەهێشت توویان لێ بکەوێتەوە و منداڵەکانیان بێنە نێو کۆمەڵگایەکی ئەوتۆوە. لەو سەر دەمەدا ئەندامانی ئەو دەستەیە کە بەو شێوەیە لەگەڵ گەندەڵیی کۆمڵگا بەربەرەکانێیان دەکرد، قۆڵبەست کران و سزا دران.

سـەرۆکی دادگـا ڕاوێـژی کـرد بـوو و بەو ئاکـامە گەیشـتبوون کە ئەم پەروەندەیە بنێرن بۆ یەکێک لە شارە دوورەدەستەکان تاکوو لە هەنتەشی لێژنەی داوەرانی پێکهاتوو لە وەرزێڕانی دەمارگژ، حوکمەکەیان بۆ دەرچێ.

نێـو دالانەکـان ژاوەژاوی دەهـات و قەرەبـالغ بـوو. لە بەر دادگـای مـاف تاقمێک کۆ بووبوونەوە و بەسەرسوورمانەوە چاویان لە پیرێژنێک دەکرد کە بە پێی حوکمی دادگا تەواوی بوون و سامانی خۆی لە دەست دابوو. گوایە کەسێک دیعایەی کرد بوو کە ماڵ و سامانی ئەو پیرێژنە سەرلەبەری هی ئەوە و پـارێزەری بە توانـا و لێـزان، بە وەرگرتنـی دەهەزار ڕۆبـڵ و بە هێنانەوەی بەڵگەی قایم و مەحکەمە پەسەند، بەرهەق بوونی بریگرتەی خۆی سەلماندبوو. قازییەکانی دادگـا دەیـانزانی هەقـی بەدەسـت نییە و دیعـایەی بریگرتەکەشـی بـێ بنەمـایە، بەڵام لە هەمـبەر مەنتـق و بەڵگەهێنـانەوەی بـێ وێـنەی ئەم پـارێزەرەدا، کەوای دەنوانـد قسـەی تێـدا نەبـوو، بە قـازانجی بریگـرتەکەی ئەو دەنگیـان دابـوو. دوای کۆتـایی هـاتنی دادپرسـی، پیرێـژنەکە کڵاوێکـی گوڵـداری لە سـەر کردبـوو، کـاس و واق وڕمـاو پرسـیاری لە پارێزەرەکەی خۆی دەکرد. دیار بوو هێشتا تێنەگەیشتووە چ قوڕێکیان بۆ گرتـۆتەوە. پـارێزەرەکەی چـاوی لە گـوڵی کـڵاوەکەی دەکـرد و قسـەی بـێ سـەرەوبەرەی دەکرد کە زیاتری تووشـی سەرسووڕمان دەکرد. تاقمێک لە دەوری پارێزەری سـەرکەوتوو کۆ بـوو بـوونەوە کە ئـاوا شـارەزایانە هەقـی پامـاڵ کردبـوو و هەموویـان ئافەرەنیـان بەو لێـزاینییە بـێ وێـنەیەی دەگوت.هەموویـان بە چـاوی ڕێـزەوە لە پارێزگـاری بـێ وێـنە و بریگـرتە بەختەوەرەکەیـان دەڕوانـی؛ بەڵام هـیچ کەس ئـاوڕی لەو پیرێـژنە بێچـارەیە نەدایەوە کە بە ناهەق تەواوی هەیی و سامانەکەی لە دەست دابوو.

# حەوت

دوای ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی، ماتڤێ نیکیتیچ هات. فەرمانبەری بەشی چاوەدێریی دادگاشی لەگەڵدا بوو، ئەو پیاوێکی داڵگۆشتی مل درێژ و لچ شۆڕ، زۆر کارقایم و دروستکار بوو. خاوەنی بڕوانامەی باڵای زانکۆ بوو. هێندێ جار لە خواردنەوەدا زێدەڕەویی دەکرد، هەر بەو هۆیەشەوە هیچ کارێکی بۆ مسۆگەر نەدەبوو. سێ مانگ لەمەوبەر لە سەر داوای کۆنتسێکی دەسترۆیشتوو کە نێوانێکی گەرموگوڕی لەگەڵ ژنەکەی هەبوو، توانیبوی ببێتە فەرمانبەری بەشی چاوەدێریی دادگا. ئەو ڕۆژە هەر ئەو بوو چوو بۆ لای لێژنەی داوەران تاکوو لە ئامادەبوونیان دڵنیا بێ. سەرەتا تۆزێ چاویلکەکەی ئەمبارەوبار کرد. بازرگانی خۆشمەشرەف قسەی خۆشی دەکرد و بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ هەمووان ئامادەن، هیچ کەس غایب نییە.

ـ لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگام پێ بدەن ناوی بەڕێزان لە ڕووی کاغەزەوە بخوێنمەوە.

ناو و پیشەی هەر کەسێکی دەخوێندەوە لە ژوور چاویلکەکەیەوە تێی دەڕوانی.

ـ ئاغای نیکیفۆرۆڤ! کارمەندی پایەبەرزی وڵات.

ـ لێرەم.

ڕواڵەتێکی مەند و ماقووڵی هەبوو، لە کاروباری ماف و بەڕێوەبەرایەتیدا خاوەن بیروڕا بوو.

ـ سەرهەنگی خانەنشین، بەڕێز ئیڤان سیمنۆڤیچ ئیڤانۆڤ.

ـ ئامادەم!

لاواز و بەلەباریکە و جلوبەرگی سەربازیی لەبەردا بوو.

ـ پیتێر باکلاشۆڤ، بازرگان، ئەندامی یەکتێیی خاونکاران!

ـ لە دەورت گەڕێم، منیش حازر و ئامادەم!

ـ ئەفسەری گارد، کۆنت دیمیتری نۆخلیدۆڤ!

ـ لێرەم!

چاوەدێر لە ژوور چاویلکەکەی و بەڕێزەوە چاوێکی لێ کرد و سەری داخست.

ـ ملازم یووری دیمیتریۆڤیچ دانچنکۆڤ! گریگۆری ئەفیمۆریچ کۆلچۆڤ، بازرگان! بەم شێوەیە هەموو ناوەکانی خوێندەوە. تەنیا دووکەس نەهاتبوون.

ـ ئێستا بەڕێزان فەرموون بۆ هۆڵی دادگا!

هەموو هەستانە سەرپێ. لەبەر دەرگاکە فەرمووی یەکتریان کرد. لە دالانێکەوە تێپەڕین و گەیشتنە هۆڵی دادگا. هۆڵێکی گەورە و پڕشکۆ بوو. جێگەی سەرۆکی دادگا و قازییەکان سێ پللە لە تەرکی هۆڵەکە بەرزتر بوو: لەم شوێنە میزێکی گەورەیان دانابوو، ڕوو مێزییەکی مەیلەوسەوزیان بەسەردا کێشابوو کە پەراوێزەکانی تۆخ بوو. سێ کورسی لە پشت مێزەکە بوون کە دەسکەکانیان پڕ لە نەخشونیگار بوو، ئەو کورسییانە لە داری بەڕوو دروست کرابوون. لە لای سەرووی ئەو شوێنە وێنەی سەرتاپای ئیمپڕاتۆر هەڵواسرا بوو، جلوبەرگی فەرمیی لەبەردا بوو بە حەمایلی سێنت

ئاندریوە، قاچێکی هێنابووە پێشێ و دەستی لە سەر مشتووی شمشێرەکەی دانابوو. لە سووچی ڕاستی هۆڵەکە وێنەی حەزرەتی مەسیح بە تاجی مشارە دارەوە بەرچاو دەکەوت. جێگای قازی لەلای ڕاست و جێگای نووسیاری دادگا لەلای دەستە چەپی شوێنەکە هەڵکەوتبوو. شوێنی تۆمەتباران لە سووچێک بەلاجامە لە شوێنەکانی دیکە جیا کرابۆوە. لە سەر قاڵدرمەکانی لای ڕاست، دوو ڕیزیان کورسی بۆ لێژنەی داوەران دانابوو. کورسیی پارێزەرەکان زۆر لەوانەوە دوور نەبوون.

بە لاجامەیەکی دارین جێگای تەماشاچییەکان لە بەشەکەی تر جیا کرابۆوە. لە سەر کورسییەکانی ڕیزی یەکەم چوارژن و دوو پیاو دانیشتبوون کە بە ڕواڵەت لە خزمەتکار یان کرێکار دەچوون، بە سەر سوورمانەوە چاویان بە دارودیواری ئەو تالارە پڕشکۆیەدا دەگێڕا و بە سرتە قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد. چەند خولەک دوای هاتنە ژووری لێژنەی داوەران، کارگێڕی چاوەدێری بە دەنگێکی بەرز و فەرمان پێدەرانە دەسپێکی کۆڕەکەی ڕاگەیاند.

هەموو ئامادە بووان بۆ ڕێزگرتن لە هاتنی قازییەکان ئاخێزیان کرد. لە پێش هەموویانەوە سەرۆکی دادگا هاتە ژوورێ کە قەڵافەتێکی تێکسمڕاوی هەبوو، قژە ماشوبرنجییەکەشی لە سەر لاڕوومەتی لێوە شاوەییەکی تایبەتی پێوە دیار بوو. بە دوای ئەویشدا دوو قازیی تر هاتنە ژوورێ. قازیی ئاڵەتی کە چاویلکەی چوارچێوە زێڕینی لە چاودا بوو، گرژ و تووڕەتری دەنواند. ژنبراکەی کە فێریاری کاروباری ماف بوو، لە نێو داڵانەکە پەیامی خوشکەکەی پێ ڕاگەیاند: «بە هیوای فراوێن و شێو نەبێ.» بە پێکەنینەوە گوتی: «خەم مەخۆ هاوڕێی بەڕێز! ئەمڕۆ پێکەوە لە ڕیستۆرانت نانی نیوەڕۆ دەخۆین.

قازیی مڕومۆچ بەو گاڵتەیەی ئەو زیاتر دڵمەند بوو.

قازییەکەی دیکەش ماتڤی نیکیتیچ بوو کە هەمیشە درەنگ دەهات. چاوی گەورە و ڕیشی پڕوتۆپ بوو. هەمیشە گەدەی دەهێشا. ئەو ڕۆژ سەر لە بەیانی پزیشک پشکنینی بۆ کردبوو و دەرمانی تازەی بۆ نووسیبوو. هەر بەو هۆیەش درەنگتر لە کاتی ئاسایی هاتبوو. ژانی گەدەی هێندەی تووشی فیکر و بیرئالۆزی کردبوو، کاتێک پێی نایە نێو هۆڵی دادگا، بە خەیاڵیدا هات کە لەبەر دەرگاکەوە هەتا شوێنەکەی خۆی، هەنگاوەکانی بژمێرێ. ئەگەر ئەم ژوومارەیە بەسەر ڕەقەمی سێدا دابەش بکرێ، دەرمانی تازەی پزیشک بۆ ئەوە دەبێ دڵی پێ خۆش بکات. بە بیست و شەش هەنگاو گەیشتە شوێنەکەی خۆی. هەنگاوێکی گچکەی دیکەی هەڵێنایەوە و بوو بە بیست و حەوت و بە دڵنیاییەوە لە سەر کورسیی دادوەری دانیشت. بیست و حەوت ژوومارەیەکی پیرۆز بوو، بەسەر سێدا دابەش دەکرا!

سەرۆک و قازییەکانی دادگا بە جلوبەرگی فەرمی و ملیوانەی پەراوێز زێڕینەوە دانیشتبوون و ڕواڵەتێکی زۆر شکۆمەندیان هەبوو. قازییەکان خۆیان زۆریان گوێ بە سەنگینیی ڕواڵەت نەدەدا؛ خاکەڕا و قۆرساخ لە سەر کورسییە خەڕاتی کراوەکان دانیشتبوون. لە سەر مێزە سەوزپۆشەکەی بەر دەمیان هێندێ شت وەبەر چاو دەکەوتن، وەک پەیکەری سێ سەری هەڵۆی ئیمپڕاتووری[8]،دەفرێکی بلووری، چەند قەڵەم و پەڕەمووچ و جەوهەر و پەڕە کاغەزی سپی.

دوای هاتنی قازییەکان، دادیار بە جانتای بن هەنگڵەوە هاتە ژوورێ، لە سەر جێگای خۆی دانیشت و بەبێ خۆگنخاندن پەروەندەکان و لاپەڕەکانی لە جانتاکەی دەرهێنا و لە سەر مێزەکە بڵاوی کردەوە، پاشان دەستی کرد بە

---

8 ـ ئەو پەیکەرەیە ئاوێنەی عەداڵەتیشیان پێدەگوت. لە سەر هەرکام لە سێ نکالی ئەو پەیکەرەیە ڕستەیەکی پێتری مەزن سەبارەت بە مافی کۆمەڵایەتی و عەداڵەت و حکوومەتی یاسا هەڵکەندرا بوو. ئەم پەیکەرەیە بە شێوەیەکی ئاسایی لە سەر مێزی قازییەکان دادەندرا.

خوێنـــدنەوە و ڕێکوپێـــک کردنیـــان. کەڵکـــی لە هەمـــوو کـــات و ســـاتەکانی وەردەگرت تاکوو بۆ مەحکووم کردنی تۆمەتبارەکان ئامادە بێ، چونکە لە سەر ئەو باوەڕە بوو لە هەر دادگایەک کە نوێنەرێکی دادستانی لەگەڵ بێ، تاوانبار و بێ تاوان دەبێ مەحکووم بن!

نووسیاری دادگا بەرەو ڕووی ئەو دانیشتبوو، تەواوی پسووڵە و بەڵگە نامەکانی ئامادە کردبوو کە لە کاتی خۆیدا بینوێنێ و لە ژێر کاغەزەکانیشدا ژومارەیەکی شەونامەی شاردبۆوە کە تازە لە نێو شاردا بڵاو بووبۆوە. نووسەری شەونامەکە ئەو باسەی لە سەر دادیاری بەڕێزی دادگا نووسیبوو و پەتەی خستبووە سەر ئاو و پەردە لە سەر ڕوخساری فێڵاوی و ناپاکی هەڵدابۆوە. نووسیار دەیویست لە کاتێکی لەبار و گونجاودا، شەونامەکە پێشان قازیی ڕیشن بدات کە لە بواری سیاسیدا هاوڕێباز بوون.

## هەشت

سەرۆکی دادگا چاوێکی لە کاغەزەکانی سەر مێزەکە کرد، چەند پرسیاری لە نووسیار و کارگێڕی چاوەدێری کرد و دەستووری دا تۆمەتباران بێنن بۆ بەردەمی دادگا. زۆری پێنەچوو لە سووچی هۆڵەکە دەرگایەک کرایەوە و دوو سەربازی شمشێر بەدەست بە کڵاوخوودەوە، لەپێش سێ تۆمەتبارەوە کە پیاوێک و دوو ژن بوون، هاتنە ژوورێ و چوون بۆ جێگەی تۆمەتباران. پیاوی تۆمەتبار وەرزێرێکی قژخەنەیی خولێرکاوی بوو، عەبایەکی فشوفۆڵی لەبەردا و سەرقۆڵە درێژەکانی بە قامکی ئەستوور و خەریتەی گرتبوو، هەردوو باسکی توند بە خۆیەوە نووساندبوو. لە سەرێکی کورسییە درێژەکە دانیشت تاکوو

جێگـای دوو کەسـەکەی دیـکەش هەبـێ. چـاوی لە سـەرۆکی دادگـا بڕیبـوو. بە هێواشـی لێـوی دەبزوانـد؛ وەک ئەوەی لە بـن لێـوەوە. شـتێک بڵـێ. تۆمەتبـاری دووهەم ژنێـک بـوو تەمەنـی لە چـل سـاڵ زیـاتر بـوو. ئەویـش لە تـۆرەمەی وەزێڕەکـان بـوو، عەبـایەکی فشـی لەبەردا و لەچکەکەی لەبەر ملیـدا تونـد گرێـدا بـوو. سـوورهوول و بـێ مـژۆڵ و بـرۆ بـوو. کاتێـک هـات لە سـەر کورسـییەکە دانیشـێ، چمکی عەبـاکەی لە تەختـەکە گیـرا. بە هێواشـی لە کەلێنی کورسـییەکەی دەرکێشا، هێمن و لە سەرەخۆی دەنوان دو لەوە نەدەچوو پەشێوکابێ.

سێهەمین تۆمەتبـار ماسلۆڤا بـوو. کاتێک پێی نـایە نێو هـۆڵەکەوە، چاوی هەمـوو پیاوەکـان لە سـەر بەژنوبـاڵای گیرسـایەوە. دەموچـاوێکی سـپی و سـەرنج ڕاکێشـی هەبـوو، چـاوە ڕەشـەکانی تروسـکەی دەهـات، مەمـکە قوتەکـانی لە ژێـر عەبـا فشـەکەیەوە دیـار بـوو. تەنـانەت سـەربازە شمشـێر بەدەسـتەکەش نەیـدەتوانی چـاوی لە سـەر هەڵگـرێ و تامەزرۆیـانە چـاوی تێبڕیبـوو. ماسـلۆڤا وەک ئەوەی تـازە تـاوانەکەی خـۆی بـۆ دەرکەوتبـێ، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و چاوی لە پەنجەرەکەی ڕووبەڕوو بڕی.

تۆمەتباران لە جێی خۆیان دانیشتن. سەرۆک ئاماژەی بە نووسیار کرد و تەشریفاتی ئاسایی دەستی پێکرد. سـەرەتا نـاوی ئەندامانی لێژنە داوەرییـان خوێندەوە، بەجێی دوو کەسە ناهاتووەکە کە جێگاکەیان خاڵی بوو، بڕیـار درا دوو ئەندامی جێ نشین بانگ بکەن و ئەگەر ئەو دوو کەسـە بۆ نەهاتنەکەیـان بەڵـگەی ڕوونیـان بە دەسـتەوە نەبـێ، غەرامە بکـرێن. بـۆ هەڵبژاردنـی دوو جێگرەکە، سەرۆک وەک شوعبەدەبازان دەستی لە قۆڵە فشوفۆڵەکەی دەرهێنا و کردی بە نێو دەفرێکی بلووریندا،لە نێو ئەو ناوانەدا کە لە سەر پسوولەیەک نووسرا بوون، دوو نـاوی دەرهێنا و خوێندییەوە. پاشـان قەشـەی بانگ کرد تاکوو ڕێوڕەسمی سوێند خواردن بەڕێوە بەرێ.

قەشـەی پیـر و وردیـلە بە دەموچـاوی پەنەمیـو و کەرکەیەکـی قـاوەییەوە هـات. خاچی زێڕین و نازانم چ نیشانێکی تر بوو، بە ملیدا هەڵیواسیبوو. بە هەنگاوی وردو نەرم ڕۆیشت بۆ سـووچێک کە وێنەی حەزرەتی مەسـیح لەوێ لە سـەر سـێپەکێک داندرا بوو. ئەندامانی لیژنەی داوەری هەستانە سەر پێ و هەموویان چوون بۆ ئەو سووچە. قەشە ماوەی چل و شەش ساڵ بوو بەشێوەی فەرمی لە دادگا خەریکی ئەو کارە بوو. ئەگەر دەستی ئەجەل نەیگلاندبایە سێ چوار ساڵی تر دەگەیشتە پەنجایەمین ساڵی خزمەت کردنی. تازە پلەی ئۆسقۆفیی پێدرا بوو. کلیسا هەر لە سەرەتاوە ئەوی کرد بووە بەر پرس و کاگێڕی ڕێوڕەسمی ئایینیی دادگا. تا ئێستا دەیان کەس لە سەر دەستی ئەودا سوێندیان خواردبوو. زۆر لە کارەکەی ڕازی بوو و شـانازیی پێـوەدەکرد. ئەم ڕووحـانییە ئەرکنـاس و ڕۆحسـووکە لەگەڵ ئەوەی خزمەتی بە کلیسا و دەوڵەت دەکرد، لە کوکردنەوەی ماڵ و سـامانیش غافڵ نەبوو؛ مـاڵێکی گەورەی هەبـوو، هەروەهـا سـی هەزار ڕۆبـل پـارەی نەغد،کە هەمـووی لە مامەڵەی پڕ قازانجدا بۆ سەرمایەگوزاری دانابوو. لەگەڵ ئەوەدا کە خەڵکی بە ئینجیلی پیرۆز سوێند دەدا و داوای لێدەکردن لە هەق و ڕاستی لانەدەن، کەچی چاوپۆشیی لە لادانەکانی خۆی دەکرد. زۆر لە کەسپەکەی خۆی ڕازی بوو، چونکە پیشـەیەکی هەمیشەیی و پڕ داهات بوو. لەگەڵ کەسانی جۆراوجۆر لە هەمـوو چین و تـوێژێکی کۆمەڵگـا ناسـیاویی پەیـدا دەکـرد. لەگەڵ پـارێزەرە کـارامە و لێزانەکـان کەینـوبەینی هەبوو. ئەوانی بە خەڵکی دەناسـاند و دەڵاڵانەی لێ وەردەگرتن. بۆ وێنە، تا ئێسـتا چەنـدین هەزار ڕۆبڵـی لەو پـارێزەرە کـارامەیە وەرگرتبـوو کە ئەمـرۆ پیرێـژنە کـڵاو گوڵدارەکەی مەحکووم کرد و هەموو دارونەدارەکەی لە چنگ دەرهێنا، ئەو پارێزەرە کارامەیەش ئەم گوژمە پارەیەی بە گیان و دڵ پێدابوو؛ چونکە ئەو کـارە بـاش و پڕ داهاتەی بە هۆی جەنابی قەشەوە وەگیر کەوتبوو.

قەشە کاتێک لیژنەی داوەرانی لە تەنیشت خۆی دی، دانەوی و ئەو چەند چڵە مووەی ڕێکوپێک کرد کە بەسەریەوە مابوو و گوتی:

ـ دەستی ڕاستەتان هەڵێنن و قامکەکانتان بەم شێوەیە پێکەوە بنووسێنن!

دەستە گۆشتنەکەی هەڵێنا و دەنگی دەلەرزی. قامکەکانی جۆرێک نووشتاند بۆوە و مشتی قووچاندبوو، دەتگوت شتێکی لە مشتیدا شاردۆتەوە.

ـ من ڕوو لە خودای خۆم دەکەم و سوێند بە ئینجیلی پیرۆز و خاچی ژیانبەخش دەخۆم کە لە هەق و ڕاستی لانەدەم...

گتێکی گرت و ئاماژەی بە یەکێک لە ئەندامانی گەنجی لیژنەکە کرد کە دەستی دانەواندبوو و داوای لێکرد دەستی هەڵێنێ. سەرهەنگی خانەنشین کراو و کارگێڕی پایەبەرزی دەوڵەت و بازرگانی خۆشمەشرەف، بە دەنگی بەرز وشەکانی دەردەبڕی بەڵام ئامادە بووان بەحاڵ گۆییان لە دەنگی دەبوو. هێندێ لە وشەکانیان بە شێوەی داناردانار و بە هێواشی دەردەبڕی و هێندێ جاریش ئەوەندە بە نەرمی و بێ تاقەتی دەریاندەبڕی دەتگوت دۆعا دەخوێنن؛ تەنیا هێندێ جار لە ترسی نارەزایەتیی قەشە وەخۆ دەهاتنەوە و دەنگیان هەڵدەبڕی. هێندێ کەس وەها مشتیان دەقووچاند، دەتگوت دەیانهەوێ ددان بە جەرگی خۆیاندا بنێن و واز لە ڕق و تووڕەیی بێنن. لەو نێوانەدا تەنیا قەشە ڕازی و دڵخۆش بوو، واشی دەنواند کە کارێکی گرینگ و بەکەڵک ئەنجام دەدا. دەنا ئەوانی تر هەرکەس سوێندی دەخوارد، ترسێک دەشکایە دڵی و بە ئاواتەوە بوو لە زووترین کاتدا ئەم ڕێوڕەسمە کۆتایی بێ.

دوای سوێند خواردن سەرۆکی دادگا داوای لە لیژنەی داوەران کرد کە لە نێو خۆیاندا سەرۆکێک هەڵبژێرن. بە پێشنیاری یەکێک لە ئەندامانی لیژنەکە، هەموو دەنگیان دا بە کارگێڕی پایەبەرزی دەوڵەت کە لە کاروباری ئیداری و ماف سەری دەردەچوو و زانیاریی تەواوی هەبوو.

سەرۆکی دادگا بیرورای لیژنەی وەرگرت و هەموویان لە سەر جێگای خۆیان دانیشتن.

بێ ئەوەی سەرۆک زەنگەکە لێ بدا یان کەسێک ئاگادار بکاتەوە، کارەکان بە خێرایی دەچوونە پێشێ و ئەم ڕێکوپێکییە بۆ ئەکتەرانی شانۆکە جێی ڕەزامەندی بوو. هەموویان دڵخۆش بوون کە ئەرکی کۆمەڵایەتیی خۆیان بە وردی و ڕێکوپێکی ئەنجام دەدەن. نۆخلیدۆڤیش هەستی بە ڕەزامەندی دەکرد.

سەرۆکی دادگا بە کورتی ئەرک و بەرپرسایەتیی لیژنەی داوەرانی ڕوونکردەوە. سەرۆک لە کاتی ئاخافتندا، هێندێ جار بۆ لای ڕاست و بڕێ جاریش بۆلای چەپ خۆی خوار دەکردەوە و هێندێ جاریش دەستی لە قەڵەم و کاغەزی سەر مێزەکە وەردەدا.

بەم شێوەیە ئەندامانی لیژنە بۆیان دەرکەوت ئەگەر قسە یان بابەتێکیان هەبێ، دەبێ لە سەر کاغەز بینووسن و بیدەن بە قازییەکان بۆ ئەوەی لە تۆمەتبارەکانی بپرسن. دەبوو بەڵگە و کەلوپەلی تاوان بە وردی هەڵسەنگێنن و تەواوی لایەنەکان لەبەر چاو بگرن. ئەگەر بۆشیان دەرکەوت لەگەڵ هەرکام لە تۆمەتبارەکان خزمایەتی و ناسیاوییان هەیە، لە ئەندام بوون لە لیژنەکە بکشێنەوە و وازی لێ بێنن.

هەموویان بە وردی و ڕێزەوە گوێیان بۆ قسەکانی سەرۆکی دادگا شل کردبوو. بازرگانی خۆشمەشرەف کە دەمی بۆنی مەشرووبی لێ دەهات و دیاربوو بەیانیی ئەم ڕۆژە هەتا ملان خواردوویەتەوە، لە پەستا نزگەرەی دەدا و هەرچی هەوڵی دەدا نەیدەتوانی پێش بە نزگەرەکەی بگرێ.

# نۆ

سەرۆکی دادگا دوای ئەو ئاخافتنە، ڕووی لە تۆمەتبارەکان کرد و گوتی:

ـ سیمۆن کارتی نیکین، هەستە سەر پێ!

سیمۆن هەستا سەر پێ. دیار بوو تووڕە و خەمبارە.

ـ ناوت چییە؟

ـ سیمۆن پێترۆڤ کارتی نیکین.

ـ خەڵکی چ شار و ناوچەیەکی؟

ـ شاری تۆلا. ناحیەی کراپی وین. ناوچەی کۆپیانسک. گوندی بوورکی.

دیار بوو لە پێش دا دەیزانی چ پرسیارێکی لێ دەکرێ و وڵامەکانی لە زینداندا ئامادە کردبوو.

ـ تەمەن؟

ـ سی و سێ ساڵ. لەدایکبووی هەزار و هەشتسەد و...

ـ ئایین؟

ـ ئایینی خەڵکی ڕووسیا؛ ئۆرتۆدۆکس.

ـ ژنت هەیە؟

ـ نا، هێشتا ژنم نەهێناوە.

ـ کەسپ؟

خزمەتکارم لە هوتێلی مۆریتانی.

ـ تا ئێستا کارت کەوتووەتە دادگا؟

ـ نا قوربان. من پێشتر لە...

ـ گوتت کە هیچکات بۆ دادگا بانگ نەکراوی؟

ـ نا گەورەم! سوێند دەخۆم کە هیچکات بانگ نەکراوم.

ــ ڕوونووسی سکالانامەتان بە دەت گەیشتووە؟ دەزانی بۆچی بانگ کراوی بۆ دادگا؟

ـ بەڵێ.

ـ دانیشە!

سەرۆکی دادگا داوای لە دووهەمین تۆمەتبار کرد هەستێتە سەر پێ. بەڵام سیمۆن هەروا لە جێگای خۆی ڕاوەستا بوو.

ـ گوتم دانیشە، سیمۆن کارتی نیکین!

کارتی نیکین جووڵەی نەکرد. چاوە دێر هەڵات بۆلای و دەمی بردە بن گوێی.

ـ دانیشە!

سیمۆن خێرا دانیشت و لە نێو عەبا فشوفۆڵەکەی ڕۆچوو و سەر لە نوێ دەمی کەوتەوەکار، دەتگوت لەگەڵ خۆی قسە دەکا.

تۆمەتباری دووهەم ژنێک بوو بە ناوی بۆچکۆڤا؛ چل و سێ ساڵی تەمەن بوو. لە چینی میش چینکا[9] بوو. پێشخزمەتی هۆتێل مۆریتانی بوو. هیچکات بۆ دادگا بانگ نەکرابوو. ڕوونووسی دادنامەی بە دەست گەیشتبوو. بۆچکۆڤا ڕووهەڵماڵدراوانە و بەدەنگی بەرز وەڵامی دەدایەوە. کاتێک پرسیارەکان تەواوبوون، بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی فەرمانی سەرۆک بێ، لە سەر جێگای خۆی دانیشتەوە.

---

9 ـ لە ڕووسیای کۆن خەڵک بە حەوت چین دابەش دەکران. خانەدانەکان و پیشەسازان، کاسپکاران و بازاڕیان، خان و مووژیک و کریکاران، مشانکا لە چینی کرێکاران بوو.

سـێهەمین تۆمەتبـار ماسـلۆڤا بـوو. کاتێـک نـۆرەی ئەو هـات، بـێ جـووڵە دانشـتبوو. سـەرۆک بە نەرمـی و مێهرەبـانی داوای لێکـرد هەسـتێتە سـەر پـێ. ماسلۆڤا هەستا. بەرزایی سنگی لە بن عەبا فشوفۆڵەکەیەوە دیار بوو. بە ناسکی و نازەوە قسەی دەکرد. چاوە ڕەشە شیرین خێلەکەی، بزەی تێ گەڕابوو.

ـ ناوت چییە؟

ـ پێم دەڵێن نەرمۆڵ گیان!

سـەرۆک دەیویسـت درێـژە بە پرسـیار بـدات. قـازی نێـو چـاوانی گـرژ کـرد و شتێکی چرپاند بە گوێیدا. سەرۆک سەری لەقاند و دیسان ناوەکەی لێ پرسییەوە.

ـ نەرمـۆڵ گیـان خـۆت نـاوت نییە، نـاوی ڕاسـتەقینەت بڵـێ؛ ئەو نـاوەی وا بانگت بە گوێدا دراوە.

ـ پێشتر پێیان دەگوتم کاترین.

نۆخلیـدۆڤ سـەری سـووڕمابوو. لە خـۆی دەپرسـی، ئەم ژنە هەر ئەو کـچە نییە وا لە مـاڵی پوورەکـانی ئاشـنایەتی لەگەڵ پێکهێنـا، فریـوی دا و شـەوێ هەتـا بەیانی لە باوشـی گەرم و نەرمیدا بوو! هەر ئەو کچە نییە کە نیوە خـانم و نیوە خزمەتکـار بـار هـاتبوو و یەکێـک لە پوورەکـانی بـوو بـوو بە دایکەخێـوی؟ نۆخلیـدۆڤ لە ناکـاو هەسـتی کـرد تۆمەتبـاری سـەرەکی خـۆیەتی و لە هەمـبەر دادگادا دانیشتووە. هەستی کرد بۆتە بەرلـۆمەی هەمووان و نـاوی زڕاوە، خەڵکی قـامکی ئامـاژە بـۆ لای ڕادەدێـرن و دەڵـێن ئەو هەر ئەو پیـاوەیە کە وای دەنوانـد ڕاست و بەشەڕەفە، بەڵام ئەو ژنە بەستەزمانەی تووشی ڕۆژە ڕەشی کردووە!

ئەرێ، بە هەڵە نەچووبوو؛ هەرکەس کەسایەتییەکی تـایبەت بە خـۆی هەیە، هەرکەس خاوەنی خدە و ئاکارێکە کە تەنیا تایبەت بە خـۆیەتی و بەس. ڕەنـگ بزرکانی ئەو ژنە هیچ شتێکی نەدەگۆڕی. ئەوەی لە قـووڵایی ڕۆحیدا بـوو، لە لێوانیدا، لە چاوە شیرین خیلەکەیدا، لە سـەر تاپایدا، ڕەنگدانەوەیەکی تـایبەتی

هەبوو. نۆخلیدۆڤ بە ڕوانینێک هەموو شتێکی دیتبوو و هەستی پێکردبوو. سەرۆکی دادگا درێژەی بە پرسیارەکانی دا:

ـ ناوی باوکت؟

ـ من ڕۆڵەی ئەشقم!

ـ بابەخێوت ناوی چبوو؟

ـ میخائیلۆڤ

نۆخلیدۆڤ ئیتر گومانی لە لا نەمابوو کە خۆیەتی.

ـ بە چ ناوێک دەتناسن؟

ـ ماسلۆڤا.

ـ لە کام چینی کۆمەڵگای؟

ـ مشانکا.

ـ ئایین؟

ـ ئۆرتۆدۆکس.

ـ پیشە؟

ـ لە ماڵیک کار دەکەم.

لە چ جۆرە ماڵێک؟

ـ جەنابی سەرۆک! پیاوان ئەو جۆرە ماڵانە زۆر باش شارەزان! چەند کەس دایان لە قاقای پێکەنین. سەرۆکی دادگا بە ئاماژەیەک بێدەنگی کردن. نیگا و بزە و دەموچاوی ماسلۆڤا شتێکی سەیری پێوە دیار بوو کە شوێنی لە سەر ڕۆحی مرۆڤ دادەنا.

ـ چەند جار بۆ دادگا بانگ کراوی؟

ـ تا ئێستا پێم نەناوەتە ئەم جۆرە جێگایانە.

ـ ڕوونووسی سکاڵانامەیان پێداوی؟

- بەڵێ.

دانیشە.

تۆمەتبار بە نازێکەوە داوێنی عەباکەی ڕێکوپێک کرد و بە نەرموونیانی لە جێی خۆی دانیشتەوە. دەستە سپی و ناسکەکانی کرد بە نێو سەر قۆڵە درێژ و دەڵبەکەیدا و هەروا چاوی لە سەرۆک بڕی.

شاهیدان و پزیشک و کارناس لە جێگەی خۆیان و لە نێو تەماشاچیانەوە چاوەڕوانی نۆرەی خۆیان بوون. نووسیاری دادگا هەستا سەر پێ و بە دەنگی بەرز سکاڵانامەکەی خوێندەوە. دوو پیتی«ر» و «ل»ی وەک یەک بێژە دەکرد. ڕاوێژەکەی یەکهاوی و زیاتر وەک ویرەویر دەچوو و بە باشی لێی تێ نەدەگەیشتی. قازییەکان هەر جارەی بەلایەکدا پاڵیان دەدایەوە و هێندێ جارش بۆ پێشەوە دادهاتنەوە. بڕێ جار چاویان دەقووچاند، بڕێ جاریش چاویان هەڵدێنا و بە سەر قسەیان دەکرد. یەکێک لە سەربازەکان، شمشێر بە دەست، تاقەتی بەسەر چوو بوو و باوێشکی دەدا. کارتی نیکین، ئەگەرچی مات و بێ جووڵە دانیشتبوو، دەماری ڕوومەتی دەفڕی. بۆچکۆڤا لووتبەرزانە دانیشتبوو و بە نووکی قامکی سەری خۆی دەخوراند.

ماسلۆڤا هێندێ جار کەمتەرخەم بوو، هێندێ جاریش هەڵدەستا سەر پێ و وەها ئاڵەتی دەبوو چەقۆت لێدایە خوێنی نەدەهات. سوور هەڵدەگەڕا و هەناسەی هەڵدەکێشا، دەستی ڕادەوەشاند و چاوی بە دەوروبەری خۆیدا دەگێڕا. کتوپڕیش هێور دەبۆوە، گوێی بۆ نووسیاری ڕادەگرت، کە هەروا خەریکی خوێندەوەی سکاڵانامەکە بوو.

نۆخلیدۆڤ کە لە ڕیزی یەکەمی ئەندامی لیژنەی داوەری دانیشتبوو، بە چاویلکەی یەکچاوەوە چاوی لە ماسلۆڤا بڕیبوو و تۆفانێکی سەیر هێمنایەتیی ڕۆحی شڵەژاند بوو.

## دە

سکالا نامەیەک کە نووسیاری دادگا دەیخوێندەوە، بەم شێوەیە بوو:
«ڕۆژی هەڤدەهەمی ژانوییەی ساڵی... بازرگانێک بەناوی سملکۆڤ، ئەندامی یەکێتیی خاوەنکاران، خەڵکی گوورکانی سیبیریا، لە هۆتێلی مۆریتانی دەمرێ. پزیشکی یاسا مەرگی ئەو بازرگانە بە هۆی زێدەڕوەوی لە خواردنەوە و ڕاوەستانی دڵ دەزانێ و بەرگەی ناشتنی ناوبراو ئیمزا دەکا. چەند ڕۆژ دوای مەرگی سملکۆڤ، یەکێک لە هاوڕێیان و هاوکارانی ئەو بە ناوی تەمووچین، کاتێک دەیهەوێ بڕوا بۆ پتروگراد و لەوێوە تێدەپەڕێ، لە کۆچی دواییی هاوڕێکەی ئاگادار دەبێ. پێوشۆێنی ڕووداوەکە دەگرێ و کاربەدەستانی یاسا ئاگادار دەکاتەوە کە مەرگی سملکۆڤ جێی گومانە و پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە. بە دوادا چوون و لێکۆڵینەوەی بەر پرسانی یاسا گومانەکەی تەمووچین پێشتڕاست دەکەنەوە و ئێستاش ئەو خاڵانەی کە پێوەندیی بە تۆمەتبارانەوە هەیە بەم شێوەیە ئاڕاستەی دادگای دەکەین:»

«1ـ سملکۆڤ چەند ڕۆژە بەر لە مەرگی بڕی سێ هەزار و هەشتسەد ڕۆبڵی لە حیسابی بانکییەکەی وەرگرتەووە، کەچی تۆمار کردنی هەیی و سامانەکەی لە دوای مردنی دەریدەخات کە تەنیا سێسەد و دوازدە ڕۆبڵ و شازدە کۆپک پارەی بۆ ماوەتەوە.»

«2 ـ سملکۆڤ ڕۆژی پێش مردنەکەی لە خانەی لەشفرۆشان و هوتێل مۆریتانی لەگەڵ کاترین ماسلۆڤا ڕایبواردووە. ئەو ژنە لە سەر داوای خۆی

چـوو بـوو بـۆ ژوورەکەی سـملکۆڤ و لە بەر چـاوی ئـۆفیمی بۆچکۆڤـا و سیمۆن کارتی نیکین، کە هەردووکیـان خزمەتکاری هـوتێلەکە بوون، دەرگـای جانتاکەی کردۆتەوە و خزمەتکارەکان ئەو پارەیەیان بە چاوی خۆیـان لە نێو جانتای ناوبراودا دیتووە.»

«3 ـ لێکۆڵینەوەکـان دەریـدەخات کە دوای ڕۆیشـتنی سملکۆڤ لە خـانەی لەشفرۆشانەوە بۆ هوتێل، کاترین ماسلۆڤا بە هاوکاری سیمۆن کارتی نیکین، گەردەیەکی سپیی کردۆتە نێو مەشرووبی سملکۆوەوە و دەرخواردی داوە.»

«4ـ ڕۆژێ دوای مەرگـی بازرگـان، کـاترین ماسـلۆڤا ئەنگوسـتیلەیەکی ئەڵماسی بە خاتوونی خاوەنکاری فرۆشتووە و گووتوویە سملکۆڤ بە دیاری پێی داوە.»

«5 ـ ئۆفیمی بۆچکوڤـا، کە یەکێک لە تۆمەتبـارانە، ڕۆژێک دوای مردنـی سـملکۆڤ بڕی هەزار و هەشتسـەد ڕۆبڵ دەخـاتە سـەر حیسـابی بـانکییەکەی خۆی.»

« داوی بە دەست هێنانی ئەم بەڵگانە، یاسا دەسـتووری هەڵدانەوەی گۆڕ و تویکـاریی ئەنـدامی ناوبراویـان دەرکـرد، لە کـاتی توێکاریـدا دەرکەت کە گەدەی مـردووەکە بـڕە ژراێکـی تێـدایە کە بـۆ کوشـتنی ئەوە بەسـندەی کردووە.»

«لە کـاتی لێپێچـنەوەدا، بۆچکۆڤـا و کـارتی نیکـین تاونەکەیـان لە ئەسـتۆ نەگرتـووە. ماسـلۆڤاش گووتـوویەتی لە سـەر داوای سـملکۆڤ، چـووە بـۆ هـوتێلی مۆریتـانی و لەبەر چـاوی دوو خزمەتکـارەکە دەرگـای جانتـاکەی کردۆتەوە، چل ڕۆبڵی لێ دەرهێنـاوە و ئیتر دەستی بۆ پاشماوەی پارەکە نەبردووە. ماسلۆڤا حاشا لە دەرمانداو کردنی سملکۆڤ دەکا و دەڵێ کاتێک چووە بۆ هوتێلەکە، لە سەر داوای کارتی نیکین گەردەیەکی سپی کە گوتوویە

دەرمانی خەوە، کردوویەتە نێو مەشرووبی سملکۆڤەە بۆ ئەوەی هێور بێتەوە و زۆری ئـازار نەدا، سـەبارەت بە ئەنگوسـتیلە ئەڵماسـەکەش گوتـوویە کە سملکۆڤ لە داوی لێدان و ئازاردانێکی زۆر، بۆ ئاشتی و دڵدانەوە بە دیاری پێی داوە.»

«ئۆفیێمی بۆچکۆڤا گوتوویەتی لە پارەی نێو جانتاکە ئاگادار نەبووە و تەنـانەت پێـی نەنـاوەتە نێـو ژووری بازرگـانەکەوە. ماسلۆڤاشـی تۆمەتبـار کردووە کە کلیلی جانتاکەی پێ بووە و تەواوی پارەکەی دزیوە.»

ماسـلۆڤا کاتێـک ئەوەی بیسـت، لە جێـی خـۆی هەسـتا و بە دەمـی داچەقاوەوە، بەسەرسامی چاوی لە بۆچکۆڤا بڕی کە لە پاڵیدا دانیشتبوو.

«ئۆفیێمی بۆچکۆڤا لە سـەر ئەوە پێداگری دەکـا کە ئەو هەزار و هەشتسـەد ڕۆبڵەی دوای ئەو ڕووداوە خستوویەتە سـەر حیسـابی بانکییەکەی، پاشـەکەوتی چەندین ساڵ زەحمەت و کاری بێ وچانی خۆی و کارتی نکین بووە.»

« بەڵام سیمۆن کارتی نیکین لە لێپێچینەوەی سەرەتاییدا دانی پێداناوە کە ماسلۆڤا، ئەو و ئۆفیێمی بۆچکۆڤای بۆ ئەو دزییە هـان داوە و پارەکەیـان لە نێـوان خۆیانـدا دابەش کـردووە، دانـی بەوەشـدا نـاوە کە ئەو دەرمـانی خەوهێنەری داوە بە ماسلۆڤا کە بیکاتە نێو خواردنەوەی بازرگانەکەوە.»

ماسلۆڤا دیسان لە جێی خۆی ڕاپەڕی. سوورهەڵگەڕابوو! دەیویست قسە بکات بەڵام چاوەدێر نەیهێشت و داوای لێکرد ئارام و بێدەنگ لەجێی خۆی دانیشێ.

«لە لێپێچینەوەکانی دواییدا، کارتی نیکین نکوولی لە هەموو شتێک دەکات. حاشـا لە دزی و بەشـداری کـردن لە کوشـتنەکەدا دەکـات و وەک ئـۆفیێمی بۆچکۆڤـا پێـداگری دەکـات کە ئەو هەزار و هەشتسـەد ڕۆبـڵە، دەسـتڕنجی چەنـدین سـاڵ کـار و زەحـمەت بـووە و میوانـانی هوتێل وەک دەستخوشـانە پێیان داون، پاشەکەوتیان کردووە و دەیانهەوێ پێکەوە زەماوند بکەن.»

دوای ئەم قسـانە، چـۆنیەتی بەرەوڕووو کـردنەوەی تۆمەتبـاران و سـوێند خـوادنی شـاهیدەکان و بیـروڕای کارناسـان، بە وردی بـاس کـرا بـوو: «لە لێپێچینەوە و لێکۆلینەوە و بەڵگەکاندا کە ئاڕاستەی دادگا کرا، وا دەردەکەوێ سیمۆن کارتی نیکین سی و سێ ساڵان و ئۆفێمی بۆچکۆڤا چل و سێ ساڵان و کـاترین ماسـلۆڤا بیسـت و حەوت سـاڵان، ڕۆژی حەڤـدەهەمی ژانـویە دەسـتیان داوەتە دەسـتی یەک و بـڕی دووهەزار و پێنجسـەد ڕۆبـڵ و ئەنگوستیلەیەکی ئەڵماسیان لە سملکۆڤی بازرگان دزیوە، خۆشیان دەرمانداو کردووە و کوشتوویانە. دادیار تـاوانی تۆمەتبـاران بە پێی بەنـدەکانی چوارەم و پێنجەمـی مـادەی هەزار و چوارسـەد و سـی و پێنجـی یاسـای تاوانەکـان و مادەی دووسەد و یەکی ڕێوشوێنی دادپرسیی سزاکان بە گونجاو دەزانێ و داوا لە دادگای باڵا دەکات لە هەنتەشی لێژنەی داوەراندا، سزای تۆمەتباران دیاری بکات.»

نووسـیاری دادگـا، داوای خوێنـدنەوەی ئەم سـکاڵانامە دووردرێـژە، کاغەزەکـانی بەر دەسـتی ڕێکوپێـک کـرد و لە سـەر جێگـای خـۆی دانیشـت. هەمـوو ئامـادە بـووان هەناسـەیەکی ئاسـوودەیان هەڵکێشـا؛ بەو هیـوایەی بە زووتـرین کـات تەمـومژەکە بـڕەیتەوە و ڕاسـتییەکان ئاشـکرا بـن و دادگـا تاوانباران سـزا بدات، کەیسـەکەش بە سـەکەوتنی هەق و عەداڵت کۆتـایی پێ بێ. لەو نێوەدا، تەنیا نۆخلیدۆڤ هەستی بە پێچەوانەی ئەوانی تر بوو و بیری لە چارەنووسـی سـامناکی ماسـلۆڤا دەکـردەوە، ماسـلۆڤایەک کە دە سـاڵ لەمەوبەر کچێکی پاک و بێ تاوان بوو، بەڵام ئێستا تووشی ئەو گێژاوە بـووە و خەریکە تێیدا نوقم دەبێ.

# یازده

سەرۆکی دادگاه دوای دەمەتەقییەکی کورت لەگەڵ قازییەکان، داوای لە سیمۆن کارتی نیکین، تۆمەتباری ژومارە یەک کرد لە جێی خۆی هەستێ و وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە. تۆمەتبار هەستایە سەرپێ، دەستی توند بە پانتۆڵەکەیەوە نووساند بوو و بێ ئیختیار لێوی دەبزواند.

ـ تۆ تۆمەتباری کە ڕۆژی حەڤدەهەمی ژانوییە لەگەڵ ئۆفیێمی بۆچکۆڤا و کاترین ماسلۆڤا، جانتاکەی سملکۆڤتان کردۆتەوە، دزیتان لێکردووە و گەردی ئۆرسنیکتان داوە بە کاترین ماسلۆڤا کە بیکاتە نێومەشرووبەکەیەوە. دان بەو تۆمەتانەدا دەنێی؟

ـ من... من ئەو کارەم نەکردووە، بێ تاوانم، ئێمە بە ئەرکی سەرشانی خۆمانی دەزانین خزمەت بە میوانەکان بکەین. نا...

ـ جارێ لەو شتانەگەڕێ، ئێستا پێمان بڵێ ئەو تۆمەتانەت قەبووڵە یان نا؟

ـ من بێ تاوانم،تەنیا دەموسیت...

ـ دواتر دەچینە سەر بابەتەکانی تر.

ـ من...من هیچکات دزیم نەکردووە. مرۆڤم نەکوشتووە. من...

چاوەدێر سرتاندی بە گوێیدا و هێوری کردەوە. کارتی نیکین لە جێی خۆی دانیشتەوە. سەرۆکی دادگا ئەو پرسیارەی لە تۆمەتباری دووهەمیش کرد.

ـ ئوفمی بۆچکۆڤا! تۆ تۆمەتباری کە ڕۆژی حەڤدەهەمی ژانوییە لەگەڵ سیمۆن کارتی نیکین و کاترین ماسلۆڤا لە هوتیلی مۆریتانی ئەنگوستیلەیەکی ئەڵماس و گوژمەیەک پارەتان لە جانتاکەی سمکلۆڤی بازرگان دزیوە و بەشتان کردووە، هەروەها بازرگانەکەشتان دەرمانداو کردووە و کوشتووتانە. دان بەو تۆمەتانەدا دەنێی؟ بۆچکۆڤا بە جێی قسە کردن دەیگوڕاند، دەیگوت بو شەڕوکێشە و هەرا ئامادە و لە سەر پێیە.

ـ من بێ تاوانم. من پێم نەناوەتە ژووری سملکۆڤ. هەرچییەک ڕوویدابێ لە ژێر سەری ئەو چەتیوە سەلیتەیەدایە کە لە پاڵ مندا دانیشتووە.

ـ ئەم قسانە هەڵگرە بۆ دوایی.

ـ من نە پارەم لە کەسێک دزیوە، نە ژهریشم کردۆتە نێو مەشرووبی کەسێکەوە. ئەگەر لەوێ بوایەم، نەمدەهێشت ئەو کوڵکەی سەر بە خوێنە ئەو پیاوە بێچارەیە بکووژێ.

ـ کەوایە ئەو تۆمەتانەت قەبووڵە؟

ـ ئەوانە هەمووی درۆیە، بوختانە،من...

ـ باشە، باشە دانیشە... ئیستاش نۆبەی تۆیە کاترین ماسلۆڤا. تۆش بەوە تۆمەتباری کە لەو ماڵەوە وا کاری لێدەکەی چووی بۆ هوتێل و پارە و ئەنگوستیلەت لە جانتاکەی بازرگان دزیوە. دوای بەشکردنی پارەکە، سملکۆڤت بردووە بۆ هوتێلی مۆریتانی و ژارت کردۆتە نێو مەشرووبەکەیەوە و کوشتووتە. ددانی پێدادەنێی کە ئەو تاوانەت ئەنجام داوە؟

سـەرۆکی دادگـا نەرم و لە سـەرەخۆ قسـەی دەکـرد؛ دەتگـوت شـیعرێکی لەبەرە و دەیخوێنێتەوە؛

ـ من بێ تاوانم، هیچ قسەیەکیشم بۆ گوتن نییە.

ـ کەوایە تۆ دەستت لە دزینی دوو هەزار و پینجسەد ڕۆبلّدا نەبووە؟

ـ نا، من تەنیا چل ڕۆبلم لە جانتاکە دەرهێنا.

ـ ئەو تۆمەتەت قەبووڵ نییەکە ژارت کردۆتە نێو مەشرووبی سملکۆڤەوە؟

ـ نـا، قەبـوولّم نییـە. مـن پێموابـوو ئەو گەردە دەرمـانی خەوهێنەرە و هـیچ مەترسییەکی نییە؛ سوێند دەخۆم کە خەیاڵێکی خراپم لە ژێر سەردا نەبووە.

ـ کەوایە هیچکام لە تۆمەتەکان لە ئەستۆ ناگری؟

ــ تەنیـا ئەوەم قەبـوولّە کە گەردم لە مەشـرووبیی سـمکلۆڤ کـردووە. ئەویش پێم وابوو هێوری دەکاتەوە و خەوی لێ دەکەوێ.

ـ ئیسـتا کە دان بەو شـتانەدا نـانێی، بە وردی لە نووکەوە بۆمـان بگێڕەوە چی ڕووی دا.

سـەرۆکی دادگـا دەسـتی لە سـەر مێـزە سەوزپۆشـەکە دانـا و چـاوی لە تۆمەتبار بڕی. ماسلۆڤا بۆ ساتێک بێدەنک بوو.

ـ بەوردی بۆمان باس بکە. بەدان پیانـانی سـادقانە بـاری تـاوانەکەی خۆت سووک بکە.

ــ کاتێـک گەیشـتمە هـوتێلەکە سـملکۆڤ سـەرخۆش بـوو. یەکجـار زۆر سەرخۆش بوو. هەرکە ویستم لە ژوورەکە بێمە دەرێ پێشی پێگرتم. کاتێک باسـی «ئەو»ی دەکـرد ترسـێک بـاڵی بە سـەر ڕۆح و چاوانیـدا دەکیشـا و دەشـڵەژا. نەیـدەتوانی ڕووداوەکـان لە زەنیـی خۆیـدا ڕاستەوپاسـتە بکـا و دەربیبڕێ.

ـ پاشان چی ڕوویدا؟

ـ دواتر؟... هێندێک لەوێ مامەوە و گەڕامەوە بۆ ماڵێ. دادیارکە لە سەر جێگاکەی خۆی پاڵی دابۆوە، داوای لە سەرۆکی دادگا کرد کە ڕێگای پێ بدا چەند پرسیار لە تۆمەتبار بکات.

ـ دەمەوێ بزانم ماسلۆڤا بەر لەو ڕووداوە سیمۆن کارتی نیکینی ناسیوە؟

سەرۆکی دادگا پرسیارەکەی ئەوی دووپات کردەوە. ماسلۆڤا بە ترسەوە چاوی لە دادستان دەکرد.

ـ بەڵێ، من سیمۆنم دەناسی.

ـ دەمەوێ بزانم ئەو ئاشنایەتییە تاج ڕادەیەک بوو؟ چ پێوەندییەک لە نێوان ئەو و سیمۆندا هەبووە.

ـ چ پێوەندییەک؟ سیمۆن دەهات و منی دەبرد بۆ لای میوانەکانی هوتێل، پێوەندیمان تەنیا ئەوەندە بوو.

ـ بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی بابەتەکە، تۆمەتبار پێمان بڵێ بۆ چی سیمۆن کارتی نیکین ئەوی بردووە بۆ لای میوانەکانی. بۆ لە نێوان ئەو هەموو ژنەدا ئەوی هەڵبژاردووە؟ دادیار بزەیەکی فێڵەبازانەی هاتێ. ماسلۆڤا تاوێک چاوی لە ئەو دەکرد و تاوێک لە سەرۆکی دادگا. ترس سەرتاپای داگرتبوو.

ـ نازانم بۆ. سیمۆن هەرکات دەهات، یەکێکی هەڵدەبژارد. سەرنجی ترسناکی بە نێو هۆڵەکەدا سووڕا و بۆ چرکەیەک لە سەر نۆخلیدۆڤ گیرسایەوە. کۆنت خەمێک شکایە دڵی و ترسا ناسیبێتیەوە. ماسلۆڤا چاوی لە سەر لێژنەی داوەران گوێستەوە و لە دادیار ورد بۆوە.

ـ دیارە تۆمەتبار و سیمۆن کارتی نیکین پێکەوە کەنیوبەنێکیان نەبووە. بۆیە جارێ هیچ پرسیارێکم نییە.

دادیار قەڵەمی لە سەر کاغەز دانا و وای نواند کە شتێکی گرینگ دەنووسێ، بەڵام لە ڕاستیدا هیچی نەدەنووسی؛ تەنیا بۆ ئەوەی خۆی وا

پیشان بدات وردبینه و موو له ماست دەردەکێشێ، لاسایی دادیار و پارێزەره ناودارەکانی دەکردەوە. سەرۆکی دادگا به سرته لەگەڵ قازیی چاویلکه له چاو کەوته ئاخافتن و ئەو پرسیارانەی لێکدایەوه که له لایەن لیژنەی داوەرانەوه هاتبوونه گۆڕێ و درێژەی دا به لێپێچینەوه له ماسلۆڤا.

ـ پاشان چی ڕوویدا؟ کاتێک له هوتێلەوه گەڕایەوه بۆماڵێ چیت کرد؟

ـ زۆر ماندوو بووم. چوومه ژوورەکەم و خەوتم، بەڵام هێشتا چاوم گەرم نەکردبوو، «برێت» خزمەتکاری ماڵەکەمان، خەبەری کردمەوه و گوتی هەسته وەره خوارێ؛ ئاشقەکەت دیسان هاتووه و بەزم و هەرای ساز کردووه. له پەستا داوای مەشرووب دەکا بۆ کچەکان، بێ ئەوەی تاقه ڕۆبڵێکی له گیرفاندا بێ. دەمزانی خانمی سەرۆک هەڵسوکەوتی چۆنه و هیچ داواکارییەک به قەرز قەبووڵ ناکات. ناچار بووم بچمه خوارێ. سملکۆڤ کلیلی جانتاکەی پێدام و گوتی بچم دەرگای جانتاکەی بکەمەوه و چل ڕۆبڵی بۆ بهێنم.

سەرۆک به هێواشی لەگەڵ قازییەکان دەدوا و بیر و خەیاڵی له جێگایەکی دیکه بوو، بەڵام وای دەنواند که له هەموو شتێک تێدەگا و گوێچکەی هەرزن هەڵدەگرێ.

ـ دەی، پاشان چی ڕوویدا؟ له هۆتێل چیتان کرد؟

ـ سیمۆن و ئۆفێمی بۆچکۆڤام ئاگادار کرد. ئەوانیش لەگەڵم هاتن بۆ ژوورەکه.

بۆچکۆڤا لاقی له زەوی کوتا و گوڕاندی:

ـ درۆ دەکا. من پێم نەناوەته ئەو ژوورەوه. باوەڕ به قسەی ئەو سووکوچرووکه مەکەن!

بۆچکۆڤایان هێور کردەوه و ماسلۆڤا درێژەی به قسەکانی دا:

ـ لەبەر چاوی ئەو دوو کەسە دەرگای جانتاکەم کردەوە، چوار گەڵای سووری دە ڕۆبڵیم هەڵگرت.

دادیار پرسیارێکی نوێی لێ کرد.

ـ کاتێک تۆمەتبار چوار گەڵای دە ڕۆبڵی هەڵگرتووە، بۆی دەرکەوتووە جانتاکە چەندەی پارە تێدا بووە؟

هەر کاتێک دادیار پرسیارێکی دەکرد، ماسلۆڤا دەشڵەژا و زمانی دەکەوتە تەتەڵە کردن. هەستی دەکرد دادیار دەیهەوێ بەداوییەوە بکات.

ـ من باقیی پارەکانم نەبژارد؛ بەڵام بۆم دەرکەوت جانتاکە گەڵای سەد ڕۆبڵیشی تێدایە.

ـ کەوایە تۆمەتبار پارەی سەد ڕۆبڵیی بە چاوی خۆی دیوە.

سەرۆکی دادگا چاوی لە کاتژمێرەکەی کرد و درێژەی ڕووداوەکەی لە ماسلۆڤا پرسی.

ـ من چل ڕۆبڵەکەم هەڵگرت و گەڕامەوە بۆ ماڵێ.

ـ لەوێ چی ڕووی دا؟

ـ پارەکەم دا بە سملکۆڤ. دەست هەڵگیر نەبوو. دیسان منی لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ هوتێل.

ـ چۆن گەردەکەت کردە نێو مەشرووبەکەیەوە؟

ـ زۆر ئاسایی. گەردەکەم کردە نێو مەشرووبەکەیەە و دامە دەستی.

ـ بۆچی ئەو گەردەت دەخوارد دا؟

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

ـ دەستی لە کۆڵم نەدەکردەوە. هەراسانی کردبووم. بە ناچاری چووم سیمۆنم بانگ کرد و پێمگوت کە زۆر وەڕەز و شەکەتم. بیرێکم بۆ بکەوە، بزانم چبکەم؟ سیمۆن بەستەی گەردەکەی پێدام تاکوو بیکەمە نێو

مەشرووبەکەیەوە. کاتێک چووم بۆ ژوورەکەی، سملکۆڤ حاڵی زور شڕ بوو. لەبەر پەردەکەدا کەوتبوو بە زەویدا و داوای لێکردم مەشرووبی بۆ بەرم. بەتڵێک شامپانی لە سەر مێزەکە بوو. گەردەکەم کردە نێو مەشرووبەکەوە و شڵەقاندم. پەرداخێکم بۆ تێکرد یەکبین نای بەسەریەوە. خودا دەزانێ من ڕۆحیشم لەوە ئاگادار نەبوو کە ئەو گەردەیە دەرمان بێ و بیکووژێ.

ـ ئێستا باسی ئەنگوستیلەکەمان بۆبکە. چۆن ئەو ئەنگووستیلە ئەڵماسەت وەدەست کەوت؟

ـ کاتێک لە ماڵێوە گەڕامەوە بۆ هوتێل، دیتم حاڵی زۆر خراپە. گوتم دەمهەوێ بچمەوە بۆ ماڵێ، دەستی کرد بە لێدانم. بە مشتەکۆڵە لە سەری ڕادەکێشام. شانەکەی سەرم شکا. ئیتر ئامادە نەبووم بۆ چرکەیەک لە لای بمێنمەوە. پێشی پێگرتم و لە بەرم پاڕایەوە، ئەنگوستیلەکەی داکەند و بە دیاری پێی دام. بۆ ئەوەی دڵخۆشم بکات و لە لای بمێنمەوە.

دادیار دیسان لە جێی خۆی هەستا، ئیزنی لە سەرۆکی دادگا وەرگرت و لە تۆمەتباری پرسی تا چ ماوەیەک لە ژوورەکەی سملکۆڤ مایتەوە؟ ماسلۆڤا دیسان ترس شکایە گیانی.

ـ لە بیرم نەماوە چ ماوەیەک لەوێ مامەوە.

ڕەنگە تۆمەتبار ئەوەیشی لە بیر نەمابێ کاتێک لە ژورەکەی سملکۆڤ هاتەدەرێ، چوو بۆ ژوورێکی تر؟

ـ ئەرێ لە بیرمە چووم بۆ ژوورەکەی تەنیشت.

ـ بۆچی چووی بۆ ئەوەی؟

ـ چاوەڕوان بووم کارتی نیکین بانگی عارەبانە بکا.

ـ کارتی نیکین لەگەڵ تۆدا هات بۆ ئەو ژوورە؟

- بەڵێ.
- بە چ مەبەستێک هات؟
- هێندێک شامپانی مابوو. هێنابووی پێکەوە بیخۆینەوە.
ــ کەوایە پێکەوە شامپانیتان خواردەوە؟ حەتمەن زۆرتان پێکەوە قسەکردووە، لە بیرتانە باسی چیتان دەکرد.
ماسلۆڤا سوور هەڵگەڕابوو.
- باسی شتێکی گرینگمان نەکرد. تەنیا قسەی ئاسایی، خۆ من هەموو شتێکم بۆ ئێوە باسکرد. جگە لەوە هیچ قسەیەکم نییە، من بێ تاوانم.
دادیار دیسان لە جێی خۆی دانیشتەوە و شتێکی لە سەر کاغەز نووسی: «ماسلۆڤا و سیمۆن و کارتی نیکین ماوەیەک پێکەوە لە ژوورێکدا بوون.»
سەرۆکی دادگا دیسان داوای لە تۆمەتبار کرد ئەگەر قسەیەکی هەیە بیکات.
- من هیچ شتێک نەماوە بیڵێم.
سەرۆکی دادگا شتیکی نووسی و سرتاندی بە گوێی یەکێک لە قازییەکاندا. دە خولەکی پشوودان ڕاگەیاند و لە جێی خۆی هەستا و لە هۆڵەکە چووە دەرێ. ئەم وچانە لە سەر داوای قازییە نەخۆشەکە بوو. چونکە گەدەی ژانی دەکرد و دەیویست لەو ماوەیەدا کەوچکێک لەو شەربەتە بخواتەوە کە پزیشک ئەمڕۆ بەیانی بۆی نووسیبوو.
لێژنەی داوەران و دادیار و پارێزەران و شاهیدانیش بە دوای قازیەکاندا لە هۆڵەکە چوونە دەرێ. شەقوکوتی کورسییەکان لە هەمووو لایەکەوە بەرز بۆوە. نۆخلیدۆڤیش هات بۆ ژووری تایبەتی لێژنەی داوەران، لە پاڵ پەنجەرەکەدا دانیشت و خەیاڵ هەڵیگرت.

# دوازده

خۆی بوو. ڕاست کاتیوشا بوو. نۆخلیدۆڤ چۆنییەتیی ئاشنا بوونەکەیانی لە ڕۆژی یەکەمەوە هێنایەوە بیری خۆی. لەو ساڵەدا، ئەو خوێندکاری ساڵی سێهەم بوو و تێزی کوتاییی سەبارەت بە «خاوەنداریێتیی زەویوزار» ئامادە کردبوو، بۆ ڕابواردنی پشووی هاوینە چووبوو بۆ مەزرای زۆزانی پوورەکانی. ئەو پشووی هاوینە زیاتر لە ملکی دایکی یان خۆشکی ڕادەبوارد کە لە نزیک مۆسکۆ هەڵکەوتبوو؛ بەڵام ئەو ساڵە خوشکی شووی کردبوو و دایکیشی بۆ کەڵک وەرگرتن لە ئاوی شیفابەخشی گڕاو چووبوو بۆ دەرەوەی وڵات. نۆخلیدۆڤ کە دەیویست تێزەکەی بنووسی، وای بە باش زانی بچێ بۆ ماڵی پوورەکانی کە شوێنێکی خۆش و بێدەنگ بوو و ئەویش کە تەنیا میراتگری ئەوان بوو زۆریان خۆشدەویست. نۆخلیدۆڤ زۆری حەز لەو ژیانە ئارام و ساکارەی پوورەکانی بوو. کۆنت نۆخلیدۆڤ لەم هاوینەدا دڵی ئاوی کردبوو و چێژی لە هەستی لاوانەی خۆی وەردەگرت ؛ چونکە یەکەم جار لە سەر ویستی خۆی، نەک لەگەڵ ئەموئەو، دەچوو بۆ گەشت و ڕابواردن. خەریک بوو جوانی و مەزنایەتیی ژیانی بۆ دەردەکەوت، لە گرینگایەتیی ئەو ڕۆڵە تێدگەیشت کە مرۆڤ لە ماوەی ژیانیدا دەکەوێتە ئەستۆی، بۆی دەردەکەوت کە چۆن خۆی لە دنیای خەون و خەیاڵ بە دوور

بگرێ و لەگەڵ ڕاستییەکان ئاشنا بێ و بە دڵێکی پڕ هیوا و ئەرخەیانییەوە ڕێگـــای کەمـــاڵ و پێگەیشـــتن بگـــرێتەبەر. لەو ســـاڵەدا، لە زانکـــۆ کتێبـــی «هاوسـەنگیی کۆمەڵایەتی» هێربێرت سپەنسێری خوێندبوو و بیرو بڕوای ئەو بیرمەنـدە سـەبارەت بە خاوەنـداریێتیی زەویـوار، زۆری شـوێن لە سـەر دانابوو. بنەماڵەی ئەوان یەکێک لە مالیکە گەورەکان بوون. ئەگەرچی باوکی ماڵ و سامانێکی زۆری نەبوو، بەڵام دایکی زیاتر لە دەهەزار دۆنم زەویی بە میـرات پێگەیشـتبوو. دوای خوێنـدنەوەی چڕوپـڕی ئەو کتێـبە، تێگەیشـت کە خاوەنداریێتیی زەویوزار چەندەی زوڵم و بێ عەدالەتی تێدایە و بەدوورە لە چاکە و بەزەیی و مرۆڤدۆستی. هەر بەو هۆیە، زەوییەکانی باوکی، ئەگەرچی زۆریش نەبوون، لە نێوان ڕەشاییەکاندا دابەش کرد. ئەم چاکە و بەخشینە ڕۆحی ئەوی لەگەڵ چاکە و پیاوەتی ئاوێتە کرد و چێژێکی بێ وێنەی پێ بەخشـی؛ ئەو هەسـتە شـیرینە بە نێـو دەمارەکـانی لەشـیدا بڵاوبووبـۆوە. هەڵبژاردنی بابەتی «خاوەنداریێتیی زەویوزار» بۆ تێزی کۆتایی زانکۆش هەر بەو هۆیە بوو.

لە مەزرای زۆزانـــی پوورەکـــانی، بەیانیـــان زوو هەڵدەســـتا و هێشـــتا تەمـوومژی بەیان نەڕەوییبۆوە، لە نێو کانیاوی بەر گردەکەدا، خۆی دەشت. کاتێک دەگەڕایەوە بۆ ماڵێ، هێشتا شـەونمی سـەر پەلکی ناسکی گوڵان دەستی هەتاویان پێ نەگەیشتبوو.

قاوەیەکی دەخواردەوە و ئەو کتێبانەی کە بۆ نووسینی تێزەکەی بەکەڵک بوون متالای دەکردن و یاداشتی لێ هەڵدەگرتن. هێندێ جار کتێب و قەڵەم و کـاغەزی بەجێدەهێشـت و بـۆ گەشـت و سـەیران دەچـوو بـۆ نێـو بێشـە و مەزراکـانی دەوروبەر و پـێش نێـوەڕۆ دەگەڕایەوە بـۆ نێـو بـاخەکە؛ دوای پشـــوودانێکی کـــورت لەگەڵ پوورەکـــانی نـــانی نیـــوەڕۆی دەخـــوارد و بە

گاڵتەوگەپ و قسەی خۆش سەرگەرمی دەکردن. هێندێ جار دەچوو بۆ ئەسپ سواری و گەمیە لێخوڕین. شەوانەش یان خەریکی کتێب خوێندنەوە دەبوو یان لە لای پوورەکانی دادەنیشت و دەستی دەکرد بە دەمەتەقێ و گاڵتە و پێکەنین. شەوانی مانگەشەو کە خەوی لێ نەدەکەوت، دەچوو بۆ نێو باخەکە و هەتا گزنگی بەیان لە سەرچڵووکی دارەکانی دەدا، لە نێو بیر و خەیاڵی شیریندا نوقم دەبوو.

مانگی یەکەم زۆر بە خۆشی و ئاسوودەیی تێپەڕی و کۆنت نۆخلیدۆڤی لاو هیچ سەرنجێکی کاتیۆشای چاوڕەش و نەرم و ناسکی نەدا. هێشتا زۆر گەنج بوو، تا ئەو کاتە لە باوەشی گەرموگوڕی دایکیدا ژیابوو؛ ژنی بە مرۆڤێکی بەڕێز و پاکداوێن دەزانی و پێی وابوو دڵسۆز و خەمخۆری ڕۆڵە و بنەماڵەکەیەتی و تەنیا ئەو کاتە دەتوانی لێی نزیک ببیەوە کە زەماوەندت لەگەڵ کردبێ.

ڕۆژێک کەوتە بارودۆخێکەوە کە بەلایەوە شتێکی نوێ بوو. ئەو ڕۆژە ژنێکی جیرانیان لەگەڵ کوڕێک و دوو کچی کە هەرسێکیان قوتابیی دواناوەندی بوون، بە میوانی هاتن بۆ ماڵی پوورەکانی. شێوەکارێکی لاویشیان لەگەڵدا بوو. دوای خواردنەوەی چایی، لاوەکان چوون بۆ باخ و مێرگەکەی نزیک ماڵێ. کاتیۆشاش لەگەڵیان چوو. بۆ شادی و سەرگەرمی دەستیان کرد بە یاریی «دایەمەمدە بە گورگێ ». بەو شێوەیەکە یەکێک دەبوو بە گورگ و وەدووی ئەوانی دیکە دەکەوت. دوو کەس دەبوو پێکەوە بن و هەتا ئەو کاتەی دەستیان لە دەستی یەکتردا بوو، لە لایەن گورگەوە هێرشی نەدەکرایە سەر؛ بەڵام لەو کاتەدا کە دەستیان بەردەدا بۆ ئەوەی هاواڵەکەیان بگۆڕن، گورگە هێرشی بۆ دەبرد و ئەگەر کەسێکی بگرتبایە، دەبوو جێگاکەی لەگەڵ گورگەکە بگۆڕێ و بەو شێوەیە یاری درێژەی

پێدەدرا. نۆخلیدۆڤ چەند جار لەگەڵ کاتیۆشا بوو بە جووت و دەستی یەکیان دەگرت و پێدەکەنین و ڕایان دەکرد. بەڵام کۆنتی لاو بەخەیالیشیدا نەدەهات کە ڕۆژێک ئاشقی ئەو دەبێ.

لاوی شێوەکار کە پەروەردەی گوند بوو، گورجوگوڵ بوو و کاتێک هەڵدەهات هیچکەس پێی نەدەگەیشتەوە. کاتیۆشا ئاماژەی بە نۆخلیدۆڤ کرد کە لە پشت دەوەنەکان خۆیان بشارنەوە، لە پشت دارەکان نۆخلیدۆڤ لاقی لە سەر چیمەنەکە خزی و کەوتە نێو جۆگەیەکەوە، کە هەستایەوە هەموو دەمووچاوی بە ئاوەنگ خووسا بوو. بە پێکەنینەوەهلە جۆگەلەکە هاتەدەرێ، خۆی گەیاندە کاتیۆشا و دەستی گرت.

ـ دڕک لە دەستت نەڵنەچەقیوە؟ زۆر بە توندی کەوتی!

ـ چاوم لە بەر پێی خۆم نەکرد، کەوتمە نێو جۆگەلەکەوە.

زیاتر لێک نزیک بوونەوە. هیچکام نەیاندەزانی چی دەکەن. کاتیۆشا دەستی نۆخلیدۆڤی گوشی و لێویان بە لێوی یەکەوەنا. کاتیۆشا دەستی نۆخلیدۆڤی بەردا و هەڵات.

ـ کاتی هەڵاتنەکە گورگ ناتوانی بمگرێ.

بە دەستی لکی یاسە سپییەکەی گرت و ئاوڕی دایەوە. هێشتا لێوی تەڕی و گەرمایی ماچەکەی پێوە بوو. ئەو ڕۆژە دڵیان بۆلای یەکتر فڕی. لەدوای ئەوە هەر کاتێک نۆخلیدۆڤ چاوی بە کاتیۆشا دەکەوت بە بەر هەڵبێنەی سپییەوە، دنیا لە بەر چاوی نوقمی جوانی و ڕووناکی دەبوو، هەموو شتێک لەبەر چاوی جوانتر و گەشاوەتری دەنواند. هەستی کاتیۆشاش دەرەق بە ئەو هەوا بوو. بۆ نۆخلیدۆڤ دنیا ڕەنگ و بۆنێکی تازەی لە خۆ گرتبوو. کاتێک نامەیەکی دایکی بە هەواڵێکی ناخۆش ماتی دەکرد، یان بە هۆی تێزی

زانکۆکەیەوە تووشی گرفت و کێشە دەبوو، یان خەم و خەفەتێک دڵی ڕێک دەگوشی، دیتنی کاتیۆشا هەموو ئەوانەی لە بیر دەبردەو و دەیگەشاندەوە.

ئەگەرچی کاتیۆشا لەماڵێدا زۆر سەرقاڵی ئیش و کار بوو، کاتی بێکاریشی زۆر بوو. نۆخلیدۆڤ کتێبەکانی دۆستۆیۆڤسکی و تۆرگنیڤی پێدەدا بیخوێنێتەوە. کاتیۆشا چیرۆکی «هێمنایەتی»ی تۆرگنیڤی لە هەموان پێخۆشتر بوو. لە بەر چاوی ئەم و ئەو زۆر پێکەوە نەدەدوان. لە دالان و بەر هەیوان و هەر شوێنێک کە چاویان بە یەکتر دەکەوت شتێکیان دەردەبڕی. هێندێ جار نۆخلیدۆڤ دەچوو بۆ ژووری ماترنا خزمەتکاری بەساڵاچوو،لەوێ چایی دەخواردەوە و قسەی لەگەڵ کاتیۆشا دەکرد. دەتگوت لە تەنیایی دەترسێن. چونکە لە تەنیاییدا چاوانیان پێکەوە دەدوان. ماریانا ئیڤانۆڤنا پوورە تووڕە و سەختگیرەکەی لەوە دەترسا برازاکەی زیاتر لەوە دڵی گیرۆدەی کاتیۆشابێ و هۆش و ئاوەزی بدۆڕێنێ. ترسی ئەو بێ هۆ بوو. نۆخلیدۆڤ، کاتیۆشای زۆر پاک و سادقانە خۆشدەویست و هەستی ئەو لە سنووری ڕێز و خۆشەویستیی تێنەدەپەڕاند. سووفی ئیڤانۆڤا پوورە لە سەرەخۆ و مێهرەبانەکەشی، وەک خوشکی دڵەدوا بوو. ئەویش دەترسا برازاکەی وەها بکەوێتە دوای ئەوینی کاتیۆشا کە نەتوانێ وازی لێ بهێنێ و شکۆ و شانازیی بنەماڵەکەیان لە بەر چاو نەگرێ و لە گەڵ ئەو کچە بێ ڕەچەڵەک و ناخانەدانە ژیانی هاوبەش پێک بێنێ.

ئەگەر نۆخلدۆڤ زیاتر لە مانای ئەوین تێگەیشتبایە، ئەگەر تووشی کۆسپێک بووایە، ئەگەر پوورەکانی پڕکێشیان بکردایە و ئەویان لە کاتیۆشا دوور بخستایەتەوە، ڕەنگە ڕقی هەستایە و تەواوی جیاوازییەکانی تووڕهەڵدایە و لەگەڵ کاتیۆشای داوێن پاک و ساکار زەماوەندی بکردایە؛ بەلام وەڕووی خۆیان نەهێنا و هیچیان نەگوت. هیچ کۆسپک و

بەربەستێکیشیان نەخستە سەر ڕێگاکەی، بۆ ئەوەی بەرقدا نەچێت و گڕی ئەشقەکەی بڵێسەدارتر نەبێ.

نۆخلیدۆڤ هەستی ئاشقانەی خۆی زۆر بە شتکی سادە و سروشتی دەزانی. ئەم هەستە ناسک و پاکە هەردووکیانی دڵشاد دەکرد و چێژێکی ڕۆحی لە ناخیاندا شەپۆلی دەدا. لە کاتی خوداحافیزیدا، چاوی پڕ لە فرمێسکی کاتیۆشای دی و شڵەژا. هەتا چەند ڕۆژ دواتریش پێی وابوو شتێکی گرینگی لە ماڵێ پوورەکانی لێ بەجێماوە، کە لەو شتە باشتر و بە نرختری لە تەواوی ماوەی ژیانیدا نەبووە و نابێ؛ هەتا ماوەیەکی زۆریش ئەو هەستە دڵی ڕێک دەگوشی.

کاتیۆشاش دوای ڕۆیشتنی نۆخلیدۆڤ، چووە سووچێک و فرمێسکی هەڵوەراند، ئەو هەستە خەماوییە هەتا چەند ڕۆژ لە سەر دڵی نەڕەوییەوە.

## سێزدە

سێ ساڵ دوای ئەو ڕووداوە، دیسان نۆخلیدڤ ڕێی کەوتەوە ماڵی پوورەکانی. مەزرای هاوینەهەوارەکەی ئەوان لە سەر ڕێی ئوردووگای سەربازییەکەی هەڵکەوتبوو. کۆنت نۆخلیدۆڤ ئیتر ئەو لاوە دڵپاک و ساکارەی سێ ساڵ لەمەوبەر نەبوو. لەو سەردەمەدا زۆر کوڕێکی مێهرەبان و لە دڵەوە نزیک و فیداکار بوو؛ بەڵام ئێستا بە پێچەوانەی ئەو کات، لاوێکی خۆپەرەست و داوێن تەڕ بوو. بادیهەوا و تەڕ پۆش و هەرزە و خۆشگوزەران، لەگەڵ ئەوەشدا گڕی ئەشق لە هەناویدا بڵێسەی دەکێشا و تامەزرۆیانە وەدووی حەز و مگێزەکانی دەکەوت و دەیویست دەستی بە

هەموو ڕازە نهێنییەکانی جیهان ڕابگا. ئێستا تۆلازی و هەوسبازی یەکێک لەو چێژە ڕۆحییانە بوو کە جەستەی تامەزرۆی پێی دەحەسایەوە. لەو سەردەمەدا بە هەستێکی قووڵ و پڕشکۆوە بەرەو سروشت و جوانییە واتاییەکان دەکێشرا و ئێستا جگە لە ڕابواردن و خۆشگوزەرانی و هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوڕێیانی نابار و داوێن پیس هیچ شتێکی دیکەی بەلاوە گرنیگ نەبوو. ئەو کات ژنی بە بوونەوەرێکی ڕازاوی و دلڕفێن دەزانی کە ئەو ڕاز و نهێنییانە ئەوی جوانتر و دلڕفێنتر دەکرد، بەڵام ئێستا ژنی تەنیا بۆ دامرکاندنەوەی ئاوری هەوەس دەویست. لەو سەرمەدا پێوستی بەپارە نەبوو؛ یەک لە سەر سێی مانگانەکەی دایکی لیی سەرو زیاد بوو. تەنانەت ملک و زەوییەکانی کە وەک میرات لە باوکی بۆی مابۆوە بەشێوەیەکی جوامێرانە بەسەر وەرزێڕەکاندا دابەش کردبوو، ئێستاش لەگەڵ ئەوەی هەموو مانگێک هەزار و پێنجسەد ڕۆبلی لە دایکی وەردەگرت، خەرجەکەی بووبووە چەند قات و بەردەوام لە سەر مەسەلە ماڵییەکان لەگەڵ دایکی لە کێشەدا بوو. ئەو کات پێی وابوو کەسایەتیی خەڵک پێوەندیی بە ڕەفتار و ئاکاری واتایی ئەوانەوە هەیە، بەڵام ئێستا کەسایەتیی هەرکەسێکی لە شان و باهۆ و وزەی هەوەسی ئەودا دەدی.

ئەم ئالوگۆڕە هۆکارەکەی ڕوون و ئاشکرا بوو؛ لەو سەردەمەدا بۆ تێگەیشتن لە ڕاستییەکان بە وردی بیری دەکردەوە،بەڵام ئێستا بەپێچەوانە دنیای لە چاوی خەڵکییەوە دەدی و ئەوەی خەڵکی دەیانگوت ئەو دووپاتی دەکردەوە. دیارە ئازار کێشان و لە ڕێگای دروست و حیسابییەوە گەیشتن بە ڕاستییەکان کاری هەموو کەس نییە. ئەویش ڕێگا ئاسانەکەی هەڵبژاردبوو. بەجێی ئەوەی یارمەتی لە ئاکاری پاک و وزە ڕۆحییەکان وەرگرێ، خەریکی دامرکاندنەوەی هەوەسە حەیوانییەکەی بوو. لەو ڕۆژەوە پێی نابووە ئەو

ڕێگـا پـڕ کەندولەنـدەوە دەوروبەرییەکـانی خۆشـحاڵ بـوون. هانیـان دەدا. چەپڵەیان بۆ لێدەدا و ئامێزی گەرموگوڕیان بۆ دەکردەوە.

لەو سـەروبەندەدا کە نۆخلیـدۆڤ لایەنگریـی لە هەق و عەدالەت دەکـرد و ڕەخـنەی لە کەیـف و نەهەنگـی زۆرداران و چارەڕەشـیی تـاقەتپڕووکێنی هەژاران دەگرت، دایکی و پوورەکانی و هەموو کەسانی دەوروبەری لچیان لێ هەڵدەقورتاند و دەیانداپە بەر پلاری تانە و تەشەر و بە کەسێکی فشـە و بـێ مبالاتیـان دەزانیـی بەڵام ئێسـتا کە گۆڕابـوو، چیرۆکـی دێمـۆدەی دەخوێنـدەوە و دەچـوو بـۆ دیتنـی شـانۆی قـۆڕ و بـێ تـامی فەڕەنسـی، و قەشمەری و حەنەکچێتیی وەڕێ دەخست، هەمـووان چەپڵەیـان بـۆ لێدەدا و ئافەرەمیـان پێـدەگوت. ئەو کـاتەی کە هەڵەخەرجیی نەدەکـرد و مەشـرووبی نەدەخـواردەوە، جلـوبەرگی سـاکاری لەبەر دەکـرد و خـاکەڕا و خەڵـک خۆشەویسـت بـوو، هـاوڕێ و کەسـوکارەکانی بە کەسـێکی گەمـژە و دەسـتبڵاویان دەزانـی، ئێسـتاش کە بـۆ ڕاو کـردن و ڕابـواردن و گـۆڕینی کەلوپەلی ژووری کارەکەی بە لێشـاو پارەی خەرج کرد،هەمـووان ڕێزیـان بۆ دادەنـا و بە کەسێکی ژیـر و بە مشـووریان دەزانـی و دیـاریی بەنرخیـان بـۆ دەنـارد. ئەو کـات کە داوێنپـاک و بە دوور لە هەوا و هەوش بـوو و حەزی نەکرد خۆی تووشی زەلکاوی بێ ئـابڕوویی بکات، دایکی خەمـی ئەوەی بـوو کـوڕەکەی لەشسـاغ و پیـاو نەبـێ. بەڵام کاتێـک خـزم و کەسـەکانی دیتیـان کەوتـۆتە سـەر ڕێچکەیەکـی نـوێ و بـۆتە پیـاوێکی حیسـابی و لەگەڵ ژنێکـی بەسـتۆکەی فەڕەنسـی کەنیـوبەینی هەیە، دڵیـان ئاسـوودە بـوو. ئێسـتاش کە ئاگـادار بـوون ئەشـقی کاتیۆشـا لە دڵیـدا ڕەگـی داکوتـاوە، ئاراوقارایـان لـێ هەڵگیرابوو و دەترسان لەگەڵ ئەو کچە بێ کەسوکار و ناخـانەدانە زەماوەند بکات و بنەماڵەکەیان تووشی سەرشۆڕی بکات.

کاتێک نۆخلیدۆڤ گەیشتە تەمەنی یاسایی و ئیختیاری ماڵ و سامانەکەی خۆی بە دەستەوە گرت، ئەو زەویوزارەی بە میرات پێی برابوو، بەسەر جووتیار و ڕەشاییەکاندا دابەشی کرد، لە لایەن خزم و کەسەکانییەوە درایە بەر پلاری تانە و سەرکۆنە و دەیانگوت ئەو بەخشین و تەخشان و پەخشانە نەک بە قازانجی جووتیاران نییە، بەڵکوو پەلیان لێ قەوی دەکات و تەپلۆس و تەوەزەل دەبن. بەڵام کاتێک چووە ڕیزی ئەرتەشەوە. شەو و ڕۆژ لەگەڵ هاوڕێیانی خانەدان و نەجیبزادەی خەریکی قومار و خۆشگوزەرانی بوو و خەرجی زۆر گەورەی دەکرد و هێندێ جار دەکەوتە ژێر باری قەرزێکی قورس و گرانەوە، دایکی مێشێکیشی میوان نەبوو. دایکی ئەو کارانەی بۆ پیاوێکی لە چینی خانەدان و ساماندار بە شتێکی سروشتی دەزانی و تەنانەت دڵخۆشیش بوو کە کوڕەکەی ئاقڵ بووە و لەگەڵ دۆستانی هاوشانی خۆی هەڵدەستێ و دادەنیشێ و خۆی بەڕابواردنی باش و شایستەوە سەرقاڵ دەکا.

نۆخلیدۆڤ هەروا بە سانایی لە گێژاوی گۆڕانکاریدا نوقم نەبوو؛ سەرەتا هێندێ دوودڵ بوو، هەستی دەکرد ئەوەی ویژدانی مرۆڤ ئازار دەدا بەلای خزم و کەسەکانییەوە شیاوە و حەزی پێ دەکەن، بەڵام ئەوەی ویژدان قەبوولێ دەکا دەوروبەرییەکان لێی بێزارن. ماوەیەک بەم شێوەیە هەوڵی دا و لەگەڵ کێشەکە بەربەرەکانێی کرد، بەڵام وردە وردە بڕوا بەخۆ بوونی لە دەست دا و تێوەگلا. وای لێ هات ئیتر هاواری ویژدانی نەدەبیست و تەنیا دەنگێک کە دەیبیست هاندانی خزم و هاوڕێیانی بوو بەرە و ڕێگا چەوتەکە. لەگەڵ ئەوەشدا تێپەڕین لەو ڕێچکە و ڕێبازە زۆر زەحمەت بوو. بۆ ئەوەی خۆی لەبیر بباتەوە، پەنای بۆ دووکەڵ و مەشرووب دەبرد. زۆری نەەخایاند خووی بەو ئاکارە تازەیە گرت و هێمنایەتیی لەدەست چووی خۆی دیتەوە.

بۆ دوورکەوتنەوە و پارێزکردن لە دڵناسکی و ویژدانی پاک، ناچار بوو هاواری ودیژدان لە ناخی خۆیدا بخنکێنێ و تەنیا گوێ بۆ دەوروبەرییەکانی شل بکات. دوای هاتنی بۆ پترزبۆرگ خووی بەم گۆڕانکارییە گرت و کاتێک بەرگی ئەفسەریی گاردی لەبەر کرد، ئیتر سەرە دەرزییەک لەو هەستەی پێشوو لە ناخیدا نەمابوو.

خزمەتی سەربازی بە شێوەی ئاسایی لاوان بەرە و گومڕایی و لەشگرانی دەکێشێ، چونکە لاوان کاتێک ئەو جلوبەگە لەبەر دەکەن ئیتر هیچ کارێکی بە کەڵک ئەنجام نادەن، خۆ لە ئەرکە کۆمەڵایەتییەکا دەبوێرن، بیر و مێشکیان دەکەوێتە چوارچێوەی ڕێزدانان بۆ ئاڵا و جلوبەرگ و پلەوپایەوە. زنجیرەی پلەبەندی و دەرەجەی ئەفسەری لە هەموو شتێک زیارتر بەلایانەوە گرینگە و تەنانەت پێیان وایە کاری بنەڕەتیی دنیا هەر ئەوەیە و دەبێ هەر کەسەی بەسەر کەسی خوار خۆیدا زاڵ بێ و زوڵمی لێ بکات و فەرمانی پێ بکا و گوێڕایەڵی خاوەن پلەکانی سەرووی خۆی بێ.

گوێڕایەڵی کوێرانە، ڕێزدانانی ساختە و درۆکامین بۆ جلوبەرگ و دەرجە وردە وردە بە جێیەک دەگا کە هەموو چەشنە زوڵم و گەندەڵی و دڵڕەقییەک لەو چوار چێوەیەدا ئاسایی بنوێنێ و تێکڕا پێڕەویی لێ بکەن. لەم نێوانەدا، ئەفسەرانی گاردی ئیمپڕاتۆڕی کە کەسانێکن لە بنەماڵە و کەسوکاری خانەدانە دەسەڵاتدارەکان، بە هۆی ناسیاوی و هەڵسوکەوت لەگەڵ بنەماڵەی ئیمپڕاتۆڕ تووشی خۆپەرستییەکی شێتانە و بێ بەزەییانە دەبن. نۆخلیدۆڤیش لەو ڕۆژەوە جلوبەرگی ئەفسەرانی گاردی ئیمپڕاتۆڕی لەبەر کرد، تووشی نەخۆشیی خۆپەرستی بوو. دوای ئەوە دەستڕەنگینترین و ناسراوترین بەرگدرووەکان جلوبەرگی سەربازییان بۆ دەدروو و گرانبابیترین پارچەی دەکڕی، کڵاوەکەشی باشترین کڵاودروو بۆی سازدەکرد. دەمانچەکەی

کەسێکی تر بۆی دەسڕی و بریقەی پێ دەخست. ئەسپە ڕەسەن و تیژڕۆکەی چەند مەیتەر و بەیتاڵ پێی ڕادەگەیشتن و تیماریان دەکرد، زینیان دەکرد و تەنیا کاری ئەوە بوو سواری بێت و لە گۆڕەپانی مەشقی سەبازخانە ئامادەبێ، قیتوقۆز لە سەر مالّی زین دانیشێ. دەست بە شمشێر چوارناڵ غاری دەدا و تاقمێکی فێری مەشق و سوارکاری دەکرد. ئەفسەرانی پایەبەرز و تیزار خۆی لەوێ ئامادە دەبوون و ئەفسەرانی گاردیان تەشویق دەکرد و ئەوانیان بە شانازیی کۆمەڵگا دادەنا. نۆخلیدۆڤ دوای خزمەتی ڕۆژانە دەچوو بۆ باشگای ئەفسەران یان بارە بەناوبانگەکان، لەگەڵ هاوقەتارەکانی خەریکی خواردن و خواردنەوە دەبوو، زۆری هەڵەخەرجی دەکرد و شەودرەنگان دەچوو بۆ شانۆ یان کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێ و لەگەڵ ژنان ڕایدەبوارد، بەم شێوە ژیانی بە سوارکاری و شمشێربازی و تیرەندازی و خواردنەوە و خۆشگوزەرانی ڕادەبوارد.

ئەم شێوە ژیانەی ئەفسەران کۆمەڵگا تووشی گەندەڵی و خراپەکاری دەکات. لە نێوان فەرمانبەرانی دەوڵەتیشدا هەن کە بەم شێوەیە ڕۆژ و شەویان ڕادەبوێرن، بەڵام لانیکەم ئەوان لە هەمبەر ویژدانی خۆیاندا شەرمەزار دەبن؛ کەچی ئەفسەرەکان پێیان وایە ژیان دەبێ بەو شێوەیە بێ و لەخۆ دەفشن و هەست بەسەربەرزی دەکەن، لەڕۆژانی شەڕدا تەنانەت دەست دەکەن بە شاتوشووت و خۆڕانان. کاتێک شەڕی نێوان ڕووسیا و عوسمانی[10] ڕووی دا، نۆخلیدۆڤ و هاو قەتارەکانی خۆپەرەستانە فیزیان بە سەر کۆمەڵگادا لێدەدا و دەیانگوت: «کەسانێکی وەک ئێمە خەباتگێڕ و فیداکار

10 ـ شەڕی ڕووسیا و عوسمانی ساڵی 1856 بە ناوبژیوانی پاریس کۆتایی پێ هات. لەم شەڕەدا فەڕەنسا و بریتانیاش بەشدار بوون و لە کەریمە لەگەڵ سوپای تیزار تێک هەڵچوون.

شایانی ئەو جۆرە ژیانەن و دەبێ بە خۆشی ڕایبوێرن؛ چونکە ئەم کەیف و خۆشگوزەرانیی بۆ ئێمەومانان پێویستە!»

کۆنت نۆخلیدۆڤ لەو کاتەدا کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئەو چەشنە بیر و خەیاڵە و ئەو ئاکارانە بۆ ئەو وەک جۆرێک نەخۆشیی لێ هاتبوو. ئەو هیچ سنوورێکی نەدەناسی و خۆی بە کەسێکی ئازاد دەزانی. خۆپەرستییەکەی لە ڕادەی تێپەڕاندبوو و ڕاست بەو خەسڵەت و ئاکارەوە دوای سێ ساڵ دیسان ڕۆیشتەوە بۆ هاوینەهەواری ماڵی پوورەکانی.

# چاردە

نۆخلیدۆڤ دەچوو بۆ مەیدانی شەڕ و هاوینەهەواری پوورەکانی لە سەر ڕێگاکەی هەڵکەوتبوو. پوورە بە ساڵدا چووەکانی زۆر جار داوایان لێکردبوو بچێ بۆ سەردانیان. کاتیۆشای شۆخوشەنگیش لەوێ بوو. وەێدەچوو دێوی هەوەس لە ناخیدا زنجیری سپاندبێ و بێ ئیختیار بەرە و ئەوێی ڕاکێشێ. یان ڕەنگە واش نەبێ. سەرەتا بڕیاری دا چەند کاتژمێر لەلای پوورە دڵسۆزەکانی بمێنێتەوە، ئەو پوورانەی کە هێندێ جار وەک مەڵحەکە دەهاتنە بەرچاوی، لە حاڵوباڵیان ئاگادار بێ و بەرەو ئوردووگای سەربازی وەڕێ بکەوێ.

کۆتایی مانگی مارس بوو، ڕۆژی هەینیی پیرۆز[11] بەفر لە ژێر لێزمەی بارانێکی بەخوڕدا دەتوانەوە و جۆگە و جۆباران پڕ بووبوون لە ئاو و لافاو هەستابوو. نۆخلیدۆڤ سەرتاپای خووسابوو. کاتێک خرمەی پێی ئەسپ و

11 ـ ڕۆژێک کە بە بۆنەی ساڵوەگەڕی کۆچی دوایی مەسیح لە کڵێسە ڕێوڕەسمێک بەڕێوە دەبەن.

سیرەی کاشـە لە پشـت حەوشـەی مـاڵی پوورەکـانییەوە هـات، حەزی دەکـرد یەکەم کەس کاتیۆشا بەرە پیری بێ. هێشتا حەوشەکە پڕ بوو لە بەفر؛ چونکە لە زستاندا سەربانەکانیان دەماڵی و بەفرەکانیـان دەکردە حەوشـە و لە سـەر یەک دەبـووە لـۆدە. لە دوورەوە چـاوی بە دو ژنـی گوندنشـین کەوت کە بە تەنوورەی فش و پڕ چینەوە سـەتڵی پر ئاویـان بەدەسـتەوە بـوو و تەرکـی هەیوانەکەیان دەشۆردوە. تیخوون خزمەتکاری بەسـالاچوو، کە بەر هەڵبێنەی لێدابوو چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوت و بە هەڵداوان هات بۆلای. پوورە سووفی ــ ش کە لە هەلاتنــی بــرازاکەی ئاگــادار بووبــوو، بە کــلاو و جلــوبەرگی هەوریشمینەوە هات بەرەو پیری.

- زۆر کارێکی باشت کرد هـاتی، ماریـا حـاڵی بـاش نییە، لە کلێسـە مانـدوو بووە، خەریکە پشوو دەدا.

نۆخلیدۆڤ دەستی پووری ماچ کرد.

- پوورێ گیان! ببوورە کراسەکەتم تەڕ کرد.

- سەرتاپات خووساوە، زووکە بـا بچینە ژوورێ خۆت وشـک بکەوە. ئەو سمێڵەشت زۆر لێ دەکاڵێتەوە!

پوورە سووفی بانگی کاتیۆشای کرد و دەسـتووری پێدا قـاوە سـاز بکـات. دەنگی کاتیۆشا لە دالانەکەوە هاتە گوێ.

- بە چاوان هەر ئێستا سازی دەکەم.

نۆخلیــدۆڤ کەوتە دڵەکــوتە. «کەوایە ئەو هێشــتا لێــرەیە!» وەک ئەوەی پڕشنگی زێرینی خۆر دڕ بە هەوری ڕەش بدات و دنیا ڕووناک بکاتەوە.

شاد و دڵخۆش بەدوای تیخووندا ڕۆیشت و چووە ژوورێک تـاکوو جلە خووسـاوەکانی بگۆڕێ. حەزی دەکـرد تیخـوونی بەسـالاچوو بـدوێنێ و بـۆی دەرکەوێ کاتیۆشـا چـی دەکـا؟ لە چ بارودۆخێکـدایە؟ شـووی کـردووە یـان

دەزگیران دارە؟ بەڵام تیخوون هێندە بەڕێز و ئەدەبەوە قسەی دەکرد و ئاوی بەدەستدا دەکرد کە دەستی بشوا، بە ناچاری پاشگەز بۆوە و تەنیا حاڵی نەوەکانی و هێستره پیرە کە ناویان نابوو «برادەر» و پوولکان سەگە پیرەکەی مێگەلی پرسی و بۆی دەرکەوت پوولکان ساڵی ڕابردوو هار بووە و چەند کەسی گوندەکەی گرتووە.

دەست و دەمووچاوی شۆرد و جلەکانی گۆڕی. تـرپەی پێیەکی لە داڵانەکەوە بیست. دەستێک بە هێواشی لە دەرگاکەی دا ترپی پێ و لە دەرگادانەکەی ناسییەوە. تەنیا ئەو لەو ماڵەدا بەو شێوەیە بەڕێدا دەڕۆیشت و ئاوا لە دەرگای دەدا.

باڵتە تەڕەکەی بەشانیدا دا و دەرگاکەی کردەوە.

- وەرە ژووریّ!

خۆی بوو. کاتیۆشا بوو. نەگۆڕا بوو. زۆر جوانتر بووبوو. هەر بەو چاوە ڕەشانەوە کە تۆزێ شیرین خێل بوو. هەر بەو شێوەیە دەیڕوانی. وەک جاران بەرهەڵبێنەی سپی لێدا بوو. سابوونی بۆنخۆش و خاولیی حەمام و خاولیی دەست و دەمووچاوی بۆ هێنا بوو. هەموو شتێک خاوێن و ڕێکوپێک، کاتیۆشا خۆشی وەک ڕابواردوو جوان و پاک و خاوێن بوو. لێوە سوور و خونچەییەکەی هەروا دڵفڕێن و دەموچاوە سپی و ناسکەکەی سوور هەڵگەڕابوو.

ـ دیمیتری ئیڤانۆڤیچ! بەخێر بێی. پوورە خانم خاولی و سابوونی بۆ ناردووی. ئەم سابوونە بۆنی گوڵەباخی لێدێ و ئێوە حەزی پێدەکەن.

سابوونەکەی لە سەر مێزەکە دانا و خاولییەکەی بەسەر کەمەی کورسییەکەدا دا. نۆخلیدۆڤ کە لەم ساڵانەدا زۆری ئەزموون کۆ کردبۆوە، دوودڵ بوو کە خۆمانە قسەی لەگەڵ بکات یان بە شێوەیەکی ویشک و فەرمی؟

- چۆنی، باشی؟
- شوکر بۆ خودا باشم!
تیخوون کە دەیویست وا بنوێنێ کە میوانی تازە هاتووە، هەموو شتێکی لەگەڵ خۆی هێناوە، جانتا زارک ئاوەڵاکەی هێنایە پێشێ و گوتی:
- حەزرەتی مەزن! هەموو شتێک ئامادەیە!
جانتاکە پڕ بوو لە هەموو چەشنە شانە و عەتر و سابوون و شتی بۆن خۆشی تر کە بۆ شۆردن و بۆنخۆشکردنی سەر و لەش پێویست بوو. نۆخلیدۆڤ داوای لە کاتیۆشا کرد سپاس لە پوورەکانی بکات کە ئەو خاولی و سابوونەیان ناردووە. کاتیۆشا بە شیلە بزەیەک لێوە سوور و جوانەکەی کرایەوە و لە ژوورە کە چووە دەرێ.
پوورەکانی کە برازاکەیان بە قەد ڕۆح و گیانیان خۆش دەویست، بە گەرموگوڕی پێشوازییان لێکرد و چونکە ئەمجارەیان دەچوو بۆ بەرگەی شەڕ و گیانی لە مەترسیدا بوو، زیاتر لە جاران ڕێزیان لێگرت و لاواندیانەوە.
نۆخلیدۆڤ دەیویست ڕۆژێک لەوێ بمێنێتەوە بەڵام کاتێک چاوی بە کاتیۆشا کەوت، پێملی پێداگریی پوورەکانی بوو کە دوو ڕۆژی تر بمێنێتەوە و جەژنی پاک لەگەڵیاندا بێ، هەر بۆیە تیگلەڕافێکی بۆ شۆنبووکی هاوڕێی کرد کە لە ئەدسا چاوەڕوانی بوو و داوای لێکرد بێت بۆ لای.
هەر لە یەکەم دیداردا هەستی کرد ئەوینی ڕابردوو لە ناخیدا ژیاوەتەوە. هەر کە چاوی بە بەرهەڵبێنە سپییەکەی دەکەوت، یان زایەڵەی دەنگی و قریشکەی پێکەنین و ترپەی پێی دەبیست، دڵی دەکەوتە کوتەکوت و سوورهەڵدەگەڕا. ئاشق بووبوو. سی ساڵ لەمەوبەر ئەوین لەبەر چاوی پاک و پڕ لە ڕازی خودایی بوو. حەزی دەکرد ئەو هەستە بشارێتەوە و بە هیچ کەسی نەڵێ؛ بەڵام ئێستا ئەوین بۆ ئەو شتێکی تر بوو. ئەگەرچی لە سەر ئەو باوەڕەبوو مرۆڤ لە ماوەی

ژیانیدا تەنیا جارێک ئاشق دەبێ، بەڵام ئەمجارەیان نەیدەوست زۆر خۆی بخاتە زەحمەتەوە و بیر لە ئاکامی ئەم ئەشقە بکاتەوە.

وەک هەموو مرۆڤەکان خاوەنی کەسایەتییەکی دوولایانە بوو؛ لە لایەکەوە پیاوێکی پاک و خێرخواز بوو؛ زۆر گرینگی بە ئەخلاق و ئاکاری جوان دەدا و لە هەموو کارێکیدا بەرژەوەندیی خۆی و خەڵکی لەبەر چاو دەگرت و پێی لەبەرەی خۆی زیاتر ڕانەدەکێشا؛ لە لایەکی دیکەشەوە کەسێک بوو کە دەیویست بە دڵی خۆی چێژ لە دنیا وەرگرێ و هەموو دنیا بکاتە قوربانی ساتێک کەیف و نەهەنگ و ڕابواردن. لەم دواییانەدا، ئاو و هەوای پترزبۆرگ و مانەوە لە سەربازخانە وای لێکرد بوو پۆز و هەوا و خۆپەرستی لە مێشکیدا سەر هەڵبدات و هەستی مرۆڤانە لە ڕۆحیدا مردبوو، بەڵام بە دیتنی کاتیۆشا ئەو هەست و دڵنەرمییانە لە ناخیدا ژیاوە. لەو ڕۆژەدا کە ڕێکەوتەکەی لەگەڵ جێژنی پاک بوو، ئەم دوو ڕۆحە پاک و ناپاکە پێکەوە کەوتنە ململانێ و ئارا و قەراریان لێهەڵگرت.

هێندێ جار بیری دەکردەوە پێش ئەوەی کارەکەی لێ ئاڵۆز بێ، ڕابکات و لە ماڵی پوورەکانی دوور کەوێتەوە، بەڵام نەیدەتوانی واز لەو هەموو خۆشی و چێژە ڕۆحییە بێنێ و بچێت بۆ سەربازخانە و بەرەگەی شەڕ.

شەوی جێژنی پاک[12] قەشە و جانکوشی کلێسە، بۆ بەرز و پیرۆز ڕاگرتنی جێژنەکە هاتن بۆ ماڵی پوورەکانی. ئەوان سێ وێرستیان[13] ڕێگا بڕیبوو و چونکە بەفرەکە توابۆوە بە سواری کاشە بە نێو قوڕ و چڵپاودا هاتبوون. نۆخلیدۆڤ و پوورەکانی و هەموو خزمەتکاران لەو ڕێوڕەسمدا بەشداریان دەکرد. کۆنتی لاو چاوی لە سەر کاتیۆشا هەڵنەدەگرت کە

12- ڕێوڕەسمی ئایینی جێژنی پاک لە ڕووسیا کە شەوانە بەڕێوە دەچێ.

13 - ڤێرست Verste هەزار و شەست و حەوت مەترە.

مەنقەڵێکی پڕ لە سکڵی بەدەستەوە بوو و لە نزیک دەرگاکە ڕاوەستا بوو. دوای کۆتایی هاتنی دۆعا و پاڕانەوە، نۆخلیدۆڤ دەستی قەشە و پوورەکانی ماچ کرد و ڕۆیشت بۆ ژووری خەوەکەی بەڵام لە دالانەکە گوێی لێ بوو ماترنای بە سالاچوو گوتی دەیهەوێ لەگەڵ کاتیۆشا بچێت بۆ کلێسە و لەو ڕێوڕەسمەدا بەشداری بکات بۆ ئەوەی لە بەرەکەتی کەیکی جێژنی پاک بێبەش نەبێ. نۆخلیدۆڤیش هاتە سەر ئەوەی بچێت بۆ کلێسا. کاشە و فەیتوون بۆ تێپەڕین لەو قوڕ و زێلاقەیە بەکار نەدەهات، بۆیە دەستووری دا پیرە ئێسترەکەیان کە پێیان دەگوت «برادەر» بۆی زین بکەن، جلوبەرگی ئەفسەری و پانتۆڵی تەنگی لەبەرکرد و پاڵتۆی ئەفسەری بە شانیدا دا و سواری ئێسترە پیرە بوو و بەرەو کلێسە وەڕێکەوت.

# پازدە

نۆخلیدۆڤ هیچکات بیرەوەریی ئە شەوەی لە بیر نەبردەوە. کاتێک گەیشتە حەوشەی پڕ لە قوڕ و بەفراوی پشت کلیساکە، پیرە ئێستێرەکە ئاو بە لاقەبرغەیدا دەچوڕا. شڵێوەی دەکرد و گوێچکەی ئێستێرەکە لە ژێر کولووە بەفری ئاوەکیدا بریقەی دەهات. پەنجەرەی کلیساکە شۆقی لێ دەڕژایە دەرێ. وەرزێرەکان کاتێک بۆیان دەرکەوت ئەو برازای شازادە خانمەکانە، بەپەلە چوون بۆلای، بارگینەکەیان لێ وەرگرت و بەڕێز و حورمەتەوە ڕێنوێنییان کرد بۆ نێو هۆڵەکە.

لە نێو هۆڵەکەی کلیسادا پیاوان لە بەری دەستە ڕاست دانیشتبوون. پیرە پیاوەکان عەبای شۆڕیان لەبەر کردبوو، هەتا چۆکیان بە بەلەکپێچ پێچابوو و

پێڵاوی دارینەیان لەپێدا بوو. لاوەکان جلوبەرگی ماهووتیان لەبەردابوو، کەمەربەندی سپییان بەستبوو و جزمەیان لەپێ کردبوو. ژنان لەبەری دەستە چەپ دانیشتبوون. جحێڵەکانیان لەچکەی هەوریشمینی سووریان بە سەردا دابوو، تێلەگی مەخمەری سوور و تەنوورەی سەوز و شین و ڕەنگاوڕەنگایان لەبەردا و کەوشی پاژنە تەقتەقیلەیان لە پێدابوو، پیرێژنەکان جلوبەرگی مەیلەوخۆڵەمێشینیان لەبەردا و لەچکەی سپی بە سەرەوە و پێڵاوی دارینیان لە پێدابوو، لە ڕیزی دواوە دانیشتبوون. لە نێوان ئەو دوو دەستەیەشدا منداڵان بەجلوبەرگی نوێ و سەروقژی شانە کراو و ڕۆن لێ دراوەوە دانیشتبوون. گوندنشینە بەساڵاچووەکان لە پەستا خاچی خۆیان دەکێشا. لە بەر دەمی خاچەگەورەکەدا سەریان دادەخست و هێندێ جاریش چۆکیان دادەدا. پیرێژنەکان چاویان لە شەم و شەمدانە داییساوەکان بڕیبوو و لەو ڕووناکییە پڕ لە ڕازە ڕامابوون و خاچی خۆیان دەکێشا. منداڵانیش لاسایی گەورەکانیان دەکردەوە، بەتایبەت ئەو کاتانەی کە قورسایی سەرنجی گەورەکانیان لە سەر خۆیان هەست پێدەکرد، لە بەر خۆیانەوە ورتەیان دەهات و دۆعایان دەخوێند.

نۆخلیدۆڤ چوو بۆ ڕیزی یەکەم. گەورە و خانەدانەکانی ناوچە لەو شوێنە دانیشتبوون. یەکێک لەو مالیکانە جلوبەرگی ئەفسەرانی هێزی دەریایی لەبەردابوو، لەگەڵ ژن و منداڵەکەی و تیلگەڕافچی و سەرۆکی جەندرمەکان و قایمەقام کە میدالیایەکی لەمل کردبوو، هەروەها لەگەڵ چەند بازرگان، لەتەنیشتی یەک دانیشتبوون. ماترنا ئیڤانۆڤنا و کاتیۆشا لە پشت سەری ئەوانەوە بوون. ماترنا کراسێکی مەخمەری بنەوشی لەبەردا و شاڵێکی سپیی پەشمینەی بە سەر شانیدا دابوو. کاتیۆشا کەمەرەیەکی مەیلە و شینی لە سەر کراسە سپییەکەی بەستبوو و بە قردیلەی سوور بسکە ڕەشەکەی

ڕازانـدبۆوه. هەمـوو کەس و هەمـوو شـتێک ڕەنـگ و بـۆی جێژنـی له خـۆ گرتبوو. شادی و جوانی له هەموو لایەکەوه خۆی دەنواند.

قەشـه بەعەبـای مەلـیله دۆزیـیەوه، خـاچی زێڕینـی به ملیـدا هەڵواسـیبوو. دۆعـاخوێن و جانکوشـەکانی کلیسـا عەبـای زەڕییـان لەبەردابـوو بەپەراوێـزی زێوینەوه و شـەمدانی زێونییـان بەدەسـتەوه گرتبـوو. گرووپـی سـروودوێژان جلـوبەرگی نوێیـان لەبەردا و ڕۆنیـان له قژیـان دابـوو، دوای هەر ئاوازێـک، هەوایەکی خۆشی دیکەیان دەستپیدەکرد. قەشه و جانکوش و دۆعا خوێنەکان به نێـو هـۆڵەکەدا دەگەڕان. قەشـه مزگێنیـی به ئامـاده بـووان دەدا که لەم جێـژنەدا خێـر و بەرەکەتـی خـودا به لێشـاوه و پیـرۆز بـایی «پەسـلاّنی مەسیحی» لیّ دەکردن و هیوای به دڵیان دەبەخشی. هەموو شتێک له بەر چاوی نۆخلیدۆڤ جوانی دەنواند، له هەمووشـی جوانتر کاتیۆشا بوو که به کراسی سپی و کەمەرەی شین و قردێلەی سوورەوه که قژی پیّ ڕازاندبۆوه؛ چـاوه گەشەکانیشـی که تروسـکەی بزەیـان تێـزا بـوو ئەوەندەی تـر دڵـڕفێن بوون.

نۆخلیدۆڤ هەستی دەکرد پەپوولەی سرکی نیگای کاتیۆشـا بەدووی ئەودا دەگەڕیّ، کاتێـک له جێـی خـۆی هەسـتا تـاکوو بچـیّ بـۆ لای مێحـرابەکه و بەرەکەت له دەسـتی قەشـه وەرگـریّ، له نزیکـی کاتیۆشـا گتێکـی گـرت و له سەرەخۆ گوتی: «پووره خانم گوتیان ناخەوین تاکوو دوای کۆتایی هاتنی ڕێوڕەسمەکه بچین بۆ لایان.»

کاتیۆشا سوور هەڵگەڕا و وەک هەمیشه چاوه ڕەشه شیرین خیلەکەی بزەی تێزا.

ـ بەڵیّ، دەزانم.

یەکێـک لە دۆعـا خوێنەکـانی کلێســە کە دەفرێکـی مسـینی پـڕ لە ئـاوی متفەڕکی بەدەستەوە بوو، بەبێ ئەوەی لە ڕاز و نهێنی دڵی ئەوان ئاگادار بێ، کەوتە نێوانیانەوە و ئاوی متفەڕکی لە سـەر و ڕوخسـاری نۆخلیدۆڤ پرژاند. دۆعـا خـوێن نەیزانـی ئەوەی لەم کلێسـەیە بەڕێـوە دەچـی و ئەوەی لە هەمـوو دنیـاش بەڕێـوە دەبەن لە بەر چـاوی ئەو تووریێـک نـاژی و لە بەر چـاوی ئەو کاتیۆشــا ناوەنـدی جیهــانە! خــاچی گەورە دەبرسـکایەوە، مۆمەکـان لە نێـو شـــەمدانی و چلچراکانــدا ترووســـکەیان دەهـــات، گرووپـــی ســـروودوێژان خۆشـترین ئاوازیـان دەخوێنـد و نۆخلیـدۆڤ ئەم هەمـوو جـوانی و شـکۆ و درەوشـانەوەی تەواوی لە چـاوی کاتیۆشاشـدا دەخوێنـدەوە کە ئەویـش ئەو هەسـتە لە دڵیـدایە و هەمـوو شـتێک لە وجـوودی ئەودا دەبینـێ. گرووپـی سروودوێژان ئەم شیعرەیان دەگوت:

**« ئەی دڵە مێهرەبانەکان!**

**ئەم شەو هەموو ئاسمانەکان جێژنیانە،**

**ئەی دڵە مێهرەبانەکان!**

**ڕێک بکەون لەگەڵ ئاسمان ئاشقانە،**

**ئەی دڵە مێهرەبانەکان!»**

ئەو دوو گەنجە دڵدۆڕاوە هەستیان دەکرد، گرووپی سروودوێژان وەسفی ئەشـــــقەکەی ئەوان دەکەن و ئاســـــمانەکان ئەو جێژنەیـــــان بـــــۆ ئەوان وەڕێخستووە.

کاتێک ڕێوڕەسمەکە کۆتایی هات، نۆخلیدۆڤ دری بە ئـاپۆرەی خەڵکەکەدا و هـاتەدەرێ. گوندنیشـینەکان بەڕێـزەوە ڕێگایـان بـۆکردەوە و ئەو کەسـانەی نەیاندەناسـی دەمیـان دەبـردە بـن گـوێچکەی هاوڕێکەیـانەوە و ناوەکەیـان دەپرسی، کۆنت نۆخلیدۆڤ ئەوەی پارەی لە گیرفانیدا بوو، بە سـەر سواڵکەر

و هەژارەکاندا دابەشی کرد و لە قالّدرمەکان هاتەخوارێ. کات لە نیوەشەو لایدابوو. ئەو گوندنشینانەی لە سەر بەردی گۆڕەکانی دەوری کلێسە دانیشتبوون، یەک یەک و دوو دوو هەستان و ڕۆشیتن. هێشتا کاتیۆشا لە کلیسا نەهاتبووە دەرێ، نۆخلیدۆڤ لە دەرەوە چاوەڕوانی بوو.

گوندنیشنەکان پۆل پۆل لە هۆلّەکە دەهاتنەدەرێ و کاتێک بەقالّدرمەکاندا دادەگەڕان، پاشنەی کەوشە تەقتەقیلەکانیان لە سەر بەردەکان، تەقوکوتی دەهات و خرمە و تەقەیەکی وشک گۆڕستانی بەر کلیساکەی داگرتبوو. پیرەپیاوێک کە پێشتر ئاشپەزی پوورەکانی بوو، کۆنتی لاوی ناسییەوە، هاتە پێشێ و جێژن مەبارەکیی لێکرد و سێ جاری ماچ کرد. ژنەکەی کە پیر و خڕیلانە بوو، پرچە سپییەکەی بە لەچکەیەکی ئارمووشی داپۆشیبوو، هاتە پێشێ و هێلکەیەکی بە زەعفەران ڕەنگ کراوی پێشکەش بە کۆنت نۆخلیدۆڤ کرد. دوای ئەو گەنجێکی کەلّەگەتی چوارشانە باوەشی بە نۆخلیدۆڤدا کرد و سێ جار ڕوومەتە بۆنخۆش و تیفتیفە دراوەکەی ماچ کرد و هێلکەیەکی ڕەنگ کروای پێدا. لەم کاتەدا، نۆخلیدۆڤ داوێنی پڕچینی کراسەکەی ماترنا و بەدوای ئەودا پرچە ڕەشەکەی کاتیۆشای بە قردیلەی سوورەوە دی و ڕوخساری گەشایەوە. ماترنا و کاتیۆشا لە بەر دەرگاکەدا گتێکیان گرت تاکوو سەدەقە بدەن بە فەقیر و خوازەلّۆکەکان. لەو کاتەدا سوالّکەرێکی لووت گول دەستی لە بەردەمی کاتیۆشادا پانکردەوە و ئەویش بە ڕوویەکی خۆشەوە دراوێکی خستە لەپی دەستییەوە و سێ جار ڕوومەتی ماچ کرد، هەر لەو کاتەداشدا کە سوالّکەرێکی گولی دیکەی لە باوەش گرت بوو، چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوت. دەتگوت لیێ دەپرسێ: «ئەو کارەی ئەوی بەدلّە یان نا؟» کۆنتیش بە چاوی وەلاّمی دایەوە: «ئەری؛ خۆشەویستەکەم. تۆ هەرکارێک بکەی من بە دلّمە و خۆشم دەوێی.»

لە قاڵدرمەکان هاتنە خوارێ. نۆخلیدۆڤ چووە پێشێ. ماترنا بە لۆی دەسماڵەکەی لێوی خۆی سڕی و ڕوومەتی کۆنت نۆخلیدۆڤی ماچ کرد. ماترنا هەستی دەکرد ڕۆژی پەسلانی مەسیح بەسەردا هاتووە و چونکە هەمووان پێکەوە یەکسان بوون ؛ هەژار و سامانداڕ و شازادە و گەدا یەکتریان ماچ دەکرد. کاتیۆشا هاتە پێشێ.

ـ دیمیتری ئیڤانۆڤیچ؛ پەسلانی مەسیح پیرۆز بێ ؛

دوو جار یەکتریان ماچ کرد و بۆ چەند چرکەیەک چاویان لە چاوی یەکتر بڕی. دەتگوت بە چاو لە یەکتریان دەپرسی پێویستە سێهەم ماچیش بکەن؟ چاویان وەلامەکەی ئەرێ بوو. سێهەمەمین گوڵەماچیان لە ڕوخساری یەکتردا و پێکەنینێکی ئاشقانە لێویانی گەشاندەوە.

ـ کاتیۆشا؛ دیسان دەچییەوە بۆلای قەشە؟

ـ نا، هەر لێرە ڕادەوەستین هەتا قەشە دێ.

کاتیۆشا شاد و گەشاوە، بە چاوە جوان و مێهرەبانەکەی لە کۆنتی دەڕوانی. خۆشەویستی کاتێک دەگاتە لووتکە؛ نە ڕێگا بە ئاوەز دەدا بێتە هەرێمە پیرۆزەکەیەوە و نە هەوەس. نۆخلیدۆڤ لەو شەوی جێژنەدا بەو لووتکەیە گەیشتبوو. لە مێشکی خۆیدا پەیکەرەیەکی لە کاتیۆشا دروستکردبوو بەقژی ڕەش و کراسی پرچینی سپی و ئەندامی نەرمونۆڵ و چاوانی نیوە خەواڵووەوە، لە مێحرابی گیانی خۆیدا دانابوو، هەرجارێ کە وەبیری دەهاتەوە ئەو کچە چەندە ڕووخۆش و مێهرەبانانە ڕوومەتی ئەو سواڵکەرە گولەی ماچ کرد، زیاتر دڵی بۆ لای دەخوشی و شەیدای دەبوو.

ئەو شەوە ئەوین لە گیان و دڵیدا ڕسکابوو و بۆ ساتێک خۆی لە سەر لووتکەی ئەشق و پاکی هەست پێکردبوو. لەو کاتەدا لە ژووری لێژنەی داوەری و لە پاڵ پەنجەرەکەدا دانیشتبوو، خۆی سەرکۆنە دەکرد و بەخۆی

دەگوت ئەگەر ئەو شەوە لە پاکی و ئەشقی ڕاستەقینە تێبگەیشبایە و ڕاز و واتای ئەو ساتە پیرۆزەی بۆ دەربکەوتایە، ئێستا کاتیۆشا لە سەر کورسیی تۆمەتباری دانەنیشتبوو.

## شازدە

کاتێک لە کلیسا گەڕایەوە، نۆخلیدۆڤ لەگەڵ پوورەکانی لە سەر مێز دانیشت و شتێکی خوارد، بۆ ئەوەی شەکەتیی شەوانەشی لە نێو بچێ، پیاڵەیەکی شەڕاب خواردەوە. پاشان ڕۆیشت بۆ ژووری خەوەکەی و بە جلوبەرگەوە لە سەر تەختەکەی ڕاکشا. چەند خولەک دواتر دەستێک لە دەرگاکەی دا. خەبەری بۆوە، دڵی خەبەریدا کە دەبێ خۆی بێ. هەستا دەستێکی بە چاویدا هێنا.

- کاتیۆشا؛ تۆی؟ وەرە ژووریٚ؛

دەرگاکە کەلێنێکی پێدرا.

- شیو ئامادەیە و چاوەڕوانی ئێوەن.

هەر ئەو کراسە سپییەی دوێشەوی لەبەردا بوو، قردێلە سوورەکەی لە قژی کردبۆوە. نۆخلیدۆڤ لە کەلێنی دەرگاکەوە دیتی و شەکەتی و خەواڵوویی لە سەری پەڕی.

- هەرئێستا دێم.

هەستا سەری داهێنا. لە ناکاو وەخۆ هاتەوە، شانەکەی لە سەر مێزەکە دانا و هەڵات بۆ دالانەکە. کاتیۆشا خەریک بوو بە هەنگاوی ورد و خێرا

دەڕۆیشت، کەوتە دوای... «منیش چەندە گەوجم؛ بۆچی نەمکێشایە ژووریَ ماچی بکەم؟» نەیدەزانی چی لە کاتیۆشا دەخوازیَ.

ـ چیت پێویستە؟

ـ هیچ؛...

چووە، پێشترەوە و باوەشی پێداکرد.

ـ نا، وامەکە... نابیَ...

کاتیۆشا سوور هەڵگەڕابوو، بە دەستە نەرم و وردیلەکانی، خۆی لە باسکی بە هێزی کۆنت ڕاپسکاند. نۆخلیدۆڤ تۆزیَ کشا دواوە. دەستی شل بۆوە. هاوارێک لە دەروونەوە پێی گوت کە پاکی و جوامێری نەخاتە پشت گویَ. تریق بۆوە. هاوارەکەی ناخی زۆر بەهێز نەبوو، پشووی هاتەوە سەرخۆ. دەنگێکی تر هانی دا: «گەوجە، بۆ ڕاوەستاوی؛ شەق لە بەختی خۆت هەڵمەدە. قەتت ئاوا بۆ هەڵناکەویَ.»

دیسان باوەشی پێدا کردەوە. لێوی بە لاملە ناسکەکەیەوە ناو ماچی کرد. ئەم ماچە زۆر لەگەڵ ئەو ماچەی سیَ ساڵ لەمەوبەری بن داریاسە بنەوشەکە جیاواز بوو. هەروەها لەگەڵ ماچەکەی شەوی جێژنی پاکیش زۆر جیاواز بوو. کاتیۆشا سەرکۆنەی کرد. وەک کەسێک کە منداڵیک لە شکاندنی دەفرێکی گرانبایی بگێڕێتەوە.

ـ بۆچی وادەکەی؟

خۆی لەباوەشی ڕاپسکاند و بە هەڵاتن ڕۆیشت.

لە سەر مێزی شێو جگە لە پوورەکانی کە خۆیان لە گوڵدابوو، چەند کەس لە دراوسێکان و پزشیکی گوندەکەش لەویَ بوون. هەموو شتێک خۆش و خۆمانە بوو، بەڵام لە ناخی نۆخلیدۆڤدا تۆفان و ڕەشەبایەک هەڵیکردبوو و ئاراوقارای لێهەڵگرتبوو. دەنگی هیچ کەسی نەدەبیست. بیری هەر لەلای

کاتیۆشا بوو. تامی ماچەکەی نێو دالان هەروا لە سەر لێوی بوو. کاتێک کاتیۆشا هات، چاوێکی لێکرد. هاتنی کچە لەرزی شکاندە گیانی. دەترسا چاو لە چاوی بکات.

دوای شێو ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی. گوێی بۆ هەموو دەنگ و ترپەیەکی دالانەکە شل کردبوو، دەیویست گوێی لە ترپەی پێی ئەو بێ. ئیتر ئەو مرۆڤەی سێ ساڵ لەمەوبەر نەبوو کە بەشێوەیەکی سادە و خۆشەویستییەکی پاکەوە دەستی کاتیۆشای دەگرت و هەڵدەهات. ئیتر ئەو مرۆڤەی چەند کاتژمێر لەمەوبەریش نەبوو کە بە ئەشق و تامەزرۆییەوە لە ڕێوڕەسمەکەی کلیسادا چاوی لە کاتیۆشا بڕیبوو. دێوێک لە ناخیدا سەری هەڵدابوو و ئۆقرە و ئارامی لێهەڵگرتبوو.

ئەو ڕۆژە ڕووی لە هەر لایەک دەکرد، نەیدەتوانی لەگەڵ کاتیۆشا تەنیا بکەوێ. کاتیۆشا نەیدەوێرا لێی نزیک بێتەوە، بەڵام ئەو هەروا لە دەرفەتێک دەگەڕا. بڕیار بوو ئەو شەوە پزیشک لەوێ بمێنێتەوە. کاتیۆشا هاتبوو بۆ ژوورەکەی تەنیشتی و خەریکی ڕێکوپێک کردنی نوێن و پێخەفەکان بوو. نۆخلیدۆڤ بەبێ چرپە خۆی کرد بەو ژوورەکەدا؛ دڵی بەپرتاو لێی دەدا. کاتیۆشا خەریکی ڕێکوپێک کردنی بالیفەکان بوو. ئاوڕی دایەوە و زەردەیەکی گرت. بزەکەی بەهۆی شادییەوە نەبوو؛ ترس شکابووە گیانی. وێدەچوو بیهەوێ بەو بزە مەزڵوومانەیە بەزەیی ئەفسەری لاو ببزوێنی. ئەو بزەیەی وێدەچوو سەرکۆنەیەکی بێ دەسەلاتانەی لە ناخی خۆیدا حەشار دابێ. نۆخلیدۆڤ هێشتا دوودڵ بوو. هێندێ جار دەنگی لەرزۆکی ئەشقی دەبیست، بەڵام ویستە نەفسانییەکەی بە هێزتر بوو. ئەم ویستە چنگی لە ناخی گیر کردبوو و نەیدەتوانی بەربەرەکانێی لەگەڵ بکات. شانی کاتیۆشای گرت، لە سەر تەختەکە داینیشاند و لە پاڵیدا دانیشت.

ـ دیمیتری ئیڤانۆڤیچ! خۆشەویستەکەم! تکات لێدەکەم ئەو کارە مەکە. ماترنا ئیڤانۆڤنا هەر ئێستا دێت بۆ ئێرە.

ـ گوێ بگرە کاتیۆشا، ئەمشەو دێم بۆ لات. بەتەنیای؟

ـ نا، مەیە. تۆخودا مەیە!

ئەگەرچی داوای لێکرد وازی لێ بێنێ، بەڵام خۆشی نەیدەزانی چی دەڵێ و چیی دەوێ. ماترنا کە بەتانییەکی بەدەستەوە بوو هاتە ژوورێ. چاوێکی سەرکۆنەئامێزی لە نۆخلیدۆڤ کرد و لە کاتیۆشا تۆوڕە بوو کە بۆچی بەتانیی لەگەڵ خۆی نەهێناوە.

نۆخلیدۆڤ هیچی نەگوت و چووە دەرێ. تەنانەت هەستی بە شەرمەزاریش نەدەکرد. ئەگەرچی لە ڕوخساری ماترنادا خوێندبوویەوە کە چۆن سەبارەت بە ئەو بیر دەکاتەوە، بەڵام گرینگیی بەهیچ شتێک نەدەدا و تەنیا لە بیری ئارەزووی دەروونیی خۆیدا بوو. دەیویست دەست لەگەڵ کاتیۆشا تێکەڵ بکات و جگە لەوەش بیری لە هیچ شتێکی دیکە نەدەکردوە.

ئەو شەوە ئۆقرەی لێ هەڵگیرابوو. هێندێ جار دەچوو بۆ لای پوورەکانی و لەلایان دادەنیشت. هێندێ جار دەچوو بۆ بەرهەیوانەکە و لەوێشەوە پەنای دەبردەوە بۆ ژوورەکەی خۆی. کاتیۆشا خۆی لێ دەدزییەوە و پارێزی لێدەکرد. ماترناش هەردووکیانی خستبووە ژێر چاوەدێری.

# حەڤدە

ئێوارە بەسەردا هات و وڵات تاریک داگەڕا. پزیشکەکە چوو بۆ ژووری خەوەکەی. پوورەکانیشی چوون بۆ ژوورەکەی خۆیان و ماترنا ئیڤانۆڤناش لەگەڵیان چوو یارمەتییان بدات جلەکانیان داکەنن. نۆخلیدۆڤ دەیزانی لەو کاتەدا کاتیۆشا لە ژووری تەنیشت چێشتخانەکە بەتەنیایە. بەقاڵدرمەکاندا داگەڕا و چووە بەر هەیوانەکە. هەوا تاریک و گەرم و شێدار بوو. سەهۆڵی چۆمەکە دەشکان و تەمومژی بەهاری وڵاتی داگرتبوو. نۆخلیدۆڤ بە نێو قوڕ و زیلاقەی تەرکی حەوشەکەدا تێپەڕی. هێندێ جار بەهۆی شڵەژانەوە دەکەوتە دڵەکوتێ و لەوانەبوو هەناسەی ڕاوەستێ. لە ژووری تەنیشت چێشتخانەکە چرایەکی چکۆڵە داییسابوو. کاتیۆشا بەتەنیا لەوێ لە پشت مێزێک دانیشتبوو، خەیاڵاوی چاوی لە شوێنێک بڕیبوو. خوڕە و هاژەی چۆمەکە لە دوورە دەهاتە گوێ. هێندێ جار سەهۆڵ و قاڕقاڕە تێک دەشکان و دەنگێکی وەک شکانی شووشە بێدەنگیی شەوی دەچڕژاند. کۆنتی لاو هێندێ جار دڵسۆزانە چاوی لە کاتیۆشا دەکرد، بەڵام هەستی دڵسۆزی نەدەبووە بەربەستێک بۆ ئەوەی بیر لە دەست تێکەڵکردن نەکاتەوە و چاوپۆشیی لێ بکات.

هەوەس سەرتاپای داگرتبوو. بەنووکی قامکی لەدەربیجەکەی دا. کاتیۆشا وەک ئاسکی سڵۆک لە جێی خۆی دەرپەڕی. ترس سەرتاپای داگرتبوو.

بەپەلە هات بۆبەر دەربیجەکە. دەستی کردە نسێی چاوی و سەری بە شووشەکەوە نا و تەماشای دەرەوەی کرد. چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوت لە تاریکیدا ڕاوەستا بوو. کۆنتی لاو شڵەژابوو. کاتیۆشا قەت ئەوی بەو شێوەیە جیددی و گرژ نەدیتبوو؛ نە پێدەکەنی و نە جووڵەی دەکرد.

بە دەستی ئاماژەی بە کاتیۆشا کرد کە بچێت بۆ لای. کاتیۆشا بە لەقاندنی سەری تێیگەیاند کە ئەو کارە ناکات. نۆخلیدۆڤ دەستی هەڵنەدەگرت. دەیویست بە مشت لە دەربیجەکە بدات کە لە دوورەوە دەنگێکی بیست. بۆی دەرکەوت ماترنا بۆ ئێشێک بانگی کاتیۆشا دەکات.

شەوێکی تاریک و ئەنگوستەچاو بوو، جگە لە شۆقی مەیلەوسووری ئەو چرایەی ژووری تەنیشت چێشخانەکە، هیچ شۆقێکی تر لەو دەوروبەرە وەبەر چاو نەدەکەوت . هاژەی چۆمەکە و هێندێ جار تەقوتۆقی پێکدادران و شکانی قارقارە سەهۆڵ ئاوێتە دەبوون. کەڵەشێرێک لەو تاریکەشەوەدا خوێندی و چەند کەڵەشێری تر وەڵامیان دایەوە. نۆخلیدۆڤ لە نێو قوڕ و زیلاقەی حەوشەکەدا ڕاوەستابوو. دیسان ڕۆیشتەوە بۆبەر پەنجەرەکە. کاتیۆشای دی گەڕاوەتەوە شوێنەکەی خۆی دانیشتووە. چراکە هەروا داییسابوو؛ دیسان لە دەربیجەکەی دا. کاتیۆشا ژوورەکە هاتەدەرێ و لە سەر قاڵدرمەکان ڕاوەستا. نۆخلیدۆڤ بێ ئەوەی قسەیەک بکات باوەشی پێداکرد. کاتیۆشا خۆی لە باوەشی توندکرد و نەرم و کەوی لێوی بۆ ماچەکانی شل کرد.

ـ کاتیۆشا!

دەنگی ماترنا بوو کە دیسان بانگی دەکرد. کاتیۆشا لە باوەشی کۆنت نۆخلیدۆڤی لاو هاتە دەرێ و خۆی کرد بەژووریدا. بێدەنگی دیسان باڵی بە

سـەر وڵاتـدا کێشـایەوە. چـرا چکـۆڵەکەش کـوژایەوە. تەم و تـاریکی ئـاوێتەی یەک بوون. بەڵام هاژەی ڕووبارەکە هەروا دەهاتە گوێ.

نۆخلیـدۆڤ دیسـان ڕۆیشـتەوە بـۆ بەر پەنـجەرەکە و بە قامـک لە شووشـەکەی دا. هـیچ وەڵامێکـی نەبیسـت. گەڕایەوە بـۆ ژووری خەوەکەی. خەوی لێ نەدەکەوت. هەستا و بەدالانە تاریکەکەدا تێپەڕی. دەیزانـی کاتیۆشـا چـۆتە ژووری خەوەکەی خـۆی کە لە پـاڵ ژوورەکەی ماترنـا هەڵکەوتبـوو. کاتێک گەیشتە بەردەرگای ژوورەکەی ماترنا، گتێکی گرت و گوێی شل کرد. ماترنـا نەرم و لە سـەرەخۆ پـرخەی دەهـات. تـۆزێ ڕاوەسـتا. خزمەتکـاری بەسـاڵاچوو کۆخی. کەوتە سـەر شـانەکەی دیکەی و بە ئـارامی هەناسـەیەکی هەڵکێشـا و خەوێکـی قـورس دایگـرت. نۆخلیـدۆڤ چەنـد خـولەک ڕاوەسـتا. هەناسەی لە سینگیدا کۆ کردەوە. کاتێک هەستی کرد هەموو خەوتوون چووە پێشـێ. بە پـارێزەوە دەڕۆیشـت بـۆ ئەوەی لە سـەر تەرکـی دارینـی دالانەکە تـرپەی پێـی نەیە. گـوێی بە دەرگـای ژوورەکەی کاتیۆشـاوە نـا. پـرخەی نەدەهـات، دیـار بـوو نەخەوتـووە. بە ئـارامی بـانگی کـرد. کـچە لە پێخەفەکەی هاتە دەرێ و هات بۆلای دەرگاکە و لێی پاڕایەوە و سەرکۆنەی کرد.

ـ ئەوە چ کارێکە دەیکەی؟ تکات لێدەکەم وازم لێ بێنە. ئەگەر پووره خـانم بزانن ئابڕووم دەچێ. نازانی چیمان پێدەڵێن؟

ئەگەرچی قسەکانی تووڕەیی پێوە دیاربوو، بەڵام تەواوی گیانی هـاواری دەکرد: «من هی تۆم؛» نۆخلیدۆڤیش زۆر باش لەوە تێگەیشتبوو.

ـ دەرگاکە بکەوە؛ تەنیـا خولەکێک لەلات دەمێنمەوە و دەڕۆم، تەنیـا یەک خولەک.

بیـری لە مانـای قسـەکانی خـۆی نەدەکـردەوە. تەنیـا دەیویسـت شـتێکی گوتبێ. دەستی کاتیۆشا لە تاریکیدا ئاڵقەڕێزی دەرگاکەی دیتەوە و کردیەوە.

نۆخلیدۆڤ بەبێ ڕاوەستان هەر لەڕێوە باوەشی پێداکرد و بردیە سەر تەختی خەوەکە.

ـ چی دەکەی؟ وازم لێ بێنە. ئەوە بۆ ئاوا دەکەی؟

نارەزایەیتی دەردەبڕی بەڵام زیاتری خۆی لە باوەشی توند دەکرد...

کاتێک کە شڵەژاو و شەرمەزار لە سەر تەختی خەوەکە هاتە خوارێ و لە ژوورەکە هاتە دەرێ، گتێکی گرت. دەیویست زیاتر بیر لەو کارە بکاتەوە کە ڕووی دابوو.

کازیوەی بەیان ئاسۆی زێوئاژن کردبوو. شکانی سەهۆڵ و هاژەی چۆم و تەقوکوتی قاڕقارە زیاتر بووبوو. مژی بەرەبەیان هێور هێور نەوی دەبۆوە و لە نێوان تەمەکەوە مانگ وەکوو دەمە داسێکی باریک لە سووچێکی ئاسۆوە دیاربوو.

نۆخلیدۆڤ لەو ڕووداوە سەری سووڕمابوو. نەیدەزانی خۆی سەرکۆنە بکات یان بچێتە باوەشی خەوێکی خۆشەوە؟ ئاخری خۆی بە گوت؛ «هەرکەسێکی تر لە جێی من بووایە هەر ئەو کارەی دەکرد. بۆ لەخۆڕا بیری خۆم ئاڵوز بکەم و خۆم ئازار بدەم؟» بەو بیر و خەیاڵەوە چاوی لێک ناو خەوێکی ئارام باڵی بەسەردا کێشا.

# هەژدە

شەوی دوایی، شوون بووک هاوڕێ و هاوقەتاری نۆخلیدۆڤ لە سەر بانگهێشتی ئەو گەیشتە ماڵی پوورەکانی. ئەو بە هەڵسوکەوتی نەرمونیان و ئەدەب و دەستودڵبازی خۆی لە دڵی هەردوو پوورەخانمدا کردبۆوە. لە هەمووشی زیاتر دەهەندیی و دەستبڵاوییەکەی ئەوانی تووشی سەرسوورمان کردبوو؛ چونکە جاری وابوو لە بەخشینی تێدەپەڕاند و دەبوو بەهەڵەخەرجی. سواڵکەرێکی کوێر کە داوای خێری دەکرد چەند ڕۆبڵی پێدەدا. وەک دەستخۆشانە یازدە ڕۆبڵی بە هەر کام لە خزمەتکارەکان دا. کاتێک چاوی کەوت بە سووزێت، سەگە سپی و کولکنەکەی پوورە سووفی، کە لاقی بریندار بووبوو، دەستەسرە ناسک و هەورێشمینەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و لاقی بۆ پێچا. پوورەکانی نۆخلیدۆڤ تا ئێستا گەنجێکی ئاوا ڕۆحسووک و لە دڵاشیرین و دەستودڵبازیان نەدیبوو. ئیتر لەوە ئاگادار نەبوون کە شوون بووک لانیکەم دووسەد هەزار ڕۆبڵ قەرزدارە و نایهەوێ بیداتەوە. بۆیە بیست سی ڕۆبڵ کەمتر و زیاتر هیچ شوێنێکی لە سەر گیرفان و باری ماڵیی ئەو دانەدەنا.

شوون بووک تەنیا ڕۆژێک لەوێ مایەوە و شەوێ ئەو و نۆخلیدۆڤ بەرە و ئوردووگای ئەفسەران وەڕێکەوتن. تاکوو لە هەلی گونجاودا بڕۆن بۆ بەرەگەی شەڕ.

نۆخلیدۆڤ دوایین ڕۆژی لە ماڵی پوورەکانی زۆر بە دڵتەنگی و ئاڵۆزییەوە ڕابوارد. لە لایەکەوە چێژی هاوباوەش بوون لەگەڵ کاتیۆشای بۆ مابۆوە کە زۆر خۆش بوو و بە ئاواتی دڵی گەیشتبوو؛ لە لایەکی دیکەشەوە خەمی ئەوەی بوو ڕازەکەی لێ ئاشکرابێ و پوورەکانی بە چاوێکی سووک لێی بڕوانن. خزمەتکاران و ڕەعیەتەکانیش بە کەسێکی داوێنپیسی بزانن. لەو نێوانەدا تەنیا شتێک کە بیری لێ نەدەکردوە کاتیۆشا و ئاکامی کارەکەی خۆی بوو. تەنانەت خۆڕانان بووە هۆی ئەوەی چیرۆکی خۆی و کاتیۆشا بۆ شوون بووک بگێڕێتەوە.

ـ ئێستا تێگەیشتم بۆ ئەوەندەت ماڵی پوورەکانت پێخۆشە و دەچیتە سەردانیان! ناڕەسەن! کەوایە بۆ ئەوە لێرە مایەوە و منەتیشت بەسەر پوورە پیرەکانتدا کرد کە لەلایان ماویەتەوە. هەر کەسێکی دیکەش لە جێی تۆ بووایە هەر ئەو کارەی دەکرد. چونکە بە ڕاستی کچێکی جوان و شۆخوشەنگە!

ئەگەرچی نۆخلیدۆڤ بەداخەوە بوو کە ناتوانی زیاتر لەوێ بمێنێتەوە و دیسان چێژ لە باوەشی گەرموگوڕی کاتیۆشا وەرگرێ و خۆی لەو سەرچاوەی ئەشق و هەوەسە تێراو بکات، بەڵام بۆ ڕۆیشتنیش زۆر بەپەلە بوو. دەتگوت دەیهەوێ زووتر خۆی دەرباز بکات و ئەو کچە لە بیر بەرێتەوە. بۆ قەرەبووی تاوانەکەشی کەوتە بیری ئەوەی پارە بدات بە کاتیۆشا؛ ئەگەرچی دەیزانی ئەو کچە هیچ پێویستییەکی بە پارە نییە، بەڵام لە خەیاڵی خۆیدا ئەو کارەی بە جۆرێک پیاوەتی و جوامێری دەزانی.

دوایین ڕۆژ، دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ، لە دالانەکە ڕاوەستا و چاوەڕێ بوو کاتیۆشا لەوێوە تێپەڕێ. کاتێک کاتیۆشا چاوی پێی کەوت، پاشەوپاش گەڕایەوە و ویستی خۆی دەرباز بکات، بەڵام کۆنتی لاو هەڵات بۆ لای و نەیهێشت بڕوا.

ـ دەمویست خودا حافیزیت لێ بکەم. ئەمەش...

پاکەتێک کە گەڵایەکی سەد ڕۆبڵیی تێخستبوو، دایە دەستی. کاتیۆشا نێوچاوانی تێک نا. لێی وەرنەگرت. نۆخلیدۆڤ پاکەتەکەی خستە نێو چینی کراسەکەیەوە و بەپەلە ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی. خەمبار و لەش داگیراو بوو. بە نێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو و ئازاریک لە ناخەوە هەڵیدەچۆقاند؛ وەک نەخۆشێکی لەشبەبارار هەستی بەژان و برکێکی تاقەتپڕووکێن دەکرد.

وردە وردە هێور بۆوە. دڵخۆشیی خۆی دەدایەوە: «خۆ کارێکی خراپم نەکردووە، هەر کەسێکی دیکەش لە جێی من بووایە هەر ئەو کارەی دەکرد. شوون بووکیش لەگەڵ کچە خزمەتکارەکەیان ئەو کارەی کردووە. خۆی بۆی گێڕامەوە. مامە گریشاش ئەو کارەی کردووە. تەنانەت باوکی خۆشم زگی کچێکی گوندنشینی پڕ کرد و کوڕێکی بوو کە نێویان نا میتینکا و ئێستاش زەق و زیندووە و زڕبرای منە! ئەگەر ئەو کارە خراپ بووایە، هەموان نەیاندەکرد.»

بەم قسە خۆڕاییانە هەوڵی دەدا خۆی ئارام بکاتەوە. لە ناخیدا گڕێک بڵێسەی دەکێشا. بەردەوام هاوارێکی لە ناخی خۆیەوە دەبیست و پێی دەگوت: «تۆی خوێڕی و ناپاک ئیتر هەقی ئەوەت نییە خۆت بە کەسێکی پاک و شەریف بزانی.» بەڵام بۆ ئەوەی بە دڵێکی خۆش و شادەوە بژی، ناچار بوو ئەم بیر و خەیاڵانە لە بیرخۆی بباتەوە.

بەم شێوەیە، ماوەیەک دوای شەڕ شەوێکی دیکەش هاتەوە بۆ ماڵی پوورەکانی و بە هیوابوو دیسان کاتیۆشا ببینێ و لێی نزیک بێتەوە، بەڵام کچە چەند مانگ پێش هاتنی ئەو بە دووگیانی لەوێ ڕۆیشتبوو و لە شوێنێکی نادیار منداڵەکەی بووبوو. زۆری بیر کردەوە. دەیویست ڕێکەوتی لە دایک بوونی منداڵەکەی بۆ دەرکەوێ. «بڵێی منداڵی من بێ؟» پوورەکانی دەیانگوت ئەو چەتیوە داوێنتەڕ و دایک خۆڕەسەنە، خۆی دۆڕاندبوو. گوێی بۆ ئەو داوەرییەی پوورەکانی شل دەکرد؛ چونکە تاوانەکە دەکەوتە ئەستۆی کاتیۆشا و ئەو فحێل دەبوو!

سەرەتا لە بیری ئەوەدا بوو کاتیۆشا و منداڵەکەی بدۆزێتەوە. ماوەیەک سۆراخی گرتن و پرسیاری کرد، بەڵام زۆر زوو خستیە پشت گوێ. دەیزانی وەدواکەتنی ئەو بە قازانجی نییە و تەنانەت بیر کردنەوە لەو کارەش ئازاری دەدا.

ئێستاش کە چەندین ساڵ بە سەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕیبوو، چاوی بە کاتیۆشا کەوتبۆوە و ئەو ڕووداوانە هێرشیان کردبووە سەر مێشکی، بۆی دەردەکەوت کە چەندە پیاوێکی خوێری و بێ بەزیی بووە. دەساڵ بە سەر ئەو ڕۆژانەدا تێپەڕیبوو، ئەویش لەو ساڵانەدا بەبێ ئەوەی ڕێزەیەک بیری لە چارەنووسی کاتیۆشا کردبێتەوە، شاد و بێ خەم ڕاببواردبوو. بەڵام هێشتا نەیدەویست ڕازەکەی ئاشکرا بێ. لەوە دەترسا کاتیۆشا بیناسێتەوە. هەستێتە سەر پێ قامکی تۆمەتی بۆ ڕادێرێ و سەرلەبەری ڕووداوەکە بگێڕێتەوە.

# نۆزدە

نۆخلیدۆڤ، لەو تەنگژە دەروونییەدا گیری خوارد بوو و جگەرەی بە جگەرە دادەگیرساند و گوێی بۆ دەمەتەقێی هاوکارەکانی شل کرد بوو. بازرگانی خۆشمەشرەف کە بەیانی تێرپڕی خواردبوو و خواردبۆوە، باسی ئەو هەموو زێدەڕەوییەی سملکۆڤی دەکرد لە خواردنەوە و هەوسبازیدا و هەروەک لە زمانی تۆمەتبارانی بیستبوو، تاریفی ئەو هەموو کەیف و چێژوەرگرتن و ڕابواردنەی ئەوی دەکرد.

ـ بەوە دەڵێن کەیف و ڕابواردن؛ لەگەڵ هەموو کچان یاریی قانەقدیلە دەکا و نەیتوانیوە دەست لەو کچە شۆخوشەنگ و بەژن زراڤەش هەڵگرێ. بەڕاستی بەوە دەڵێن پیاو!

گراسیمۆڤیچ، فەرمانبەری پلەبەرزی دەوڵەت و سەرۆکی لیژنەی داوەران کە لە هەموو کارەکاندا شارەزا بوو، حیسابداری جوولەکەی کێشابووە سووچێک و بە گاڵتە هێندێ شتی پێدەگوت و پێدەکەنین. هەر کەس دەهات و شتێکی لە نۆخلیدۆڤ دەپرسی، بە چەند وشە وەڵامی دەدایەوە و لەکۆڵ خۆی دەکردەوە.

کاتێک کاربەدەستی چاوەدێری، لیژنەی داوەرانی بانگ کردەوە بۆ هۆڵی دادگا، نۆخلیدۆڤ دەترسا پەردە لە سەر ڕازەکەی هەڵدرێتەوە و ئابڕووی

بچێ. وەک تاوانبارێک دەچوو کە ترس سەرتاپای داگرتبێ و نەوێری چاو لە چاوی هیچکەس بکات. سەری داخستبوو، بە گورجی لە قاڵدرمەکان وەسەرکەوت و لە پاڵ سەرۆکی لیژنەی داوراندا دانیشت، چاویلکە یەکچاوەکەی دەرهێنا و خۆی پێوە خەریک کرد.

تۆمەتباران کە لەو ماوەیەدا بردبوویاننە دەرێ، دیسان هێنایاننەوە بۆ شوێنی خۆیان. ئەمجارەیان کەسانێکی تازە لە هۆڵەکەدا وەبەرچاو دەکەوتن. ئەوانەی تازە هاتبوون شایەدی ڕووداوەکە بوون. نۆخلیدۆڤ لە بنەوە هەموو شونێکی خستبووە ژێر چاوەدێری. ژنێک لە نێو شایەدەکاندا دانیشتبوو کە ماسلۆڤا چاوی لە سەر هەڵنەدەگرت. قەڵەو بوو، کراسێکی هەوریشمینی گرانبایی لەبەرکردبوو کە لە چەند شوێنەوە بە مەخمەری ڕەش ڕازابۆوە. قژی ڕازاندبۆوە و کڵاوێکی گەورەی بە تەنزیلی پانەوە لە سەر نابوو، لە ڕیزی یەکەمی شایەدەکان دانیشتبوو. قامکەکانی پڕ لە ئەنگوستیلە بوون و دەستی کە هەتا نزیک بەلەمرکی ڕووت بوو، پڕلە بازنە و خرخاڵ بوو. نۆخلیدۆڤ، بێ ئەوەی پرسیار لە کەسێک بکات، تێگەیشت کە دەبێ ئەو ژنە سەرۆکی ئەو ماڵە بێ کە ماسلۆڤا لەوی کاری کردووە.

لێپرسنیەوە لە شایەدەکان دەستی پێکرد. قەشەی پیر کە خاچێکی ئاڵتونی لە ملدا بوو، یەک لە دوای یەک شایەدەکانی برد بۆ بەر وێنەکەی مەسیح و بەڕێوجێ سوێندی دان و پێی وابوو کارێکی زۆر گرینگ و بەسوود ئەنجام دەدا. دوای ئەو شانۆیە، شایەدەکانیان یەک لەدوای یەک بانگ کرد بۆ لێپێچینەوە و ناو و شۆرەت و ئایین و زۆر شتی دیکەیان لێ پرسین. خانمی سەرۆک کە بە مادام کیتایڤا بە ناوبانگ بوو داویان لێکرد ئەوەی دەیزانێ بۆیان باس بکات، ئەویش هەروا کە بزەی لە سەر لێو بوو، لەگەڵ هەموو

وشەیەک سەری دەلەقاند و زمانی ڕووسیی بە زاراوەی ئەڵمانی دەردەبڕی، ڕووداوەکەی لە نووکەوە گێڕایەوە:

ـ سەرەتا سیمۆنی خزمەتکار هات بۆ هوتێلەکە و گوتی دەیهەوێ کچێک بەرێت بۆ بازرگانێکی ساماندارى خەڵکی سیبیریا. منیش نەرمۆڵی جوان و ناسکۆڵەم لەگەڵ نارد. دوای ئەوە ئاغا لە هوتێلەوە هات بۆ ماڵەکەمان، هەتا توانیی مەشرووبی خواردەوە و کچەکانی بانگ کرد و لەگەڵیان هاوپیاڵە بوو. میوانییەکی شاهانەی سازکرد و گیرفانی خۆی هەڵتەکاند و دنیارێکی تێدا نەهێشت. منیش نەرمۆڵ گیانم نارد بۆ ژوورەکەی، دیار بوو ئەو کچە شۆخ و ناسکۆڵەیەی کەوتۆتە بەر دڵ و متمانەی تەواوی پێیەتی.

خانم سەرۆک چاوی گێرا و لە ماسلۆڤا ڕاما. نۆخلیدۆڤ بۆی دەرکەوت کە ماسلۆڤا قسەکانی خانمی بە دڵە و زەردەی دەگرت. بەڵام بزەکەی ئەو زۆر لە بەر چاوی سووک و جاڕزکەری دەنواند. ڕق و بەزەیی لە ڕۆحیدا ئاوێتە بووبوون و ململانێیان دەکرد. پارێزەری دەستنیشانکراو، کە فێرکار بوو و لە لایەن دادگاوە بۆ پارێزگاری لە ماسلۆڤا هەڵبژێردرابوو، لە مادم کیتایڤای پرسی: «بیروڕای سەبارەت بە تۆمەتبار چییە؟»

ـ بە بڕوای من زۆر کچێکی باشە؛ زۆر ژیر و وریا و ڕۆحسووکە؛ زمانی فەڕەنسیش دەزانێ. لە بنەماڵەی خانەدانەکاندا پەروەردە کراوە. هێندێ جار لە خواردنەوەی مەشرووبدا زێدەڕەوی دەکا، بەڵام هیچکات نەمدیوە سەرخۆش بێ و ئەقلی لە دەست بدات.

ماسلۆڤا بۆ ساتێک چاوی لە سەر خانم سەرۆک هەڵگرت و چاوی لە لێژنەی داوەران کرد. چاوی بۆ چرکەیەک لە سەر نۆخلیدۆڤ گیرسایەوە. شیرین خێڵییەکەی زیاتر بووبوو. کۆنت لەگەڵ ئەوەی ترسا بوو، نەشیدەوێرا چاوی لە سەر هەڵگرێ. هەستی دەکرد ماسلۆڤا ئەوی ناسیوەتەوە و ئەو

شەوەی وەبیر هاتەوە. شەوێک کە هاژەی ڕووبارەکە لە دوورەوە دەهاتە گوێ و سەهۆڵەکان قرچەقرچ دەشکان و قاڕقارە بە شەپۆلەوە تەقوکوتیان دەهات و تەمومژ وڵاتی داگرتبوو، مانگیلەی ئاسمانی کاتێک چاو پێکەوت کە هوا ڕووناک بووبۆوە و ئیتر ئەو کاتە کار لە کار ترازا بوو.

پێی وابوو ئەوی ناسیوەتەوە؛ بەڵام بەهەڵەچووبوو. ماسلۆڤا چاوی لە سەر ئەو هەڵگرت و لە سەرۆکی دادگا ڕاما. نۆخلیدۆڤ نیگەران بوو. «کەوایە کەنگێ ئەم دانیشتنە کۆتایی پێدێ؟» وەک ڕاوچییەکی بە تاڵووکە دەچوو کە باڵندەیەکی پێکابێ و بۆ ئەوەی باڵندە زامارکە ڕوحم و بەزەیی نەبزوێنێ، بیهەوێ خێرا سەری ببڕێ!

کاتێک نۆخلیدۆڤ گوێی بۆ قسەی شایەدەکان ڕاگرتبوو، بیر و خەیاڵێکی سەیر خۆی لە ڕۆح و هەستی پێچا بوو و خسبوویە گێژاوێکی بەسامەوە.

## بیست

کۆڕەکە زۆری خایاند. شایەدەکان قسەی خۆیان کرد. کارناسان وتەی خۆیان پێشکەش کرد و دادیار و پارێزەرەکان، زیاتر بۆ خۆنواندن، شتێکیان لە شایەد و کارناسەکان پرسی. ئەو بەڵگانەی سەبارەت بەو پەروەندەیە کۆ کرابوونەوە، لە سەر مێزەکە لە پاڵ یەکدا داندرابوون؛ ئەنگوستیلەیەکی ئەڵماس، بۆڕییەکی باریکی پاڵاوتن و جیا کردنەوەی ژار لەو نێوانەدا جێی سەرنج بوو. هەرکام لەو بەڵگانە ئیتکێتێکیان پێوە بوو و بەوردی ژومارەبەندییان کردبوون.

لەو کاتەوە کە لێژنەی داوەران خەریکی چاو لێکردنی کەرەسە و بەڵگەی تاوانەکە بوون، دادیار لە جێی خۆی هەستا و داوای کرد ڕاپۆرتی پزیشکی یاسایی لە دادگا بخوێندرێتەوە. سەرۆکی دادگا کە لەگەڵ شۆخە ژنی سویسڕایی لە هۆتێل قەراری ژوانی هەبوو، دەیویست زوو سەر و بەری دانیشتنەکە وێک بێنێتەوە، بەڵام داخوازیی دادیار مافی یاسایی ئەو بوو و ناچار بوو قەبووڵی بکات.

نووسیاری دادگا کە «ل» و «ڕ» وەک یەک دەردەبڕی، بە ڕاوێژێکی یەکهاوی ڕاپۆرتی پزیشکی یاسایی خۆێندنەوە کە سەرەتا باسی بارودۆخی ڕواڵەتیی تەرمەکەی کرد بوو: بەژن و باڵای کوژراوەکە سەد و نەوەد و هەشت سانتی متر بوو. بازرگانی جەفەنگباز کە لەدپاڵ نۆخلیدۆڤدا دانیشتبوو، سەری بردە بن گوێیەوە و گوتی:

ـ عەجەب زەبەلاحێک بووە؛ بێچارە نزیکەی دوو مەتر قەدوباڵای بووە!

لەو ڕاپۆرتەدا دەردەکەوت کە کوژراوەکە چل ساڵان و قەڵەو و زگهانک و ڕەشتاڵە بووە و چەند جێگای لەشیشی خاڵ و پەڵەی ڕەشی پێوە بووە. مووی سەری خورمایی و تەنک و قرژ بووە و بە ئاسانی هەڵکەندراوە، چاوەکانی زەق و دەرپۆقیو و دەمی نیوە ئاوەڵا، گوێچکە و گەرووشی پڕ بووە لە کەف و چەوری، ملی ئەستوور و بەرخەبەبەی شۆڕ و گوشتن بووە.

بەم شێوەیە لە چوار لاپەڕە و بیست و حەوت بەنددا، چۆنیەتیی تەرمی کوژراوەکە بەر لە توێکاریی ئەندام باس کرابوو. ئامادە بووان بە بیستنی ئەو بابەتە، قەڵافەت و لەشولاری ئەو بازرگانە تۆلاز و داوێنتەڕەی خەڵکی سیبیریایان هێنایە بەرچاوی خۆیان کە لە بادەنۆشی و هەوسبازیدا هیچ کەس دەسکی لە دوو نەکردووە. نۆخلیدۆڤ کاتێک ئەو ڕاپۆرتەی بیست،

بـۆی دەرکەوت کە کاتیۆشـای شـلک و ناسـکی ئەو تووشـی بە تووشـی چ دێوزمەیەکەوە بووە.

کاتێک باسی چۆنیەتیی ڕواڵەتی تەرمەکە کۆتایی پێ هات، سەرۆکی دادگا ئـۆخەی لە دڵـی گەڕا. پێـی وابـوو خوێنـدنەوەی ڕاپـۆرت تەواو بـووە، بەڵام نووسیار بێ ئەوەی وچانێک بدات دەستیکردەوە بەخوێندنەوەی پاشماوەی ڕاپـۆتەکە کە باسـی لە چـۆنیەتیی تەرمەکە پـاش توێکـاریی جەسـتە دەکـرد. سەرۆک لە سەر کورسییەکە خۆی ئەمبارەوبار کرد. دیار بوو وەڕەز و بێ تـاقەتە. بازرگـانی جەفەنگبـاز هەوڵـی دەدا خەوی لـێ نەکەوێ. پاسـەوانەکان، دەست لە سەر مشتووی شمشێر بێ جووڵە ڕاوەستا بوون.

لە ڕاپـۆرتی توێکـاریی ئەندامـدا ئەوەیـان بـۆ دەرکەوت کە کاسەسـەری کوژراوەکە هیچ برین و شکانێکی پێوە دیار نەبووە، ئێسکی کاژەڵاکی ساغ بـووە، دوو پەڵەی سـووری پـازدە میلـی مەتـری لە سـەر پێسـتی مێشـکی دیتراوە. پاشان لە سیزدە بەندا هاتبوو کە پشکنین و جیاکردنەوەی ئاوەکیی نێو گەدە و ڕیخۆڵەکانی دەریدەخات کە مەرگی بازرگان دەبێ بەهـۆی ژاری تێکەڵ بە ئـاڵکوڵی زۆرەوە بـووبێ، بەڵام ناسـینەوەی ژارەکە بەهـۆی تیپەڕینی کات نەلواوە.

بازرگـانی جەفەنگبـاز کە وەنەوزی دەدا، چـاوی هەڵێنـا و بە نۆخلیـدۆڤی گوت:

ـ ئەو دێوەزمە حەیتەیە بەرمیلێک ئارەقی یەکبین هەڵقوڕاندووە!

خوێنـدنەوەی ڕاپـۆرتەکە کـاتژمێرێکی خایانـد. دادیـار هێشـتا دەسـتهەڵگیر نەبوو، لە سـەر ئەوە پێداگر بـوو کە دەبێ ئاکامی تاقیکارییە کیمیاییەکانیش بخوێندرێتەوە و سەرۆکی دادگاش بەوە ڕازی نەبوو.

ـ خوێندنەوەی ئەم بەشەی ڕاپۆرتەکە کەڵکی نییە.

ـ بەبڕوای من دەبێ ئەم بەشە بخوێندرێتەوە.

دادیار بەبێ ئەوەی چاو لە سەرۆکی دادگا بکات قسەی دەکرد؛ لە سەر قسەی خۆی سوور بوو و ئەو داخوازییەی بە مافی یاسایی خۆی دەزانی، بۆیە نەیدەویست چاوپۆشیی لێ بکات. قازیی ڕیشن، کە ئازاری گەدەی جاڕزی کردبوو، داوای لە سەرۆکی دادگا دەکرد داخوازییەکەی دادیار قەبووڵ نەکات.

ـ ئەو شتانە کەڵکیات نییە؛ تەنیا کاتی دانیشتنەکە درێژ دەکاتەوە.

ئەم یاسا نوێیە زۆر بێ کەڵک و کات بەفیڕۆدەرە[١٤].

قازییەکی تر کە چاویلکەی دەورە ئاڵتوونیی لە چاودا بوو، مته‌قی نەکرد. ئەو کە نە بەهیوا بوو ژنەکەی لەگەڵی بێتە ڕەدا نە ئاسۆیەکی ڕووناکی لە ژیانی خۆیدا بەدی دەکرد، زۆر مات و لەشداگیراو بوو. چارە نەبوو، سەرۆکی دادگا داخوازییەکەی دایاری قەبووڵ کرد و قازییەکانیش بیانەوێ و نەیانەوێ ناچار بوون گوێ بۆ ڕاپۆرتی تاقیکارییەکە ڕاگرن:

«ڕۆژی پازدەهەمی فیوریە بە پێی دەستووری ژمارە شەشسەد و سی و هەشتی دایرەی پزشیکی یاسایی، تاقیکاریی کیمیایی گەدە و هەناوی کوژراوەکە بە ئامادەبوونی جێگری بەڕێزی دایرەی لێپرسینەوە ئەنجام درا و ئاکامەکەی بەم شێوەی خوارەوە...»

نووسیاری دادگا ئەمجارەیان بە دەنگێکی بەرزتر خوێندییەوە؛ دەتگوت دەیهەوێ خەواڵوویی و لەشداگیراویی ئامادە بووان بپەڕێنێ. لەم بەشەی ڕاپۆرتەکەدا کێش و ئەندازە و چۆنیەتیی سیپەلک و دڵ و جەرگ و گورچیلە و ڕیخۆڵەی کوژراوەکە باسی لێ کرابوو. سەرۆکی دادگا بە سرتە لەگەڵ قازییەکان دەدوا و ئاماژەی بە نووسیار کرد:

---

14 ـ ئاماژەیە بە ڕێسایەک کە لە سەردەمی ئەلکساندری دووهەمەوە لە دادگاکاندا جێگر کرا.

- دادگا خوێندنەوەی ئەم بەشەی ڕاپۆرتەکە بەبێ کەڵک دەزانێ .

نووسیار بێدەنگ بوو و کاغەزەکانی بەردەمی ڕاستەوپاستە کرد. دادیار بە تووڕەیی، شتێکی نووسی. سەرۆک داوای لە لیژنەی داوەران کرد بێنە پێشێ و بەڵگە و کەرەسەی پێوەندیدار بە تاوانەکە لە نزیکەوە ببینن کە لە سەر مێزەکە ڕیزکرابوون. ئەندامانی لیژنەی داوەری هەستان و هاتنە پێشێ، لە ئەنگوستیلەی ئەڵماس و گەدە و ڕیخۆڵە و ئەندامەکانی ناخی کوژراوەکەیان ڕوانی. بازرگانی مەشرەفخۆش ئەنگوستیلەکەی هەڵگرت و لە قامکی کرد.

- ئەوە قامک نەبووە ئەو دێوەزمەیە بوویەتی، ترۆزی بووە!

## بیست و یەک

لیژنەی داوەران بەڵگەکانیان لە نزیکەوە دیت و گەڕانەوە سەر جێگاکەی خۆیان و دانیشتن. سەرۆکی دادگا ڕایگەیاند کە لیپرسینەوەکان کۆتایی پێ هاتووە و داوای لە دادیار کرد هەستێ بۆ بەرەڤانی کردن لە دادنامەکە و هیوادار بوو ئەو بە کورتی بیروڕای خۆی دەربڕێ، تاکوو قازی و پارێزەرە لەشداگیراو و ماندووەکان بڕۆن و هێندێک پشوو بدەن. بەڵام دادیار بەزەیی و پیاوەتی لە زاتیدا نەبوو؛ ئەو نە بەزەیی بە قازییەکاندا دەهات نە گوێی لە تۆمەتباران بوو. ئەگەرچی زۆر گەلحۆ و گەوجەپیاو بوو، بەڵام زۆر ڕۆح زل و لەخۆڕازی بوو؛ چونکە تێزی زانکۆکەی سەبارەت بە «کۆیلەیی لە دەزگای

مافی ڕۆمدا» میدالیای ئالتوونی پێ بەخشرابوو، خۆشی لە نێوان ژنوژاڵ و مێوینەکانی کۆمەڵگادا لایەنگری زۆر بوو.

دادیـــار، بە عەبـــای کەلبەدوونکـــراوەوە چـــاوێکی لـــووتبەرزانەی لە دەوروبەری خۆی کرد و بەم شێوەیە دەستی کرد بە ئاخافتن:

«قـازییە بەڕێزەکـان! ئەنـدامانی بەڕێـزی لیـژنەی داوەری! ئـێمە لێـرە دەمـانەوێ بـاس لە تـاوانێکی قـورس بکەیـن کە لە هەمـوو بـارێکەوە شـیاوی گرینگی پێدان و لێکۆڵینەوەیە!»

خـــۆی پێـــی وابـــوو وتەکـــانی زۆر بیرمەنـــدانەیە و ئەو خـــاڵە تـــازە و نەبیسـتراوانەی ئامـاژی پێدەکا،ئەگەر شـارەزاترین پـارێزەر و مافنـاس لە نێو کوڕەکە هەبێ تووشـی سەرسووڕمان دەبێ. بەڵام بەداخەوە تەماشـاچییانی ئەو ڕۆژە بریتی بوون لە عارەبانەچییەک و خوشکی سیمۆن کارتی نیکین و دوو ژنـی دیکە کە یەکیـان بەرگدروو و ئەوی دیکەشـیان ئاشـپەز بـوو. بەڵام دادیار گوێی لەوە نەبوو. دەیویست پانتایی هۆش و زانیـاریی خۆی لە بواری ماف و کاروباری کۆمەڵایەتیدا تەنانەت لەم شوێنە بەرتەسکەشدا بنوێنێ و لە سەر بارەی دەروونناسیی تاوانەکە هەڵوەستە بکات و لێی بکۆڵێتەوە.

ـ ئەندامانی بەڕێزی لیژنەی داوەری! ئێوە لەگەڵ تاوانێک بەرەوڕوون کە ڕەنگە لەم سەدەیەدا وێنەی ئەوەتـان کەمتر دیتبێ. ئێمە خەریکین لە کۆتـایی سەدەی نۆزدەهەم نزیک دەبینەوە. کۆمەڵگـای مرۆڤـایەتی لە هەمـوو بـارێکەوە کەوتۆتە بەر هەڕەشە. مرۆڤایەتی هانمان دەدا کە تیشک بخەینە سەر تەواوی لایەنە کۆمەڵایەتییەکـــانی ئەو تـــاوانە و لە هەمـــوو هۆکـــار و بەرهۆکـــانی بکۆڵینەوە.

ئەوەی لە کتێبدا خوێندبوویەوە، هەمووی تێک هەڵدەکێشا و بە گورچووی ئامادە بووانیدا دەدا، بۆ ئەوەی وا بنوێنێ کە وتەبێژێکی لەزەبرە، بێ ئەوەی

کورته وچانێک بدات وەک برێشکه دەتۆقی قسەی هەڵدەڕشت. سەعات و چارەکێک بەم شێوەیه قسەی کرد و هیچ کەس قسەکانی پێ نەبڕی. لەو ماوەیەدا تەنیا چەند چرکەیەک گتی گرت و تفی دەمی قووت دا و دیسان درێژەی بەوتەکانی دایەوە. هێندێ جار به نەرمی دەدوا بەڵام جارجاریش دەنگی بەرز دەکردەوە؛ هێندێ جار به نێو هۆڵەکەدا خولێکی لێدەدا و دەگەڕایەوە چاوێکی له یادداشتەکانی دەکرد و داواشی له لێژنەی داوەران دەکرد وتەکانی بسەلمێنن. هێندێ جار ڕووی قسەی له پارێزەر و قازییەکان بوو، هێندێ جاریش له تەماشاچییەکان. لەم ماوەیەدا تەنانەت چاوێکی له تۆمەتباران نەکرد. له مژوولیایشەکەیدا ئەوەی سەبارەت به زانست و ژیار دەیزانی و خوێندبوویەوە، هەمووی باس کرد. باسی زانستی ژێنێتیکی دامەزراند و باسی کەسانێکی کرد که کاتێک له دایک دەبن تاوەنبار و پیاوکوژن و بۆ ئەوەش بیروڕای بیرمەندانی وەک لۆمبرۆسۆ و دێتارد و کەسانێکی دیکەی هێنایەوە[15]و هەروەها چەند بابەتی له شارکۆ باس کرد سەبارەت به کامڵ بوون، ناکۆکی ژیان، هیپنۆتیزم، تەڵقین بەخۆ کردن و پەستی و بێ نرخیی ڕەگەزی. دوای پێشەکییەک و ڕەخساندنی هەلی لەبار بۆ قسەکانی بەو ئاکامه گەیشت که «سملکۆڤی بازرگان، کەسێکی بەهێز و توانا و زۆریش دەستودڵباز بووە، هەر ئەو دەستودڵبازی و دڵپاکییەش وای لێکردبوو ڕوو بکاته ڕابواردن و هەوەسبازی و له ئاکامدا بکەوێته داوی کەسانێکی دلڕەشەوە. سیمۆن کارتی نیکین، به پێچەوانه، کەسێکه له نێو

15 ـ سیزار لۆمبۆسۆ Lombroso .C (19.9- 1835) تاوان ناسی ئیتالیایی ساڵی 1897 چوو بۆ سەردانی تۆلستۆی و بێهووده ویستی بیروڕای سازگاری ئەو سەبارەت به تاوانبارانی زگماکی به دەست بێنێ. گابریەل دۆتارد1843-1904) G. De tarde) له بواری بیر و باوەڕەوە له لۆمبرۆزۆ نزیک بوو؛ بەڵام تۆلستۆی هۆگری ژان مارتین شارکۆ (1893–1925) و لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت به هیپنۆتیزم بوو.

چینی وەزیر و گوندنشیندا سەری هەڵداوە و بوونەوەرێکی بێ نرخ و بۆرەکەیە، کەسێکی بێ ڕەوشت و دڵرەق و لادین و بێ بیروباوەڕیشە. گراوەکەشی، واتە ئۆفیمی بۆچکۆڤا هەروەک خۆی وایە و ژنێکی بێ نرخ و ناچیزەیە. هەروەها بە ڕوانین لە ژیان و باری کۆمەڵایەتیی تۆمەتباری سەرەکیی پەروەندەکە، واتە ماسلۆڤا باشتر و وردتر بۆمان دەردەکەوێ ئەوانە چەندە خوێری و ناکەس و هیچوپووچن.»

دادیار جۆرێکی باسی ماسلۆڤا دەکرد کە دەتگوت کوودەڵەیەکی بێ نرخی تاقیگەیە.

ــ لێرە لە زمانی خانمی سەرۆکم بیست کە ئەم ژنە لە بنەماڵەیەکی خانەداندا پەروەردە بووە، لەوێ زۆر باش بار هاتووە، خوێندنەوە و نووسین و تەنانەت زمانی فەرەنسیش فێر بووە. کاکڵی باسەکەمان لێرەدایە کە ئەم کچە بێ دایک و بابە تاوان و جینایەت لە زاتی دایە و لە گەڵیدا لە دایکبووە، لەگەڵ ئەوشدا لە بنەماڵەیەکی نەجیب و خانەداندا گەورە بووە، باش پەروەردە کراوە و خوێندوویەتی، بەجێی ئەوەی بەڕێگەی ڕاستدا بڕوا و کاری باش و ئابڕوومەندانە ئەنجام بدات، هەرکە هەلی بۆ هەڵدەکەوێ پشت لەو بنەماڵە بەڕێزە دەکات و بەجێیان دەهێڵێ، هەوساری ئەقڵی خۆی دەداتە دەست زاتی چەپەڵی و دەست دەکات بە لەشفرۆشی، هەروەک خانمی سەرۆک گوتی لە هاوکارەکانی دیکە وریاتر بووە و خوازیاریشی زیاتر بووە. لەم بابەتەوە دەبێ بە عەرزی لێژنەی داوەریی بگەیەنم کە لە ڕوانگە زانستییەوە، لەم ساڵانەی دواییدا لێکۆڵینەوەی باش کراوە و بەتایبەت گریمانەی تەڵقین بەخۆ کردنی شارکۆ، مەسەلەکەی بەباشی ڕوون کردۆتەوە.

هەروەک لە پەروەندەکەدا بۆمان هەڵکەوت، ئەم ژنە توانایی شەیتانیی خۆی دەخاتە کار و سملکۆڤی دڵپاک و ڕۆحسووک و دەوڵەمەند، کە پیاوێکی

بەهێز و خۆش باوەڕ بووە، دەخاتە داوی خۆیەوە. هەروەها کەڵک لە دڵسافی و سایلۆحیی ئەو وەردەگرێ؛ سەرەتا ئەنگوستیلە ئەڵماسەکە و پاشان پارەکەی لێ دەدزێ و دواتر زۆر بێ بەزییانە دیکوژێ.

سەرۆکی دادگا بە سرتە چرپاندی بە گوێی قازیی ڕووگرژدا: «بڕوانە، چۆن کەوتۆتە چەنەوێرغە!»

ـ چەنەوەریش دەکات و فلتە فلتیش.

دادیار گوێی بەو قسانە نەدەبزووت. قیت ڕاوەستا بوو و قسەی دەکرد:

ــ لێژنەی بەڕێزی داوەران! چارەنووسی ئەو سێ کەسە لە دەستی ئێوەدایە. لەوەش گرینگتر، چارەنووسی کۆمەڵگاکەمان ن بیر و ڕای ئێوە بەرە و ڕووناکی و بەختەوەری دەبا. ئەگەر بڕواننە ئەم تاوانە سامناکانە و لە کاردانەوەی کۆمەڵایەتیی ئەو بڕوانن، دەنگ بە سزادانی کەسانێک دەدەن کە وەک ماسلۆڤا تاوانیار لە دایک بوون و بوونیان لەو کۆمەڵگایەدا ژارێکی مەترسیدار و کوشندەدەیە. دەبێ بە چڕوپڕترین شێوە لەگەڵ ئەو پەتا و مەترسییە بەرەوڕوو بینەوە کە هەڕەشە لە کۆمەڵگاکەمان دەکا و هەوڵ بدەین هەتا سەرە چەرمەکە ئاو نەیبردووە، چارەسەری بۆ بدۆزینەوە.

لێدوانی دوور و درێژی دادیار لێرەدا کۆتایی پێ هات. ئەو نەک لەوە دڵنیا بوو قسەکانی شوێنی لە سەر لێژنەی داوەران داناوە بەڵکوو خۆشی تووشی شڵەژان بووبوو و هەتا ماوەیەک گێژوویژ چاوی لە دەوروبەری خۆی دەکرد. مەبەستی ئەو لەو قسانە زیاتر خۆڕانان بوو و ئەگەر قسە زیادییەکانی وەلانێن کاکڵی قسەکانی ئەوە بوو کە ماسلۆڤا بازرگانی داوێنتەڕ و ساویلکەی هەڵفریواندووە و بە وەدەست هێنانی متمانەی ئەو توانیویەتی کلیلەکەی لێ وەرگرێت و درگای جانتاکەی بکاتەوە، پارە و ئەنگوستیلە ئەڵماسەکەی لێ دزیوە و کاتێک بۆی دەرکەوتووە کارتی نیکین و بۆچکۆڤا

پێیان زانیوە، پارەکەی لەگەڵ بەش کردوون؛ پاشان بۆ قایمکاری ژاری کردۆتە نێو مەشرووبی سملکۆڤی بازرگانەوە و کوشتوویەتی.

لەدوای دادیار، پارێزەری کارتی نیکین و بۆچکۆڤا هەستا و دەستی کرد بە پارێزگاری لە بریگرتەکانی. ئەو پیاوێکی گەڕاوەبوو. جلوبەرگی فەرمی لەبەردا بوو، بە کلاو ملیوانەی سپی شەقوڕەقەوە. زۆر بە گڕ و تینەوە بەرەڤانیی لە بریگرتەکانی دەکرد. چونکە سێسەد ڕۆبڵی هەقی پارێزگاری لێوەرگرتبوون، بریگرتەکانی بە بێ تاوان دەزانی و هەموو تاوانەکانی دەخستە ئەستۆی ماسلۆڤا. بە کورتی وتەکانی ئەوە بوو کە بریگرتەکانی ئەو کاتی کردنەوەی زارکی جانتا کە لەو ژوورەدا نەبوون و ئەو پارەیەش کە کراوەتە نێو حیسابی بۆچکۆڤاوە، هەقدەستی چەندین ساڵ کار و ئارەق ڕشتنی ئەو دوو خزمەتکارە بووە، کە هەرکامیان ڕۆژی سێ تا پێنج ڕۆبڵ دەستخۆشانە لە میوانەکانی هۆتێل وەردەگرن. بەڵام دیارە ماسلۆڤا پارەکانی دزیوە و لە شوێنێک شاردوویەتەوە و لە کاتی سەرخۆشی و شەیداییدا سملکۆڤی بازرگانی کوشتووە، بۆ ئەوی تاوانەکەی خۆی سووک بکات پێی ئەم دوو کەسەشی تێوەداوە.

پارێزەر داوای لە لیژنەی داوەران کرد بریگرتەکانی لەو تۆمەتە بەدوور بگرن و لە بەشداری کردن لەو تۆمەتەیان فحێل بکەن، لە کۆتایی بەرەڤانییەکەیدا ئاماژەی بە باسە زانستییەکەی دادیار کرد و بە حاڵەتێکی گاڵتەئامێزەوە گوتی: «هەر چەند لێکۆڵینەوەکانی ئەو سەبارەت بە ژینێتیک و تاوانبارانی زگماکی لە ڕوانگەی زانستییەوە پڕ بایەخە، بەڵام دیار نییە کەسانێکی وەک بریگرتەی من یانی ئۆفیمی بۆچکۆڤا کە دایک و باوکی خۆی ناناسێ، چارەنووسیان بە کوێ دەگا؟»

دادیار بە توڕەیی ددانی بە یەکدا نا و بە چاوێکی پڕ سووکایەتییەوە لە پارێزەری ڕوانی.

نۆرە گەیشتە پایزەرکەی ماسلۆڤا کە مرۆڤێکی حەیابەخۆ و زۆر دەمتەڕ و زمان پاراو بوو. بەم شێوەیە دەستی کرد بە بەرەڤانی کردن و گوتی بریگرتەی من دەستی لە دزی و کوشتندا نەبووە؛ ئەو گەردە سپییەش کە کردوویەتە نێو مەشرووبی بازرگانەکەوە، پێی وابووە دەرمانی خەوە. لە بەشێکی قسەکانیشیدا بۆ ئەوەی هەستی ئامادە بووان بجوولێنێ، باسی ژیانی ماسلۆڤای کرد و چووە سەر لایەنی دەروونناسی و چیرۆکی پیاوێکی گێڕایەوە کە شەوێک ماسلۆڤای هەڵخەڵەتاندووە و ڕچەی ئەم ڕێگا چەوتە ئەو شکاندوویەتی و تووشی ئەم ڕۆژەڕەشییەی کردووە. بە بڕوای پارێزەر، تاوانباری سەرەکی ئەو پیاوە بووە کە خۆی لە یاسا دزیوەتەوە و ئەو کچە بەستەزمانەی بەو مەرەدە بردووە. بەداخەوە پارێزەر ئەو قسانەی هێندە ناشارەزایانە دەربڕی، لە سەر هیچ کەس کاریگەریی نەبوو و بنەمای پارێزگارییەکەی وەها لەبەر یەک هەڵتەکاند کە سەرۆکی دادگا داوای لێکرد لە باسی سەرەکی دوور نەکەوێتەوە و لە چوارچێوەی بابەتەکە نەچێتە دەرێ.

دوای وتە و باسوخواسی پارێزەرەکان، دادیار هەستایە سەرپێ و جارێکی تر گریمانەی تاوانبارانی زگماکی هێناوە گۆڕێ و داکۆکیی لە سەر کرد. سەرەتا وڵامی پارێزەرەکەی بۆچکۆڤا و کارتی نیکینی دایەوە و گوتی: «وای دانیێن بۆچکۆڤا دایک و باوکی خۆشی نەناسێ، خۆ بەوە بنەمای گریمانەی ژێنێتیک و تاوانبارانی زگماکی تووشی لەرزین نابێت و ئەم گریمانەیە وەک دیوارێک وایە کە بەرەڵێخی قایم و پتەوی زانستی هەبێ و بەو بایانە ناڕووخێ.» ڕەخنەی لە بەرەڤابینەکەی پارێزەری ماسلۆڤاش گرت و بە گاڵتەوە باسی «پیاوێکی» کرد کە شەوێک ئەوی هەڵخەڵەتاندووە و بەڵگەی هێنایەوە کە ئەگەر ئەو «پیاوە خەیاڵییە»

بوونیشی هەبێ، هێچ شوێنێک لە سەر ڕووداوەکە دانانێ؛ چونکە ماسلۆڤا چەندین ساڵە پیاوانی ساویلکە و بێ تاوان هەڵدەفریوێنێ و تووشی ڕێگای چەوت و نالەباریان دەکات.

دادیارسەرکەوتووانە لە جێی خۆی دانیشتەوە و سەرۆکی دادگا داوای لە تۆمەتباران کرد ئەگەر قسەیەکیان بۆ پارێزگاری کردن لە خۆیان هەیە، بیڵێن.

ئۆفمی بۆچکۆڤا لە دوایین بەرەڤانیی خۆیدا هیچی تازەی نەگوت و هەر قسەکانی پێشووی دووبات دەکردەوە: «هیچ تاوانێکم نییە و تاوانباری ڕاستەقینە ماسلۆڤایە.» سیمۆن کارتی نیکینیش هەر ئەو قسانەی دووپات دەکردەوە کە پێشتر کردبووی و دەستی کرد بە پاڕانەوە: «ئێمە ملمان لە موو باریکترە، خۆتان چۆنتان پێ خۆشە سزامان بدەن، بەڵام خودا سزادانی کەسێکی بێ تاوانی وەک من قەبووڵ ناکات و واچاکە بیرێک لە داوەری و حوکمەکەتان بکەنەوە.»

ماسلۆڤا هیچی نەگوت. کاتێک سەرۆک داوای لێکرد بەرەڤانی لە خۆی بکات هەستایە سەر پێ. چاوانی مات و بەزەیی بزوێن بوون. وەک ئاسکێکی پێکراو دەچوو کە بۆ دوایین جار چاو لە ڕاوچییەکەی خۆی دەکات. تۆزێ بێدەنگ بوو و لە ناکاو دای قوڵپەی گریان.

نۆخلیدۆڤ تاقەتی نەهێنا. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و تەزوویەک بەگیانیدا هات. بازرگانی مەشرەفخۆش کە لە پاڵیدا دانیشتبوو هەناسە هەڵکێشانەکەی کۆنتی بیست و گوتی: «کوێت ژان دەکا؟!»

کۆنت وەڵامی نەدایەوە. فرمێسک لە چاویدا قەتیس مابوو. بە دەسرەیەک فرمێسکەکەی سڕی و چاویلکەکەی لە چاو کردەوە. لەوە دەترسا نهێنییەکەی لێ ئاشکرا بێ و هەمووان بزانن کە ئەو ماسلۆڤای تووشی ئەو چارەڕەشییە کردووە. ترسی ئابڕوو چوون و هەستی پەشیمانی لە ڕۆحیدا خەریکی ململانێ بوون.

# بیست و دوو

له پاش دوایین بەرەڤاینی تۆمەتباران، باسێکی دووررودێژ دامەزرا له سـەر ئەوەی که لیژنەی داوەران له چی بکۆڵنەوە. سەرۆکی دادگا به دەنگێکی ئارام و ڕاوێژێکی نەرمونیان کورتەی وتەکانی تۆمەتباران و شـاهیدان و دادیار و پارێزەرەکانی دووپات کردەوە و بۆ ئاگاداریی زیاتری لیژنەی داوەران لەگەڵ بنەمـای مـاف و یاسـا، بەوردی بـۆی بـاس کـردن که دەبـێ ڕوون بیـتەوە تۆمەتباران چ تاوانێکیان ئەنجام داوە و بۆ وێنە ئەگەر تـاوانەکە دزی بـووە، دەبـێ ڕوون بێـتەوە دزەکە دەرگـای شـکاندووە، یـان به کلیـل دەرگـاکەی کـردۆتەوە و بەبـێ هەبـوونی بەربەسـتێک دزیـیەکەی ئەنجـام داوە. له کـاتی دەربڕینی ئەم تـاوانەدا، چاوی له نۆخلیدۆڤ بڕیبوو، دەتگوت دەخوازێ ئەم ئەندامە خـانەدان و بەناوبـانگەی لیژنەی داوەران له وتەکانی ئەو تێدەگات و هاوکارەکانیشی ڕێنوێنی دەکا. پاشـان سـەرۆکی دادگـا هـاتە سـەر ئەوەی که کوشـتن تـاوانێکی گەورەیە و ئەگەر دەرمانـداو کـردن ئاکـامەکەی مەرگ بـێ، وەک قەتـڵ چـاوی لێـدەکرێ؛ ئەگەر کوشـتن و دزی کـردن پـێکەوە ئەنجـام بدرێن، یاسا و ڕێسای تایبەت به خۆی هەیه.

سەرۆک ئەگەرچی دەرفەتێکی ئەوتۆی نەبوو، پەلەی ئەوەشی بوو کۆتایی بە کۆڕەکە بێنێ و شۆخی سویسراپی لە چاوەروانیدا نەهێڵێتەوە، بەڵام هەروەک خووی هەمیشەی بوو، کاتێک دەکەوتە قسە هیچکەس دەسکی لە دوو نەدەکرد. لە درێژەی قسەکانیدا لیژنەی داوەرانی تێگەیاند کە ئەرکێکی زۆر گرینگیان لە ئەستۆیە و لە سەر ئەوە داکۆکیی کرد کە مافی ئەوەیان هەیە تۆمەتباران بە تاوابار بزانن یان لە تاوان فحێلیان بکەن. یەکێک لەوان لە بەشێک لە تۆمەتەکاندا بە تاوانبار و لە بەشێکی تردا بە بێ تاوان بناسێنن؛ بەڵام بە هێچ شێوەیەک نابێ لە هەق و عەداڵەت دوور بکەونەوە و لە ڕووی هەست و بەزەیی کاتییەوە بیروڕا دەبڕن؛ هەروەها ڕوونیشی کردەوە کە دەبێ وەڵامی ڕوون بە هەموو پرسیارەکانی دادگا بدەنەوە و ئەگەر لەگەڵ هەموو بەشەکانی ئەو پرسیارە کۆک نین، دەبێ بە وردی ڕوونی بکەنەوە و بەشەکان لە یەکتر هەڵاوێرن.

سەرۆکی دادگا کاتژمێرەکەی دەرهێنا و چاوێکی لێکرد. لەوە زیاتر دەرفەتی قسەکردنی نەبوو. کاتژمێرەکەی خستەوە گیرفانی و چووە سەر باسێکی تر. دوو قازی کە لە تەنیشتی دانیشتبوون، لەپەستا چاویان لە کاتژمێرەکانیان دەکرد. بە بڕوای ئەوان قسەکانی سەرۆک باش و بە سوود بوو بەڵام دووردرێژ بوو. دادیار و پارێزەرەکانی و لیژنەی داوران و تەماشاچییانیش ئەو جۆرەیان بیر دەکردەوە. وێدەچوو سەرۆک خۆشی لەوە تێگەیشتبێ. گتێکی گرت. شتێک نەمابوو باسی نەکردبێ. بەڵام ئەو کە زۆری چێژ لە زمانپاراوییەکەی وەردەگرت. دیسان چەند خولەکێک لە سەر گرنگایەیتی ماف و ئەرکی لیژنەی داوەران دوا، داوای لێکردن پابەندی سوێندەکەیان بن و لە ڕووی ویژدانەوە بڕیار بدەن.

لەو ماوەیەدا کە سەرۆکی دادگا قسەی دەکرد، ماسلۆڤا چاوی لە دەمی بڕیبوو؛ دەتگوت دەیهەوێ گوێی لە دانەبەدانەی وشەکانی بێ. نۆخلیدۆڤ بە دەرفەتی زانی و لە دوورەوە چاوی تێبڕی.

هەر کەسێک دوای ساڵانێکی زۆر خۆشەویستێکی خۆی ببینێتەوە، هەستێکی سەیر خۆ لە ڕۆحی دەئاڵێنێ. سەرەتا لە گۆڕانی ڕواڵەتی دەروانێ و ڕوخسار و هەڵسوکەوتی ئەو کاتی لەگەڵ ئەمڕۆی پێکەوە هەڵدەسەنگێنێ. وردەوردە خوو بە سیمای ئێستای دەگرێ و گۆڕانی ڕواڵەتی گرنیگایەیتی خۆی لە دەست دەدا و بیر لە کەسایەیتی ڕاستەقینەی ئەو دەکاتەوە. نۆخلیدۆڤیش ئەو هەستە ڕۆحی داگرتبوو.

ماسلۆڤا لەگەڵ ئەوەشدا کە جلوبەرگی بەندیخای لەبەردابوو و هێندێ قەڵەو بووبوو و مەمکی گەورەتری دەنواند و دەموچاویشی برێ پانتر و نێوچاوانی گنجی تیکەوتبوو، بەڵام هەر کاتیۆشاکەی ساڵان بوو؛ هەر ئەو کاتیۆشایەی کە شەوی جێژنی پاک پێکەوە چووبوون بۆ کلیسا؛ هەر ئەو کاتیۆشایەی کە چاوانی پڕ لە ئەوین و جوانی بوون. «بڕوانە دەستی زەمانە چی دەکا، منی هێناوەتە ئێرە و لەم دادگایە بوومەتە ئەندامی لێژنەی داوەرییەک و دوای دە ساڵ ئەو لە سەر کورسیی تۆمەتباران ببینم. خۆزگە ئەم دانیشتنە زوو کۆتایی پێ بێ !»

کۆنت هێشتا نەیدەویست تەسلیمی شەرم و پەشیمانی بێ. هەموو شتێکی وەک یاریی چارەنووس لە قەڵەم دەدا. نەیدەویست خۆی بدۆڕێنێ و دڵی خۆی بخاتە داوی خەم و پەرێشانییەوە. وەک سەگێک دەچوو کە مافوورەی تەرکی ژوورێکی پیس کرد بێ و خاوەنەکەی پشت ملی گرتبی و بە زۆر لمبۆزی لە پیسییەکەی خۆی نابێ؛ بەڵام سەگی بەستەزمان لاقە فرتێ دەکا و هەوڵ دەدا خۆی دەرباز بکات و خۆی لە قوژبنێک بشارێتەوە.

نۆخلیدۆڤ لە کاری چەپەڵ و خویڕییانەی خۆی تێگەیشتبوو. هەستی بە پەنجەی بە هێزی چارەنووس دەکرد کە پشت ملی گرتبوو؛ بەڵام هێشتا نەیدەویست قەبووڵی بکا کە بەرپرسی هەموو ئەو چارەڕەشی و کێشانە ماسلۆڤایە. ئەو پەنجە بەهێزە زیاتر پشت ملی ڕێک دەگوشی و دەیویست ناچار بە دانپیانانی بکا. هێشتا ویقاڕ و قورساخیی ڕواڵەیتی خۆی پاراستوو. لە ڕیزی پێشەوەی لێژنە داوەران دانیشتبوو، لاقی لە سەر لاقی دانابوو و چاویلکەکەی بە دەستیەوە ئەمبار و ئەوبار دەکرد؛ بیری لەوە دەکردەوە کە ڕەفتاری لەگەڵ کاتیۆشا زۆر ناجوامێرانە بووە و ئەم دە دوازدە ساڵەی زۆر بە شێوەیەکی بێهوود و خوێڕییانە ڕابواردووە.

# بیست و سێ

سەرۆکی دادگا دوای کۆتایی پێ هێنانی وتەکانی، بەر پرسی لێژنەی داوەرانی بانگ کرد و لیستەی ئەو پرسیارانەی دایە دەستی کە دەبوو وەڵام بدرێنەوە. ئەندامانی لێژنە شاد و دڵخۆش لە جێی خۆیان هەستان و ڕۆیشتن بۆ ژووری ڕاوێژکردن. دەرگا پێوەدرا. پاسەوانێک بە شمشێرەوە لە بەر دەرگاکەدا ڕاوەستا. تۆمەتبارانیان بۆ دەرێ ڕەپێچەک دا و قازییەکانیش لە هۆڵی دادگا چوونە دەرێ.

لێژنەی داوەران لە دەوری مێزێک دانیشتن؛ هەناسەیەکی ئاسوودەیان هەڵکێشا. هێندێکیان جگەرەیان داگیرساند. ئیتر ناچار نەبوون وشک و عەبووس دانیشن و لووتیان هەڵێنن. هەرکەس بە پێی حەزی خۆی شتێکی دەگوت. بازرگانی خۆشمەشرەف باسی بەزەیی و بەخشینی دەکرد.

ـ هاوڕێیان! ئەو کچە بێ تاوانە. دەبێ ڕەحم و بەزەیمان هەبێ.

سەرۆکی لێژنە ئەوەی قەبووڵ نەبوو. گوتی:

ڕەحم و بەزەیی بە جێی خۆی؛ نابێ لە ڕووی هەست و سۆزەی کەسانەوە بڕیار بدەین. دەبێ زۆر بە وردی لێی بکۆڵینەوە و موو لە ماست دەرکێشین.

عەمیدی خانەنشین تاریفی وتەکانی سەرۆکی دادگای دەکرد. بازرگانی خۆشمەشرەف دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی:

ـ من کارم بە لایەنی باشی و خراپی نییە؛ من تێروپڕ خەوتووم. ئەگەر ئەو کچە جانتاکەی لەبەر چاوی ئەو خزمەتکارانە نەکردایەتەوە، ئەوان لەو پارەیە ئاگادار نەدەبوون و ئەو دزییەش ڕووی نەدەدا.

یەکێک لە ئەندامانی لێژنە بە سەرسووڕمانەوە چاوی لێکرد.

ـ کەوایە ئێوە ئەو کچە بە تاوانبار دەزانن؟

بازرگانی خۆشمەشرەف لایەنگریی لە ماسلۆڤا دەکرد و لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەو «کچە جوانە» ناتوانێ دزی بکات و پیاو بکووژێ. عەمیدی خانەنشین بە پێچەوانەی ئەو پێی وابوو کچە هەموو کارێکی لە دەست دێ. هێندێک لە ئەندامانی لێژنەی داوەری دەیانگوت کلیلەکەش و ئەنگوستیلە ئەڵماسەکەش بە ماسلۆڤا بووە، کەوایە زیاتر لەوانی دیکە جێی گومانە. دەمەتەقێ دەستی پێکردبوو و هەکەس شتێکی دەگوت:

ـ ئەو کچە هیچ تاوانێکی نییە. ئەو پیاوە فیلەتەنە سەرخۆش بووە و لێیداوە؛ پاشان بۆ ئاشتکردنەوە و دڵدانەوەی ئەو ئەنگوستیلەیەی پێداوە.

ـ دەبێ بۆمان ڕوون بێتەوە کە ئەو کچە تاوانبارە یان ئەو دوو کەسەی دیکە؟

ـ ئەو دوو خزمەتکارە بێ تاوانن، کلیلەکە بە دەست ئەو کچەوە بووە.

هەڕوا خەریکی مشتومڕ بوون و هەرکەس شتێکی دەگوت. فەرمانبەری پایەبەرزی دەوڵەتی و سەرۆکی لیژنەی داوەران هەستایە سەر پێ و داوای لێکردن ئارام بن و بە شێوەیەکی جیددی باسەکە درێژە پێبدەن. جوولەکەی حیسابدار بەر لەوەی وتەکان بنەوشێترین، بەسەرهاتی لەشفرۆشێکی گیڕایەوە کە کاتژمێری هاوڕێیەکی ئەوی لە گیرفانی دەرهێناوە. عەمیدی خانەنشین باسی لەشفرۆشێکی دیکە و دزییە سەیروسەمەرەکانی ئەوی کرد. هەر دووکیان لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە ژنی لەشفرش هەموو کارێکی لە دەست دێ.

سەرۆک دیسان هەموویانی بێدەنگ کردەوە تاکوو پرسیارەکانی دادگا هەمیسان بخوێندرێنەوە. هەموویان بێدەنگ بوون. سەرۆک زۆر لە سەرەخۆ پرسیارەکانی خوێندەوە:

1ـ هاوڕێیان ئێوە سیمۆن کارتی نیکین خەڵکی گوندی بوورکی، لە ناوچەی کراپی ڤێنۆ، کە سی و سێ ساڵی تەمەنە، بەتاوانبار دەزانن؟ ئەو بەوە تۆمەتبارە کە ڕۆژی حەڤدەهەمی ژانوییەی ساڵی... بە هاودەستی تۆمەتبارانی دیکە، گەردی ژاری کردۆتە نێو مەشرووبی بازرگانەوە و دوای کوشتنی نابراو بڕی دووهەزار و پێنجسەد ڕۆبڵ و ئەنگوسیلەیەکی ئەڵماسی لێ دزیوە. ئێوە ئەو تۆمەتانە بەڕەوا دەزانن یان نا؟

2 ـ ئۆفێمی بۆچکۆڤا، خزمەتکاری هوتێل، چل و سێ ساڵان، تۆمەتێکی دراوەتە پاڵ کە لە پرسیارەکەی سەرەتادا ئاماژەی پێکرا. ئێوە ئەو بە تاوابار دەزانن یان نا؟

3 ـ کاترین ماسلۆڤا، بیست و حەوت ساڵان تۆمەتی کردەوەیەکی دراوەتە پاڵ کە لە پرسیاری سەرەتا دا ئاماژەی پێکرا. ئێوە ئەو بە تاوانیار دەزانن یان نا؟

4 ــ ئەگەر پێتــان وایە ئــوفمی بوچکۆڤــا دەســتی لەو تــاوانەدا نیــیە و پرسیاری یەکەم ئەو ناگرێتەوە، ئەو تاوانەی دەدەنە پاڵ کە بە کلیل زارکی جانتاکەی سملکۆڤی کردبێتەوە و دووهەزار و پێنجسەد ڕۆبڵی دزیبێ یان نا؟

سەرۆکی لێژنە دوای خوێندنەوەی ئەم بابەتانە، پرسیاری یەکەمی دیسان خوێندەوە و داوای لە هاوکارانی کرد بیروڕای خۆیان دەربڕن. وەڵامی ئەو پرسیارە ئەرێنی بوو. هەموویان لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە کارتی نیکین دەستی لەو دزییەدا هەبووە. هەموویان تۆمەتەکەیان بەڕەوا زانی. جگە لە کەسێکیان کە پیشەسازێکی بە ساڵاچووبوو، ئەو کارتی نیکینی بە بێ تاوان دەزانی. سەرۆکی لێژنە چونکە پێی وابوو پیشەسازی پیر لە پرسیارەکە تێنەگەیشتووە، جارێکی دیکەی خوێندەوە و بۆی ڕوون کردنەوە کە هیچ کەس گومانی لەوە نییە کە سیمون کارتی نیکین بێ تاوان بێ. پیشەسازی پیر کە بە باشی لە بابەتەکە حاڵی بووبوو، فەلسەفەیەکی بۆ خۆی هەبوو و دەیگوت: «مەگین ئێمە پاک و بێ تاوانین؟» هاوکارەکانیشی ئامۆژگاری دەکرد و دەیویست پێیان بسەلمێنێ کە لێبوردن زۆر چێژبەخشە و وا باشترە تاوانباران ببەخشین. هەرچی قسەیان لەگەڵ کرد و شێروڕێوییان بۆ هێنایەوە، گوێی نەدایە و نەچووە ژێربار.

دووهەمین پرسیار سەبارەت بە بوچکۆڤا بوو. باسێکی دوورودرێژ دەستی پێکرد. زۆربەی ئەندامانی لێژنە ئەویان بەبێ تاوان دەزانی و لە سەر ئەو باوەڕە بوون هیچ هۆکارێک لەبەردەستدا نییە کە ئەو دەستی لە دەرمانداو کردنی سملکۆڤدا هەبوونێ، پارێزەرەکەشی بە چەندین هۆ بێ تاوانیی ئەوی سەلماند بوو. بارزگانی خۆشمەشرەف کە هەوڵی دەدا ماسلۆڤا فحێل بکرێ، بە هەموو شێوەیەک دەیویست تاوانەکە بخاتە ئەستۆی ئۆفێمی بوچکۆڤا و گراوەکەی ئەو کارتی نیکین. سەرۆکی لێژنە، کە نەیدەویست

هەست و سۆز بە سەر بابەتەکەدا زاڵ بێ، بە چەند هۆکاری بەهێز بوچکۆڤای بە بێ تاوان لە قەڵەم دا و لە کۆتاییدا هەموویان چوونە سەر قسەی ئەو؛ بەڵام سەبارەت بە پرسیاری چوارەم کە بوچکۆڤای تەنیا لە دزییەکەدا بە تاوانبار دەزانی، هەموو وەڵامی ئەرێنییان دایەوە و لە سەر داوای پیشەسازی پیر پێشنیاریان کرد کەمترین سزای بۆ لەبەرچاو بگیرێ.

پرسیاری سێهەم کە سەبارەت بە ماسلۆڤا بوو باس و دەمەتەقێیەکی زۆری لێکەوتەوە. سەرۆکی لێژنە ئەوی لە دزی و کوشتنەکەدا بە تاوانبار دەزانی. عەمیدی خانەنشین و جوولەکەی حیسابدار لەگەڵ ئەو هاوڕا بوون. بازرگانی خۆشمەشرەف ئەوی لە هەموو لایەنێکەوە بەبێ تاوان دەزانی و ئەوانی دیکە دوودڵ بوون و هەر جارەی دەچوونە سەر قسەی لایەنێک. ڕاستییەکەشی ئەوە بوو کە هەمووان ماندوو بووبوون و حەزیان دەکرد بەزووترین کات کارەکە یەکلایی بکەنەوە و بڕۆن بە دوای کار و ژیانی خۆیاندا.

نۆخلیدۆڤ کە ماسلۆڤای دەناسی و بەوردی گوێی بۆ لێپێچینەوەکانی دادگا شل کردبوو و گومانی لەبێ تاوانیی ئەو نەبوو، کاتێک هەستی کرد زۆرینەی ئەندامان لەگەڵ سەرۆک هاوڕان، هەڵیدایە و دەستی کرد بە پارێزگاری کردن لێی و دەیویست بیسەلمێنێ کە ماسلۆڤا بێ تاوانە. کێشەی کارەکەش لەوەدا بوو کە بازرگانی خۆشمەشرەف بەڵگە و قسەکانیشی زۆر بێ بنەما و ناشارەزایانە بوون. ئامادە بووانیش سات لە دوای سات بێ تاقەت و ماندووتر دەبوون. نۆخلیدۆڤ دەبوو خۆی لێ هەڵکا. بەڵام بەداخەوە ترسێکی سەیر چنگی لە گیانی گیر کردبوو. لەوە دەترسا قسەیەک بکات و بە دەنگی لەرزۆک و ڕەنگی هەڵبزرکاویدا هاوکارانی لە ڕاز و کەینوبەینەکەی تێبگەن. زۆر بە زەحمەت توانیی بە سەر خۆیدا زاڵ بێ. هەر لەگەڵ ویستی

دەمی ببزێوێ و بەرەڤانیی لێبکا، سوورهەڵگەڕا و کەوتە هەناسە بڕکێ. بەڵام نێوچاوانەکەی هێنای و پێش ئەوەی زمانی بگەڕێ گراسیمۆڤیچ گەیشتە فریای. ئەو کە تا ئێستا متەقی نەکردبوو، باسێکی وردی دامەزراند:

ـ هاوڕێیان وای بە باش دەزانم لە سەرەتاوە بەو بابەتەدا بچینەوە. ئێوە دەڵێن ژنە پارەکانی دزیوە، چونکە کلیلی پێبووە. پێتان وانییە خزمەتکارەکانی هوتێل، دوای ڕۆیشتنی ماسلۆڤا بە کلیلێکی تر زارکی جانتاکەیان کردبێتەوە؟

بازرگانی خۆشمەشرەف بزەیەکی هاتێ و هەستایە سەرپێ.

ـ ڕاست وایە؛ بژیی، هەروایە!

گراسیمۆڤیچ ئەو مامۆستایە بوو کە سەردەمێک وانەی بە خوشکزاکانی کۆنت نۆخلیدۆڤ دەگوت و بە بڕوای ئەو پیاوێکی ڕەشۆکی و ڕووهەڵماڵدراو بوو؛ چونکە ڕێزی بۆ ئەشراف و خانەدانەکان دانەدەنا. قسەکانی ئەو شوێنێکی باشی لە سەر کۆڕەکە دانا.

ـ سەرنجێکی ئەم خاڵەش بدەن و ئەوە بزانن کە ماسلۆڤا لە بارودۆخیکدا نەبووە کە بتوانی پارە بدزێ و خۆی بشارێتەوە.

بازرگانی مەشرەفخۆش دیسان قسەکەی ئەوی پەسند کرد. گراسیمۆڤیچ کە دیتی قسەی بڕدەکا، ئاماژەی بە خاڵێکی تر کرد کە بە بڕوای ئەو هاتنی ئەو کچە بۆ هوتێل و کردنەوەی زارکی جانتاکە لەبەر چاوی خزمەتکارەکان، ئەوانی وەسەر تەماح خستووە کە پارەکان بدزن و تاوانەکەی بخەنە ئەستۆی ئەو.

گراسیمۆڤیچ زۆر بە گوڕوتینەوە قسەی دەکرد. سەرۆکی لێژنەش بە هەیەجانەوە لە سەر قسەی خۆی سوور بوو و ماسلۆڤای بە تاوانبار دەزانی. بەڵگەکانی مامۆستای خاوەن هەست هێندە بەهێز بوو ئامادە بووان بەو ئاکامە گەیشتن کە ماسلۆڤا هیچی نەدزیوە و ئەنگوستیلە ئەڵماسەکەش سملکۆڤ خۆی بەدیاری پێی داوە. بەڵام مەسەلەی کوشتنەکە، کاری

پارێزەرە پڕ گوروتینەکەی دژوارتر کردبوو. ئەو لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ماسلۆڤا ئەو ژەهرەی بە دەرمانی خەو زانیوە و کردوویەتە نێو مەشرووبی سملکۆڤەوە؛ سەرۆکی لیژنەش بە پێچەوانەی ئەو دەیگوت تەنانەت ماسلۆڤا خۆشی دانی پیاناوە کە ژەهری لە پەرداخی بازرگان کردووە و بەو پێیە ناتوانین بەبێ تاوانی بزانین.

بازرگانی خۆشمەشرەف بەڵگەی دەهێنایەوە، دەیگوت ماسلۆڤا پێی وابووە شتێکی خەوهێنەر وەک تریاک دەکاتە نێو پەرداخی سملکۆڤەوە و بەو کارەش ناکرێ بە تاوانباری بزانین. بەڵام عەمیدی خانەنیشین پێمل نەدەبوو.

ـ بە تریاکیش دەکرێ کەسێک بکووژی. ماوەیەک لەمەوبەر ژنێکی خزمی ئێمە تریاکی خواردبوو و ئەگەر پزشیکەکەی دراوسێیان نەگەیشتبایەتە فریای، گیانی لە دەست دەدا.

عەمیدی خانەنشین هێندە بە نەرمی و ویقارەوە دەدوا کە هیچ کەس نەیدەوێرا بپەڕێتە نێو قسەکانی. سەرەڕای ئەوەش جوولەکەی حیسابدار قسەکەی پێ بڕی:

ـ ئەگەر کەسێک فێری بەکارهێنانی تریاک بێ، بە ڕادەی زۆریش بخوا نامرێ. خزمێکی ئێمە...

عەمیدی خانەنشین نەیهێشت قسەکەی تەواو بکات. دیسان درێژەی بە قسەکانی خۆی دایەوە و چووە سەر باسی ئەو ژنەی خزمیان کە تریاکی خواردبوو. یەکێک لە ئەندامانی لیژنە لە ناکاو هەڵیدایە:

ـ هاوڕێیان؛ وادیارە ئاگاتان لێ نییە چەند سەعات تێپەڕیوە و ئێمەش هەر خەریکی ڕستنی خۆڕایین و بێهوودە لە سەری دەڕۆین.

سەرۆکی لیژنە دوایین قسەی خۆی کرد:

ـ هاوڕێیـان! ئیتـر بـا لە سـەری نەڕۆیـن. هەموومـان دەزانـین ماسـلۆڤا تاوانبـارە! بەڵام نە لە دزیـیـەکەدا بەشـدار بـووە، نە لە پیـاو کـوژییەکەدا. مامۆستای خاوەن هەست زۆر شاد بوو لەوەی کە لەو کارەدا سەرکەتوو بووە. بازرگانی خۆشمەشەڕەف پێداگر بوو لە سەر ئەوەی بنووسن: «ئەو بێ تاوانە و دەبێ کەمترین سزای بۆ لەبەر چاو بگیرێ!» تەنیا پیشەسازی پیر بوو دیگوت دەبێ بنووسن: «ماسلۆڤا بێ تاوانە و دەبێ سزای لە سەر هەڵگیرێ.» سەرۆکی لێژنە بۆ ئەوەی بێدەنگی بکات گوتی: ئەگەر بنووسرێ ئەم ژنە دەسـتی لە دزی و کوشـتندا نەبـووە، ئیتـر لە هەمـوو تۆمەتەکـان دەشۆرێتەوە.

ئەنـدامانی لێـژنە هێنـدە مانـدوو بـوون نەیانـدەزانی سـەرۆک چ فێـڵ و تەڵەکەیەکی لە ژێر سەر دایە و ڕستەی «تاوانبارە، بەڵام نە لە دزییەکەدا بەشدار بووە و نە لە پیاوکوژییەکەدا» لە ڕوانگەی دادگاوە چ مانایەکی هەیە؟

ڕابلـێ[١٦] دەڵـێ: «لە دادگایەکـدا، پـارێزەرێکی کـارامە بـۆ سـەلماندنی بـێ تاوانیی بریگرتەکەی خۆی، زۆری بەڵگە و بابەتی یاسایی کۆکردەوە و بیست و چوار لاپەڕەی بابەتی یاسایی بە زمانی لاتینی خوێندەوە. لە کاتی دەنگداندا قازییەکـان زۆر مانـدوو بـوون؛ یەکێـک لە قازییەکـان پێشـنیاری کـرد تەڕ و وشـک هەڵـخەن ئەگەر تەڕ هـات تۆمەتبـار فحێـل بـکەن و ئەگەر وشـک هـات سزای بدەن!

کاری لێژنەی داوەرانیش دەستی کەمێکی لەو چیرۆکە نەبوو. لە لایەکەوە نووسـیبوویان ماسـلۆڤا نە لە دزیـدا دەسـتی هەبـووە نە لە پیاوکوژیـدا؛ لە

16. F.Rabelais «1553 ـ 1494» نووسەری فەڕەنسی؛ تۆلستۆی ئەوی وەک پووشکین و سێروانتێش و نووسەرانی تر لە قەڵەم دەدا و لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە دەبێ گرنگی بە نووسراوەکانیان بدرێ.

لایەکی دیکەشەوە ئەویان بە تاوانی دەرمانداو کردنی سملکۆڤ مەحکووم کردبوو. سەرۆکی دادگا ئەگەرچی لە وتەکانیدا هەموو شتێکی باس کردبوو، بەلاَم لە بیری چووبوو بە ئەندامانی لێژنەی داوەران بلّێ لە وەلاَمی «بە تاوانبار زانینی تۆمەتباردا» بەڕاشکاوی یان بلّێن ئا یان بلّێن نا. لێژنەی داوەران لە وەلاَمدا نووسیبوویان «ئەرێ تاوانبارە بەلاَم قەستی کوشتنی نەبووە؛» سوێرقسەیی عەمید و جوولەکەی حیسابدار هەمووانی گێژ کردبوو. نۆخلیدۆڤ وەها لە دەریای خەیاڵدا نوقم بووبوو کە ئاگای لە خۆی و دەوروبەری نەمابوو. گراسیمۆڤیچ لەو کاتەدا کە سەرۆکی لێژنە ئەو بابەتە فێلاَوییەی دەنووسی و بە هەمووانی واژۆ دەکرد، چەند خولەکێک چووبووە دەرێ. ئەندامانی لێژنەش هێندە ماندوو بوون هەر چییەکیان لە بەر دەستدا بایە بێ ئێختیار واژۆیان دەکرد.

سەرۆکی لێژنە زەنگی لێدا. هەمووان هەستان و چوونە دەرێ. پاسەوان شمشێرەکەی خستەوە کالان. ئەندامانی دادگا گەڕانەوە شوێنەکەی خۆیان. تۆمەتبارانیان هەمیسان هێنایەوە بۆ بەردەمی دادگا.

سەرۆکی لێژنە ئاکامی ڕاوێژ و دەنگدانەکەی لێژنەی داوەرانی دایە دەست سەرۆکی دادگا و سەرۆکی دادگا بیروڕای لێژنەی خوێندەوە و بە سەرسووڕمانەوە کاغەزەکەی پیشانی هاوکارانی خۆی دا؛ ئەوانیش بە دیتنی کاغەزەکە سەرسام بوون.

- دیتووتانە چ گەوجییەکیان نواندووە؟

ئەو دوو قازییە لەگەڵی هاوڕا بوون.

- بەڵی. لەگەڵ ئەوەدا وەک بێ تاوانیان لەقەڵەم داوە، بەلاَم بە پێی یاسا بە بەندیخانە و کاری دژوار مەحکووم دەبێ.

سەرۆکی دادگا لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە دەبێ پەنا بۆ مادەی هشتسەد و هەژدە بەرن. لەو مادەیەدا هاتبوو، هەرکاتێک بیروڕای لیژنەی داوەران بنەمای یاسایی نەبێ، دادگا دەتوانێ چاکسازیی بکا یان دەستی تێوەربدا. یەکێک لەو دوو قازییە کە ژانی گەدەی جاڕزی کردبوو، لە سەر کاغەزێک چەند ژمارەی نووسی و پێکەوە زێدەی کرد، ئەگەر ئاکامی ئەو زێدەکردنە بە سەر ژمارە سێدا شیاوی دابەشکردن بووایە، کەڵک لە مادەی818 وەردەگیرا. لەگەڵ ئەوەشدا کە ژمارەی بەدەست هاتوو بەسەر سێدا شیاوی دابەشکردن نەبوو، چونکە مرۆڤێکی دڵنەرم بوو ڕەزایەتی دەربڕی. بەڵام قازییەکی تر کە چاویلکەی چوارچێوە زێڕینی لە چاودا بوو و بەردەوام لەگەڵ ژنەکەی خەریکی کێشە و شەڕەدەندووکە بوون، ڕازی نەبوو.

ـ لەپەستا لە ڕۆژنامەکاندا هێرش دەکرێتە سەر لیژنەی داوەران و دەڵێن بەبێ هیچ هۆیەک تاوانباران فحێل دەکەن. ئێستا ئەگەر ئێمە قازی و دەمڕاستی دادگاین و بمانهەوێ تۆمەتبارێک فحێل بکەین کە لیژنەی داوەران مەحکوومی کردووە، نازانن ڕۆژنامەکان چۆن قامک بە چاوماندا دەکەن و دەماندەنە بەر پلاری ڕەخنە. من بە هیچ شێوەیەک ڕازی نیم کەڵک لە مادەی 818 وەربگیرێ.

سەرۆکی دادگا چاوی لە کاتژمێرەکەی کرد.

ـ کەوایە هیچ چارەیەکمان نییە جگە لەوەی پێملی بیروڕای لیژنەی داوەران بین.

هەموو لە جێی خۆیان هەستان. سەرۆکی لیژنەی داوەران کە لە پەستا ئەمپا و ئەوپای دەکرد، بە ئاماژەی سەرۆکی دادگا بیروڕای لیژنەی داوەران و وەڵامی پرسیارە چوار لایەنەکەی بە دەنگی بەرز خوێندەوە. قازییەکان،

نووسیاری دادگا، پارێزەرەکان و تەنانەت دادیاریش سەرسام بووبوون و ئەوەی دەیانبیست باوەڕیان پێ نەدەکرد.

کاتێک هەمووان لەجێی خۆیان دانیشتنەوە، سەرۆک داوای لە دادیار کرد بە پێی بیروڕای لیژنەی داوەران سزای هەرکام لە تۆمەتباران ڕاگەیێنێ.

دادیار کە پێی وابوو وتەکانی ئەو شوێنی لە سەر لیژنەی داوەران داناوە و تۆمەتبارانیان مەحکووم کردووە، لووتبەرزانە هەستایە سەر پێ و لانی زۆری سزای بۆ هەرکام لە تۆمەباران داوا کرد:

ـ بۆ سیمۆن کارتی نیکین مادەی 1451 و بەندی چوارەم لە مادەی1453، بۆ ئوفمی بوچکۆڤا مادەی 1659، بۆ کاترین ماسلۆڤاش مادەی 1454 داوا دەکەم.

ـ کۆتایی دادگاییەکە ڕاگەیندرا.

سەرۆکی دادگا و قازییەکان بۆ ڕاوێژ و دەرکردنی حوکمی کۆتایی لە هۆڵەکە چوونە دەرێ. ئەندامانی لیژنە تازە وەخۆ هاتبوونەوە و بۆیان دەرکەوتبوو چ قوڕێکیان بۆ ماسلۆڤای چارەڕەش گرتۆتەوە. گراسیمۆڤیچ لە کۆنت نۆخلیدۆڤ ڕاخوڕی:

ـ دۆستی بەڕێز! دەزانی ئەو بەستەزمانەمان چۆن گرفتار کرد؛ بەو بڕیارە نابەرپرسانەیەی خۆمان ئەو کچە چارەڕەشەمان ئاوقای بەندیخانە کرد.

نۆخلیدۆڤ وەها شڵەژابوو لەوانەبوو هەناسەی ڕاوەستێ؛ ئەو قسانەی مامۆستای خاوەن هەستیش ئەوەندەی دیکە ژانی بە دڵی گەیاند.

ـ بە ڕاستیتە؟

ـ ئەی پێت وایە گاڵتە دەکەم. ئێمە بەو دەنگدانەی خۆمان دەزانی چ قوڕێکمان بۆ ئەو چارەڕەشە گرتەوە؟ ئێمە دەنگمان دا کە ئەو ژنە تاوانبارە، بەڵام قەستی کوشتنی سملکۆڤی بازرگانی نەبووە. نووسیاری دادگاش

دەیگوت دادیار پازدە ساڵ زیندانی بە کاری دژوارەوە بۆ ماسلۆڤا داوا کردووە.

نۆخلیدۆڤ هێشتا باوەڕی نەدەکرد؛ داوای لە سەرۆکی لیژنە کرد بۆی ڕوون بکاتەوە بۆچی ئەو کارەی کردووە. بەڵام ئەو ئامادە نەبوو ئەو تاوانە بگرێتە ئەستۆی خۆی و دەیگوت ئەو بڕیارە بڕیاری گشتییە و هەمووان لە سەری کۆک بوون، تێکڕاش واژۆیان کردووە.

گراسیمۆڤیچ پێمل نەدەبوو.

ـ براکەم، ئەوە چ قسەیەکە تۆ دەیکەی؟ کاتێک دەڵێین تۆمەتبار قەستی پیاوکوژیی نەبووە و لەو کوشتنەدا دەستی نەبووە، دەبێ ئەو تۆمەتەشی لە سەر لابەین و نەهێڵین تێوەگلێ؛ چونکە ئەو مەسەلەیە وەک ڕۆژ ڕوونە.

ـ من ئەو بابەتەم بە دەنگی بەرز خوێندەوە؛ هیچکام لە ئێوە دژایەتیتان نەکرد و ناڕەزایەتیتان دەرنەبڕی.

گراسیمۆڤیچ وەبیری هاتەوە کە چەند خۆلەکێک لە ژوورەکە چۆتە دەرێ و لەو کاتەدا کە ئەو لە ژوورێ نەبووە ئەو بڕیارەیان دەرکردووە. لە نۆخلیدۆڤیش تووڕە بوو کە بۆچی ناڕەزایەتیی دەربڕیوە. کۆنت نۆخلیدۆڤ کاس و گێژ بووبوو.

ـ من وا لە گۆمی بیر و خەیاڵدا نوقم بووم ئاگام لە هەموو شتێک بڕابوو.

ـ تۆ نوقم بووی لە گۆمی خەیاڵدا و ئەو ژنە بەستەزمانەش لە گێژاوی چارەڕەشیدا.

ـ نابێ هەروا دەست لە سەر دەست دانێین؛ دەبێ ئەو خەتایەی خۆمان قەرەبوو بکەینەوە.

ـ هیچ کەڵکێکی نییە، تازە کار لە کار ترازاوە.

نۆخلیدۆڤ چاوی لە تۆمەتبارەکان کرد. هەرسێکیان لە شوێنی تۆمەتباران دانیشتبوون و چاوەڕوانی بڕیاری دادگا بوون. ماسلۆڤا زەردەیەکی لە سەر لێو بوو. کۆنت نۆخلیدۆڤ خەمبار و بێ تاقەت. هەتا چەند خولەک لەمەوبەر لە خەیاڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەگەر ماسلۆڤا ئازاد بێ دەبێ چۆنی هەڵسوکەوت لەگەڵ بکەم؟» دەبێ بچێت بۆ سەردانی و باسی ڕابردووی بۆ بکات یان بڕوات لە بیری خۆی بباتەوە؟ ئێستا کە بیر و مێشکی ئاڵۆزابوو و وێدەچوو ئەو ژنە لێقەوماوە بنێرن بۆ سیبیریا و دەیزانی ئیتر چاوی پێی ناکەوێتەوە و دەستی پێی ڕانەگا، وەها پەشۆکابوو دەتگوت بە کوتک بە سەریاندا کێشاوە.

# بیست و چوار

پێشبینییەکەی گراسیمۆڤیچ وەڕاست گەڕا. قازییەکان دوای ڕاوێژکردن گەڕانەوە بۆ نێو هۆڵەکە و سەرۆک حوکمی دادگای بەم شێوەیە خوێندەوە:

«بەناوی حەزرەتی مەزن ئیمپڕاتۆر. ڕۆژی بیست و هەشتەمی ئاڤریل، دادگای تاوانەکانی پارێزگا بە سەرنجدانە بیروڕای ئەندامانی لێژنەی داوەران و بە پێی بەندی سێهەمی مادەی 771 لە بەندی چوارەمی مادەی771 و 777ی یاسای سزا و تاوانەکان، حوکمی تۆمەتباران بەم شێوەیەی خوارەوە ڕادەگەیێنێ: «سیمۆن کارتی نیکین سی و سێ ساڵان و کاترین ماسلۆڤا بیست و حەوساڵان لە هەموو چەشنە مافێکی مەدەنی و تاکەکەسی بێبەش دەبن. کارتی نیکین هەشت ساڵ و ماسلۆڤا چوار ساڵ زیندانیان بە کاری دژوار وە بۆ بڕاوەتەوە و بە پێی مادەی 28ی یاسای سزادان مەحکوم کراون.

«ئۆفیمی بوچکۆڤا، چل و سێ ساڵان بە بێبەش کردن لە مافی مەدەنی و تاکەکەسی و دەسبەسەردا گیرانی هەموو ماڵ و سامانەکەی و سێ ساڵ زیندان بە پێی مادەی 49ی یاسای سزادان مەحکوم کراوە.

«هەموو مەحکوم کراوەکان پێویستە خەرجی دادگا و لێپێچینەوەکە بدەن و ئەنگوستیلە و پارە دزراوەکەش دەدرێ بە خەزێنەی دەوڵەت.»

کارتی نیکین بەبێ ئەوەی جووڵە بکات و زمانی بگەڕێ گوێی بۆ بڕیاری دادگا شل کردبوو؛ دەستی لە سەر چۆکی دانابوو و بەردەوام چەناگەی دەجووڵایەوە. بۆچکۆڤا ئارام و لە سەرەخۆ دەهاتە بەر چاو. ماسلۆڤا سوور هەڵگەڕابوو و هاواری دەکرد:

- من بێ تاوانم. من هەموو شتێکم پێ گوتوون. من هیچم نەشاردەوە و ڕاستیی هەموو شتێکم گوت.

هاوار و سکاڵای لە نێو هۆڵەکەدا دەنگی دەدایەوە. لە سەر کورسییەکە بەلادا هاتبوو و هۆن هۆن دەگریا. کارتی نیکین و بوچکۆڤا لەگەڵ پاسەوانەکان لە هۆڵەکە چوونە دەرێ. ماسلۆڤا هەروا دەگریا، پاسەوانێک قۆڵی گرت و بەرزی کردەوە.

نۆخلیدۆڤ پەرێشان بوو. خەمێک دڵی ڕێک دەگوشی و عەجمانی لێ هەڵگیرا بوو. بیری کردەوە: «دەبێ پێشی ئەو ناعەداڵەتییە بگرم.» بێ ئیختیار هەڵات بۆ دالانەکە بۆ ئەوەی جارێکی تر چاوی بە ماسلۆڤا بکەوێ. لە بەر دەرگاکە ئەندامانی لیژنەی داوەری و پارێزەرەکانی دی بەهەڵەداوان دەڕۆیشتن و دڵخۆش بوون کە کارەکەیان کۆتایی پێ هاتووە. ئەویش بەبێ ئەوەی بیر لە پلەوپایە و ئابرووی خۆی بکاتەوە، هەڵدەهات و دەیویست بە ماسلۆڤا بگاتەوە. گتێکی گرت. ماسلۆڤا بە لۆی لەچکەکەی فرمێسکەکانی دەسڕی.

نۆخلیدۆڤ بە پەنایدا تێپەڕی. ماسلۆڤا کە خەمێکی قورس دایگرتبوو، ئەوی نەدی. کۆنت کەوتە بیری ئەوەی سەرۆکی دادگا ببینێ و قسەی لەگەڵ بکات. سەرۆکی دادگا باڵتۆ و گۆچانە کەمە زێوینەکەی لە خزمەتکاری دیوی جلان وەرگرت و دەیویست لە خانەی داد بچێتە دەرێ کە نۆخلیدۆڤ پێی گەیشت و خۆی پێ ناساند.

ـ جەنابی سەرۆک! ئیزن بفەرموون شتێکتان عەرز بکەم. من یەکێک لە ئەندامانی لێژنەی داوەری بووم.

ـ کۆنت نۆخلیدۆڤ! خۆشحاڵم بە دیتنت. لە کۆڕێکی شەونشینیدا زیارەتم کردوون. هەر لە بیرمە جەنابتان چرای کۆڕەکە بوون و لە هەمووان باشتر سەماتان دەکرد. بفەرموون چ خزمەتێکم بۆ ئێوە لە دەست دێ.

ـ دەبێ عەرزتان بکەم ئەو ژنەی ئەمڕۆ مەحکووم کرا، بەبڕوای من بێ تاوانە.

ـ دادگا بە پێی بڕیاری لێژنەی داوەران حوکمی دەرکردووە. منیش دەزانم بڕیاری لێژنەی داوەران مەنتیقی نەبوو، بەڵام چبکەین؟ خۆ جەنابیشتان ژێر کاغەزەکەتان واژۆ کردبوو. ئەگەر ئێوە ئەم ڕستەیەتان پێ زیاد کردبایە کە تۆمەتبار بە ئانقەست دەستی لەو پیاو کوژییەدا نەبووە، فحێل دەبوو.

ـ من بۆ ئەو کارە هەست بە تاوان دەکەم و ویژدانم ئازارم دەدا. بۆ ڕزگاریی ئەو ژنە لێقەوماوە دەبێ کارێک بکەین، بە بڕوای ئێوە چیمان لەدەست دێ؟

ـ تەنیا یەک ڕێگا هەیە؛ دەبێ داوای پێداچوونەوە بکەی. دەبێ پارێزەرێکی دڵسۆز پەیدا بکەی و پێوشوێنی ئەو کارە بگرێ .

سەرۆکی دادگا کڵاوەکەی نایە سەری بە ئەدەب و ڕێزەوە قۆڵی کۆنت نۆخلیدۆڤی گرت و لە دادگا هاتنە دەرێ.

ــ ئەگەر بڕیـــاری لیـژنەی داوەران بە باشــی بــدرایە، ئەم ژنە لەو تــۆمەتە ڕزگـاری دەبـوو و دادگـاش لانـی زۆر چەنـد مـانگی زینـدانی بـۆ دەبـڕیەوە. دەبێ قەبـووڵی بـکەی کە ناشـارەزایی لیـژنەی داوەران بـووە هـۆی ئەوەی ئـێمە ئەو حوکمە بدەین. هەروەک عەرزم کردن، جەنابت دەبێ پارێزەرێکی کارامە بگری. ئەویش دەبێ بۆ ڕەتکردنەوەی بڕیاری دادگا بەڵگەی ڕوون و باوەڕپێکراوی بە دەستەوە بێ؛ بۆ ئەو کارەش هەتا زووتر دەستبەکاربن باشترە.

سەرۆکی دادگا تەنیا سێ چارەکە سەعات کاتی هەبوو کە خۆی بگەیەنێتە جێژوان. بە ئاماژەی دەستی فەیتوونێک هاتە بە دەمی و ڕاوەستا. ناونیشـانی شەقامی دیڤۆریا نسکایای دا بە فەیتوونەوانەکە.

ـ حەزرەتی مەزن! هەر کاتێک ئەمر بفەرموون بۆ خزمەت ئامادەم.

فەیتـوون وەڕێ کەوت و سـەرۆکی دادگـا دەسـتی بـۆ کۆنـت نۆخلیـدۆڤ ڕاتەکاند.

# بیست و پێنج

ئاخـافتن لەگەڵ سـەرۆکی دادگـا و هەڵمژینـی هەوای فێنکـی دەمەوبەهـار هێنـدێک سـوکنایی بەگیـانی بەخشـی. لە ڕواڵەتـدا لە ڕادە بەدەر هەسـتی جووڵابوو و کەوتبووە گۆمی خەم و خەیاڵەوە :«پەککوو لەو ڕووداوە؛ دەبێ بـۆ دەربـازبوون لەو کێشـەیە ڕێگەچـارەیەک بـدۆزمەوە. دەبـێ بچـم لە نووسـینگەی خـانەی داد ناونیشـانی نووسـینگەی "فانـارین" و "میکـی شـێنی" پارێزەر وەرگرم؛ هەردووکیان لە پارێزەرە بەناوبانگەکانی وڵاتن.»

لە قاڵدرمەکان وەسەرکەوت. باڵتۆکەی سەرلەنوێ داکەندەوە و دای بە بەرپرسی دیوی جلان. بەرلەوەی بگاتە نووسینگەی خانەی داد، لە داڵانەکە چاوی بە فانارین کەوت. ئەوی دەناسی. لە سەر داوای ئەو پێکەوە چوونە ژوورێک کە دیار بوو نووسینگەی کاری یەکێک لە قازییەکانە.

ـ چبووە؟ کێشەیەکت بۆ پێش هاتووە؟

ـ بەر لەوەی بچینە سەر باسی سەرەکی، دەمەوێ هەموو شتێک لە نێوان خۆماندابێ و نابێ ناوی من بێتە گۆڕێ.

ـ باشە، دڵنیابە.

ـ مەسەلە ئەوەیە کە من ئەندامی لیژنەی داوەری بووم و... کە بەسەر هاتەکەی گێڕایەوە سوور هەڵگەڕا. فانارین بۆی دەرکەوت کە چۆن شڵەژاوە.

ـ ئێمە کەسێکی بێ تاوانمان حوکم دا. تکایە کارێک بکە بە شێوەی یاسایی ئەو حوکمە هەڵوەشێتەوە و دادگایەکی باڵاتر سەرلەنوێ پێداچوونەوەی بۆبکا. تۆزێ بە شەرمەوە گوتیشی: هەقی پارێزەرییەکەشت بە زیادەوە دەدەمێ.

نافارین زەردەیەگی گرت.

ـ سبەینێ پەروەندەکە وەردەگرم و دەیخوێنمەوە. ڕۆژی پنجشەممە وەرە بۆ نووسینگەکەم وەڵامت دەدەمەوە.

نۆخلیدۆڤ دوای قسەکردن لەگەڵ ئەو پارێزەرە تۆزێ دڵی حەسایەوە. لە سەر شەقام فایتوون و عارەبانە لەبەر دەمی ڕادەوەستان. بەڵام حەزی دەکرد بە پێیان بڕوا. هەواکەی زۆر خۆش بوو. بۆنی بەهار وڵاتی داگرتبوو. بیری لە کاتیۆشا دەکردەوە. خەمبار و بێ هیوا بوو. لەخۆی ڕاخوڕی: «خەمی ناوێ، نابێ خۆت بدۆڕێنی!» بارگینێک بەشەقامەکەدا تێپەڕی؛ تراموایەکی ڕادەکێشا، عارە بانەچییەکە ڕایگرت و سواربوو. لە شەقامێکی

دیـکە دابەزی. پاشـماوەی ڕێگـاکە بە سـواری عارەبـانە ڕۆیشـت. دوای دە خولەک لەبەر دەرگای ماڵی کوورچاگین دابەزی.

# بیست و شەش

بنەماڵەی کوورچاگین مـاڵێکی زۆر گەورە و ڕازاوەیـان هەبوو. دەرگـاوانی قەڵەو کڕنۆشێکی بۆ کۆنت نۆخلیدۆڤ کرد و بەعەرزی گەیاند کە: «هەمـووان چاوەڕوانی ئەون.» دەرگـاکە کە لە داری بەڕوو دروسـت کرابوو، کردیەوە و ڕۆیشـت بـۆلای قاڵـدرمەکان، پەتـی زەنـگەکەی کێشـا و هـاتنی میـوانەکەی ڕاگەیانـد. کۆنـت نۆخلیـدۆڤ پـاڵتۆکەی داکەنـد و لە دەرگـاوانەکەی پرسـی میوانەکان کێین؟

ـ جەنابی کولۆسۆڤ و میخائیل سێرگییۆڤیچ.

بە دەنگی زەنگەکە، پێشـخزمەتێک بە جلی ڕەش و دەسـتەوانەی سـپییەوە هـات بەرەوپیـری و بەڕێـز و حـورمەتەوە نۆخلیـدۆڤی بە قاڵـدرمە فەرش پۆشـەکاندا بەرەو ژووری میوانـداری ڕێنـوێنی کـرد. هەمـووان لە دەوری مێزەکە دانیشـتبوون، جگە لە سـووفی ڤاسـیلۆڤنا، دایکـی کۆنتس میسـی، کە هیچکـات لە ژووری خەوەکەی نەدەهـاتە دەرێ. لەلای سـەرووی مێـزەکە کوورچـاگینی پیـر دانیشـتبوو؛ لە دەسـتە چەپـی پزیشـکی بنەمـاڵە و لای ڕاستیشی ئیڤان ئیڤانۆڤیچ کۆلسۆڤ، کە مارشارشـاڵی ئیفتیخاری و ئەندامی ئەنجـومەنی بـاڵای بەڕێـوەبەرایەتیی بانـک و کەسـێکی لیبـراڵ بـوو. خـاتوو "رادێر"، لەلەی خوشکە چوار ساڵانەکەی پرەنسس میسـی، "پێتیا" تاقـانە بـرای پرەنسـس میسـی کە قوتـابیی پـۆلی دواناوەنـدی و یەکێـک لە هاوپۆلەکـانی،

کاترین ئالکسیۆڤنا قەیرە کچی چل و چەند ساڵانەی میخاییل سێرگی یۆڤیچ، تێلێگین کوڕە مامی پرەنسس میسی، لە دەوری مێزەکە دانیشتبوون. کورسیی تەنیشتی پرەنسس میسی خاڵی بوو.

کوورچـاگین کە بە ددانە دەسـتکردەکانییەوە، زۆر بە شـێنەیی نـانی دەخوارد، لە جێی خۆی هەستا و بە چاوی ئاماژەی بە کۆنت نۆخلیدۆڤ کرد لە سـەر کورسـییە خـاڵییەکە دانیشـێ. نۆخلیـدۆڤ مـاوەیەکی زۆر بـوو کوورچـاگینی پیـری دەناسـی بەڵام ئەو ڕۆژە بـۆ یەکەم جـار بە بێـزارییەوە چاوی لە چاوی سـوور و لچـی شـۆڕ و بەرخەبەبەی گوشـتنی ئەو کـرد. ئەم پیاوە ساماندارە دەستڕۆیشتووە، لەو سەردەمەدا کە پارێزگـار بـوو زۆر زاڵـم و دڵـڕەق بـوو و بـێ بەزییـانە ڕەعیەتەکـانی دەدایە بەر زەبـری قـامچی و تەنانەت گوللەبارانیشی دەکردن.

سـتیپان پێشـخزمەتی بەژن و بـاڵا جـوان لە دۆلابێـک کە پـڕ بـوو لە قاپوقاچـاخی زێوین،کەوچـک و چەتـاڵێکی دەرهێنـا هـاتە پێشـێ و بە ڕێـزەوە کڕنۆشێکی کرد:

ـ گەورەم! بفەرموون با خواردن بێنم.

ئەو ڕۆژە هەموو شتێک لەبەر چاوی قۆڕ و ناحەزی دەنواند. تەوقە کـردن و گەڕان لە دەوری مێزەکەی زۆر پـێ نـاخۆش بـوو. لە سـەر مێـزی سـووچی ژوورەکە، چەنـدین جـۆر خـواردن، هەر، لە قـررژاڵەوە بگـرە هەتـا ماسـی و خاڤیـار و زەڵاتەی جۆراوجـۆر ڕیـز کرابـوو، قاشـێک پەنیـری خسـتە سـەر دەورییـەکەی و لە نێـوان پرەنسـس میسـی و کـاترین ئەلکسـیۆڤنادا دانیشـت. مەدەی بەسـرابوو، بەڵام بە تـامەزرۆییەوە دەسـتی کـرد بەخـواردن. کولۆسۆڤ، مارشاڵی ئیفتیخاری بە گاڵتە گوتی:

ــ بیستوومە لیژنەی داوەران تاوانبارانیان فێحل کردووە و بێ تاوانەکانیشیان حوکم داوە. ئەوەش کاری هەمیشەی ئەوانە؛ زۆری گوێ مەدن!

نۆخلیدۆف وەلامی پلارەکەی کولۆسۆڤی نەدایەوە. پرەنسس میسی بزەیەکی هاتێ و زۆر خۆمانە گوتێ.

ـ میوانە بەڕێزەکەمان تازە تەشریفی هێناوە؛ باس و ڕەخنە هەڵگرن بۆ دوایی.

کولۆسۆف دەستی هەڵنەدەگرت؛ دەیگوت ڕۆژنامەیەک لە نوێترین ژومارەی خۆیدا بە توندی هێرشی کردۆتە سەر لیژنەی داوەران. میخاییل سێرگی یۆڤیچیش کوڕەمامی پرەنسس میسی باسی وتاریکی دیکەی لێکۆڵەری بەشی مافی ئەو ڕۆژنامەیەی کرد. میسی بەپێی خدەی هەمیشەیی جلوبەرگی جوان و گرانبایی لەبەرکردبوو و خۆی لەگوڵ دابوو. زۆر لەسەرەخۆ و بە میهرەبانییەوە بە نۆخلیدۆڤی گوت:

ـ ماندووبووی، ڕەنگە زۆریشت برسی بێ!

ـ زۆرم برسی نییە. ئەرێ ئەمڕۆ چووی بۆ پێشانگای شێوەکاری؟

ـ پێشانگام خستە کاتێکی دیکە. چووم بۆماڵی سالاماتۆڤ، یاریی گۆلفمان کرد. ئاغای کرۆکس زۆر باشی یاری دەکرد.

نۆخلیدۆڤ هەر کاتێک دەهات بۆ ئەو ماڵە، شاد و دڵ حەساوە بوو. زۆری حەز بەشکۆ و ڕازاوەیی ماڵەکە و هەڵسوکەوتی خۆمانەی پرەنسس میسی و بنەماڵەکەی دەکرد. بەلام ئەمجارەیان هەموو شتێک لەبەر چاوی نامۆی دەنواند. دەرگاوان، قاڵدرمەی فەرشکراو، ئینجانەی پڕلە گوڵ، پێشخزمەتەکان، میوانەکان، مێزی پڕ لە خواردنی جۆراوجۆر و تەنانەت پرەنسس میسی خۆشی، لە بەر چاوی غەوارە و نامۆ بوون. لە هەموو کەس

و هەموو شتێک بێزار بوو. قسەی هیچوپووچ و لیبراڵ ئاسایی کولۆسۆڤ، قەڵافەتی گەوجانە و تۆڵازی پرەنس کوورچاگینی بەساڵاچوو، داخیان خستبووە سەر دڵی. زۆری ڕق لە ناز و هەڵسوکەوتە ناسروشتییەکانی خاتوو ڕادێری لەلەی منداڵەکان هەستابوو. پێشتر هەرکاتێک چاوی لە میسی دەکرد، بەرەو دنیای خەون و خەیاڵ دەفڕی و ئەوی لە سەر لووتکەی جوانی دەدی، بەڵام ئەمڕۆ لە لووتکەی خەیاڵ هاتبووە خوارێ. میسی لەبەر چاوی جوان نەبوو. بەرچاوی چرچولۆچی تێکەوتبوو. دەیزانی چینی بسک و هەڵگەڕانەوەی مژۆڵی دەستکردە. تەنانەت چاوی لە نینۆخی قامکە گەورەی دەستیشی دەکرد و دەیدی چەندە پان و ناحەزە و لە نینۆخە نابارەکانی باوکی دەچێ!

پرەنسس میسی باسی یاریی تێنیسی دەکرد و کولۆسۆڤ باسی هێندێک لە یارییەکانی سەردەمی منداڵی دەکرد کە زۆر شێوەی تێنیس دەدەن. بەڵام میسی لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە تێنیس شتێکی دیکەیە و یاریەکی «یەکجار» خۆشە!

میسی لە نۆخلیدۆڤ فێر بووبوو، بە جێی «زۆر زۆر»، بڵێ «یەکجار». تێنیسی سەر چیمەن[17]، کە هێشتا شتێکی نۆێ بوو، دەمەتەقێی لە سەر ساز بوو. میخاییل سێرگی یۆڤیچ و کاترین ئەلکسیۆڤنا هاتنە نێو باسەکەوە بەڵام ئەوانی دیکە بێدەنگ بوون و گوێیان بۆ ئەم باسە جاڕزکەرە شل نەکرد. کوورچاگینی بە ساڵا چوو بە هەموو شتێک پێدەکەنی.

ـ هەر چەلەحانێ، هەر دژایەتی!

هەروا کە پێدەکەنی لە جێی خۆی هەستا. هەستان و لە دەوری مێزەکە کۆبوونەوە کە دەفری پڕ لە ئاوی بۆنخۆشی لە سەر ڕێز کرابوو. دەست و

17. Lawn Tennis تێنیس لە سەر شێوازی کۆن.

دەمیـان شـۆرد و دەمەتەقـێ دەسـتی پێکـردەوە. میسـی نۆخلیـدۆڤی لە قسـە گرتبوو.

ـ هێچ شتێک نییە وەک قومار کەسایەیتی ڕاستەقینەی مرۆڤ وەدەربخات.

نۆخلیدۆڤ هەستی دەکرد میسی بە بێ هیچ مەبەستێک باسی قومار دەکا و ڕەنگە بیهەوێ بە شێوەی ناڕاستەوخۆش ڕەخنەی لێبگرێ.

ـ ڕەنگە قسەی تۆش بێ؛ من تا ئێستا بیرم لەو بابەتە نەکردتەوە.

ـ حەز دەکەی سەرێک لە دایکم بدەین؟

ـ جـا دیـارە حەز دەکەم، بەڵام بەو شـەرتەی سـەر و دڵـی نەگـرین. لەوە دەچوو حەز نەکات بچێ بۆ سەردانی دایکی میسی کە نەخـۆش بـوو و کەمتـر لە ژووری خەوەکەی دهـــاتە دەرێ. جـــگەرەکەی لە گیرفـــانی دەرهێنـــا و دایگیرسـاند. خـۆی دەگنخانـد بەڵکـوو میسـی لە بیـری بچـتەوە و نەیبـات بـۆ ژووری خەوەکە دایکی.

ـ بابچینە سەرێ بۆلای دایکم! بە دیتنمان دڵخۆش دەبێ.

ناچار بوو لەگەڵی بچێ. لەڕووی ئەدەبەوە گوتی: «زۆر بە تـامەزرۆییەوە دەخوازم بچم بۆ سەردانی پرەنسس.»

پرەنسس سووفی ڤاسیلۆڤنا زۆربەی کـات لە پێخەفەکەی نەدەهـاتە دەرێ. حەوت ساڵ بوو لە ژووری خەوەکەی پێشوازیی لە میوانەکانی دەکرد کە پڕ بـوو لە مەخـمەر و عـاج و هەورێشـم و عەتـر و گـوڵ و پەیـکەرەی مەفرەقـی. نۆخلیـدۆڤ کە لە دۆسـتانی نزیکـی بنەمـاڵەی کوورچـاگین بـوو و گریمـانەی ئەوە دەکرا لەگەڵ میسی ژیانی هاوبەش پێک بێنێ، بەڕێزەوە لە لایەن خـاتوو سووفی فاسیلۆڤناوە وەردەگیرا .

ژووری خەوەکەی کۆنتس دەرگای بـۆ سـەر دوو تەلاری گەورە و چکۆڵە هەبوو. میسی لە پێش نۆخلیدۆڤەوە خۆی کرد بە ژوورێدا. میسی هێندێ جار

گتێکی دەگرت و چاوی لە کۆنتی خۆشەویستی خۆی دەکرد. ماوەیەک بوو دەیویست دڵی لێ بستێنێ و شووی پێبکا، بۆیە بە هەموو شێوەیەک نازی بۆ دەکرد و دەیویست خۆی لە بەر چاوی شیرین بکات. ئەو لەو کچانە بوو کە دەیویست پیاو بخاتە داوی خۆیەوە و ئامادە نەبوو خۆی بکەوێتە داوی هیچ پیاوێکەوە. شیلەبزەکەی سەر لێوی کاڵ بۆوەوە و گووتی:

ـ وێدەچێ ئەمڕۆ ڕووداوێکی خراپ قەومابێ؛ زۆر پەرۆش و خەمبار دیاری!

نۆخلیدۆڤ نەیدەوست ڕووداوەکەی دادگای بۆ بگرێتەوە.

ـ وایە، باش تێگەیشتووی.

ـ کەوایە بۆم باس بکە، بزانم چی ڕوویداوە.

ـ جارێ باسی هیچ نەکەم باشترە، نامەوێ بیر لەو بابەتە بکەمەوە.

ـ یانی حەز ناکەی ڕاستییەکەی بڵێی؟ تەنانەت بە من؟

ـ نا، ناتوانم.

هەستی دەکرد ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە چەندە بەلایەوە گرینگ بوون. دەترسا باسی ڕووداوەکە بکات و گریان ئەوکی بگرێ و فرمێسک لە چاوی بزێ. دەیزانی ئەگەر لە هەمبەر میسیدا خۆی لاواز بنوێنێ و چاوە فرمێسکاوییەکانی ببنێ، دەکەوێتە داوی و دەرباز بوونی مەحاڵە. ئیتر درێژەی بە قسەکانی نەدا و بێدەنگ بوو.

# بیست و حەوت

کۆنتس سووفی، دایکی میسی خواردنە بەتام و چێژەکەی تەواو کردبوو. ئەو هەمیشە بە تەنیایی نانی دەخوارد. دەیزانی نان خواردن دیمەنێکی زۆر جوان و شاعیرانەی نییە! دوای نان خواردن لە سەر کورسییەکی نەرم دانیشتبوو و جگەرەیەکی بەرگی بۆنخۆشی داگیرساندبوو. پەرداخی قاوە لە سەر مێزەکە بوو. باڵابەرز و قەدبارێک، بە قژی خورمایی و ددانی درێژ و چاوی ڕەش و گەورەوە. ئەگەرچی بەساڵاچوو بوو بەڵام وەکوو کچانی جحێڵ هەڵسوکەوتی دەکرد. کەینوبەینی لەگەڵ پزیشکی بنەماڵە بووبووە بنێشتەخۆشکەی سەر زاران، بەڵام نۆخلیدۆڤ باوەڕی نەدەکرد. لە ژووری خەوەکە پزیشک لە پاڵ خاتوو سووفی دانیشتبوو. ڕیشە دووفلیقانەکەی بەڕۆنێکی بۆنخۆش چەور کردبوو. کولۆسۆڤیش لە سووچێک دانیشتبوو خەریک بوو پەرداخی قاوەکەی دەشێواند. پەرداخی لیکۆریش لەبەر دەستیدا بوو. میسی، نۆخلیدۆڤی گەیاندە ژووری خەوەکەی دایکی و خۆی گەڕایەوە.

ـ کاتێک دایکم وەڕەز بوو و دەری کردی، وەرە بۆ لای من. لە خوارێ چاوەڕێتم.

زەردەیەکی گرت و ڕۆیشت. خاتوو سووفی بەڕێز و ئەدەبێکی ساختە و بزەیەکی زیرەکانەوە پێشوازیی لە نۆخلیدۆڤ کرد.

ـ بەخێر بێی دۆستی بەڕێز! دانیشە و بۆم بگێڕەوە بزانم ئەمڕۆ لە دادگا چی ڕووی دا. دەیانگوت زۆر ناڕەحەت بووی. ئەم کارانە بۆ مرۆڤێکی دڵناسکی وەک ئێوە باش نییە.

هێندی لە ڕستە و وشەکانی بە زمانی فەڕەنسی دەگوت. نۆخلیدۆڤ لە وەڵامی قسەکەی ئەودا گوتی: «پیاو هێندێ جار هەست دەکا، مافی داوەری کردنی نییە.»

ـ comme c'est vrai.[١٨]

پرەنسس سووفی دەیزانی چۆن بە دڵی بەرانبەرەکەی قسە بکات و دڵی بەدەست بهێنێ. لە باسی دادگا و داوەرییەوە قسەکەی گۆڕی و چووە سەرباسی شێوەکاری و هونەر.

ـ بڕیا حاڵم باش بووایە. بمتوانیبایە بێم بۆ کارگەی شێوەکارییەکەتان و سەیری تابلۆ نوێیەکانتان بکەم.

ـ شێوەکاریم بە تەواوی وەلاناوە؛ ئیتر دەستم بۆ قەڵەم و پەڕەمووچە ناچی، تاقەتم نەماوە.

پرەنسس سووفی هەروا کە ئەدای کچانەی دەردێنا، لە تاریف و پێداهەڵگوتنەکانیشیدا ڕووڕاست نەبوو.

ـ زۆر بەداخەوەم وازت لە شێوەکاری هێناوە. ڕێپین[١٩] کە گومان لە هونەرناسییەکەیدا نییە، بە خۆمی گوت کۆنت نۆخلیدۆڤ گەنجێکی بەهرەمەندە و ڕۆژێک دەبێتە مایەی شانازیی هونەری وڵاتەکەمان!

---

18ـ بەڕاستی وایە.

19ـ Repine شێوەکاری ڕووسی«1844ـ1930» کە بەرهەمەکانی لە بواری مێژوویی و کۆمەڵایەتیدا بەناوبانگن.

نۆخلیدۆڤ هەستی بەشەرمەزاری دەکرد کە سووفی بەرەوڕووی خۆی درۆیەکی ئاوا گەورە دەکا. سووفیش بۆی دەرکەوتبوو کە میوانە خۆشەویستەکەی هێندە پەرۆش و خەمبارە بە هیچ زمانێک ناکرێ شادی بکەی. ناچار ڕووی لە کولۆسۆڤ کرد و سەبارەت بەو شانۆیە پرسیاری لێکرد کە تازە هێنابوویانە سەر پەردە. کولۆسۆڤ وەک ئەوەی خۆی بە ڕەخنەگرێکی ناودار بزانێ، هەڵیکوتایە سەر شانۆکە و پەڕوپۆی پێوە نەهێشت. سووفی یەک دووجار پەڕییە نێو قسەکانی و لایەنگریی لەو شانۆیە کرد بەڵام کاتێک تێگەیشت کولۆسۆڤ زۆر سوورە لە سەر ڕەخنەکەی، شلەی دایە و هاتە سەر قسەکەی ئەو و پێکەوە دژ بە شانۆکە بوونە هاو دەنگ و هاودەست.

نۆخلیدۆڤ گوێی بۆ باسەکە شل کردبوو بەڵام زۆری بەلاوە بنەوەشی نەبوو و بە سەرگەرمی و ڕابواردنی دوای نان خواردنی دادەنا!

دەشیزانی کە هیچکامیان لە سەر قسەکانی خۆیان سوور نین و تەنیا دەیانەوێ دوای تێر کردنی زگیان، زار و زمانیان بخەنە گەڕ و وەرزشی پێبکەن! بەتایبەت کولۆسۆڤ ڤۆدکا و شەڕاب و لیکۆری تێکەڵی خواردبۆوە و سەرخۆش بووبوو. سەرخۆشییەکەشی وەک سەرخۆشی وەزیران نەدەچوو کە درەنگ مەشرووب دەخۆنەوە و گوڕە و هەرا ساز دەکەن؛ ئەو خووی بە خواردنەوە گرتبوو. ئەو هاتوهاواری نەدەکرد بەڵام هەستەدەماریشی ئارام نەبوو و بۆ هێور کردنەوەی خۆی کردبوویە سەری و نەیدەماڵییەوە. نۆخلیدۆڤ چاوی بە تیشکی هەتاو کەوت کە دوایین تیشکی کەشوتووشی خۆی لە پەنجەرەکەوە خستبووە سەر ڕوخساری سووفی و چرچولۆکانی زیاتر وەدیار خستبوو. سووفی کە هەستی کردبوو خەریکە پەتەی بکەوێتە سەر ئاو، پەتی زەنگەکەی کێشا. پزیشک کە لەماڵێدا زۆر

خۆمانە هەڵسوکەوتی دەکرد، هەستا و بێ ئەوەی قسە بکات ڕۆیشتە دەرێ، پرەنسس سووفیش سەرنجی بەدوایدا بەڕێ کرد.

ـ فیلیپ! ئەو پەردەیە دادەوە.

پێشخزمەتی لاو و جوانچاک، جلوبەرگی جوان و ڕێکوپێکی لەبەر کردبوو. پرەنسس سووفی چاوی لە سەر هەڵنەدەگرت و درێژەی بە باسە هونەرییەکەی دەدا.

ـ ئەو شانۆیە پڕ بوو لە بیرۆکەی سۆفیانە. بە بڕوای من شیعر ڕۆحی عیرفانی ئاوێتە نەبێ شیعر نییە، بەڵام پەخشان دەبێ لە عیرفان...

قسەکەی بڕی و بیری ڕۆیشت بۆ لای فیلیپ.

ـ گوتم پەردەی ئەو پەنجەرە گەورەیە دادەوە، نەک ئەوەیان.

دەتگوت بۆ دەربڕینی ئەو چەند وشەیە کە بە ئاخافتی ڕەشۆکییانەی دەزانی، ڕەنجی دنیای تامڵ کردووە. بۆ دەرباز بوون لەو ڕەنجە، چەند مژی لە پەستای لە جگەرەکەی دا! فیلیپ پێشخزمەتی جوانچاک و سینگ پان، کڕنۆشێکی کرد بۆ ئەوەی داوای لێبوردن بکات بۆ خراپ تێگەیشتنەکەی و بە هەنگاوی گورج و خێرا ڕۆیشت بۆ ئەوسەری ژوورەکە و پەردەکەی داوایەوە. پرنسس سووفی هەروا دەیبۆڵاند و پێشخزمەتەکەی لۆمە دەکرد کە خراپ تێگەیشتووە. فیلیپیش لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «پیرێژنی پەیتارە! ئەگەر ناچار نەبووایەم، ئامادە نەبووم تەنانەت تفیش لەو ڕووخسارە دزێو و کرێتەت بکەم.» بە ئەدەب و خاکەڕاییەوە، تەپڵەک و پەرداخەکانی هەڵگرت و سەرمێزەکەی ڕیکوپێک کرد. کۆلۆسۆڤ بێ ئەوەی گوێ بداتە بوونی پێشخزمەتەکە باسێکی دیکەی دامەزراند.

ـ گریمانەکانی دارڤین لەم ڕۆژانەدا بۆتە بنێشتەخۆشکە. بە بڕوای من ئەو گریمانەیە پڕاوپڕە لە ڕاستی.

سووفی ڕووی لە نۆخلیدۆڤ کرد و بیروڕای ئەوی سەبارەت بەگریمانەی ژێنێتیک پرسی.

ـ من ئەو گریمانەیەم قەبووڵ نییە.

نۆخلیدۆڤ چاوی لە فیلیپ بڕیبوو کە هەروا خەریکی ڕێکوپێک کردنی ژووری خەوەکە بوو. لە زەینی خۆیدا ئەوی لەگەڵ کولۆسۆڤ و پرەنس سوفی هەڵدەسەنگاند. کولۆسۆڤی بە زگی زل و سەری ساف و باسکی باریکەوە لەگەڵ سووفی بە دەموچاوی چرچولۆچ و ئەندامی ڕەقەڵە و داڵگۆشتەوە لە لایەک و فیلیپی گەنج و چالاک و توندوتۆڵی لە لایەکی تر دادەنا و لە زەنیی خۆیدا هەڵیدەسەنگاندن.

سووفی کە تێگەیشتبوو حاڵی نۆخلیدۆڤ پەرێشانە و کەوتۆتە تەنگژەیەکی دەروونییەوە، بە هانایەوە چوو:

ـ میسی چاوەڕوانی ئێوەیە؛ بڕۆ بۆ لای. پارچە مووسیقایەکی نوێ لە بەرهەمەکانی ڕۆبێرت شوومان[٢٠] فێربووە، بە پیانۆ بۆتانی دەژنێ، بەڵکوو لە چنگی ئەو خەم و پەرۆشییە دەرباز بن.

نۆخلیدۆڤ دەیزانی سووفی بە پێی خووخدەی هەمیشەی خۆی درۆ دەکات و دەیهەوێ خۆی بنوێنێ. هەستایە سەرپێ. دەستی ڕەقەڵە و پڕ لە ئەنگوستیلەی پرەنسسی گوشی و لە ژووری خەوەکە چووە دەرێ. کە بە قاڵدرمەکاندا داگەڕا، چاوی بە کاترین ئەلکسیۆڤنا کەوت. کاترین سەری قسەی لەگەڵ دامەزراند. فەڕەنسی و ڕووسیی پێکەوە تێکەڵ دەکرد:

ـ وێدەچێ ئەندام بوون لە لێژنەی داوەریدا لەگەڵ هەستی ئێوە سازگار نەبووبێ؛ خەم و پەرۆشی لە چاواندا دیارە.

---

20 ـ Robert schumann ئاوازدانەری بەناوبانگی ئاڵمانی (1856ـ 1810).

ـ چاکی بۆچووی؛ بەڵام ئەمشەو لە دۆخێکدام کە زیاتر لە هەموو شتێک حەز بە بێدەنگی و ئارامی دەکەم.

ـ بەپێچەوانە، ئەگەر ئەوەی لە دڵتدایە هەڵیرێژی، هێور دەبییەوە.

ـ تکایە لێم گەڕێ با هیچ نەڵێم.

ـ هەمیشە دەتانگوت ڕاستییە تاڵەکان قەبووڵ بکەین. کەوایە قسە و داواکەی خۆت لە عەرزی مەدە و ئەو خەم و پەرۆشییە لە کۆڵ خۆت بکەوە.

پرەنسس میسیش هات بۆ لایان. نۆخلیدۆڤ بۆ بەرگری کردن لە خۆی هیچ قسەیەکی قایمی پێ شک نەدەهات.

ـ هەمیشە دەمگوت، دەبێ تاڵترین ڕاستییەکان بدرکێنین؛ بەڵام ئەمجارەیان بارودۆخێک هاتۆتە پێشێ گێژوویژی کردووم.

ئەم خەم و پەرێشانییەش حەز ناکەم لەگەڵ هیچ کەس بەش بکەم.

ـ خۆتان ئازار مەدەن؛ خەتای ئێمەیە زۆر پێداگری دەکەین.

هەموویان لە خۆڕا قسەیان دەکرد و تەنیا دەیانەوست بێدەنگ نەبن. نۆخلیدۆڤ وەک ئەسپێکی تۆڕ دەچوو کە ڕێگای نەدەدا هیچ کەس زینی بکات. میسی دەستی گرت و توند لە نێو دەستە نەرم و شلەکانیدا گوشیی.

ـ سبەینێ حەتمەن وەرە بۆ لامان. هەر چییەک پێوەندیی بە ئێوەوە هەبێ بۆ ئێمە گرینگە و حەز ناکەین خەم بخۆی.

ئیتر هیچ قسەیەکی بۆ گوتن پێ نەبوو. سوورهەڵگەڕا. نەیدەزانی بەو خۆشەویستی دەربڕینەی میسی سوور هەڵگەڕاوە یان هەڵسوکەوتی خۆی نارەحەتی کردووە،ماڵئاوایی کرد و چووە دەرێ.

کاترین ئەلکسیۆڤنا دوای ڕۆیشتنی ئەویش دەستهەڵگیر نەبوو. حەزی دەکرد لەو ڕازە سەردەرهێنێ.

ــ دەبــێ بــزانین چــی ڕووی داوە، ڕەنــگە پێوەنــدی بە ڕووداوێکــی هەستیارییەوە بێ کە ئاوا خەم دایگرتووە.

میسـی دەیویسـت بڵـێ: «ڕەنـگە پێوەنـدیی بە ڕووداوێکـی ئەویندارانەوە هەبێ»، بەڵام قسەکەی خۆی خواردەوە. دڵی گیرابوو. ئیتر ئەو کچە شـاد و لیـو بە بـزەیەی چەنـد خـولەک لەمەوبەر نەبـوو. سـەری داخسـت بـۆ ئەوەی کـاترین هەسـت بە شـێواوییەکەی نەکـات. لە سـەرەخۆ گـوتی: «گرینـگ نیـیە. مـرۆڤ ڕۆژێـک شـادە و ڕۆژێـک خەمبـار!» خەمـی ئەوەی بـوو نەکـا عاشـق بووبێ و دوای ئەو هەموو کەینوبەین و ناسیاوییە وازی لێ بێنێ!»

هیچ شتێکی بۆ ڕوون نەبوو. ئاکاری نۆخلیدۆڤیش سـەیر بـوو. ئەگەرچـی تا ئێستا هیچ بەڵێن و پەیمانێک لە نێوانیاندا نەبـوو، بە نیگـا و بـزە و ئامـاژە زۆر شتیان بە یەکتر گوتبوو. ئەو نۆخلیدۆڤی بە هی خۆی دەزانـی و تەنـانەت بە بیریشیدا نەدەهات کە ڕۆژێک لە دەستی دەدا.

## بیست و هەشت

هەتـا مـاڵێ مەودایەکـی زۆر نەبـوو. بە پێیـان بە ڕەوگەی هەمشـەییدا ملـی ڕێی گرتبوو و مێشکی لە بیر و خەیـاڵ جمەی دەهـات. جنێوی بەخـۆی دەدا. «تـۆ دانـاڕزێی! شــەرم نـاکەی، بـوونەوەری هیچوپـووچ و قیـزەون؟!» ئەو دوایـین وشـانەی بە میسـیی گوتبـوو، وەبیریـی دەهـاتنەوە و خـۆی سـەرکۆنە دەکرد. بۆ خۆی لێ نامۆ کردبوو؟ ڕاستە هـیچ پەیمـان و بەڵێنێک لە نێوانیاندا نەبوو، نە وادەیەکیان دانابوو، نە ڕاشکاوانە باسی ژیانی هاوبەشـیان کردبـوو، بەڵام هەڵسوکەوتیان وەک جۆرێک وادە و بەڵێن دەچوو.

نەک هەر ڕەفتاری لەگەڵ میسی، بەڵکوو تەواوی ژیانی خۆی لێوڕێژ لە شەرمەزاری و نەفرەتباری دەدی. کاتێک گەیشتەوە ماڵێ، کۆرنئی، پێشخزمەتەکەی بەهەڵەداوان هات بەرەوپیری و کڕنۆشی بۆ برد.

- هیچم پێویست نییە؛ بڕۆ بخەوە!
- بەچاوان گەورەم.

چایی ئامادە بوو. کۆرنئی ژوورەکەی ڕێکوپێک دەکرد. نۆخلیدۆڤ حەزی دەکرد پێشخزمەتەکەی زووتر بڕوات و بەجێی بێڵێ. کاتێک ئەو ڕۆیشت، ترپەی پێی ئاگراڤنا لە دالانەکەوە هات. حەزی نەدەکرد چاوی بە هیچ کەس بکەوێ. دەگاکەی لە ژوورەوە داخست.

سێ مانگ لەمەوبەر دایکی لەو ژوورەدا مردبوو، ئێستا تەنیا چرایەکی چکۆڵە شۆقەکەی لە وێنەی دایکی و باوکی دەدا. دوایین ڕۆژانی ژیانی دایکی وەبیر هاتەوە و خۆی لۆمە کرد کە چ هەڵسوکەوتێکی ناحەز و شەرماوەری هەبووە. ئەگەرچی لە ژوور سەری دایکی دادەنیشت و دڵخۆشیی دەدایەوە، بەڵام لە دڵەوە ئاواتی دەخواست هەرچی زووترە دایکی بمرێ و ئەوەندە ئازار نەکێشێ؛ ڕاستییەکەشی ئەوە بوو کە نەیدەویست بە دیتنی ژان و برکی دایکی ئازار بکێشێ.

چاوی لە وێنەکەی دایکی بڕی تاکوو ئەو ڕۆژانەی جوانتر وەبیر بێتەوە. ئەو وێنەیە شێوەکارێکی بەناوبانگ کێشابوویەوە و پێنج هەزار ڕۆبڵی لێ وەرگرتبوون. دایکی کراسێکی مەخمەری ڕەشی لەبەردا بوو. شێوەکار بەرۆکی هێندە ئاوەڵا کێشابۆوە کە مەمکی قوت و شان و ملە ڕووتەکەی بەدیارەوە بوو. چەندە ناحەز و شەرماوی! سێ مانگ لەمەوبەر هەر ئەو ژنەی کە شێوەکار وێنە نیوەڕووتەکەی ئەوی کێشا بۆوە،نەخۆش و کەلەلا لە جێدا کەوتبوو. وەها پێچوو بوو تەنیا پێست و یەسقانەکەی مابوو؛ بۆگەنێکی

پیسی لێدەهات و هەموو ماڵەکەی تەنیبۆوە. دەتگوت ئێستاش ئەو بۆگەنە جارِزکەرە ماوە و هەوای ژوورەکەی قورس کردووە. هێستا هەستی بەو بۆگەنە دەکرد. دایکی لە کاتی گیانکەنشتدا بە دەستە وشک و رەقەڵەکانی دەستە سپی و پڕ ماسوولکەکانی ئەوی گرتبوو و لێی پاڕابۆوە:

ـ کوڕە خۆشەویستەکەم! کەسەکەم! من مرۆڤێکی باش نەبووم، گەردنم ئازادکە!

هەموو شتێک لەبەر چاوی ناحەز و پڕ شوورەیی دەنواند. دیسان چاوی لە وێنەکەی دایکی کردەوە. شانە سپیوسۆڵ و جوانەکەی! بزەی شیرینی سەر لێوی! بەرۆکە ڕووتەکەی ئەو وێنەیەی، پرەنسس میسیی وەبیرهێنایەوە کە شەوێک ئەوی بردبوو بۆ ژوورەکەی خۆی و کراسە تازەکەی پێیشان دابوو. کاتێک کراسەکەی لەبەرکردبوو، سینگ و شان و ملی ڕووت و هەوەس بزوێنی میسی دڵی داخورپاندبوو. میسی بەو سینگە سپیوسۆڵەوە لەگەڵ باوکی ماریز و دڵڕەق و دایکە خراپکارە لە خۆڕازییەکەی، لە زەینیدا پێکەوە کۆبوونەوە. چەند دزێو و پڕ شوورەیی بوون!

بە خەیاڵیدا هات: «دەبێ واز لەو دۆستایەتی و دڵدارییە بێنم و لێیان دوور بکەومەوە. دەبێ پێوەندیم لەگەڵ بنەماڵەی کوورچاگین بپسێنم. دەبێ ماریای هاوسەری مارشاڵی ئیفتیخاری و ئەشقە هەوساوییەکەی ئەویش لە بیری خۆم بەرمەوە. دەست لەو هەموو ملک و میراتە هەڵگرم کە پێم بڕاوە و وەک مرۆڤێکی ئازاد و سەربەست بژیم. بچم بۆ ڕۆم، ئیستانبوڵ یان شوێنێکی دوورەدەست و خۆم بە وێنەکێشانەوە و هونەرەوە سەرقاڵ بکەم. ئازاد و ئاسوودە بۆخۆم بژیم. ئەگەرچی دەشزانم وێنەگەرێکی باش نیم، بەڵام هەر ئەوەم چاکترە. ئەوەی بە لامەوە گرینگە شێوەکاری نییە، بەڵکوو هەستی ئازادییە. دەرباز بوونە لەم ژیانە پڕ شوورەیی و ناحەزە. بەڵام هەتا

بارودۆخی ژیانی ماسلۆڤا ڕوون نەبێتەوە، نابێ بیر لە هیچ شتێکی دیکە بکەمەوە. ڕەنگە فانارینی پارێزەری دادگا بتوانێ کارەکەم بۆ یەکلایی بکاتەوە.»

بۆ ساتێک هەموو وێنە و خەیاڵەکان لە بەر چاوی بزر بوون و ڕوخساری بەندییەکی جوان و چاوڕەش جێگای هەموویانی گرتەوە. وەبیری هاتەوە کاتێک ئەو ژنە حوکمەکەی دادگای بۆ خوێندرایەوە چۆن دای لە قوڵپەی گریان. قوونچکی جگەرەکەی فڕێدا نێو تەپڵەکەکە و جگەرەیەکی دیکەی داگیرساند. ئەو شەوەی وەبیر هاتەوە کە لەگەڵ کاتیۆشا ڕایبواردبوو، چەندە تامەزرۆیانە دەستی لەگەڵ تێکەڵ کردبوو. دوای ئەوەی ئیلاقەی کردبوو، چەندە لە خۆبایی بووبوو. وەبیری هاتەوە کە لە ڕێوڕەسمی جێژنی پاکدا پێکەوە بەشدارییان کردبوو. کاتیۆشا جلوبەرگی سپیی لەبەر کردبوو کە پەراوێزەکانی بە دەزووی شین گوڵدۆزی کرابوو. «چەندەم پێ جوان بوو؛ ئەشقەکەم چەندە پاک بوو؛ ئەشقێک کە هەتا ئەو کاتە دەرهەق بە هیچ کەس لە دڵمدا نەبووە.» دیسان بیری کردەوە. ئەو کاتەی وەبیرهاتەوە کە بۆ نووسینی تێزی زانکۆ چوو بوو بۆ لای پوورەکانی و لە ژێر دار یاسە بنەوشەکە کاتیۆشای ماچ کردبوو. ئەو سۆز و ئەشقە شیرینەش چ زوو تێپەڕیبوو!

ئێتر ئەو گەنجە بەهەست و دڵپاکەی ئەو سەردەمە نەمابوو؛ بووبوو، شتێکی دیکە. جیاوازیی نێوان کاتیۆشای پاک و شەرمن کە ئەو شەوە هاتبوو بۆ کلیسا، لەگەڵ نەرموڵ خانی لەشفرۆش کە ئەمڕۆ لە سەر کورسیی تۆمەتباران دانیشتبوو عەرز هەتا ئاسمان بوو.

خۆشی لەو ڕۆژانەدا پیاوێکی بەشەرەف و جوامێر بوو. داهاتوویەکی ڕووناک و بێ بڕانەوەی لە بەردەمدا بوو، بەڵام ئەو هەموو ئاوات و هیوایەی

لە دڵیدا دەڕسکان و گەشەیان دەکرد، ئێستا ئاسەواریان نەمابوو. کەوتبووە داوی ژیانێکی بێهوودە و بێ مانا و هیچ ئامانجێکی نەبوو، دەرباز بوونیش لەو داو و تەنگژەیە مەحاڵ بوو. لەو سەردەمەدا شانازیی بەخۆیەوە دەکرد کە پیاوێکی بە شەرەف و جوامێرە. درۆ لە زاتیدا نەبوو. لە ڕێگای ڕاستدا هەنگاوی هەڵدەگرت. ئێستاش کەوتبووە نێو زەلکاوی درۆ و ناپیاوییەوە. دەوروبەرییەکانیشی بەو درۆیانەوە ئەویان دەویست و ڕێزیان بۆ دادەنا. خووی بەفێڵ و درۆ گرتبوو؛ درۆی لەگەڵ خۆی خەڵکی دەکرد.

بیرۆکە و خەیاڵ لە هەموو لایەکەوە هێرشیان بۆ مێشکی دەهێنا؛ «مەگین دەکرێ دەست لە ماریا هەڵگرم؟ مەگین دەکرێ بۆ هەمیشە واز لە ماریا بهێنم؟ دەکرێ چاوپۆشی لەو هەموو مڵک و سامانە بکەم و بە دەنگێکی بەرزیش بڵێم مڵکدارییەک کە بە میرات بە پیاو گەیشتبێ لەگەڵ ویژدان و عەدالەت سازگار نییە؟ مەگین ئەو ستەمەی لە کاتیۆوشا کراوە قەرەبوو دەکرێتەوە؟ نا! ناکرێ! بەڵام نابێ هەروا دەست لە سەر دەست دانیم و بڵێم هیچکارێکم لە دەست نایە؛ دەبێ یارمەتیی کاتیۆوشا بدەم. دەبێ بە هاوکاریی فانارین، کە پارێزەرێکی بە توانا و لێهاتووە، لە بەندیخانە ڕزگاری بکەم. دەبێ سامان و پێداویستی ژیانی بۆ دابین بکەم بۆ ئەوەی بە ئاسوودەیی بژی. ئەوەش باشترین کارێکە دەبێ بیکەم!»

وەبیری هاتەوە کە چۆن گەڵا سەد ڕۆبڵییەکەی خستە نێو چینی کراسەکەی کاتیۆشاوە. «چەندە خوێڕی و سووک و چرووک بووم. تەنیا مرۆڤێکی چەپەڵ و بێ ویژدان کاری ئاوا دەکا.

من مرۆڤێکی خوێری و سووکوچرووکم!» قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد. خۆی لە سەر کورسیی تۆمەت دانابوو: «ئەرێ! تۆ خوێری و بێ شەرەفی! چەندەت نامەردی لەگەڵ ماریا و مێردەکەی کرد؟ حەز لە ژنەکەی مارشاڵی

ئیفتیخـاری دەکەی و بەڕواڵەت یـارمەتیی مێـردەکەی دەدەی لە هەڵبژاردنـدا سـەرکەوێ. لە لایەکەوە دەم لە ئـازادی و عەداڵەت دەکـوتی و لە لایەکـی دیکەوە بەهۆی ئەو هەموو ملّک و ماش و سامانە میراتییەتەوە شەو و ڕۆژ خەریکی عەیش و نۆش و ڕابواردنی. بوویەتە پیاوێکی بەرەڵـلا و تۆلاز و هەرزە. بوویەتە خاوەنی ئەو هەموو ملّک و سامانە و دڵیشت بەوە خۆشە کە لە ڕێی یاساییەوە پێت گەیشتووە! کەوایە ئەو بیروباوەڕەی سەردەمی گەنجیت کوا؟ تۆ بوونەوەرێکی خوێڕی و درۆزنی! خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنی. درۆت لەگەڵ هەمووان کردووە. بەڵام ئێستا وەرە و لەگەڵ خۆت ڕووڕاست بە! ناتوانی فێڵ لە خۆشت بکەی!»

یەکەم جار نەبوو کە خۆی دەدایە بەر لافاوی تانە و تەشەر، خۆی سەرکۆنە دەکرد و لە خۆی بێزار بوو؟ بەڵام یەکەم جار نەبوو ئاوا بێ بەزییانە خۆی تاوانبار دەکرد و ددانی بەخوێڕییەتی و سووکوچرووکیی خۆیدا دەنا. چەند جار هاتبووە سەر ئەوەی ڕۆحی خۆی پاک بکاتەوە. چەند جار تووشی کێشە و قەیرانی ڕۆحی بووبوو. لەو کێشە و قەیرانە ڕۆحییانەدا، بۆ ماوەیەک لەو هەموو ناپاکی و بێ ویژدانییە دادەبڕا کە دەوریان تەنیبوو؛ تەنانەت چەند ڕۆژێک خۆی لە دنیای دەوروبەری دەدزییەوە. بەڵام ئەو حاڵەش زۆری نەدەخایاند. هێمنایەتی و ڕواڵەتی خاپینۆکی ژیان ئەوی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا و سەرلەنوێ هەموو شتێک دەکەوتەوە سەرباری ئاسایی. لە سنوورە نەگۆڕەکانی ژیانی ڕۆژانە نەدەچووە دەرێ و بە پڕتاو بەرەو ژیانێکی نوێ کە پڕاوپڕ بوو لە خۆشی و ئاسوودەیی دەچووە پێشێ! هەموو جارێکیش دوای ئەو قەیرانە کورت خایەنانە، بەرەو ئاستێکی نەویتر دادەبەزی و بە تەماح و چابرسیتر دەبوو.

ئەو قەیرانانەی وەبیر دەهاتەوە. یەکەم جار لە هاونیکدا بوو کە لەماڵی پوورەکانی وەها کەوتبووە سەر هەوای دڵ و گەشە و نەشە کە هەتا ماوەیەکی زۆر ڕۆح و مێشکی لەو چوارچێوە دەرباز نەدەبوو. دووهەمین جار، کاتێک بوو کە بۆ خۆبەخشین و گیانفیدایی لە ڕێگای نیشتماندا دەیویست بچێ بۆ بەرەگەی جەنگ؛ بەڵام زۆری نەخایاند و هاتەوە سەر دۆخەکەی پێشوو. سێیەمین جار ئەو ڕۆژانە بوو کە سەفەری کردبوو بۆ دەرەوەی وڵات و هەموو کاتەکانی خۆی بۆ وێنەگەری تەرخان کردبوو. ئەو سەفەرەش کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە سەر ڕۆحی دانەنا.

دوای ئەو ڕووداوە ئیتر بیری لە پاککردنەوەی ڕۆحی خۆی نەکردەوە. ئەو قەیران و کێشە کورت خایەنانەش هیچکات ئەوی وەک ئەمشەو تووشی خەم و شڵەژان نەکردبوو. ئەمجارەیان لەگەڵ هەموو جارەکانی تر جیاواز بوو؛ هاوارێک لە دەروونییەوە هەستا: «ئەی پیاو! مەگین چەندین جار بڕیارت نەدا خۆت پاک بکەیەوە؟ هەموو جارێکیش وەسوەسەی هەوەس و خۆشگوزەرانی بە سەرتدا زاڵ دەبێ و خۆت بەدەستەوە دەدەی؟ ئیتر ئەو خۆفریودان و گەمە و یارییە تاکەی؟ چ کەڵکێکی هەیە؟ کە دیسان دەچیەوە سەر بەزمەکە و دەستی لێ هەڵناگری؟ تەنیا تۆ نیی کە لە هەمبەر وەسوەسەکاندا خۆڕاناگری، هەمووان وەک تۆن.» لەگەڵ ئەوەشدا ئەمشەو حاڵێکی تر ڕۆح و دڵی نۆخلیدۆڤی داگرتبوو. هەستی دەکرد تەنیا لە ڕێگای جوامێری و پاکییەوە دەتوانێ دەستی بە هەقیقەت ڕابگا. هەستی دەکرد ئەگەر ئیرادە و لەخۆبردوویی هەبێ دەتوانی هەموو بەند و زنجیرەکان بپسێنێ. «ئیتر بەسە! دەبێ دان بە خراپەکارییەکانمدا بنێم. زەنجیری درۆ و ڕیا پس پس بکەم و لەمە بەدواوە ڕێگای ڕاست و پاک دەگرمەبەر! بەمیسی دەڵێم کە پیاوێکی داوێنپیسم و ناتوانم ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێک بێنم و ژیانی لێ

تیکبدەم. بە ماریا دەڵێم... نا. هیچ بە ئەو ناڵێم. بە مێردەکەی دەڵێم کە من پیاوێکی خوێڕی و هیچوپووچم و ژنەکەیم هەڵخەڵەتاندووە. ڕاست و ڕەوان هەموو شتێکی پێدەڵێم. ئەو ماڵ و سامانەی هەمە هەموو بە سەر هەژاراندا دابەش دەکەم. بە کاتیۆشا دەڵێم کە هەموو چارەڕەشییەکانی لە ئەستۆی منە و ئامادەم زەماوەندیشی لەگەڵ بکەم.»

دەستی لە سەر دڵی خۆی دانابوو. لە کاتی منداڵیدا کاتێک دۆعای دەخوێند هەر ئاوای دەکرد.

«خودایە! یارمەتیم بدە و ڕێگای ڕاستم بخە بەردەم! یارمەتیم بدە با خۆم لەو زەلکاوە گەمارە دەرکێشم و پاک ببمەوە.»

دۆعای دەخوێند. داوای یارمەتیی لە خودا دەکرد و فرمێسکی هەڵدەوەراند. خودایەک لە قووڵایی گیانیدا بوو، هێمایەتیی پێدەبەخشی. هەستی دەکرد ڕزگار بووە و هیچ کۆسپ و تەگەرەیەک لە ژیانیدا نەماوە. شادی و وزە ڕۆح و دڵی داگرتبوو.

فرمێسک لە چاویدا قەتیس مابوو. گریانی شادی بوو. گریانی ئاسوودەیی و دڵ حەسانەوە. گریانی وەئاگا هاتن. دەتگوت ئەو شتەی ساڵانێکە لە قووڵایی گیانیدا خەوتووە، ئێستا خەبەری بۆتەوە.

هەوای ژوورەکە قورس بوو. پەنجەرەی ڕوو لە باخەکەی کردەوە؛ مانگەشەوێکی خۆش بوو. لە دوورەوە تەقوکوتی تایەی فەفەیتوونێکی دەهاتە گوێ. دوای چەند چرکە تەقوکوتەکە تەواوبوو. باخەکە بێدەنگی دایگرت. سێبەری کەمڕەنگی داری بێ گەڵای سنەوبەر لە سەر چیمەنەکە بڵاو بووبۆوە. سەربانی ئەنباری ئەو پەڕی باخەکە لە ژێر تریفەی مانگەشەودا سپیواشی دەنواند.لە نێوان لک و پۆپی دارەکانەوە تەیمانی خوارووی باخەکە دیار بوو.

نۆخلیـدۆڤ لە بـاخەکە ڕامـابوو کە لە ژێـر تـریفەی زێـوینی مانگـدا دەرەوشـایەوە. سـروەی فێنـک و گیـان وەبـووژێنی شـەوبا لە سـێبەری سنەوبەرەکانەوە هەتا سەربانی سپیواشی ئەمبارەکە بەنەرمی دەخوشی.

«چەنـدە جـوانە! شـەو چەنـدە جـوانە!» ئەم وشـانە وەک شـنەی نەرم و فێنکی شەوبا ئاوێتەی گیانی دەبوو.

# بیست و نۆ

نزیک کاتژمێر شەشی دوانیوەڕۆ، ماسلۆڤا گەیشتە بەندیخانە. بە پێیـان بە سـەر ئەو سەنگفەڕەشـە ڕەق و پـر لە چـاڵوچۆڵەدا ڕۆیشـتبوو و هـاتبۆوە. برسی و تینوو بوو. بڕیاری دادگاش بەجارێ شڵەژاندبووی.

لە کـاتی پشـوودانی دادگـادا. کە لە هـۆڵەکە بردبوویـانە دەرێ، دیتبـووی کە پاسـەوانەکان بە چ ئیشـتیایەکەوە نـان و هێلکەیـان دەخـوارد. دەمی پڕ بووبوو لە ئاو. برسییەتی زۆری بۆ هێنـابوو. نەیدەویسـت خـۆی سـووک بکـات داوای نـان لە پاسەوانەکە بکات. چەند کاتژمێر تـوونییەتی و برسـییەتیی تامڵ کردبوو، هەر لەو حاڵەشدا بڕیاری دادگای بیستبوو. سەرەتا پێی وابوو خراپ حـاڵی بـووە. تەنـانەت بە خەویـش پێـی وانەبـوو زنیـدانی بەکـاری قورسـەوە بـۆ دەبـرنەوە. چـاوی لە قەڵافەتی ئارام و بێ هەسـتی قـازی و ئەنـدامانی لیژنەی داوەران بڕیبوو. تـاقەتی نەهێنابوو و دابووی لە قوڵپەی گریـان. هـاواری کردبـوو، بەڵام هەسـتی کـرد جگە لە قەبووڵکردنی بێ عەداڵەتی چارەیەکی دیکەی نییە.

قازییەکـان و ئەنـدامانی لیـژنەی داوەران زۆربەیـان گەنـج یـان تـاڕادەیەک گەڕاوە بوون؛ بە چاوێکی پڕ لە سۆز و خۆشەویستییەوە تییان دەڕوانی. هەر

ئەوەش بووبــووە هــۆی سەرســوورمانی. لەو نێــوەدا تەنیــا دادیــار لەگەڵ هەموویـان جیـاواز بـوو، لە کـاتی دانیشـتنەکەی دادگـادا بێ بەزیییـانە دەنگی هەڵــدەبڕی، لە کــاتی پشوودانیشـــدا هەر تــاوێ بە بیــانوویەک دەهــات بە تەنیشتیدا تێدەپەڕی و بە چاوێکی مانـادارەوە لێی مۆڕ دەبۆوە. بۆ دەبێ بێ تاوانێـک سـزا بدەن؟ دوای بیسـتنی حـوکمەکەی دادگـا بە دەنگی بەرز دای لە قوڵپەی گریـان. وردەوردە ئـارام بۆوە. ئیتـر فرمێسـک لە چـاوی دانەدەبـاری. حەزی دەکرد زووتر بگەنە بەندیخانە، لەوێ دانیشێ و جگەرەیەک داگیرسـێنێ. دوای ڕاگەیانـدنی بڕیـاری دادگـا، بوچکۆڤا و کـارتی نیکینیـان لەگەڵ ئەو بـردە ژوورێـک. بوچکۆڤـا ئەوی بە دەمیـدا دەهـات پێـی دەگـوت و بـۆ چـرکەیەک دەستی لە سەری هەڵنەدەگرت.

ـ قەحـبەی هیچوپـووچ! دە بخـۆ ئەوە دەردت بـێ. دیتـت چـۆن هەقەکەیـان پێدای؟ ئێسـتاش بۆ هەرکوییەک بچی کـارت هەر لەشفرۆشییە. ڕاوەسـتە بـا بگەیـنە سـیبیریا جـا دەزانـی چـۆن پیـاوان خـۆت لـێ هەڵـدەکەن و کارێـکت پێدەکەن بـا بە دەواری شـڕی نەکردبێ. جا ئەو کـاتە بە جەسـتەی شـپرزە و لەبەریەک پچڕاوەوە بزانم چۆن لەشفرۆشی دەکەی؟

ماسـلۆڤا هەردوو دەسـتی خسـتبووە بـن بـاخەڵی، سـەری داخسـتبوو و چـاوی لە سـووچێک بڕیبـوو. تەنیـا کاتێـک کە ژان بە جەرگـی دەگەیشـت، دەکەوتە سکاڵا کردن و لە بوچکۆڤا دەپاڕایەوە.

ـ دەستم لێ هەڵگرە، من هەقم بە سەر تۆوە نییە، بۆ لە کۆڵم نابییەوە؟

بە گۆمی خەیاڵدا ڕۆچووبوو. یەکێک لە پاسـەوانانی چاوەدێری خۆی کـرد بە ژوورێدا.

ـ ماسلۆڤا کێیە؟

ـ من.

- هانێ. ئەم سێ ڕۆبڵە ئەو ژنە بۆی ناردووی.
- کامە ژن؟
- ژنێک ناردوویەتی ئیتر لە سەری مەڕۆ.

ئەو پارەیە مادام کیتایڤا، سەرۆکی خانەی لەشفرۆشان بۆی ناردبوو. مادام کیتایفا لەگەڵ سەرۆکی ئاسایشی دادگا قسەی کردبوو و ڕازیی کردبوو کە ئەو چەند ڕۆبڵە بۆ ماسلۆڤا بنێرێ. پاشان دەستەوانە جیرە سێ قۆپچەکەی لە دەستی داکەند و بە قامکە پڕ لە ئەنگوستیلەکەی داوێنی کراسەکەی هەڵدایەوە و لە گیرفانە شاراوەکەیدا کە لە پشت چینی تەنوورەکەی هەڵکەوتبوو، جزدانێکی زۆر جوان و ناسکی دەهێنا و لەو جزدانەدا کە پڕ بوو لە پسوولەی جندەخانە و هێندێک ئەسکەناس و قەرەپووڵ، گەڵایەکی دوو ڕۆبڵ و نیوی و دوو دراوی بیست سانتیمی و یەک دراوی دە کووپکی دەرهێنا و دای بە سەرۆکی ئاسایشی دادگا. سەرۆکیش یەکێک لە فەرمانبەرەکانی بانگ کرد و لە بەر چاوی مادام کیتایڤا ڕایسپارد کە ئەم برە پارەیە بە تەواوی بگاتە دەستی ماسلۆڤا و هیچی لێ پاشقل نەدرێ. فەرمانبەرەکەش بە ڕق هەستاوی چووبووە دەرێ.

ئەم پارە کەم بایەخە تۆزێ ماسلۆڤای دڵخۆش کرد. چونکە دەیتوانی بە ئاواتی خۆی بگا، کە ئەویش کڕینی بەستەیەک جگەرە بوو. چۆن دەیتوانی کەسێک پەیدا بکات کە جگەرەی بۆ بکڕێ؟ هیچ چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی ددان بەخۆیدا بگرێ هەتا لە خانەی داد دەیبەنە دەرێ. بۆ بەدبەختی نووسیاری دادگا کە دەبوو مۆڵەتی گەڕانەوەی تۆمەتباران بۆ بەندیخانە واژۆ بکات یەکێک لە پارێزەرەکانی بانگ کردبووە سووچێک و خەریک بوون سەبارەت بە وتارەکانی شەونامەیەک پێکەوە دەدوان.

تەنـــانەت لە ســـووچی ئەو ژوورەش دەســـتیان لە ســـەری ماســـلۆڤا هەڵنەدەگرت. گەنج و پیر، بە بیانووی جۆراوجۆر دەهاتن بە چاوی کڕیار لێیان دەڕوانی و پێکەوە سرتوخورتیان دەکرد، ئەویش وەها گیرۆدەی خەم و ئازارەکانی خۆی بوو کە گوێی بەو شتانە نەدەبزووت.

کـاتژمێر پێنجـی دوانیـوەڕۆ مۆڵەتنـامەکە واژۆ کـرا و دوو پاســەوان ئەویـان لە بوچکۆڤا و کارتی نیکین دوور خستەوە و لە دەرگـای دواوە بردیـانە دەرێ. لە بەر دەرگـای خـانەی داد، ماسـلۆڤا بیسـت کـوپکی دا بە پاسـەوانێکی بە ڕەگەز چۆئـاش و داوای لێکرد نان و پاکەتێک جگەرەی بۆ بکڕێ. پاسەوانەکە جگەرە و نانی بۆ کڕی و پاشماوەی پارەکەی پێدایەوە. بە داخەوە نەیتوانی بە ڕێگاوە جگەرەیەک بکێشێ. ناچار بوو ددان بە خۆیدا بگرێ هەتا دەگەنە بەندیخانە. پۆلێک بەندییان دی کە سەعاتێک پێشتر لە شـەمەندەفەر دایان بەزاندبوون و هێنابوویان ڕادەستی ئەو بەندیخانەیان بکەن. دەیان کەس بوون و لە هەموو جۆرە مرۆڤێکیان لەگەڵدا بوو؛ گەنج و پیر، ڕیشدار و بێ ڕیش، ڕووسی و قەوم و ڕەگەزەکانی تر. دەست و قاچیان لە زەنجیردا بوو. زڕەزڕی زەنجیر داڵانەکەی داگرتبوو. تەپوتوزیان ساز کردبوو. هەموو پێکەوە قسەیان دەکرد. بۆنی ئارەقە و چەوری و پیسی تێکەڵ بووبوون. هەرکامیان بە پەنا ماسلۆڤادا تێدەپەڕین چاوی حیز و پڕ هەوەسیان تێدەبڕی. پیاوێک لێی نزیک بۆوە و گوتی: «کچی جوان! خەون دەبینم یان بەخەبەرم؟» یەکێکی دیکەیان گوتی: «سەری ڕێـزت بـۆ دادەنەوێـنم!» یەکێکـی دیـکەش کە ســەری وەک چەوەنـدەر تاشـرابوو و سـمێڵێکی بـابڕی هەبوو، بە ڕوخسـارێکی دێزە و ترسـناکەوە، زنجیرەکەی لە نێوان قاچیدا کۆکردەوە و هۆمەنی بۆ برد و باوەشی پێداکرد.

ـ نەرمۆڵ گیان! هاوڕێی جارانت نەناسییەوە. ئاوا زوو منت لە بیر بردەوە؟

نـایبی زینـدان کە ئەو دیـمەنەی دی، بە هەڵەداوان ئەو بەنـدییە زلحـۆرتەی دوور خستەوە و لە ماسلۆڤای پرسی لەوێ چدەکا؟ ماسلۆڤا ئەوەندە شەکەت

بووبوو، توانایی قسەکردنی نەبوو. یەکێک لە پاسەوانەکان گوتی کە ئەویان تازە لە دادگاوە هێناوە بۆ بەندیخانە.

ـ هەتا زووە بیبەن بۆ لای سەرپاسەوان با ئەم ڕووداوە دزێوانە دووپات نەبنەوە.

ـ بەچاوان گەورەم.

نایبی زیندان بۆ ئەوەی کێشە و دەردەسەری ڕوو نەدا، بانگی سەرپاسەوانی کرد دەستووری پێدا زوو لەوێی دوور بخاتەوە. سەرپاسەوان هاتە پێشێ، شانی ماسلۆڤای گرت و بە تووڕەیی ڕایتڵەکاند و تێیگەیاند کە لەگەڵیدا بچێت بۆ بەندی ژنان. لەوێ گیرفان و باخەڵیان پشکنی. جگەرەکانی لە نێو نانەکەدا شاردبۆوە. هیچ شتێکی قاچاخیان لە گیرفان و باخەڵیدا نەدۆزییەوە و بردیانەوە بۆ ئەو شوێنەی کە بەیانی هێنابوویانە دەرێ.

# سی

بەندی ژنان لە هەر دووبەری دالانێکی تەنگ و تاریک هەڵکەوتبوو. بەندی ماسلۆڤا و هاوزەنجیرەکانی شەش مەتر و نیو لە پێنج مەتر بوو و بە دوو پەنجەرەی چکۆڵە و شیشبەندی ئاسنینەوە، پەنجەرەکان ڕوویان لە بەندی پیاوان بوو. سۆبایەکی خەڵووزی زۆر کۆنە لە سووچی ژوورەکە بوو. وێنەیەکی مەسیح و خاچێکی داریـن بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوون و شەمدانێکی مسین لە سەر ڕەفەیەک داندرابوو، لە سووچێکیش سەتڵێکی زباڵە وەبەر چاو دەکەوت. تەختێکی نەوی و شەقوشڕ و چەپەکیش کە دوو لە سەر سێی پانتای ژوورەکەی داگرتبوو، بەندیەکان جێوبانیان لە سەر دادەخست و لە سەری دەخەوتن.

ماسلۆڤا دوای ئەوەی بەوردی پشکنییان، بەرەو بەندەکە بەڕێکرا. خۆر خەریک بوو ئاوا دەبوو، دوای ئەوە ئیتر ژنانی بەندی هەقیان نەبوو لە ژوورەکەیان بێنە دەرێ. لەو ژوورەدا دوازدە ژن و سێ منداڵ بەند کرابوون.

هێشتا هەوا ڕووناک بوو و دوو کەس لە ژنەکان خەویان لێکەوتبوو. یەکیان کە باڵتەکەی بە خۆیدا دابوو و خەوتبوو، ژنێکی ڕەشۆکی و حەپۆل و کەم ئاوەز بوو، زۆربەی کات دەخەوت و هیچ کەس نەیدەزانی بۆچی بەند کراوە. یەکێکی دیکەیان کە ژنێکی سیلدار بوو،بە تۆمەتی دزی دەستگیر کرابوو، کەم وابوو بخەوێ؛ ئێستاش خۆی لە گەز دابوو، پاڵتۆکەی گرمۆڵە کردبوو و نابوویە ژێر سەری. بە دەستیشی بەر دەمی خۆی گرتبوو بۆ ئەوەی لەگەڵ کۆخین بەڵغەمەکەی نەیەتەوە دەرێ.

بەندییەکانی دیکە هێشتا بەخەبەر بوون. هەموویان جلوبەرگی زبر و ئەستووری زیندانیان لەبەردابوو. هێندێکیان لە سەر تەختەکە دانشتبوون و خەریکی دروومان بوون؛ چەند کەسیشیان لەبەر پەنجەرەکە ڕاوەستا بوون و چاویان لە حەوشەی بەندیخانەکە دەکرد. یەکێک لەو سێ ژنەی کە خەریکی دروومان بوون، یەکیان ئەو پیرێژنە بوو کە بەیانی ئەو ڕۆژە هەتا بەر دەرگا بە دوای ماسلۆڤادا هاتبوو. ئەو ناوی کۆرابلڤا بوو. ژنێکی قەڵەوە و توندوتۆڵ بوو بە ڕوخسارێکی گرژ و پرچڕچولۆچەوە. بالووکەیەکی گەورە لە سەر ڕوومەتی بوو. بەرخەبەبەی داکەوتبوو و بسکی زەرد و خۆڵەمێشینی لە دوو لاوە کەوتبووە سەر لاجانگی. مێردەکەی بە بیور کوشتبوو. چونکە تەماحی لە کچەکەی کردبوو کە لە مێردەکەی پێشووی بوو. ئەو ژنە دەمڕاست و سەرگەورەی بەندەکەبوو و مەشرووبی قاچاخیشی دەفرۆشت.

کۆرابلڤا چاویلکەی لە چاو کردبوو و بە شێوازی ژنانی لادێیی دەرزیی بەسێ قامکی و بەرەوڕووی خۆی گرتبوو. ژنێک کە لە پاڵ دەستی

دانیشتبوو و خەریکی درووومان بوو، ژنێکی ڕەشتاڵە و لووت قیت بوو بە چاوی چکۆڵە ڕەشەوە. زۆر مێهرەبان و ڕۆحسووک و لەگەڵ ئەوەشدا زۆربڵێ و چەنەوەر بوو. ماچڵەکچیی هێلاسن بوو. سێ مانگی زیندان بۆ براوبۆوە؛ چونکە درەنگ شەمەندەفەری ئاگادار کردبۆوە و بەهۆی بێ موبالاتیی ئەوەوە دوو شەمەندەفەر خۆیان بەیەکدا کێشابوو.

سێیەمین ژن کە خەریکی درووومان بوو، ناوی فیدۆزیا بوو، بەڵام هاوڕێکانی بەناوی فێنیچکاش بانگیان دەکرد. هێشتا لاو بوو، دەموچاوی کرچوکاڵ بوو بە چاوی شین و گەش و منداڵانەوە! پرچە درێژ و کاڵەکەی بە پەلکە هۆنیبۆوە و لە دەوری سەری هاڵاندبوو. بەوە تۆمەتبار کرابوو کە مێردەکەی درمانداو کردووە. دوای هەشت مانگ ئازادی مەرجدار لەگەڵ مێردەکەی ئاشت بووبوونەوە و لە هەموو لایەنێکەوە کێشە و گرفتەکانیان چارەسەرکردبوو. خەزوور و خەسوو و هێورەکەشی لێی خۆش بووبوون و هەموو شتێک بە باشی کۆتایی پێ هاتبوو. بەڵام دادگا دوای ماوەیەکی زۆر بە پەروەندەکەدا دەچێتەوە و بە تۆمەتی دەرمانداو کردنی مێردەکەی، زیندانی بە کاری دژوارەوە بۆ دەبڕێتەوە. فێدۆزیا ژنێکی شاد و دڵنەرم بوو، ئەو لە پەنای ماسلۆڤا دادەنیشت و لە پاڵ ئەویشدا دەخەوت. زۆری ماسلۆڤا خۆشدەویست و لەقسەی دەرنەدەچوو.

دوو ژنی دیکە لە سەر تەختەکە دانیشتبوون، بەڵام درووومانیان نەدەکرد؛ یەکیان نزیکەی چل ساڵی تەمەن بوو بە دەموچاوێکی ڕەقەڵە و ڕەنگ بزرکاوەوە. دیار بوو ژنێکی شوخوشەنگ بووە و دەستی ڕۆژگار جوانییەکەی لێ سەندۆتەوە. منداڵەکەی دەمی نابوو بە مەمکە سپی و گەورەکەیەوە و دەمیژی. ئەو بە تۆمەتی ئاژاوەگێڕی قۆڵبەست کرابوو. ڕۆژێک کە ئاژانە ئەسپ سوارەکان چووبوون بۆ گوندەکەیان و ویستبوویان

گەنجێک دەستگیر بکەن و بیبەن بۆخزمەتی سەربازی، خەڵکی پێشیان بە ئاژانەکان گرتبوو و ئەم ژنە کە پووری کوڕە گەنجەکە بوو، زیاتر لە هەموو خەڵکی گوندەکە دەمی بردبووە پێشێ و لەگەڵ ئاژانەکان بەشەڕ هاتبوو؛ ئەوەش تاوانێک بوو کە بۆ لێبوردن نەدەبوو.

ئەوی دیکە پیرێژنێکی سەر سپی و پشت کۆم بوو و لە پەنا سۆباکە و لە سەر تەختەکە خۆی کوشمەڵە کردبوو و لەگەڵ کوڕیکی چوار ساڵان یاریی دەکرد. کوڕەکە قژی سەری لە بندا تاشرابوو و زگی هەڵمەسابوو، تەنیا کراسێکی لەبەردابوو. بەدەنگی بەرز پێدەکەنی و بە سەر تەختەکەدا هەڵات هەڵاتی دەکرد و گەمەی لەگەڵ پیرێژنە پشت کووڕەکە دەکرد. بەوە تۆمەتبار کرابوو کە بە هاودەستیی کوڕەکەی ماڵێکی ئاور تێبەرداوە. ژنێکی سەبوور و بەتاقەت بوو. زۆری خەمی کوڕەکەی بوو کە ئەویش لە بەندی پیاوان دەسبەسەر کرابوو. چونکە بووکەکەی دوای دەستبەسەرکرانی ئەوان ماڵەکەی بەجێهێشتبوو و دەترسا هیچ کەس نەبێ جلی کوڕەکەی بشوا و ڕشک و ئەسپێ تێی بدا.

جگە لەو حەوت ژنە، چوار ژنی دیکەش لە بەر پەنجەرەکە ڕاوەستا بوون و لە پشت شیشبەندی ئاسنینەوە چاویان لەو تۆمەتبارانە دەکرد کە دەیانهێنان بۆ بەندی پیاوان. یەکیان ژنێکی قژ سوور بوو بە دەموچاوی زەردەڵ و گولدوزامەوە؛ ملیشی کە لە ملیوانەی کراسە کەیەوە بەدەرکەوتبوو پڕ بوو لە خاڵی سوور و بۆر. بە تۆمەتی دزی زیندانی کرابوو. دەنگی گڕ و پیاوانە بوو و بەردەوام جنێوی دەدا.

لە پاڵ ئەودا ژنێکی کورتە باڵا ڕاوەستا بوو کە لە منداڵێکی دەساڵان گەورە تر نەبوو. سەوزە بوو. ئاتەگی کراسەکەی کەوتبووە سەر لاقە قوڵەکانی. چاوانی بە ڕوخسارە سوور و پڕ خاڵ و پەڵەکەیەوە زۆر لە یەک بڵاو بوون. ددانە درێژەکانی بە دیارەوە بوون. بە گاڵتە پێیان دەگوت

«ژیـکەڵە». ئەویـش ئەو نـاوەی پێنـاخۆش نەبـوو. بە تـۆمەتی دزی و ئـاور تێبەردانی بە ئانقەست زیندانی کرابوو.

ژنێکی تر کە لە پشت پەنـجەرەکە ڕاوەسـتا بـوو، دووگیـان بـوو. کراسـێکی خۆڵەمێشینی زۆر چڵکنی لەبەر دابوو. متەقی نەدەکرد.

هێنــدێ جــار ئــاوڕی دەدایەوە و بەو ژنــانەی پێــدەکەنی کە خەریکــی دروومان بوون. پەرێشـان و شـڵەژاوی دەنوانـد و بە تـۆمەتی شـاردنەوەی ماڵی دزی دەستبەسەر کرابوو.

چوارەمین ژنیش کە لە بەر پەنجەرەکە بوو، بە تۆمەتی فرۆشتنی مەشرووبی قاچاخ کەوتبـووە زینـدان. لادێیـی بـوو،خڕپلانە و قەڵەو، دایکـی دوو منـداڵ بـوو هەر دووکیـانی لەگەڵ بوو؛ یەکیان ئەو کوڕە چوارساڵانەیە بوو کە لەگەڵ پیرێژنە پشت کووڕەکە یـاریی دەکرد و ئەوی دیکەیان کچێکی شەش حەوت ساڵانی قژ کاڵ بوو و کراسـێکی سـادەی لەبەر دابـوو. ئەم ژنە گوندنشـینە، هەروا کە ڕاوەسـتا بـوو لە پەنــجەرەکەوە دەیڕوانــی، گـورەویی دەچنـی و هەر کاتێک کە گوێی لە جنێو یـان قسـەیەکی نـاخۆش دەیـوو نێـو چـاوانی گـرژ دەکـرد. بەڵام کـچە قـژ کـاڵەکەی دەسـتی بە داوێنـی ئەو ژنە قـژ سـوورە گرتبـوو کە بەردەوام جنێـوی دەدا و گـوێی بـۆ ئەو قسـە پیسـانە شـل کردبـوو کە ژنە قژسوورەکە و پیاوانی حەوشە و بەیەکیان دەگوت و لەبەر خۆیەوە دووپاتی دەکردوە؛ دەتگوت دەیهەوێ جنێوی نوێ فێر بێت و لەبەری بکات!

دوایین ژن لە ژوورەکەدا ئـافرەتێکی قەڵەو بـوو، بە سـەروقژێکی ئـاڵۆزەوە کە دوو پەلـکەی هۆنیبـۆوە و بە پشـتیدا شـۆڕ بووبـوونەوە. پێخـاوس بـوو و کراسـێکی چڵکنـی لەبەر کردبـوو. بـاوکی جانکوشـی کلێسـا بـوو و بە تـۆمەتی ئەوەی منداڵە ساواکەی خۆی لە چـاڵاو خسـتبوو کەوتبـووە بەندیخانەوە. بێ ئەوەی سەرنجی دەوروبەرییەکانی بدا، لەم سەری ژوورەکەوە دەڕۆیشـت بـۆ ئەو سەر و بەردەوام خەریکی هاتوچۆ بوو.

# سی و یەک

لەو کاتەوە کلیل لە نێو قوفڵەکەدا سووڕا، دەرگای بەندەکە کرایەوە و ماسلۆڤا چووە ژووری، هەموو چاویان تێبڕی؛ تەنانەت کچی جانکوشیش کە لە نێو بەندەکەدا ڕاوێچکەی دەکرد، گتێکی گرت و بۆ ساتێک لە سەرتاپای وردبۆوە و دیسان دەستی کردەوە بە ڕاوێچکە کردن. کۆرابلڤا دەرزییەکەی لە پەڕۆی بەردەستی هەڵچەقاند و لە سەرووی چاویلکەکەیەوە چاوی پڕ لە پرسیاری تێبڕی.

ـ دایکەکەم! دیسان هێنایانیەوە بۆ ئێرە؟ ئێمەش چەندە ساویلکە بووین، پێمان وابوو ئازادیان کردووی.

دەنگێکی گڕ و پیاوانەی هەبوو. چاویلکەکەی لە چاوی داکەند و ماسلۆڤای لە پاڵ خۆیدا دانا. فێدۆزیا بە زمانێکی شیرین دڵخۆشیی دایەوە.

ـ گوڵە گیان! ئێمە دەمانگوت بێ تاوانییەکەت بۆ دادگا دەردەکەوێ و ئازادت دەکەن. وا دیارە پێشبینییەکەمان وەڕاست نەگەڕا. خەم مەخۆ خۆشەویستەکەم! خودا گەورەیە. ڕەنگە ئەو کارە حیکمەتێکی تێدابێ. وا دیارە هیچت نەخواردووە و برسیتە.

فێدۆزیا چاوە منداڵانەکەی تێبڕیبوو. حەزی دەکرد هەموو شتێک لە زمانی خۆی ببیستێ و باری خەم و ئازارەکەی سووک بێ. ماسلۆڤا هیچی نەگوت.

نانەکانی لە سووچێک دانا. عەبا تۆزاوییەکەی داکەند و لەچکەکەی لە سەری کردەوە، بسکە ڕەشەکەی لە دەوری ملی پەرێشان بوو. پیرێژنە پشت کوورەکە وازی لە یاری کردن لەگەڵ منداڵەکە هێنا و هەستا هات بۆ لای ماسلۆڤا. بە چاوێکی دڵسۆزانەوە تێی دەڕوانی. منداڵەکەش لەگەڵی هات. کە چاوی بە نانەکە کەوت، دەمی ئاوی کرد و لێوی کۆکردەوە.

هەموویان دەیانویست بزانن ماسلۆڤا چیی بەسەر هاتووە. هەموویان خۆیان بە هاودەردی دەزانی. ماسلۆڤا ددانی بە خۆیدا گرتبوو بۆ ئەوەی نەدا لە قوڵپەی گریان. دەستی برد بۆ نانەکە و ویستی بیداتە دەستی منداڵەکە، بەڵام خۆی پێ ڕانەگیرا و قوڵپی گریان لە قوڕگیدا تەقییەوە. کۆرابلڤا دڵخۆشیی دایەوە.

ـ کچەکەم! من پێم گوتی پارە خەرج بکە و پارێزەرێک بگرە. دەی نەتگوت چەندساڵیان زیندان بۆ بڕیویەتەوە.

ماسلۆڤا هەروا دەگریا، لەگەڵ ئەوەی خەریک بوو قوتووی جگەرەکەی لە نێو نانەکە دەردەهێنا، فرمێسک بە ڕوومەتیدا دەهاتە خوارێ. قوتووی جگەرەکەی دایە دەست کۆرابلڤا. وێنەی ژنێکی جوان بە قژی جوان و بەرۆکی ئاواڵەوە بە سەر قوتووی جگەرەکەوە بوو. کۆرابلڤا چاوی لە وێنەی سەرقوتووەکە کرد و سەری ڕاوەشاند، دەتگوت دەیهەوێ ماسلۆڤا تێگەیێنێ کە بۆچی پارەکەی خۆی لە حەرام دەگێڕێ و بۆ شتێکی باش و پێویست پاشەکەوتی ناکا. لەگەڵ ئەوەشدا جگەرەیەکی داگیرساند، مژێکی لێدا و دای بە ماسلۆڤا. ماسلۆڤا جگەرەکەی وەرگرت و مژێکی قووڵی لێدا.

ـ زیندانم بە کاری دژوارەوە بۆ بڕایەوە.

ـ ئەوانە ویژدانیان نییە و لە خودا ناترسن؛ ئەوانە قازی نین، دڕندەن. کچێکی ئاوا باش و بێ تاوان لە سەر هیچ و خۆڕایی مەحکووم دەکەن. ژنە

خریلانەکەی وا لە بەر پەنجەرەکە ڕاوەستا بوو، بە دەنگی بەرز دای لە قاقای پێکەنین. وەک منداڵ دەیقرشیکاند؛ هەڵسوکەوتی قەشمەرجاڕانەی زیندانییەکی حەوشەکە ئەوی وەپێکەنین خستبوو. دەموچاوی بە شیشبەندی پەنجەرەکەوە نووساندبوو. پێدەکەنی و بە پیسترین جێو کوڵوکوی خۆی دادەمراکاند. کۆرابلڤا گوڕاندی بەسەریدا و بە چەند جنێوی خەست بێدەنگی کرد و سەبارەت بە ڕادەی زیندانییەکەی پرسیاری لە ماسلۆڤا کرد. ماسلۆڤا لە وەڵامدا گوتی:

- چوار ساڵ.

جگەرەکەی بە فرمێسک تەڕ بوو و جگەرەیەکی دیکەی هەڵگرت. ژنی ماچڵەکچی کە هیچکات جگەرەی نەدەکێشا، جگەرە نیوە کێشراوەکەی هەڵگرت و مژێکی لێدا و گوتی:

- چیمان لە دەست دێ؟ ئەوانە خۆ نازانن ویژدان و دادپەروەری چییە. من ئەو دڕندانە دەناسم. لە سووچێک بۆسە دەنێنەوە تاکوو چارەڕەشێک بخەنە داوە. پاشان وەک چەقەڵ و گورگ و کەمتیار هەڵدەکوتنە سەری و لەبەریەکی هەڵدەدڕن. ئەوانە لە دڕندەش دڕندەترن.

وردە وردە ئەو ژنانەی بەر پەنجەرەکەش کە چاویان لە حەوشەکە دەکرد، هاتن و لە دەوری ماسلۆڤا کۆبوونەوە. ئەو ژنەی کە بە تۆمەتی فرۆشتنی مەشرووب دەسبەسەر کرابوو، لە پاڵ ماسلۆڤادا دانیشت. گۆرەویی دەچنی و قسەی دەکرد.

- کەوایە مەحکوومیان کردی؟

کۆرابلڤا هێشتا لە سەر قسەی پێشووی خۆی سووربوو:

- ئەگەر پارەی بووبووایە و پارێزەرێکی بگرتایە، ئاوای بەسەر نەدەهات. پارێزەرێک هەیە ناوەکەیم لە بیر چۆتەوە، پیاوێکی کۆلکن و لووت زلە، ئەگەر

پیاو بکەوێتە نێو گەناویشەوە، ئەو ویشک و خاوێن دەریدەهێنێتەوە. ماسلۆڤا پارێزەرێکی ئاوای دەویست.

ژنە خڕیلانەکە کە تازە لەبەر پەنجەرەکەوە هاتبوو بیروڕای ئەوە نەبوو. سەری ڕاوەشاند و گوتی:

ـ مەگین دەکرێ بچی بۆ لای پارێزەرێکی ئاوا. ئەو تف بکاتەوە هەزار ڕۆبڵت لێ دەستێنێ.

پیرێژنە کووڕەکە بۆ سەدەمین جار قسەکەی خۆی دووپات کردەوە:

ـ هەرچییەک بێ، چارەنووسە و هیچی لەگەڵ ناکرێ. بووکەکەی من لەگەڵ پیاوێکی نابار کلکی تیکهالاند و من و کوڕەکەمی تووشی ئەم ڕۆژە ڕەشییە کرد. مرۆڤی هەژار دەبێ جێگای هەر لە زیندان بێ.

ژنەی فرۆشیاری مەشرووبی قاچاخ کچەکەی کێشایە بەردەمی خۆی و لە سەر کۆشی دانا؛ بە دەم دۆزینی سەری کچەکەیەوە گوتی:

ـ منیش لە پەستا لێیان دەپرسیم بۆچی مەشرووبی قاچاخ دەفرۆشی؟ گوتم ئەگەر مەشرووب نەفرۆشم ئەی نانی منداڵەکانم کوێ بێنم؟

قسەکانی ئەو ژنە ماسلۆڤای خستە گۆمی بیر و خەیاڵەوە. داوای لە کۆرابلڤا کرد چۆڕێکی مەشرووب بداتێ؛ بە سەر قۆڵی کراسەکەی فرمێسکی چاوی سڕی و گوتی:

ـ هەر ئێستا بۆت دێنم؛ خۆ پارەکەیت پێیە؟

# سی و دوو

ماسلۆڤا پارەکەی لە نێو هەویری نانەکە دەرهێنا و دای بە کۆرابلڤا. کۆرابلڤا نەخوێندەوار بوو. پارەکەی پیشانی ژنە خڕیلانەکە دا و دڵنیا بوو کە دوو ڕۆبڵ و نیوە؛ چوو دەستی کرد بە نێو زارکی سۆباکەدا و بتڵێکی ڤۆدکا دەرهێنا. هەموو چاویان لێدەکرد. کاتیۆشا بەڕاکشانەوە نانی دەخوارد. فێدۆزیا پەرداخێکی چایی بۆ تێکرد.

- بۆتۆم هەڵگرتبوو، بەداخەوە ساردبۆتەوە.

کاتیۆشا چاییەکەی بە لەتێک نانەوە خوارد. لەتێک نانیشی دا بە کوڕە چکۆڵەکە کە دیتی چاو لە دەمی دەکا. کۆرابڤا پەرداخێ ڤۆدکای دایە دەستی. چۆڕێکی لێ خواردەوە و چۆڕێکیشی دا بە ژنە خڕیلانەکە. کۆرابلڤا و ئەو دوو ژنە لە بەندەکەدا بارودۆخی ماڵییان لە هەمووان باشتر بوو. هەموو شتێکیان پێکەوە بەش دەکرد و لە نێو هاوبەندە هەژارەکانیاندا، بۆرژوا و خاوەن پارە بوون!

ماسلۆڤا چەند قومی دیکەی لە ڤۆدکاکە خواردەوە. تۆزێ گەرم داهات و بەسەرهاتی ئەو ڕۆژەی بە تیروتەسەلی بۆ گێڕانەوە. لاسایی دادیاری دەکردەوە. هەموو شتێکی بە وردی لە بیر مابوو:

ـ تەواویان چاویان لە من بوو. کاتێک لە ژوورە تاریکەکەی نێوەڕاستی دالانەکەش بووم، لە پەستا دەهاتن و سەریان بە ژووریدا دەکرد و بە چاوە حیزەکانیان خەریک بوون هەڵملووشن! هەرکەسەی بە بیانوویەک خۆی دەکرد بە ژووریدا . یەکێک دەهات بۆ کاغەز، یەکێک قەڵەمەکەی ون کردبوو،یەکێک بە شوێن قوزەڵقوتەکەیدا دەگەڕا...

ژنی ماچڵەکچی قسەکانی ئەوی پشت ڕاست کردەوە و گوتی:

ـ هەموویان بەو جۆرەن؛ وەک مێش لە شیرینی دەنیشن! ئامادە نین هەنگاوێکی خێر هەڵبێننەوە.

ـ لە هەمووشی سەیرتر کاتێک گەیشتمەوە بەندیخانە، تاقمێک زیندانییان بەکۆت و زەنجیرەوە هێنابوو. هەرکام پلاریکیان تێدەگرتم و حەزیان دەکرد لە باوەشم بگرن. یەکێکیان وەها ئاوقام بوو و باوەشی پێداکردم، ناچار بووم لێیدەم. باش بوو نایبی زیندان لەوێ بوو و گەیشتە فریام.

ژنە خڕیلانەکە کە دەتگوت زۆر شت دەزانی، سەبارەت بە شێوە و ڕواڵەتی کابرا پرسیاری لە ماسلۆڤا کرد، ماسلۆڤا لە وەڵامدا گوتی:

ـ پیاوێکی ڕەشتاڵەی سمێڵ زل بوو. سەری تاشرابوو.

ـ خۆیەتی.

ـ ئەوە چ جۆرە مرۆڤێکە. دەڵێی لە ئەشکەوتدا گەورە بووە.

ـ ناوی چیگۆلۆڤە. لە حەوشەی زیندانەکە لە دوورەوە دیتم. تا ئێستا دوو جار لە زیندان هەڵاتووە و گرتویانەتەوە و دیسان هەڵاتووە. پاسەوانەکان زۆری لێدەترسن.

کۆرابلڤا پارێز کردن لەو جۆرە کەسانەی بە پێویست دەزانی و لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە نابێ لە کەسانێکی ئاوا مەترسیدار نزیک ببیەوە. سەبارەت بە ناڕەزایەتی دەربڕین لەمەڕ بڕیاری دادگاوە پرسیاری لە ماسلۆڤا کرد. ئەو

ئاگـای لەو شـتانە هەر نەبـوو. ژنە سەرسـووورە دەم پیسـەکە کە گـوێی بـۆ قسەکانیان شل کردبوو، هاتە پێشێ بۆ ئەوەی ماسلۆڤا ڕێنوێنی بکات.

ـ نەدەبوو بنووسی من ئەو بڕیارەی دادگام قەبووڵ نییە؛ هێشتاش درەنگ نەبووە. نامەیەک بنووسە و بینێرە بۆ دادیار.

کۆرابلڤا دەرهەڵبوو.

ـ کێ ڕێگای بە تۆ داوە خۆت لە هەموو شتێک هەڵقوتێنی؟ بڕۆ کۆی کەوە و دەمت لێک نێ. خۆمان دەزانین چبکەین.

ـ خۆمن قسەم لەگەڵ تۆ نەکردووە.

ـ دەزانم دەردت چییە. بۆنی ڤۆدکات کردووە و هاتووی بۆ چۆڕێ ڤۆدکا.

ماسـلۆڤا بـۆ ئەوەی کێشـەکە دامرکێنـێ چۆڕێکیشـی بـۆ ئەو تێکـرد. نێوبژیوانی ئەو کەڵکی نەبوو. قژسوور و کۆرابلڤا تێکهەڵچوون.

ئەم ژنە با قوزەلقورت و سندان بخوا؛ ڤۆدکا حەیفە بۆ ئەو.

ـ سەڵیتەی هیچوپووچ! فێری دەمدرێژی بووی!

ـ ئێستا پشانت دەدەم کێ سەڵیتەیە؛ وەهات لەبەر یەک هەڵدەقیشێنم...

جنێو بۆ ئەوان وەک ئاو خواردنەوە وابوو. سـەد جۆر دژوێن و قسـەی سووکیان دا بە گورچووی یەکتردا. لە ئاکامدا ئاوقای یەکتر بوون دەستیان لە قـژ و بەرۆکـی یەک گیـر کـرد و چنگـاوەش بـوون. کۆرابلڤـا مشـتێکی لە سینگی قژسووردا لە سـووچی ژوورەکە تخێڵی کرد. قژسـوور دانەدەسـەکنا. هەسـتایەوە و پەلامـاری قـژی ڕەقیبەکەی دا، چنگی لێ گیـر کـرد و کێشـای. دیسـان چنگـاوەش بـوونەوە. ماسـلۆڤا و فێـدۆزیا چـوون بـۆ نێوبژیـوانی دەیانەویست لێکیـان بکەونەوە، بەڵام دەرۆسـتیان نەدەهـاتن. قژسـوور پرچـی کۆرابلڤـای لە دەسـتی هاڵانـدبوو و بە دەسـتەکەی دیکەی لە سەروسـەکوتی ڕادەکێشـا. کۆرابلڤاش بە مشـت لە دەم و لـووتی قژسـووری دەدا و گـازی لە

باسکی دەگرت. هەمووان هەوڵیان دەدا لە یەکیان دوور بخەنەوە و تەنانەت ژنە سیلدارەکەش کە کۆخە پیرانی پێ بەستبوو هاتبوو بو نێوبژیوانی. منداڵەکان لە سووچێک سەریان پێکەوە نابوو و دەگریان. شەڕ و چنگەپەڵماسێ کۆتایی نەدەهات. لە پڕ دەرگای بەندەکە کرایەوە، ژنەی زیندانەوان و سەرپاسەوان هاتنە ژوورێ و جووتە حەریفیان لێک کردەوە. چنگێک پرچی کۆرابلڤا هەڵکەندا بوو. قژسوور کراسە دڕاوەکەی پیشانی سەرپاسەوان دەدا. هەرکام باسی بێ تاوانی خۆیان دەکرد و هاوبەندییەکانیان دەکردە شایەد. ژنەی زیندانەوان کە زۆری لەو کێشەو هەرایانە دیتبوو لە ڕێوە سەرەداوەکەی دۆزییەوە.

ـ هەمووی بە هۆی مەشرووبەوەیە. بۆنی دێ. سبەینێ سەرۆک بەندیخانە ئاگادار دەکەم و تاقمێکتان دەنێرم بۆ لێپرسینەوە. ئێستا بڕۆنەوە سەر جێگای خۆتان و بتۆپن. جا سبەینێ پێتان دەڵێم پووتێک چەند سیەیە.

هەرکامیان بە مەیلی خۆی باسی کێشەکەی دەکرد و تاوانی دەخستە ئەستۆی بەرامبەرەکەی. ژنەی زیندانەوان و سەرپاسەوان گوێیان لە قسەکانیان بوو، کە دیتیان داسەکینون، دەرگاکەیان داخست و ڕۆیشتن. ژنەکان وردەوردە بێدەنگ بوون و خۆیان بۆ خەوتن ئامادە کرد. پیرێژنی پشت کووڕ لەبەر خاچەکەدا چۆکی دادا و دەستی کرد بە نزا کردن.

دوای تاوێک قژسوور لە جێگاکەی هەستا و جنێوێکی بە کۆرابلڤا دا. کۆرابلڤاش قیژاندی:

ـ چییە دیسان ئێشتای لێدانت کردووە؟

ــ ئەگەر ئەوانە لە ژێر چنگم دەریان نەهێنایەی هەردووک چاوتم دەردەهێنا.

هەموویان ناوبژیوانییان دەکرد و ورده ورده ئاوری ڕقەکەیان دامرکیەوە. هێندێکیان ڕاکشان و زوو خەویان لێکەوت، هێندێکیشان پرخوهۆریان بەرز بۆوە. پیرێژنی پشت کوورِ هێشتا هەر دۆعای دەخوێند. کچی جانکوش دیسان لەو بەندە بەرتەسکەدا دەستی کردەوە بە ڕاوێچکە کردن. ماسلۆڤا هەروا بەخەبەر بوو و لە بیری ئەوەدا بوو چۆن ئەو ماوەی زیندانە کۆتایی پێ بێنێ. ئیتر بۆی دەرکەوتبوو زیندانییەکی چارەنووس نادیار نییە و وەکوو مەحکوومێک چاوی لێدەکرێ. کۆرابلڤا لە سەر لاتەنیشت بەرەو لای ئەو وەرسووڕا. ماسلۆڤا حەزی دەکرد لەگەڵ کەسێک بدوێ و کوڵوکۆی دڵی دامرکێ.

- هێشتا باوەڕ ناکەم. هێندێ کەس کاری خراپیش دەکەن پێوە نابن. کەچی من نەدزیم کردووە و نەکەسم کوشتووە، بۆ دەبێ بکەومە بەندیخانە؟

- کچم! خەم مەخۆ. بیر لە سیبیریا مەکەوە؛ لەوێش دەتوانی بژیی؛ لەوێش دانامێنی.

- نامەوێ ئاوا بژیم؛ خووم بە ژیانی ئاسوودە گرتووە.

- حیکمەتی خودا هیچی لەگەڵ ناکرێ، دەبێ ڕازی بی بە ڕەزای ئەو.

- قسەکەت ڕاستە، بەڵام زۆر دژوارە، زۆر دژوارە.

هەردووکیان بێدەنگ بوون. لەو بەری تەختەکە کەسێک دەگریا، گریانەکەی زۆر بە سۆز بوو؛ قژسوور بوو دەگریا. لە تەواوی ماوەی تەمەنیدا جنێوی پێدرابوو و چەپۆکەسەر و چارەڕەش، ڕۆژی خۆشی نەدیبوو. یەکەم ئەشقی خۆی وەبیر هاتبۆوە. حەزی لە گەنجێکی کرێکاری کارگە کردبوو. ڕۆژێک ئەو کوڕە زۆر سەرخۆش دەبێ، ئاوەزی لە دەست دەدا و جەوهەری گۆرگرد لە هەستیارترین شوێنی لەشی دەکا. ئەو لەبەر ژان جینگڵی دەدا و هاواری دەکرد، گەنجەکە و هاوڕێکانیشی پێی پێدەکەنین

و گاڵتەیان پێدەکرد. ئەو بیرەوەرییە سامناکە هێشتا ئازاری دەدا و جگە لە گریان هیچ کارێکی دیکەی لە دەست نەدەهات. دەینالاند. دەگریا و فرمێسکی هەڵدەوەراند. ماسلۆڤا زۆری بەزەیی پێیدا دەهات؛ هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

- چەندە چارەڕەشە!

کۆرابلڤا گوتی:

- منیش بەزەییم پێیدا دێ. خەتای من نەبوو؛ ئەو شەڕەکەی دامەزراند.

# سی و سێ

نێخلیدۆڤ بەیانیی ڕۆژی دوایی لە خەوی شەوانە ڕاپەڕی و هەستی کرد ئیتر ئەو مرۆڤەی دوێنێ نییە. شەوی ڕابردوو حاڵی شێوابوو و ئێستا ئەو شێواوی و گۆڕانەی بە تەواوی ڕۆح و جەستەوە هەست پێدەکرد. ئەو سوێندەی دوێنی لە دادگا خواردبووی، دیسان هاتەوە سەر زمانی: «سوێند دەخۆم درۆ نەکەم و جگە لە ڕاستی بە سەر زمانمدا نەیە.» ڕووداوێکی سەیر بوو. ئەو ڕۆژە نامەیەکی بە دەست گەیشت کە زۆر لەمێژ بوو چاوەڕوانی دەکرد، ئەویش نامەی گراوەکەی، واتە ماریای ژنی مارشاڵی ئیفتیخاری بوو. ماریا نووسیبووی لێی جیا دەبێتەوە و فەرامۆشی دەکا و بۆ ئەو و هاوسەری داهاتووشی بەختەوەری بە ئاوات دەخوازێ.

هەموو وشەکانی ئەو نامەیەی قۆڕ و بێ مانا هاتە بەر چاو: «کام هاوسەر؟ کام ژیانی هاوبەش؟ ئەم قسانە زۆر قۆڕ و بێتامن!» لە بیری ئەوەدا بوو بچێت بۆ ماڵی مێردەکەی ماریا، دان بە هەموو شتێکدا بنێ و بۆ

تۆڵەیان بەخشین بچێتە بەردەمی و ملی لە موو باریکتر بێ. چڕتر بیری کردەوە. ئەو کارەی بەدڵ نەبوو. «چ کەڵکێکی هەیە؟ جگە لەوەی مارشاڵ خیانەتی ژنەکەی بۆ ڕوون دەبێتەوە و بۆ هەمیشە خۆی بە شەرمەزار و بەرلۆمە دەزانێ؟»

دوێشەو بەڵێنی بە خۆی دابوو کە میسی لەو پێوەندییە عاشقانە و هەوەساوییە ئاگادار بکات، بەڵام ئێستا بۆی دەرکەوتبوو ئەم کارە لە بەرژەوەندیی خۆی و گراوەکەیدا نییە و لە بەرچاوی میسی و بنەماڵەکەی سووک و شەرمەزار دەبێ. وا باشترە ئیتر هاتوچۆیماڵیان نەکات و ڕێز و حورمەتی خۆی ڕاگرێ.

کاتیۆشا لەگەڵ کەسانی دیکە جیاوازبوو؛ سەبارەت بە ئەو پارێزکردنی بە پێویست نەدەزانی. لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەبێ هەر ئەمڕۆ بچم بۆ زیندان. چاوم پێی بکەوێ و تکای لێبکەم بمبوورێ. ئەگەر ڕازی بێ ئامادەم ژیانی هاوبەشیشی لەگەڵ پێک بێنم!» ویژدان و هەستی مرۆڤانە واداری دەکرد خۆی فیدای کاتیۆشا بکات. لەمێژ بوو ئاوا بە شەوق و زەوقەوە لە خەو هەڵنەستابوو. چوو بۆ لای ئاگراڤنا کە لە خزمەتی دایکیدا سەر و پرچی سپی کردبوو، پێیگوت ئیتر پێویستم بەم ماڵە ڕازاوەیە و کار و خزمەتی تۆ نییە. ئاگراڤنا لێیی تێنەگەیشت و پێی وابوو کۆنتی لاو دەیهەوێ زەماوەند بکات؛ یان دەچێتە ماڵێکی گەورەتر و پڕشکۆتر. تووشی سەرسووڕمان بووبوو. نۆخلیدۆڤ ناچار بوو زیاتری بۆ ڕوون بکاتەوە. گوتی:

ــ لە ناخی دڵەوە سپاست دەکەم کە ساڵانێکی زۆر زەحمەتت بۆ من کێشاوە و بڕوا بکە چاکەی تۆم بۆ نادرێتەوە. من ئیتر پێویستم بە ماڵێکی ئاوا گەورە و بەبریقوباق نییە، خۆتان چیدەکەن بیکەن، ماڵەکە بە مەیل و

حەزی خۆتان ڕێک و پێک بکەن هەتا ناتاشای خوشکم دێت و تەکلیفی ماڵ و کەلوپەلەکان ڕوون دەکاتەوە.

ئاگراڤنا گێژوویژ بووبوو، نەیدەزان بڵێ چی.

ــ وا باشترە نییە پەلە نەکەی؟ دواتر پێویستت بە ماڵ و کەلوپەلەکان دەبێ.

ـ نا، هیچ پێویستییەکم بەو شتانە نییە. بە کورتئی بڵێن ئیتر پێویستمان بە ئەویش نەماوە. پارەی دوو مانگی لە زیادی دەدەمێ با خەمی بێکاریی نەبێ.

ــ گەورەم ئەو بڕیارە کتوپڕەت زۆر سەیرە. ئەگەر بتهەوێ بڕۆی بۆ دەرەوەی وڵاتیش، کاتی گەڕانەوە پێویستت بەو ماڵ و ژیان و سامانە دەبێ. پێشخزمەت و کارەکەرت پێویستە.

ـ نامەوێ بڕۆم بۆ دەرەوەی وڵات. ڕەنگە سەفەرێکی دوورودرێژم لەبەر بێ؛ دووتر لەوەی بیری لێ دەکەیەوە.

ئاگراڤنا سەری لەو کارە ماسیبوو. نۆخلیدۆڤ بۆی دەرکەوت بە جارێ ئەو پیرێژنەی تاساندووە، بۆیە ناچار بوو ڕاستییەکەی پێ بڵێ.

ـ وا باشە هەموو شتێکتان پێ بڵێم. کاتیۆشات لە بیرە؟ ئەو کچەی لە ماڵی پوورەکانم گەورە بووبوو؟

ـ هیچکات لە بیرم ناچێ؛ خۆم دروومانم فێر کرد.

ــ دوێنێ لە دادگایەک کە من ئەندامی لیژنەی داوەری بووم حوکمی زیندانی بۆ بڕایەوە.

ـ خودایە، ئەوە دەڵێی چی؟ تاوانەکەی چییە؟

ـ پیاوکوژی. هۆکاری ئەو چارەڕەشییەشی منم.

کۆنت نۆخلیدۆڤ باسی ژوانەکەی ئەو شەوەی بۆ کرد. ئاگراڤنا ئەگەرچی تارادەیەک لە گومڕا بوونی کاتیۆشا ئاگادار بوو، بەڵام سەری لەو کارەی نۆخلیدۆڤ سووڕمابوو.

ـ دەی گریمان واش بێ، تۆ بۆ دەبێ ژیانی خۆت بشێوێنی.

ـ بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو تاوانەی کردوومە، تەواوی ماڵ و سامانەکەم لە ڕێیدا خەرج دەکەم.

ـ هەڵبەت ئیختیار بە خۆتە؛ بەڵام بە بڕوای من خەتای تۆ نییە. ئەو جۆرە ڕووداوانە بۆ زۆر کەس دێتە پێشێ. خۆتی پێوە نارەحەت مەکە وردەوردە لە بیرت دەچێتەوە. هەرکەس بەرپرسی تاوانی خۆیەتی. ماوەیەکە کەمتا کورتی لە ژیانی کاتیۆشا ئاگادارم؛ بیستووم کەوتۆتە سەر ڕێگای خراپ و فێری لەشفرۆشی بووە.

ـ من هۆکار ئەو لاڕێ بوونەی ئەوم.

ـ تاوانبار بی یان بێ تاوان، تازە کار لە کار ترازاوە و هیچی لەگەڵ ناکرێ.

ـ دەزانم دەبێ چبکەم . تۆش خەمت نەبێ لە سەر کاری خۆت دەمێنییەوە؛ من...

ـ من خۆ خەمی خۆمم نییە. دایکت زۆری گەورەیی دەرهەق بە من نواندووە. ئەوەندەت بۆ من داناوە هەتا ئەو کاتەی زیندووم ئاتاجی کەس نابم. لیدای خوشکەزام،ماوەیەکە داوام لێدەکا بچم بۆلای. لێرە کە کاروبارەکەم تەواو بوو، دەچم بۆ لای ئەو. من زیاتر خەمی ئێوەمە کە خەریکن بڕیارێکی خراپ دەدەن؛ ئەویش بۆ بابەتێکی ئاسایی کە بۆ هەموو کەس پێش دێ.

نۆخلیدۆڤ خۆشی سەری سوورما بوو. ڕەفتار و کردکاری گۆڕابوو. ڕێزی بۆ ژێردەستەکانی دادەنا. بە چاوێکی تر لە ئاگراڤنا و کۆرنئیی دەڕوانی. بە دڵ گوێی بۆ قسەکانیان شل دەکرد و دەیویست قسە لەگەڵ کۆرنئیش بکات و ڕاستییەکان لە لای ئەویش بدرکێنێ. خزمەتکارەکەی هێندە خاکەڕایانە کڕنۆشی بۆ برد کە کۆنت نۆخلیدۆڤ چاوپۆشیی لە دانپیانانەکەی کرد و تەنیا باسی دوو مانگ مووچەی زیادیی کرد کە بڕیاری داوە بیداتێ.

لە ماڵێوە هەتا بینای داد بە سواری فەیتوون ڕۆیشت. هەستی دەکرد بۆتە مرۆڤێکی دیکە. ئەگەرچی نە شتێک گۆڕابوو نە خەڵکیش گۆڕابوون، بە چاوێکی تازە لە هەموو شتێک و هەموو کەسێکی دەڕوانی. هەتا دوێنێ بیری لە داهاتووی خۆی و زەماوەند کردن لەگەڵ میسسی دەکردەوە، ئەمڕۆش تەنیا شتێک کە بیری لێ نەدەکردەوە زەماوەند کردن، لەگەڵ میسی بوو. هەتا دوێنێ گەڵاڵەی داهاتووی دوای پێکهێنانی ژیانی هاوبەشی لەگەڵ میسی لە زەینی خۆیدا دادەڕشت، ئەمڕۆش تەنانەت حەزی نەدەکرد چاوی بە چاوی میسی بکەوێ؛ مێشکی پڕ لە بیر و خەیاڵی میسی و ژیانی داهاتوویان بوو. «ئەگەر بە میسی بڵێم چ کەینوبەینێکم لەگەڵ کاتیۆشا بووە، دڵنیام لێم دەتۆرێ و قەت ڕازی نابێ شووم پێ بکا. ئەگەر ڕازیش بێ بیر و خەیاڵی کاتیۆشا کە دەکەوێتە بەندیخانەوە، بۆ ساتێک ناهێڵێ ئاسوودە بم. نا! دەبێ واز لە میسی بهێنم و لە بیری خۆمی ببەمەوە!» ئەگەرچی ڕۆحی لە گێژاوی ئەو بیر و خەیاڵانەدا بوو، بەڵام دڵی ڕووناک بوو. ئەو شادییەی هەستی پێدەکرد زۆر چێژ بەخش بوو. ئەو گۆڕانەی دەروونیشی چێژی پێ دەبەخشی.

«دەبێ سبەینێ بچم بزانم فانارینی پارێزەری خانەی داد چیی کردووە. دەبێ بچم بۆ بەندیخانە و چاوم بە کاتیۆشا بکەوێ و هەموو شتێکی پێ بڵێم.»

لە خەیاڵی خۆیدا دەیهێنایە پێش چاوی کە بەرەوڕووی کاتیۆشا ڕاوەستاوە، چاوی لە چاوی بڕیوە و قسەی لەگەڵ دەکا، دان بە تاوانەکەی خۆیدا دەنێ و پێی دەڵێ: «ئامادەی هەموو کارێکە؛ تەنانەت ئامادەیە ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێک بێنێ». دڵی ئۆقرەی دەگرت، هەستی بە ژانێکی شیرین دەکرد و فرمێسک لە چاوانیدا دەزا.

# سی و چوار

کاتێک گەیشتە بینای خانەی داد، لە دالانەکە چاوی بە سەرۆکی چاوەدێری کەوت و پرسیاری لێکرد کە تۆمەتباران دوای ئەوەی سزایان بۆ دەبڕنەوە، دەیانبەن بۆ کام زیندان و چۆن دەکرێ چاوی پێیان بکەوێ؟ ئەویش گوتی هەتا ئەو کاتەی نامەی سزادانەکەیان دەدری بەزیندان، تۆمەتباران لە گرتووخانەی کاتی ڕادەگیرێن و بۆ مۆڵەتی چاوپێکەوتنیش دەبێ داوا لە دایار خۆی بکرێ. نۆخلیدۆڤ سپاسی لێکرد.

سەرۆکی چاوەدێری گوتی:

ـ هێشتا دادیار نەهاتووە، وەرە بۆ کۆڕەکەی دادگا. کاتێک کارەکان تەواوبوون، پێکەوە دەچین بۆلای دادیار.

نۆخلیدۆڤ بۆ تێپەڕکردنی کات چوو بۆ کۆڕەکەی دادگا. لێژنەی داوەران هەر ئەوانەی دوێنێ بوون. بازرگانی خۆشمەشرەف دیسان لە بەیانیەوە

تێروپڕی خواردبۆوە و شاد و سەرخۆش بوو؛ وەک هاوڕێیەکی دێرین پێشوازیی لە نۆخلیدۆڤ کرد. گراسیمۆڤیچ خۆمانەتر لە هەموو کاتێ لەگەڵی دووا و نۆخلیدۆڤ بە پێچەوانەی دوێنێ ئەو گەرموگوڕی و خۆمانە بوونەی پێ ناخۆش نەبوو.

حەزی دەکرد بە وردی باسی پێوەندیی خۆی و سزادراوەکەی دوێنێ بۆ هەمووان بکات. تەنانەت لە خەیاڵی خۆیدا دەیگوت: «لە کاتی کۆڕەکەی دادگادا هەڵدەستمە سەرپێ و هاوار دەکەم، چەند خولەک بێدەنگ بن و گوێ بۆ ئەم چیرۆکەی من ڕابگرن.» لەگەڵ ئەندامانی لیژنەی داوەران چووە نێو هۆڵەکەی دادگاوە. دیسان وەک دوێنێ فەرمانبەری چاوەدێری بەدەنگی بەرز دەسپێکردنی کۆڕەکەی ڕاگەیاند. سەرۆکی دادگا و قازییەکان بە جلوبەرگی فەرمییەوە هاتن و لە سێ پلەکە چوونە سەرێ و لە پشت مێزێکی سەوزپۆش دانیشتن؛ دیسان چەند ساتێک بێدەنگی، پاشان ئەندامانی لیژنەی داوەران لە سەر کورسییەکانی خۆیان دانیشتن و دوو پاسەوانی شمشێر بە دەست تۆمەتبارانیان هێنایە ژوورێ.

کابرای دەسبەسەر کراو بە تۆمەتی شکاندنی قوفڵ قۆڵبەست کرابوو. تۆمەتبار بیستساڵی تەمەن بوو. لاواز و ڕەنگ بزرکاو، شانی داتەپیو و ڕوخساری خەم داگرتوو. ڕووپۆشی خۆڵەمێشینی بەندییەکانی لەبەردابوو. ڕوخساری خەم و چارەڕەشیی لێدەباری. بەوە تۆمەتبار کرابوو کە بە هاودەستیی یەکێک لە هاوڕێکانی قۆفڵی ئەنبارێکی شکاندووە و مافوورەیەکی کۆنی دزیوە کە نرخەکەی سێ ڕۆبڵ و شەست و حەوت کوپک بووە. دادنامەکە لەوە دەدوا کە پاسەوانێک ئەو و هاودەستەکەی لە کاتی دزییەکەدا گرتووە و بردوونی بۆ دایرەی پۆلیس، ئەوانیش لەوێ دانیان بە تاوانەکەیاندا ناوە. هاودەستەکەی لە گرتووخانەی دایرەی پۆلیس مردبوو و ئێستا تەنیا

تۆمەتباری ئەم پەروەندەیەیان هێنا بوو بۆ دادگا. مافورە کۆنەکەیشان لە سەر مێزێکی گەورە بڵاو کردبۆوە.

دیسان شانۆکەی دوێنی دەستی پێکرد. دەلیل و بەڵگەیان نواند. شاهیدەکان سوێندیان خوارد. کارناسەکان قسەی خۆیان کرد. لێپرسینەوە ئەنجام درا. ئەو پاسەوانەی کە تۆمەتبارەکەی گرتبوو باسی ڕووداوەکەی کرد و لە وەڵامی دادیاردا، پارێزەر مژولیایشێکی تێروتەسەلی پێشکەش کرد. داوایان لە خاوەنی مافوورە شڕەکە کرد ئەویش سکاڵای خۆی دەربڕێ. ئەو پیاوێکی نابار و ئاڵەتی بوو. کاتێک لێیان پرسی ئەو مافوورەیە هی ئەوە یان نا؟ دەستی کرد بە هاتوهاوار. دادیار لێی پرسی:

- ئەم مافورە دڕاوە خۆ لە کەلکوکەرەم کەوتووە؟ بەکاری چی دێ؟

کابرای خاوەن مافوورە سوورهەڵگەڕا و دەرهەڵبوو:

- ئەم مافوورە شڕە فرێشی بدەی هیچ کەس هەڵی ناگرێتەوە. ئەگەر دەمزانی ئەو هەموو چەرمەسەرییەی بەدواوە، زمانی خۆم دەبڕی و سکاڵام لە دژی دزەکە بەرز نەدەکردەوە. من ئامادە بووم بیست ڕۆبڵ بدەم بە کەسێک و ئەم مافوورە شڕە بەرێ بۆ خۆی و نەجاتم بێ لە دەستی . ئێستاش منی بادار و ورەگەپۆستتان بۆ ئێرە پەلکێش کردووە و نازانم چیتان لە گیانم دەوێ؟ بۆچی دەستم لە کۆڵ ناکەنەوە، دیقتان پێکردم.

خاوەنی مافوورە شڕەکە ئەو قسانەی دەکرد و تۆمەتباریش وەک ئاژەڵێکی بەستەزمانی لە داو کەوتوو وابوو. لە وەڵامی سەرۆکی دادگادا ڕووداوەکەی لە نووکەوە گێڕایەوە. سەرەڕای ئەوەی هەموو شتێک ڕوون و ئاشکرا بوو، دادیار لە جێی خۆی هەستا و وەک دوێنی دەستی کرد بە چەنەوەری و بە هێنانەوەی بەڵگە و دەلیل دەیویست تۆمەتبار بخاتە داوەوە.

بەڵام تۆمەتباری قوڕبەسەر خۆی لە داوکەوتووە و بەدەندووک پێوەبوو. دادیار لە کۆتایی وتەکانیدا گوتی:

ـ دزییەکە لەماڵێک کراوە و تۆمەتبار قوفڵی ئەمبارەکەی شکاندووە و چۆتە ژووریێ، کەوایە دەبێ بە توندترین شێوە سزا بدرێ.

پارێزەری بە سوخرە گیراو بەم شێوەیە بەرەڤانیی خۆی ڕاگەیاند:

ـ ئەو ئەمبارەی کە مافوورە شڕەکەی تێدا بووە، ئاوەدان نەبووە و بریگرتەی چارەڕەشی من نە پیاوکوژە و نە دوژمنی کۆمەڵگایە.

سەرۆکی دادگا دیسان هەڵیدایە و ئەو بابەتانەی بۆ لیژنەی داوەران بەیان کرد کە لە کاتی لێپرسینەوەکەدا هاتبووە گۆڕێ.

نۆخلیدۆڤ کە بە چاوێکی نوێ لە دنیای دەڕوانی، بە گۆمی بیر و خەیاڵدا ڕۆچووبوو. بەو قسانەدا کە لەم کۆڕەدا بیستبووی بۆی دەرکەوت کە ئەو لاوە تۆمەتبارە لە منداڵییەوە هەژار و چارەڕەش بووە، پێنج ساڵ لە گارگەی بەرهەم هێنانی تووتن کاری کردبوو و لە کێشەی نێوان کرێکار و خاوەنکاردا، داری خەتا لە سەری ئەودا شکابوو و لە کارگەکە دەریانکردبوو. ماوەیەک بێکار و بێ پەنا و سەرگەردان خولابۆوە. وردەوردە پێی بۆ مەیخانە کرابۆوە و ئەو برە پاشەکەوتەی ساڵانێکی زۆر بەڕەنج و ئارەقە ڕشتنێکی زۆر بە دەستی هێنابوو،بە بای دادا. لە مەیخانە لەگەڵ قوفڵسازێکی مەیخۆر و نەخۆش ناسیاوی پەیدا دەکا کە کارەکەی لە دەست دابوو. دوای ئەوە جاروبار لە مەیخانە چاویان بە یەکتر دەکەوت. شەوێک کە هەردوو کیان سەرخۆش بوون، دەچن قوفڵی ئەمبارێک دەشکێنن و یەکەم شت کە وەدەستیان دەکەوێ هەڵیدەگرن؛ ئەم دوو دزە ناشارەزایە هەر ئەو شەوە بە مافوورە شڕەکەوە دەگیرێن و دان بە هەموو شتێکدا دەنێن. قوفڵسازەکە لە گرتووخانە دەمرێ و گەنجەکە دەبەن بۆ دادگا تاکوو لێپرسینەوەی لەگەڵ

بکرێ و سزا بدرێ؛ کۆمەڵگاش لە هەڕەشەی بوونەوەرێکی ئاوا مەترسیدار بەدوور بێ.

نۆخلیدۆڤ لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: «ئەم گەنجە هەژارەش وەک ماسلۆڤا بە مەترسییەکی گەورە دەزانن بۆ کۆمەڵگا، بەڵام کەسانێکی تەڕپۆش و بەرواڵەت ڕێزداری وەک ئێمە هیچ مەترسییەکیان بۆ کۆمەڵگا نییە. ئەو چارەڕەشە سزا دەدەن و ڕێز بۆ مرۆڤێکی هەوسباز و ماستاوچی و هەرزەی وەک من دادەنێن، بەڵام کێ چووزانی ئەم لاوە لە تەواوی ئەو کەسانەی لەم هۆڵی دادگایەدان، بۆ کۆمەڵگا بێ مەترسیتر نییە؟»

«شکی تێدانییە کە ئەم گەنجە خراپکارێکی شڕودڕ نییە. هەرکەسێک بکەوێتە بارودۆخی ئەوەوە، تووشی ئەو جۆرە کارانە دەبێ. بۆ ئەوەی ئەو کەسانە گومڕا نەبن و دەست بۆ دزی نەبەن. ڕێگایەک هەیە: ئەویش ئەوەیە دەبێ ئەم بارودۆخە گۆڕانی بەسەردا بێ.»

«ئێمە بە جێی ئەوەی گەندەڵکاری بنەبڕ بکەین، ئەمە کار و کردەوەمانە: یەکێک لەو چارەڕەشانە قۆڵبەست دەکەین و لە کۆمەڵگای دوور دەخەینەوە، دەیخەینە بەندیخانەوە تاکوو لەگەڵ سەدان قوربەسەر و چارەڕەشی تر ژیانی بە بێهوودەیی و بێکاری تێ بپەڕێ و لە بەندیخانەش ناهێڵین ڕووی ئاسوودەیی ببێنی، لەگەڵ خێڵی چارەڕەشانی دیکە بەرەو ئیرکووتسک[٢١] دووریان دەخەینەوە.»

---

21 - Irkoutsk شارێکە لە سیبیریا کە 5191 کیلۆمەتر لە مۆسکۆ دوورە و مەودای لەگەڵ ولادیۆستۆک 41 41 کێلۆمترە. بەر لە شۆڕش بەندیە دوورخراوەکانیان دەنارد بۆ ئەوێ. زیندانیە سیاسییەکان وەک دێکابرسیتەکان و لایەنگری ڕێکخراوی ئازادیی گەل و بلشۆڤیکەکانیش بۆ ئەوێ دوور دەخرانەوە.

«ئێمە بۆ گۆڕانی ئەو بارۆدۆخەی کە ئەو چارەڕەشانە لە داوێنی خۆیدا پەروەردە دەکات هیچ هەنگاوێکمان هەڵنەهێناوەتەوە. بە پێچەوانە دەزگا جینایەت پەروەرەکان دەگرینە ژێر باڵی خۆمان و داکۆکی لە کار و کردەوەکانیان دەکەین. هیچ هەوڵێک بۆ چاکسازیی بارودۆخی گارگە و کارخانەکان نادەین. چایخانە و گازینۆ و بەستۆکەخانەکان بە ویستی خۆیان خەریکی کار و چالاکین و ئاوڕیان لێنادەینەوە. چونکە پێمان وایە ئەم شتانە لە کۆمەڵگاکەماندا چەقیان بەستووە و ناتوانین وازیان لێ بێنین و دەبێ هەر بین.»

«بەو کارانە ئێمە هەزاران جینایەتکار دروست دەکەین و دەینێرینە نێو کۆمەڵگاوە و کاتێکیش یەکێک لە خراپکاران دەکەوێتە چنگمان، لە خۆمانی دەتارێنین و بە دوورخستنەوەی بۆ ئێرکووتسک، پێمان وایە ئەرکی سەرشانی خۆمان بەجێ هێناوە و شوێنی نیشتەجێ بوونمان بەتەواوی بۆ دابین کردوون.»

نۆخلیدۆڤ پەردەی بەرچاوی لادرابوو. وەک دوێنێ لە نێوان عەمیدی خانەنشین و بازرگانی خۆشمەشرەفدا لە شوێنی لیژنەی داوەران دانیشتبوو؛ گوێی بۆ وتەکانی دادیار و پارێزەر شل کردبوو و دەیان پرسیار لە زەنیدا سەریان هەڵدەدا: «ئەو هەموو شانۆیە بەکاری چی دێ؟ ئەم هەموو مەرایی و دووڕەنگییە چ کەڵکێکی هەیە؟» بە چاوە تیژەکانی دەورانەدەوری هۆڵە بەشکۆکەی دەپشکنی: چلچراکانی، مێز و کورسییەکانی، جلوبەرگی شۆڕ و بەبریقوباق، کۆڵەکە و دیواری ڕازاوە و پڕ نەخش و نیگار لە ژێر سەرنجە تیژ و وردبینەکەیدا خەریک بوون کاڵ دەبوونەوە. حیسابی دەکرد کە ئەم بینا گەورە و بەشکۆیەی خانەداد و هەموو بیناکانی دیکەی ئیمپراتووریی ڕووسیا چ بووجەیەکی گەورە و گرانی ویستووە و ئاپۆرەی فەرمانبەر و قازی و پاسەوان و نامەبەر و خزمەتکاری جۆراوجۆر بۆ ئەم یارییە قۆڕ و گڵاوانە چ

خەرجێکی تووشی ئەم وڵاتە کردووە و چەندە مووچە وەردەگرن! «یانی وا باشتر نییە یەک لە سەدی ئەم هەموو خەرجی و هەوڵ و زەحمەتانە بۆ دابین کردنی بژیوی چارەڕەشان و لێقەوماوانی ئەم وڵاتە سەرف بکرێ و کاتێک ئەو هەژار و بێ ئەنوایانە بۆ کارکردن لە گوندەوە دێن بۆ شار یارمەتییان بدەین و دەستیان بگرین؟»

لەو بوارەدا هەروا بیری دەکردەوە: «ئەو کاتەی کە ئەم گەنجە هەرزەیە، بێکار و سەگەردان بوو، کێ بە هانەیەوە چوو؟ کاتێک بەڕیدە و بێ ئەنوا پەنای بۆ مەیخانەکان دەبرد و پیاڵەی لە پیاڵەی هەژار و لێقەوماوان دەدا، کێ دەستی گرت و خستە سەر ڕێگای ڕاست؟ ئەگەر لەو کاتەدا مرۆڤێکی دڵسۆز و تێگەیشتوو ئاوڕی لێ بدابایەتەوە و پێی بگوتبایە: ئیڤان! ئەو کارانە ئاکامێکی خراپی هەیە!... ڕەنگە ئەو گەنجە لە خەوی غەفڵەت ڕاپەڕیبایە و تووشی ئەو ڕێگا ڕەش و چەوتە نەبووبایە.»

«لەماوەی ئەو هەموو ساڵەدا هیچ کەس ئاوڕێکی بەخێری لێ نەدایەوە و بەرەو ڕێگای ڕاست پەلی نەگرت. لەم شارە قەرەباڵغەدا وەک ئاژەڵ هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرد. سەریان لەبندا دەتاشی بۆ ئەوەی ئەسپێ تێی نەدا. هیچ کەس هەمیەتی پێنەدەدا. شەو و ڕۆژ خاوەنکاران دەیان چەوساندە و شیلەی گیانیان دەمژی و لەگەڵ ئەوەشدا فێریان دەکرد چۆن درۆ بکات،جنێو بدات و مەشروب بخواتەوە، دەست بوەشێنێ و دەستی لێ بوەشێنن، چۆن فێری لاتی و بەرەڵڵایی بێت؟ هانیان دەدا بۆ کاری ناحەز و خوێڕییانە و دوای ئەوەی شیلەی گیانیان کێشا و برستیان لێبڕی، لە کارگە دەریانکرد و بوو بە ئاوارە و وەیلانی کۆڵان و شەقام و کاتێک ژان بە ئێسکی گەیشت و برسییەتی وای لێکرد قوفڵی دەرگای ئەمبارێک بشکێنێ و مافوورە شڕێک بدزێ، گرتیان و دایانە دەستی ئێمە تاکوو ببینە قازی و

دادوەر و سزای بدەین. ئێمە کە سامان و ناو و ناوبانگمان هەیە خۆمان بە مرۆڤێکی خاوەن ژیار و خوێندەوار دەزانین، قەت بیرمان لەوە نەکردۆتەوە کە ڕیشەی ئەو کارانە بدۆزینەوە و تێبگەین بۆچی دەیان و سەدان کەس کەوتوونە ئەو بارودۆخەی ئەوەوە و سەریان لێشێواوە؟ ئێمە کە بەجێی بیرکردنەوە و بە خۆدا چوونەوە، ئەو سزا دەدەین و دەخەینە بەندخانە و بۆ تاراوگەی دەنێرین، یان گێژ و گەمژەین، یان دڵرەق و خوێنمژ! هەرچییەکیش بین جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە. بە هەرحاڵ ئێمە ئەومان بۆ ئێرە پەلکێش کردووە و لە ڕاستیدا ئەوە ئێمەین کە خەریکین ئەو بەرە و هەڵدێرێکی ڕەشتر پاڵ پێوە دەنین.»

نۆخلیدۆڤ گوێی نەدایە کاروباری ئەو دانیشتنە و کاری بەسەریەوە نەبوو. پەردەکانی بەر چاوی لادرا بوون. هەموو ڕاستییەکانی دەدی و ترس خۆی لە گیانی دەهاڵاند. لەوەش سەری سوور مابوو کە بۆچی هەتا ئێستا لەو ڕاستییانە تێنەگەیشتووە؟ هەروەها بۆچی خەڵکیش ئەو ڕاستییانە نابینن؟!

## سی و پێنج

چەند خولەک وچان ڕاگەیاندرا. نۆخلیدۆڤ لەوێ ڕۆیشت و ئیتر بڕیاری دا لەو کۆڕ و دانیشتنانەی دادگادا بەشداری نەکات. «هەر حوکمێک دەرکەن و هەر سزایەک بە سەر ئەو داماوەدا بسەپێنن گرنگ نییە! نامەوێ بەشداری ئەو هەموو جینایەت و ناعەداڵەتییەی لێژنە داوەران و قازییەکان بم! نامەوێ لەو یارییە چەپەڵ و ترسناکەدا ڕۆڵێکم هەبێ!» ڕۆیشت بۆ نووسینگەی دادیار. نووسیارەکەی گوتی: «جەنابی دادیار کاتی ئەوەی نییە چاوی بە هیچ

کەس بـکەوێ.» نۆخلیـدۆڤ ڕێگـایەکی باشـتری بـۆ چـاوپێکەوتنی دادیـار دۆزیـیەوە. لە دالانەکە پێشـخزمەتێکی بانـگ کـرد و پەیـامێکی پێـدا نـارد بـۆ دادیـار و تێیدا نووسیی کە یەکێک لە ئەندامی لیژنەی داوەرییە و دەیـهەوێ بـابەتێکی زۆر گرینگـی لەگەڵ بێنێـتە گـۆڕێ. ناوبـانگی کۆنـت و قەڵافەت و تەڕپۆشـییەکەی کـاری خـۆی کـرد. لەگەڵ ئەوەشـدا دادیـار زۆر وشـک و بە شێوەیەکی فەرمی وەریگرت.

- چی ڕوویداوە؟

ـ مـن ئەنـدامی لیـژنەی داوەریـم. دەمەوێ چـاوم بە بەنـدییەک بە نـاوی ماسلۆڤا بکەوێ.

سـوورهەڵگەڕابوو. سـەرەتای ژیـانی نـوێی ئەو بـوو. دادیـار پیـاوێکی چاوزیـت و ڕەنـگ بزرکـاو، مـووی سـەری کـورت و ماشـوبرنجی و ڕیشـی دووفلیقانە بوو.

ـ گوتت ماسلۆڤا؟ نـاوەکەیم لە بیرە. ئەم ژنە بڕیـار بـوو بە تـاوانی پیـاو کوشـتن بـدرێ بە دادگـا. مەبەسـتتان لە چـاوپێکەوتن چیـیە؟ مـن دەبـێ لە مەبەستی ئێوە ئاگادار بم.

دادیار زۆر لەسەرەخۆ قسـەی دەکرد. نۆخلیدۆڤ بە پێچەوانەی ئەو جار لەگەڵ جار دەنگی بەرز دەکردەوە.

- دەبێ چاوم پێی بکەوێ. ئەم چاوپێکەوتنە بۆ من زۆر گرینگە.

ـ هێشـتا نـازانم پەروەنـدەکەی بە کـوێ گەیشـتووە. ئـێمە لێـرە زۆرمـان پەروەندە هەیە.

- دۆینێ لە دادگا چوار ساڵ زیندانییان بۆ بڕییەوە، بەڵام بێ تاوان بوو.

ـ ئەگەر دۆینێ دادگایی کرابێ دەبێ ڕاوەستی هەتـا کاروبـاریی ئیداریی پەروەنـدەکەی تەواو دەبـێ و حـوکمەکەی بە شـێوەی فەرمـی بە زینـدان

ڕادەگەیێندرێ. دوای ئەو لە ڕۆژانی دیاریکراودا دەتوانن چاوتان پێی بکەوێ؛ زۆر ناخایێنێ، چەند ڕۆژێک سەبر بگرە.

ـ من دەبێ هەرچی زووترە چاوم پێی بکەوێ.

نۆخلیدۆڤ لێوی دەلەرزی. هەستی دەکرد سەرقاڵی یەکەم تاقیکارییە و نابێ لە ڕاستوێژی بترسێ و پێی شەرم بێ. دادیار نێو چاوانی گرژ کرد.

ـ بۆ ئەوەندە بە پەلەی؟

ـ ئەو بێ تاوانە. ئەو نابێ بچێتە زیندان؛ تاوانباری ڕاستەقینە منم.

دەنگی دەلەرزێ. ئەوەی نەدەبوو بیڵێ، دەیگوت.

ـ بۆچی خۆتان بە تاوانبار دەزانن؟

ـ من یەکەم کەس بووم لە خشتەم برد و بوومە هۆی ئەوەی تووشی ئەو بارودۆخە نالەبارە ببێ. ئەگەر من فریوم نەدایە و تووشی گومڕاییم نەکردایە، کاری بەم جێگایە نەدەگەیشت.

ـ چاوپێکەوتنی چ کەڵکێکی هەیە.

دەمەوێ لەلای خۆی دان بە تاوانەکانمدا بنێم. ئەگەر ڕازی بێ ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێکدێنم. ئەگەر بۆ سیبیریا دووری بخەنەوە لەگەڵیدا دەچم . چاوی پڕ بوو بوو لە فرمێسک. دادیار بە سەرسووڕمانەوە چاوی لێدەکرد.

ــ ئەگەر قەستت ئەوە بێ مەسەلەکە جیاوازە. ئێوە دەبێ ئەندامی ڕێکخراوەی زێمستڤۆ کراسنۆپرسک[٢٢] بن.

دادیار گوشاری بۆ زەینی خۆی دەهێنا. ناوی کۆنت نۆخلیدۆڤی بیستبوو. کارە سەیر و سەمەرەکانی ئەو پیاوە لە نێوخەڵکدا دەنگی دابۆوە.

ـ جەنابی دادیار! پێموایە ئەو بابەتە پێوەندیی بە داخوازی منەوە هەیە.

---

22- Zemestvo krasnopersk لە ڕێکخراوە ئازادیخوازەکانی ئەو سەردەمە بوو کە تاقمێک لە خانەدانە مرۆڤدۆست و ڕووناکبیرەکان لەوێدا ئەندام بوون و چالاکییان دەنواند.

ـ ئەگەر مسەبایەک بگرن پسوولەیەکت بۆ واژۆ دەکەم کە بتوانی بچیتە زیندان. فەرموو دانیشە.

دادیار پسوولەکەی واژۆ کرد و دایە دەستی.

ـ داواکارییەکی دیکەشم هەیە. لەمەبەدواوە ناوی من لە ڕیزی ئەندامی لێژنەی داوەری بسڕەوە.

ـ خۆ ئاگاداری یاسا هەن؛ بۆ واز هێنان لەو کارە دەبێ بەڵگەی قایمت بەدەستەوە بێ.

ـ بەڵگەی من وەک ڕۆژ ڕوونە؛ بە بڕوای من ئەم دادگایە و تەواوی دادگاکانی دیکە بێ کەڵکن؛ هەروەها هەموو کارەکانیشیان بە پێچەوانەی ویژدان و ئینسانییەتە.

دادیار پێکەنینێکی شەیتانانەی نیشتە سەر لێوی. دەتگوت دەیهەوێ بڵێ لەو قسە پووچ و بێ مانایانەی زۆر بیستووە.

ـ چاوپۆشی لە قسەکانتان دەکەم. بابەتەکەی خۆشتان هەر چۆنێک بە باشی دەزانن بۆ مەقاماتی دادەوەریی بنووسن. دادگاش بۆ قەبووڵکردن و نەکردنی بەڵگە و هۆکارەکەتان دەستی ئاوەڵایە و بە غەرامەی نەغدی مەحکوومتان دەکا.

ـ هەر بڕیارێک بدەن بۆ من گرینگ نییە.

دادیار هەوڵی دەدا هەر چۆنێکە ئەو مرۆڤە سەرسووڕهێنەرە لە خۆی دوور بخاتەوە.

ـ هەرچۆنێک مەیلتان لێیە وابکەن حەزرەتی مەزن.

نۆخلیدۆڤ کاتێک لە نووسینگەی دادیار هاتەدەرێ، یەکێک لە قازییەکان هاتە ژوورێ. قەڵافەت و ڕواڵەتی ڕازاوەی کۆنت نۆخلیدۆڤ سەرنجی ڕاکێشا. ناو و ناسناوی ئەوی لە دادیار پرسی.

کۆنـت نۆخلیـدۆڤ بـوو. وێـدەچێ ئەنـدامی ڕێکخـراوەی زێمسـتڤۆ کراسنۆپرسـک بـێ. قسـەی زۆر سـەیری دەکـرد و تەواو تووشـی سەرسوورمانی کردم. وا دیارە ئەو بەڕێزە یەکێک لە ئەندامانی لێژنەی داوەری بووە. ژنێکی گەنج سزای زیندان و دوورخرانەوەی بۆ بڕاوەتەوە، ئێستاش هاتووە و دەڵێ من ئەو ژنەم لە خشتە بردووە و دەمەوێ زەماوەندی لەگەڵ بکەم.

ـ بەڕاستی جێی سەرسوورمانە.

ـ نازانی بە چ هەیەجانێکەوە قسەی دەکرد.

ـ زۆریش گەنج نەبوو.

ـ ئەم بیرۆکە گەوجانەیە کۆمەڵگا تووشی وێرانی دەکا و ئاڵۆزی پێکدێنێ.

ـ ئەم جۆرە کەسانە دەبێ قۆڵبەست بکرێن و بخرێنە بەندیخانەوە. بوونی ئەوانە بۆ کۆمەڵگا زیانبارە.

# سی و شەش

نۆخلیدۆڤ لە بینای خانەی داد هاتە دەرێ و چوو بۆ گرتووخانەی کاتی. ماسلۆڤا لەوێ نەبوو. سەرۆکی گرتووخانە گوتی ڕەنگە ئەویان هەر لە سەرەتاوە بردبێت بۆ زیندانی ناوەندی. نۆخلیدۆڤ بەبێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدات ڕۆیشت بۆ ئەوێ.

ماسلۆڤا لەوێ بوو. دادستان لە بیری بوو شەش مانگ لەمەوبەر تاقمێکی زۆریان لە تێکۆشەرانی سیاسی قۆڵبەست کردبوو کە زۆریان خوێندکاری زانکۆ و پزیشک و کرێکار و مامۆستا و قوتابیی دواناوەندی بوون.

گرتووخانەی کاتی وەها پڕبووبوو جێگا نەبوو. بۆیە ماسلۆڤایان هەر لە سەرەتاوە ناردبوو بۆ زیندانی ناوەندی.

گرتووخانەی کاتی زۆر لە زیندانی ناوەندی دوور نەبوو. هەوا تاریک داهاتبوو کە نۆخلیدۆڤ گەیشتە ئەوێ. بینای زیندانەکە بەرز و گەورە و دڵتەزێن بوو. لەبەر دەرگاکە پاسەوانێک کێشکی دەدێرا. لە سەر داوای کۆنت لە زەنگی دەرگاکەی دا. پاسەوانێک دەربیجەی دەرگاکەی کردەوە. چاوی لە پسوولەکە کرد و گوتی ئێستا کاتی سەردان نییە؛ مەگین سەرۆکی زیندان ئیزن بدات. نۆخلیدۆڤ بە ناچاری چوو بۆ ماڵی سەرۆکی زیندان کە دیوار بە دیواری بەندیخانەکە بوو. لە قاڵدرمەیەک وەسەرکەوت.لە پشت دەرگاکەوە دەنگی مۆسیقا دەهات. کەسێک پیانۆی دەژەنی. ژنێکی خزمەتکار کە چاوێکی بە تەنزیلێک بەستبوو، دەرگاکەی کردەوە. دەنگی پیانۆکە لە ژوورەکەی ڕووبەڕووەوە دەهات. ژنیارەکە یەکێک لە ڕاسپۆدییەکانی فرانتێس لیستی[23] دەژەنی. هێندی جاریش فاڵژ بوو. سۆراخی سەرۆکی زیندانی لە خزمەتکارەکە گرت.

ـ هێشتا نەهاتۆتەوە بۆماڵێ؟

ـ کەنگی دەگەڕێتەوە؟

ـ دەبێ بچم بپرسم.

ڕاسپۆدیی لیست چەند چرکەیەک ڕاوەستا. دەنگی کچێک لەو ژوورەوە هاتە گوێ.

ـ باوکم وێناچێ بەم زووانە بگەڕێتەوە.

کچەی ژەنیار کونچکاو بووبوو. لە جێی خۆی هەستا و هات بۆلای دەرگاکە. نۆخلیدۆڤ قژ ئاڵۆز و ڕەنگ بزرکاو بە چاوانی خەمبار و مەیلەوشینەوە لەوێ ڕاوستا بوو.

---

23 - فرانتێس لیست F. Liszt (6881 ـ 1181) ئاوازدانەری بە ناوبانگی مەجارستانی.

ـ فەرموون، چکارێکت بە باوکمە؟

ـ دەمەوێ چاوم بە زیندانییەک بکەوێ.

ـ حەتمەن زیندانییەکە سیاسییە! ها؟

ـ نا، سیاسی نییە. مۆڵەتم لە دادیار وەرگرتووە.

ـ نازانم باوکم کەنگێ دەگەڕێتەوە. لەگەڵ نایبی بەندیخانە قسە بکە. هێشتا لە نووسینگەکەیەتی.

نۆخلیدۆڤ سپاسی لێکرد و بەقاڵدرمەکاندا داگەڕا. هێشتا دەرگای ماڵەکە دانەخرابوو کە دەنگی پیانۆ دیسان بەرز بۆوە. ئەم ڕاسپۆدییە شاد و دڵبزوێنە بە هیچ جۆرێک لەگەڵ پانتای خەمباری زیندان سازگار نەبوو؛ بەڵام کۆنت تەنیا لە بیری ماسلۆڤادا بوو و سەرەنجی ئەو ناسازگارییانەی نەدەدا. لە حەوشەی پاڵ بەندیخانەکەدا ملازمێکی گەنج و سمێڵ زلی دی و شوێنی نایبی زیندانی لێپرسی. بۆی دەرکەوت نایب خۆیەتی. پسوولەکەی پیشاندا.

ـ ئەم پسوولەیە بۆ گرتووخانەی کاتی نووسراوە و لێرە هیچ بایەخێکی نییە. سبەینێ کاتژمێر دەی بەیانی وەرەوە، ڕۆژی ملاقاتە. دەتوانی لە شوێنی ملاقەت یان ئەگەر سەرۆک ڕێگەت بدا لە ژوورێکی تر چاوت پێی بکەوێ.

چاری نەما. دوای ئەو هەموو هەڵات هەڵاتە بێ ئاکامە لەوێ ڕۆیشت. دڵی پڕ بووبوو. خەمبار و دڵ کەیل ڕێگای ماڵێی گرتەبەر. ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە بەزەینیدا تێدەپەڕین. ئاخافتن لەگەڵ دادیار و هاتوچۆکانی دیکەی وەبیر دەهاتەوە. کەوتبووە دڵەکوتێ. کاتێک گەیشتەوە ماڵێ دەفتەری یادداشتەکانی ڕۆژانەی هەڵگرت کە ماوەیەکی زۆر بوو لێکی نەکردبۆوە. سووچێکی ژوورەکە تۆزی لێ نیشتبوو. چەند دێڕی تێدا نووسی، وەک ئەوەی پێویستی بە نووسین بێ:

«دوو ساڵە هیچم لەو دەفتەرەدا نەنووسیوە. پێموابوو ئیتر دەست بۆ ئەو کارە منداڵانەیە نابەم. بەڵام ئەمڕۆ پێوستیم بەوەیە لەگەڵ خۆمدا بدۆیم و باشترخۆم

بناسم. لەم ساڵانەدا هەموو شتێک لە قووڵایی ڕۆحمدا قەتیس مابوو. دەرفەتی ئەوەم نەبوو بپەرژێمە سەر خۆم و بە خۆمدا بچمەوە. ڕۆژی بیست و هەشتەمی ئاڤریل ڕووداوێکی تاڵ ڕایچڵەکاندم. ئەندامی لێژنەی داوەریی دادگایەک بووم و دوای چەندین ساڵ کاتیۆشام بە جلوبەرگی زیندانەوە لە سەر کورسیی تۆمەتباران دی؛ هەر ئەو کاتیۆشاکە ڕۆژێک لە خشتەم بردبوو. لەو دادگایە هەڵەیەک ڕوویدا کە زیاتر خەتای من بوو و ئەو بێچارەیە سزای زیندان و دوورخرانەوەی بەسەردا سەپێندرا. ئەمڕۆ چووم بۆ لای دادیار و مۆڵەتنامەیەکم وەرگرت کە لە زیندان چاوم پێی بکەوێ. دەمهەوێ ببینم، دەستەوداوێنی بم و داوای لێبوردنی لێبکەم،ئەگەر ڕازیش بوو ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێک بێنم. خودایە، خودای مەزن! ئێستا کە ڕۆحم لێوڕێژە لە شادی و هەیەجان بگەفریام و یارمەتیم بدە!»

# سی و حەوت

ئەوشەوە ماسلۆڤا خەو نەچووە چاوی. لە سەر پێخەفەکەی ڕاکشابوو و چاوی لە دەرگاکە بڕیبوو. کچی جانکوش هەروا بە نێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. ئەوانی دیکە لە حەوساڵان ڕاست بووبوونەوە و پرخەیان ژوورەکەی داگرتبوو. ماسلۆڤا بە گۆمی بیر و خەیاڵدا ڕۆچووبوو. «ئەگەر دوورم بخەنەوە بۆ ساخالین یان شوێنێکی دیکە، ئامادە نیم شوو بە هیچ کەس بکەم. بەڵام وا باشترە لەگەڵ کەسێک کەینوبەین ساز کەم؛ بۆ وێنە لەگەڵ سەرۆکێک، فەرمانبەرێکی خانەی داد، یان سەربازێک. جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە! پیاوان هەمیشە حەز بە پلە گۆشت دەکەن!» وەبیری هاتەوە کە پارێزەر و نووسیاری دادگا و دادیار چۆن خەریک بوون بە چاو هەڵمەقووتی بکەن،

لە دالانەکەش فەرمانبەرانی خانەی داد چۆن لە دەوری ملۆمۆیان دەکرد. بێرتا، خزمەتکاری بەستۆکەخانە، ماوەیەک لەمەوبەر هاتبوو بۆ سەردانی گوتبووی خوێندکارێکی زانکۆ کە پێشتر دەهات بۆ ماڵی مادام کیتایڤا و ئاشقی ئەو بوو، هەموو ڕۆژێک دێت و هەواڵت دەپرسێ. نانەوای زیندانەکەی وەبیر هاتەوە کە ئەوی لە دوورەوە دیتبوو و هێندێ جار نانی زیادیی بۆ دەنارد. زۆر شتی دیکەشی وەبیر هاتەوە. بیری لە هەموو شتێک دەکردەوە جگە لە نۆخلیدۆڤ. کەمتر بیری لە سەردەمی منداڵی و تافی لاوی دەکردەوە. ئەوەی قەت بە بیر و زەینیدا نەدەهات، بیرەوەریی یەکەم خۆشەویستیی بوو. ئەم بیرەوەرییە تاڵە هەمیشە لە زەینی دەپەڕی. دەتگوت ئەو بیرەوەرییەی لە قووڵایی ڕۆحی خۆیدا و لە سووچێکی تاریکدا پووشبەسەر کردووە و تەنانەت لە دنیای خەون و خەیاڵیشدا ناچێتەوە سەری.

لە دانیشتنەکەی دادگادا نۆخلیدۆڤی نەناسیبۆوە. دوایین جار ئەوی بە جلوبەرگی سەربازییەوە دیتبوو، بە ڕیشی تاشراو و سمێڵی قەیتانی و قژی کورت و لوولەوە. ئێستا دە ـ دوازدە ساڵ بە سەر ئەو کاتەدا تێپەڕیبوو. کۆنت نۆخلیدۆڤ ڕیشی هێشتبۆوە و زۆر گۆڕابوو. ڕەنگە گۆڕانی ڕواڵەتیش زۆر نەبووبێ؛ گرینگ ئەوەیە ماسلۆڤا چاوەڕوانیی ئەوەی نەبوو لە هیچ سووچێکی دنیا چاوی پێی بکەوێ و ئەوەی لە بیرەوەریی ئەودا مابۆوە لە شەوێکی تاریک و سامناکدا نێژرابوو. ئەو شەوەش کە بڕیار بوو نۆخلیدۆڤ لە بەرەگەی شەڕ بگەڕێتەوە و لابداتە ماڵی پوورەکانی و ماوەیەکی کورت لەوێ بمێنێتەوە؛ بەلام زۆر بە پەلە هاتبوو ورۆیشتبوو.

هەتا ئەو شەوە هێشتا بە هیوابوو چاوی پێی بکەوێتەوە. بوونەوەرێکی چکۆڵەی لە زگی خۆیدا هەست پێدەکرد و هێندێ جار زۆر بە توندی دەجوولایەوە. بە بوونی ئەو هەستی بە چێژێکی ڕۆحی دەکرد؛ بەلام دوای ئەو

شـەوە، هەمـوو شـتێک گۆڕانی بەسـەردا هـات. تەنـانەت بـوونی ئەو منداڵەشـی بە سەربارێک دەزانی. کە قورساییەکەی لەوانە بوو بڕستی لێ ببڕێ.

ئەو شەوە هەردوو پوورە خانم چاوەڕوانی هـاتنی برازاکەیـان بـوون. لە کـاتی گەڕانەوەی بـۆ پترزبـۆرگ چەنـد شـەو لە لایـان بمێنێتەوە، پاشـان ئەو تێلگەڕافـی کردبـوو کە دەرفەتـی مـانەوەی نییە و دەبـێ بە زووتـرین کـات خـۆی بگەیێنێتەوە یەکە سـەربازییەکەی، بـۆیە نـاتوانێ لە لای ئەوان لابـدات. کاتیۆشـا دەیزانـی لە کـاتژمێر چەنـددا شـەمەندەفەر لە وێسـتگە نزیـک دەبێـتەوە، بڕیـاری دا بـۆ دیتنـی نۆخلیدۆڤ ـ ئەگەر بۆ چەند خولەکیش بێ ـ خۆی بگەیێنیێتە وێستگە.

شەمەندەفەر کـاتژمێر دووی نیوەشـەو دەگەیشـتە وێسـتگە. کاتیۆشـا دوای ئەوەی جێوبانی خانمەکانی ئامادە کرد، جلوبەرگی پۆشـی و جزمە کۆنەکانی لەپێ کرد، لەچکەکەی لە بەرملی توند کرد و بەهەڵەداوان بەرە و وێستگە ملی ڕێی گرت. ماشـا،ئەو کچۆڵەی دایکی ئاشـپەز بـوو، پێ بە پێی ئەو هەنگاوی دەنا.

شەوی پاییز بوو. باران و لەنگێزە بـوو. تاوێـک دەبـاری و تاوێـک خۆشـی دەکـردەوە. بە نێـو کێڵگەیەکـدا نێوبڕیـان لێـدا. دۆزیـنەوەی ڕێگـا کـارێکی دژواربـوو. گەیشـتنە لێرەوارەکە، وڵات کرۆبێـدەنگ بـوو. کاتیۆشـا شـارەزای ڕێگاکە بوو. بە هیوابوو بەرلە گەیشتنی شەمەندەفەر خۆی یگەیێنێتە وێسـتگە. بەداخەوە درەنگ گەیشتنێ و شەمەندەفەر خەرێک بوو وەڕێدەکەوت. هـۆڕنی دووهەمی کێشا بوو و لەگەڵ سێیەمین هۆڕن وەرێدەکەوت.

کاتیۆشـا هەڵـدەهات و دانە بە دانە چـاوی قەمارەکـان دەکـرد. ئەوی نەدەدی. لە سـەر کورسـییەکی مەخمەرپـۆش دوو مـلازم بەرەوڕووی یەکتـر دانیشـتبوون. و پاپەزێنیـان دەکرد. نۆخلیـدۆڤ پـانتۆڵێکی تەنگی لەپێدا بـوو لەگەڵ کراسـێکی سـپی. قاقـای دەکێشـا و پێـدەکەنی. کاتیۆشـا بە دەسـتی سـڕ و لە گۆکەوتـووی لە

پەنجەرەکەی دا. هۆڕنی سێیەم لێدرا. شەمەندەفەر جووڵەیەکی بۆ دواوە کرد و وردەوردە وەرێکەوت. کاتیۆشان لەگەڵ شەمەندەفەرەکە هەڵدەهات و بە دەست ئاماژەی دەکرد. شەمەندەفەرەکە خێرایی زیاتر دەبوو و کاتیۆشاش خێراتر هەنگاوی هەڵدێنایەوە. چاوی لە جامەکان بڕیبوو. هاوڕێکەی نۆخلیدۆڤ هەستا شووشەی پەنجەرەکە داکێشێ. قەوەی پێی نەشکا. کۆنت هەستا و بە هاوکاریی یەکتر جامەکەیان داکێشا. لەوکاتەدا، شەمەندەفەر خێراییەکی بە تەواوی زیاد کردبوو و کاتیۆشا هەرچی هەوڵی دەدا پێی نەدەگەیشتەوە و ئیتر وەدووکەوتنێ کەڵکی نەبوو. چاوەدێری شەمەندەفەرەکە ترسی بوو کچە بکەوێتە مەترسییەوە کە ئاوا بە دوای شەمەندەفەرەکەدا هەڵدەهات، بۆیە هاواری دەکرد بڕواتە دواوە، بەڵام کاتیۆشا گوێی بە هەراوهاواری ئەو نەدەدا. هەروا هەڵدەهات. شەمەندەفەر لە ژێر ساباتی وێستگە چووە دەرێ و کاتیۆشا بە سەر زەویی خووساو و باران لێدراودا هەروا هەڵدەهات. وردەوردە شەمەندەفەرەکە دوور کەوتەوە و تەنیا چراسوورەکانی دواوەی دیاربوون. بایەکی توندی دەهات و لەچکەکەی کاتیۆشا لە سەری بۆوە و بابردی. تەنوورەکەی بەدەم باوە دەشەکایەوە. قژی ئاڵۆزابوو. ماشای وردیلە بەدوایدا هەڵدەهات و هاواری دەکرد:

- لەچکەکەت با بردی.

هەڵاتن بێ کەڵک بوو، تۆزێ ڕاوەستا. «ئیتر بەدووکەوتنی بێ کەڵکە. ئەو لە سەر کورسیلەی مەخمەر پۆش دانیشتووە یاری دەکا و پێدەکەنێ. بەڵام من لە نێو قوڕ و چڵپاودا خووساوم و بەو باران و لەنگێزەیە بەدوای شەمەندەفەردا ڕادەکەم!» ماشا توند دەستی کاتیۆشای گرتبوو و نەیدەهێشت بڕوا بەڵام ئەو زووڕەزووڕ دەگریا.

کچە ترسا بوو. خۆی بە تەنوورە خووساوەکەیەوە نووساندبوو و لێی دەپاڕایەوە کە زووتر بگەڕێنەوە بۆ ماڵێ. کاتیۆشا لە بیری ئەوەدا بوو هەر

لەویَ ڕاوەستی هەتا شەمەندەفەرێکی تر دێت و خۆی بهاوێتە ژێر تایەکانی. جموجۆڵی منداڵەکەی نێو هەناوی هەست پێدەکرد. دەتگوت ئەو گیانلەبەرە وردیلەیە لەقە لە زگی دەدات و پێی دەڵێ بیری خۆکوژی لە مێشکی دەربـاویَ. تـۆزیَ ئـارام بـۆوە. جلەکـانی ڕێکوپێـک کـرد. لەچـکە تەڕ و قـوڕاوییەکەی هەڵگرتەوە و دەستێکی بە سـەروقژە ئاڵۆز و خووساوەکەیدا هێنـا. دەستی ماشـای گـرت بەرە و مـاڵیَ ملـی ڕێیـان گـرت. دوای سـەعاتێک گەیشـتنەوە مـاڵیَ و ڕووداوی ئەو شــەوە کـاریگەرییەکی قورسـی لە سـەر ڕۆحـی دانـا و خوڵقوخـووی گـۆڕی. ئەوشـەوە سـەرەتایەک بـوو بـۆ ئەوەی تووشی ئەو بارودۆخە ئاڵۆزە بیَ. لەو شـەوە بە دواوە ئیتر ئیمانی بەهەق و عەداڵەت نەمـا. هەتـا ئەو کـاتە دنیـای بە چـاوێکی تـر دەدی، بەڵام لەو شـەوە بەدواوە هەق و عەداڵەتـی بە درۆ و فڕوفیشـاڵ دەزانـی. ئەو پیـاوەی خۆشەویستی بـوو، دەستی لـیَ بەردابـوو و دوای کەیـف و نەهەنگـی خـۆی کەوتبوو. لە لایەکیشـەوە دەیزانـی ئەو پیـاوە لەوانـی دیکە باشـترە و پیـاوانی دیـکە زۆر لە ئەو دڵڕەشـترن. دوای ئەوە ئەم بیرۆکـانە لە مێشـکیدا گـوورا و گیـانی داگـرت. هەردوو پوورەخـانم کە دیتیـان ئیتـر نـاتوانیَ وەک جـاران بە باشـی خزمەتیـان پێبکـا و شــەو و ڕۆژ ئـارەق بڕێـژیَ و ماندوونەناسـانە کاربکـات، لە مـاڵیَ وەدەریـان نـا. دوای ئەوە گەلـیَ بـوونەوەری سەیروسـەمەرەی ناسـی. ژنـان داویـان بـۆ نـایەوە و خسـتیانە نێـو باوەشـی پیـاوانی هەوەسبازەوە. پیـاوان، لە ئەفسـەری بـاڵای شـارەوانییەوە بگرە هەتـا پاسەوانی بەندیخانە، هەمـوو ئەویـان بـۆ خۆشـی و ڕابواردن دەویسـت و لەو سـاڵانەدا هـیچ کەسـی نەدی کە جگە لە بەرژەوەنـدیی خـۆی و چێـژ و هەوا و هەوەس بیـر لە شـتێکی تـر بکـاتەوە. نووسـەرێکی پیـر کە لە سـاڵی دووهەمـدا لەگەڵی ئاشنا بووبوو، زیاتر لە خەڵکی تـر ئەو فکـر و بیرۆکانەی پیَ تەڵقین

کردبــوو. ئەم پیــاوە هەوســباز و دەوڵەمەنــدە، وای پــێ ســەلماندبوو کە بەختەوەریی مرۆڤ تەنیا کەیف و چێژی جەستەییە و شیعر و هونەریش تەنیا ئەرکی ئەوەیە ئەو جوانی و چێژانە بەرجەستە بکات!

وردەوردە هاتەسەر ئەو باوەڕەی کە هەموو کەس دەبێ لە بیری چێژ و بەرژەوەندیی خۆیدا بێ و ئەوەی سەبارەت بە هەق و هەقیقەت گوتوویانە هەمووی فڕوفیشاڵە. ئەگەر کەسێکیش لێی بپرسیبایە بۆچێ دەبێ دنیا لە سەر ئەو تەوەرە بسووڕێتەوە کە هەمووان خراپ بن و بۆ ئازار دانی یەکتر هەوڵ بدەن، بە چ مەبەستێکیش دنیایەکی ئاوا پڕ لە ڕەنج و تاڵی دروست کــراوە؟ دەکەوتە گــۆمی فیکــرەوە، جگەرەیەکــی دادەگیرســاند، ڤۆدکــایەکی دەخواردەوە و لە باوەشی پیاوێک دەخزا و تەواوی باس و پرسیارەکانی پشت گوێ دەخست و لەبیری خۆی دەبردنەوە.

# سی و هەشت

ڕۆژی یەکشــەممە بــوو. کــاتژمێر پێنجــی بەیــانی لە خەویــان ڕاپەڕانــدن. کۆرابلڤاکە زووتر لە خەو هەستابوو، ماسلۆڤای خەبەر کردەوە.

ماسلۆڤا دەستێکی بە چاویدا هێنا و باوێشکێکی دا. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشــا و هەوای بــۆگەنی بەنــدەکە ســیپەلکی پــڕ کــرد. زۆر پەرێشــانتر لە ڕۆژانی ڕابردوو چاوی لە دەوروبەری خۆی کرد. هەتا دوێنێ چارەنووسی نادیــار بــوو، بەڵام لە ئەمــڕۆوە خــۆی بە مەحکــووم دەزانــی. حەزی دەکــرد دیســان بخەوێتەوە و پەنــا بــۆ دنیــای بــێ خەبەری بەرێ؛ بەڵام تــرس لەخەو بەهێزتــر بــوو. لە جێی خــۆی هەســتا. هەمــوو هەســتا بــوون. تەنیــا منداڵەکان

خەتبوون و ئەو ژنەی کە بەتاوانی فرۆشتنی مەشرووب گیرابوو، لە سەر هەست بوو کە کەسێک منداڵەکەی لە خەو هەڵنەستێنێ. ژنێکیش کە تاوانەکەی ئاژاوەگێڕی بوو، لەبەر سۆبا کۆنەکە منداڵە بەرمەمکانەکەی وشک دەکردەوە و لە باوەشیدا ڕایدەژەند و دەیویست ژێری بکاتەوە. ژنە سیلدارەکەش دەستی بە سینگی خۆیەوە گرتبوو و هەناسەسواری وەنیخەنیخی خستبوو. ژنە قژسوورەکەش بەڕاکشانەوە خەونەکەی شەوی ڕابردووی بە دەنگی بەرز دەگێڕایەوە. ئەو پیرێژنەی بە تاوانی سووتمانی ئانقەست دەستبەسەر کرابوو، لەبەر خاچەکەدا چۆکی دادابوو و دۆعای دەخوێند. کچی جانکوشی کلیسا لە سەر تەختەکە دانیشتبوو. هێشتا خەوبەری نەدابوو. ژیکەڵەش قژە زبر و ئاڵۆزاوەکەی لە قامکی دەهاڵاند.

لە نێو داڵانەکەوە دەنگێک هات. کلیل لە قوفڵی دەرگاکەدا سووڕا، دوو پیاوی بەندی کە دەرەلینگی پانتۆڵەکانیان هەڵکردبوو، خۆیان کرد بە ژووریدا و سەتڵی زباڵەکەیان هەڵگرت و بردیانە دەرێ. ژنەکانیش لە بەندەکە هاتنە دەرێ و چوون دەست و دەموچاویان بشۆن و دیسان ژنە قژسوورەکە لەگەڵ ژنێکی بەندەکەی تەنیشتیان تێک هەڵچوون و گوڕە و هاوار و جنێویان داڵانەکەی داگرت. پاسەوانێک هاتەپێشێ و مشتێکی لە بۆقەتە ملی گۆشتنی قژسوور ڕاکێشا و زرمەکەی لەو داڵانەدا دەنگی دایەوە. بەڵام ئەو زەبرە توندە بۆ قژسوور وەک لاواندنەوە وابوو!

ـ مەگین گوێت لێ نییە ئەو واوالێکراوە چیم پێدەڵێ ؟

ـ دەمت داخە و زماندرێژی مەکە!...هەموو خۆتان ئامادە بکەن بۆ کلیسا.

ماسلۆڤا لەو ماوە کورتەدا دەستێکی بە سەر و قژی خۆیدا هێنا. نایبی زیندان و چەند ملازم هاتن بۆ بەندی ژنان. سەرپاسەوان فەرمانی دا هەموویان بەڕیز ڕاوەستن. ژنەکان لە نێو داڵانەکەدا بە دوو ڕیز ڕاوەستان.

ئەوانەی ڕیزی دووهەم دەستیان لە سەر شانی ژنەکانی ڕیزی پێشەوە دانابوو. حازر و غاییبیان کردن و دوو ڕیزەکە بە فەرمانی سەر پاسەوان بەرە و کلێسە کەوتنەڕێ.

ماسلۆڤا و فێدۆزیا لە نێوەڕاستی ڕیزەکەدا بوون. ژنەکان سەد کەس زیاتر بوون. هەموویان لەچکەی سپییان بە سەردا دابوو و فانیلە و تەنوورەی سپی لەبەردا. هێندێ جار لە نێویاندا یەک دوو کەسیان بە جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگەوە ئەو یەکسانییەیان تێک دەدا. ژنانی جلوبەرگ ڕەنگین ئەو دایکانە بوون کە لەگەڵ عەولادە مەحکوومەکەی خۆیان لە بەندیخانە دەژیان. ڕیزی ژنان بە پلیکانەکاندا داگەڕا. تەقوکوتی بە ئاستەمی کەوشەکانیان دەهات و هێندێ جار بە سرتە لەگەڵ یەک دەدوان و جاروباریش قاقاپێدەکەنین. لە سەر پێچی قادرمەکان ماسلۆڤا، دوژمنە دەمهەراشەکەی خۆی، واتە بوچکۆڤای دی و پیشان فێدۆزیای دا. زۆری لێ دوور نەبوو. لە خوار پلیکانەکان هەموو بێدەنگ بوون. خاچی خۆیان کێشا و چوونە نێو کلیساکەوە. تیشکی زێڕینی چلچراکان پانتایی کلیساکەی ڕووناک کردبۆوە. ژنەکان چوون بۆ شوێنی خۆیان. تێک ترنیجابوون و خۆیان پێکەوە نووساندبوو کە جێگەی هەموویان ببێتەوە. دوای ئەوان پیاوانی زیندانی هاتنە ژووری. ڕووپۆشی خۆڵەمێشییان لەبەردا بوو. دەستە دەستە هاتن و لە سەر کورسییەکانی دەستە چەپ دانیشتن. لە سەرووی تەلارەکەوە گرووپی سروودوێژان بە سەری تاشراوەوە ڕاوەستا بوون و بە زڕە لێ هێنانی زنجیرەکانیان ئامادە بوونی خۆیان ڕاگەیاند. ئەو قۆڵبەست کراوانەی هێشتا سەریان نەتاشرا بوو، لە پشت سەری حوکم دراوەکان دانیشتبوون.

کلیسای زیندان لەلایەن بازرگانێکی ساماندارەوە نۆژەن کرابۆوە. دەیان هەزار ڕۆبڵی تێدا خەرج کرابوو. چەند خولەک بێدەنگ بوون. تەنیا هێندێ

جـار چەنـد کەس چڵمەکەیـان هەڵدەلووشـییەوە و دەکـۆخین، یـان منـداڵێک دەیقیژانـد. زنجیرەکـان تیـک دەدران و زڕەیـان دەهـات. لەناکـاو جموجۆڵێـک کەوتە نێویان. بەندییەکانی نێوەڕاستی تەلار چوونە دواوە و هاتنەوە پێشێ و ڕێگاکەیـان کـردەوە کە سـەرۆکی بەنـدیخانە بتـوانێ بە نێویانـدا تێـپەڕێ و لە پێشیانەوە دانیشێ.

## سی و نۆ

ڕێوڕەسـمی پـاڕانەوە دەسـتی پێکـرد. هەر ئەو ڕێوڕەسـمە هەمیشـەییە؛ قەشـە بە جلـوبەرگی درێـژ و فشـوفۆڵ و زەڕی دۆزیـیەوە هـاتبوو بـۆ نێـو تەلارەکە،ورکەنـانی لە شـەڕاب هەڵدەکێشـا و دۆعـای دەخوێنـد. جانکوشـی کلیسە یەکبین دەپاڕایەوە و بە حینجە ئایەتی ئینجیلی دەخوێندەوە و ئامادە بووان هاودەنگ لەگەڵی دەیانخوێندەوە. گرووپی سرووودێژان کە ئەوانیش لە کەسانی حوکمدراو بوون، دەستیان پێکرد. هەموو دۆعاکان و سرووودەکان بە زمـانی ئیسـلاوی کـۆن[٢٤] بـوون و ئەوەی دەشـیانگوت لە مانـاکەی تێنەدەگەیشتن. سەرە ڕای ئەوەش، ڕستەکانیان لەبەر بوو و زۆر بە سادەیی و بە شێوەیەکی ئاسایی ئایەت و سرووودەکانیان دەخوێندەوە.. ئەوان بەزمانی ئەو ئایەتانەی کە خۆشیان نەیاندەزانی یانی چی، داوایان لە خودا دەکرد و لێی دەپاڕانەوە ئیمپڕاتۆر و بنەماڵەکەی بپارێزێ و ڕاوەستاویان بکات، ئەو بابەتەش چەندین جار دووپات کرایەوە. دوای ئەوە، جانکوشی کلیسا چەند ئایەتی لە «ئاکاری پێغەمبەران» بە ئاوازێکی ساختە و بێ تام خوێندەوە کە

24 ـ زمانی کۆنی ڕووسەکان کە لە کلیسای ئۆرتۆدۆکس بەکاریان دەهێنا.

هیچ کەس لێی تێنەدەگەیشت. قەشەش چەند بابەتی لە ئینجیلی مەرقەس بە دەنگی بەرز و وشەی داناردانار خوێندەوە، کە دەیگوت: عیسا مەسیح بەرلەوەی ڕۆحی بەرەو ئاسمانەکان بفڕی، لە پاڵ باوکیدا، واتە خوداوەندی مەزن، دانیشتووە. هەر لەو کاتەدا هاتە بەرچاوی مەریەمی مەجدەلییە و ڕۆحی حەوت شەیتانی لە دەوروبەری تاراند، دوای ئەو خۆی پیشانی یازدە حەواریی خۆی دا و فەرمووی کە ئینجیل فێری خەڵکی بکەن؛ فەرمووشی هەرکەس ئیمان بە ئینجیل نەهێنێ، گومڕایە و هەرکەس ئیمان بهێنێ ڕزگار دەبێ؛ هەروەها فەرمووشی هەرکەسێک سەرانشۆ بدرێ لە گومڕایی ڕزگاری دەبێ. فەرمووی خوداوەند هەرکەسێکی پێخۆش بێ وزە و توانای پێدەبەخشێ کە شەتیان لە خۆی تبارێنێ و بە دەستی ئەو نەخۆش و لەشبەباران شیفا بدا و بەهەر زمانێک کە بیهەوێ قسە بکات و ماری بڤە و ژاراوی بەدەست بگرێ و ژاری هەلا وەک شەربەت بنۆشێ.

قەشە بە خوێندوەی ئەو ئایەتانە دەیویست تێیان بگەیێنێ کە ئەو پیاوی خودایە و توانایی ئەوەی هەیە بە دۆعا نان و شەڕاب بکاتە گۆشت و خوێنی مەسیح. ئەگەرچی ئەو جلوبەرگە فش و پڕ زریقەوبریقەیە زۆری ئازار دەدا، بەڵام وەڕووی خۆی نەدەهێنا. لە پشت پەردەی مێحرابەکەوە، سەرەتا دەستی هەڵبڕی و دۆعای خوێند، پاشان بەرەوڕووی مێحرابەکە چۆکی دادا و هەموو دەوروبەری خۆی ماچ کرد. بە ئاکاری دیاریکراو وای دەنواند کە لەو ساتەدا دەیهەوێ بە نان و شەڕاب گۆشت و خوێنی مەسیح دروست بکات.

ئەم بەشەی شانۆکە شکۆیەکی سەیروسەمەرەی هەبوو. زایەڵەی دەنگی قەشە لە پشت پەردەی مێحرابەکەوە تەلارەکەی داگرت: «ئەی مەریەمی پیرۆز! ئەی پاکترین و پیرۆزترین و بەرەکەت بەخشترین....» هەر لەو کاتەدا سرووودوێژان هەوایەکی سەرفرازانەیان تێهەڵکرد کە تایبەتی ئەو کاتە بوو:

«ئەی مەریەمی پیرۆز! بێ ئەوەی دەستی نامەحرەم لە جەستەی پاکت بکەوێ، مەسیحت لە هەناوتدا پەروەردەکرد...» دوای ئەو دۆعا و پاڕانەوە و ئاوازە پڕشکۆیانە، قەشە سەرپۆشی لە سەر پەرداخە ئاڵتونییەکە لادا کە پڕ بوو لە شەراب. پەنچکێ نانی لە شەڕابەکە هەڵکێشا و نایە دەمییەوە، لە پشت پەردەکە هاتە دەرێ و لەگەڵ ئەوەی پەرداخێکی ئاڵتوونیی بەدەستەوە بوو، یارانی مەسیحی بانگ کرد بچنە پێشێ و لە خوێن و گۆشتی ئەو بخۆن. چەند منداڵ هاتنە پێشێ. ناوەکەیان دەپرسی و بە هێواشی پەنچکە نانێکی لە شەڕابەکە هەڵدەکێشا و دەیخستە دەمیانەوە. جانکوشی کلیسا دەمی سڕی و هەروا سروودی دەخوێند و منداڵەکانیش گۆشت و خوێنی مەسیحیان دەخوارد. دوای کۆتایی هاتنی ئەم بەشەی دۆعا و پاڕانەوەکە، قەشە پەرداخە ئاڵتوونییەکەی خاوێن کردەوە و خستیەوە سەر جێگاکەی خۆی و بە هەنگاوی ورد و بەگوڕ لە پشت پەردەکە هاتەدەرێ.

بەشی سەرەکیی پاڕانەوەکە کۆتایی هاتبوو. قەشە بۆ ئەوەی ئازاری دیلەکان کەم کاتەوە و زامی دڵیان ساڕێژ بکات، بەشێکی دیکەی بە دۆعا و پاڕانەوەکە زیاد کردبوو؛ لەهەمبەر وێنەی حەزرەتی مەسیحدا، کە بە دەموچاو و دەستی ڕەشەوە کێشرابۆوە، چۆکی دادا. شۆقی مۆمە داگیرساوەکان وێنەکەی ڕووناک کردبوو و هەمووان چاویان تیبڕیبوو. قەشە بە شێوازێکی زۆر ساختە، کە ئاوێتەیەک لە وتە و گۆرانی بوو، ئەم وشانەی بەدوای یەکدا ڕیزکرد: «عیسای مەسیح! بگە فریامان! ئەی عیسای ڕزگاریدەر! ئەی باشترینی باشەکان! شادی و هێمنایەتی بە ئەوێندارانت ببەخشە! کۆت و زنجیر لە پێی ئاشقان و لایەنگرانت داماڵە! ئەی عیسای ڕزگاریدەر! جوانی و خۆشییەکانی بەهەشت بە نسیبی ئەویندارانی خۆت بکە.»

تۆزێ بێدەنگ بوو، کورتە وچانێکی دا و بە دەست خاچی خۆی کێشا! قەشە و چانکوشەکان کڕنۆشیان برد و نێوچاوانیان نایە سەر زەوی. سەرۆکی

بەندیخانەش کڕنۆشی برد. پاسەوان و بەندییەکانیش داهاتنەوە. گرووپی سروودویژانیش کڕنۆشیان برد و زڕە و تەقوکوتی کۆت و زەنجیر تەلارەکەی داگرت. گرووپی سروودویژان هەوایەکی تازەیان دەسپێکرد و قەشە دۆعایەکی تازەی خوێند: «ئەی خولقێنەری فریشتەکان! ئەی بەتواناترینی بەتواناکان! ئەی مەسیحی خۆشەویست! ئەی مەسیحی زانا! ئەی مەسیح! ئەی ڕزگاریدەری باب و باپیرانمان، ئەی مەسیحی دڵسۆز و دلۆڤان! ئەی مەسیحی پاک و پیرۆز! ئەی مەسیحی سەربەرز و سەرکەوتوو! ئەی پارێزەری تاج و تەختەکان! ئەی دلۆڤان! ئەی کەماڵی پێغەمبەران! شەفیعی شەهیدان! مەسیحی خاکەڕا! مەسیحی مەزن! مەسیحی بەخشندە! ئەی بەخشندەی تۆبەکاران! ئەی پاکی بەخشی پارێزگارانی بەڕۆژوو! ئەی پاک! ئەی نەجیبترینی تاکەکانی مرۆڤ! ئەی مەسیحی نەمر و هەرمان! ئەی ڕێنوێن و ڕێنیشاندەری تاوانباران! ئەی کوڕی خودا! بەزەییت بە ئێمەدا بێ و ئاگات لێمان بێ!»

دیسان بێدەنگ بوو. وشەی مەسیحی جۆرێک دەردەبڕی و کێشی پێدێنا دەتگوت فیتوو لێدەدا. عەبا هەورێشمینەکەی تۆزی هەڵکێشا و دیسان لە هەمبەر وێنەی مەسیحدا چۆکی دادا. گرووپی سروودویژان، هەروا خەریکی چڕین بوون: «ئەی مەسیح! ئەی ڕۆڵەی خوداوەند! لەگەڵمان بەبەزەیی بە!» بەندییەکان چۆکیان دادا. زەنجیرەکە لاقە لەڕ و لاوازەکانی ئازار دەدان، زڕە و تەقوکوتی کۆت و زەنجیر بەرز بۆوە.

ئەم بەشە لە پاڕانەوە بە دووپاتکردنەوەی «لەگەڵمان بەبەزەیی بە!» کۆتایی پێهات و لەگەڵ پاڕانەوەیەکی تر بە هەوای ئەللێ لڤیا[٢٥]، بەندییەکانیش دوای هەر بەندێک لەو هەوایە، خاچیان دەکێشا و وردەوردە ئەم هەموو کڕنۆش و خاچ

25 ـ ئەللێ لڤیا Allelvia وشەیەکی عیبرییە «ستایشی یەهوود بکەن!» کەلیمییەکان و مەسیحییەکان بە دووپاتکردنەوەی ئەم وشەیە ڕێورەسمی گازە و پاڕانەوە بەجێ دێنن.

کێشانە ماندووی کردن و تەنیا لە کۆتایی سروودەکەدا خاچی خۆیان کێشا و قەشەش کە وەک ئەوان ماندوو بووبوو، هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵکێشا و ڕۆیشت بۆ پشت پەردەکە، دوای ساتێک دیسان هاتەوە و بۆ بەڕێوەبردنی دوایین بەشی پاڕانەوەکە، خاچێکی ئاڵتونیی گەورەی لە سەر مێزێک هەڵگرت و بردی بۆ نێوەڕاستی کلیساکە. سەرۆکی بەندیخانە هاتە پێشێ و خاچەکەی ماچ کرد، دوای ئەو جێگرەکەی و بەدوای ئەویشدا ئەفسەر و پاسەوان و بەندییەکان کە زەنجیرەکانیان زرەی دەهات، بۆ ماچ کردنی خاچەکە هاتنە پێشێ. قەشە هەروا کە خاچەکەی بە دەستەوە بوو، لەگەڵ سەرۆکی بەندیخانە قسەی دەکرد. هێندێک لە بەندییەکان دوای ماچ کردنی خاچەکە، دەستی قەشەشیان ماچ دەکرد و ئەو هەستی بە تەڕایی دەم و لووتیان دەکرد. بەم شێوەیە ڕێوڕەسمی دوعا و پاڕانەوە کۆتایی پێهات.

# چل

لە نێو ئەم کۆڕەدا، لە سەررۆکی بەندیخانەوە بگرە هەتا ماسلۆڤا، هیچ کەس بیری لەو ڕاستییە نەدەکردەوە کە گازە و پاڕانەوەیەکی ئاوا زۆر لە ڕاهێنان و ئاکاری مەسیح بەدوورە. مەسیح، ئەو مەسیحەی کە بەو هەیەجان و شەیداییەوە ناویان دەهێنا و قەشە ئەوی بەو هەموو شکۆ و تەنتەنەوە ستایش دەکرد، لە تەواوی ئەو کار و ڕەفتارانە بێزار بوو کە لێرە ئەنجام دەدران. مەسیح هیچکات نەیدەهێشت ئەوینداران و پێڕەوەکانی ئاوا خەریکی وڕێنە و هەڵسوکەوتی نالەبار بن. مەسیح دەیگوت، هیچ کەس مافی ئەوەی نییە خۆی بە پایەبەرز و خاوەن ئیختیاری خەڵکی بزانێ. مەسیح بتشکێن

بوو. بۆیە زۆریشی ڕق لە دۆعا و پاڕانەوەی نێو پەرستگەکان بوو. مەسیح دەیگوت من بۆ شکاندنی بت و ڕووخاندنی ئەو پەرستگایانە هاتوومە سەر دنیا. مەسیح دەیگوت، دەبێ خودا لە شوێنێکی خەڵوەت و دوور لەو پەرستگایانە ستایش بکرێ. مەسیح لە زنجیر خستنە دەست و پێی خەڵکی و ئەشکەنجە و ئازاردانیان بێزاربوو. مەسیح هەموو جۆرە دڵڕەقی و ئازار و بەدڕەفتارییەکی بەناڕەوا زانیوە و ڕیگەی پێنەداوە. مەسیح دەیگوت من بۆ ئازادی و ڕزگاریی گیرۆدە و دیلەکان هاتوومە سەر زەویی ئێوە!

لە نێو ئەو کۆڕەدا هیچ کەس ئاگاداری ئەو ڕاستییە نەبوو کە چۆک دادان لە هەمبەر مێحراب و ماچ کردنی خاچی زێڕینی ڕیشکودار، دوژمنایەتییە لەگەڵ دین و ڕاهێنانەکانی مەسیح. چونکە ئەو خاچە زێڕینەی کە بە ڕیشکۆی مینا ڕازاوەتەوە، هێمایەک لەو دارەیە کە مەسیحیان پێ لە خاچ دا؛ مەسیح بۆیە لە خاچ درا چونکە نەیاری دڵڕەشی و ئاکاری ناشیرین بوو و ئەمرۆ پێڕەوەکانی بە ناوی ئایینی ئەو خەریکی بەڕێوە بردنی ئەو ئاکارە کرێت و چەپەڵانەن کە ئەو بۆ لە نێو بردنیان گیانی خۆی بەخت کرد. هیچ کەس لە نێو ئەو کۆڕەدا بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئەو نان و شەڕابەی بە ناوی گۆشت و خوێنی مەسیح دەرخواردی منداڵەکانی دەدەن، وەک ئەوە وایە چڕنووک لە ڕوخساری پاکی مەسیح بگری و چنگ بنێیتە نێو جەرگ و هەناوی. مەسیح مزگێنیی ئازادیی بۆ مرۆڤایەتی هێنابوو بەڵام لێرە پێڕەوەکانی منداڵانی بێ تاوانیان لە بەندیخانەدا ڕاگرتبوو و نان و شەڕابیان بە ناوی گۆشت و خوێنی مەسیح دەرخوارد دەدان.

قەشە بە بیروباوەڕێکی هێندە پتەوەوە ئەم ڕێوڕەسمەی بەڕێوە دەبرد کە دەتگوت باشترین کاری دنیا ئەنجام دەدا؛ چونکە لە منداڵییەوە پێیان تەڵقین کردبوو کە ئیمان هەر ئەوەیە و ڕێگای خودا و مەسیح جگە لەوە هیچی تر

نیـیە. گەورە و پاکـانی دینـیش کـار و کردەوەیـان هەر ئەوە بـووە. لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیزانی بە دۆعای ئەو نان و شەڕاب نابێتە گۆشت و خوێنی مەسیح، بەڵام پێی وایە ئەو کارە یەکێک لە کۆڵەکەکانی دینە. ماوەی هەژدە ساڵ ئەو کارەی ئەنجام دابوو و لە سایەی بەڕێوەبردنی ئەو ڕێوڕەسم و پـاڕانەوانەش ژیـانێکی خـۆش و ئاسـوودەی هەبـوو. خەرجـی خوێنـدنی کوڕەکانی دابین بوو، کچەکەشـی لە قوتابخـانەیەکی ئـایینی بەبێ بەرانبەر دەرسی دەخوێند.

جانکوشـی کلیسـاش وەک ئەو خـاوەنی ئیمـانێکی قـایم بـوو. قـایم بـوونی ئیمانەکەش بەو هۆیە نەبوو کە زۆر لە ئـایینی مەسیح شارەزایە، بەڵکوو بەو هۆیە بوو کە ئیماندارانی سەر بە کلیسا پاداشی زۆر باشیان پێدەدا بۆ ئەوەی دۆعا بۆ مردووەکانیان بخوێنێ و لە خودا داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات. هەر بەو هۆیە بە ئیمانێکی قایم و لە ناخی دڵەوە هاواری دەکرد: «یا مەسیح! لەگەڵمـان بەبەزەیی بە!» و ئایەتەکانی ئینجیلی هێندە بە سۆزەوە دەخوێند، وەک کاسبێک وابوو کە ئێزنگ و ئارد و پەتاتە دەفرۆشێ و لە سەر ئەو باوەڕەیە کە کۆمەڵگا پێویستی بەو شتانەیە و خەرجی ژیانی ئەو دەبێ لەو ڕێگەیەوە دابین بکرێ.

سـەرۆکی بەنـدیخانە و ئەفسـەر و زینـدانەوانەکان گوێیـان بە مانـای ڕاستەقینەی ئایینی مەسیح و چاک و خراپیی ئەو ڕێوڕەسمانە نەدەدا، بەڵام لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە ئایینی مەسیح دەبێ ببێ و ئەم ڕێوڕەسمانش دەبێ ئەنجام بدرێن؛ چونکە دەیانزانی مەقاماتی بـاڵا و تەنـانەت جەنـابی تێزاریش باوەڕیان بە ئایینی مەسیح هەیە و ئەم ڕێوڕەسمانە بەجێ دێنن. فەرمـانبەرانی بەنـدیخانە ئیمانیـان بەو ئـایینە هەبـوو؛ چـونکە زوڵـم و دڵڕەقییەکانی ئەوانی بە خراپ نەدەزانی و هێمنایەتیی ویژدانی پێدەبەخشین.

ئەگەر ئەو باوەڕەیان نەبووایە، مەحاڵ بوو بتوانن ئەوەندە زیندانییەکان ئازار بدەن و بیانچەوسێننەوە و مێشێکیشیان میوان نەبێ. سەرۆکی بەندیخانە کە پیاوێکی لەسەرخۆبوو، لە سەر ئەو باوەڕە بوو ئەگەر بیروباوەڕی ئایینی نەبووایە نەیدەتوانی ئەم کارە بێ بەزییانەیەی هەبێ و ویژدانیشی ئاسوودە بێ. هەر بەو هۆیە لە کلیسا زۆر ڕەفتارێکی خاکەڕایانەی هەبوو. هێدی و سەر لە پێناو دادەنیشت و خاچی خۆی دەکێشا، هێندێ جاریش دڵی پڕ دەبوو و فرمێسک لە چاویدا قەتیس دەما. ئەو کاتانەی قەشە دۆعای بۆ منداڵەکان دەکرد، لە جێی خۆی هەڵدەستا و منداڵێکی لە نێو بەندییەکاندا دەدۆزییەوە و لە باوەشی دەکرد.

جگە لە چەند کەس کە چاو و گوێیان کراوەتر بوو، زۆربەی بەندییەکان بە دڵ و گیانەوە دەهاتن بۆ کلیسا و پێیان وابوو خاچی ئاڵتوونی، مۆمە داگیرساوەکان، پەرداخی زێڕین، وێنەی مەیسح و عەبای قەشە و هەرچی لەو کلیسایە دایە، شتێکی پڕ لە ڕازی لە خۆگرتووە کە بۆ تامڵ کردنی ئەم ژیانە دژوار و پڕ تەنگوچەڵەمەیە یارمەتییان دەدا و وزەیان پێدەبەخشێ. زۆربەی ئەو چارەڕەشانە لە تەواوی ماوەی ژیانی خۆیاندا هاتوچۆی کلیسایان کردووە و لە خودا و مەسیح پاڕاونەتەوە لە گێژاوی چارەڕەشی ڕزگاریان بکات؛ ئەگەرچی قەت دۆعاکانیان گیرا نەبووبوو، بەڵام هۆکاری ئەو بەدبەختی و لێقەوماویەی خۆیان لە نێو چاوی ئایین نەدەزانی و لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە نەهاتی و چارەڕەشییەکەیان بە هەڵکەوت بووە و ئایین ئەگەر لەم دنیاش کەڵکی نەبێ، بەکاری ئەو دنیایان دێ.

ماسلۆڤاش لە سەر ئەو باوەڕە بوو. ئەویش وەک خەڵکی تر لە کلیسا هەستێکی سەیری هەبوو. لەگەڵ ئەوەدا ماندوو دەبوو، هەستی بەڕێز و شکۆیەکی مەزن دەکرد. سەرەتا لە پشت لاجامەکان ڕادەوەستا و بە باشی نەیدەتوانی قەشە

ببینێ؛ وردەوردە خۆی کێشا پێشەوە و سەرۆکی بەندیخانە و ئەفسەرەکانی بە باشی دەدی. فێدۆزیا پیاوێکی بە قژ و ڕیشی بۆزەوە پیشانی ماسلۆڤادا. ئەو پیاوە مێردەکەی فێدۆزیا بوو کە لە دوورەوە چاوی لە ژنەکەی بڕیبوو. کاتێک گرووپی سروودوێژان دەنگیان هەڵبڕی، فێدۆزیا دەمی بردە بن گوێی ماسلۆڤا و سەبارەت بە مێردەکەی زۆری قسە بۆکرد. دوای ئەوە ماسلۆڤا کاری بەسەر هیچ کەسەوە نەبوو. بێ ئیختیار سروودەکەی لەگەڵ دەخوێندن، لەگەڵ ئەوان خاچی خۆی دەکێشا و لاسایی دەکردنەوە.

# چل ویەک

نۆخلیدۆڤ بەیانی زوو لە ماڵێ هاتە دەرێ. دەنگی شیرفرۆش کۆڵانەکەی داگرتبوو.

- وەرای شیر! شیری تازە!

دەنگێکی سەیری هەبوو. دوێشەو یەکەم بارانی بووژێنەرەوەی بەهاری باریبوو. گیاوگژ لێویان بە خاکەوە نابوو. لقی سپیدارەکان چرۆی مەیلەوزەردیان دەرکردبوو. دارە بووزەکان لکی پڕ گەلای سەوز و تەرچکیان بە هەموو لایەکدا بڵاو کردبۆوە.

دەڕابەی دارینی ماڵ و دووکانەکان ئاواڵە بوون. نۆخلیدۆڤ بە بازاڕی کۆنەفرۆشاندا تێدەپەڕی. لە هەموو لایەکەوە خێوەتیان هەڵدابوو و فرۆشیارانی شڕەپۆش کوت و پانتۆڵ و هێلەگی نیمداشتیان بە سەر دەستیاندا دابوو و بۆ فرۆشتنی هەرایان دەکرد، یان کەوشی کۆنیان نابووە بن باخەڵیان و بەدوای مشتەریدا دەگەڕان.

تاقمێـک کرێکـار بە جلـوبەرگی خـاوێن و پۆسـتاڵی بـریقەدارەوە لەبەر دەرگای چایخانە و مەیخانەکان کۆ بووبوونەوە. ژنان خۆیان ڕازاندبۆوە و بە لەچکە و دەسماڵی ڕەنگاوڕەنگ و کراسی پووڵەکەدارەوە دەهاتن و دەچوون. پاسـەوانەکانی ئاسـایش، دەمانچەیـان لە کەلەکەیـان دابـوو و بە کەمەربەنـد و حەمایلی زەردەوە دەسووڕانەوە و خەریکی چاوەدێریی بارودۆخەکە بوون. منداڵان و تووتکە سەگەکان بە دوای یەکدا هەڵدەهاتن و لە سـەر چیمەنەکـان یارییـان دەکـرد. دایکـان و دایەنـی منـداڵەکانیان لە سـەر کورسـییە دارینەکـان دانیشـتبوون و خەریکـی چەنەوەری بـوون. شۆسـتەی نیسـێی شـەقام هێشـتا خووساوی باران بـوو بەڵام نێوەڕاستی شـەقامەکە وشـک بووبۆوە. خـرمە و تەقوکـوتی تـایەی فەتیـوون و هێلینـگە و ترامۆڤـا و سـمی ئەسـپ و بـارگین ئـاوێتە بووبـوون. کلیسـا بە زڕەی گازەنـگ خەڵکـی بـۆ ڕێوڕەسـمی دۆعـا و پاڕانەوە بانگ دەکرد. تاقمێک جلوبەرگی جوان و ڕازاوەیان لەبەر کردبوو و بەرەو کلیسـا بەڕێـوە بـوون. لە کلیسـای زینـدانیش ئەو ڕۆژە ڕێوڕەسـمێکی ئەوتۆ بەڕێوە چووبوو.

نۆخلیـدۆڤ نیـوەی ڕێگـا بە سـواری فەتیـوون ڕۆیشـت و لەبەر دەرگـای زینــدان دابەزی. چەنــد کەس کە بــۆ ســەردانی کەســوکاریان هــاتبوون، چـاوەڕوانی کـرانەوەی دەرگـای بەنـدیخانە بـوون. هەرکـام بوخچەیەکیـان بەدەستەوە بوو. چەند بینای چکۆڵە لە پاڵ بینای بەرزی بەندیخانە وەبەرچاو دەکەوتـن. سـەربازێکی چەک لە شـان لە بەر دەرگـای بەنـدیخانە خەریکـی چاوەدێری دەرگای زینـدان و شـەقامەکە بـوو. لە تەنیشـت زینـدان ژوورێکـی دارین هەبوو کە عەریفێک لە سووچێکی دانیشـتبوو و نـاوی ئەو بەندییانەی دەنووسـی کە کەسـووکاریان هـاتبوون بـۆ سـەر دانیـان. نۆخلیـدۆڤیش چـوو بۆلای ئەو و داوای لێکرد ناوی کاترین ماسلۆڤا بنووسێ.

ـ کەنگێ ڕێگە دەدەن چاومان بە بەندییەکان بکەوێ؟
ـ دەبێ ڕاوەستن هەتا ڕێوڕەسمی ئایینی کۆتایی دێ.
ـ کۆنت هیچی نەگوت و گەڕایەوە بۆ نێو ملاقاتچییەکان.

پیاوێکی شڕەپۆش بەکڵاوی دڕاو و پێی پەتی و دەموچاوی زامارەوە لە ملاقاتچییەکـــان دوور کەوتەوە و چـــوو بـــۆ لای دەرگـــای بەنـــدیخانەکە. سەربازێکی چەک لە شان گوڕاندی بەسەریدا.

ـ دەچی بۆ کوێ؟
ـ نەقیب! هاوار مەکە شیرەکەت ویشک دەکا.

کابرای پێخاوس دیسـان گەڕایەوە بۆ شـوێنەکەی خـۆی. هەمـوو دەسـتیان کـرد بە پێکەنـین. زۆربەی ملاقاتچییەکـان جلـوبەرگی کـۆن و دڕاویـان لەبەر دابوو. هێندێکیان چڵکن و پڵکن و شـڕەپۆش، هێندێکیشـیان تەڕپـۆش و پاک و خـاوێن. پیاوێـک لە پەنـای نۆخلیـدۆڤ ڕاوەسـتابوو کە جلوبەرگێکی خـاوێن و ڕێکوپێکی لەبەردا و ڕیشی تیفتیفەدابوو، دەموچاوێکی سووروسپیی هەبـوو و بوخچەیەکی نـابووە بن بـاخەڵی. کۆنـت لێی پرسـی یەکەم جارییەتی دێت بۆ ئێرە؟ لە وەلامدا گوتی دەرگاوانی بانکە و هەموو ڕۆژانی یەکشـەممە دێت بۆ ملاقـاتی بـراکەی کە بە تـاوانی تەزویـری تـاپۆ دەستبەسـەر کـراوە و چیرۆکـی ژیـانی لە نـووکەوە بـۆ گێـرایەوە. ڕاسـت لەو کـاتەدا کە دەیوسـت سـەری لە کـاری نۆخلیـدۆڤ دەرچـێ، فەیتـوونێکی یەک بـارگینە سـەرنجی ڕاکێشـان کە هێواش هێواش دەهاتە پێشـێ و لە نزیکی ئەوان ڕاوەسـتا. دوو کەس سـواری فەیتــوونەکە بووبــوون، ژنێــک کە ڕووی خــۆی داپۆشــیبوو، گەنجێکــیش کە بوخچەیەکی گەورەی لە بن باخەڵدابوو. کوڕە گەنجەکە لە فەیتوونەکە دابەزی و بـۆ نۆخلیـدۆڤ و کـابرای دەرگـاوانی باسـکرد کە ئەو ژنەی ڕووی خـۆی داپۆشــیوە دەزگیرانییەتــی و ئەم دەســتەوارە نــانە ســپییەی لە ســـەر داوای

بنەماڵەی دەزگیرانەکەی هێناوە و دەیهەوێ بیدات بە زینداننییەکان. بەڵام نازانێ دەستەوارە نانەکە بدات بە کێ.

ـ ئێمەش نازانین؛ دەبێ بچی پرسیار لەو عەریفە بکەی کە لە نێو ئەو دیوە دارینە دانیشتووە و ناونووسی دەکا.

لەو کاتەدا دەرگای گەورە و ئاسنینی بەندیخانەکە کرایەوە؛ ئەفسەرێک و سەربازێک هاتنە دەرێ و لەمبەر و ئەوبەری دەرگاکە ڕاوەستان. ملاقاتچییەکان هرووژمیان هێنا بۆ ئەوەی زووتر خۆیان بگەیەننە شوێنی ملاقات. پاسەوانەکە ملاقاتچییەکانی دەبژارد ... شازدە... حەڤدە... هەژدە... و چەند هەنگاو لەولاترەوە پاسەوانێکی تر دەستی لە سەر شانی دانە بە دانەی ملاقاتچییەکان دادە نا و دەیژماردن. کاتێک کۆنت بەبەر دەمیدا تێپەڕی،بۆ ژماردن دەستی لەشانی ئەویش کوتا. نۆخلیدۆڤ ئەو ڕەفتارە پڕ سووکایەتییەی وەڕووی خۆی نەهێنا. ناچار بوو غووروری خانەدانییانەی خۆی بنێتە ژێر پێ.

لە شوێنی ملاقاتەکە وێنەیەکی گەورەی مەسیح وەبەر چاو دەکەوت. نۆخلیدۆڤ لە خۆی دەپرسی: «بۆچی مەسیحیان هێناوە بۆ بەندیخانە؟ مەگین مەسیح مزگێنیدەری ئازادی نەبوو؟» کۆنت بەشێنەیی هەنگاوی دەنا. ملاقاتچییەکان پاڵیان پێوەدەنا و پێشی دەکەوتن بۆ ئەوەی زووتر خۆیان بگەیەننە پشت شیشبەندی ملاقات. ئەو هەستێکی ئاڵۆز و لێڵ خۆی لە ڕۆحی هاڵاندبوو. ترسی ئەو خراپکارانە شکابووە گیانی کە لە چوارچێوەی ئەو بەندیخانەیەدا دیل کرابوون؛ بەزەیی بە کاتیۆشادا دەهات کە بەبێ تاوان کەوتۆتە ئەو زەلکاوەوە؛ هەستی بە شەرمێکی گورچوبڕیش دەکرد! لە لایەکی دیکەوە هێشتا نەیدەزانی کاتیۆشا چۆن لەگەڵی بەرەڕوو دەبێ؟ وەها کاس و گێژ بووبوو کە هێشتا نەیدەزانی بە هەڵە چۆتە شوێنی ملاقاتی پیاوان؛ سەرەڕای ئەوەی پاسەوانێک کە ملاقاتچییەکانی دەژمارد، لە پەستا هاواری

دەکرد و شوێنی ملاقاتی ژنان و پیاوانی پیشان دەدان، بەڵام کۆنت سەرنجی نەدابوویە و بەدوای خەڵکەکەدا هاتبوو بۆ شوێنی ملاقاتی پیاوان.

نۆخلیدۆڤ دوایین کەس بوو کە گەیشتبووە ئەو شوێنە. دەنگەدەنگ و ژاوەژاو شوێنەکەی داگرتبوو. دەنگەکان سەرسووڕهێنەر بوون. کۆنت تێنەدەگەیشت بۆچی ئەم هەموو دەنگە دەنگە بەرز بۆتەوە و کەس لە کەس حاڵی نابێ. چووە پێشترەوە و بۆی دەرکەوت هۆکاری ئەو هەراوهۆریایە چییە. ملاقاتچییەکان لەم بەری میلەکان و بەندییەکانیش لەو بەرەوە خۆیان بە میلەکانەوە نووساندبوو و هەموو پێکەوە دەنگیان هەڵدێنا تاکوو دەنگیان بە گوێی کەسووکارەکانیان بگات.

ئەم شوێنە لە دەلاقەی نزیک میچەکەوە ڕووناکیی وەردەگرت. لە نێوان بەندییەکان و ملاقاتچییەکاندا دوو ڕیز میلە هەبوون کە لە نێوانی ئەم دوو میلەیەدا پاسەوانێک دەهات و دەچوو. نێوی مەودای نێوان بەندی و ملاقاتچی دوو مەتر بوو. بەندی و ملاقاتچی نەیاندەتوانی لە یەکتر نزیک ببنەوە. دەستیان بە یەکتر بگا و ئەگەر یەکێک لەو دوو لایەنە چاوی نزیک بین بووایە تەنانەت دەموچاوی کەسەکەی خۆی نەدەدی. زۆر بە دژواریش دەنگیان بە یەک دەگەیشت. بۆیە هەموویان ناچار بوون گوشار بۆ گەرووی خۆیان بهێنن و بە هەموو تواناوە بنەڕێنن. دەموچاوی تێک قوپای ژنان، پیاوان و باوکان و دایکان و منداڵان بە میلە ئاسنینەکانەوە نووسابوون. هەرکەس دەنگی لەوی دیکە زیاتر هەڵدەبڕی و یارمەتییان لە دەست و دەموچاو و برۆیان وەردەگرت تاکوو مەبەستی خۆیان بگەیەنن. هیچ کەس دەرفەتی بۆ بیر کردنەوە لە قسەی بەرانبەرەکەی و ئامادە کردنی وەڵامی شیاوی نەبوو.

نۆخلیدۆڤ بڕوای بە چاوی خۆی نەدەکرد. لە نزیکییەوە پیرێژنێکی خریلانە خۆی بە میلەکانەوە نووساندبوو، چەنەی دەلەرزی و چاوی لە

گەنجێکی ڕەنگ بزرکاوی سەرتاشراو بڕیبوو، بەوردی گوێی بۆ قسەکانی شل کردبوو. لە پاڵ پیرێژنەکەشەوە پیاوێکی گەڕاوە بە جلوبەرگی کارەوە ڕاوەستابوو و لەگەڵ بەندییەک قسەی دەکرد کە ڕوخسارێکی خەماویی و ڕیشێکی پڕ و خۆڵەمێشینی هەبوو. هێندێ لەو لاترەوە لاوێکی هەرزە ئەدا و ئەتواری دەردێنا و جاروبار قاقای دەکێشا. ژنێک کە لەچکەیەکی پەشمینەی بە سەردا دابوو و منداڵێکی بە باوەشەوە بوو، لەبەر میلەکاندا و لە سەر زەوی دانیشتبوو و زوڕەزووڕ دەگریا. زیندانییەک کە وێدەچوو مێردی بێ، زنجیری لە پێدابوو و بە هێز و قەوەتی خۆی دەینەڕاند بۆ ئەوەی دەنگی بە گوێی ژنەکەی بگات. دەرگاوانی بانک کە نۆخلیدۆڤ لەبەر دەرگای بەندیخانە لەگەڵی ئاشنابوو،لە ژوور سەری ئەو ژنە ڕاوەستا بوو و دینەڕاند بۆ ئەوەی دەنگی بە براکەی بگات کە کوڕێکی چاو زیتی سەر ساف بوو.

نۆخلیدۆڤ ڕقی هەستا بوو. ڕۆحی شڵەژابوو و ئەو سیستەمەی مەحکووم دەکرد کە خەڵکی تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە کردووە و ئاوا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکا. سەری لەو هەموو ئاکارە ناحەز و بێ عەداڵەتییە سووڕ مابوو. دەیدی چۆن بێ ڕێزی بە هەستی مرۆڤ دەکرێ و مافەکانیان پێشێل دەکەن. لەوەش سەرسوورهێنەتر ئەوەبوو کە بارودۆخەکە بۆ هەمووان، لە سەرۆکی زیندانەوە بگرە هەتا پاسەوان و زیندانەوان و بەندی و ملاقاتچی بە شێوەیەکی ئاسایی و سروشتی چاوی لێدەکرا.

نۆخلیدۆڤ چەند خولەکێک لەوێ مایەوە. هەستی دەکرد ئەم بارودۆخە زۆر پڕ ئازارە و ناتوانێ بەرگەی دیتنی ئەو دیمەنە تاڵ و دڵتەزێنانە بگرێ. خەمێکی قورس دڵی داگرتبوو. هەستی دەکرد لە نێو پاپۆڕێکی لە حاڵی نوقم بوون دایە و سەری لە گێژەوە دێ.

# چل و دوو

نۆخلیدۆڤ وەخۆهاتەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەبێ بۆ دیتنی ماسلۆڤا هەوڵێک بدەم!» چاوی لە دەوروبەری خۆی کرد. چاوی بە پیاوێکی کزی سمێڵ زل کەوت کە جلوبەرگی ئەفسەریی لەبەر دابوو و لە پشت سەری ملاقاتچییەکانەوە چاوەدێریی بارودۆخەکەی دەکرد. چووە پێشێ. زۆر بە ڕێزەوە قسەی لەگەڵ کرد.

ـ تکایە ڕێنوێنیم بفەرموون. هاتووم چاوم بە ژنێکی بەندی بکەوێ.

ـ دەبێ بچی بۆ بەشی ژنان. ئەگەر لە سەرەتاوە بتگوتبایە دەیانبردی بۆ ئەو بەشە.

ـ هەڵەی خۆم بوو.

ـ دەتهەوێ چاوت بە کێ بکەوێ.

ـ کاترین ماسلۆڤا.

ـ بەندیی سیاسییە؟

ـ نا...

ـ حوکم دراوە؟ یان هێشتا نەچووە بۆ دادگا؟

ـ دوو ڕۆژە لە دادگا حوکمی بۆ بڕاوەتەوە.

زۆر بەڕێز و لە سەرە خۆ قسەی دەکرد نەکا ئەو ئەفسەرە ڕەفتاری بگۆڕێ و کەند و کۆسپی بۆ دروست بکات. قەلافەت و بۆشناغیی خانەدانانەی ئەو کاری خۆی کرد. ئەفسەری سمێڵ زل عەریفێکی سمێڵ زلی دیکەی بانگ کرد.

- سیدرۆڤ! ئەم بەڕێزە ڕێنوێنی بکە دەیهەوێ بچێت بۆ بەشی ژنان.

- بەچاوان گەورەم.

زووڕەزووری گریانی دڵتەزێنی ئەو ژنەی کە لە بەرمیلەکان دانیشتبوو، لە بەر هەراو زەنازەنا نەدەبیسترا. هەموو شتێک بۆ نۆخلیدۆڤ تازەی دەنواند. سەیر بوو، لە هەموو شتێک سەیرتر ئەوە بوو، ناچار بوو سپاس لەو ملازم و عەریفە بکات کە لە شوێنێکی ئاوا کار دەکەن.

عەریفی سمێڵی ئەوی برد بۆ دالانێک کە لەو سەری دالانەکە دەرگایەک هەڵکەوتبوو و دەچووە شوێنی ملاقاتی ژنان. لێرەش دوو ڕیز میلەی ئاسنین، بە مەودایەکی کەمتر، ملاقاتچی و بەندییەکانی لێک جیا دەکردەوە. لێرەش هەرا و قیژە و زەنازەنا گوێچکەی ئازار دەدا. پاسەوانێک بە جلوبەرگی شین و سەرقۆڵی زەرپدۆزییەوە لە نێو میلەکاندا دەهات و دەچوو. لێرەش ملاقاتچی و بەندییەکان دەموچاویان بە میلەکانەوە نووساندبوو و هاواریان دەکرد. ملاقاتچییەکان بە جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگەوە لە بەرێک بوون و ژنانی بەندیش لەو بەرەی دیکەوە جلوبەرگی سپییان لەبەردابوو. تاقولۆقیشیان بە جلوبەرگی ئاسایی خۆیانەوە هاتبوون. لە هەردوو بەری میلەکانەوە شوێنێکی بەتاڵ نەبوو. چەند کەس لە سەر نووکی قاچ خۆیان هەڵێنابوو و لە سەرووی ئەوانی دیکەوە قسەیان لەگەڵ بەرانبەرەکەیان دەکرد؛ چەند کەسیش لەبەر میلەکاندا لە سەر زەوی دانیشتبوون.

لەم نێوەدا ژنێکی قەرەج بە هاواری دڵتەزێن و سەروڕووی شێواو و ئاڵۆزەوە سەرنجی هەمووانی بۆلای خۆی ڕاکێشابوو. ژنێکی کزەڵۆکە و سەر ئاڵۆزکاو بوو. لەچکەیەکی بە سەریدا دابوو. لە نزیک دیوارەکە ڕاوەستا بوو لەگەڵ ژنێکی قەرەجی تر کە جلوبەرگی شینی کەمەرداری لەبەر دابوو خێراخێرا قسەی دەکرد و هەردووکیان پێکەوە دەیانقیژاند. لە نزیک ئەو سەربازێک لە سەر زەوی دانیشتبوو و لەگەڵ ژنێکی زیندانی قسەی دەکرد. هێندێک لەو لاترەوە لاوێکی گوندنشین بە کەوشی دارینەوە ڕاوەستابوو، دڵی پڕ بووبوو و لێوی دەلەرزێ. بەرانبەرکەی ژنێک بوو بە قژێکی زەرد و لەشولارێکی دڵڕفێنەوە. ئەو ژنە فێدۆزیا بوو، سەربازەکەش مێردی بوو. لە تەنیشتیشی لاوێکی هەرزە و چوارشانەی قژئاڵۆز چاوی لە چاوی ژنەکەی بڕیبوو کە لەو دیوی ملیەکانەوە ڕاوەستابوو؛ دوای ئەو چەند ژن و پیاوی دیکە وەبەر چاو دەکەوتن کە هاتبوون بۆ ملاقاتی دوو ژنی زیندانی. ماسلۆڤا لە نێویاندا نەبوو. نۆخلیدۆڤ چاوی لە دواوەتر کرد، ژنێک لە بن دیوارێک ڕاوەستا بوو؛ خۆی بوو. کەوتە دڵەکوتێ، هەناسەی خەریک بوو ڕاوەستێ. لە چرکەساتی چارەنووس نزیک بووبۆوە. ماسلۆڤا لە پشت سەری فێدۆزیا ڕاوەستا بوو و لێو بەبزە گوێی بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو. کراسێکی سپیی تەنگی لەبەر دابوو. مەمکە قوتەکەی سەرنجی ڕاکێشا. قژە ڕەشەکەی لە سووچی لەچکەکەیەوە هاتبووە دەرێ. نۆخلیدۆڤ نەیدەزانی چبکا. دەبێ بانگی بکات یان ڕاوەستێ هەتا خۆی دێتە پێشێ. ئەوەندە ڕاوەستا هەتا زیندانەوانەکە هات و لێی پرسی دەیهەوێ چاوی بەکێ بکەوێ.

ـ کاترین ماسلۆڤا.

زندانەوان گوڕاندی:

ماسلۆڤا! وەرە پێشێ. هاتوون بۆ ملاقاتت.

ماسلۆڤا سەری هەڵێنا، سینگی دەرپەڕاند و هەر بەو حاڵەتەوە کە بۆ نۆخلیدۆڤ نائاشنا نەبوو، هات بۆ لای میلەکان. ئەو کەسەی هاتبوو بۆ ملاقاتی، ناسیاو نەبوو. قەلافەت و ڕواڵەتی ئەو پیاوە دیار بوو مرۆڤێکی خانەدانە. زەردەیەکی گرت و بە چاوێکی پڕ لە مێهرەبانییەوە تێی ڕوانی.

ـ جەنابت هاتووی بۆ ملاقاتی من؟

ـ بەڵێ، دەمەوێ...

نۆخلیدۆڤ دەیویست خۆمانە بدوێ بەڵام نەیتوانی.

ـ دەمویست چاوم پێت بکەوێ و...

ماسلۆڤا دەنگی ئەوی نەدەبیست. لاوێکی هەرزە کە لە پەنای نۆخلیدۆڤ ڕاوەستا بوو وەهای دەگوڕاند، ماسلۆڤا گویی لە هیچ نەدەبوو.

ـ ڕێگەم لێ مەگرە. هەر چۆنێک بێ حەیاتی لێدەبڕم.

ـ خۆی خەریکە دەمرێ؛ پێویست ناکا تۆ حەیاتی لێببڕی.

ماسلۆڤا دەنگی نۆخلیدۆڤی نەدەبیست. بەڵام وردەوردە ناسییەوە و هەموو بیرەوەرییە کانی ڕابردووی وەبیر هاتەوە. هێشتا بڕوای بە چاوی خۆی نەدەکرد. بزەکەی سەر لێوی وشک بوو.

ـ حاڵی نابم چی دەڵێی.

ـ بۆیە هاتووم...

نەیتوانی ڕستەکە بەتەواوی دەر بڕێ و بڵێ: «... هاتووم ڕابردووم قەرەبوو بکەمەوە.» چاوی پڕ بوو لە فرمێسک، ئۆناقێک گەروووی گرت، دەمووچاوی بەمیلەکانەوە چەسپاند و ددانی بەخۆیدا گرت و گریانەکەی خواردەوە. لە بن گوێیدا کابرایەک گوڕاندی.

ـ بڕۆ بە دوای کاری خۆتدا!

یەکێکی دیکەش گوتی:

- بە خودا من ئاگام لە هیچ شتێک نییە.

نۆخلیدۆڤ وەک قوتابییەک کە دەرسەکەی ئەزبەر بێ و وەڵامی پرسیاری مامۆستاکەی بداتەوە، دەنگی هەڵێنا:

- هاتووم داوای لێبوردنت لێبکەم.

هەرچەندی هەوڵی دەدا و دەنگی هەڵدێنا، کەڵکی نەبوو و دەنگی لە نێو دەنگی ئەوانی دیکەدا ون دەبوو. شەرمێک گەرووی ڕێک دەگوشی. چاوی لە دەوروبەری خۆی کرد. هەوڵی دەدا شەرم و ترس لە خۆی دوور بخاتەوە. ساتە وەختی تاقیکاریی گەورە بوو!

- بمبوورە؛ من تاوانبارم.

ماسلۆڤا لە جێی خۆی نەدەجوولا و چاوی لە سەر هەڵنەدەگرت. نۆخلیدۆڤ لە میلەکان دوور کەوتەوە. تاکوو بەربەو هاوارە بگرێ کە لە سینگیدا پەنگی خواردبۆوە.

ئەو عەریفە سمێڵ بابڕەی کە ڕێنوێنیی کردبوو بۆ ئێرە، لە حاڵی ئاگادار بوو. چووە پێشێ و لێی پرسی بۆ لە میلەکان دوور کەوتۆتەوە؟ مەگین نایهەوێ لەگەڵ ئەو ژنە قسە بکات؟

- ناتوانم لە پشت میلەکانەوە قسەی لەگەڵ بکەم.

عەریف گتێکی گرت و گوتی:

- ڕاوەستە ئێستا جێبەجێی دەکەم.

ڕۆیشت و داوای لە ماریا کارلۆڤنای زیندانەوانی ژنان کرد کە ماسلۆڤا بۆ چەند خولەکێک بنێرێ بۆ ئەم دیوی میلەکان.

# چل و سێ

ماسلۆڤایان لە دەرگایەکەوە هێنا بۆ ئەم دیوی میلەکان کە هەتا ئەم کاتە نۆخلیدۆڤ نەیدیبوو. ماسلۆڤا بە هێواشی هاتە پێشێ و دوو هەنگاو دوور لە کۆنت نۆخلیوۆڤ ڕاوەستا؛ بێ ئەوەی سەری هەڵێنێ، چاوی لەبەر پێی خۆی بڕیبوو؛ وەک ئەو ڕۆژەی دادگا قژە ڕەشەکەی لە ژێر لەچکەکەیەوە هاتبووە دەرێ. خەمبار و پەنەمیوو ڕەنگ بزرکاو. ڕوخساری جوان و ئارام بوو. چاوە ڕەشەکانی لە ژێر پێڵووە ماسیوەکانیدا بە شێوەیەکی سەیر تروووسکەیان دەهات.

عەریفی سمێڵ زل لێیان دوور کەوتەوە و گوتی:

ـ لێرە دەتوانن بە ئیشتیای خۆتان قسە بکەن. نۆخلیدۆڤ چوو بۆ لای کورسیی پەنا دیوارەکە و چاوێکی پرسیار ئامێزی لە عەریف کرد، کە دیتی بەرگریی لێ ناکا لە سەری دانیشت. ماسلۆڤاش لە پاڵیدا دانیشت.

ـ دەزانم لێم خۆش نابی. ئیتر زۆر درەنگە و ڕەنگە ڕابردوو قەرەبوو نەکرێتەوە. بەڵام هاتووم بۆلات و چۆن بڵێی وادەکەم.

فرمێسک لە چاویدا قەتیس مابوو.

ـ چۆن منت دۆزییەوە؟

چاوانی ماسلۆڤا سارد و بێ هەست بوون؛ شیرین خێل بوو. نۆخلیدۆڤ بۆی دەرکەوت ماسلۆڤا لەم سالانەدا چەندە گۆڕاوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «خودایە! یارمەتیم بدە! بەرەو ڕێگای ڕاست ڕێنوێنیم بکە!»

ـ پێرێ من ئەندامی لیژنەی داوەران بووم: تۆ منت نەناسییەوە؟

ـ نا... ئێوەم نە ناسییەوە؛ من چاوم لە هیچ کەس نەدەکرد.

ـ منداڵەکە چیی بەسەر هات؟ هەموو شتێکم بۆ باس بکە.

کاتیۆشا ڕووی وەرگێڕا.

ـ دوای لە دایک بوون مرد. خودا ڕوحمی پێکرد و ڕزگاری بوو.

ـ بۆچی مرد؟

ـ من خۆم لە کاتی زایەماندا لە بارودۆخێکی خراپدا بووم؛ خەریک بوو بمرم.

ـ چۆن پوورەکانم هێشتیان لەوێ بڕوێ؟

ـ کێ خزمەتکارێکی دۆڕاو و زگپڕ ڕادەگرێ؟ زگم دیاریی دا و لە مەسەلەکە تێگەیشتن. لە ماڵێ دەریان کردم . تازە باسکردنی ئەو شتانە چ کەڵکێکی هەیە؟ ئیتر هەموو شتێک تەواو بووە، کای کۆن بە با نەکەین باشترە.

ـ نا هەموو شتێک تەواو نەبووە؛ هاتووم هەموو تاوانەکانی خۆم قەرەبوو بکەمەوە.

ـ ئەو شتانە ئیتر قەرەرە بوو ناکرێتەوە؛ مەگین نەتدیوە کەوتوومە چ بارودۆخێکەوە؟

لەبزی سات لە دوای سات سەرکۆنەئامێزتر دەبوو؛ نۆخلیدۆڤی سەرکۆنە دەکرد. ئێستا کە دوای چەند ساڵ چاوی پێی کەوتبۆوە، ڕابردوو لە زەینیدا زنیدوو بووبۆوە. وەبیری هاتەوە کە چەندەی ئەو گەنجە قیتوقۆزە خۆش دەویست و شەوانی زۆر بە یادی ئەوەوە چاوی چووبووە خەو. ڕۆژانی چارەڕەشی و لێقەومانی خۆی وەبیر هاتەوە. چەندەی ڕەنج و ئازار

کێشـابوو، ئەو هەمـوو سـووکایەتی و چارەڕەشـییانەی تامـڵ کردبـوو. ئەو ڕۆژانە زامێکی قووڵیان لە سەر دڵی جێهێشتبوو. ساڵانێکی زۆر بوو یاد و بیرەوەریـی ئەو پیـاوەی لە سـووچێکی نادیـاری ڕۆحـی خۆیـدا شـارد بـۆوە، بەڵام ئێسـتا ئەوی لە پەنـای خـۆی دەدی. وردە وردە بـۆی دەرکەوت کە ئەو پیـاوە خـانەدان و تەرپـۆش و بۆنخۆشـە، ئەو کـوڕە گەنـجە نیـیە کە یەکەم ئەشـقی بـوو و لە پـاکی و مێهرەبانیشـدا بـێ وێـنە بـوو. هەسـتی دەکـرد ئەم پیـاوەش وەک هەمـوو پیـاوانی دیـکە دەیـهەوێ گـڕی هەوەسـی خـۆی بە جەسـتەی ئەو دامرکێنـێ و ئەم هەسـتە شـوێنی لە سـەر ڕوانینـی دانـا. چەنـد چرکە بێدەنگ بوو. خەیاڵ هەڵیگرت.

ـ ئێتـر باسـی ڕابـردوو کەڵکی نییە؛ حـوکمی زینـدان و دوورخسـتنەوەیان بەسەردا سەپاندووم. من زیندانیم.

لێوی دەلەرزی و قسەی بۆ نەدەکرا. نۆخلیدۆڤ گوتی:

ـ هەموو شتێک دەزانم؛ دەشزانم کە بێ تاوانی.

ـ من نە دزم، نە پیاوکوژ. دەڵێن ئەگەر پارێزەرێکی باشـم هەبووایە حوکم نەدەدرام. دەڵێن دەبێ داوای پێداچوونەوەی حـوکمەکەم بکەم. بەڵام مـن پـارە لە کوێ بێنم؟

ـ من لەگەڵ پارێزەرێکی شارەزا قسەم کردووە؛ خەمت نەبێ.

ـ دەبێ زۆر پارێزەرێکی کارامە بێ بۆ ئەوەی بتوانێ ڕزگارم بکات.

ـ بیر لەو شتانە مەکەوە. من خۆم هەموو کارەکان جێبەجێ دەکەم، خەمت نەبێ.

هەردووکیـان بێـدەنگ بـوون. بزەیەکـی کاسـبکارانە نیشـتە سـەر لێـوی ماسلۆڤا.

ـ تکایەکم لە ئێوە هەیە؛ بڕێکم پارە پێویستە. ئەگەر پێتە دە ڕۆبڵم بدەیە.

ـ بەڵێ جا دیارە پێمە.

نۆخلیدۆڤ جزدانی پارەکەی دەرهێنا. ماسلۆڤا بە ترسەوە چاوێکی لە عەریفە سمێڵ بابڕەکە کرد.

ـ نا. لەبەر چاوی ئەو پارەم پێمەدە؛ لێم دەستێنن.

کاتێک عەریفی سمێڵ بابڕ پشتی تێکردن، نۆخلیدۆڤ جزدانەکەی دەرهێنا. هەر کە ویستی گەڵایەک بداتە دەستی ماسلۆڤا پاسەوانەکە ئاوڕی دایەوە. کۆنت ناچار بوو پارەکە لە نێو مشتیدا ڕاگری. هەستێکی سەیر گیانی داگرتبوو. بۆی دەرکەوتبوو کە ئەو ژنە، لەگەڵ کچە داوێن پاکەکەی ئەودەم زۆر جیاوازە. بۆ ساتێک تووشی دڕدۆنگی و دوودڵییەکی سەیر بوو. دەتگوت شتێک وەسوەسەی دەکات و دەنگێک بە گوێیدا دەچرپێنێ: «بیر لە ئاکامی ئەو کارەت بکەوە؛ تۆ هیچ کارێکت لە دەست نایە. گەڵا دە ڕۆبڵییەکەی پێبدە و خوداحافیزیی لێبکە و بۆ هەمیشە لە بیری خۆتی ببەوە!»

تووشی شڵەژاوییەکی سەیر بووبوو. وەک تەرازوویەک دەچوو کە هەردوو تایەکەی یەکسان ڕاوەستاوە و بێتوو چڵە پووشێک بکەوێتە سەر تایەکیان، قورستر دەبێ. نەیدەزانی داوای یارمەتی لە کێ بکات؟ ئەو دەنگە پاکەی دوێشەو لە ناخی گیانیدا بیستبووی لەگەڵ ئەم دەنگە وەسوەسە ئامێزەی ئێستا لە سەر ڕۆحی کەوتبوونە ململانێ. بڕیاری دا لەگەڵ ماسلۆڤا بە شێوەیەکی خۆمانە بدوێ و هەموو شتێکی پێ بڵێ.

ـ کاتیۆشا! هاتووم داوای لێبوردنت لێبکەم. هێشتا وەڵامت نەداومەتەوە. لێم خۆش دەبی؟ لە بەرانبەردا هەر کارێک بڵێی دەیکەم.

ماسلۆڤا گوێی لێ نەبوو. هەموو هۆشی لە لای عەریفە سمێڵ بابڕەکە بوو کە بتوانێ لە کاتێکی باشدا پارەکە لە نۆخلیدۆڤ وەرگرێ. هەر کە عەریف وەرسووڕا، پڕی بە دەستی نۆخلیدۆڤدا کرد؛ پارەکەی لە مشتی دەرکێشا و لە ژێر کەمەرەکەیدا شاردییەوە.

ـ ئەو قسانە بە بڕوای من زۆر بێ مانایە.

کۆنت نۆخلیدۆڤ تێگەیشتبوو کە لەو بارودۆخەدا ماسلۆڤا هەستی شڵەژاوە و بە چاوی ڕق و دوژمنایەتی لە هەموو شتێک دەڕوانێ، بەڵام قسەی ڕەق و تێکوڵداری ژنە شلویێ نەدەکرد. بە پێچەوانەوە هەتا زیاتری دژایەتی و تیروتوانج لە ماسلۆڤا دەبیست زیاتر پێداگریی دەکرد. ڕێگایەکی دژواری لەبەر بوو. لە دژواری و کەند و کۆسپ نەدەترسا. ئەگەرچی هێندێ جار دڕدۆنگی چنگی لە گیانی گیر دەکرد، بەڵام وردەوردە هەموو وەسوەسەکانی لە خۆی تاراند. هەستێکی پاک و پڕ لە خۆشەویستی ڕۆحی داگرت. ئەو هەستە بە لایەوە شتێکی نوێ بوو. بیری لە جەستەی ئەو ژنە نەدەکردەوە؛ هیچ شتێکی لەو نەدەویست؛ تەنیا مەبەستی ئەو گرتنی دەستی ئەو ژنە بوو بۆ ئەوەی لەو گێژاوی چارەڕەشییەی دەرهێنێتەوە و ژیانەوەیەکی تر لە ڕۆحی ئەودا بەدی بێنێ.

ـ کاتیۆشا! بۆ ئاوا قسەم لەگەڵ دەکەی؟ لە بیرمە ئەو کاتە تۆ چەند کچێکی پاک و بێگەرد بووی.

ـ باسی ئەو کاتە هەر مەکە.

ـ با دەبێ باسی بکەین. دەبێ هەموو شتێکمان وەبیر بێتەوە. دەمهەوێ ڕابردوو قەرەبوو بکەمەوە.

دەیویست بڵێ ئامادەیە ژیانی هابەشی لەگەڵ پێک بێنێ، بەڵام ڕوانینی سڵۆکی کاتیۆشا پەژیوانی کردەوە. ترسا شتێک بڵێ و ماسلۆڤا لە خۆی بتارێنێ و لێی زیز بێ.

ملاقاتچییەکان بەرەبەرە ئامادەی ڕۆیشتن بوون. عەریفی سمێڵ زل هات بۆ لای نۆخلیدۆڤ و وەبیری هێنایەوە کە کاتی ملاقات تەواو بووە. ماسلۆڤا هەستا سەرپێ.

ـ کاتیۆشا! زۆر شت هەیە هێشتا پێم نەگوتووی.

دەستی بردە پێشێ تەوقەی لەگەڵ بکات، گوتی:

ـ دیسان دێم بۆ لات.

ـ هەموو شتێکت گوت. پێویست ناکا زەحمەت بکێشی.

ـ نا، هەموو شتێکم نەگوتووە، کارێک دەکەم کە لە شوێنێکی شیاو چاومان بە یەکتر بکەوێ. مەبەستێکی گرینگ هەیە دەبێ پێتی بڵێم.

کاتیۆشا بزەیەکی ساردوسڕ نیشتە سەر لێوی. وەک ئەو بزە ساختانەی بۆ مشتەرییەکانی دەکەوتە سەر لێوی.

ـ ئێستا کە پێداگری دەکەی؛ باشە، وەرە.

ـ تۆ لە خوشکێک بۆ من خۆشەویستتری.

ـ قسەکانت چەندە قۆڕ و بێ مانان!

سەری ڕاوەشاند و لە دەرگاکە چووە دەرێ.

# چل و چوار

نۆخلیدۆڤ پێوابوو هەر لە یەکەم دیداردا، هەرکە ماسلۆڤا چاوی پێی بکەوێ و داوای لێبوردنەکەی ببیستێ، دەستەوبەجێ گۆڕانی بەسەردا دێ و دەبێتەوە بە کاتیۆشا پاک و ڕوحسووکەکەی پێشوو، بەڵام ڕاستییەکان لەگەڵ خەیاڵ و بۆچوونی ئەو هەزاران فەرسەخ لێک دوور بوون. بە چاوی خۆی دیتبووی کاتیۆشای ئەو سەردەمە ئاسەواری نەماوە، بزر بووە و ماسلۆڤای ئەمڕۆ لە جێگای ئەو دانیشتووە.

لەوەش سەیرتر ئەوە بوو ماسلۆڤا بە هۆی حوکمەکەی دادگاوە خەمبار و دڵتەنگ بوو، بەڵام بۆ لەشفرۆشییەکەی مێشێکیشی میوان نەبوو؛ تەنانەت هەستی بەرەزایەت و سەربەرزیش دەکرد و نەیدەویست لێی پاشگەز بێتەوە. ئاساییە هەرکەس هەر کار و کەسبێکی هەبێ پێیوایە بۆ کۆمەڵگا بە کەڵکە و لە هەموو باریکەوە گرنگایەتیی هەیە. ئەو کەسانەی پێیان وایە دز و سیخوڕ و پیاوکوژ و لەشفرۆشەکان کاری خۆیان بە لاوە شوورەیییە یان هەست بەشەرمەزاری دەکەن، لە هەڵەدان؛ چونکە ڕاستی شتێکی دیکەیە. کەسانێک کە بە هۆی هەڵە و تاوانی خویان یان نەهاتی دەست بۆ کارێکی دزێو و نەشیاو دەبەن، بە پێچەوانەی بۆچوونی ئێمە لە بارودۆخی خۆیان ناڕازی نین، تەنانەت چاوەڕوانن هەموو کەس ڕێزیان بۆ دانێ و بۆ ئەو مەبەستەش لەگەڵ کەسانێک هەڵدەستن و دادەنیشن کەبە کەسێکی بەڕێزیان بزانێ و لەگەڵ بیروباوەڕیان کۆک بێ. ئێمە سەرمان لەوە سووڕدەمێنێ کە دزەکان شانازی بە کارامەیی و لێهاتوویی و لەشفرۆشەکان بە هەرزەیی و پیاوکوژانیش بە دڵڕەقیی خۆیانەوە دەکەن. هۆی سەرسامبوونی ئێمە ئەوەیە لە نێو ئەواندا ناژیین و لەگەڵ ژیانی ئەوان نامۆین، بەڵام کاتێک دەبیستین ساماندارێک باسی بەدەستهێنانی ماڵ و سامانی خۆی دەکات کە لە ڕێگای تالان و بڕۆی خەڵکەوە بە دەستی هێناوە، یان سەردارێک باسی سەرکەوتن و قارەمانییەکانی خۆی دەکات کە هەمووی هەر پیاوکوژی و دڵڕەقییە، یان مرۆڤێکی پایەبەرز باسی دەسەڵات و تواناییەکانی خۆی دەکات کە سەرلەبەری ستەم و چەوساندنەوەی خەڵکە، سەرمام نابین و ئەگەر ئێمە سەبارەت بەو کەسانە داوەریی خراپ ناکەین و ئەوان بە پیاوکوژ و تالانکەر و زاڵم نازانین هۆیەکەی ئەوەیە لە کۆمەڵگایەکدا دەژیین کە ئەو جۆرە کارانە

بە کردەوەیەکی دزێو و نەشیاو نازانن و تەنانەت شانازیشی پێوە دەکەن. ئێمەش ڕێزەیەک لە پانتایی بەربڵاو و ئەندامێک لەو کۆمەڵگایەین.

ماسلۆڤای لەشفرۆش کە حوکمی زیندان و دوورخستنەوەی بۆ بڕابۆوە، لە شوێنێک دەژیا کە کارەکەیان بەلاوە پەسەند بوو و تا ئێستا پێی نەنابووە پانتایەکی بەرفراوانتر و تازەترەوە کە ناچار بێ بیر لە کار و کردەوەی خۆی بکاتەوە و بە خودا بچێتەوە؛ ئەو پێی وابوو باشترین شادی و بەختەوەریی پیر و گەنج، زانا و نەزان، دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات، چێژ وەرگرتنە لە ژنانی شۆخوشەنگ ؛ ئەگەرچی زۆر شتی دیکەش لە ژیاندا هەیە، بەڵام سەرەکیترین بابەتی ژیان هەرەسبازییە. ئەو کە خۆی بە ژنێکی جوان و دڵڕفێن دەزانی، بە خواستی خۆی یان بە ناچاری خۆی دەدایە دەست پیاوان بۆ ئەوەی چێژ لە جەستە لەشولاری وەرگرن و بەو کارەش خۆی بە کەسێکی گرنیگ و بەکەڵک دەزانی بۆ کۆمەڵگاکەی.

ژیانی ڕابردوو و ئێستای ئەو، فەلسەفەکەی ئەوی پەسند دەکرد. لەدە-دوازدە ساڵی ڕابردوودا، ڕووی لە هەر جێگایەک دەکرد، پیاوان لە دەوری ملۆمۆیان دەکرد و دەیانویست گڕی هەوەسیانی پێ دامرکێنن و تا هەنووکە پیاوێکی نەدیتبوو جگە لەوە چاوەڕوانییەکی دیکەی لێی هەبێ. ئەزموونی ژیان تێی گەیاندبوو دنیا گۆڕەپانی تاقمێک مرۆڤە کە ئامانجیان تەنیا چێژوەرگرتنە و بۆ گەیشتن بە کاوی دڵ و بەرژەوەندی و قازانجی خۆیان، هەموو کارێک دەکەن و لە درۆ و مەرایی و تەشیڕێسییەوە بگرە هەتا دەستدرێژی و زۆرەملی، لە هیچ شتێک ناپرینگێنەوە.

ماسلۆڤا بەو بیر و بۆچوونانەوە نەک خۆی بە کەسێکی سووک و بێ نرخی کۆمەڵگا نەدەزانی، بەڵکوو گرنیگترین و باڵاترین پلەوپایەی بە هەقی خۆی دەزانی و وەها لە سەر بیروباوەڕی خۆی سوور بوو کە ئامادە نەبوو

پێملی هیچ بیر و بڕوایەکی تر بێ. ئەگەر کەسێک قسەیەکی جیا لەوەی بکردبایە دڵی دەڕەنجا و دەرهەڵدەبوو. چونکە لەرزۆک بوونی کۆڵەکەی بیروباوەڕی دەبووە هۆی ئەوەی نەتوانێ لە ژێر باری ژیاندا خۆڕاگری بکات. هەر بەو هۆیە کاتێک هەستی کرد نۆخلیدۆڤ دەیهەوێ دەستی بگرێ و لەو گێژاوە ڕزگاری بکات و بیخاتە سەر ڕێگایەکی تازە، لە هەمەریدا هەڵوێستی گرت و پێمل نەبوو. لەوە دەترسا ئەو ڕێگا تازەیە بەرەو هەڵدێری بەرێ و هەستی بڕوابەخۆبوون لە دەست بدات، هەر لەو ڕەوگەیەشدا بوو کە ئێستا بیرەوەریی کاتی جحێلی و یەکەم خۆشەویستی لە خۆی دەتاراند. چونکە ئەم بیرەوەرییانە لەگەڵ باری ژیان و بیروباوەڕی ئێستای یەکی نەدەگرتەوە و هاوسەنگییەکەی لێ تێکدەدا. هەتا ئەمڕۆ توانیبووی ئەم بیرەوەرییانە لە قوژبنێکی ڕۆحیدا بنێژێ و شوورەیەکی بە دەوردا بکێشێ کە تەنانەت هیچ دەلاقە و دەروویەکیشی تێدانەبێ. وەک مێشەنگوینێک وابوو کە پلوورەی هەنگوینەکەی لە ژێر خۆڵدا شاردبێتەوە بۆ ئەوەی هیچ کەس دەستی بە شیلەکەی ڕانەگا. ئەمڕۆ بە جێی ئەوەی وەک پیاوێکی نوێ بە بیرۆکەی پاک و ناخی بێگەردەوە لە نۆخلیدۆڤ بڕوانی، ئەوی وەک پیاوێکی ساماندار و دەستڕۆیشتوو دەدی کە بە گیرفانی پڕ لە پارەوە هاتووە بۆلای و جگە لە هاو باوەشبوون لەگەڵ هیچ قەستێکی دیکەی نییە.

نۆخلیدۆڤ لە دنیایەکی دیکەدا دەژیا. کاتێک لەگەڵ ئاپۆرەی ملاقاتچییەکان لە بەندیخانە چووە دەرێ، لە بیری ئەوەدا بوو: «واچاکە هەموو شتێکی پێ بڵێم؛ پێی بڵێم دەمهەوێ ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێکبێنم.» کاتێک گەیشتە بەر دەرگای بەندیخانە دیسان پاسەوان دەستێکی لە شانی کوتا و ئەویشی وەک خەڵکەکەی دیکە ژمارد، کۆنت هیچی نەگوت. ئیتر گوێی بەو جۆرە بێ ڕێزییانە نەدەدا.

# چل و پێنج

نۆخلیدۆڤ بڕیاری دابوو شێوە و باروودۆخی ژیانی خۆی بگۆڕێ، خزمەتکارەکانی جواب بکات؛ خانوبەرە گەورەکەی بدا بەکرێ و ژوورێک لە هوتێل بگرێ. ئاگراڤنا ڕازی نەبوو و دەیگوت هەتا زستانێ دەست ڕاگرن باشترە؛ چونکە لە هاویندا کرێنشینی باش دەست ناکەوێ. جگە لەوەش دەبێ لە پێشدا ئەمبارێک بەکرێ بگرن و قەنەفە و کەلوپەلەکانی مالێی لێ دابنێن. بەم جۆرە بڕیارەکەی نۆخلیدۆڤ بێ ئاکام بوو. ئەو دەیویست خۆی بخزێنێتە قوژبنێک و وەک خوێندکارێکی زانکۆ بژی؛ بەلام هەموو شتێک وەک ڕابردوو لە جێی خۆی بوو. بێنەوبەرەیەکی زۆریش لە مالێدا وەڕێکەوتبوو. خەریک بوون مالەکەیان خاوێن دەکردەوە. مۆبل و کەلوپەلەکانی مالێیان خستبووە دەرێ، لەبەر تاو هەلیانخستبوون و ئەمبارەوباریان دەکردن.

دەرگاوان و یاریدەدەرەکەی و ژنی ئاشپەز و کۆرنئی خزمەتکار دەستیان دابووە دەستی یەک و دەیانویست هەموو کارەکان بە باشی جێبەجێ بکەن. لە پێشدا جلوبەرگەکانیان لە سندووق و دۆلابەکان دەرهێنابوو و هەلیانخستبوون. هێندێک لەو جلوبەرگانە لە پێستی زۆر گرانبایی دروست کرابوون و تا ئێستا بۆ تاقە جارێک لەبەرنەکرابوون. پاشان نۆرەی فەرش و مۆبلەکان بوو. دەرگاوان و یاریدەدەرەکەی شانوباهۆی بە هێزیان خستەکار،

قەنەفەکانیان ئەمبارەوبار کرد و فەرشەکانیان تەکاند. بۆنی نەفتالین هەموو ژوورکانی داگرتبوو. نۆخلیدۆڤ کە لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانی، چاوی بەو کەلوپەلانە کەوت کە بە سەریەکدا کەڵەکە کرابوون. ئەو هەموو قەنەفە و شتومەک و فەرش و جلوبەرگەی بە شتێکی بێ کەڵک و قۆڕ دەزانی و بە خەیاڵیدا هات: «ئەو کارانە چییە دەیکەن؟ ڕەنگە خراپیش نەبێ. ئاگراڤنا سەرقاڵ بوو. کورنئی و ئاشپەز و دەرگاوان و یاریدەرەکەی هێندێک جموجۆڵ دەکەن و وەرزشێکیشە بۆیان!»

«ڕەنگە پەلەپەلیش باش نەبێ. هەتا مەسەلەی ماسلۆڤا ڕوون نەبێتەوە، گۆڕینی ئەم بارودۆخە کەڵکی نییە. وا چاکە دەست ڕاگرم هەتا مەعلوم دەبێ ماسلۆڤا دەبەن بۆ تاراوگە و من دەتوانم لەگەڵی بچم یان نا؟»

بە دوای کاروباری ماسلۆڤاوە بوو؛ هەر ئەو ڕۆژەی کە بڕیار بوو وەدووی کارەکەی بکەوێ، چوو بۆلای فانارینی پارێزەری بەناوبانگی خانەی داد. نووسینگەکەی زۆر ڕازاوە بوو، بە دار و گوڵ و پەردەی گرانبایی و قەنەفەی ئەنتیکە ڕازابۆوە. وێدەچوو تازە پیاکەوتوو بێت و پارەیەکی مفتەی وەدەست کەوتبێت بۆ ڕازاندنەوەی ڕواڵەتی ژوورەکەی خەرج کردبێ. لە هۆڵی چاوەڕوانی کە زۆر پڕشکۆ بوو، تاقمێک لە دەوری مێزێک دانیشتبوون. سەر مێزەکە پڕ بوو لە کتێب و گۆڤاری سەرگەرمی و بە دیتنی ئەوانە لەڕێوە ژووری چاوەڕوانیی ددانپزیشکت وەبیر دەهاتەوە. نووسیاری جەنابی وەکیل کە لە سووچێکی هۆڵەکە لە سەر مێزێکی گەورە دانیشتبوو، سڵاوێکی گەرمی لە نۆخلیدۆڤ کرد و ڕۆیشت کە هاتنی بە جەنابی پارێزەر ڕاگەیێنێ . دەرگاکە نیوە کراوە بوو و فانارین و یەکێک لە بریگرتەکانی کە بازرگانێک بوو بە دەموچاوێکی سوور و سمێڵێکی زلەوە، خەریک بوو خوداحافیزیی دەکرد. بە بریقەی چاوی هەردووکیاندا دیاربوو کە گرێبەستێکی پڕلە

قازانجیان واژۆ کردووه و لە سەری پێک هاتوون. فانارین پێدەکەنی و تاوانی ئەو جۆرە مامەڵانەی دەخستە ئەستۆی ئەو.

ـ فانارینی بەڕێز! چبکەین؟ خۆ هەمووان ناچنە بەهەشت؛ دۆزەخ پێوستیی بە کەسانێکی وەک ئێمەیە.

ـ بەڵێ دۆستی بەڕێز! فەرمایشتەکەت بە جێیە!

هەردووکیان پێدەکەنین؛ دیاربوو بە زۆری پێدەکەنن. فانارین چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوت.

ـ فەرمووو حەزرەتی مەزن!

دەستی کابرای بازرگانی گوشی و دوای ڕۆیشتنی ئەو نۆخلیدۆڤ چووە ژوورەکەی جەنابی پارێزەرە کە قەنەفە و کورسییەکانی بە جوانی ڕێکوپێک داندرابوون. کۆنت لە سەر مۆبلێکی نەرم دانیشت و جەنابی وەکیل جگەرەیەکی بۆ ڕاگرت و خوڵکی کرد.

ـ سپاس! من بۆ مەسەلەی ماسلۆڤا هاتووم؛ خۆ لە بیرتانە؟

ـ بەڵێ حەزرەتی مەزن! خۆزگە هەمووان وەک تۆ بووایەن.

نازانی ئێمە چەندەمان کێشە و گرفت هەیە. خۆ ئەو پیاوەی چەند سات لەمەوبەرت دی کە ڕۆیشتە دەرێ؟ لانیکەم دوازدە میلیۆن ڕۆبڵی پارەی نەغد هەیە بەڵام گەلایەکی دە ڕۆبڵی لێ بستێنی دڵی دەتۆقێ.

مەبەستی جەنابی پارێزەر لەو قسانە ئەوە بوو کە بە کۆنت نۆخلیدۆڤ بڵێ ئێمە جیاوازین و لەگەڵ ئەو بازرگانە ڕژد و چکووسە زەوی تا ئاسمانمان فەرق هەیە!

ـ بە گیانی حەزرەتی مەزن مێشکی خواردم! نازانی چ پیسکەیەکە! خۆ دیقی پێکردم. بەڵام حەزرەتی مەزن، حیسابی ئێوە لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە جیاوازە. من بە وردی پەروەندەکەم خوێندەوە. تۆرگنیڤ وتەنی:

«ناوەرۆکەکەیم بە دڵە!» ئەو پارێزەرەی بۆ ماسلۆڤایان دەستنیشان کردووە، دیارە زۆر ناشارەزا بووە و تەواوی ڕێگاکانی لە ئێمە قەپات کردووە.»

ـ ئەی دەبێ چیبکەین؟

ـ هەر ئێستا عەرزتی دەکەم.

نووسیاری پارێزەر هاتە ژووری و بە سرتە شتێکی بە فانارین گوت.

ـ پێی بڵێ هەر ئەوەیە کە پێمگوتووە، کەموزیادی نییە.

ـ ئاخر ئەو مەبلەغەی پێ زۆرە.

ـ کەوایە قسەی لێ ناکەین.

ڕوخساری لە ڕواڵەتدا مێهرەبانی جەنابی وەکیل بۆ ساتێک گرژ بوو؛ بەڵام دوای ڕۆیشتنی نووسیار دیسان پێکەنین نیشتەوە سەر لێوی:

ـ حەزرەتی مەزن! تاقمێک پێیان وایە پارێزەرەکان بێ ئەوەی کارێکت بۆ بکەن گیرفانت هەڵدەتەکێنن. بیری لێ بکەوە، کەسێک کە قەرزدار بووە، قەرزەکەی لە کاتی خۆیدا نەداوەتەوە و تۆمەتباریش بووە، من لە هەموو گرفت و تەنگژەکان ڕزگارم کردووە. ئێستا هاتووە و بەجێی سپاس و پێزانین دەردەسەری بۆ من ساز کردووە. ڕازی کردنی خەڵک کاری حەزرەتی فیلە. نازانم کام نووسەرە دەڵێ: ئێمە نووسەران کوتێک لە گۆشتی خۆمان لە نێو جەوهەردا بە جێ دەهێڵین[٢٦]. ئێمە پارێزەرەکانیش هەر ئەو گیروگرفتەمان هەیە. ئێستا بێینە سەر پەروەندەی ئێوە... یان باشترە بڵێم ئەو پەروەندەیەی مەبەستتانە... دەبێ عەرزتان بکەم سەرەڕای ئەوەی تەواوی ڕێگاکان لەو پەروەندەیەدا کوێر بووبوونەوە؛ بەندەی بچووکت، توانیم بابەتی

26 ـ ئەم وتەیە تۆلستۆی هی خۆیەتی و لە یەکێک لە بەرهەمەکانیدا نووسیویەتی؛ لێرەدا نووسەر نقورچەک لە خۆی دەگەرێ.

زۆر باش بەدەست بهێنم و دادنامەیەکی باش ئامادە بکەم و تۆمەتباری ناوبراو فحێل بکەم.

لە نێو پەڕە کاغەزی پرژوبڵاوی سەر مێزەکەی چەند پەڕە کاغەزی چاپ کراوی دۆزییەوە کە بۆ ئەو جۆرە کاتانە بەکاری دەهێنا و بابەتەکەی بۆ نۆخلیدۆڤ خوێندەوە:

«نووسراوەیەک ئاراستەی دیوانی دەوڵەت... ووو... بۆ داخوازیی هەڵوەشاندنەوەی حوکمی ژومارە... سەبارەت بە حوکم درانی ماسلۆڤا، تۆمەتبار بە کوشتنی سملکۆڤی بازرگان کە بەپێی مادەی 1454ی یاسای تاوانی گشتی زیندانی بە کاری دژوارەوە بۆ براوەتەوە...»

گتێکی گرت. وشەکانی بە شێوەیەکی دانە دانە و بەوردی دەردەبڕی و بۆ ئەوەی گرنگایەتی کارەکەی خۆی نیشان بدات، زیاتری بۆ نۆخلیدۆڤ ڕوون دەکردەوە و دیسان چووە سەر خوێندنەوەی نووسراوەکە:

«حوکمی دادگا بە هۆی کەموکووڕیی کاروباری دادیاری و لادان لە ڕەوگەی یاسا و ڕێسای وڵات دەبێ هەڵوەشێتەوە. یەکەم ئیراد کە پێویستە لەو کەیسە بگیرێ، پەڕاندنی بەشێکی زۆر لە ڕاپۆرتی توێکاریی جەستەیە لەلایەن سەرۆکی دادگاوە.

نۆخلیدۆڤ بە سەرسووڕمانەوە پەڕییە نێو قسەکانی.

ـ خوێندنەوەی بەشێکی زۆری سووڕەت جەلەسەکە زیادی و بێ کەڵک بوو؛ هەمووانیش لەگەڵ بیروڕای سەرۆکی دادگا هاوڕا بوون.

ـ دەبێ ڕەخنە لەو دادگاییکردنە بگیرێ؛ ئیتر دروست و نا دروستەکەی گرنیگ نییە. سەرنج بدە درێژەی نووسراوەکە: «دووهەمین ڕەخنە ئەوەیە قسەکانی پارێزەری ماسلۆڤا چەند جار لە لایەن سەرۆکی دادگاوە قرتاوە و سووکایەتی بە کەسایەتیی ئەو ژنە کراوە. قەستی پارێزەر سەلماندنی بێ

تـاوانیی بریگـرتەکەی خـۆی بـووە، بەڵام سـەرۆکی دادگـا دەرهەڵبـووە و بە بیانووی دەرچوون لە بازنەی باسەکە وتەکانی پێ بڕیوە؛ بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە پـارێزەر بـواری ئەوەی نەبـووە بـێ تـاوانیی بریگـرتەکەی خـۆی بسەلمێنێ و سووکایەتی بە کەسایەتی تۆمەتبار نەکرێ.»

فانارین سەری هەڵبڕی و چاوی لە کۆنت نۆخلیدۆڤ کرد کە ئەو بەشـەی نووسراوەکەشی بەدڵ نەبوو و دەیویست بزانـێ بابەتەکەی شوێندانەربووە لە سەری یان نا.

ـ جەنابی فانارین! لێرەشدا سەرۆکی دادگا تاوانبار نەبوو؛ پارێزەر هێندەی درێژدادڕی کرد کە هیچ کەس نەیدەزانی مەبەستی چییە و سـەرۆکی دادگا لەڕاستیدا دەیویست یارمەتیی بدات.

ـ من ئەو پارێزەرە باش دەناسم. مرۆڤێکی گەمژەیە؛ نازانێ دوو قسـەی حیسـابی بکـات؛ بەڵام گرنیـگ نیـیە، بـۆ هەڵوەشـانەوەی حـوکمەکە دەبـێ بیانوویەک بدۆزینەوە.

لەگەڵ ئەوەی پێدەکەنی درێژەی بە خوێندنەوەی لایحەکە دا:

«بەڵام ڕەخنەی سێیەم ئەوەیە کاتێک سەرۆکی دادگا کورتەی دادنامەکەی بـۆ لێـژنەی داوەران بـاس دەکـرد، بە پـێچەوانەی، دەقـی تەبسـەرەی مـادەی 801ی دەستوورە یاساییەکان، سەبارەت بە بڕگە یاساییەکانی ئەم تۆمەتە و ئەرک و ئیختیارەکانی لیژنەی داوەران ڕوونکردنەوەی پێویستی بە دەستەوە نەداوە و هەر بەو هـۆیە، لێـژنەی داوەران تووشـی سەرلێشـێواوی بـوون و لەگەڵ ئەوەدا کە بـێ تـاوانیی ماسـلۆڤایان قەبـووڵ کـردووە و بۆیـان دەرکەوتووە ئەو سملکۆڤی بازرگانی دەرمانداو نەکردووە، بەڵام دەنگیان بە تاوانبار کردنی ئەو داوە.

ـ سەرۆک بە جوانی ڕوونی کردەوە؛ خەتای ئێمە بوو کە پێچەوانە بڕیارمان دا و بە هەڵە ئەو بابەتەمان واژۆ کرد.

فانارین بێ ئەوەی گوێ بەقسەکانی کۆنت نۆخلیدۆڤ بدات درێژەی بە خوێندنەوەی بابەتەکەیدا:

«چوارەمین خاڵ کە شیاوی باس کردنە، وەڵامی لێژنەی داوەران بەو پرسیارانەیە کە پێوەندیی بە ماسلۆڤاوە هەیە و دژوازییەکی ئاشکرای پێوە دیارە. ماسلۆڤا بە دەرمانداو کردنی سملکۆڤ تۆمەتبار کراوە بۆ ئەوەی ئەو بازرگانە لە نێو بەرێ و پارەکانی لێ بدزێ. بەم جۆرە، کارەکەی ئەو وەک هەوڵێک بۆ دزی کردن دێتە ئەژمار. لێژنەی داوەران لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا ماسلۆڤای بەری لە تۆمەتی دزی زانیوە و تەنانەت بەشداری کردنی ئەوی لە تالانی پارەی سملکۆڤ ڕەد کردۆتەوە و ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە لێژنەی داوەران ئەوی لە هەموو تاوانێک بەری ناسیوە بەڵام ڕوونکردنەوەی ناتەواوی سەرۆکی دادگا بۆ تێگەیاندنی ڕێسا و بنەما یاساییەکان بۆتە هۆی خراپ تێگەیشتن و لێژنەی داوەران بڕیاری هەڵەیان دەرکردووە. لە مادەکانی 808 و 816ی دەستووره جەزاییەکاندا ڕاشکاوانە ئاماژە بە و خاڵە کراوە کە سەرۆکی دادگا لە کاتی بینینی هەر جۆرە کەموکووڕییەک لە بڕیاری لێژنەی داوەراندا دەبێ داوایان لێ بکات دووبارە بە بڕیارەکەی خۆیاندا بچنەوە تاکوو وەڵامێکی دووبارە و بە دوور لە کەموکووڕی بۆ پرسیارە پێوندیدارەکان دەستەبەر بکرێ.

ـ بۆچی سەرۆک ئەو کارەی نەکردووە؟

فانارین زەردەی دەگرت.

ـ پرسیاری منیش هەر ئەوەیە.

ـ پێتـوایه لقـی دیـوانی بـاڵای وڵات له ئەنجـومەنمی سـەنا ئەم حـوکمە هەڵوەشێنێتەوە؟

ـ دەبێ بزانین ئەو ڕۆژە سەناتۆرەکان لە سەر چ مجێزێکن! ئێستا سـەرنج بدە دوایین بەشـی بـابەتەکە ... «بە ڕوانـین لەو بابەتـانەی بـاس کـرا، دەبـێ قەبـووڵی بکەیـن کە دادگـا هەقـی ئەوەی نەبـووە حـوکمی زینـدان بە کـاری دژوارەوە بە سـەر ماسلۆڤادا بسـەپێنێ و ئەم حـوکمە لەگەڵ بەنـد سـێیەمی مادەیـب 77 ی دەسـتووری یاسـایی یەک نـاگرێتەوە و ئەسڵە بنەڕەتییەکـانی دادیاریی پێشێل کردووە و بە سەرنجدانی ئەو بابەتانەی بۆم باس کردن، مـن بە ئەرکی سەر شانی خۆی دەزانم داوا لە بەڕێزانی بـاڵا بکەم بە پێـی مـادەی 909 و 910 و بەنـــدی دووەمـــی مـــادەی 912 و مـــادەی 928ی دەسـتوورەکانی یاسـا، ئەم حـوکمە هەڵوەشـێتەوە و پەروەنـدەکە بـدرێ بە یەکێک لە دادگا هاوتەرازەکـان و حـوکمێکی شـیاو و عـادڵانەی بۆ دەربکەن.» سـەرنج بـدە حەزرەتـی مەزن... بـۆ نووسـینی ئەم دادنـامەیە هەوڵێکـی زۆرم داوە؛ بەڵام وا باشـە لەگەڵ یەک ڕووڕاسـت بـین. چـونکە شانسـی سـەرکەوتن زۆر کەمە. هەمـــوو شـــتێک پێوەنـــدیی بەو کەســـانەوە هەیە کە لە ســـەر پەروەنــدەکە بیــروڕا دەردەبــڕن. ئەگەر لە ئەنجــومەنی ســەنا ناســیاوتان هەیە،ڕوویان لێ بنێ بەڵکوو هەوڵێکت بۆ بدەن.

ـ لەوێ ناسیاوم هەیە.

ـ کەوایە بەبێ ڕاوەستان وەدووی بکەوە. خۆشـت دەزانـی هەمـوو پیـر و کەلاکـن و نەخۆشـیی بێوەسـیرییان هەیە. نـاتوانن مـاوەیەکی زۆر لە سـەر کورسـی دانیشـن و پەروەنـدەکە بەوردی بخـوێنەوە! مـاوەی سـێ مانـگ دەخایێنێ هەتا پەروەندەکە دەگاتە ئەوێ و پێی ڕادەگەن. ئەگەر حوکمەکەیـان بەپێـی بڕیـاری یاسـایی پەسـندکرد، تەنیـا ڕێگـا ئەوەیە داوا لە خـاوەن شـکۆ

ئیمپراتۆر بکەین دەستووری بەخشینی بدات. لەوێش کارەکە سووک و ئاسان نییە. دەبێ داوای یارمەتی لە دۆستانی دەربار بکەی. خۆم لە دەربار دۆست و ناسیاوم هەیە و ئەگەر پێویست بوو داوای یارمەتییان لێدەکەین.

ـ زۆر سپاس. ئێستا بفەرموون بۆ ئەو ئەرک و زەحمەتانە چەندەتان پارە بدەمێ؟

ــ نووسیارەکەم خۆی ئەو کارانە جێبەجێ دەکا و کاغەزەکان دەداتە خزمەتتان واژۆی بکەن؟

ــ داواکارییەکی دیکەشم هەیە؛ ئیجازەنامەیەکی ملاقاتم لە دادیار وەرگرتووە؛ بەڵام دەڵێن بۆ ملاقاتی زیندانی لە کاتی نائاساییدا ئیجازەنامەی تایبەتی پارێزگاری دەوێ؛ ئێوە لەوە ئاگاداران؟

ــ بەڵێ وایە؛ ئێستا پارێزگار لە سەفەرە. هەموو کاروبارەکانی بە جێگرەکەی سپاردووە کە مرۆڤێکی گەوج و خوێنتاڵە و زۆر بە زەحمەت دەتوانی لەگەڵی پێک بێی.

ـ مەبەستت ماسلنیکۆڤە؟

ـ بەڵێ، دەیناسی؟

ــ زۆرباش؛ زۆر زیاتر لە ناسیاوی. دەبێ بڕۆم بۆلای. نۆخلیدۆڤ هەستاخوداحافیزیی بکات، ژنێکی وردیلەی زۆر ناشیرین هاتە ژوورێ. ڕەقەڵە و لووت پان بوو. ئەو ژنی فانارین بوو. دیاریش بوو لەو ناشیرینییەی خۆی نەک شەمەزار نییە بەڵکوو زۆریش بادیهەوا و لەخۆڕازییە. کراسێکی مەخمەری زەردی بە تەنزیل و قردێلەی کەسکەوە لەبەر دابوو، قژە تەنکەکەی چین چین هێنا بووە سەر لاجانگ و نێوچاوانی. پیاوێکی کەڵەگەتی ڕووخۆش و دەم بەپێکەنینی لەگەڵدا بوو چاکەتێکی هەورێشمینی لە بەردا و

بۆینباخێکی سەوزی لەملی کردبوو. نۆخلیدۆڤ ئەوی دەناسی و نووسەر بوو. ژنە ناحەزەکە هاتبوو فانارینی مێردی لەگەڵ خۆی ببات.

- دەبێ تۆش بێی،کۆڕیکی خۆشە. سیمۆن ئیڤانۆڤیچ بەڵێنی داوە شیعرە نوێیەکانی خۆی بخوێنێتەوە؛ تۆش وتارەکەی خوت سەبارەت بە گارشینی شاعیر بخوێنەوە.

نۆخلیدۆڤ دەیویست بڕوا کە ژنە سرتەیەکی لەگەڵ مێردەکەی کرد و هات بۆلای ئەو.

ـ حەزرەتی مەزن! زۆربە چاوپێکەوتنتان خۆشحالّم. تکایە ئێوەش تەشریف بێنن بۆ کۆڕەکەمان؛ هاتنی ئێوە بۆ هەمووومان مایەی شانازییە.

فانارینیش هات بەهانای ژنەکەیەوە تاکوو ڕازیی بکەن؛ ئەگەر چی دەیزانی لە هەمبەر جوانی و کەسایەتیی ژنەکەیدا هیچ کەس توانایی خۆڕاگریی نییە! نۆخلیدۆڤ پەرۆش و بێ تاقەت بوو، بەو پەڕی ئەدەبەوە داوای لێبوردنی لێکردن کە ناتوانێ لەو کۆڕە شاعیرانەیەدا ئامادە بێ و دوای سپاسکردن لەو خانمە، لە دەرگاکە چووە دەرێ. لەگەڵ پێوەدرانی دەرگاکە ژنە نێوچاوانی تێکنا و ئەوەندەی تر خۆی ڕەزاتاڵ کرد.

- ئەم پیاوە چەندە بە تڕوتۆپ و ئەداوئەتوارە.

نووسیاری جەنابی پارێزەر کاغەزەکانی ئامادە کردبوو کە لە هەمبەر هەزار ڕۆبڵدا هەتا کۆتایی بە دووی پەروەندەکەوە بێ. نووسیار لە سەرەخۆ و بەئەدەب قسەی دەکرد و دەیگوت جەنابی فانارین تەنیا پەروەندە گرنیگەکان قەبوول دەکات و تەنیا بەهۆی ڕێز و گەوریی کۆنت نۆخلیدۆڤەوە ئەم کارە چکۆڵەیەی گێڕاوەتەوە.

- ئەم داواکارییە کێ دەبێ واژۆی بکات؟

ـ تۆمەتبار خۆی. ئەگەر جەنابی فانارین بکەن بە کەفیلی کارەکە، خۆی واژۆی دەکات و دەیخاتە بواری جێبەجێکردنەوە.
ـ ئەم داخوازییە لەگەڵ خۆم دەبەم بۆ بەندیخانە و دەیدەم بەو ژنە خۆی واژۆی بکات.
نۆخلیدۆڤ هیوادار بوو بەو بۆنەیەوە دیسان چاوی بە ماسلۆڤا بکەوێ و زیاتری قسە لەگەڵ بکات.

# چل و شەش

لەکاتی دیاریکراودا پاسەوان فیتفیتەی لێدا. دەرگا ئاسنینەکانی بەندی ژنان کرانەوە. ژنان بە پێی پەتی یان بە گۆرەوییەوە لە نێو بەندکەدا دەهاتن و دەچوون. ئەو پیاوانەی بۆ بێگاری هاتبوون، سەتڵە گەورەکانی زبڵوزاڵیان هەڵگرت و بردیانە دەرێ. بۆگەنی زبڵوزاڵ وڵاتی داگرتبوو. زینیدانییەکان دەست و دەموچاویان شۆرد و جلوبەرگیان لەبەر کرد. لە نێو داڵانەکان ڕیزیان بەست و دوای کۆتایی هاتنی حازر و غایب، چوون ئاوی کوڵاتوو بێنن بۆچایی.
ئەو ڕۆژە بەندییەکان کاتی چایی خواردنەوە، لە دەوری یەک دانیشتبوون و قسەیان دەکرد. ئەو خەبەرەی دەماودەم دەگەڕا و بە گەرمە باسیان دەکرد، لێدانی قامچی لە دوو پیاوی بەندی بوو کە بڕیار بوو لەبەر چاوی هەموان لێیان بدەن. یەکێک لەو دوو کەسە، لاوێک بوو بە ناوی ڤاسیلی یێڤ کە سکرتێری خانەیەکی بازرگانی و کوڕێکی خوێندەوار بوو. تاوانەکەشی ئەوە بوو کە گراوەکەی خۆی لە حاڵەتێکی نائاساییدا کوشتبوو.

ئەو هاوبەندانەی لەگەڵی بوون، زۆریان خۆشدەویست. لاوێکی ڕەزا شیرین و دەستودڵباز بوو. سەری بۆ زوڵم و زۆر دانەدەنواند. هەر بەو هۆیەش کاربەدەستانی گرتووخانە ڕقیان لێی بوو؛ چونکە لە یاساوڕێساکان بە باشی ئاگادار بوو و بەرەڤاینی لە مافی خۆی و خەڵکی دەکرد. سێ حەوتوو لەمەوبەر یەکێک لە بەندییەکانیان بردبوو بۆ بێگاری. سەتڵی زوباڵەکەی لە سەرشان بەربووبۆوە و جلوبەرگی پاسەوانێکی پیس کردبوو. پاسەوانەکە دەرهەڵبووبوو و زۆری لە بەندییەکە دابوو. ڤاسیلی یێڤ لە سەری بە جواب هاتبوو و شەڕەکەی بڕیبووەوە بەر خۆی. پێشی گوتبووی یاساوڕێسای بەندیخانە ڕێگە نادا لە زیندانی بدەن. ئەو پاسەوانە گوڕاندبووی: «یاساوڕێسایەکت نیشاندەدەم بستێکی ڕۆن لە سەربێ!» ڤاسیلی یێڤ دەستی پاسەوانەکەی گرتبوو و بای دابوو و کردبوویە دەرێ. پاسەوان سکاڵای بردەبووە لای سەرۆکی بەندیخانە، سەرۆک فەرمانی دابوو ڤاسیلی یێڤ بخەنە بەندی تاکەکەسی. بەندی تاکەکەسی ژووری تاریک و چکوڵە بوون و دەرگاکەیان لە دەرەوە دادەخرا. لەم ژوورە تەنگ و تاریک و ساردانەدا نە پێخەفێک هەبوو نە جێگایەک بۆ دانیشتن؛ بەندی ناچار بوو لە سووچێک هەڵکورمێ یان لە تەرکی بەندکەدا ڕاکشێ. مشک لە کەلوکون دەهاتنە دەرێ و بە سەر و سنگی بەندیدا هەڵدەگەڕان. مشکەکان هێندە زۆر و ڕووهەڵماڵدراو بوون گازیان لە پەنجە و گوێچکەی بەندی دەگرت و پێیان وابوو پەنچکە نانە. ئەگەر بەندیی بێچارە بیویستبایە دووریان بخاتەوە لە خۆی، بە سەروچاویدا هەڵدەپڕژان. ڤاسیلی یێڤ کە خۆی بە تاوانبار نەدەزانی، نەیدەویست بچی بۆ بەندی تاکەکەسی. هاتن بە زۆر بیبەن. پاڵی پێوەنان و دووری خستنەوە. دوو هاوڕێی زیندانی هاتن بۆ یارمەتیی و ئەویان لە دەستی پاسەوانەکان سەندەوە. بەڵام پێترۆڤ، پاسەوانی فیلەتەن و

بەهێز، هاتە پێشێ و بە یارمەتیی پاسەوانەکانی دیکە، بە ڕاکێش ڕاکێش بردیان بۆ بەندی تاکەکەسی. کاربەدەستانی گرتووخانەکە بەهۆی بەرخودانی زیندانییەکانەوە ترسیان لێ نیشتبوو، ڕاپۆرتێکیان ئامادە کرد و ناردیان بۆ کاربەدەستانی بالاتر؛ لە ڕاپۆرتەکەدا نووسیبوویان: لە بەندیخانە تاقمێک ئاژاوەیان ناوەتەوە و پاسەوانەکان سەرکوتیان کردوون! کاربەدەستانی باڵاش لەڕیۆە دەستووریان دا ڤاسیلی یێڤ و هاودەستەکەی نێپۆم نیاشچی، هەرکام سی زەبری قامچییان لێدەن.

ئەم هەواڵە لە ڕۆژی ڕابردووەوە دەم بە دەم گەڕابوو و هەر کوێیەک دەچووی باس هەر باسی ئەو بابەتە بوو. کۆرابلڤا، ژیکەڵە، فێدۆزیا و ماسلۆڤاش لە سووچێک دانیشتبوون و باسی ئەو ماجەرایەیان دەکرد. هەرچواریان چایی و ئارەقیان خواردبۆوە و دەموچاویان سوورهەڵگەڕابوو. ماسلۆڤا وەک هەمیشە دەستودڵبازانە پارەی مەشرووبەکەی دابوو. دەیانویست ئەم بەیانییە بە مەستی و بێ ئاگایی ڕابوێرن. کۆرابلڤا کولۆ قەندێکی بەددانی دوولەت کرد و گوتی:

ـ خۆکارێکی خراپی نەکردووە، لە سەر هاوڕێکەی کردۆتەوە، نەیهێشتووە لێی دەن. لەم زەمانەدا هیچ کەس هەقی نییە لە زیندانی بدا.

فێدۆزیا لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ماسلۆڤا دەبێ لەگەڵ دۆستە دەسترۆیشتووەکەی خۆی قسە بکا بەڵکوو بتوانێ حوکمی قامچی لێدانی بەندییەکان هەڵوەشێنێتەوە. ماسلۆڤا تێگەیشت کە مەبەستی فێدۆزیا لە دۆستە دەسترۆیشتووەکەی کێیە.

ـ ئامادەیە لەبەر خاتری من هەموو کارێک بکات؛ یانی ئامادەیە سەری خۆشی لە ڕێی مندا دانێ. فێدۆزیا هەناسەیەکی هەڵکێشا. ژنی ماچڵەکچیی هێلاسن کە گویی لە قسەکانیان بوو، لە سەر ئەو باوەڕە بوو «ئیتر هیچ

دەرفەتێک نەماوە؛ دەڵێن چوون ئەو دوو کەسە بێنن.» باسی وەرزێڕێکی گوندەکەی خۆیانی گێڕایەوەکە قامچییان لێدابوو. بە تەواوی ڕووداوەکەی نەگێڕایەوە، لە قاتی سەرەوە دەنگە دەنگ پەیدا بوو. هەموو بێدەنگ بوون. ژیکەڵە دەیگوت:

ـ وادیارە خەریکن دەیانهێنن. حەتمەن بە قەستی کوشتن لێیان دەدەن. پاسەوانەکان زۆریان لێ داخ لە دڵن. چەند جار پێشی بە پێشێل کردنی یاساکانیان گرتووە.

لە قاتی سەرەوە دەنگ نەدەهات. ژنی ماچڵەکچی دەستی کرد بە گێڕانەوەی پاشماوەی ڕووداوەکە. لە دوای ئەو ژیکەڵە، ماجەرای قامچی لێدانی شێگلۆڤی گێڕایەوە کە چۆن بە قامچی دڕکدار کەوتبوونە گیانی و هیچ کەس دەنگیناڵە و هاواریشی نەبیست. فێدۆزیا کتریی چایی و پەرداخەکانی کۆ کردەوە. کۆرابلڤا و ژنی ماچڵەکچی خەریکی دروومان بوون و ماسلۆڤا لە سەر پێخەفەکەی خۆی دانیشت و ئەژنۆی لە باوەش گرت. هەتا ئەو کاتەی زیندانەوان هات بانگی کرد و گوتی ملاقاتی هاتووە.

ماسلۆڤا لەبەر ئاوێنە شکاوەکە دەستێکی بە سەروڕووی خۆیدا هێنا و لەچکەکەی ڕێکوپێک کرد. ژنی ماچڵەکچی لێی دەپاڕایەوە.

ـ حەتمەن پێی بڵێ دەیانهەوێ قامچی لە واسیلی یێڤ بدن... باسی بێ تاوانیی من و کوڕەکەمی بۆ بکە. پێی بڵێ کابرای خاوەن ئەمبار خۆی ئەو کارەی کردووە. کەسێک بە چاوی خۆی دیتوویە. هەموو شتێکی پێ بڵێ. بەڵکوو کارێکمان بۆ بکا. من و کوڕەکەم هیچ تاوانێکمان نییە. لەخۆڕا لەم بەقوڕێگیراوەیان کردووین.

کۆرابلڤا قسەکانی ژنی ماچڵەکچیی پشتڕاست کردەوە. ماسلۆڤا بەڵێنی دا داوای یارمەتی لە نۆخلیدۆڤ بکات.

ـ هەموو شتێکی پێدەڵێم. ڕەنگە وا باشتر بێ پەرداخێکی دیکە مەشرووب هەڵدەم بۆ ئەوەی غیرەتم ببزوێ و ئاسوودەتر قسەی لەگەڵ بکەم.

کۆرابلڤا پەرداخەکەی بۆ نیوە کرد. ماسلۆڤا یەکبین نای بەسەریەوە، دەمی سڕی و بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ بەوە دەڵێن دڵ و غیرەت.

پاشان بە دوای پاسەوانەکەدا کەوتە ڕێ و چوو بۆ ملاقاتی نۆخلیدۆڤ.

# چل و حەوت

ماوەیەک نۆخلیدۆڤیان لە پشت دەرگای بەندیخانە ڕاگرت. کاتێک چووە نێو زیندان ئیجازەنامەکەی دادیاری پیشان پاسەوانی کێشک دا.

ـ دەچیتە ملاقاتی کێ؟

ـ کاترین ماسلۆڤا.

ـ جارێ ناتوانی بچی. سەرۆکی بەندیخانە کاری هەیە.

ـ لە نووسینگەکەی کاری هەیە یان لە شوێنێکی تر؟

ـ لە نووسینگەکەی نییە؛ لە شوێنی ملاقاتە.

پاسەوانەکە قسەکانی دەگنخاند. دیاربوو شتێک دەشارێتەوە.

ـ ئەمڕۆ ڕۆژی ملاقاتە؟

ـ نا؛ لە شوێنی ملاقات کارێکی تایبەتیی هەیە.

ـ ئەی تەکلیفی من چییە؟

ـ دەبێ ڕاوەستن هەتا سەرۆک کارەکەی تەواو دەبێ.

نۆخلیدۆڤ نەیدەزانی چبکا، لەناکاو دەرگایەک کرایەوە و عەریفی بەندیخانە بە سەردووشیی بریقەدارەوە هاتە دەرێ. ڕوخساری سوورهەڵگەڕابوو. سمێڵی بە دووکەڵی جگەرە زەرد بووبوو. گوڕاندی بەسەر پاسەوانی کێشکدا:

ـ ئەو بەڕێزەت بۆ ڕاگرتووە؟ ڕێنوێنی بکە بۆ نووسینگەی سەرۆک.

ـ گوتیان سەرۆک لە شوێنی ملاقاتە.

کۆنت نۆخلیدۆڤ هەستی کردبوو خەریکە لە بەندیخانە شتێک ڕوودەدا. عەریف لە بارودۆخێکی ئاساییدا نەبوو. بە دوای ئەودا پێترۆڤ پاسەوانی لۆزەندەر هاتە ژوورێ. ئارەقەی دەردابوو و کەوتبووە هەناسەبڕکێ. بە عەریفی گوت: «دەترسم هەموومان تووشی دەدەسەری بین.» عەریف بە مۆڕەیەک بێدەنگی کرد. پێترۆڤ گرژبوو و لە دەرگاکە چووە دەرێ. نۆخلیدۆڤ پرسیارێکی لا دروست بوو.«بۆ دەبێ هەموو تووشی دەردەسەری بن؟ بۆ هەموویان شڵەژاون؟ بۆ عەریف ئاوا لەبنەوە مراقیب ماوە و چاوی لێدەکا؟»

ـ بەڕێز! تکایە فەرموون بچنە نووسینگەی سەرۆک.

هەر لەو کاتەدا سەرۆکی بەندیخانە هاتە ژوورێ. گرژ و تووڕەی دەنواند. بە پاسەوانی کێشکی گوت کاترین ماسلۆڤا لە بەندی ژمارە پێنج بێنێ بۆ نووسینگەکەی. وێدەچوو هاتنی کۆنت نۆخلیدۆڤیان پێ ڕاگەیاندبێ. پاشان پێکەوە لە قاڵدرمەیەکی باریک وەسەرکەوتن و چوونە ژوورێک کە پەنجەرەیەکی هەبوو لەگەڵ چەند مێز و کورسی. سەرۆک جگەریەکی دەرهێنا، دایگیرساند و گوتی:

ـ چ کارێکی پڕ زەحمەتە! بەڕاستی کەسپێکی پیسە!

ـ زۆر شەکەت دیاری.

ـ لەگیانی خۆم وەڕەز بووم. پیاو ناچارە کارێک بکات کە لەگەڵ باری ڕۆحیت یەک ناگرێتەوە و مێشکت ئازار دەدا. هەرچی بەو چارەڕەشانە دەڵێم و هەوڵیان بۆ دەدەم کە زۆر ئازار نەکێشن، کەڵکی نییە. خۆیان کاری وا دەکەن پیاو ناچار بێ توندوتیژی نیشان بدا. بەڕاستی کەسپێکی پڕ دەردەسەریمان هەیە. نۆخلیدۆڤ هێشتا نەیزانیبوو هاتنی ئەو کاربەدەستانی بەندیخانەی بۆچی ئاوا شڵەژاندووە؟ تەنیا هەستی کردبوو ئەو ڕۆژە لە زیندان شتێک ڕووی داوە.

ـ بێگومان کارێکی پڕدەردەسەرییە. زۆر ئاسان دەتوانی دەست لە کار بکێشییەوە و خۆت ئاسوودە بکەی.

ـ بەداخەوە چارم ناچارە. خۆ ملّک و میراتم پێ نەبڕاوە؛ دەبێ زەحمەت بکێشم و...

ـ بەڵام ئەگەر ئەو کارە ئەوەندەت ئازار دەدا، باشترە دەستی لێ هەڵگری. بۆ ئێوە کاری دیکەش زۆرە.

ـ دەبێ عەرزتان بکەم سەرەڕای ئەوەی ئازار دەکێشم بەڵام ویژدانم ناڕازی نییە. هەتا ئەو جێیەی لە توانام دایە بۆ ئاسوودەیی بەندییەکان تێدەکۆشم. بە هەر شێوەیەک بێ بارێکیان لە سەر سووک دەکەم. ئەگەر کەسێکی تر لە جێی من بووایە، جۆرێکی تر هەڵسوکەوتی دەکرد. کارێکی ئاسان نییە. دووهەزار کەس لێرەن؛ ئەویش ئەو کەسانەی لێرەن! خۆ ناکرێ هەروا وێڵیان بکەی و چاوت بە سەریانەوە نەبێ. هەرچۆنێک بن پیاو دەبێ بەزەیی پێیاندابێ. دەبێ پیاو یارمەتییان بدا.

سەرۆکی زیندان بۆ ئەوەی نۆخلیدۆڤ زیاتر لە کارەکانی خۆی ئاگادار بکات، باسی یەکێک لە تیکهەڵچوونەکانی بەندیخانەی بۆ گێڕایەوە کە کوژرانی کەسێک و بریندار بوونی چەند کەسی دیکەی لێکەوتبۆوە. باسەکەی سەرۆک

هێشتا تەواو نەبووبوو، ماسلۆڤا لەگەڵ پاسەوانێک هاتە ژووری. نۆخلیدۆڤ ماسلۆڤای لە نێو دەرگانەکەدا دی. دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو. سەری دەلەقاند و پێدەکەنی. کاتێک ماسلۆڤا چاوی بە سەرۆک کەوت، ترس هەموو گیانی داگرت بەڵام زوو وەخۆ هاتەوە و سڵاوی لە نۆخلیدۆڤ کرد، دەستی گرت و بەتوندی گوشیی. کۆنت تێگەیشت کە هەڵسوکەوتەکەی ئاسایی نییە.

ـ داخوازیی پێداچوونەوەی حوکمەکەم هێناوە واژۆی بکەی. پارێزەرێکی بەناوبانگ دادنامەکەی ئامادە کردووە. دوای واژۆ کردنی ئێوە دەیخەمە بواری جێبەجێ کردنەوە.

کۆنت کاغەزەکەی لە گیرفانی دەرهێنا، لە سەر مێزەکە داینا و لە سەرۆکی پرسی:

ـ لێرە دەکرێ شتێک بنووسرێ؟

ـ وەرە لێرە دانیشە ماسلۆڤا! قەڵەمێکیش هەڵگرە. خۆ دەزانی بنووسی؟

ـ جاران دەمزانی.

زەردەیەکی گرت. تەنوورەکەی بەلادا کرد و دانیشت. قەڵەمی بە دەستە خڕپنەکەیەوە گرت. نۆخلیدۆڤ پیشانی دا کوێ واژۆ بکات و ئەویش قەڵەمەکەی لە جەوهەر هەڵکێشا. چەند جار جووڵاندی، واژۆی کرد و قەڵەمەکەی لە جێی خۆی دانایەوە.

ـ تەواو بوو.

ـ تەواو بوو؛ بەڵام من قسەیەک هەیە دەبێ پێتی بڵێم.

ـ قسەکەت بکە.

ڕەنگی تێکچوو. وەک ئەوەی شتێکی خراپی وەبیرهاتبێتەوە. سەرۆکی بەندیخانە هەستا و چووە دەرێ. تەنیا نۆخلیدۆڤ و ماسلۆڤا و عەریف لە ژوورەکەدا بوون.

# چل و هەشت

عەریف لەبەر پەنجەرەکە و دوور لە مێزەکە ڕاوەستا بوو و کاری بەسەر ئەوانەوە نەبوو. کاتێکی گرنیگ بوو بۆ نۆخلیدۆڤ. نەیدەزانی چۆن دەست پێکا. خۆی لۆمە دەکرد کە بۆچی لە یەکەم دیداردا مەسەلەی زەماوەندی نەهێناوەتە گۆڕێ. ماسلۆڤا لە قەراغ مێزەکە دانیشتبوو و کۆنت بەرەوڕووی ئەو. ژوورەکە ڕووناک بوو. بە جوانی دەموچاوی ماسلۆڤای دەدی. چرچی سووچی لێوی و بەرچاوی پەنەمیوی دەدی و زیاتر بەزەییی پێیدا دەهات. چاوێکی لە عەریف کرد، هەنیشکی لە سەر مێزەکە دانا. دەیویست جۆرێک قسەبکات کە عەریف گوێی لێ نەبێ.

ـ کاتیۆشا! ئەگەر پێدا چوونەوەی حوکمەکە لە دادگا جێبەجێ نەبێ، داوای بەخشین لە ئیمپڕاتۆر دەکەم. هەر کارێک لە دەستم بێ درێغی ناکەم.

ـ ئەگەر لە سەرەتاوە پارێزەرێکی باشم هەبووایە، ئاوام بەسەر نەدەهات. ئەو پارێزەرەی بۆیان دەستنیشان کردبووم زۆر گەمژە بوو. بەجێی ئەوەی قسەی حیسابی بکات، چاوە حیز و برسییەکەی تێبڕیبووم. ئەگەر ئەو کاتە بیزاینبایە ئێوە ناسیاوی منن، کارەکە بەم جێیە نەدەگەیشت.

نۆخلیدۆڤ سەری سووڕمابوو. ماسلۆڤا لە چاو جاری پێشوو زۆر گۆڕابوو. لەپەستا قسەی دەکرد.

ـ ئێستا کە تووشی ئەو کێشە و تەنگژەیە بووم، تکایەکم هەیە. پیرێژنێک لە بەندەکەی ئێمە دایە زۆر دڵسوز و مێهرەبانە. هەموومان دڵمان پێی دەسووتێ. ئەو چارەڕەشە و کوڕەکەی بەبێ تاوان پێوە بوون. ئەو و کوڕەی تاوانی ئەوەیان داونەتەپاڵ کە شوێنێکیان ئاور تێبەرداوە. ئەو ژنە داوای لێکردم بە ئێوە بڵێم یارمەتیی بدەن. زۆر داماو و لێقەوماوە.

سەری داخست و گرژییەوە.

ــ زۆرباشە. دەچم چاوم بە مەنشۆڤ دەکەوێ لە بەندیخانە. بەڵکوو کارێکمان بۆ بکرێ. هاتووم مەسەلەیەکی زۆر تایبەتیت لەگەڵ بێنمە گۆڕێ. لە بیرتە جاری پیشوو چیم گوت؟

ـ باسی زۆر شتت کرد.

ماسلۆڤا سەری بە ڕاست و بە چەپ خوار دەکردەوە و پێدەکەنی.

ـ تکام لێکردی لە تاوانم خۆشبی.

ـ چ کەڵکێکی هەیە لێتان خۆش بم؟ بە کاری چیی ئێوە دێ؟

ـ دەمەوێ تاوانی ڕابردووم قەرەبوو بکەمەوە. دەمەوێ دڵم ئاسوودە بێ. دەمەوێ لەمەبەولاوە بە پاکی بژیم. با پێکەوە ژیانی هاوبەش پێک بێنین و لەگەڵ یەکدا بژیین. ماسلۆڤا گرژ بوو.

ـ سەرم لەو قسانەی ئێوە دەرناچێ.

ـ من لە ڕێگەی خودادا بە ئەرکی خۆمی دەزانم ئەو کارە بکەم.

ــ ئێوە خوداتان لە کوێ دیتووە؟ باسی کام خودا دەکەی؟ هەر ئەو خودایەی کە منی تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە کردووە؟

ئیتر نەیتوانی هیچ بڵێ. هەناسەی بۆنی توندی مەشرووبی لێدەهات. نۆخلیدۆڤ تازە بۆی دەرکەوت بۆچی ئەمرۆ ماسلۆڤا ئاوا توندوتیژ و بێباکانە قسەدەکات.

- لە سەر خۆ بە.

ـ بۆ لە سەرەخۆ بم؟ با ڕاست و ڕەوان پێت بڵێم. من مەستم. بەڵام دەزانم چی دەڵێم. من حوکمی زیندانم بە کاری دژوارەوە بۆ بڕاوەتەوە. من لەشفرۆشم. تۆش خانەدانی. شازادەی. بۆ یاری بە ئابڕووی خۆت دەکەی؟ شازادە دەبێ لەگەڵ شازادە خانمەکان کەینوبەینی هەبێ، نەک لەگەڵ منی لەشفرۆش… نەک منی لەشفرۆش کە هەموو کەسێک دەتوانێ بە چل ڕۆبڵ لە باوەشمدا بخەوێ.

نۆخلیدۆڤ بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

- ئەگەر هات و هاوار سازکەی، لە ڕاستییەکان تێناگەی. تێناگەی چەندە لەکاری خۆم پەشیمانم و چەندە خۆم لەهەمبەر تۆدا بە تاوانبار دەزانم.

ـ پەشیمانی چ کەڵکێکی هەیە. ئەو ڕۆژەت لەبیرە وا سەد ڕۆبڵت پێدام؟ ئەی بۆچی ئەو کاتە پەشیمان نەبووی؟

ـ ڕاست دەکەی. هەموو تێدەگەم و ئێستا دەمەوێ لێم خۆشبی. هەر کارێک بیلێی دەیکەم.

ـ باوەڕت پێناکەم. گرێو دەکەم زۆر زوو تەنانەت لە ملاقات کردنیشم پەشیمان دەبییەوە.

دای لە قاقای پێکەنین. نۆخلیدۆڤ ویستی دەستی بگرێ و هێوری بکاتەوە. ماسلۆڤا دەستی کێشا دواوە. جار لەگەڵ جار گڕی تووڕەیی ڕقەکەی بڵێسەدارتر دەبوو.

ـ زوو لێرە بڕۆ. من لە شفرۆشم. دز و پیاوکوژم. تۆ شازادەی؛ ئێرە جێگای تۆ نییە. تاوانی تۆ بە هیچ شتێک پاک نابێتەوە. لەم دنیایە تەماحت لە جەستەی من کرد، ئێستا لەبیری ئەو دنیا دای؟ ڕقم لێتە و لە سەرتاپات

بێزارم. ڕقم لە چاویلکە یەک چاوەکەتە. ڕقم لە دەموچاوە پۆتر لێدراوەکەتە. زوو لێرە برۆ دەست لەبەرۆکم بەردە.

دەنگی هەڵبڕی. دەستی کردبوو بە جنێودان. عەریف هاتە پێشترەوە.

ـ ئەوە چییە؟ کێ ڕێگەی پێداوی ئاوا هاتوهاوار وەڕێ بخەی؟ نۆخلیدۆڤ تکای لێکرد بگەڕێتەوە شوێنەکەی خۆی و لێیان گەڕێ قسەی خۆیان بکەن.

ـ هەقی نییە هەراوهۆریا ساز کا.

ـ ڕاست دەکەی. تەنیا یەک ـ دوو خولەک لێمان گەڕێ، ئارام دەبێتەوە.

عەریف ڕۆیشتەوە بۆ بەر پەنجەرەکە. ماسلۆڤا لەجێی خۆی دانیشتەوە، سەری داخست، قامکەکانی تێک پەڕاند و پێکەوەی گوشی. نۆخلیدۆڤ نەیدەزانی چی بڵێ.

ـ باوەڕ بە قسەکانم ناکەی؟ من دەمهەوێ زەماوەندت لەگەڵ بکەم.

ـ من شووت پێ ناکەم. ئەگەر لە سێدارەشم دەن شووت پێ ناکەم.

ـ چۆن دەڵێی من وادەکەم؛ هەر قسە نییە، بە کردەوە پێت دەسەلمێنم درۆ ناکەم.

ـ من پێویستم بە دڵسۆزی و یارمەتیی ئێوە نییە. خۆزگە بمردایەم و تووشی ئەم ڕۆژە ڕەشە نەهاتبایەم.

دەستی کرد بە گریان. هۆن هۆن دەگریا. گریانی کاتیۆشا دڵی نۆخلیدۆڤیشی پڕ کرد و دای لە قوڵپەی گریان. کاتیۆشا سەری هەڵێنا و چاوە فرمێسک تێزاوەکانی کۆنت نۆخلیدۆڤی بینی. بە لۆی لەچکەکەی چاوی خۆی سڕی. عەریف هاتە پێشێ و وەبیری هێنانەوە کە کاتی ملاقاتەکەیان کۆتایی هاتووە. ماسلۆڤا لە جێی خۆی هەستا.

ـ کاتیۆشا! سبەێنی دیسان دێمەوە. دەرفەتت هەیە بە جوانی بیر بکەیتەوە و وەڵامم بدەیتەوە.

ماسلۆڤا هیچی نەگوت و بەدوای عەریفدا وەڕێ کەوت. لە نێو بەندەکەدا ژنان دەورەیاندا. کۆرابلڤا گوتی:

ـ کچی باش! خەمی هیچت نەبێ. ئەم پیاوە تۆ لێرە ڕزگار دەکا. ساماندارەکان هەموو کارێکیان لە دەست دێ.

ژنی ماچڵەکچی لەگەڵ ئەو هاوڕا بوو.

ـ بۆ کەسانی هەژار و کڵۆڵ تەنانەت شەوی زەماوەندیش لێوڕێژە لە خەم و کەسەر، بەڵام خەڵکی زەنگین و ساماندار ئارەزووی هەر شتێک بکەن لە چاوترووکاندنێکدا بۆیان ئامادە دەبێ.

پیرێژنەکەی وا بە تۆمەتی سووتاندنی ئەنبار دەستبەسەر کرابوو دەیویست بزانی سەبارەت بە کاری ئەو و کوڕەکەی قسەی لەگەڵ ئەو کابرایە کردووە؟ ماسلۆڤا تاقەتی وەڵام دانەوەی نەبوو. لە سەر تەختەکەی دانیشت و چاوی لە سووچێک بڕی و هەتا شەوێ لە جێی خۆی جووڵەی نەکرد. بیر و خەیاڵ وەک هەنگەژاڵە لە نێو کاسەسەریدا هارووژابوون. قسەکانی نۆخلیدۆڤ بردبوویە فەزایەکەوە کە ساڵانێکی دوورودرێژ بوو لێی دابڕابوو، ئەو تەنانەت سڵی لە فەزایەکی ئەوتۆ دەکرد و نەیدەویست لێی نزیک بێتەوە. بیرەوەریی فەرامۆش کراو هێرشیان بۆ مێشکی هێنا بوو. هەموو شتێک لە دڵغەیدا زیندوو بووبوونەوە، ئەم بیرەوەرییانە ئازاریان دەدا. هەتا کاتی تاریک داهاتنی هەوا بەو شێوەیە مایەوە. شەوێ مەشرووبی کڕی لەگەڵ ژنەکانی دیکە خواردییەوە و پەنای بۆ دنیای سەرخۆشی برد.

# چل و نۆ

ماسلۆڤا لە درگاکە چووە دەرێ، نۆخلیدۆڤ لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد. خۆی لۆمە دەکرد: «قسەکانی ڕاستە. هەرچی ئەو دەیڵێ ڕاست وایە!» تازە تێگەیشتبوو چ بەڵایەکی بەسەر ئەو ژنە بەستەزمانە هێناوە. ئەگەر نەکەوتایەتە بیری قەرەبووکردنەوەی تاوانەکەی قەت ئەوڕاستییەی بۆ دەرنەدەکەوت. تەنانەت ماسلۆڤاش نەیدەزانی چ زوڵمێکی لێکراوە. ئێستا هەموو شتێک ڕوون بووبۆوە و هەردووکیان ڕاستییەکانیان بە هەموو بارە ناحەزەکانیانەوە بە چاوی خۆیان دەدی. هەم نۆخلیدۆڤ بۆی دەرکەوتبوو چیی کردووە و هەم ماسلۆڤا زانیبووی تووشی چ ڕۆژەڕەشییەک هاتووە. نۆخلیدۆڤ لە سەرەتای ئەو گۆڕانەدا خۆشی لە دڵی گەڕابوو. لە دڵی خۆیدا هەستی بە شادییەکی زۆر دەکرد، بەڵام وردەوردە ترس جێگای شادییەکەی گرتەوە؛ ڕێگایەکی سەیری گرتبووە بەر، ڕێگایەکی بێ گەڕانەوە. نەیدەتوانی هەموو شتێک بە نیوەچڵی بهێڵێتەوە و وەدووی کەیف و نەهەنگی خۆی بکەوێ، بە باشی دەیزانی ئەگەر بە دوای ئەو کارەدا بڕوا و هەتا کۆتاییەکەی بچێتە پێشێ، چ ئاکامێکی تاڵ چاوەڕوانییەتی.

لە نزیک دەرگای بەندیخانە، زیندانەوانێک کە سەر سنگی بە میدالّیا و نیشان نەخشابوو، سەرنجێکی مزیرانە و دەموچاوێکی کرێتی هەبوو، هاتە پێشێ. چاوی لە دەوروبەری خۆی کرد و نامەیەکی دایە دەستی.

ـ حەزرەتی مەزن! ئەم نامەیە کەسێک بۆی ناردووی.

ـ کێ بۆی ناردووم؟

ـ بیخوێنەوە تێدەگەی. نووسەرەکەی خاتوونێکە؛ بەندییەکی سیاسی. من لەو بەشە پاسەوانم. تکای لێکردووم نامەکەی بگەیەنمە دەستی ئێوە. هەڵبەت لە ڕوانگەی یاساییەوە ئەو کارە قەدەغەیە، بەڵام لە ڕوانگەی مرۆڤاتییەوە جیاوازە.

ئەم زیندانەوانە زۆر سوێرقسە بوو. کۆنت سەری سووڕمابوو کە چۆن پاسەوانێک نامەی بەندییەکی سیاسی دێنی و دەیدات بە ڕێبوارێک. لەوە ئاگادار نەبوو کە ئەو پاسەوانە حەزی لە سیخوڕییە و مەبەستی لە هێنان و بردنی نامە، سەردەرهێنان لە هێندێک لە کارەکانە! چاری نەبوو. نامەکەی لێ وەرگرت و لە بەندیخانە هاتە دەرێ. نامەکەی هەڵپچڕی. بە میداد نووسرابوو، لە هێنانی پیتی بێژ نەکراو[٢٧] خۆی پاراستبوو. نۆخلیدۆڤ نامەکەی خوێندەوە:

«بۆم دەرکەوتووە جاروبار دێی بۆ ئێرە تا چاوت بە ژنێک بکەوێ کە لە زیندانی ئاساییە. حەزدەکەم چاوپێکەوتنێکمان هەبێ. ئەگەر داوا بکەی، ڕێگەت پێدەدەن بێی بۆ سەردانم. ئاگادارییەکی زۆرم هەیە سەبارەت بە

27 ـ لە ئەلفوبێی ڕووسیدا جۆرێک e هەیە کە دەنووسرێ بەڵام ناخوێندرێتەوە. دوای شۆڕش ئەو پیتە لە ئەلفوبێ سڕدرایەوە. بەر لەوەش شۆڕشگێڕەکان ئەو پیتەیان نەدەنووسی.

بارودۆخی زیندان و ئەو ژنەی کە یارمەتیی دەدەی و زۆر شتی تر کە ئەگەر بتهەوێ دەینێمە ئیختیارتان.»

بە سپاسەوە... وێرا بۆگۆدوو خۆڤسکایا.

نۆخلیدۆڤ بیری کردەوە و ناسییەوە. لە گوندێکی دوورەدەستی شاری نۆ گۆروود وێرای دیتبوو. بۆ ڕاوی ورچ چووبوو بۆ ئەوێ. وێرا، کە لەو گوندە مامۆستا بوو، هاتبوو بۆ لای و داوای یارمەتیی ماڵیی لێکردبوو تاکوو بتوانی لە زانکۆ درێژە بە خوێندن بدا. ساڵانێکی زۆر بە سەر ئەو شەوەدا تێپەڕیبوو و لە بیری چوو بۆوە؛ بەڵام ئێستا دۆزیبوویەوە و بۆی دەرکەوتبوو بەندییەکی سیاسییە و دەیهەوێ چاوی پێی بکەوێ.

ئەو سەر دەمەی وەبیر هاتەوە و لەو کاتەدا کارەکان چەندە لە بەر چاوی سانای دەنواند و ئێستاش هەموو شتەکان چەندە ئاڵوز و دژوار بوون. بیرەوەریی ئەو ڕۆژانە و چاوپێکەوتنی وێرا زۆر شیرین بوو. چەند ڕۆژ بەر لە ڕێورەسمی پارێز[٢٨] بوو. لەگەڵ هاوڕێیانی بۆ ڕاوە ورچ چووبوون بۆ ناوچەیەکی دوور کە شەست کیلومەتر لە هێلاسن دوور بوو. ڕاوەکەیان بە باشی دەچووە پێشێ و دوو ورچیان ڕاو کردبوو، چوو بوون فراوێن بخۆن و بگەڕێنەوە بۆ شار کە خاوەنماڵ هات و بە کۆنت نۆخلیدۆڤی ڕاگەیاند کچی قەشەی گوندەکە دەیهەوێ چاوی پێی بکەوێ. یەکێک لە هاوڕێیانی بە گاڵتە پێی گوت:

ـ دەبێ کچێکی جوان بێ! کۆنت خۆزگەم بە خۆت!

نۆخلیدۆڤ گویی بە گاڵتەی هاوڕێکانی نەدا و هەستا و چوو بۆ ماڵی قەشە. دەیویست بزانێ کچی قەشە چ کارێکی پێیەتی.

---

28 ـ پارێز کردن لە خواردنی هێندێک لە خۆراکەکان، جۆرێک ڕۆژووە لە ئایینی مەسیحیدا باوە.

مـاڵی قەشـە نزیـک بـوو. ویـرا لەگەڵ دایکـی چـاوەڕوانی ئەو بـوون. کچـی قەشە ناشیرین و ڕەقەڵە بوو. چاکەتێکی قوڵەی لەبەردا و کڵاوێکی پێستی لە سـەر نـابوو. لە سـەرتاپایدا تەنیـا بـڕو کەوانییەکـانی جـوان و دڵـڕفێن بـوون. دایکی ویرا کاتێک نۆخلیدۆڤ چووە ژووریٚ بە کچەکەی گوت:

ـ ویـرا، کۆنـت خـۆی هـات بـۆ ئێـرە. ئێـوە پـێکەوە بەجێـدەهێڵم بـا بە ئاسوودەیی قسەی خۆتان بکەن.

دوای ڕۆیشـتنی ئەو نۆخلیـدۆڤ بە ڕێـزەوە مەبەسـتی چـاوپێکەوتنەکەی لـیٚ پرسـی. کـچە شـڵەژابوو نەیدەزانی چۆن مەبەستەکەی خۆی بە کۆنت نۆخلیدۆڤ بڵیٚ. سەرەتا تۆزیٚ سوورهەڵگەڕا بەڵام خێرا شەرمەکەی وەلا ناو گوتی:

ـ جەنابی کۆنت! من...من... ئەوەی دەمهەویٚ پێتانی بڵێم، زۆر سادەیە. ئێوە پیاوێکی دەوڵەمەندن؛ هەر چەندی بتانهەویٚ خەرج دەکەن. خەرجی ڕابواردن و جلوبەرگ و مەشرووب و جگەرە و ... من ئەو خەرجانەم نییە. دەمهەویٚ خـزمەت بەخەڵکـی بـکەم و قـازانجم بـۆ گەلەکەم هەبـیٚ، بەڵام بەداخەوە کۆسپێک لە سەر ڕێمدایە.

ڕاسـت و خۆمـانە دەدوا. قسـەکانی هەر لە سـەرەتاوە نیشـتە دڵـی نۆخلیدۆڤ. خۆی لە جێی ئەو دانا و بەزەییی پێیدا هات.

ـ هێشتا نەتگوتووە من چ کارێکم لە دەست دیٚ؟

ـ من مامۆستای قوتابخانەم. دەمهەویٚ بۆ درێژە دانی خوێندن بچم بۆ زانکۆ. بەڵام دەستوبالّم بەستراوە و ناتوانم بچم. ئەگەر ئێوە بڕیٚ پارەم بە قەرز بدەنیٚ، بەڵێنـی شـەرەفتان دەدەمـی دوای کۆتـایی هێنـان بە خوێنـدنەکەم پێتـان دەدەمەوە. پیاوێکی دەوڵەمەندی وەک ئێوە کە بۆ ڕابواردن ورچ ڕاو دەکات و گوندنیشنەکان سـەرخۆش دەکـا و پێکیانـدا دەدات، چـاوەڕوانیی سـەدان کـاری لەوە خراپتریشـی لێدەکریٚ، وا باشە کارێکی باشیش بکات. من بۆ چوونە زانکۆ پێویستم بە هەشتا

ڕۆبڵە. ئەو داوا کارییەم هەیە، جا پێم بدەن و نەیدەن جیاوازییەکی نییە و منەتت ناکێشم؛ لە کەسێکی دیکەی قەرز دەکەم.

ـ بە پێچەوانە بۆ من زۆر جیاوازە، زۆریشت سپاس دەکەم کە متمانەت بە من کرد و ئاوا ڕاست و ڕەوان قسەت کرد. تکایە هەر لێرە چاوەڕێ بە، هەتا چەند خولەکی تر دەگەڕێمەوە.

گەڕایەوە بۆ ماڵی خانەخوێکەی. هاوڕێکانی سەریان خستەسەری و گاڵتەیان پێدەکرد کە چووە بۆ لای کچی قەشە. بەڵام گوێی پێ نەدان. چوو هەشتا ڕۆبڵی لە جزدانەکەی دەرهێنا و ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی قەشە.

ـ کچی باش! سپاس لە من مەکە. من دەبێ سپاس لە ئێوە بکەم کە بوونە هۆی ئەوەی لە پاڵ ئەو هەموو کارە خراپەدا کارێکی باش ئەنجام بدەم.

تەنانەت وەبیرهاتنەوەی ئەو بیرەوەرییانەش بەلایەوە شیرین بوو. وەبیری هاتەوە کە تەنانەت لەگەڵ ئەفسەرێکی هاوقەتاری خۆی بەشەڕهاتبوو کە قسەی سووکی بە وێرا گوتبوو. وەبیری هاتەوە کاتی گەڕانەوە لەو سەفەرە هەستی بە چێژ و خۆشییەکی لە ڕادەبەدەر دەکرد. بارگینەکانیان لە کاشە کرد و وەڕێکەوتن. بارگینەکان بە سەر ڕێگای باریکدا وێرغەیان دەکرد. هێندێ جار ڕێگایان دەکەوتە نیودار و دەون و هێندێ جاریش بە نێو لێڕەواردا دەڕۆیشتن. بەفرەکە هێندە قورس بوو لک و پۆپی ناسکی دارەکانی داهێنابوو. کاتێک هەوا تاریک داهات، تەنانەت شۆقی سکڵی جگەرەی داییساو لە دوورەوە دەبیندرا. ئۆسیب، گوندنشینێکی گورجوگۆڵ کە ورویرکە و ڕێنوێنیان بوو، هێندێ جار بە پێیان و هێندێ جاریش دەهات سواری کاشە دەبوو و باسی ئەو ئاسکانەی دەکرد کە ئێستا لەم کاتەی شەودا لە نێو بەفر و بەستەڵەکدا سەرگەردانن، باسی ئەو ورچانەشی دەکرد

کە لە نێو کەندەڵان و کونە قووڵەکاندا جێیان خۆشکردووە، لە حەوساڵان ڕاست بوونەوە و هەناسەی گەرمیان وەک هەڵم و هاڵاو دەچێ.

نۆخلیدۆڤ وەبیری هاتەوە کاتی گەڕانەوە چ هەستێکی هەبووە. هەستی دەکرد ویژدانی ئاسوودەیە و پاک بۆتەوە. پڕ بە سیپەلکی هەوای ساردی هەڵدەمژی و کلووی بەفر کە لە دارە بەرزەکان دادەوەرین، دەموچاوی دەلاواندەوە. دەموچاوی یەکپارچە سەهۆڵ، بەڵام دڵی گەرم بوو. ئێتر خەم و کەسەر لە دڵیدا نەمابوو؛ نە ترسی لە دڵدا مابوو نە ئارەزوو! ئێتر خۆی لۆمە نەدەکرد و دڵی حەسابۆوە. چ شەوێکی خۆش بوو و چ زوو تێپەڕی. ئێستاش هەموو شتێک دژوار و پڕ ئازاری دەنواند.

ئەوەی ڕوون و ئاشکرابوو وێرا بووبووە کچێکی شۆرشگێڕ و لەم کاتەدا لە بەندی سیاسیدا بوو و دەیویست دیسان چاوی پێبکەوێ. نۆخلیدۆڤیش حەزی دەکرد ئەو ببینێ؛ چونکە وێرا نووسیبووی سەبارەت بە بەندی ژنان و ماسلۆڤا زۆر شت دەزانێ.

# پەنجا

بەیانیی ڕۆژی دوایی کاتێک نۆخلیدۆڤ لە خەو هەستا، ڕووداوەکانی ڕۆژی ڕابردووی وەبیرهاتەوە و لە ناکاو ترسێکی سەیر شکایە گیانی. سەرەڕای ئەو ترسە، لە سەر بڕیارەکەی خۆی سوور بوو و ئەو ڕۆژە بەو قەستە لە ماڵێ هاتەدەرێ کە بچێت بۆ لای ماسلنیکۆڤ؛ ئیجازە نامەیەکی لێوەرگەێ و چاوی بە ماسلۆڤا و وێرا و مەنشۆڤ بکەوێ کە بە تۆمەتی سووتاندنی ئەنبار دەستبەسەر کرابوو. لە مێژ بوو ماسلنیکۆڤی جێگری

پارێزگاری دەناسی و ئەو کاتەی ئەفسەر بوو ئەو لە یەکەکەی ئەواندا بەر پرسی بەشی ماڵی بوو. زانا و کارزان و جگە لە کاروباری یەکەی سەربازی و بەرژەوەندییەکانی ئیمپراتۆر گوێی بە هیچ شتێکی تر نەدەدا. بەڵام دوای زەماوەند کردن لەگەڵ ژنێکی دەوڵەمەند و بڕوابەخۆ، لە سەر داوای ئەو گوێزرایەوە بۆ ڕێکخراوەی دەوڵەتی و بوو بە جێگری پارێزگار. ئەم ژنە مێردەکەی وەک مێو لە مشتی خۆیدا دەگێڕا و وەک پشیلەیەکی دەستەمۆ ڕەفتاری لەگەڵ دەکرد. زستانی ئەو ساڵە نۆخلیدۆڤ جارێک چوو بوو بۆ سەردانی ئەو ژن و مێردە، بەڵام ژیان و هەڵسوکەوتیانی بە دڵ نەبوو.

ئەو ڕۆژە ماسلنیکۆڤ بە باوەشێکی ئاواڵەوە پێشوازیی لە هاوڕێی دێرینی خۆی کرد. دەموچاوێکی سوور و گۆشتنی هەبوو. بە جلوبەرگی ئاساییشەوە لەشی گۆشتن و سینگە پانەکەی دیار بوو. وەک هەمیشە ڕازاوە و ڕێکوپێک بوو. سەر و ڕیشی بە مۆدیلی ڕۆژ چاک کردبوو. پێکەوە بە شێوەیەکی خۆمانە قسەیان دەکرد.

ـ کارێکی باشت کرد هاتی. خانم بە دیتنتان زۆر خۆشحاڵ دەبێ. من تەنیا دە ـ دوازدە خولەک کاتم هەیە.

دەبێ لە کۆڕێکدا بەشداری بکەم. پارێزگار چووە بۆ سەفەر، هەموو شتێک کەوتۆتە ئەستۆی من؛ بەڕێوەبرنی پارێزگا بە من سپێردراوە.

دیار بوو زۆری ئەو بێنەوبەرە و گرفتارییانە بە دڵە.

ـ بۆ چ ئیشێک؟

ـ بەندیخانەی شار ژنێکی لێیە و هۆگری چارەنووسی بووم و دەمهەوێ لە نووسینگەی بەندیخانە چاوم پێی بکەوێ. دەڵێن مۆڵەتەکەی لە دەست تۆدایە.

کە وشەی بەندیخانەی بیست، خۆی قرژ کرد. بەڵام لە هەمبەر هاوڕێکەیدا هەروا خاکەڕا مایەوە.

ـ هاوڕێی ئازیز! هەر کارێکم لە دەست بێ بە گیان و دڵ دەیکەم. بەداخەوە دەرفەتم نییە.

ـ ئنجازەنامەکەم لە لاپەڕەیەکدا بۆ بنووسە.

ـ گوتت ژنێکە؟ بەچ تاوانێک بەندکراوە؟

ـ بە تۆمەتی پیاو کوژی؛ بەڵام بێ تاوانە و دادگا ئەو حوکمەی بە سەردا سەپاندووە.

ـ ئەوەش دادگاکانی ئێمە! مەرامی تۆ لەگەڵ من جیاوازە. تۆ لیبرالی و باوەڕەت بە چاکسازییە. بەڵام بە بڕوای من چارەیەکمان نییە دەبێ قەبووڵی بکەین.

C'est mon opinion bien arête [٢٩]

سەبارەت بە چەند وتاریش قسەی کرد کە لە ڕۆژنامە کۆنەپەرستەکاندا، تازە خوێندبوویەوە. نۆخلیدۆڤ زەردەیەکی گرت. نەیدەزانی بۆ هەرکەسەی ئەو بە حیزب و لایەنێکەوە گرێ دەدا؛ ئەگەرچی ئەو هیچی نەگوتبوو، تەنیا لە سەر ئەو باوەڕە بوو دەبێ لە دادگا گوێ لە قسەی تۆمەتباران بگرن و ڕێگایان پێ بدرێ بەرەڤانی لە خۆیان بکەن. لە سەر ئەو باوەڕەبوو لە هەمبەر یاسا و خانەی داددا هەمووان دەبێ یەکسان بن. لەو بڕوایەدا بوو کە دەبێ لەگەڵ بەندییەکان بە جوانی ڕەفتار بکرێ و نابێ بەدار و قامچی لێیان بدرێ و ئەشکەنجە بکرێن.

29 ـ من هەمیشە لە سەر ئەو باوەڕەم.

ـ دۆستی ئازیز! هێشتا نازانم لیبرالم یان نا، تەنیا ئەوەندە دەزانم کە دادگاکانی ئەمڕۆ بە هەموو کەموکووڕییەکانیانەوە لە دادگاکانی ڕابردوو باشترن.

نۆخلیدۆڤ سەبارەت بە ماسلۆڤا هێندێکی قسە بۆ کرد.

ـ پارێزەرەکەی کێیە؟

ـ فانارینە. خۆدەیناسی؟

ماسلینۆڤ خۆی گرژ کرد و بۆی گێڕایەوە کە ماوەیەک لەمەوبەر فانارین وەک شایەد بۆ دادگایەک بانگ کراوە و ئەو نیو سەعاتی تەواو تاریفی لە خۆی کردووە.

ـ کەوایە تۆ فانارینت بە دڵ نییە؟

ـ بەکاری تۆ نایە. C’est un bimme tare[٣٠]

ـ سپاس بۆ ڕێنوێنییەکەت. تکایەکی دیکەم هەیە. خانمێک کە مامۆستای قوتبخانەیە ئێستا لە زیندانە. نامەیەکی بۆ ناردووم و دەیهەوێ چاوم پێی بکەوێ. بۆ ملاقاتی ئەویش ئیجازەنامەیەکم دەوێ.

ـ زیندانی سیاسییە؟

ـ وا دەڵێن.

ـ حەتمەن دەزانی تەنیا دایک و باوک و خزمانی نزیک دەتوانن چاویان بە زیندانیی سیاسی بکەوێ... من ئیجازەنامەیەکی گشتیت بۆ دەنووسم بۆ ئەوەی هیچ بەربەستێکت نەبێ.[٣١] Jesais que vous n’abusez pas…

ـ گوتت ئەو ژنە ناوی چییە؟

ـ وێرا بۆگۆدۆ خۆڤسکایا.

---

30 ـ مرۆڤێکی ناجۆرە.

31 ـ دەزانم بە خراپ کەڵکی لێوە ناگرێ.

- جوانیشە؟

- نەک جوان نییە، بەڵکوو زۆریش ناشیرینە.

ماسلنیکۆڤ بە دڵسۆزییەوە چاوی لە نۆخلیدۆڤ کرد و لە سەر کاغەزێکی مارکدار نووسیی: «هەڵگری ئەم نامەیە کۆنت دیمیتری ئیڤانۆڤیچ نۆخلیدۆڤ مۆڵەتی هەیە لە نووسینگەی بەندیخانە چاوی بە ماسلۆڤا و ویرا بۆگۆدوو خۆڤسکایا بکەوێ.»

ـ باشە دۆستی ئازیز؟ لە بەندیخانە نەزمێکی ئاسنین هەیە و دەبێ هەرواش بێ. دەبێ زۆر سەختگیر بی. لەوانەیە تاقمێک ئاژاوە بنێنەوە و دەردەسەر ساز بکەن. من هەموو شتێکم خستۆتە ژێر چاوەدێری. کاتێک چووی بۆ ئەوێ تێدەگەی بارودۆخەکە چەندە لەبارە و هەمووان ڕازین. بۆ بەڕێوەبردنی ئەو شوێنە دەبێ لێزان و کارامە بی. چەند ڕۆژ لەمەوبەر لە بەندیخانە ڕووداوێک قەومابوو؛ تاقمێک ئاژاوەیان نابۆوە. فەرمانم دا لەڕێوە سەرکوتیان کردن و ئاژاوە چییەکان زۆر بە توندی سزا دران. زۆر بە ئاسانی هێمنایەتی مسۆگەر بوو. هێندێ جار دەبێ نەرمونیان بی و هێندێ جاریش تووڕە و بێ بەزەیی. چارەمان نییە.

دەستی لە قۆڵە شەق و ڕەقەکەی دەرهێنابوو و مشتی قووچاندبوو، قۆپچەی نقیم ئەڵماسی سەرقۆڵی ترووسکەی دەهات، خێراخێرا قسەی دەکرد.

- دەبێ بە مشت بکێشی بەسەری مرۆڤی نافەرماندا و لەگەڵ ئەوەشدا دەستی نەوازش بێنی بە سەری داماوەکاندا.

- من زۆر لە بارودۆخی بەندیخانە ئاگادار نیم. تەنیا دوو جار چووم بۆ ئەوێ و بارودۆخی نالەباری بەندیخانە زۆر خەمبار و نیگەرانی کردم.

- دەبێ بچی لەگەڵ کۆنتس پاسیک هاوکاری بکەی. ئەم خاتوونە تەواوی کاتی خۆی بۆ چاکسازی بارودۆخی بەندیخانە تەرخان کردووە. Elle fait

beaucoop de bien[٣٢] بە هۆی زەحمەتەکانی ئەوەوە کە من یارمەتیی دەدەم زۆر شتەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە. بەوپەڕی خاکەڕاییەوە ئەمە دەڵێم! ئیتر ئەو بارودۆخە ترسناکەی ڕابردوو لە نێوچووە. زیندانییەکان بەڕاستی دڵخۆش و بەختەوەرن. ئەم شتانە بە چاوی خۆت دەبینی و تێدەگەی من لەخۆڕا شاتوشووت ناکەم... بەڵام دیسان سەبارەت بە فانارین... داوات لێدەکەم زیاتر وریا بی. ئەگەرچی بە باشی نایناسم، هەر ئەوەندە دەزانم کە مرۆڤێکی باش نییە.

کەسێک کە ئەو جۆرە لە کۆبوونەوەی دادگادا تاریف لە خۆی بکات، دیارە کەسێکی باش نییە.

نۆخلیدۆڤ ئیجازەنامەکەی وەرگرت و سپاسی لێکرد.

ـ ئێستا دەبێ سەرێک لە خێزانم هەڵێنی.

ـ داوای لێبوردن دەکەم؛ ئێستا دەرفەتم نییە.

ـ ئەگەر بزانێ هاتووی و چاوت پێی نەکەوتووە دڵی لێت دێشێ. ئەگەر بۆ خولەکێکیش بێ دەبێ بچی بۆ لای.

ـ باشە بۆ جارێکی تر ئەگەر دەرفەتم هەبوو دەچمە خزمەتی.

پێشخزمەت گۆچان و پاڵتۆکەی بۆ هێنا. ماسلنیکۆڤ بە پێی خووخدەی هەمیشەیی هەتا یەکەم پێگۆڕکەی قادرمەکان بەڕێی کرد و گوتی:

ـ پێنجشەممە حەتمەن وەرە. ئەو ڕۆژە خێزانم میوانداری لە دۆست و هاڕێکانی دەکا.

---

32 ـ کاری زۆر بە کەڵک ئەنجام دەدا.

# پەنجا و یەک

نۆخلیدۆڤ لە ماڵی ماسلنیکۆڤ هاتە دەرێ و ڕاست ڕۆیشت بۆ بەندیخانە. بۆ ئەوەی کار ئاسانیی بۆ بکرێ لە پێشدا چوو بۆ ماڵی سەرۆکی بەندیخانە. دیسان وەک جاری پێشوو دەنگی پیانۆ دەهات. کچی سەرۆکی بەندیخانە خەریکی ژەنینیرپیانۆ بوو، ئەمجارەیان پارچەیەکی «کلێمانتی»[٣٣]ی دەژەنی و چەندەش ناخۆش و ناشارەزایانە دەیژەنی.

کڵفەتەکەیان قردێلەیەکی لە چاوێکی بەستبوو، بردی بۆ ژوورێکی چکۆڵە کە کورسییەک و چەند کورسیلەی لێبوو، مێزێکیش کە ڕووپۆشێکی پەشمینەی دەستچنی بە سەردا کێشرابوو. چرایەک لە سەر مێزەکە بوو لایەکی ئاباژۆرە کاغەزییەکەی نیوە سووتاو و ڕەش داگەڕاو بوو. سەرۆکی بەندیخانە بە ڕوخسارێکی خەمبار و ماندووەوە هات بۆ لای.

ـ ئیشێکت بوو؟

ـ جێگری پارێزگار ئیجازە نامەیەکی پێداوم. دەمەوێ چاوم بە کاترین ماسلۆڤا و چەند بەندیی دیکە بکەوێ.

33 ـ Ciementi ئاوازدانەری ئیتالیایی«1832ـ 1752» یەکێک لە مامۆستایانی قوتابخانەی مودێرنی پیانۆ. زۆربەی تەمەنی لە لەندەن مایەوە و سۆنات و سەمفۆنیای زۆری دانا.

ئیجازەنامەکەی دایە دەست سەرۆکی بەندیخانە. سەرۆک بە دەنگی بەرز داوای لە کچەکەی کرد کە لە ژوورەکەی تەنیشت پیانۆی دەژەنی چەند خولەک دەستی لێ هەڵگرێ بۆ ئەوەی لە میوانەکەی حاڵی بێ، بەڵام داواکەی بێ کەڵک بوو و کچە هەروا دەیژەنی.

ـ فەرمووت مارکۆڤا؟

ـ نا. ماسلۆڤا

ـ بەڵێ، بەڵێ. ئەو بەندییە دەناسم.

سەرۆکی بەندیخانە هەستا و چوو بۆ ژوورەکەی تەنیشت و داوای لە کچەکەی کرد چەند خولەک دەست ڕاگرێ. پیانۆکە بێدنگ بوو. سەرۆک گەڕایەوە و جگەرەیەکی داگیرساند کە بۆنێکی نەرمی هەبوو. جگەرەیەکی بۆ نۆخلیدۆڤیش ڕاگرت بەڵام ئەو بە ڕێزەوە داوای لێبووردنی کرد و هەڵی نەگرت.

ـ بەڵێ. دەمهەوێ چاوم بە ماسلۆڤا بکەوێ.

ـ بەداخەوە ئەمڕۆ ناکرێ.

ـ بۆ؟ مەگین شتێک ڕووی داوە؟

سەرۆکی بەندیخانە بزەیەکی مانادار نیشتە سەر لێوی.

ـ تاوانەکەی لە ئەستۆی خۆتە، حەزرەتی مەزن! لە مەولا ئەگەر ویستت پارە بدەی بە بەندییەک بیدە بە ئێمە، دڵنیا بە پارەکە بە دەست لێ نەدراوی دەدەین بە بەندییەکە تاکوو بۆ شتی پێویست خەرجی بکات. دوێنێ پارەت دابوو بە ماسلۆڤا. ئەویش هەمووی دابوو بە ڤۆدکا و خواردبوویەوە. هێندە سەر خۆش بوو ئاگای لە خۆی بڕابوو... هەرچی هەوڵ دەدەین پێشی هێنانە ژوورێی مەشرووبمان بۆ ناگیرێ.

ـ کەوایە نێو زیندان خواردنەوە و ڕابواردنیشی تێدایە؟

- دەستوورم داوە ماسلۆڤا ببەن بۆ بەندێکی دیکە. دەڵێن ئەو زۆر بێدەنگ و لەسەرەخۆیە.

نۆخلیدۆڤ دوێنێی وەبیر هاتەوە کە بارودۆخی بەندیخانە ئاسایی نەبوو. دەیویست هەموو شتێک بزانێ.

ــ دەمــهەوێ چـاوم بە ویـرا بۆگـۆدۆ خۆڤسـکایاش بـکەوی بەنـدییەکی سیاسییە.

- دەتوانی ئەو ببینی.

کچە چوار- پێنج ساڵانەکەی سەرۆک غاریدا نێو ژوورەکە و قسەکەی پێ بڕین.

- کچم! بۆ هاتی بۆ ئێرە؟ چاو لە بەرپێی خۆت کە نەکەوی.

کچە کە گوێی بە قسـەی بـاوکی نەدەدا، لاقی لە فەرشـەکە گیـرا و کەوت، دیسـان هەسـتایەوە و ڕۆیشـت بۆ لای بـاوکی. سـەرۆک کـچەکەی نـایە سـەر کۆشی و لە باوەشی باوکیدا چاوی لە نۆخلیدۆڤ بڕیبوو.

- دەتوانم ئەمڕۆ سەردانی ئەو ژنە بکەم؟

- قەیناکا، بچۆ.

نۆخلیـدۆڤ و ســەرۆکی بەنــدیخانە هەســتان و پــێکەوە چــوونە دەرێ. سەرلەنوێ دەنگی پیانۆ بەرز بۆوە. پارچەیەک لە کلێمانتیی دەژەنـی. سـەرۆک دەردەدڵی بۆ کۆنت نۆخلیدۆڤ دەکرد.

ــ کـچەکەم مـاوەیەک لە قوتابخـانەی مۆسـیقا دەرسـی دەخوێنـد، بەڵام بەردەوام نەبوو لە سەری؛ حەز دەکا ببێتە ژەنیاری ئۆرکێسترا. لەگەڵ نزیک بوونەوەی سەرۆک دەرگای بەندیخانە کرایەوە. هەموو ئاگادار ڕاوەستان و کونچکـاوانە چاویـان لە نۆخلیـدۆڤ دەکـرد کە شـان بە شـانی سـەرۆک دەڕۆیشت. چوار بەندی کە بە سـەری تاشـراوەوە سـەتڵی زباڵەیـان لە سـەر

شـان دانابوو،خۆیـان کێشـا بـۆ بـن دیـوارەکە بـۆ ئەوەی سـەرۆکی بەنـدیخانە پڕیشکەی لێ نەکەوێ. یەکێکیان نێو چاوانی گرژ کردبوو و چـاوە ڕەشـەکانی بریقەیان دەهات. سەرۆک هێشتا هەر باسی کچەکەی دەکرد.

ـ هونەر شتێکە پێویستی بە پرۆڤە و هاندان هەیە. لەو خـانوبەرە چکۆڵەی ئێمەدا کچەکەم بە ئاسوودەیی ناتوانێ پرۆڤە بکات و زۆر لە زەحمەت دایە.

سەرۆکی بەندیخانە گوێی بە دەوروبەری خۆی نەدەدا و زۆر کەمتەرخەم بوو.

ـ ناوی ئەو بەندییە چبوو؟

ـ وێرا بۆگۆدۆ خۆڤسکایا.

ـ لە بەندی سیاسییە؛ دەبێ هێندێ چاوەڕوان بی هەتا بانگی دەکەن.

ـ ڕێـگەم پێدەدەی لەو دەرفەتەدا بچـم چـاوم بە مەنشـۆڤ بـکەوێ. ئەو و دایکی بە تۆمەتی ئاورتێبەردانی ئەمبارێک بەند کراون.

ـ مەنشۆڤ لە بەندی بیست و یەکە. ئەگەر بێت بۆ ئێرە خۆتان ئاسوودە ترن.

ـ حەزدەکەم لە بەنـدەکەی خۆیـدا مەنشـۆڤ ببیـنم. هەڵـبەت ئەگەر ئیجـازە بفەرموون.

ـ ئەوە دیارە جۆرێک سەلیقەیە؛ قەیناکا.

سـەرۆکی بەنـدیخانە ملازمێکـی بەلەبـاریکە و ڕووخۆشـی بانـگ کـرد و داوای لێکرد کۆنـت نۆخلیـدۆڤ ڕێنـوێنی بکات بـۆ بەنـدی بیسـت و یەک. ئەو ملازمە قژی بۆر و سمێڵی بریقەدار بوو، بۆن و عەترێکی لە خۆی دابـوو کە بۆنەکەی دالانی بەندەکانی داگرتبوو و زۆر بە ڕێزەوە لەگەڵ کۆنت دەدوا.

ــ زۆر خۆشـــحاڵین کە کەســـانێکی وەک ئێـــوە گرنگـــی بە ڕێکخـــراوەی زیندانەکان دەدەن.

ــ ئەو کەســەی کە دەمــهەوێ چــاوم پێــی بـکەوی بــێ تــاوان کەوتـۆتە بەندیخانە.

ملازمی بەلەباریکە شانی هەڵتەکاند و گوتی:

ـ بەڵێ، هێندێ جار ئەو شتانە ڕوودەدا؛ بەڵام زۆربەی ئەوانە درۆ دەکەن. هەمووان دەڵێن بێ تاوانین.

کۆنت بەدوای ملازمدا لە داڵانەکەوە تێدەپەڕی. لە هەموو لایەکەوە بۆگەن دەهات. دەرگای بەندەکان کرابوونەوە. هێندێک لە بەندییەکان هاتبوونە نێو داڵانەکە. پاسەوانەکان بە نێویاندا دەگەڕان و ملازمی بەلەباریکە بە ئاماژەی دەست وەڵامی ڕێزدانانی ئەوانی دەدایەوە. هێندێک لە بەندییەکان پاڵیان بە دیوارەوە دابوو. هێندێکشیان لەبەر دەرگای بەندەکەیان واقوڕماوانە ڕاوەستابوون سەیری نۆخلیدۆڤ و ملازمیان دەکرد. کۆنت و ملازم لە داڵانەکە تێپەڕین. بەلای چەپدا بایاندایەوە و لە دەرگایەکی ئاسنین چوونە ژووریٚ و گەیشتنە داڵانی دووهەم، کە لە داڵانی یەکەم تاریکتر و بۆگەنتر بوو. ملازم جێگای مەنشۆڤی لەو پاسەوانە پرسی کە لە نێو داڵانەکەدا دەهات و دەچوو. پاسەوانەکە گوتی:

ـ دەرگای هەشتەم. دەستە چەپ. جەنابی ملازم!

# پەنجا و دوو

نۆخلیدۆڤ لە ملازمی بەلەباریکەی پرسی دەتوانی لە دەربیجەوە چاو لە بەندەکان؟ ملازمیش زەردەیەکی گرت و بە ئاماژە تێیگەیاند کە ئاساییە. نۆخلیدۆڤ لە دەربیجەکە نزیک بۆوە. چاوی لە نێو بەندەکە کرد. لاوێکی کەڵەگەت و چوارشانەی دی. ڕێشکی کورتی هەبوو، کراس و ژێرپانتۆڵی لەبەردابوو و بە نێو بەندەکەدا دەهات و دەچوو. کاتێک زانیی کەسێک لە

دەرەوە چاوی لێدەکا، نێو چاوانی تێکنا. نۆخلیدۆڤ چووە پێشترەوە و لە دەربیجەکەوە چاوی لە بەندێکی دیکە دەکرد. چاوێک بە ترسەوە لە دەربیجەکە ڕامابوو. لە بەندێکی تردا پیاوێکی وردیلەی دی لە سووچێک ئەژنۆی لە گرتبووە باوەش، خەوتبوو و پاڵتۆکەی بەسەر خۆیدا دابوو. لە بەندی چوارەم پیاوێکی چوارشانە سەری کردبووە سەر چۆکی و لە سووچێک هەڵکرمابوو. بە بیستنی ترپەی پێی کۆنت لە جێی خۆی هەستا و هات بۆ بەر دەربیجەکە. خەم و خەفەت لە نێو چاوانیدا شەپۆلی دەدا.

نۆخلیدۆڤ ترس و خەم هەموو گیانی داگرتبوو. ئیتر دەترسا لە دەربیجەکانەوە چاو لە نێو بەندەکان بکات. گەیشتە بەندی ژمارە بیست و یەک. پاسەوانێک قوفڵەکەی کردەوە، مەنشۆڤ لەوێ بوو. لاوێکی توندوتۆڵ بوو بە ملێکی درێژ و ڕیشێکی تەنکەوە. چاوی پڕ لە پرسیاری تاوێک لە سەر نۆخلیدۆڤ و تاوێک لە سەر ملازمی بەلەباریکە دەگێرسایەوە.

ـ ئەم پیاوە هاتووە یارمەتیی تۆ بدات.

ـ زۆری سپاس دەکەم تەشریفی هێناوە.

نۆخلیدۆڤ چووە پێشترەوە و لە نزیک میلە ئاسنین و پیسەکان ڕاوەستا و گوتی:

ـ سەبارەت بە ئێوە هێندێ شتم بیستووە. دەمهەوێ لە زمان خۆتانەوە گوێم لێبێ.

مەنشۆڤ هات بۆ بەر دەربیجەکە. وردەوردە دەستی کرد بە قسە کردن. سەرەتا هێندێک شەرمی دەکرد. جارێک لە ملازم و جارێک لە نۆخلیدۆڤی دەڕوانی. بەسەرهاتی ئەو بە هەموو کەندولەندەکانییەوە، باسی لە کێشە و چەرمەسەریی وەرزێرێکی ساویلکە دەکرد. نۆخلیدۆڤ بە دڵێکی کەیلەوە گوێی بۆ ڕاگرت. تەختی دارین و لەقی بەندەکە، دۆشەکی پڕ لە کا، میلەی

ئاسنینی پەنجەرەکان، دیواری پیش و شێدار و قەڵافەتی داماوانەی ئەو لاوە لێقەوماوە، کزەی لە دڵی هەڵدەستاند. ئەوەی لە زمانی ئەو لاوە لادێییەی دەبیست، تووشی خەمێکی تاڵی کرد بوو و تاساند بووی. ئەم لاوە بێ تاوانەیان لە گوندەوە هێنابوو، جلی زیندانیان لە بەرکرد بوو و لەو قوژبنە پیسەیان پەستاوتبوو. ئەم لاوە هێندە ساویلکە بوو نەیدەزانی درۆ بکا. تەواوی سەربردەی خۆی بە شێوەیەکی سادە دەگێڕایەوە، پیاوێکی مەیخانەچی، چەند مانگ دوای زەماوەندەکەی، ژنەکەی لێ هەڵدەفریوێنێ و هەڵیدەگرێ. ئەویش بۆ ساندنەوەی ژنەکەی پەنا بۆ هەموو کەسێک دەبات و ڕوو لە زۆر کەیخودا و پیاوماقووڵ دەنێ، بەڵام هیچ کەس گوێی پێ نادا. کابرای مەیخانەچی کە دەوڵەمەندیشە و لەگەڵ خەڵکانی دەستڕۆیشتووش ئاشنایەتیی هەیە، ناهێڵێ دەنگی بە هیچ کوێ بکات. ڕۆژێک ئەم لاوە ساویلکە و هەژارە بە زۆر ژنەکەی دەباتەوە بۆ ماڵی خۆیان دوای چەند ڕۆژ ژنە دیسان هەڵدێ و دەچێتەوە بۆلای کابرای مەیخانەچی، مەنشۆڤ بۆ ساندنەوەی ژنەکەی دەچێتە بەر دەرگای ماڵی مەیخانەچی، بەڵام تاقمێک دارودەستەی کابرا دەیگرن و خوری شۆری دەکەن، هەر ئەو شەوەش ئەنبارە ئاوری تێبەر دەبێ. ئاور تێبەردانی ئەمبارەکەش دەخەنە ئەستۆی مەنشۆڤ و دایکی.

- کەوایە تۆ ئەمبارەکەت ئاور تێبەر نەداوە؟

- گەورەم! تەنانەت بیریشم لە ئاور تێبەردان نەکردۆتەوە. ئەو پیاوە خۆی ئاوری تێبەرداوە بۆ ئەوەی من و دایکم بە گرتن بدا. لە گەڕەکەکە دەیانگوت ئەمبارەکەی بیمە بووە. بەو پێیە بیمەی ئەمبارەکەشی وەردەگرێ، من و دایکیشم پێوە دەکا و ژنەکەشم داگیردەکا، بۆیە ئەو پیلانەی دارشتووە. ئەو

شەوەی ئەو دەڵێ ئەمبارەکە ئاوری گرتووە، من پێم بەو گەڕەکەدا نەچووە، خۆ هێندەیان لێدا بووم خۆم لە سەرپێ نەدەگرت، بتوانم کاری ئەوتۆ بکەم.

ـ سەیرە!

ـ گەورەم، سوێند دەخۆم کاری من نییە. تۆ ئەو کەسەی دەیپەرستی یارمەتیمان بدە و ئێمەی چارەڕەش و لێقەوماو لەم گرفتارییە ڕزگار بکە. هیچ کەس گوێ بە قسە و سکاڵامان نادا.

لە بەر پێی نۆخلیدۆڤدا چۆکی دادا و ویستی کەوشەکانی ماچ بکات. نۆخلیدۆڤ بە شەرمەزارییەوە قۆڵی گرت و بەرزی کردەوە. مەنشۆڤ دەلەرزی، هۆن هۆن دەگریا و بە ئاتەگی چاکەتەکەی فرمێسکەکانی دەسڕی.

نۆخلیدۆڤ ئیتر هیچی نەگوت. بەڵێنی پێدا ئەوەی لە دەستی بێت دریغی نەکات و لە بەندەکە هاتە دەرێ. پاسەوان دەرگاکەی داخستەوە و مەنشۆڤ لە دەربیچەکەوە چاوی لە نۆخلیدۆڤ و ملازمی بەلەباریکە دەکرد.

# پەنجا و سێ

کاتی خواردنی نانی نیوەڕۆی بەندییەکان بوو و دەرگای بەندەکان کرابوونەوە. بەندییەکان بە ڕووپۆشی زەردی کاڵ و پانتۆڵی فش و قوڵە و نەعلەوە دانیشتبوون و بە حەسرەتەوە چاوان لە نۆخلیدۆڤ دەکرد. کۆنت دڵی پێیان دەسووتا. لەو کەسانە بێزار بوو کە زیندانەکانیان لەم کەسانە ئاخنیوە و شەرمی لە خۆشی دەکرد کە بینەری ئەم دیمەنەیە.

لە دالانەکەی ئەو بەر، کەسێک هەڵدەهات، نەعلەکانی تەقوکوتیان دەهات و دەگەیشتە هەر دەرگایەت لەقەیەکی پێدا دەکێشا. چەند بەندی کە قەلافەت و

سەروپۆتراکی ڕازاوە و کەسایەتیی مەند و ماقووڵی نۆخلیدۆڤ سەرنجی ڕاکێشا بوون، دەورەیان دا و وێڕای ڕێز و سڵاو کڕنۆشیان بۆ برد.

ـ بەڕێز... حەزرەتی مەزن!... هەرکەسێکی دەستوور بفەرموو بە ئێمەی بێچارە و لێقەوماو ڕابگەن؛ ئاوڕێکمان لێ بدەنەوە.

ـ من بەرێوە بەری گشتی نیم، من هیچ کەس نیم.

ـ گرینگ نییە هەرکەسێک بی؛ سکاڵای ئێمە بگەیێنە بە کاربەدەستانی باڵا، بەڵکوو بگەنە هاوارمان. ئێمە هیچ تاوانێکمان نەکردووە. دوو مانگی تەواوە ئێمەیان لەم قوژبنە پەستاوتووە.

نۆخلیدۆڤ ڕووداوەکەی لە ملازمی هاوڕێی پرسی.

ـ شتێکی گرینگ نییە؛ بە هەڵکەوت دەستبەسەر کراون. ناسنامەیان پێ نەبووە. ئەوانیان گرتووە و دەیان نێرنەوە بۆ شاری خۆیان تاکوو ڕوون بێتەوە کێن و ئەگەر بێ تاوان بن ئازادیان دەکەن. بەداخەوە بەندیخانەی ئەو شارە ئاوری گرتووە، بۆیە ناچارین لێرە ڕایانگرین هەتا بەندیخانەکە نۆژەن دەکەنەوە.

وردە وردە تاقمێکی زیاتر لە دەوری نۆخلیدۆڤ کۆ بوونەوە. چل کەس دەبوون. هەموویان پێکەوە قسەیان دەکرد! ملازم داوای لێکردن کەسێک بە نوێنەرایەتیی هەموویان قسە بکات. وەرزێڕێکی ڕووخۆش کە تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵ دەبوو، هاتە پێشێ. بۆ نۆخلیدۆڤی باس کرد کە ئەویش وەک ئەوانی دیکە کێشەکەی نەبوونی پسوولەی ناسنامەیە. کاتێک دەستگیریان کردووە، پازدە ڕۆژ لە مۆڵەتی پسوولەکەی لایداوە و ئێستا دوو مانگە لەم بەندیخانەیەدا دیل کراوە.

ـ ئێوە چکارەن؟

ـ هەموومـان پیشـەمان بەنـاییە. گوروپێکین پێکەوە کـاردەکەین. دەڵێن بەندیخانەی شـارەکەمان سووتاوە. خـۆ ئەوە تـاوانی ئـێمە نیـیە. خـۆ ئـێمە ئاورمان تێبەرنەداوە. بۆ دەبێ ئێمە زیندانی بکرێین؟ گەورەم! کارێکمـان بۆ بکە. هاوارمان بە هیچ جێگایەک ناگا.

نۆخلیدۆڤ گوێی بۆ قسەکانی پیرەپیاوی ڕەزاسووک شل کرد بوو، هەر لەو کـاتەدا چـاوی لە ئەسـپێیەک بـوو بە نێـو ڕیشـیدا دەڕۆیشـت. ملازمـی بەلەبـاریکە تـاوانەکەی خسـتە ئەسـتۆی کـار بە دەسـتانی ئیـداری و گـوتی کەمتەرخەمیـیەکە لەوانەوەیە. لەم نێـوەدا پیـاوێکی وردیـلە کە حەزی دەکـرد دەردەدڵی خۆی هەڵڕێژێ، هاتە پێشێ و دەستی کرد بە سکاڵا کردن:

ـ لێرە وەک سەگ هەڵسوکەوتمان لەگەڵ دەکەن.

پاسەوانێک کە لە نزیکی ڕاوەستا بوو لەگەڵی تێوەچوو.

ـ تۆ دەمت داخە. خۆت دەزانی...

ـ خۆم چی دەزانم؟... خۆ ئێمە هیچ تاوانێکمان نەکردووە.

پاسـەوانەکە گوڕاندی بە سـەریدا و ئەو بێدەنگ بـوو. نۆخلیـدۆڤ سـەری سووڕمابوو. لەوە زیاتر لەوێ ڕانەوەستا و ڕۆیشت. سـەدان چاو بە دوایەوە بوون. چەند پرسیاری لە ملازمەکەی هاوڕێی کرد.

ـ کەوایە کەسانێکی بێ تاوانیش لەم بەندیخانەیەدا هەن.

ـ هەن؛ بەڵام زۆربەیان درۆ دەکەن. ئەگەر گوێ بۆ ئەو بەندییانە ڕاگری، یەک کەسیشیان خۆی بە تاوانبار نازانێ.

ـ ئەوە وایە، بەڵام خۆتـان دیتتـان کە هەنـدێکیان بـێ تـاوانن؛ بـۆ وێنە ئەو تاقمەی کە پێناسەیان نییە یان لە کاتی خۆیدا مۆڵەتەکەیان تازە نەکردۆتەوە.

ـ چاو لە ڕواڵەتیان مەکەن؛ زۆربەیان کەسانێکی مزیڕ و گەندەڵن. ئەگەر زەبروزەنگ نەبێ، هیچ کارێک سەناگرێ و وڵات دەبێتە تێکەولێکە. هەر دوێنێ ناچار بووین قامچی لە دوو کەس لە بەندییەکان بدەین.

ـ قامچیتان لێدان؟

ـ کاربەدەستانی باڵا دەستووریان دابوو.

ـ بۆ ئەو بەندییانەی لە مافی مەدەنی بێبەش کراون، کێشەیەک نییە.

نۆخلیدۆڤ وەبیری هاتەوە، دوێنێ کە چاوەڕوانی سەرۆکی بەندیخانە بوو، بارودۆخەکە نائاسایی بوو و ئێستا بۆی دەرکەوتبوو ئەو کاتە قامچییان لەو دوو بەندییە داوە. بیرەوەریی ئەو شتانەی دوێنێ دیتبووی کونچکاوی و سەرسووڕمان و ڕق و بێزاری لە مێشکیدا ئاوێتە کرد بوو. بێزی لەو ئاکارانە هەستابوو.

ئیتر نە گوێی بۆ قسەی ملازم دەگرت و نە چاوی لە دەوروبەری خۆی کرد. گەیشتە نووسینگەی سەرۆکی زیندان. سەرۆک هێندە سەرقاڵی کاروباری ئیداری بوو لە بیری چووبۆوە ڕاسپێرێ ویڕا بانگ بکەن. کاتێک چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوت، وەبیری هاتەوە.

ـ فەرموو دانیشە. هەر ئێستا دەنێرم بە دوایدا بیهێنن.

# پەنجا و چوار

نووسینگەی بەندیخانە دوو ژوور بوو بەسەر یەکەوە. ژووی یەکەم دوو پەنجەرەی چڵکن و سۆبایەکی ئاسنی ژنگاویی هەبوو. لە سووچێکیش دەزگایەک داندرابوو بۆ پێوانی بەژنوباڵای دیلەکان. وێنەی حەزرەتی مەسیح لەو ئەشکەنجەگایەدا بە دیوارەوە هەڵواسرابوو. لە ژوورەکەی دیکەش نزیکەی بیست کەس بە جیاجیا یان دوو دانە دوو دانە لە سەر کورسییەکان دانیشتبوون یان ڕاوەستا بوون و پێکەوە قسەیان دەکرد، ئەوانە کەسانێک بوون کە مۆڵەتیان وەرگرتبوو لە نووسینگەی بەندیخانە چاویان بە کەسوکارەکانیان بکەوێ، نەک لە شوێنی گشتی.

سەرۆکی زیندان لە سەرووی ژوورەکە و لە نزیک پەنجەرەکە دانیشتبوو و داوای لە نۆخلیدۆڤ کرد لە سەر کورسیی پاڵ خۆی دانیشێ. کۆنت دانیشت و چاوی لە دەوروبەری خۆی دەکرد. یەکەم کەس کە سەرنجی ڕاکێشا گەنجێکی. جوانچاک بوو. چاکەتێکی کورتی لە بەردا بوو و گەرموگوڕ و تامەزرۆیانە لەگەڵ ژنێکی چاوڕەش قسەی دەکرد. لە نزیک ئەو پیرەپیاوێک بە چاویلکەی شینەوە دانشتبوو و لەگەڵ کچێک قسەی دەکرد کە جلوبەرگی بەندییەکانی لەبەردا بوو. قوتابییەکی پۆلی دواناوەندی لە پاڵیاندا ڕاوەستا بوو و چاوی لە پیرەپیاوەکە بڕیبوو.

هێندێ لەو لاترەوە کیژ و کوڕێکی ئەویندار لە سووچێک دانیشتبوون. کچە قژی کورت و زەرد بوو، کوڕەش چاکەتێکی بارانیی لەبەردا و قژی لوول و چین چین بوو. سەریان لە یەک بردبووە پێشێ و بە سرتە قسەیان دەکرد. ژنێکی سەر سپی بە جلوبەرگی ڕەشەوە، چاوی لە گەنجێکی لاواز و زەردەڵ بڕیبوو کە وێدەچوو سیلدار بێ و دەیویست قسەی لەگەڵ بکات، دیار بوو کوڕیەتی، بەڵام گریان ئەوکی گرتبوو. گەنجەکەش کاس و وڕ، لەتە کاغەزێکی دەنووشتاندەوە و لوولەی دەکرد و خۆشی نەیدەزانی چدەکا. کچێک بە کراسێکی خۆڵەمێشینەوە و دەموچاوی کاڵوکرچ و لەشولارێکی ڕێکوپێکەوە لە پشت سەری دایکی ڕاوەستا بوو، دەستی بە شانیدا دەهێنا و دڵخۆشیی دەدایەوە. ئەو کچە هەموو شتێکی جوان بوو. دەست و پەنجەی قەویوقۆڵ و ناسک، قژی کورت و چین چین، لێوی تەڕ و گۆشتن، لە هەمووشی جوانتر چاوە هەنگوینییەکانی بوو کە دەتگوت تەواوی مێهرەبانییەکانی دنیا لەوێدا کۆبوونەتەوە. نۆخلیدۆڤ هەر لە یەکەم چاوپێکەوتندا نیگای گەرم و میهرەبانی کچە سەرنجی ڕاکێشا و کچەش جار جار چاوێکی لە ئەو دەکرد و کە کۆنت سەری هەڵدێنا، ڕووی وەردەگێڕا و چاوی لە ژنە سەر سپی و ڕەشپۆشەکە دەبڕی. لە نزیک ئەوان ژن و پیاوێکی تر هەبوون. پیاوەکە سەر و قژی ئاڵوزکا بوو، دەموچاوێکی ڕەشتاڵە و خەمناکی هەبوو، خێرا خێرا و بە تووڕەیی قسەی دەکرد.

نۆخلیدۆڤ لە نزیک سەرۆکی بەندیخانە دانیشتبوو و بە وردی لە هەموو شتێکی دەڕوانی و لە کاتێکدا کە چاوەڕوانی هیچ شتێک نەبوو، کوڕێکی چکۆڵەی سەر تاشراو هاتە بەر دەمی و بە دەنگێکی منداڵانە لێی پرسی:

ـ بەڕێز تۆ چاوەڕوانی کەسێکی؟

کوڕە زۆر جیددی و خاوەن بیری دەنواند! چاوانی هۆش و زیرەکییان لێ دەباری. پرسیاری کردبوو و چاوەڕوانی وەڵام بوو.

- من چاوەڕوانی ژنێکم.

- خوشکتە؟

- نا، خوشکم نییە. مامەگیان! تۆ لێرە لەگەڵ کێی؟

- من لەگەڵ دایکم لە بەندیخانەین، ئەو بەندیی سیاسییە.

سەرۆکی زیندان کە ئەو قسانەی بە لادان لە یاسا و ڕێسای بەندیخانە دەزانی، بانگی دایکی کوڕەی کرد:

- ماریا پاولۆڤنا! وەرە کوولیا لێرە دوور خەوە.

ماریا پاولۆڤنا هەر ئەو کچە کاڵ و کرچە جوان و چاو نەرمە بوو کە سەرنجی نۆخلیدۆڤی ڕاکێشابوو، ژنە بە هەنگاوی گورج و قایم و تاڕادەیەک پیاوانە هاتە پێشێ، دەستی کوولیای گرت و بە مێهرەبانییەوە چاوی لە نۆخلیدۆڤ کرد و بە زەردەخەنەیەک لێوی پشکووت و گوتی:

ــ حەتمەن لێی پرسیون ئێوە کێن؟ کاری بەسەر هەموو شتێکەوەیە. دەیهەوێ هەموو شتێک بزانێ.

هێندە ئاسایی و خۆمانە لەگەڵ نۆخلیدۆڤ دەدوا، دەتگوت ساڵانێکی زۆرە دەیناسی.

- لێی دەپرسیم هاتووم بۆ ملاقاتی کێ؟

دیسان سەرۆکی بەندیخانە وەدەنگ هات.

- ماریا پاولۆڤنا! بڕیار نەبوو لێرە لەگەڵ هەموو کەس قسە بکەی.

- باشە گەورەم، ئیتر هیچ ناڵێم.

دەستی کوولیای گرت چوو لە پاڵ ئەو دایکە سەر سپییە و گەنجە سیلدارەکە ڕاوەستا. نۆخلیدۆڤ لە سەرۆکی پرسی:

ـ باوکی ئەو منداڵە کێیە؟

ــ بــاوکی زینــدانییەکی سیاســییە؛ دایکیشــی هەروا. ئەو کــاتەی کەوتە بەندیخانە دووگیـان بـوو. لە زینـدان ئەو منـداڵەی بـووە. جۆرێـک ئەو قسـەی دەکـرد دەتگـوت شــانازی بە خــۆیەوە دەکـا کە لە ژێــر چــاوەدێریی ئەودا ڕووداوێکی ئاوا قەوماوە.

ـ سەیرە! بەڕاستی سەیرە!

ـ ئەو منداڵە بڕیار وایە لەگەڵ دایکی بنێردرێ بۆ سیبیریا.

ـ ئەو ژنە جحێڵە کێیە؟

ـ واباشـترە وەڵامتـان نەدەمەوە؛ خـاتوو وێـراش هـاتووە . چـاوەڕوانە ئێوە ببینێ!

وێرا لە نێو دەرگانەکەدا ڕاوەستابوو.

# پەنجا و پێنج

نۆخلیدۆڤ لە نێو دەرگانەکەدا ژنێکی لاواز و وردیلەی دی، قژی کـورت و زەرد، بە نیگـایەکی گەرم و مێهرەبـانەوە. وێـرا بـوو! هـاتە پێشــێ و دەسـتی کۆنت نۆخلیدۆڤی گوشی.

ـ بەڕاستی گەورەییت نواند هاتی. منت لە بیرە؟

هەردووکیان دانیشتن. نۆخلیدۆڤ چاوی لە وێرا بڕی و گوتی:

ـ بە خەونیش نەمدەزانی ڕۆژێک ئێوە لێرە ببینم!

ـ خەمی منت نەبێ؛ لە دۆخێکی خراپدا نیم. حاڵیشم زۆر باشە.

بە چاوە خڕەکانی لە کۆنتی دەڕوانی. ملە باریک و زەرد و درێژەکەی، بە دەماری وەدەرکەوتووەوە لە ملیوانە چلکن و چرچولۆچەکەی هاتبووەدەرێ. لە وەڵامی نۆخلیدۆڤدا کە دەیویست بزانێ بۆ کەوتۆتە بەندیخانە، زۆری باسی چالاکی و تێکۆشانەکانی خۆی کرد. زۆر بە شێوەیەکی نەرم و پاراو قسەی دەکرد؛ وەک ئەوەی بیهەوێ بانگەشە بۆ ڕیبازەکەی خۆی بکات! باسی جموجۆڵ و خەباتی چالاکانە و ڕێکخراوەکان و لک و ناوەندە حیزبییەکانی دەکرد و پێی وابوو هەمووان دەبێ ئەوە بزانن؛ بەڵام کۆنت سەری لەو شتانە هەر دەرنەدەچوو!

زۆر تامەزرۆیانە و بە هەیەجانەوە قسەی دەکرد و پێی وابوو بەردەنگەکەی چێژ لەو بابەتە سیاسی و ڕێکخراوەییانە وەردەگرێ. کۆنت لەو کاتەدا چاوی لە ملی بارک و قژی کورت ئاڵۆزی بڕیبوو و لە خۆی دەپرسی: «بۆ دەبێ ئەم کچە ئازاری بەندیخانە تامڵ بکات و بۆ ئەم قسانە بۆ ئەو دەکات؟ هەستی بە دڵسۆزی دەکرد، دڵسۆزییەکەی بۆ وێرا لەگەڵ بەزەیی پێدا هاتنی مەنشۆڤ و بەندییەکانی دیکە جیاواز بوو. ئەوان بەبێ تاوان کەوتبوونە بەندیخانە، بەڵام ئەم کچە بە پێی خۆی هاتبووە بەندیخانە و خۆی بە قارەمان دەزانی. ئامادە بوو سەر و گیانیشی لەو پێناوەدا بەخت بکات؛ ئەگەرچی نەیدەتوانی ڕاشکاوانە بڵێ بیروباوەڕی چییە و لە کاتی سەرکەوتن و گرتنە دەستی دەسەڵات چ گوڵێک لە سەری خەڵک و وڵاتەکەی دەدا؟

وێرا دوای شیکردنەوەی ئەو باسانە داوای لە نۆخلیدۆڤ کرد یارمەتیی یەکێک لە هاوڕێکانی بدا کە نێوی شۆستۆڤایە. ئەو کەسە ئەندامی گورووپەکەی ئەوان نەبوو، پێنج مانگ لەمەوبەر لەگەڵ ئەو پێکەوە قۆڵبەست

کرابوون و ئەویان نارد بوو بۆ قەڵای پێتر- پاول[٣٤]. لە ماڵی وێرا ڕادەیەکی زۆر کتێب و نووسراوە دەستی بە سەردا گیرابوو کە بووبووە هۆی ئەوەی شۆستۆڤا قۆڵبەست بکرێ. وێرا لەو ڕووداوەدا خۆی بە بەرپرس دەزانی و داوای لە نۆخلیدۆڤ دەکرد بە هۆی قسە بڕکردن و دەستڕۆیشتوویییەوە هەوڵێک بۆ ئازاد بوونی ئەو کچە بێ تاوانە بدات. داوای لێکرد یارمەتیی کەسێکی دیکەش بە ناوی کۆرۆکۆڤیچ بدات ئەگەر بۆی هەڵسووڕا کارێک بکات کە کەسوکارەکەی بتوانن چاویان پێی بکەوێ و کتێبی فەننی و زانستیی پێبدرێ بۆ ئەوەی بتوانێ درێژە بە خوێندنەکەی بدا.

نۆخلیدۆڤ بەڵێی پێدا کە سەرفەرێک دەکات بۆ پترزبۆرگ و سۆراخی ئەو کارانە دەگرێ. وێرا سەبارەت بە خۆشی باسی بۆ کۆنت کرد و گوتی بڕوانامەی بەشی مامانی زانکۆی وەرگرتووە، پاشان چۆتە ڕیزی ڕێکخراوەی شۆڕگێڕانی نارۆدنایا ڤۆلیاوە. ئەم ڕێکخراوەیە توانیبووی کاریگەری لە سەر کرێکارانی کارگە و کارخانەکان دانێ و لایەنگر بۆ خۆی دەستبەر بکات. بەڵام یەکێک لە ئەندامامی پلە یەکی ڕێکخراوەکە قۆڵبەست کرابوو و پۆلیس لە ماڵەکەیدا بەڵگە و نووسراوەیەکی زۆر دۆزیبۆوە و تاقمێکی زۆر لە ئەندام و لایەنگرانی ئەو ڕێکخراوەیە قۆڵبەست کرابوون.

ــ کەوایە تۆش دوای دەسبەسەردا گیرانی ئەو بەڵگە و نووسراوانە قۆڵبەست کرای؟

---

34 ـ پێتر ـ پاولPierre et paul قەڵایەکی گەورەیە بە فەرمانی پێتری مەزن دوای سەر کەوتن بە سەر سویدییەکاندا «حەوتەمی مەی1703» بەرە بەرە ساز کرا، پاشان پەرەی پێدرا و بە شێکی زۆر لە دوورگەی سەنپێتر و دوو دوورگەی چکۆڵەی دیکەی گرتەوە. بەندیخانەی دەوڵەتی، ئەمباری چەکوچۆڵ، کارگەی سکە لێدان، ئەنتیکە خانەی سەر بازی، کلیسای سەنپێتر و چەند فەرمانگەی سەربازیی دیکە لەم قەڵایەدا بوون.

ـ بەڵێ. بڕیار وایە بمنێرن بۆ سیبیریا بەڵام گرنێگ نییە؛ من ورەیەکی بەرزم هەیە. لەو شتانە ناترسم؛ تەنانەت شانازیشی پێوە دەکەم!

نۆخلیدۆڤ لە ویرای پرسی ئەو کچە چاو هەنگوینییە کییە؟ ویرا گوتی: «کچی ژنیراڵێکە و ماوەیەکە هاتۆتە ڕیزی ڕێکخراوەکەیانەوە. لەگەڵ چەند کەسی دیکە لە ماڵێکدا دەژیان. مەکینەی چاپ و زۆر شتی دیکەیان هەبووە و پۆلیس شوێنەکەیان دەدۆزێتەوە و شەوێ بۆ دەستگیرکردنیان هێرش دەکەنە سەر ماڵەکە. بەڵام هاوڕێیان خێرا چراکان دەکوژێننەوە و نووسراوە و بەڵگەنامەکان لە نێو دەبەن. لەو تاریکییەدا تەقە لە هێزی پۆلیس دەکەن. یەکێک لە هێزەکانی پۆلیس بە توندی بریندار دەبێ. کە کاتی لێپێچینەوەدا ئەم کچە تاوانەکە دەخاتە ئەستۆی خۆی؛ ئەگەر چی لە ماوەی تەمەنیدا دەستی لە دەمانچە نەداوە و تەنانەت ناتوانێ مێشێکیش بکووژێ، ئێستاش بڕیار وایە بنێرن بۆ تاراوگە. ویرا زۆر بە ڕێزەوە باسی ئەو کچەی دەکرد.

ـ زۆر بوێر و کوڵنەدەرە و بیروباوەڕێکی پۆلایینی هەیە.

دوایین قسەکانی سەبارەت بە ماسلۆڤا بوو. ماسلۆڤای دەناسی، قسەی لەگەڵ کردبوو و چیرۆکی پێوەندییەکەی لەگەڵ کۆنت نۆخلیدۆڤی لە زمانی خۆی بیستبوو. داوای لە نۆخلیدۆڤ دەکرد کارێک بکات ماسلۆڤا بنێرن بۆ بەندی سیاسییەکان، چونکە شوێنێکی باشترە. ئەگەر نەشکرا بینێرن بۆ نەخۆشخانەی زیندان وەک پەرستار وەرگیرێ. چونکە نەخۆش زۆرە و فەرمانبەر و پەرستارانی نەخۆشخانە زۆر کەمن. نۆخلیدۆڤ سپاسی لێکرد بۆ ڕێنوێنییەکانی.

# پەنجا و شەش

سـەرۆکی بەنـدیخانە لە جێی خـۆی هەسـتا و بەدەنگی بەرز گـوتی کـاتی ملاقـات کۆتـایی هـاتووە. نۆخلیـدۆڤ هەسـتا و خـودا حـافیزیی لە وێـرا کـرد. بەڵام نەیدەتوانی واز لەو شتانەی دەوروبەری خۆی بێنێ و چاویان لە سەر هەڵگرێ. لە نێو دەرگانەکەدا گێتکی گرت. سەرۆک هەڵدەستا و دادەنیشـەوە و لە پەستا دەیگوت:

ـ کاتی ملاقات تەواوبوو! کاتی ملاقات تەواو بوو!

زینـدانی و ملاقاتچییەکـان خەم دایگرتبـوون. هێنـدێکیان لە جێـی خۆیـان نەدەجوولان، هێندێکیشـیان هەسـتابوونە سـەر پێ و هەروا خەریکی دەردەدڵ کـردن بـوون، هێنـدێکیش هێشـتا دانیشـتبوون و فرمێسـک لە چاویانـدا قەتیس مـابوو. لێک دابڕانـی دایکە سـەر سپییەکە و کـوڕە سـلیدارەکەی لە هەمـووی دڵهەژێنتر بـوو. کوڕە گەنـجەکە دیسـان کـاغەڕێکی بە دەسـتەوە بـوو، لـوولەی دەکرد و دەیکردەوە. ددانی بە خۆیدا گرتبوو و نەیدەهێشت قـولّپی گریـانەکەی لە ئەوکیدا بتەقێتەوە. دایکی هـۆن هـۆن دەگریـا. کـچە چـاو هەنگوینییەکە کە نۆخلیـدۆڤ نەیـدەتوانی چـاوی لە سـەر هەڵگـرێ، دڵخۆشـیی ژنە سـەر سـپییەکەی دەدایەوە. پیرەپیـاوی چـاویلکە شـین، قـۆڵی کـوڕە گەنـجەکەی گرتبـوو، سـەری دەلەقانـد و شـتێکی بە گوێیـدا دەچرپانـد. کـچ و کـوڕە ئاشـقەکەش لە جێـی خۆیـان هەسـتا بـوون و دەسـتی یەکتریـان گرتبـوو، بـێ ئەوەی قسـە بـکەن چاویـان لە چـاوی یەکتـر بڕیبـوو. لاوێکـی ملاقـاتچی کە

چاكەتێكی كورتی لەبەردابوو و لە نزیک نۆخلیدۆڤ ڕاوەستا بوو، بە قامكی ئاماژەی پێدەكردن.

ـ چەندە بەختەوەرن!

دوو دڵدارەكە هەستیان بە قورسایی ڕوانینی ئەوان دەكرد. دەستیان لە دەستی یەكتردا بوو، زەردەیەكیان گرت، لە سەر پاژنەیان سووڕان و لە دەرگاكە چوونە دەرێ.

ـ ئەوانە ئەمشەو لە بەندیخانە زەماوەند دەكەن. سبەینێ ئەو كچە لەگەڵ مێردەكەی بەرەو سیبیریا وەڕێ دەكەوێ.

ـ ئەم گەنجە كێیە؟

ـ زیندانی بە كاری دژوارەوە بۆ بڕدراوەتەوە؛ بەڵام هەرچییەک بێ هەست بە بەختەوەری دەكەن.

دایكە سەر سپییەكە هێشتا هەر دەگریا. سەرۆكی بەندیخانە جارێک تكای دەكرد و جارێكیش بە تووڕەیی دەیگوڕاند بە سەریاندا كە زووتر شوێنەكە چۆڵ بكەن و ڕێز بۆ یاسا دانێن، مژی لە جگەرە ماریلاندەكەی دەدا و دیسان دەنگی هەڵدەبڕی.

ـ بۆ حاڵی نابن؟ دەمم شل بوو هێندەم پێگوتن كاتی ملاقات تەواو بووە. بەڵێ! مرۆڤ لە دێرزەمانەوە هەتا ئەم سەردەمەی ئێمە بە هەزار بەڵگە و بیانوو یاسا و ڕێسایەكی دروست كردووە و بە پێی ئەو یاسایە ڕێگا بە تاقمێک دراوە كەسانێكی تر ئازار بدەن و بیانخە ژێر گوشار و زەبروزەنگ. لەگەڵ ئەوەشدا، ویژدانی هێندێک لەوبەرپرس و فەرمانبەرانە ڕێگایان پێ نادا زێدەڕەوی بكەن و ستەم و دەستدرێژی لە ڕادە تێپەڕێنن. سەرۆكی بەندیخانە سەرەڕای ئەوەی دەیتوانی دەست بۆ هەموو كارێک بەرێ،لەو كارەی خۆی هەستی بە شەرمەزاری دەكرد و ئازاری دەكێشا.

گوڕەگـــوڕ و تـــووڕە بـــوونی ســـەرۆک بـــووە هـــۆی ئەوەی بەنـــدی و ملاقاتچییەکـــان زووتـــر لێـــک هەڵبـــڕێن و هەرکـــام بە لایەکـــدا بـــڕۆن. لاوە سیلدارەکە و پیاوە شێواوەکە و ئەوانی دیکە بەرە و بەندیخانە ملیان پێوەنا. ماریـــا پاولۆڤنـــاش دەســـتی کـــوڕەکەی گـــرت و بە دوای خۆیـــدا ڕایکێشـــا. پیرەپیاوی چاویکلە شین و نۆخلیدۆڤ و لاوە چەنەوەرەکەش کە چاکەتێکی قـوڵەی لە بەردا بـوو، وێکـڕا بە قادرمەکانـدا داگەڕان. ئەو لاوە دیســـان بـۆ نۆخلیدۆڤی باس کرد:

ـ بەندیخانە شوێنێکی زۆر خراپە، شوکر بۆ خودا سـەرۆک پیاویکی باشـە، زۆر سـەختگیر نییە. ڕێگەدەدا زیندانی و ملاقاتچی ئـاوا بە ئاسـوودەیی قسـە بکەن و سوکنایی بە دڵیاندا بێ.

ـ یانی بەندیخانەکانی دیکە بەو شێوەیە نییە؟

ـ لەوێ تەنیا لە پشتی میلەکانەوە دەتوانن یەکتر ببینن.

نۆخلیـدۆڤ لەگەڵ ئەو لاوە کە خـۆی بە نـاوی مێـدین تێـزۆڤ ناسـاند، گەیشتە بەر دەرگاکە، سەرۆکی بەندیخانە قاوی لێکرد:

ـ سبەینێ وەرەوە بۆ ملاقاتی ماسلۆڤا.

سـەرۆکی بەنـدیخانە مانـدوو بووبـوو و دەیویسـت لەگەڵ نۆخلیـدۆڤ بە شێوەیەکی دۆستانە و خۆمانە هەڵسوکەوت بکات. کۆنت سپاسـی لێکرد و لە نووسینگەکە چووە دەرێ. خەمێکی قورس دڵی ڕێک دەگوشی. پێی وابوو ئەو غەدر و ناهەقییەی لە کەسانێکی وەک مەنشۆڤ و دایکی دەکرێ، بە دوور لە ئەخلاق و مرۆڤایەتییە. چەندە مارێز و دڵڕەقن ئەو کەسانەی تەنیا بە تۆمەتی نـاتەواو بـوونی پسـوولەی ناسـنامە، کەسـانێکی هەژارو لێقەومـا و دەخەنە بەندیخانە و ڕێگە بە پاسەوانەکانیش دەدەن لەگەڵ ئەو بەستەزمان و داماوانە وەک ئـاژەڵ ڕەفتـار بـکەن. چەنـدە هیچوپـووچن ئەو فەرمـانبەرانەی ئاکـاری

درندانەی خۆیان بە ئەرکی سەرشان دەزانن و بە شانازییەوە باسی کارە ناحەزەکانی خۆیان دەکەن!...

نۆخلیدۆڤ پێی وابوو ڕەفتاری سەرۆکی بەندیخانە لە هەموویان قۆڕ و دزێوترە؛ چۆنکە پیاوێکی باش بوو و سەر و ڕیشی سپی بوو بوو و گەنجی و لەشساغیی خۆی لە دەست دابوو، ناچار بوو توندوتیژی بنوێنێ و باوک و دایک بە زۆر لە جگەرگۆشەکەیان دابڕێ؛ بەڵام خۆی هەتا ئەو ڕادەیە منداڵەکانی خۆی خۆشدەوێ.

لە خۆی دەپرسی: «ئەم کارانە بۆ چییە؟» شڵەژا بوو. دنیای لێ بووبووە چەرمە چۆلەکە. ڕۆح و جەستەی لە گڕی ئازارێکی قورسدا هەڵدەقرچان. هەر جاریک دەهات بۆ بەندیخانە، سەدان پرسیار لە زەینیدا سەریان هەڵدەدا. هەموو جارێکیش ئەو پرسیارانە بێ وەڵام دەماوە.

# پەنجا و حەوت

سبەینێ ئەو ڕۆژە نۆخلیدۆڤ چوو بۆ لای فانارینی پارێزەر. کێشەی مەنشۆڤ و دایکی بۆ باس کرد و داوای لێکرد بیانکاتە بریگرتەی خۆی. فانارین بەڵێنی دا پەروەندەکە دەخوێنێتەوە و ئەگەر کێشەکە هەر بەو شێوەیە بێ کە ئەو دایک و کوڕە باسی دەکەن، بێ بەرانبەر دەکەوێتە دوای و لە بەندیخانە ڕزگاریان دەکا. نۆخلیدۆڤ سەبارەت بەو سەد و سی بەندییەش کە بە تاوانی نەبوونی ناسنامە یان ناسنامەی ماوە بەسەرچوو، دەستبەسەر کرابوون، داوای ڕێنوێنی لە فانارین کرد و دەیویست بەرپرسی ئەو غەدر و بێ عەداڵەتییە بناسێ، بەڵام جەنابی پارێزەر وەڵامێکی زۆر سەیری دایەوە.

ـ دەپرسی بەرپرسەکەی کێیە؟ هیچ کەس بەرپرسیار نییە؛ هیچ کەس خۆی بە بەرپرس نازانێ. لە دادیار بپرسی تاوانەکە دەخاتە ئەستۆی پارێزگار، لە پارێزگاریش بپرسی، دەخاتە ئەستۆی دادیار.

ـ کەوایە دەبێ بچم بۆ لای ماسلنیکۆڤ؛ ڕەنگە ئەو بەرپرسیارەکەی بناسێ.

ـ ماسلنیکۆڤ؟ کەس نا ڕەجەب!! کاتی خۆت بە فیرۆ مەدە. هیوادارم خزم و دۆستی نزیکت نەبێ؛ چونکە ئەو کابرایە هەم فێڵباز و کڵاوچییە و هەم دڵڕەق و بێ بەزەییی.

کۆنت پێی سەیر بوو، چونکە ماسلنیکۆڤیش بە خراپە باسی فانارینی دەکرد. گوێی بەو بەدوێژییانە نەدا. تامەزرۆ بوو ڕاستییەکانی بۆ ڕوون بێتەوە. ماڵئاوایی لە پارێزەر کرد و بەرەو ماڵی ماسلنیکۆڤ جیگری باوەڕپێکراوی پارێزگار وەڕێ کەوت، تاکوو داوای لێ بکا ماسلۆڤا بدەن بە بەشی نەخۆشخانەی زیندان و ئەو سەد و سی کەسە بێ تاوانەش ئازاد بکەن.

بەر دەرگای ماڵی ماسلینکۆڤ قەرە باڵغ بوو. چەند فەیتوون و عارەبانە ڕاوەستابوون و تاقمێک بە جلوبەرگی نوی و سەروپۆتراکی ڕازاوەوە سوار دەبوون و دادەبەزینەوە. کۆنت وەبیری هاتەوە ئەو ڕۆژە پێنجشەممەیە و ڕۆژی میوانداری ژنەکەی ماسلینکۆڤە؛ چونکە لە دیدارەکەی پێشوودا ماسلینکۆڤ باسی ئەو میوانداریيەی کردبوو. لە نێو ئەو بێنەوبەرە و قەرەباڵغییەدا، پێشخزمەتێک بە کڵاوی خۆرنیشان و جلوبەرگی پڕ لە قردیلە و مەنگۆڵەوە، بە هەڵاتن چوو بەرەو پیری خانمێک کە لە فەیتوونەکەی دادەبەزی، چووە ژێر باڵی ژنە و یارمەتیی دا بێتە خوارێ، ئەو خاتوونە بە دەستە سپی و ناسک و قامکە شووشەکانی داوێنی کراسەکەی هەڵکرد و بەلەکە ناسکەکەی وەدیار خست.

کۆنـت نۆخلیـدۆڤ لە نێـوان عارەبانەکانـدا، فەیتـوونەکەی کوورچـاگینی ناسـییەوە. فەیتـوونەوان کە پیـاوێکی پیـر بـوو، بـۆ ڕێزگـرتن کـڵاوەکەی لە سـەری داگـرت. نۆخلیـدۆڤ تـا هـات لە دەرگـاوانەکە بپرسـێ ماسـلینکۆڤ لە کوێیە؟ چاوی بـە خـۆی کەوت کە لەگەڵ یەکێک لە میوانەکانی لە قادرمەکـان دەهاتە خوارێ. میوانەکەی کاربەدەستێکی پایەبەرزی لەشکری بوو، لە کـاتی خوداحافیزیـدا داوای لێکـردن کـۆڕێکی شـەونشـینی بـۆ یارمەتیـدانی پەنـابەران پێک بێنن.

ـ لە دوو سەرەوە قازانجە. بۆ خانمەکـان ڕابـواردنێکی خۆشـە و بە بۆنەی ئەوانەوە پارەیەکی زۆر کۆدەبێتەوە!

!Qu’elles s’amousent et que lebon dieu les bennisse[35]

ئەو کەسـایەتییە پـایە بەرزەی ئەرتەش چـاوی بە نۆخلیـدۆڤ کەوت و خۆشحاڵیی خۆی دەربڕی:

ـ کۆنت نۆخلیدۆڤ! ئەم کاتەت باش!... لە مێژە خۆت شاردۆتەوە. داخەکەم دەبـێ بـڕۆم. زووتـر لەگەڵ ماسـلنیکۆڤ بـڕۆ سـەری دەڵێـی ڕۆژی حەشـرە. کوورچـاگین و بنەماڵەکەشـی لێرەن. نـادین بۆکسگۆدن ـ یش هـاتووە toutes les jolies femmes[36] لەگەڵ ئەوەی قسـەی دەکـرد شـانی ڕاگرتبـوو پێشـخزمەتەکە کەرکە پڕ زریقەوبریقە ئەرتەشـییەکەی بـدات بە سـەر شـانیدا. دوای ڕۆیشتنی ئەو ماسلنیکۆڤ قۆڵی نۆخلیدۆڤی گـرت و ئەگەر چی قەڵەو و گوشتن بوو شان بە شانی ئەو بە گورجی لە پلیکانەکان وەسەر کەوت.

ماسـلنیکۆڤ لە خۆشـیانا پێـی وەعەرزی نەدەکەوت؛ چـونکە ئەو ڕۆژە کەسـانێکی پـایەبەرزی دەوڵەتیش میـوانی ئەو و ژنەکەی بـوون. ڕواڵەتەن بـۆ

---

35 ـ هیوادارم خانمەکان خۆشی ڕابوێرن و کۆڕەکەش خۆدا بەرەکەتی تێخا.
36 ـ هەموو خانمەکان شۆخوشەنگن.

کەسێکی وەک ماسلنیکۆڤ کە لە گاردی ئیمپراتۆریدا خزمەتی کردبوو، هاتوچۆ کردن لەگەڵ کەسایەتییە پایەبەرزەکانی دەوڵەت ئاسایی بوو. بەڵام کەسێک کە خوو بە خوێرییەتی و سووکوچرووکی دەگرێ، هەرچی زەمان تێدەپەڕێ ئەو سووکوچروکتر دەبێ. ئەو ئەگەرچی لەو هاتوچۆیانە هیچ دەستکەوتێکی نەبوو، کەچی لە هیچوخۆڕایی شایی لە دڵی دەگەڕا. وەک سەگێک دەچوو کە هەر کاتێک خاوەنەکەی دەست بە سەر و گوێیدا دێنێ، کلکەسووتێ دەکا و هەڵدەبەزی و بە هۆی شادیی لە ڕادەبەدەر، وەک شێتی لێدێ. ماسلنیکۆڤ ئامادە بوو هەموو کارێک بکات تاکوو ئەو جۆرە کەسانە زیاتر سەرنجی پێبدەن و لەو کاتەشدا هێندە شاد و بەنەشە بوو کە سەرنجی قەلافەتی مات و خەیالاویی نۆخلیدۆڤی نەدەدا؛ دەستی ئەوی گرت و بەرە و هۆڵی میوانداری ڕایکێشا، لەوێشەوە تەکلیفی خۆی لەگەڵ نۆخلیدۆڤ ڕوون کردەوە:

ـ جەنابی نۆخلیدۆڤ ئەگەر کارێکت هەیە هەڵیگرە بۆ دوایی؛ جارێ کاتی ئەو قسانە نییە، Vous n’avez qu’a ordonner [٣٧] دەبێ بێی بۆ میوانیی خانم. جاری پێشووش کە خۆت پیشان نەدا و ڕۆیشتی ناچار بووم ماوەیەکی زۆر پرتە و بۆڵەی تامڵ بکەم.

خزمەتکارێک کە لە بەر دەرگاکە ڕاوەستا بوو، هاتنی کۆنت نۆخلیدۆڤی ڕاگەیاند، خاتوو ئانا ئیگناتیۆڤنا هاوسەری ماسلنیکۆڤ کە حەزی دەکرد پێی بڵێن خانمی ژێنراڵ، ڕووی کردە نۆخلیدۆڤ و زەردەیەکی شیرین نیشتە سەر لێوی. خانم لەگەڵ چەند ژنی تر کە هەموویان کلاوی گەورەیان لە سەر دا بوو، لە سەر کورسییەکی درێژ دانیشتبوون و لە سووچێکی هۆڵەکەش پیاوان، نیوەیان بە جلوبەرگی ئاساییەوە و نیوەشیان بە جلوبەرگی

37 ـ هەرچی بیڵێی ئەنجامی دەدەم.

سەربازییەوە، لە دەوری مێزی چایی ڕاوەستا بوون. خانمی خانەخۆی گلەیی لە نۆخلیدۆڤ دەکرد:

ـ ئەوە خۆر لە کوێوە هەڵاتووە؟ ! ئێوە و ئێرە!

خانم دەیویست ژنەکان تێگەیینی کە لەگەڵ کۆنت نۆخلیدۆڤ زۆر خۆمانەیە، بەڵام لە ڕاستیدا وا نەبوو.

ــ فەرموو لە لای من دانیشە با خانمەکانت پێ بناسێنم. ئەگەر چی هەموویان دەناسی؛ میسی کچی کۆنت کوورچاگین لێرەیە، هەر ئێستا بانگی دەکەم:

38Missy, lvenez donc a notre table. Qn vous apportera votre the.

دەیویست ملازمێکی گەنج و بەلەباریکە بانگ بکات کە هاوڕێی میسی بوو، بەڵام ناوەکەی لە بیر چوو بۆوە.

ـ ئێوەش... بەڕێز... ئێوەش وەرن با لەگەڵ جەنابی کۆنت پێکەوە چایی بخوێنەوە.

ژنان بە سرتە پێکەوە دەدوان؛ ژنێکیان میسیی پیشان ئەوانی دیکە دەدا.

ــ پێت وایە ئەو کوڕە گەنجە... ئەو ملازمەی هاوڕێی میسی، هاوڕێی تازەیەتی.

ـ میسی خوویەکی خراپی هەیە؛ حەزی لە فڕووجە.

سەریان بە یەکا کرد و دایان لە قاقای پێکەنین.

ـ تۆش دەست لە گاڵتەوگەپ هەڵناگری!

ـ خۆ ئەوە خوویەکی خراپ نییە؛ هەموو ژنەکان حەزیان لە فڕووجە!

دیسان قاقایان کێشا. میسی سەیر خۆی لە گوڵ دابوو. کڵاوی لە سەر کردبوو. جلەکانی بە خەتی تۆخەوە، وەها لە بەری توند بوو بوون، دەتگوت

---

38 ـ میسی! وەرە بۆ ئێرە؛ چاییتان بۆ دێنن!

پێستی لەشیەتی و پێوەی لە دایک بووە. کە چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوت سوورهەڵگەڕا.

ـ لێتان بێ هەواڵ بووم؛ پێموابوو چوون بۆ سەفەر.

ـ خەیاڵی سەفەرم هەبوو؛ بەڵام کارم بۆ هاتە پێشێ و پەکم خستەوە.

ـ حەتمەن وەرە بۆ ماڵمان دایکم حەز دەکا چاوی پێت بکەوێ.

کۆنت دەیزانی میسی درۆ دەکا؛ بەڵام لە بارودۆخێکدا بوو گرینگیی بەو شتانە نەدەدا.

ـ دەترسم دەرفەتم نەبێ.

میسی گرژ بوو. ڕۆیشت بۆ ئەو بەری هۆڵەکە. ملازمی گەنج و تیشکەڵە پەرداخی چاییەکەی لە دەستی میسی وەرگرتبوو و بە دوایدا دەڕۆیشت و کالانی شمشێرەکەی لە هەموو کورسییەکان دەدرا.

ـ خاتوو میسی! ئێوەش دەبێ کارێک بۆ پەنابەران بکەن.

ـ زۆر باشە؛ کاتێک هاتنە سەر کۆکردنەوەی یارمەتی منیش هونەری خۆم دەنوێنم.

ـ کەوایە دەبێ چاوەڕوان بین.

هەموو شتێک بە باشی دەچووە پێشێ. خاتوونی خانەخوێش شاد و دڵخۆش بوو کە کۆڕەکەی ئاوا گەرموگوڕ و خۆمانەیە و لەگەڵ هەر کەس بە پێی مەیلی خۆی دەدوا. لە نۆخلیدۆڤیش خافڵ نەبوو.

ـ میکای مێردم (مێردە قەڵەو و زلحۆرتەکەی بە ناوی سەردەمی منداڵی بانگ دەکرد) بۆی باس کردووم کە ئێوە زۆر بە خەمی بەندییەکانەوەن. میکا ڕەنگە زۆر کەموکووڕیی هەبێ، بەڵام زۆر مێهرەبان و ڕۆحسووکە. زیندانییەکان بە منداڵی خۆی دەزانێ. ئەو هێندە مێهرەبانە...

ڕستەکەی تەواو نەبوو. پیرێژنێک بە دەموچاوی چرچولۆچەوە خۆی کرد بە ژووریدا، کراسێکی هەوریشمینی بە قردیلەی مەیلەوسوورەوە لە بەردا بوو. خاتوونی خانە خۆی بۆی گرژییەوە. نۆخلیدۆڤ تۆزێ بە نێو هۆڵەکەدا گەڕا. دەچووە لای هەر کەسێک چەند خولەک بۆ چاکوچۆنی و بەخێرهێنان وشەی دووپاتە و بێ مانای دەردەبڕی؛ دوای ئەوەی هیلاک بوو چوو بە گوێی ماسلنیکۆڤیدا چرپاند:

ـ دەبێ چەند خولەک گوێ بۆ قسەکانم شل کەی.

ـ ئێستا کە پێداگری دەکەی، باشە؛ فەرموو.

پێکەوە چوونە ژوورێکی چکۆڵە کە بە شێوازی ژاپۆنی ڕازابۆوە؛ لەبەر پەنجەرەکە دانیشتن.

# پەنجا و هەشت

ماسلنیکۆڤ سەرەتا تەپڵەکی جگەرەکەی هێنا و لە سەر مێزەکە داینا، جگەرەیەکی داگیرساند و گوتی:

ـ Eh bien. jesuis a vous[٣٩].

ـ دوو تکام لێتان هەیە.

ماسلنیکۆڤ گرژ بوو؛ ئیتر وەک ئەو سەگە نەدەچوو کە بە لاواندنەوەی خاوەنەکەی بکەوێتە کلکەسووتی و هەڵبەزدابەز. ماسلنیکۆڤ گرژ و تووڕەی دەنواند؛ وەک سەگێک دەچوو کە گوێی قوت کردبێ و چاوەڕوانی

39 ـ ئێستا لە خزمەتت دام.

شتێک بێ. دەرگاکە نیوە کراوە بوو و هەرا و قاقا و ژاوە ژاو لە هۆڵەکەوە دەهات. ژنێک بە زمانی فەڕەنسی دەیگوت:

ـ Jamais, jamais, jene croirais[٤٠].

دەنگێکی پیاوانە ناوی کۆنتس ڤێرنتسۆڤ و ڤیکتۆر ئاپاکسینی هێنا. چەند کەس پێیکەوە، سرتوخورتێکیان کرد و قاقا پێکەنین. ماسلنیکۆڤ لەگەڵ نۆخلیدۆڤ قسەی دەکرد و گوێی بۆ قسە و دەنگە دەنگی هۆڵەکەش شل کردبوو.

ـ تکای یەکەمم سەبارەت بەو ژنە زیندانی کراوەیە.

ـ هەر ئەو ژنەی دەتگوت بە بێ تاوان دەستبەسەر کراوە؟

ـ دەمهەوێ بیدەن بە بەشی نەخۆشخانەی زیندان و ببێتە پەرستار.

ماسلنیکۆڤ خۆی گیف کردەوە و بە توندی لێوی بە سەر یەکدا نا.

ـ دەترسم نەگونجێ.

ـ بۆ؟ بۆ ناگونجی! وەک باسی دەکەن نەخۆشخانەی زیندان زۆری نەخۆش لێیە و پەرستاریان کەمە.

ـ هەتا سبەینێ دەستم لێ ڕاگرە؛ وەڵامت دەدەمەوە.

ـ زۆر سپاس.

لە هۆڵەکەوە دەنگی قاقا دەهات. هەموو پێدەکەنین. ماسلنیکۆڤیش پێدەکەنی.

ـ هەمووی لە ژێر سەری ڤیکتۆر دایە؛ هەمووان دەخاتە پێکەنین.

ـ داوایەکی دیکەشم هەیە؛ سەد و سی کەس بەند کراون کە هیچ تاوانێکیان نییە و مانگێکە چارەنووسیان ناڕوونە. تاوانەکەشیان هەر ئەوندەیە ناسنامەیان پێ نییە یان ماوەی هەویەکەیان بەسەرچووە.

---

40 ـ قەت قەت باوەڕ ناکەم.

ماسلنیکۆڤ مات بوو، دیار بوو نارەحەتە.

ـ چۆنت ئەوە بۆ دەرکەوت؟

ـ چوومە سەردانی بەندییەک. لە دالانەکەدا بەندییەکان دەورەیان دام و ئەوەیان پێگوتم.

ـ چووی بۆ لای کام زیندانی؟

ـ کوڕێکە بە ناوی مەنشوڤ، بە بێ تاوان بەند کراوە. پارێزەرێکم گرتووە وەدوای کارەکانی بکەوێ. بۆ ئەو گرفتێک لە گوڕێدا نییە؛ ئەوەی گرنیگە ئەو سەد و سی کەسەن.

ماسلنیکۆڤ ڕقی هەستابوو.

ـ ئەم کارە پێوەندیی بە دادستانەوە هەیە؛ دەبێ زۆر خێرا کۆڕێکی دادگا پێک بێنن و ئەو کارە یەکلایی بکەنەوە. یەکێک لە ئەرکەکانی دادستان ئەوەیە کە قازییەک بنێری بۆ بەندیخانە و وێڕای دیتنی بارودۆخی بەندییەکان دەبێ بەو کارە نایاساییانەش ڕابگا. ئەگەر دادستان ئەرکی خۆی بەڕێوە نەبات من چ تاوانێکم هەیە؟

ـ کەوایە تۆ هیچ کارێکت لە دەست نایە؟

ـ هەڵبەت منیش دەست لە سەر دەست دانانێم؛ لەو بوارەدا زۆر زوو دەست دەکەم بە لێکۆڵینەوە.

نۆخلیدۆڤ قسەکەی فانارینی وەبیر هاتەوە کە گوتبووی پارێزگار و دادستان هەر کام تاوانەکە دەخەنە ئەستۆی یەکتر و حەواڵە بە گەواڵەت پێدەکەن. لە هۆڵی میوانداری هەر وا هەرا و چرەوگوڕەی میوانەکان دەهات. قسەیان دەکرد و قاقایان دەکێشا. ژنێک باسی ژان و برکی تاقەتپڕووکێنی خۆی دەکرد، بێ ئەوەی دەنگ و وتەکانی نیشاندەری ئەو ژان و ئازارە بێ.

پیاوێک سەبارەت بەو ژانە تاقەتپڕووکێنانە قسەی دەکرد و قاقای دەکێشا.
ماسلنیکۆڤ جگەرەکەی کوژاندەوە، هەستایە سەر پێ و گوتی:

ـ هەموو کارەکان جێبەجێ دەکەم؛ خەمت نەبێ. ئێستا وا باشە بچین بۆ لای خانمەکان.

نۆخلیدۆڤیش هەستایە سەر پێ و گوتی:

ـ شتێکی دیکەش هەیە دەبێ پێت بڵێم؛ دوێنێ لە زیندان بیستم قەمچییان لە دوو کەس داوە.

ماسلنیکۆڤ سوورهەڵگەڕا.

ـ بڕیار نەبوو لە هەموو کاسەیەکدا کەوچک بێ؛ وا باشترە گوێ بەو شتە بێ بایەخانە نەدەین. با تۆزێ زووتر بڕۆین دەنا خانم تووڕە دەبێ و پاشان بە پرتە و بۆڵە کوێرم دەکا.

ماسلنیکۆڤ ئەگەر چی خەریک بوو بکەوێتەوە سەر هەوای بەزم و شادی، بەڵام هەروا لە سەگێک دەچوو کە خاوەنەکەی دەست بە سەریدا دێنێ و دەیلاوێنێ، بەڵام هەروا مات و بێ تاقەتە. قۆڵی نۆخلیدۆڤی گرت کە بیبات بۆ هۆڵی میوانداری. کۆنت قۆڵی لە دەستی ماسلنیکۆڤ دەرکێشا و بێ ئەوەی زمانی بگەڕێ یان خودا حافیزی بکات مات و لەش داگیراو لە هۆڵی میوانداری چووە دەرێ. خاتوونی خانەخوێ لە مێردەکەی پرسی چی ڕوویداوە؟ یەکێک بە تەشەرەوە گوتی: ئەمە شێوازی خوداحافیزیی فەرەنسییەکانە! یەکێکی تر گوتی: لە شێوازی خوداحافیزیی زولووەکانی ئەفریقیا دەچوو. ماسلنیکۆڤ لە سەری وەجواب هات.

ـ گرنیگ نییە؛ خووخدەی وایە!

دەستەیەک دەهاتن و دەستەیەک دەڕۆیشتن. هاتوچۆ چەند سەعاتی خایاند و شێوازی خوداحافیزیی نۆخلیدۆڤ هەروا بنێشتە خۆشەی کۆڕەکە بوو و هەر کەس شتێکی دەگوت.

بۆ سبەێنی نۆخلیدۆڤ نامەیەکی بە دەست گەیشت. ماسلنیکۆڤ لە سەر کاغەزێکی ئەستوری مارکدار بە خەتێکی خۆش نووسیبووی: «مەسەلەی گوێستنەوەی ماسلۆڤام بۆ نەخۆشخانە نووسیوە و ناردوومە بۆ پزشکی زیندان و داوام لێکردووە بە زووترین کات لەو بەشە وەریگرن.» نامەکەی بە ڕستەی «هاوڕێی لە مێژینەت کە خۆشی دەوێی!» کۆتایی پێ هێنا بوو. زۆر بە ئەداوە ژێرەکەشی واژۆ کردبوو.

نۆخلیدۆڤ لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڕاستی پیاوێکی گەمژەیە! پێی وایە کەسێکی زۆر گرنیگە و منەتم بە سەردا دەکا. چاوەڕوانیشە شانازی بکەم من بە «هاوڕێ»ی خۆی دەزانێ!»

# پەنجا و نۆ

یەکێک لە باوەڕە بێ بنەماکانی زۆربەی خەڵک ئەوەیە کە پێیان وایە هەر کەس خاوەنی خووخدە و تایبەتمەندییەکی نەگۆڕە؛ یەکێک خراپە و یەکێک باشە؛ ئەم وریایە و ئەوی تر گێژ و حەپۆلە،ئەم چالاک و گورجوگۆڵە و ئەوی تر تەوەزەل و لەشگرانە... بەڵام وانییە. دەکرێ بڵێی فلان کەس ڕواڵەتەن کەسێکی خراپ نییە؛ یان فیسارە کەس تا ئێستا بۆ هەمووان دەرکەوتووە کەسێکی ناهیر و بێ فکر نییە. یان فلان کەس لە زۆربەی کارەکانیدا زیرەک و چالاکە، بەڵام ناکرێ لێبڕاوانە بڵێی ئەوەیان کەسێکی

زۆر باشە و ئەوی دیکەش زۆر خراڤە؛ ئەمەیان مرۆڤێکی زیرەک و وریایە و ئەوی تر نەفام و بێ ئاوەزە. بە داخەوە زۆرتر بەو شێوە داوەری دەکەین. مرۆڤەکان وەک ڕووبار وان؛ ئەگەرچی هەموویان لە یەک دەچن، بەڵام خۆ ڕووبارتان دیوە، هەروا کە بۆ پێشەوە دەخوشێ، هێندێ جار بە ئارامی و هێندێ جاریش بە خێرایی. هێندێ جار دەگاتە شاخ و کوێستان باریک دەبێتەوە، بڕی جاریش دەگاتە دەشت و دەبێتە پاناوک و تەنکاو، لە شونێک ئاوەکەی گەرمە و لە شوێنێکیش سارد و سەرتەزێن؛ هێندێ جار مەند و ئارامە و هێندی جاریش بە لرفە و کەفچڕێن. هەموو مرۆڤێک ماکی باشە و خراپە لە ڕۆحیدا هەیە؛ هێندێ جار لە سەر باشەکەی دەگەڕێ و هێندی جاریش دەکەوێتە سەر باری خراپییەکخەی؛ هێندێ جار ماکە باشەکەی بە کار دەهێنێ، هێندێ جاریش خراپەکەی.

کەسانێک هەن لە ناکاو دەگۆڕێن. نۆخلیدۆڤیش لەو جۆرە کەسانە بوو. لە ڕوانگەی ڕواڵەت و دەروونەوەگۆڕانی بەسەردا هاتبوو؛ بەڵام ئەو سۆز و هەڵچوونەی ڕۆژانی سەرتا و دوای ڕووداوەکەی دادگا، لە ناخیدا سەری هەڵدا بوو، دوای یەکەم دیداری ماسلۆڤا لە زیندان دامرکایەوە و ترس و بێزاری جێگای ئەو سۆز و تامەزرۆییەی گرتبۆوە. لە بڕیارەکەی پاشگەز نەبۆوە؛ هەروا سوور بوو لە سەر ئەوەی ماسلۆڤا لەو زەلکاوە ڕزگار دەکات و ئەگەر ڕازی بێ ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێکدێنێ؛ بەڵام کاتێک دیمەنی ئەو داهاتووەی دەهێنایە پێش چاوی خۆی، هەموو شتێک تاڵ و پڕ ئازاری دەنواند.

ڕۆژی دوایی دیسان چوو بۆ بەندیخانە تاکوو چاوی بە ماسلۆڤا بکەوێ. سەرۆکی بەندیخانە ڕێگەی پێدا لە شوێنی گشتی ببینێ. سەرۆکی بەندیخانە ئەگەر چی پیاوێکی ڕوحسووک بوو، بەڵام ئەمجارەیان ڕەفتاری گۆڕابوو.

زۆر بە پاریزەوە هەڵسوکەوتی دەکرد. دیار بوو جێگری پارێزگار تێی گەیاندووە کە زۆر بە پارێزەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ نۆخلیدۆڤ بکات. چاوێکی لێکرد و گوتی:

ـ چاوپێکەوتنتان لەگەڵ ماسلۆڤا هیچ گرفتێک ساز ناکات، بەڵام تکاتان لێدەکەم پارەی مەدەنێ. سەبارەت بە گوێستنەوەی ماسلۆڤا بۆ فەرمانگەی تەندروستی زیندان، بەڕێز ماسلنیکۆڤ دەستووری داوە و پزیشکەکەشمان ڕازی بووە؛ بەڵام ماسلۆڤا خۆی ڕازی نابێ و گوتوویە ئامادە نییە کاسە و لەگەنی نەخۆشەکان خاوێن بکاتەوە. گەورەم! دیتووتە مرۆڤی چۆن هەیە! شیاوی ئەوە نین چاکەیان لەگەڵ بکەی.

نۆخلیدۆڤ هیچی نەگوت و داوای لێکرد ماسلۆڤا بێنن. سەرۆکی بەندیخانە پاسەوانێکی نارد بە دوایدا. کۆنت نۆخلیدۆڤ چوو بۆ شوێنی ملاقاتی گشتی کە ئەو ڕۆژە کەسی لێ نەبوو. ماسلۆڤا لە پێش ئەودا گەیشتبووە شوێنەکە. شەرمن و بێدەنگ هاتە پێشێ و لە میلەکان نزیک بۆوە.

ـ داوای لێبوردن دەکەم کە جاری پێشوو بەو شێوەیە قسەم لەگەڵ کردی.

ـ من دەبێ داوای لێبوردن لە ئێوە بکەم!

ـ دیسان دەستت کردەوە بەو قسانە؟ تکایە دەستم لێ هەڵگرە. دیسان ڕق و دوژمنایەتی لە چاویدا دیار بوو.

ـ بۆ دەبێ دەستتان لێ هەڵگرم؟

ـ وام پێخۆشە.

ـ بۆ؟

نێوچاوانی تێک نا. کۆنت لە جێی خۆی وشک بوو.

ماسلۆڤا هەر بەو نێوچاوانە گرژەوە گوتی:

ــ ئــاوا ئاســووده تــرم. چــۆنم پێخــۆش بــێ وادەکەم؛ حەزدەکەم خــۆم هەڵواسم.

لێوی دەلەرزی. بێدەنگ بــوو. ڕقێــک لە ناخیــدا هــێلانەی کردبــوو. نۆخلیــدۆڤ هەســتی کــرد کاتیۆشــا بە هــیچ شــێوەیەک لێــی خــۆش نــابێ. بەڵام گــرژی و ساردوسڕییەکەی لەگەڵ هەستێکی جوان و ناسک ئاوێتە بووبوو، نۆخلیدۆڤ لەوە تێدەگەیشــت و هەر ئەو هەســتە شــاراوەیە، تەمــی دڕدۆنگییەکــانی ڕەوانــدەوە و دیسان سۆز و هەستێک باوەشی لە ڕۆحی وەرهێنایەوە و گوتی:

ـ کاتیۆشـا! دیسـان پێت دەڵێم ئامادەی شـووم پێ بکەی؟ بۆ وەڵامەکەی پەلەشــم نییە. ئەگەر چەنــد ســاڵیش بخــایەنێ ســەبر دەکەم و بــۆ هەر کــوێش بچی لەگەڵتام.

ـ چۆنت پێخۆشە وا بکە. هەرکەس قیبلەی ماڵی خۆی باشتر دەزانێ.

لێوی زیاتر کەوتنە لەرزین. ئیتر نەیتوانی قسە بکات. نۆخلیدۆڤ چاوی لە چاوە شیرین خێلەکەی ماسلۆڤا بڕی و گوتی:

ـ چەند ڕۆژێک دەچم بۆ گوند؛ لەوێشــەوە دەچم بۆ پترزبۆرگ. وەدووی کــارەکەی تــۆ دەکەوم. کــاری تــۆ، کــاری خــۆمە. کــاری هەردووکمــانە. ئەگەر خودا یار بێ بڕیاری دادگا هەڵدەوەشێنمەوە.

ـ هەڵوەشێتەوە یان هەڵنەوەشێتەوە بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە؛ من...

ددانــی بە خۆیــداگرت بــۆ ئەوەی کــوڵی دڵــی ســەرڕێژ نەکــات، بــۆ ئەوەی هەستی خۆی بشارێتەوە، قسەکەی گۆڕی:

ـ چاوت بە مەنشۆڤ کەوت؟

ـ بەڵێ، باوەڕیشم بە قسەکانی کرد.

دایکی زۆر ژنێکی فەقیر و مێهرەبانە. ئەوان بێ تاوانن. کۆنت ئەوەی لە بــارەی مەنشــۆڤەوە دیتبــووی و ئەنجــامی دابــوو، هەمــووی بــۆ ماســلۆڤا

گێڕایەوە. ماسلۆڤا چاوێکی لە چاوی کرد و سەری داخست. بە دەنگێکی شەرمنانە گوتی:

ـ بۆ کاری پەرستاری قسەیان لەگەڵ کردم؛ ئێستا کە تۆ حەزت لێیە قەبووڵی دەکەم. بەڵێنیش دەدەم لەمە بەولاوە دەم لە مەشرووب نەدەم.

ـ زۆر باشە!

کۆنت نۆخلیدۆڤ بە بێدەنگی چاوی لێدەکرد و بە بزە وەڵامی دەدایەوە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەو بە جارێ گۆڕاوە.» ئەو گۆڕانەی کاتیۆشا چێژی بە ڕۆحی دەبەخشی؛ چێژێک کە تا ئێستا هەستی پێنەکردبوو و خەریک بوو لە وزەی بەرزی ئەشق تێدەگەیشت.

ماسلۆڤا دیسان گەڕایەوە بۆ نێو بەندە بۆگەنەکە. ڕووپۆشەکەی داکەند و دانیشت. دەستی لە سەر چۆکی دانا و بۆ دەکردنی شەکەتی هێندێک لاقی جووڵاندەوە. تەنیا ژنە سیلدارەکە و ژنی ماچڵەکچی و دایکی مەنشۆف و دایکی ولادیمێر کە مەمکی دەدا بە منداڵەکەی، لە بەندەکە دابوون. کچەکەی مجێوری کلێسە شەوی ڕابردوو بە هۆی نەخشیی مێشکەوە بردبووتان بۆ نەخۆشخانە. ژنەکانی دیکەش چووبوون بۆ شیوکردن. منداڵەکانیش لە دالانەکە یارییان دەکرد. ژنی ماچڵەکچی کە گۆرەویی دەچنی، لە ماسلۆڤای پرسی: «چاوت پێی کەوت؟» ماسلۆڤا وەڵامی نەدایەوە. ژنی ماچڵەکچی دیسان گوتی:

ـ شەق لە بەختی خۆت هەڵمەدە؛ دەرفەتی ئاوا زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەوێ.

بەڵام قسەکەی ناتەواو هێشتەوە و میلی گۆرەویی چنینەکەی لە کلافی کاماوکە هەڵچەقاند و ڕۆیشت بۆ دالانەکە. وادیار بوو زانیویە منداڵەکان یەکێک لە کەرەسەی چنینەکانیان هەڵگرتوو و بردوویانە یاریی پێبکەن.

گەڕانەوەی ژنان لە شیوکردن هێمنایەتیی دالانەکەی تێکدا. هەموو پێکەوە دەدوان. هێندێکیان پێخاوس بوون. هێندێکیشیان نەعلیان لە پێدا بوو. هەرکام نانێکیان نابووە بن باخەڵیان. چەند کەسیشیان دوونانیان پێبوو، فیدۆزیا کە گەیشتەوە دیتی کە ماسلۆڤا لە سووچێک مات و خەمبار دانیشتووە، هەڵات بۆلای و گوتی:

ـ چی بووە؟ بۆ خەمباری، ئازیزەکەم؟ بڕوانە، دوو نانم هێناوە بە چاییەوە دەیخۆین.

نانەکانی دانا و بەرەوڕووی ماسلۆڤا دانیشت. کۆرابلڤا لە ماسلۆڤای پرسی: «چییە! حەتمەن ئەو پیاوە لە زەماوەند کردن لەگەڵ تۆ پەژیوان بۆتەوە، بۆیە ئاوا دەستەوئەژنۆ دانیشتووی؟

ـ ئەو پەژیوان نەبۆتەوە؛ من شووی پێناکەم.

ـ خۆت گەوج مەکە ئازیزەکەم.

فیدۆزیا لە سەر ئەو باوەڕە بوو کاتێک دوو کەس نەتوانن پێکەوە بژین، زەماوەند کردن هەڵەیە. بەڵام ژنی ماچڵەکچی لەگەڵی هاوڕا نەبوو. بە فیدۆزیای گوت:

ـ مەگین ئەو پیاوە مێردی تۆ نییە، لە هەموو جێیەک بەدواتەوەیە؟

ـ من و ئەو بە شێوەی یاسایی ژن و مێرد نیین؛ بەڵام ئەوانە...

ـ گەمژە! ئەو کابرایە ئامادەیە سەرتاپای ماسلۆڤا لە ئاڵتوون بگرێ.

ماسلۆڤا هاتە قسە.

ـ دەڵێ بۆ هەرکوێ بچی لەگەڵتا دێم. بە ویستی خۆی دەیهەوێ لەگەڵما بێ. بڕیار وایە بچێت بۆ پتزربۆرگ و وەدووی پەروەندەکەم بکەوێ. هەموو وەزیر و دەسەڵاتدارەکان دەناسێ. من هیچ چاوەڕوانییەکم لێی نییە. چونکە هیچ شتێک بۆ من جیاوازیی نییە و بە هیوای هیچیش نیم.

کۆرابلڤا دەستی کرد بە توورەکەکەیدا. وەک ئەوەی لە شتێک بگەڕێ. بۆ ئەوەی ورەی هاوڕێکانی بەرز بکاتەوە و خەمی دڵیان بڕەوێنێ، گوتی:

ـ چۆنە پێکەوە پێکێک هەڵدەین؟

ماسلۆڤا گوتی:

ـ خۆتان بخۆنەوە؛ نۆشی گیانتان بێ! من ئیتر دەم لە مەشرووب نادەم.

# یەک

بڕیار بوو دوای پازدە ڕۆژ سکاڵاکەی کاترین ماسلۆڤا لە لایەن لقی مافی ئەنجومەنی سەناوە پێدا چوونەوەی بۆ بکرێ. نۆخلیدۆڤ دەیویست بە جۆرێک کارەکان ڕێک بخات کە بۆ ئەو ڕۆژە لە پترزبۆرگ بێ و بۆ هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری دادگا کەڵک لە توانایی و دەستڕۆیشتنی خۆی وەرگرێ؛ ئەگەر نەشیتوانی حوکمەکە هەڵوەشێنێتەوە، پەنا بۆ دوایین ڕێکار بەرێ و لە ئیمپراتۆر داوای بەخشینی بۆ بکات. بەو پێیەی ئەگەر ئەنجومەنی سەنا[٤١] سکاڵانامەکەی هەڵنەوەشاندایەتەوە و بڕیاری دادگای پەسند بکردایە، ماسلۆڤا سەرەتای مانگی ژوئەن لەگەڵ کاروانی زیندانییەکان بۆ سیبیریا بەڕێ دەکرا و کۆنت ناچار بوو تا ئەو کاتە کاروباری مڵکەکەی جێبەجێ بکات، هەروەها تەکلیفی خۆی لەگەڵ ڕەعیەت و وەرزێڕەکان ڕوون بکاتەوە و لەگەڵ کاروانی زیندانییان کەوێ.

بڕیاریدا بچێت بۆ سەردانی مڵکەکانی و سەرەتا بچێت بۆ کۆزمینسکۆیە کە لە هەموویان نزیکتر بوو. زەویوزارەکانی ئەو لەو قەزایە جگە لەوەی گۆشتەزەوی و پڕ پیتوبەرەکەت بوون، زۆریش پان و بەر بڵاو بوون. لە

41 ـ لەرووسیای ئەو سەردەمەدا ئەرکەکانی دیوانی باڵای وڵات لە ئەستۆی لقی مافی مەجلیسی سەنا بوو.

سەردەمی منداڵی و مێرمنداڵیدا زۆر جار چوو بوو بۆ ئەو دەڤەرە و لە ساڵانی ڕابردووشدا دوو جار سەردانی ئەوێی کرد بوو، لەگەڵ بارودۆخەکەش ئاشنایەتیی تەواوی هەبوو. کاتێک دایکی مابوو، جارێک لە سەر داوای ئەو، چوو بوو بۆ لای کوێخای بە ڕەگەز ئاڵمانیی گوندەکە تاکوو بە حیساب و کیتابەکان ڕابگەن و قازانج و زەرەدەکان هەڵسەنگێنن، هەروەها پێوەندیی نێوان مالیک و ڕەعیەت لێک دەنەوە؛ ئەگەرچی ئەم پێوەندییانە سەردانەواندن و فەرمانبەریی ڕەعیەتەکان و جۆرێک کۆیلەیی بوو.

ساڵی 1861، کۆیلەیی جەستەیی بە پێی یاسا هەڵوەشایەوە و لە پاش ئەوە ئیتر ئاغا خاوەنی ڕەعیەتەکانی خۆی نەبوو، بەڵام هێشتا وەرزێڕی کەم داهات و ڕەشاییەکان لە هەمبەر خاوەن زەویوزارەکاندا وەک کۆیلە وابوون. نۆخلیدۆڤ ئاگای لە هەموو شتێک هەبوو، مڵکەکانی ئەویش بەو شێوەیە بەڕێوە دەچوون و پێرەوەیی لەو ڕێسایە دەکرد، لە ساڵانی ڕابردووەوە دەیزانی ئەو سسیستەم و ڕێسایە دوور لە عەداڵەت و ویژدانە. لەو سەردەمەدا کە خوێندکاری زانکو بوو، شەیدای بیروباوەڕی( هانری جۆرج) بوو و ئەو مڵکانەی وەک میرات لە باوکی پێی بڕابوو، دابەشی کرد بە سەر ڕەعیەتەکاندا؛ چونکە لەو سەردەمەدا ئاغایەتی و چەوساندنەوەی ڕەعیەتەکانی بە کوێلەداری دەزانی و وەک تاوانێکی گەورە چاوی لێدەکرد.

کاتێک چووە ڕیزی ئەرتەشەوە و فێری هەڵە خەرجی بوو، ساڵی بیست هەزار ڕۆبلی بە بادەدا، بۆیە هەموو ئەو بیروباوەڕ و بیرۆکانە لە مێشکیدا سڕدرایەوە. دایکی بە لێشاو پارەی بۆ دەنارد، ئەویش گوێی نەدەدایە ئەو پارانە لە کوێوە دێن و ڕەنجی شان و ئارەقەی ناو چاوانی چ ڕەشوڕووت و بێچارەیەکن. چەند مانگ لەمەوبەر کە دایکی مرد هەموو ئەو مڵک و زەویوزارە زۆر و زەوندە بە ئەو بڕا و ناچار بوو خۆی بە سەر کار و

بارەکاندا ڕابگا و بە ڕێوەی بهێنێ. ئەو کاتە بوو کە سەر لە نوێ مەسەلەی ئاغا و ڕەعیەت لە مێشکیدا سەری هەڵدایەوە. مانگێک پێش ئەوە ئاکامی بیرکردنەوەکانی ئەوە بوو کە جگە لەوە هیچ چارەیەکی تری نییە؛ هیچ کەس توانایی گۆڕینی ئەو سیتەم و یاساوڕێسایەی نییە و جگە لەوەش گوێخا و سەرکار و باب نۆکەر کاروباری ملکەکانی بەڕێوەدەبەن و خۆی لەگەڵ ڕەعیتەکان بەرەوڕوو نابێ؛ بەو قسانە خۆی ئارام دەکردەوە، بەڵام ئێستا سەفەری سیبیریای لەبەر بوو . لەم سەفەرە پڕمەترسییەدا کە لەگەڵ کاروانی بەندییەکان دەکەوێ، پێویستی بە پارەی زۆر هەیە، هەستی دەکرد دەبێ چارەنووسی ملّک و ڕەعیەتەکانی ڕوون بکاتەوە و تەنانەت ئەگەر تووشی زیانیش بێ، لە قازانج و زیانەکان چاوپۆشی بکات. بەرژەوەندیی خۆی لەوەدا دەدی کە بە جێی بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆ، هەمووی بە نرخێکی کەم بدات بە وەرزێڕەکان، تاکوو ئەوانیش سەربەخۆ کاری خۆیان بکەن و لێی سەر و دڵخۆش بن.

لەم بوارەدا، پێشتر موتالای کرد بوو و لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە بە ئیجارەدانی ملّک و زەویوزار بە ڕەعیەت و جووتیاران خۆی لە خۆیدا جۆرێک چەوساندنەوە و تالان کردنی ئەرک و دەسترەنجەکانیانە. لەو سەردەمەدا کە ڕەعیەتەکان کویلەی زەڕخریدی ئاغا بوون، بێگارییان بۆ دەکرد و سەریان بۆ هەموو نۆکەری و سووکایەتییەک دادەنەواند. ئاغا لە ڕێی ستەم و توندوتیژییەوە دەسترەنجەکەیانی ڕادەماڵی. بە ئیجارەدانی زەویوزاریش بە ڕەعیەت. هەر ئەو ئامانجەی لە پشتە بەڵام بە شێوەیەکی نەرمونیانتر. چارەی بنەڕەتیی ئەو کارەش ئەوە نییە بەڵام هەنگاوێکە بۆ پێشەوە؛ نۆخلیدۆڤ بڕیاری دا بەو شێوەیە لەگەڵ ڕەعیەتەکان بسازێ.

نزیک نیوەڕۆ گەیشتە کۆزمینسکۆیە.

دوای ئەو گـۆڕانە، بە ئاسـانی قەنـاعەتی ڕەچـاو کردبـوو. بـێ ئەوەی تیلگەڕاف بکات و هاتنی خۆی ڕاگەیێنێ، چووبوو بۆ وێستگە، فەیتوونێکی گرتبوو و وەڕێکەوتبوو. فەیتوونەوان گەنجێک بوو، فانیلەیەکی لە بەرگنی وشتر لەبەردابوو، لای خوارێی تەنگ و نێوقەدی ڕێک گوشیبوو. لە سەر جێگاکەی خۆی خوار دانیشتبوو بۆ ئەوەی بتوانێ لەگەڵ مسافیرەکەی قسە بکات. بارگینەکانی لاواز و ڕەقەڵە بوون، یەکیان دەشەلی و ئەوی دیکەشیان بۆ لای چەپی دەکێشا.

فەیتوونەوان کە نەیدەزانی مسافیرەکەی ئاغای کۆزمینسکۆیەیە، دەستی کرد بە باس کردنی کوێخا بە ڕەگەز ئاڵمانییەکەی ئەو ملکە پان و بەرینە:

ـ نازانی ئەوکوێخایە چ دامودەزگایەکی پێکەوە ناوە!

هێنـدێ جـار خەرەزەنـی لە بارگینەکـان ڕادەکێشـا؛ جارجـاریش خەرەزەنەکەی هەڵدەسووڕاند و بڕێ جاریش لە پەنا خۆی دایدەنا. ئەو گەنجە زۆر دەم پاراو و سوێر قسە بوو، دەیزانی چۆن تاموخوێ بدات بە قسە و چیرۆکەکانی.

ـ ئەو کوێخایە لەم بەینانەدا جووتێ ئەسپی کڕیوە ڕەنگیان دەڵێی شیر و قاوەیە. نازانی چ بەزم و میوانداریيەک وەڕێ دەخا! هەر ئەم زستانە، شەوی جێژنی نۆئێل، چەند دەستەی بۆ ماڵی ئاغا بانگهێشتن کردبوو. لە سەر دارەکاژی نۆئێل ئەستێرەیەک دەدرەوشایەوە کە وێنەی نەبوو. ئەم کابرایە وەک گەڵا تاڵوو پارە خەرج دەکات. جا بۆ نایکا؟ دەتوانێ و دەیکا! دەڵێن ملکێکی کڕیوە سەروبنی دیار نییە.

نۆخلیدۆڤ بەلایەوە گرینگ نەبوو کە کوێخا ئەڵمانییەکەی چۆن هەڵە خەرجـی دەکـا. حەزی لەو سوێرقسـەیی و چەقەسـرۆییەی لاوی فەیتوونەوانیش نەبوو. چاوی لە دیمەنەکانی دەوروبەری دەکرد. ڕۆژێکی

خۆش بوو. گەواڵە هەوری ڕەش بە ئاسمانەوە دەگەڕان و هێندێ جار پێشی خۆریان دەگرت. هەتا چاو هەتەری دەکرد، کێڵگەی گەنم بوو و وەرزێڕەکان لەلایەک خەریکی وێنجەدروون بوون و لە لایەکیش جووتیان دەکرد. لە نێو شینایی تۆخی بەهارەکێڵدا جوڕەپۆپنە و جوڕەقازلاخی دەفرین و دەنیشتنەوە. جگە لە دار بەڕوو کە درەنگتر گەڵا دەر دەکا، دارەکانی تر هەموویان تاجی زمڕوودیان لە سەر نابوو. ڕەوەی ئەسپ و گاڕان بە ئازادی بەو دەشت و بەیارانەدا دەسووڕانەوە. کۆنت چاوی لەو هەموو جوانییە دەکرد؛ بەڵام لە ناکاو شڵەژانێک خۆی لە زەینی پێچا و هەستی بە خەمێکی تاڵ و ناخۆش کرد.

کاتێک گەیشتنە کۆزمینسکۆیە، وەها بە کاروبارەوە سەرقاڵ بوو کە هەموو ئەو خەم و دڵتەنگییانە لە سەرزەین و دڵی ڕەوینەوە. سەرەتا بە حیساب و کیتابی مڵکەکەی ڕاگەیشت. لەو کاتەدا حیسابدار بە زمانێکی ساکار بۆی ڕوون دەکردەوە کە پەڵە زەویی جووتیارەکان لە نێوان زەویوزاری بەرینی ئاغادا هەڵکەوتوون و هەتا ماوەیەکی تر لە کەڵک دەکەون و لە دەستیان دەبێتەوە. ڕوونکردنەوەی حیسابدار زیاتری هان دا بۆ ئەوەی زووتر مشوورێکی ئەو کارە بجوا و ئەو داماوانە لەو بارودۆخە تاڵە ڕزگار بکات.

پێداچوونەوەی حیسابەکان و ئاخافتن لەگەڵ حیسابدار تێی گەیاند کە دوو لە سەر سێی باشترین زەوییەکان بەدەست کرێکار و سەپانەوەیە و بە مەکینەی پێشکەوتووی کشتوکاڵ کاری لە سەر دەکەن، یەک لە سەر سێی زەوییە خراپەکانیش بە دەستی ڕەعیەتەکانەوەیە و بە کەرەسەی کۆن دەیکێڵن و کاری لە سەر دەکەن، بۆ هەر دۆنمێکیش تەنیا پێنج ڕۆبڵ هەقدەست وەردەگرن؛ ئەم داماوانە بۆ بەدەست هێنانی پێنج ڕۆبڵ دەبێ

ساڵێکی ڕەبەق بە شێوەی کۆن سێ جار بیکێڵن و وەردی بدەنەوە و دایچێنن، پاشان بە داس بیدروونەوە و بە ئاژەڵ گێرەی بکەن و شەن و کەوی بکەن؛ بەڵام کرێکار و سەپانەکان بۆ نیوەی ئەو کارە لانیکەم دە ڕۆبڵ وەردەگرن.

ئەوەی ئاغا دەیدا بە ڕەعیەتەکان، بە نرخێکی گران بە سەریاندا دەسەپا. ڕەعیەتەکان دەبوو لە دەسترەنجی خۆیان هەقی لەوەڕگە و بێشە و هەزار جۆر هەق و مزی تر بدەن بە ئاغا و بەو پێیە هەمیشە قەرزدار بوون. زەوییە لاپەڕ و دوورەدەستەکانیش بە چوار هێندەی نرخی خۆی بە ئیجارە دەدران بە وەرزێرەکان و هیچ داهاتێکی نەبوو بۆیان.

نۆخلیدۆڤ ئەوەی دەزانی؛ بەڵام ئەمجارەیان بە چاوێکی وردبینترەوە و بە چاوێکی تازە دەیڕوانییە کێشەکان و لە خۆی دەپرسی: «بۆ خان و ئاغاوات لە حاندی ئەو هەموو زوڵم و زۆرە خۆیان کوێر و کەڕ کردووە؟ ئەگەر لەوەش ئاگادارن و تێدەگەن چۆن ئەو هەژار و داماوانە دەچەوسێنەوە، بۆ دەستیان لە سەر دەست داناوە و کارێک ناکەن؟»

کوێخای ئەڵمانی ڕەگەز لە سەر ئەو باوەڕە بوو ئەگەر زەویوزار بە ئیجارە بدرێ کەرەسەی کشتوکاڵ و ئاژەڵەکان بە هۆی کەمتەرخەمییەوە لە حەرام دەگەڕێن و خەسار دەبن، وەرزێڕەکانیش بۆ ئەوانە دنیارێکیان لە دەست دەرنایە. ئەو کاتە کارەکان تووشی ئاڵۆزیوپڵۆزی دەبن و کێڵگەکان لە حەرام دەگەڕێن، تەنانەت وەزێڕەکانیش زیانییان لێدەکەوێ. کوێخا بەردەوام شێر و ڕێویی دەهێنایەوە و دەیویست بیروڕای کۆنت نۆخلیدۆڤ بگۆڕێ، بەڵام ئەو بڕیاری خۆی دابوو، دەیویست هەنگاوێک بە قازانجی وەزێڕەکان هەڵێنێتەوە و زەوییەکانیان بە نرخێکی زۆر کەم بە ئیجارە بداتێ.

بڕیارەکەی ئەوە بوو کە بەبێ ڕاوەستان لەو یەک ـ دوو ڕۆژەدا، کارەکان یەکلایی بکاتەوە و کاروبارەکانی دیکە وەک دروێنە و فرۆشتنی بەرهەمی ئەمساڵ و گوێستنەوەی ئامێر و کەرەسەی کشتوکاڵ و شتەکانی دیکە بە کوێخا بسپێرێ، بەو مەبەستە پەیامی بۆسێ گوندی دیکەی سەر بە قەزای کۆزمینسکۆیە نارد کە سبەینێ بەیانی لە شوێنێک کۆببنەوە و قسەی لە سەر بکەن و کارەکە یەکلایی بکەنەوە.

کۆنت نۆخلیدۆڤ تاڕادەیەک لە کارەکەی خۆی ڕازی بوو، گوێی بە قسە و بڕوبیانووی کوێخای ئەڵمانی نەدا و هاتە سەر ئەوەی لە بەشێکی داهاتی خۆی چاوپۆشی بکات. ئەو ڕۆژە کاتی عەسر ماوەی سەعاتێک لە دەرەوەی ماڵەکەی پیاسەی کرد. لە گۆمی بیروخەیاڵدا نوقم بووبوو. بە تەنیشت باخچەکەی بەرماڵی کوێخادا تێپەڕی. گەیشتە گۆڕەپانی تێنیس و دیتی هەموو بە بنجی خۆڕسکی چەقچەقە داپۆشراوە. چووە پێشترەوە. گەیشتە ڕێگایەکی باریک کە لە هەردوو بەرەوە داری زیزفۆن سێبەریان وەسەر کێشابوو. وەبیری هاتەوە ڕۆژانێک خاتوو کریمۆڤا میوانی دایکی بوو و عەسرانە شان بە شانی ئەو خاتوونە شۆخوشەنگە لە سەر ئەو ڕێگایە پیاسەیان دەکرد و جوانی و نەرمونیانی ئەو ژنە چێژی بە ڕۆحی دەبەخشی. هەروا بیری دەکردەوە. لە بیری سبەینێدا بوو کە دەبوو لە کۆڕی وەزێرەکاندا قسەی تازە بکات و ئەو بابەتانەی دەیویست لە سەری بدوێ لە زەینی خۆیدا تاوتوێ دەکرد. دەورێکی لێدا چوو بۆ ماڵی کوێخا. پێکەوە چاییان خواردەوە و چوونەوە سەرباسی مووچە و مەزراکە، نۆخلیدۆڤ کوێخای تێگەیاند کە بڕیاری خۆی داوە و چاک بێ یان خراپ پاشگەز نابێتەوە.

کە هەوا تاریک بوو، گەڕایەوە بۆ دیوەخانی خۆی کە هەمیشە بۆ میوانداری ئامادە و دەرگای لە سەر پشت بوو. ژووری چکۆڵەی خەوکەی

ڕێکوپێک کرابوو. تابلۆیەک لە دیمەنەکانی ڤێنیز بە دیوارەوە بوو. ئاوێنەی باڵا نوێنیان لە نێوان دوو پەنجێرەدا دانابوو، چرپا و لێفەونوێنەکەی پاک و خاوێن، لە سەر مێزێکی گردی تەنیشت قەرەوێڵەکە دۆلکەیەک ئاو و پەرداخێک و شەمچەیەک و مقەستێک بۆ کوژاندنەوەی مۆم داندرا بوو. لە سەر مێزێکی گەورە کە لەبەر ئاوێنە باڵا نوێنەکەدا داندرا بوو جانتاکەی کردەوە. سێ کتێبی لەگەڵ خۆی هێنابوو؛ یەکیان کتێبێک بوو بە ناوی «لێکۆڵینەوەیەک سەبارەت بە یاسای سزا» بە زمانی ڕووسی، دووهەمی بە زمانی ئینگلیزی و سێهەمی بە زمانی ئەڵمانی، هەرسێ کتبەکەش هەر ئەو بابەتە بوون. دەیویست لە کاتی حەسانەوەدا بیانخوێنێتەوە؛ بەڵام بیر و مێشکی وەها ئاڵۆز و پەرێشان بوو تاقەتی خوێندنەوەی نەبوو. کەوتە بیری ئەوەی زووتر بخەوێ و بەیانی زوو هەستێ بڕوات بۆ کۆڕی فەلا و جووتیارەکان.

کورسییەک لە داری کاژ کە بە شێوەیەکی شارەزایانە کەندەکاری کرابوو، لە سووچێکی ژوورەکەی دایکی بوو، بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هەستی جووڵاند. کتوپڕ کەوتە بیری ئەوەی بۆ لە خۆڕا هەموو شتێک بشێوێنێ؟ بە هۆی ئەو بڕیارانەی ئەوەوە زۆر زوو ئەم دیوەخانە کاول دەبێ، باخ و باخچەکە دەشێوێن و دارستانەکان وشک دەبن، گەوڕ و گەلەخان و ئەنبارەکان دەڕوخێنن و کەرەسە و مەکینەی کشتوکاڵ دەفرۆشنەوە؛ ئەسپ و بارگین و مانگاکان دەفرۆشن و ئەوەی ساڵانێکی دوورودرێژ بە ڕەنج و زەحمەت وەسەر یەک خرابوو هەموو لەبەریەک بڵاو دەبێ و ئاسەواری نامێنێ. ئەو پێی وابوو چاو پۆشی کردن لەو هەموو ماڵ و سامانە زۆر سانایە و وەک ئاو خواردنەوە وایە، بەڵام ئێستا وەسوەسەیەک لە ناخیدا سەری هەڵدابوو: «بۆ لە خۆڕا ئەو هەموو

زەویوزارە لە دەست بدەم کە تا ئێستا بە لێشاو پارەی ڕشتۆتە گیرفانمەوە؟ یانی کارێکی ئاقڵانەیە پشت لە هەموو شتێک بکەم و لە نێوی بەرم؟»

بەڵام دەنگێک لە ناخی گیانیدا هاواری دەکرد: «ئەم هەموو مڵک و زەویوزارە هی تۆ نییە. گریمان هی تۆش بێ، مەگین دەتوانی ئاگاداری لە هەمووی بکەی و ڕەعەمەلی بێنی؟ تۆ چەند حەوتووی تر لەگەڵ کاروانی دیلەکان دەڕۆی بۆ سیبیریا، ئیتر پێویستت بەم هەموو زەوی و مڵک و دیوەخانە نییە!»

دیسان دەنگێکی تر وەڵامی دەدایەوە: «گریمان تۆ چووی بۆ سیبیریا؛ خۆ ئەو سەفەرە بۆ هەتا هەتا نییە؛ درەنگ یان زوو دەگەڕێیتەوە. ڕەنگە ژن بێنی و منداڵت ببێ. لەبەر ئەوان دەبێ ئەو مڵک و ماڵە بهێڵیتەوە و ئاگاداریی لێبکەی و منداڵەکانت لەو ماڵ و سامانە بێبەش نەکەی. ڕووخاندن ئاسانە، بەڵام ساز کردنەوە زۆر دژوارە. ژیرانەتر بیر لە داهاتووی خۆت بکەوە و بڕیارێکی ئاقڵانە بدە. بۆ دەتهەوێ هەموو شتێک بدەی بە دەم بادا! بۆ؟ ئەو کارە بۆ ڕازی کردنی ویژدانی خۆت دەکەی یان بۆ یانیها و خۆنواندن؟ ڕەنگە بۆ ئەوە بێ لە لای خەڵکی لووت هەڵێنی و خۆی پێوە ڕانێی و ناسیاو و نەناسیاو باست بکەن؟»

نۆخلیدۆڤ هەستی دەکرد قسەو بیروڕای خەڵکی هیچ شوێنێک لە سەر بڕیارەکەی دانانێ. لە هەمبەر ئەم هەموو پرسیارەدا هیچ وەڵامێکی نەبوو. بۆ ئەوەی مێشکی لە دەست ئەو هەموو فیکر و خەیاڵانە بحەسێتەوە، لە سەر چرپاکەی خۆی ڕاکێشا و چاوی قووچاند بەڵکوو خەوی لێ بکەوێ. خەوی لێ نەدەکەوت. هەوای فێنک و تریفەی مانگ لە پەنجەرەی نێوە ئاواڵەوە دەهاتنە ژوورێ. قیڕەقیڕی بۆق لە ئەستێری نێو باخەکەوە دەهاتە گوێ و هێندێ جار لەگەڵ چریکەی بولبولەکان تێکەڵ دەبوو. بولبولێک لەو پەڕی

باخەکەوە دەیخوێند و بولبولێکی تر لەم سەری باخەکەوە وەڵامی دەدایەوە. دەنگی بولبولەکە، پیانۆ ژەنینی کچی سەرۆکی بەندیخانەی وەبیر نۆخلیدۆڤ هێنـــایەوە؛ وردە وردە ماســلۆڤای وەبیــر دەهـــاتەوە کە لێــوی دەلەرزی و دەیگوت: «دەستم لە کۆڵ بکەنەوە!» لە خەیاڵی ئەودا هەسێڵی پڕ لە بۆق و کوێخـای ئەڵمـانی کچــی ســەرۆکی بەنــدیخانە و ماســلۆڤا پــێکەوە ئـاوێتە بووبوون.

هەنیشکی کردەوە کۆڵەکەی جەستەی و سەری نابە دیوارەکەوە. لە خۆی پرســی: «یـانی ئەو کـارەی مـن دەیـکەم کـارێکی بـاش و ئـاقڵانەیە؟» بەڵام وەڵامێکی پڕ بە پێستی بۆ نەدەدۆزییەوە. لەو ساتەدا باشترین کار خەوتن بوو. وردە وردە پێڵووی قورس بوو و خەوی لێ کەوت.

# دوو

کـاتژمێر نـۆی بەیـانی خەبەری بـۆوە. بەرپرســی نووســینگەکەی کە خـزمەت کردنـی کـۆنتی لە ئەسـتۆ بـوو، کەوشـەکانی بـۆ بۆیـاغ کـرد بـوو، بـریقەی دەهـات. گـۆزەیەک ئـاوی فێنکـی لە کانیـاوەکەی نێـو بـاخی بـۆ هێنـا و هەواڵـی پێـدا کە وەرزێڕەکـان کۆبـوونەتەوە. لە پـێخەفەکەی هـاتە دەرێ. ئیتـر ئەو هەمــوو داخ و مخـابنەی شــەوی ڕابـردوو ئاســەرواری نەمـابوو. تەنـانەت بە وەبیـر هـاتنەوەی دڕدۆنگـی و نیگەرانییەکـانی شــەوی ڕابـردووی، هەسـتی بە شـەرمەزاری دەکـرد. بەپەلە جلەکانی لە بەر کرد. ڕازی و دڵخۆش بوو کە دەیهەوێ کارێکی خێر بکات.

لە پەنـجەرەکەوە چـاوی لە دەرێ کـرد. چـاوی بە وەرزێڕەکـان کەوت لە مەیـدانی تێنـیس کۆبووبـوونەوە، لقـی چەقـچەقەی خۆڕسـک هەتـا سـەرووی ئەژنۆیـان دەهـات. هەواکەی هەوروهەڵا بـوو. لە بەیـانی زووەوە بـاران نـم نـم

دەباری و گەڵاو لاسکی ڕووەک ئاویان لێدەچۆڕا. بۆنی گەڵا و بۆنی گیاوگژ و بۆنی خاکی باران لێدراو وڵاتی داگرتبوو. نۆخلیدۆڤ لە پەنجەرەکەوە چاوی لە وەرزێڕەکان کرد. هەر کەس دەگەیشتە شوێنی کۆبوونەوەکە بۆ ڕێز گرتن کڵاویان لە سەریان دادەگرت و سڵاو و چاکوچۆنیان لەگەڵ یەکتر دەکرد. بە شێوەی بازنەیی لە دەروری یەک کۆبووبوونەوە. هێندێکیان خۆیان دابوو بە سەر گۆچانەکەیاندا و پێکەوە قسەیان دەکرد. کوێخای ئەڵمانی، کە قەڵەو و چوار شانە بوو، هات بۆلای کۆنت نۆخلیدۆڤ. چاکەتێکی سەوزی لەبەر کردبوو قۆپچەی گەورەی پێوە بوو و ملیوانەی کراسەکەی شەق و ڕەق ڕاوەستابوو. پێی ڕاگەیاند کە هەموو شتێکی ئامادەیە بەڵام وا باشترە زۆر پەلە نەکات. بە ئارامی ناشتایی بخوات و دوای کاتژمێرێکی تر بێت بۆلای فەلا و جووتیارەکان. نۆخلیدۆڤ قسەکەی کوێخای بە دڵ نەبوو. گوتی:

ـ نا، چاوەڕوانیان ناکەم؛ هەرئێستا دێم.

هەستی بە شەرمەزاری دەکرد؛ بەڵام نەیدەزانی بۆ. دەیویست کارێکی چاکە بکات، زەویوزارەکەی بە نرخێکی کەم بدات بە ڕەعیەتەکان و ئەوەش شەرمی نەدەویست. کاتێک لە کۆڕی ڕەعیەتەکان نزیک بۆوە، هەموو کڕنۆشیان بۆ برد. یەکێکیان قژی زەرد بوو، یەکێکی تر سەرئاڵۆز و ئەوی دیکە ماشوبرنجی . چەند کەسیش سەریان ساف بوو. جارلەگەڵ جار شەرم و نیگەرانییەکەی نۆخلیدۆڤ ڕوو لە زیاد بوون بوو. مات و بێدەنگ دەیڕوانی. باران هەروا دەباری سەر و ڕیش و جلوبەرگی ڕەعیەتەکان ئاوی لێدەچۆڕا. کوێخای ڕەگەز ئەڵمانی کە دیتی کۆنت بێدەنگە، سەری قسەی کردەوە. بە زمانێکی پاراو دەدوا و ڕووسیی زۆر باش دەزانی، لە سەر ئەو باوەڕەش بوو کە هیچ کەس وەرزێڕە ڕووسەکان وەک ئەو ناناسێ. جەستەی بە هێز و دەموچاوی سوور و سپی و زەردە تێزاوی لە هەمبەر

ڕەعیەتە لاواز و ڕەنگ پەڕیوەکاندا، کە دەستی قەڵەشیو و کزیان لە قۆڵی کراس و چاکەتە کۆنەکانیان هاتبووە دەری، زەوی تا ئاسمان جیاواز بوون.

ـ کۆنت تەشریفی هێناوە و دەیهەوێ چاکەیەکی زۆر گەورەتان لەگەڵ بکات و زەویوزارەکەی بە نرخێکی زۆر کەم بە ئێوە ببەخشێ؛ ئەگەرچی ئێوە شایانی ئەوە نین.

پیاوێکی سوورهوول ناڕەزایەتیی دەربڕی:

ـ جەنابی کوێخا! بۆ شیاوی ئەوە نیین؟ خۆ ئێمە لە سەر ئەو زەوییانە خوێن و ئارەقەمان تێکەڵ کردووە و لە بەیانییەوە هەتا شەوێ لە خزمەت جەنابت دابووین. کۆنتس خودا گۆڕی پڕکا لە نوور، زۆر دڵسۆز بوو دەرهەق بە ئێمە و جەنابی کۆنت نۆخلیدۆڤی لاویش تائێستا دڵی نەڕەنجاندووین و خراپەمان لێ نەدیوە. خودا ڕاوەستاویان کا! ئێمە تا ئێستا لە سەر ئەو زەوییانە کارمان کردووە و لەمەبەولاوەش کاری لە سەر دەکەین. نۆخلیدۆڤ کاتەکەی لەبار دی و دەستی کرد بە قسە کردن:

ــ بۆیە داوام لێکردن لێرە کۆ ببنەوە، ئەگەر ڕازی بن تەواوی زەویوزارەکەی ئێرە دەدەم بە خۆتان.

ڕەعیەتەکان متەقیان لە خۆیان بڕیبوو. تاسا بوون. باوەڕیان نەدەکرد. ڕەعیەتێک کە جلوبەرگی کاری لەبەر کردبوو لێی پرسی:

ـ جەنابی کۆنت بە چ شێوەیەک زەوییەکانمان پێدەدەی؟

ـ زۆر سادەیە؛ زەوییەکان بە ئیجارەیەکی زۆر کەم دەدەم بە ئێوە. یانی ئەوەندە هەرزان کە بە ئاسانی بتوانن بیدەن.

ڕەعیەتەکان هەرکام شتێکیان دەگوت:

ـ مامەڵەیەکی باشە، بەو شەرتەی ئیجارەکەی زۆر نەبێ.

ـ زۆریشت سپاس دەکەین، چونکە بژیوی ئێمە لەو زەوییانە پەیدا دەبێ.

ـ ئێمە گیانێکمان بەو زەوییانەیە، بە چاوان قەبووڵی دەکەین.

ـ ئەوە بۆ جەنابی کۆنتیش باشترە. ئیتر ئەو گرفتاری و کێشانەی لە کۆڵ دەبێتەوە. پارەی ئیجارەکەی وەردەگریّ و وەدووی کاوباری خۆی دەکەوی. بەڵێ، بەم شێوەیە لە هەموو دەردەسەرییەک ڕزگاری دەبیّ.

کوێخا دەنگی هەڵبڕی:

ــ ئەگەر دەردەسەریش هەبیّ هەمووی ئێوە سازی دەکەن. ئەگەر بە جوانی کار بکەن و ئەرکی خۆتان بزانن، ئەم هەموو دەردەسەرە...

پیرە پیاوێکی لاواز و لووت باریک، پەڕییە نێو قسەکانی:

ــ ئێمە دەردەسەریمان بۆ کیّ ساز کردووە؟ تۆ بەردەوام بیانوومان پێدەگری و هاتوهاوار ساز دەکەی، جاریّ دەڵێی ئێستری فلان کەس چۆتە گەنمەکەوە و گێرەی کردووە؛ خۆ خەتای ئێمە نییە. لە بەیانییەوە هەتا شەویّ ئارەقە دەڕێژین. ڕۆژێکمان بە ساڵێک لیّ دەڕوا. خۆ سەد چاومان پێوە نییە، یەسترەکە هەوساری پساندووە و چۆتە نێو گەنم و وێنجەوە.

ـ ئەرکی تۆ تەنیا ئەوەیە مرێس و ئەرکناس بی.

ڕەعیەتێکی کەڵەگەت و سەروڕیش ئاڵۆزی چاو زەرد، بەدەم کوێخادا هاتەوە:

ـ تۆش لە بەیانییەوە هەتا شەویّ مرێس، مرێست داناوە لێمان! تۆش بەو مرێس، مرێسە دیقت پێکردووین.

ـ چبکەم؟ شەویلکەم شل بووە لەگەڵتان هێندەم گوتووە دەوری مەزراکە تەیمانی لێدەن.

پیاوێکی سەرساف وەدەنگ هات:

ـ کیّ ئەو کارەی کردووە، ئێمە بیکەین، ئەو هەموو مەزرایە چۆن تەیمانی لێدەین؟

یەکێکی تر گوتی:

ـ بۆ پەرژین و تەیمان دار پێویستە؛ دارمان بۆ بێنە با دەوراندەوری زەوییەکە تەیمانی لێدەین.

یەکێک لە پشت سەری هەمووانەوە دەنگی هەڵبڕی:

ـ پارەکە چووم دار بێنم بۆ تەیمانی دەوری مەزراکە، جەنابی کوێخا بەرۆکی گرتم و خستمیە زیندان. سێ مانگ لە نێو بەندیخانە نالاندم و لە ڕشک و ئەسپێدا ڕزیم.

نۆخلیدۆڤ هاتە قسە و لە کوێخای پرسی ڕاستییەکەی بڵێ. ئەو بە زمانی ئەڵمانی گوتی:

ـDererste Dieb im Dorfe هەموو ساڵێک ئەو پیاوە دارەکانی مێشە دەدزێ. ئەوەی ڕێزی بۆ دانانێ و گوێی پێنادا مافی خەڵکییە.

- ئێمە ڕێز بۆ هەموو کەس دادەنێین. مەگین ڕێز دانانێین؟ تۆ وەک مار لە پێی ئێمە ئاڵاوی و بڕستت لێ بڕیوین.

کوێخا تۆزێ خاو بۆوە:

- برایان! ئێمە هیچ کەسمان ئازار نەداوە؛ ئێوەن کارتان ئەزیەت و ئازاری ئێمەیە.

ـ ئێمە چیمان کردووە؟ ئازارمان بە کێ گەیاندووە؟ لەبیرت چۆتەوە پارەکە لێتدام و سەرت شکاندم؟ هێشتا جێگای شکاوەکەی دیارە. لەم دەڤەرە ئێوەی دەوڵەمەندی خاوەن دەسەڵات چیتان پێخۆش بێ دەیکەن و هیچ کەسیش لە گوڵ کاڵترتان پێ ناڵێ.

- لەگەڵ هەمووان بە پێی یاسا هەڵسوکەوت دەکرێ! کوێخا و ڕەعیەتەکان دەستیان کرد بە چەلەحانێ. هیچ کەس لە بەرانبەرەکەی حاڵی نەدەبوو یان وای دەنواند تێ ناگا. لە لایەک ترس و تووڕەیی و لە لایەکی تر زۆری و

دەسەڵات! ئەو کێشە و دەمەقاڵێیە نۆخلیدۆڤی تاساندبوو. بەڵام لە پڕ وەخۆ هاتەوە و دەنگی هەڵبڕی:

ـ ئەو قسانە هەڵگرن بۆ کاتێکی تر. با لە مەبەستی سەرەکی دوور نەکەوینەوە. ئێوە بۆ ئیجارە چەندتان بۆ هەڵدەسووڕێ و چەندە پێشنیار دەکەن؟

ـ ئاغا! زەوی هی ئێوەیە. هەموو شتێک هەرهی خۆتانە. ئێوە دەبێ داینێن.

نۆخلیدۆڤ بڕی ئیجارەکەی گوت. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو نرخە کەمتر لەو ئیجارەیە بوو کە لە ناوچە دەدرا، بەڵام ڕەعیەتەکان پێیان زۆر بوو. کۆنت چاوەڕوان بوو ئەو بڕە کەمە بە شادی و ڕووی خۆشەوە قەبووڵ بکەن، بەڵام بە پێچەوانە کەمترین کاریگەریی لە سەر ڕوخساری ڕەعیەتەکان دانەنا و ڕەزایەتی لە ڕواڵەتیاندا نەدی. یەک ـ دوو کەس گوتیان ئەوە پارەیەکی زۆرە و بۆیان هەڵناسووڕێ. چەند کەسیش بابەتێکی تازەیان هێنایە گۆڕێ و پرسیان: ئەم هەڤیازییە تەواوی ڕەعیەتەکان دەگرێتەوە، یان تەنیا بۆ تاقمێکی تایبەتە؟ دیسان چەلەحانێ دەستی پێکردەوە. تاقمێک لە سەر ئەو باوەڕە بوون کەسانی دەستکورت و قەرزکوێر قرت بکرێن؛ بەڵام کوێخا کتوپڕ هەڵیدایە و کێشەکەی دامرکاند، ڕادەی ئیجارە و ماوە پێدانەکەی دیاری کرد و کارەکە کۆتایی هات. ڕەعیەتەکان کە لە بیری کاری خۆیاندا بوون، هەروا کە پێکەوە دەدوان ملی ڕێیان گرت و ڕۆیشتن. نۆخلیدۆڤ گەڕایەوە بۆ دیوەخانەکەی و لەوێ بە یارمەتیی کوێخا و بەرپرسی نووسینگەکەی گرێبەستی ئیجارەنامەکانیان ئامادە کرد.

هەموو شتێک ئەو جۆرەی چاوەڕوانی دەکرا، کۆتایی هاتبوو. ڕەعیەتەکان زەوییەکانیان بە سی لە سەد کەمتر لە نرخی باوی ئەو دەڤەرە بە ئیجارە گرتبوو و داهاتی کۆنت لە سەر یەک، پەنجا لە سەد کەمتر بووە بۆوە، بەڵام

هەر ئەو بڕە پارەیە بۆ ئەو سەروو زیاد بوو. لە فرۆشتنی داری مێشە و کەرەسەی کاریش پارەیەکی باشی دەست دەکەوت. هەموو شتێک بە باشی کۆتایی هاتبوو و لە ئاکامی کارەی ڕازی بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ناخی دڵەوە ڕازی نەبوو. چەند کەس لە ڕەعیەتەکان بۆرە سپاسێکیان لێکرد، بەڵام زۆر بەیان ناڕازی بوون و چاوەڕوانیی زیاتریان هەبوو. هەستی دەکرد سەرەڕای بەخشینی بە شێکی زۆر لە داهاتەکەی، دیسان بە ئامانجی خۆی نەگەیشتووە.

سبەینێی ئەو ڕۆژە گرێبەستەکانیان واژۆ کرد. چەند کەس لە ڕیش سپییەکان هاتن بۆ بەڕێکردنی. نۆخلیدۆڤ سواری فەیتوونی ڕازاوە و سێ بارگینەی کوێخای ئەڵمانی بوو و وەڕێکەوت. ڕەعیەتەکان کە لە قەراغ ڕێگاکە ڕاوەستا بوون، مات و ناڕازی سەریان دەلەقاند. نۆخلیدۆڤ نەیدەزانی بۆچی خۆشحاڵ نییە و هەستی بە شەرمەزاری و خەمێکی تاڵ دەکرد.

## سێ

نۆخلیدۆڤ لە کۆزمینسکۆیەوە بەرە و ئەو مڵکانە وەڕێکەوت کە لە پوورەکانییەوە بە میرات پێی گەیشتبوو؛ هەر ئەو جێیەی کە کاتیۆشای لێ ناسیبوو. دەیویست زەوییەکانی ئەویش بە ئیجارە بدات بە ڕەعیەتەکان و خۆی لە خەم و کێشەی زەویوزار ڕزگار بکات. ئەگەر بگونجایە، سەبارەت بە دوا ڕۆژەکانی مانەوەی کاتیۆشا لەو دەڤەرە و مندالەکەی کە بوویەتی پرسیار بکات و بۆی ڕوون بێتەوە مندالەکە بەڕاستی مردووەیان بە مردوویان لە قەڵەم داوە.

بەیانی زوو گەیشتە ئەوێ. هەموو شتێک وێران بوو بوو و ئاداری بە سەر پادارییەوە نەمابوو. ئەو ماڵ و دیوەخانە خۆش و ڕازاوەیەی پوورەکانی، چۆڵ و لاڕووخاو، بووبووە کاولاش. شیروانیی سەوزی ماڵەکە ژەنگی هێنا بوو و با هەمووی لە بەر یەک هەڵتەکاند بوو. تەختەبەندی تەرک و دیوارەکانی هەموو هەڵکەندرا بوون و لەم لا و ئەو لا فڕێدرابوون. قاڵدرمەی دارینی پێش و دواوەی ماڵەکە تەنیا چەند لە توکوتی لێ مابۆوە. شووشەی پەنجەرەکان دەرهاتبوون و بەجێی ئەوان تەختەیان تێگیرابوو. ژوورەکانی تایبەتی کوێخا و چێشتخانە و گەوڕ و گەلەخان، هەمووی خاپوور بووبوون؛ تەنیا چەند لادیواری بە پێوە مابوو.

لەو ملکەدا تەنیا باخەکە جوانی و ڕازاوەیی خۆی پاراستبوو. دارەکان بە ئازادی و بە شێوەیەکی سروشتی گەشەیان کردبوو و لەو کاتەی ساڵدا نوقمی گوڵ بوون. لق و پۆیی گێلاس و سێو و هەڵووژە تارای سپی و پەمەییی چرۆیان بە سەردا دابوو، دەوەنی یاسەمەن بە گوڵی بنەوش داپۆشرابوو و وەک ئەو ڕۆژە جوان بوون کە ئەو و کاتیۆشا بۆ یاریی خۆشارکێ چوو بوون بۆ ئەوێ. ئەو کەوتبووە نێو قوولکێکەوە، دڕوو لە دەستی هەڵچەقیبوو و لە ژێر ئەو بنجە یاسەمەنە یەکەم گوڵی ماچی لە ڕوومەتی کاتیۆشا چنیبوو. دارکاژێک کە پوورە سووفیا ئیڤانۆڤنا بە دەستی خۆی چەقاندبووی، زۆر ئەستوور بوو بوو و ئالینکی زەرد و سەوز ساقەتەکەی داپۆشیبوو و لە کۆڵەکەیەکی بەرز و ئەستوور دەچوو. ڕووبارەکە هەروا کەفچڕین و پڕهاژە بوو، بنگەڕ و بژوێنی قەراغ ڕووبارەکە پڕبوو لە ڕەوەی ڕەنگاوڕەنگی ئاژەڵ و دەلەوەڕان.

کوێخای ئەو گوندە لاوێک بوو کە ماوەیەک لە قوتابخانەیەکی ئایینی دەرسی خوێندبوو، بەڵام خوێندنی تەواو نەکردبوو. بە ڕوویەکی خۆشەوە

هـات بەرەوپیـری کۆنـت نۆخلیـدۆڤ. بـزەکەی هەمیشـەیی بـوو، دەتگـوت دەیهەوێ مزگێنییەکی بداتێ؛ هەر بەو بزەیەوە چوو کرێی فایتوونەکەی ئاغای دا. زرەی زەنگـوڵەی ملـی بارگینەکـان بـوو بە زایەڵە و وردە وردە فـایتونەکە دوور کەوتەوە و بێدەنگی وڵاتی داگرت.

کۆنت نۆخلیدۆڤ لە بەر پەنجەرەی ژووری کوێخا دانیشـتبوو و چاوی لە دەرێ دەکرد. کچێکی پێخاوسی گوارە لە گوێ بە کراسی پەراوێز گوڵدۆزی کراوەوە بە بەر پەنـجەرەکەدا تێپەڕی و بەدوای ئەودا ڕەعیەتێک بە کەوشـی قــورس و ئەســتوورەوە تەپوکــوت لەوێــوە تێــپەڕی و دیســان بێــدەنگی کۆڵانەکەی داگرتەوە. گوێی بۆ دەنگی نێوباخەکە شل کرد. سروەیەکی فێنک لە کەلێنی پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورێ. قژی دەبزواند و نێو چاوانی ئارەقە کردووی باوەشێن دەکرد. پەنجەرەکەی زیاتر کردەوە و بۆنی خاکی باران لێدراو خۆی کرد بە ژووریدا. لە دوورەوە دەنگی شڵپوکوتێک دەهات. ژنانی گوندنشـین جلوبەرگ و مەلافەیـان لە بەنداوی نزیک ئاشـەکە دەشـۆرد و بە تەختەی جلشـۆری دەیـان کوتـا. خـوڕەی ئەو ئـاوە دەهـات کە دەڕژایە نێـو دۆڵابـی ئاشــەکەوە. مێشـێک لە نزیـک گـوێچکەی ویـزەی دەهـات. سـاڵانی ڕابردووی وەبیر هاتەوە کە ڕاست لەو بەر پەنجەرەیە دادەنیشت. ئەو کاتیش وەک ئێسـتا شـڵپوکوتی جلشـۆرەکان و خـوڕەی دۆڵابـی ئاشـەکە دەهـات و مێشــێک لە دەوری ســەری دەیویزانــد. دەتگــوت هەمــوو شــتێک دووپــات دەبێتەوە. چرپایەکی چکۆڵە لە پشت کۆماجەکە بوو کە بە حاڵەحاڵ جێگای کەسێک دەبۆوە لە سەری بخەوێ. نۆخلیدۆڤ بە خەیاڵیدا هات دەبێ کاتیۆشـا لە سەر ئەو تەختە منداڵەکەی بووبێ. مخابن لەو گەنجە پاک و بێ فرۆفێڵە و حەز و خولیـا شـیرینەکانی هـیچ ئاسـەوارێک نەمـابوو. خەمێکی قـورس دڵـی داگرتبوو. دەنگی کوێخا هەودای خەیاڵی پساند.

- سەعات چەند حەزدەکەی فراوێنت بۆ بێنن؟

- هار کاتێک مەیلتان لێبیە، من برسیم نییە. دەچم دەورێکی نێو گوندەکە لێدەدەم و دەگەڕێمەوە.

ــ ژوورەکانیان ئامادە کردووە. تکایە چاوێکی لێ بکەن. ئێرە زۆر پاکوخاوێن نییە...

- باشە بۆ دوایی. ئەرێ ژنێک بە ناوی ماتر ناخارینا دەناسی؟

ئەو ژنە پووری کاتیۆشا بوو. کوێخا هەر بەو بزەیەوە گوتی:

- زۆر چاکی دەناسم. هەر لەم گوندە دەژی. تەنیا کەسێکەکە نەمتوانیوە ئاکاری بگۆڕم. مەشرووبی قاچاخ دروست دەکات و دەیفرۆشێ. چەند جار ویستم سکاڵا لە دژی بەرز بکەمەوە و ڕادەستی دادگای بکەم، بەڵام بەزەییم پێیدا هات و پەژیوان بوومەوە. پیرە و خەرجی نەوە ورد و هەتیوەکانی لەو ڕێگایەوە دابین دەکات.

- ماڵەکەی لە کام گەڕەکە؟ دەبێ سەرێکی لێ هەڵێنم.

- ئەو بەری ئاوایی لای دەستە چەپ، ماڵێکی کەرپووچی لیيە لە دوورەوە دیارە. پشتی ئەو ماڵە کەرپووچە، ماترنا ماڵۆچکەیەکی هەیە و تێدا دەژی. ئیزن بفەرموون لەگەڵتان دێم.

- نا ئێوە زەحمەت نادەم. خۆم دەیدۆزمەوە. بە ڕەعیەتەکان بڵێ ئەمڕۆ عەسر لە شوێنێک کۆ ببنەوە. دەمەوێ قسەیان لەگەڵ بکەم.

دەیویست کارەکانی کۆزمینسکۆیە دووپات بکاتەوە و هەر ئەمڕۆ سەر و بەری وێک بێنێ.

# چوار

لە ژوورەکەی کوێخا هاتە دەرێ و ڕۆیشت بۆ نێو دێ. جادەی گوندەکە پێچەڵاوپووچ بوو بە نێو لەوەڕەگەکاندا تێدەپەڕی. هەر ئەو کچەی گوارەی پەڕی لە گوێدا بوو، بەرەوڕووی دەهات. بەرهەڵبێنەیەکی ڕەنگینی بەستبوو. قاچە گورج و بەهێزەکانی پەتی بوون. کەڵەشێرێکی توند لە باوەشی گرتبوو. پۆپەی کەڵەشێرەکە دەلەرزییەوە و خۆی لە باوەشیدا مات کردبوو. چاوە خڕەکانی دەگێڕا و قاچە ڕەشەکانی لە یەک دەدا. کچە پێخاوسەکە هەتا لە کۆنت نزیکتر دەبۆوە، هەنگاوەکانی خاوتر دەکردەوە. گەیشتە پەنای و ڕاوەستا کڕنۆشێکی بۆ برد و هەتا کۆنت بە تەنیشتیدا تێپەڕی و دوورکەوتەوە هەروا سەری داخست و جووڵەی نەکرد.

لە نزیک چاڵاوێک پیرێژنێک دوو سەتڵی گەورەی پڕ لە ئاوی بە هەر دوو سەری داریکەوە هەڵواسیبوو و لە سەرشانی دانابوو. و بە کۆمەکۆمە دەڕۆیشت. کە چاوی بە کۆنت کەوت، سەتڵەکانی دانا و بۆ ڕێزدانان سەری داخست. لەو لای چاڵاوەکەوە ماڵی ڕەعیەتەکان هەڵکەوتبوو. ڕۆژێکی گەرم و تاو و ساو بوو. بەڵام وردە وردە هەورەکان دەچوونە پاڵ یەک و با ڕایدەدان تاکوو بەری خۆر بگرن. بۆگەنی تۆند و ناخۆشی گووڤەک و زبڵوزاڵ لە کۆڵانەکەوە دەهات. عارەبانە دەهاتن پەینوپاڵیان باردەکرد و بە

هەورازەکەدا سەر دەکەوتن و دەڕۆیشتن بۆ لای مەزراکان. لە بەر دەرگای هێندێک لە ماڵەکان پەین و شیاکە هەڵدرابۆوە. ڕەعیەتەکان بە پێخاوسی و بە کراس و پانتۆڵی پیس و ڕیخاوییەوە، لە پشت عارەبانەکانەوە بە چاوی حەسرەتەوە لەو پیاوە تەڕپۆش ماقووڵەیان دەڕوانی کە قردێلەی هەورێشمینی کڵاوەکەی لە ژێر تیشکی خۆرەتاودا بریقەی دەهات و لە هەموو هەنگاوێکدا نووکی گۆچانە عەبەنووسە سەر زێوینەکەی لەزەوی دەکوتا.

ئەو گوندنشینانەی لە نێو تەرکی عارەبانە خاڵییەکاندا دانیشتبوون و لە مەزرا دەگەڕانەوە، کاتێک بە تەنیشت کۆنت نۆخلیدۆڤدا تێدەپەڕین، کڵاوەکانیان لە سەریان دادەگرت و بە ڕێز و سەرسووڕمانەوە چاویان لێدەکرد. ژنان لە نێو دەرگانەی ماڵەکانیاندا ڕاوەستا بوون و چاویان لەو بوونەوەرە سەیروسەمەرەیە دەکرد.

نۆخلیدۆڤ لە بەر دەرگای چوارەم تووشی عارەبانەیەک بوو کە پڕ بوو لە پەین و بە تەقوکوت دەڕۆیشت. حەسیرێکیان لە سەر پەینەکە ڕاخستبوو و کوڕێکی پێنج ـ شەش ساڵان شاد و دڵخۆش بە دوای عارەبانەکەدا غاری دەدا و پێی وابوو خۆشترین ڕابواردنی دنیا هەر ئەوەیە! گوندنشینێکی لاو هەوساری ئەسپێکی گرتبوو و خەریک بوو لە ماڵێ دەیهێنایە دەرێ. جوانوویەک بە دوایدا دەرپەڕیـیە دەرێ و پێش ئەو ماینە کەوت کە لە عارەبانەکەیان کردبوو، ئەو ماینەش کە وێدەچوو دایکی ئەو جوانووە بێ، لە پەستا دەیحیلاند.

عارەبانەیەکی دیکەش پیرەپیاوێکی پێخاوس لێیدەخوڕی و پانتۆڵێکی ڕێ ڕێ و کراسێکی ئاتەگ درێژی چڵکنی لە بەر دابوو، بڕبڕەی پشتی لە ژێر

کراسەکەوە دیاربوو. پیرەپیاو لە عارەبانەکە دابەزی، هات بۆلای کۆنت نۆخلیدۆڤ و کڕنۆشێکی بۆ برد.

ـ جەنابت دەبێ برازای خاتوونەکانی خاوەنی ئەم گوندبی. خودا لێیان خۆشبێت؟

ـ بەڵێ وایە.

ـ زۆر بە خێر هاتی گەورەم! بیستوومە هاتووی قسەمان لەگەڵ بکەی.

پیرەپیاو زۆری دڵ بە قسەوە بوو. نۆخلیدۆڤیش حەزی دەکرد قسەی بۆ بکات.

ـ بەڵێ هاتووم قسەتان لەگەڵ بکەم. سەرەتا پێم بڵێ بزانم لە بارودۆخی ژیان و بەڕێچوونت ڕازیی؟

ـ باسی ژیانی ئێمە هەر مەکە؛ وەزاڵە هاتووین. مەرگ باشترە لەو ژیانەی ئێمە. داماو و لێقەوماوین.

ـ بۆ داماو و لێقەوماون؟

ـ خۆ ئەوە ژیان نییە کولەمەرگییە. ساڵ لەگەڵ ساڵ ژیانمان تاڵتر و نالەبارتر دەبێ.

چوونە پێشترەوە لە بن دیوارێک ڕاوەستان. پیرەپیاو پرێسکەی دڵی کردەوە. دوو ژنی لەچکە بە سەری پیشان دا بە بێڵ پەینیان دەکردە نێو عارەبانەکەوە.

ـ ئەوانەت دیوە؟ ئێمە دوازدە سەر خێزانین. هەموو مانگێک نەود و شەش کیلۆمان ئارد دەوێ. لە کوێی بێنین؟

ـ مەگین تۆ کشتوکاڵ ناکەی؟ مەگین داهاتت نییە؟

ـ کام داهات گەورەم؟ داهاتی زەویوزاری ئێمە، یانی ئەو بەشەی بە ئێمە دەبڕێ، بەشی سێ کەسیش ناکا. ئەمساڵ ئەو چەند خەڵوارەی بەشی من بوو، هەتا شەوی جێژنی نۆئیل هەموومان خوارد و دەنکمان لێبڕی.

ـ کەوایە چۆن بەڕێ دەچن؟

ـ هەر چۆنێک بێ قوڕێک بە سەری خۆماندا دەکەین.

یەکێک لە کوڕەکانم نارد بو کرێکاری. بڕێکیشم گەنم لە ئەمبارەکەی ئێوە قەرز کرد، ئەویش هەتا جێژنی پاک تەواو بوو. هێشتا قەرزەکەشمان بۆ نەدراوەتەوە هیچ، قیستی مانگانەشمان نەداوە.

ـ قیستەکەتان چەندەیە؟

ـ هەر قیستی حەڤدە ڕۆبڵ. خۆزگە خودا گیانی بکێشایەن و لەو ژیانە تاڵە ڕزگارمان بووایە.

نۆخلیدۆڤ داوای لێکرد ماڵ و ژیانەکەی پیشان بدات. پیرە پیاو پێشی کەوت. بە سەر کۆگا پەینەکەدا تێپەڕی و دەرگایەکی کردەوە.

ـ فەرموون گەورەم.

ژنانی لەچکە بەسەر لە نێودەرگانەکەدا ڕاوەستا بوون، خۆیان کۆکردەوە بە سەرسووڕمان و چاوێکی وردبینانەوە لە بەژن و بالا و جلوبەرگ و قۆپچەی زێڕینی سەر قۆڵی کۆنت ڕامان و دوو کچی چکۆڵە لە ماڵەکە دەرپەڕینە دەرێ و سلاویان کرد. نۆخلیدۆڤ چووە ژوورێ. ماڵێکی تەنگ و تاریک بوو. دووکەڵ و قورم دارودیواری ڕەش داگێڕابوو. پیرێژنێک لەبەر کوانوویەک ڕاوەستا بوو چێشتی لێدەنا. قۆڵی هەڵماڵیبوو و باسکە لاواز و تاوەسووتەکەی وەدەر خستبوو؛ پیرەپیاو چاوێکی لە پیرێژنەکە کرد و گوتی:

ـ ئەم پیاوە، ئاغای گوندەکەمانە. هاتووە چاوی بە ماڵ و ژیانەکەمان بکەوێ.

پیرێژن خێرا قۆڵی داوایەوە و گوتی:

ـ فەرموو وەرە ژووورێ.

ـ نا، تەنیا هاتووم لە نزیکەوە چاوم بە بارودۆخی ژیانتان بکەوێ.

ــ گەورەم! خــۆت ببیــنە. دارودیــواری مــاڵەکە خەریــکە بەســـەرماندا دەڕووخــێ. ئەمــڕۆ یــان ســبەینێ دەڕووخــێ و چەنــد کەســمان دەکــووژێ. هەرچی بەو پیرە پیاوەمان دەڵێم مشووریکی بخۆ، دەڵێ بۆم جێبەجێ نابێ و دەرەقەتی خەرجییەکەی نایەم. ئەوە ماڵەکەمانە... خواردنەکەشمان ئەوە ئێستا لە سەر کووانووەکەیە و خۆت دەتوانی ببینی.

ـ چێشتی چی لێدەنێی؟

ددانــی کەلـوپەل و زەرد و ڕەشــی پیرێـژن وەدیـار کەوتبـوو و دەیویسـت خۆی شیرین بکات.

ـ خۆشترین خواردنی ئێمە ئەوەیە. نـان و کەواس[٤٢] دەخۆین، یـان کەواس بە نانەوە دەخۆین!

ـ دەمەوێ خواردنی ئەمڕۆتان ببینم.

پیرەپیاو پێکەنی و گوتی:

ـ هۆی ژنەکە! ئەو چێشتخانەیە پیشانی حەزرەتی مەزن بدە با بزانێ چی دەخۆین.

ـ گەورەم! حەز دەکەی لەو چێشــتەی ئـێمەی ڕەعـیەت بچێـژی؟ عەجەب شــازادەیەکی! خـۆر لە کوێـوە هەڵاتـووە ئەمـڕۆ ئـاوا کەوتـوویە بیـری ئـیمە؟ خواردنی ئەمڕۆمان کواس و نـانی وشـکییە. تـۆزێکیش سـووپی کەلەرم. ژنـان دوینــێ چــوون لە ڕووبـارەکە چەنـد ماسـییەکی چکۆلەیـان گرتـووە. سـووبی ماسیمان لێناوە و سێ دەنکیشـمان پەتـاتە تێکـردووە. بە دەگـمەن هەڵـدەکەوێ چێشتیکی ئاوا باشمان هەبێ. ئەمە چێشتی دوازدە کەسە.

---

42 ـ Kwass ئـاوی هەویـری تـرش یـان شـیلەی چێـودان و جـۆ دەگـرن و لەگەڵ هێنـدێک شیلەی گیاوگژی تر تێکەڵی دەکەن.

ـ ئەم سووپە شتی دیکەشی تێدەکەن؟

ـ هێندێ جار کە نێوچاوانەکەمان بیهێنێ، چۆڕی شیریشی تێدەکەین بۆ ئەوەی سپی بێ.

چەند کەس لە بەر دەرکاکە کۆبووبوونەوە. پیرێژن چووە پێشێ و گوڕاندی بە سەریاندا و دووری خستنەوە. بۆ ئەو شانازییەکی زۆر گەورە بوو کە ئەو ڕۆژە توانیبووی لەگەڵ کۆنت نۆخلیدۆڤ قسە بکات.

ـ گەورەم! ئێمە زۆر لە بارودۆخێکی خراپ داین، زۆر خراپ.

نۆخلیدۆڤ لەگەڵ ئەوەی خەم دایگرتبوو، هەستی بە شەرمەزاریش دەکرد. خودا حافیزیی کرد و ڕۆیشت.

ـ گەورەم! زۆر سپاس کە سەردانی ئێمەی فەقیر و هەژارت کرد. خودا دەست بە عومرت بگرێ.

لە نێو دەرگانەکەدا هێشتا چەند کەس ڕاوەستا بوون. کشانە دواوە و کۆنت هاتە دەرێ. دیسان بە هەورازی کۆڵانەکەدا وەسەر کەوت. دوو کوڕی مێرمنداڵ وەدووی کەوتن. ئەوەی گەورەتر بوو، کراسێکی چڵکەسووی لە بەر دابوو کە وێدەچوو سپی بووبێ! ئەوی چکۆڵەکەشیان کراسێکی پەمەییی چڵکنتری لە بەر دابوو. نۆخلیدۆڤ بانگی کردن:

ــ کوڕە باشەکان! ماڵی ماترنا خارینا لە کوێووەیە؟ منداڵە کراس پەمەیییەکەیان کە ناوی فێدکا بوو پێکەنی. کراس سپییەکەیان گوتی:

ـ کام ماترنا؟ ڕەنگە مەبەستت ئەو پیرێژنە...

ـ بەڵێ، بەڵێ، ئەو پیرێژنە دەڵێم.

ـ لەوسەری کۆڵانەکەیە. ئێمە لەگەڵت دێین و پیشانت دەدەین.

کوڕەکان لەگەڵ نۆخلیدۆڤ وەڕێکەوتن بەرەو لای ماڵی ماترنا خارینا.

# پێنج

نۆخلیدۆڤ لەگەڵ منداڵەکان ئاسوودەتر دەدوا و وەک قسە کردن لەگەڵ گەورەکان هەستی بە شەرمەزاری نەدەکرد. هەر پرسیارێکیشی دەکرد منداڵاکان وەڵامیان دەدایەوە. فێدکا لەگەڵ ئەوەی چکۆڵەتر بوو جوانتر و ژیرانەتر قسەی دەکرد. کۆنت لێی پرسین لەو گوندەدا کێ لە هەمووان هەژارترە؟ ئەو دوو منداڵە هەر یەکی شتێکیان گوت.

ـ میخائیل لە هەمووان هەژارترە. سیمۆن باکارۆڤیش زۆر داماوە. مارڤاش ئیتر هەر باسی مەکە، زۆر فەقیرە.

ـ ئەی ئانیسیا؟ لە هەمووان فەقیرترە. مانگایەکیشی نییە. سواڵ دەکا.

ـ مانگاشی نەبێ گرنیگ نییە؛ ئەو سێ کەس بەخێو دەکا، بەڵام مارڤا پێنج کەس...

ـ بەڵام ئانیسیا بێوەژنە.

ـ مارڤاش وەک ئەو وایە؛ مێردەکەی نەمردووە، بەڵام وەک مردوو وایە.

نۆخلیدۆڤ دەیویست بزانێ مێردەکەی مارڤا لە کوێیە؟ پرسیاری لە کوڕەکان کرد. فێدکا وەڵامی دایەوە:

ـ مێردەکەی لە بەندیخانە ئەسپێ دەکووژێ.

ئەوی دیکەیان گوتی:

ـ هـاوینی ڕابـردوو دوو داری لە دارسـتانەکەی ئاغـا بـڕی؛ لە سـەر ئەوە زیندانییان کردووە. ئێستا شـەش مـانگە لە بەندیخانەیە. ژنەکەی سـواڵ دەکـا. سێ منداڵ و دایکێکی پیری هەیە. نۆخلیدۆڤ گوتی:

ـ ماڵی ئەو ژنە لە کوێوەیە؟

کوڕەکان پیشانیان دا، هەر لەو کاتەدا منداڵێکی قژکاڵ لەو ماڵە هاتە دەرێ و ژنێـک بە جلـوبەرگی چڵکـنەوە بە دوایـدا دەرپەڕی، پشـتەملی گـرت و ڕایکێشـایەوە بـۆ ژووری. هەر ئەو ژنە بـوو کە مێـردەکەی دوو داری لە مێشـەکەی ئاغـا بڕیبـوو. نۆخلیـدۆڤ دیسـان دەیویسـت پرسـیار لە منـداڵەکان بکات و قسەیان لێدەرکێشێ.

ـ کوڕەکان! پێتان نەگوتم ماترنا ژیانی چۆنە؟ هەژارە یان نا؟

فێدکا منداڵە کراس پەمەییەکە بە شێوەیەکی فەیلەسووفانە گوتی:

ـ بۆ هەژار دەبێ؟ ئارەق دەفرۆشێ. ژیانی باشە.

گەیشـتنە بەر دەرگـای مـاڵی ماترنـا. خـودا حـافیزیی لە منـداڵەکان کـرد. دەرگای ماڵەکە کرابۆوە. ژوورەکە نزیکەی چوار مەتر و نیو بوو. نۆخلیدۆڤ لە خۆی دەپرسی ئەوانە چۆن لێرەدا دەژین؟ لە کوێ دەخەون؟ لە کوێ نـان دەخـۆن؟ کەلـوپەلی ئـارەق سـازی لە سـووچێک دانـدرابوون و پیرێـژن بە یارمەتیی یەکێک لە نەوەکانی سـەرقاڵی ئامـادە کردنـی شـتومەکی ئارەقسـازی بـوو. دوو نەوەی دیـکەی لە پشـت سـەری کۆنـت ڕاوەسـتا بـوون و چاویـان لێدەکرد. ماترنا هەر کە چاوی بەو پیاوە غەوارەیە کەوت، گوڕاندی:

ـ تۆ کێی؟ چیت دەوێ؟

ـ من ئاغای گوندەکەم. هاتووم چەند پرسیارتان لێبکەم.

پیرێژن تۆزی مات بوو و لە ناکاو ڕەفتاری گۆڕا.

ـ ببووره گەورەم! ببووره تاجی سەرم! وامزانی کەسێکی خۆتێهەڵقوتێن هاتووه سەر لە کارەکانم دەرهێنێ. بڕوانە منی پیر و کڵۆڵ چۆن خەرەفاوم؛ حەزرەتی مەزنم نەناسییەوه.

ـ دەمویست چەند پرسیارت لێ بکەم. بەڵام بە تەنیا.

ژنێکی لاواز منداڵێکی لە پەڕۆیەک پێچابوو بە باوەشیەوه گرتبووی و لەبەر دەرگا ڕاوەستا بوو. ماترنا گوڕاندی بە سەریدا و لەوێ دووری خستەوه. نەوەکانیشی کردە دەرێ و دەرگاکەی پێوەدا. بە جامەلووسکێوه قسەی دەکرد. جۆرێک دەدوا دەتگوت دەیهەوێ شێعرێک بە ئاواز بخوێنێتەوه.

ـ چاو لە منی خەرەفاو بکە، ئاغای خۆشەویست، من ئاغای بەرز و بەڕێزی خۆمانم نەناسییەوه؛ نەمزانی شنەی شەماڵ بۆنی خۆشی گوڵی هێناوه! گەورەم، ئاغای بەرز و بەڕێزم، سەروەرم، تاجی سەری هەمووان، ڕووی لە ماڵی منی چارەڕەش کردووه. حەزرەتی مەزن! گەوهەری بێ وێنە! فەرموو لە سەر ئەو سندووقە دانیشە!

کۆنت لە سەر سندووقەکە دانیشت و پیرێژنەکەش دەستی نایە ژێر چەناگەی و هەنیشکی دایە سەر لێواری هەرزاڵەکە و دانیشت.

ـ حەزرەتی مەزن! بۆ ئاوا تێکچووی و ڕەنگی پیریت لێ نیشتووه؟ لە بیرمە چەندە جوان بووی و دڵی کچانت دەڕفاند. خەم و ئازاری ژیان دەرەقەتی جەنابیشت هات؟ داخی بە جەرگم بۆ ئەو هەموو جوانییە.

ـ لەوە گەڕێ هاتووم پرسیارێکت لێبکەم. کاتیۆشا ماسلۆڤات لە بیره؟

ـ مەبەستت کاترینە؟ چۆن لە بیرم نییە. حۆشەویستم بوو، خوشکەزام بوو، تووشی چارەنووسێکی ڕەش هات! چەندەی بۆ گریام و فرمێسکم هەڵوەراند، ئاگام لە کەینوبەینی ئێوە بوو، تاوانی تۆ نەبوو، تاوانی گڕ و کڵپەی تافی لاوی بوو.

پـێکەوە دانیشـتن، چاییتـان خـواردەوە، قاوەتـان نۆشـی، قسـە و گـاڵتە و گەپ و پێکەنـین، گەنـج بـوون، شـەیتان زەفەری پێبـردن. ڕەنـگە ڤۆدکاشـتان خـواردبێتەوە. شـەیتان ئەوەی پێکـردن، ڤۆدکـا تووشـی ئەو هەڵەیەی کـردن؛ لە ڕاسـتیدا تـاوانیش نییە! تۆش گەورەیی خۆت نواند و سـەد ڕۆبڵت پێدا. خۆ نرخی ئەو کـارە لەوە زیـاتر نەبـوو. ئەو چەتیـوە شـێت و گەمـژەیە ئەقڵـی نەبـوو. خوشـکەزام بـوو، بەڵام دەبـێ ڕاسـتییەکەیت پـێ بڵـێم، زۆر بەدڕەوشـت بـوو. زۆر جێگـای بـاش و ئابڕوومەنـدانەم بـۆ دیـتەوە بچـێ کـار بکـات؛ بەڵام لەگەڵ هـیچ کەس نەدەسـازا. جنێوی بە ئاغاکەی دەدا. مەگین دەبێ پیاو جنێو بە ئاغـای خـۆی بدات؟ هـیچ کەس مـافی ئەوەی نییە جنێو بە ئاغـای خاوەنکاری خـۆی بدات! هەر بۆیە دەریـان کـرد. مـاوەیەک لە مـاڵی مێشـەوانێک بـوو. کـارێکی کـرد دەری بکەن؛ دیسـان جنێـوی بە خاوەنکارەکەی دابوو.

ـ باسی منداڵەکەیم بۆ بکە. خۆ تۆ لەوە ئاگادار بووی؟

ـ لە هەموو شتێک ئاگادار بووم. منـداڵەکەی هەر ئەو کـاتەی لە دایـک بـوو، نەخۆش بوو. دیار بوو نامێنێ. خۆم سەرانشـۆم کـرد. ناردمـان بـۆ لای ژنێـک ئاگاداری لێ بکات و پاشان بینێرێ بۆ دایەنگە.

ـ ناسنامەتان بـۆ وەرگـرت؟ شـتێکتان لە لا هەیە بتـوانین سـۆراخی بگـرین؟ بلێی مابێ؟

گەورەم! خۆت ماندوو مەکە. منداڵەکە هەر ئەو کاتە مرد.

ـ چۆن مرد؟

ـ ژنێـک بـوو بە نـاوی ملانـی. ئەویش زۆر لە مێژە مـردووە. ژنێکـی بـاش بـوو، زۆر گورجوگـۆڵ و ئـازا بـوو. کـاری ئەوە بـوو ئاگـاداریی لە منـداڵانی چکۆڵە دەکرد و لە مـاڵی خـۆی بەخێـوی دەکـردن. کە دەبـوونە چـوار ـ پێـنج منـداڵ، هەموویـانی دەبـرد دەیـدان بە دایەنـگە. لە مـاڵێ بێشـکەیەکی گەورەی

هەبوو بە قەد تەختێکی دووکەسی دەبوو. چوار - پێنج منداڵی پێکەوە لەو بێشکەیەدا دەخەواند. کاتێک دەگریان مەمکەمژەیەکی گەورەی دەنایە دەمیان...

ـ کەوایە منداڵەکە ماوەیەک لای ئەو ژنە بوو؟

ـ ئەو ژنە منداڵەکەی ناردبوو بۆ دایەنگە، بەڵام لە ڕێگا مردبوو.

ـ شکڵ و شێوەی منداڵەکە چۆن بوو؟

ـ زۆر جوان بوو، لەگەڵ تۆ دەتگوت سێوێکن کراون بە دوو لەتەوە.

ـ ئەی بۆچی ئەوەندە کز و نەخۆش بوو؛ حەتمەن شیر و خۆراکی پێنەدراوە.

ـ ئەو ژنەی منداڵەکەی لەلا بوو، ژنێکی باش بوو. بەڵام هیچ کەس جێی دایک ناگرێتەوە. ئەو ژنە هەموو کارەکانی یاسایی بوون. بەڵگەنامەی مەرگی منداڵەکەشی وەرگرتبوو. ژنێکی وریا و زیرەک بوو. هیچ کارێکی سەربەخۆ و بەبێ بیرکردنەوەی نەدەکرد.

## شەش

سەری دانەواند بۆ ئەوەی لە سەردەرانەی دەرگاکە نەدرێ و لە ماڵۆچکەکەی ماترنا هاتە دەرێ. دوو کوڕێژگە کراس پەمەیی و کراس سپییە کە چاوەڕوانی بوون و وردە وردە خەڵک کۆ بوونەوە. زیاتریان ژنانی منداڵەبەر بوون و یەکی منداڵێکیان بە باوەشەوە بوو. ئەو ژنەش کە منداڵە نەخۆشەکەی لە پەڕۆیەک پێچابوو لە نێویاندا بوو. زۆر شڵەژاو و پەشۆکاو دیار بوو، قامکی دەلەرزین و بێ ئۆقرەیی بە سەرتاپایەوە دیار بوو. بزەیەکی تاڵی لە سەر لێو بوو و دەتگوت ئاور بە جەرگی نۆخلیدۆڤەوە دەنێ. لە

منداڵەکانی پرسی ئەو ژنە کێیە؟ گوتیان ئەوە هەر ئەو ئانیسیایەکە باسمان کرد. نۆخلیدۆڤ چووە پێشترەوە و لێی پرسی چۆن بژیوی ژیانی دابین دەکا؟ ئانیسیا دەستی کرد بە گریان. منداڵە نەخۆشەکەی بە باوەشییەوە پێدەکەنی و لاقە کز و باریکەکانی وەک کرم دەجووڵانەوە.

نۆخلیدۆڤ جزدانەکەی دەرهێنا و دە ڕۆبڵی پێدا. هێشتا دوو هەنگاو دوور نەکەوتبۆوە ژنێکی منداڵ بەری تر بەدوایدا هەڵات. بە دوای ئەویشدا چەند ژنی دیکە. هەموو دەپاڕانەوە و داوای پارەیان لێدە کرد. نۆخلیدۆڤ شەست ڕۆبڵی پێبوو. یەکی دەڕۆبڵی پێدان و بە باریکەڕێیەکەدا گەڕایەوە.

کوێخا هات بەرەوپیری. هەروا کە بزەی لە سەر لێو بوو، پێی ڕاگەیاند کە عەسر ڕەعیەتەکان کۆدەبنەوە و گوێ بۆ قسەی ئاغا دەگرن. سپاسی لە کوێخا کرد و چوو بۆ نێو باخەکە تاکوو لە تەنیاییدا تۆزێ بیر بکاتەوە و بە خۆدا بێتەوە. دارەسێو گوڵی دابوو. گیای خۆڕسک زەویی داگرتبوو، بەڵام ئەو وەها لە گۆمی بیر و خەیاڵدا نوقم بووبوو ئەو شتانەی نەدەدی.

باخەکە بێدەنگ بوو، بەڵام لە ناکاو قیژە و هاواری دوو ژن هەودای خەیاڵی پساند. لە دوورەوە گوێی لێبوو دوو ژن دەیانقیژاند و دەپاڕانەوە و کوێخاش زۆر لەسەرەخۆ قسەی لەگەڵ دەکرد. یەکێک لەو ژنانە دەیگوت:

- وەها ئیمان هەردەبووم دەمهەوێ خاچەکە لە ملم داماڵم.

ژنەکەی دیکەش هاواری دەکرد و پشتیوانیی لێدەکرد.

- ئەم ژنە قوڕبەسەرە چ تاوانێکی کردووە، چووە شیر بە منداڵەکەی بدات، مانگاکەیان پەتی پچڕاندووە و چۆتە نێو وێنجەی ئاغاوە.

کوێخا گوێی بەو قسانە نەدەدا و دەیگوت:

- تەنیا دوو ڕێگاتان لە بەرە؛ یان دەبێ زیانەکە ببژێرن یان لە بری ئەوە بیگاری بکەن. جا خۆتان سەرپشک بن.

نۆخلیـدۆڤ لە بـاخەکە هـاتە دەرێ. کوێخـای دی لە سـەر قاڵـدرمەکان ڕاوەستاوە و دەستی ناوەتە گیرفانی. دوو ژنی گوندنشینی لەچکە بە سەریش لە خوار قاڵدرمەکانەوە ڕاوەستا بوون. یەکیان زگی پڕ بوو؛ ژنەکان خێرا لەچکەکانیان ڕاستەوپاستە کرد و کوێخاش دەستی لە گیرفانی دەرهێنا و بزە هەمیشـەییەکەی نیشـتەوە سـەر لێـوی و هەر بەو بـزەیەوە بـۆ ئاغـای ڕوونکـردەوە کە مانگـاو گـوێلکی ئەم دوو ژنە چـۆتە نێـو وێنجەکـانەوە و زیانییان کردووە، دەشتەوانیش مانگاو گوێلکەکەی گرتووە و بەستوونیەتەوە. ئێستا یان دەبێ بۆ هەرکامیان سی کۆپک خەسارەت بدەن یان دوو ڕۆژ بچنە بێگاری. ژنەکان نەدەچوونە ژێر باری قسەکانی و دەیانگوت مانگاکە خۆی پەتی پچڕاندووە و زیانیی کردووە، پارەشیان نییە زیانەکە ببژێرن. بەڵام ئامادەن بۆ بێگارییەکە بەو شەرتەی مانگاو کوێلکەکەیان بدەنەوە؛ بەڵام مانگاو گوێلکەکەیان گرتبوو و لەبەر ئەو سوورەتاوە بەستبوویاننەوە و ئاو و لەوەڕیشیان پێ نەدەدان، ژنەکان لەوە دەترسان مانگاکە شیرەکەی وشک بکات یان گوێلکەکە لە توونیاندا مردار بێتەوە. کوێخا لە لای ئاغا شکایەتی لە ژنەکان دەکرد و خەتاباری دەکردن.

ـ سەد جارم پێگوتوون ئاگایان لە پاتاڵەکانیان بێ و نەهێڵن زیانی بکەن؛ بەڵام خۆ قسەیان بە گوێدا ناچێ.

ـ ئاغا! من تاوانێکم نییە. خەریک بووم شیرم دەدا بە منداڵەکەم، مانگاکە پەتەکەی پچڕاندبوو و چوو بووە نێو وێنجەکەوە.

کوێخا ئەو قسانەی بە گوێدا نەدەچوو.

ـ تۆ دەبوو چاوێکت بکەیتە چوار چاو و ئاگات لێیان بێ.

ـ خۆ تۆ مەمکت نییە شیر بدەی بە منداڵەکەم؛ ئەی ئەو بەستەزمانە لە برسانا بمرێ؟ خۆ هێشتا ئەو مانگا بەستەزمانەش نەگەیشتبووە نێو وێنجەکە گرتیان و بەستیانەوە.

ـــ بـــۆ درۆ دەکەی؟ ئەگەر دەشـــتەوانەکە فریـــا نەکەوتـــایە، تەواوی وێنجەکەیان پێشێل دەکرد و دیانخوارد.

ـ هەراو هاوار سازمەکە. ئەوە یەکم جارە مانگاکانی من گیراون.

ـ هیچ جیاوازییەکی نییە جاری چەنددەمە؛ یان غەڕامە دەدەی یان دەچی بۆ بێگاری.

ژنە وەک شێت و هاری لێ هاتبوو و هاواری دەکرد:

ـ بێگـاری دەکەم، سـەپانی دەکەم، بەڵام هەر ئێسـتا دەبێ مانگاکـانم ئـازاد بـکەی. مـن دڵـم ناحەسـێتەوە مانگاکـانم برسـی و تـوونی لەبەر ئەو قـرچەی خۆرەتـاوە ببەسـترێنەوە. بـابە تـۆ بـۆ ئەوەنـدە دڵڕەقـی؟ خەسـووم نەخۆشـە. مێردەکەم هەمیشە سەرخۆشە کار ناکات. من بە تاقی تەنیا دەبێ شـان بدەمە بەر تەواوی کار و کوێرەوەرییەکان. ئاخر منیش بنیادەمم، خۆ هەزار دەست و چاوم نییە.

نۆخلیدۆڤ داوای لە کوێخا کرد مانگاکانی پێ بداتەوە و دیسـان گەڕایەوە بۆ نێو بـاخەکە و خەیـاڵ هەڵیگـرت. هەمـوو شـتێکی بـۆ ڕوون بووبـۆوە. پێی سەیر بوو بۆ چی خەڵک ئەو ڕاستییانە نـابینن و بـۆچی خۆشـی ئـاوا درەنـگ لەوە تێگەیشتوووە؟

«خەڵکـی خەریـکە توێخیـان دەچـێ و وەزاڵە هـاتوون. خوویـان بەم کـارە قـورس و تاقەتپڕووکێنـانە و ئەم ژیـانە تـاڵ و دژوارە گرتـووە. بە دەسـتی خۆیان گوڕ بۆ خۆیان هەڵدەکەنن. منداڵەکان لاواز و نەخۆشـن. ژنـان لە ژێر گوشـاری کـاری قـورس و جەسـتەپڕووکێندا خەریـکە پشـتیان دەشـکی. بـێ

بژیوی و کەمایەسیی خواردن هەڕەشە لە گیانی منداڵان و بە ساڵاچووان دەکا. ئیتر گەیشتۆتە بینەقاقایان و ئازاری ژیان بە دەردێکی بردوون باکیان لە مەرگ نییە و تەنانەت سکاڵاش ناکەن؛ ئێمەش کە هۆکاری ئەو هەموو ناعەداڵەتی و غەدر و ستەمەین،کەمتەرخەم و لووتبەرز ڕاوەستاوین و مێشێکیشمان میوان نییە و پێمان وایە ئەوە یاسای ژیانە و هەر دەبێ وابێ!»

وەک ڕۆژ لێی ڕوون بوو هۆکاری سەرەکیی ئەو هەموو داماوی و چارەڕەشییەی خەڵک، سیستەمێکە کە پێی وایە مافی خاوەنداریێتی زەوی و ئاغایەتی یاسایەکی عادڵانەیە؛ بەڵام دەبێ ئەوە بزانین زەوی تەنیا هی کەسێک نییە و زەوی هی هەموومانە و دەبێ هەموو خەڵکی بژیوی خۆیانی لێ بە دەست بێنن. نەک کەسانێک ئارەقە بڕێژن و بچەوسێنەوە و چەند کەسیش دەست لە ڕەش و سپی نەدەن و خۆ بە خودای خەڵکی بزانن.

ئیتر گومانی نەبوو کە گرینگترین کێشە و گرفت خاوەنداریێتی زەویوزارە. منداڵان و بەساڵاچووان دەبێ بە قورگی مەرگدا ڕۆبچن، چونکە شیر و نانیان پێ ڕاناگا. لەوەڕگا نییە بۆ پاتاڵەکانیان و هەمووی هی ئاغایە، بۆ بەرهەم هێنانی گەنم و جۆ زەوی کەمە. شکی تێدا نییە هۆکاری ئەو چارەڕشییە پێوەندیی بە خاوەنداریێتی زەوییەوە هەیە. زەوییەک کە سەرچاوەی بژیوی هەمووانە، تاقمکی دەستیان بەسەردا گرتووە و خەڵکی دەچەوسێننەوە، خوێنی خەڵک دەمژن و گیرفانی خۆیان لە پارە داخنن. ئەو کەسانەی لە سەر زەوییەکانن بە ئامێر و کەرەسەی کۆن و سەرەتایی کاردەکەن. ئەوان خۆێن و ئارەقە تێکەڵ دەکەن و توێخیان دەچێ هەتا زەوییەکان دەکێڵن، بەڵام خان و ئاغای بەرهەمی ڕەنج و تێکۆشانی ئەوان ڕادەماڵن و دەیفرۆشن بە وڵاتانی بێگانە و بە پارەی بەلاش و دەسترەنجی هەژاران و جووتیاران کەوش و جلوبەرگ و کڵاو و ئاڵتوون دەکڕن.

«ئەم بارودۆخە زۆر ترسناکە و بەم شێوەیە پایەدار نابێ. دەبێ ڕێگایەک بدۆزرێتەوە و ئەم سیستەمە بگۆڕدرێ. یان لانیکەم ئەگەر توانایی گۆڕینیمان نییە، نابێ بە شتێکی باش و ڕەوای بزانین.»

لە ژێر دارەکان پیاسەی دەکرد و مێشکی لە ژێر گوشاردا خەریک بوو دەتەقی:

«بیرمەندەکان کتێب دەنووسن. کارمەندی فەرمانگەکان بەردەوام خەریکی باس و لێکۆڵینەوەن. ڕۆژنامەکان بابەت و وتاری چڕوپڕ بڵاو دەکەنەوە. هەمووان دەیانهەوێ ڕێگایەک بۆ چاکسازیی ئەو بارودۆخە بدۆزنەوە. هەموو شتێک دەڵێن و دەنووسن بەڵام هۆکاری سەرەکی لەبەر چاویانە و چاوپۆشیی لێدەکەن. نایانهەوێ قەبووڵی بکەن تەنیا ڕێگای ڕزگار بوون لەو هەموو ئازار و بەڵایە، هەڵوەشاندنەوەی خاوەنداریێتی تایبەتی زەویوزارە؛ یانی هەرکەس لە سەر زەویی خۆی کار بکات.» سالانی پێشوو بیروباوەڕی هانری جۆرجی لەو بارەوە خوێندبۆوە، بەڵام ئێستا هەمووی بە وردی وەبیر دەهاتەوە.

«زەوی نابێ ببێتە ملکی کەسێک و نابێ بکڕدرێ و بفرۆشرێ. زەویش وەک ئاو و هەوا و خۆرەتاو بۆ کڕین و فرۆشتن نابێ. هەموو خەڵک لە سەر زەوی مافی یەکسانیان هەیە و ئەوەی لە زەوی بە دەست دێ، دەبێ بە شێوەیەکی عادڵانە بەسەر خەڵکدا دابەش بکرێ.»

کۆنت تازە بۆی دەرکەوتبوو بۆچی لە کۆزمینسکۆیە، دوای جێبەجێ کردنی کاروبارەکان، لە دڵەوە هەستی بە ڕەزایەت نەکرد و تەنانەت خۆی بە شەرمەزاریش دەزانی. تازە تێگەیشتبوو لەوێ زەوییەکانی بە ئیجارە داوە بە ڕەعیەتەکان؛ چاوپۆشیی لە مافی خاوەنداریێتیی خۆی نەکرد بوو و بە پێی

ئەم مافە زەوییەکانی بە ئیجارە دابوو؛ لە حاڵێکدا ئەو بە پێی ئەو بیروباوەڕە مافی ئەوەی نەبوو بەو شێوەیە بیدات بە خەڵکی.

لە کاتی بیر کردنەوەکانیدا بەو ئاکامە گەیشت لێرە کارێکی جیاواز بکات؛ زەوییەکان بدات بە ڕەعیەتەکان،بەو شەرتەی داهاتی خۆیان بکەنە سندووقی زبارەی گوندەکەوە. لەو پارەیە باج وماڵیاتی دەوڵەت بدەن و خەرجی گشتی لە ڕێی ئەو سندووقەوە بدرێ. هەڵبەت ئەو پێدانە لایەتی گشتی هەیە و لەگەڵ single tax[٤٣]ـ جیاواز بوو، لە ڕوانگەی یاسا و ڕێسای ئێستاشەوە هیچ کێشەیەک بۆ گوندنشینەکان ساز ناکا.

بیر کردنەوەکانی بە ئاکامێکی باش گەیشتبوو. گەڕایەوە بۆ ماڵێ و کوێخاش بە بزە هەمیشەییەکەیەوە هات بەرەو پیری. فراوێنیان ئامادە کرد بوو؛ بەڵام دەترسا چێشتەکە باش نەبێ و هێندێک سووتابێ. ژن و کچەکەی چێشتەکەیان لێنابوو و کچەکەشی ئەوە بوو کە گوارەی پەڕی لە گوێدا بوو؛ کۆنت دیتبووی کەڵەشێرێکی بە باوەشەوەیە و دەیباتەوە بۆ ماڵێ.

لە سەر مێزەکە سفرەیەکی پۆپەشمینە ئاسا و تان و پۆ شاشیان ڕاخستبوو. بە جێی خاولی دەسڕەی گوڵداریان دانابوو. سووپی کەڵەشێریان لە قاپێکی چینیی قەدیمی کرد بوو کە دەسکێکی شکا بوو؛ کەڵەشێرەکەش هەر ئەوە بوو کە بەیانیی ئەو ڕۆژە بە باوەشی کچەکەوە دیتبووی. چەند کوتیان لە گۆشتەکەی کردبووە نێو سووپەکەوە و ئەوی دیکەشیان کرد بوو بە کەباب. خواردنەکە ئەگەرچی ئیشتیا بزوێن نەبوو، بەڵام نۆخلیدۆڤ زۆر بە ئیشتیاوە دەیخوارد و ئەوەی بیری لێ نەدەکردەوە باشی و خراپیی چێشتەکە بوو. لە کاتی خواردنیشدا بیری لە پلانەکەی خۆی دەکردەوە کە جێبەجێی دەکات و لەم چەند گوندە خاوەندارێتی تایبەتی کۆتاییی پێدێ.

43ـ بیکەنە ماڵیاتی تاکەکەسی.

کوێخا ڕازی و بەرزە دەماخ بوو کە ژنەکەی چێشتێکی ئاوا خۆشی بۆ ئاغا لێناوە؛ کچەکەشی ئاوا بە باشی مێزەکەی ڕازاندبۆوە و خواردنی بە ئاغا دەدا. ژنەکەشی لەبەر دەرگا نیوەکراوەکەدا ڕاوەستا بوو و چاوی لە ئاغا و کچەکەی خۆی دەکرد.

دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ، نۆخلیدۆڤ بە کوێخای گوت لەلای دانیشێ و بە وردی گوێ بۆ قسەکانی ڕادێرێ. بە پێویستی دەزانی ئەو پلانەی لە مێشکیدایە بۆ کەسێکی باس بکات. کوێخا بە وردی گوێی بۆ شل کرد و وای دەنواند کە زۆر لە مێژە ئەو بیروباوەڕەی هەبووە؛ بەڵام لە ڕاستیدا سەری لە قسەکانی دەرنەدەچوو. نۆخلیدۆڤ زۆر بە شێوەیەکی ئاسایی و بەبێ گرێوگۆڵ قسەی دکرد و هەموو کەس بە ئاسانی لێی تێدەگەیشت. دەیگوت ئامادەیە چاوپۆشی لە قازانج و بەرژەوەندیی خۆی بکات، بەو شەرتەی ئەو کارە قازانج و بەرژەوەندیی خەڵکی تێدابێ. بەڵام ئەو قسانە لە مێشکی کوێخادا نەدەگونجا. تا ئێستا پێی وابوو مرۆڤ بۆیە دێتە سەر دنیا تاکوو لە ماوەی تەمەنیدا بۆ قازانج و بەرژەوەندیی خۆی دەست بۆ هەموو کارێکی ڕەوا و ناڕەوا بەرێ و بۆ قازانجی خۆی ویست و مافی خەڵکی پێشێل بکات. نۆخلیدۆڤ زۆر بە وردی بیرۆکەکانی خۆی بۆ شیکردەوە و گەیشتە گرینگترین بەشی پلانەکەی خۆی:

- لە داهاتی ئەو زەوییانە دەبێ دەسمایەیەک پاشەکەوت بکرێ و هەموو خەڵکی گوندەکە کەڵکی لێوەرگرن.

- تێگەیشتم! مەبەستی بەڕێزتان ئەوەیە دەسمایەیەک پاشەکەوت بکرێ و جەنابتان سوودی لێوەرگرن.

- نا، من مەبەستم شتێکی دیکەیە. ئێوە لە سەر ئەو باوەڕە هەن کە زەوی ملکی هیچ کەس نییە؟

ـ بەڵێ، جا دیارە لە سەر ئەو باوەڕەم.

ـ کەوایە ئەگەر ملکی هیچ کەس نییە، خاوەندارێتییەکەشی دەبێ هەمووان بن و کەوایە هەرچی لەو زەوییە بەدەست دێ هی هەمووانە.

ـ ئەگەر ئەمەیان قەبووڵ بکەین، جەنابتان نە دەسمایەیەکتان دەبێ و نە داهاتێک.

ـ ڕاست دەمویست ئەوە بڵێم. دەمەوێ چاوپۆشی لە داهات و خاوەندارێتیی زەویوزارەکان بکەم.

کوێخا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دیسان بزە هەمیشەییەکەی نیشتە سەرلێوی. وردەوردە خەریک بوو تێدەگەیشت. بۆشی دەردەکەوت نۆخلیدۆڤ خەرەفاوە. بەو پێیە دەبێ ڕێگایەک بدۆزێتەوە و لەو ئاوە لێڵە ماسی بگرێ. تۆزێ خۆی خواردەوە. بیری کردەوە و بۆی دەرکەوت لەو گۆڕانەدا هیچی وەگیر ناکەوێ. دوای ئەوە تەنیا بۆ خۆشامایی کردن بزەیەکی سارد دەنیشتە سەر لێوی.

نۆخلیدۆڤ کاتێک بۆی دەرکەوت کوێخا لە قسەکانی تێناگا، ڕێگەی پێدا بڕوا بە دوای کاری خۆیدا و لە پشت مێزێک دانیشت کە قەڵەم و بۆیەی لە سەر بوو؛ دەستی کرد بە هێنانە سەر کاغەزی گەڵاڵە و پلانەکەی خۆی.

خۆر خەریک بوو لە پشت چرۆی تازە پشکووتووی زیزفۆنەوە ئاوا دەبوو. ژوورەکە پڕ بووبوو لە مێشوولە و چزەیان لە نۆخلیدۆڤ هەڵدەستاند. لە دەرەوە باڕەباڕی مەڕ دەهات. مێگەل و گاران بەرەو گوند دەگەڕانەوە. کوێخا دیسان هات بۆ لای و پێی گوت ئەگەر ڕازی بێ ڕەعیەتەکان دەهێنێ بۆلای؛ بەڵام نۆخلیدۆڤ دەیویست خۆی بچێ بۆ لای ئەوان و هەر لەوێ قسەیان لەگەڵ بکات.

بەپەلە پەرداخێکی چایی هەڵقووڕاند و لەگەڵ کوێخا بەرەو گوندەکە وەڕێکەوت.

# حەوت

ڕەعیەتەکان لە گۆڕەپانی ئاوایی کۆ بوونەوە و هەموو پێکەوە قسەیان دەکرد. کە نۆخلیدۆڤ نزیک بۆوە هەموو بێدەنگ بوون و وەک ڕەعیەتەکانی کۆزمینسکۆیە یەک لە دوای یەک کلاوەکانیان داگرت. ئەمان لە ڕەعیەتەکانی کۆزمینسکۆیە شڕۆڵ و دواکەوتووتر بوون. کچان و ژنان گوارەی قورس و ناحەزیان لە گوێدا بوو، پیاوەکانیش بە نەعلی دارینەوە هاتبوون. کەواکانیان دەستچن و شاش و دەستدروو بوون و زۆربەیان پینەیان لە هەنیشک دابوو. چەند کەسیان لە مەزراوە گەڕابوونەوە و بە پێی پەتی و بە توێی کراسێکەوە هاتبوون.

نۆخلیدۆڤ زاڵ بوو بە سەر هەستی خۆیدا و سادە و ئاسایی بۆ ڕەعیەتەکانی شیکردەوە کە دیهەوێ زەوییەکان بدات بە خۆیان. ڕەعیەتەکان بە سەر سووڕمانەوە گوێیان شل کردبوو و باوەڕیان نەدەکرد.

- من زەوییەکان دەدەم بە خۆتان. چونکە هەق و عەداڵەت وای لێکردووم بە خۆمی بسەلمێنم، زەوی هی کەسێکە کە ئیشی لە سەر دەکات.

ڕەعیەتەکان گوتیان بەڵێ وایە! زەوی هی هەمووانە؛ بێ ئەوەی بیر لە بیرۆکە و ویستی ڕۆحیی ئەو بکەنەوە. نۆخلیدۆڤ زیاتری بۆ ڕوون کردنەوە و وتی ئامادەیە چاوپۆشی لە مافی خاوەنداریێتیی خۆی بکات. ئەوانیش بە

ئیشتیای خۆیان نرخێک لە سەر زەوییەکە دانێن و دەسمایەیەک کە کۆ دەبێتەوە، هی هەموو خەڵکی گوندەکە دەبێ و لە بەرانبەردا ئەو هیچی ناوێ. ڕەعیەتەکان سەرەتا زۆریان پێخۆش بوو، دەنگە دەنگ و چپە و سرتە دەستی پێکرد و ڕەزایەت و پێزانینی خۆیان دەربڕی؛ بەڵام وردە وردە بێدەنگ بوون و مات و نیگەران سەریان بەردایەوە. وێدەچوو بیر لەوە بکەنەوە کە ئاغا فێڵ و دەهۆیەکی تازەی لە ژێر سەر دایە و دەیهەوێ قازانجی زیاتری پێبگات؛ بۆیە نەیاندەویست بە ڕوانینە تووڕە و پڕ لە دڕدۆنگەییەکانی خۆیان شەرمەزاری بکەن!

قسەکانی نۆخلیدۆڤ ڕوون و ئاشکرا بوون. ڕەعیەتەکانیش کەسانێکی وریا و بیرتیژ بوون؛ بەڵام بڕوایان بەو قسانە نەدەکرد و لێی تێنەدەگەیشتن. هەر بەو جۆرەی کوێخای دەم بە پێکەنین لە مەبەستەکە تێنەگەیشتبوو، ئەوانیش لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە هەرکەس دەبێ لە بیری قازانج و بەرژەوندیی خۆیدا بێ و جگە لەوە بیر لە هیچ شتێکی تر نەکاتەوە. ئەزموونی چەندین بەرە تێیگەیاند بوون مەبەستی ئاغاکان تەنیا قازانجی خۆیان و تاڵان کردن و هەڵتەکاندنی گیرفانی ڕەعیەتەکانە. بەو پێیە ئێستا کە ئاغا ئەوانی لە دەوری یەک کۆ کردبۆوە، پێیان وابوو مەبەستی ئاغا ئەوەیە کڵاوێکی گەورەتریان لە سەربنێ و بە فێڵ و تەڵەکەی لێزانانەی خۆی بەرهەمی کار و دەستڕەنجی ساڵانەیان حەپەنۆش بکات.

نۆخلیدۆڤ دوای وتەکانی داوای لە ڕەعیەتەکان کرد خۆیان نرخێک لە سەر زەوییەکان دانین.

ـ گەورەم! زەوی هی ئێوەیە؛ ئێمە چکارەین نرخ بۆ مڵکی ئاغا ببڕینەوە؟

ـ من لە سەر ئەو باوەڕەم ئێوە مافی خۆتانە ئەو کارە بکەن؛ چونکە لە مەبەدواوە هەموو شتێک هی خۆتانە. داهاتی زەوی و بەهرەی ئەو گوژمە

پاشـەکەوت کـراوەش هەر بۆ خۆتـان دەبێ و بۆ باشـتر بـوونی بـارودۆخ و کاروباری گوندەکەتان خەرجی دەکەن. ئەمە شتێکی تازەیە...

کوێخا قسەکەی لە دەمی ئاغا سەند و بابەتەکەی کراوە تر کرد:

ـ بڕوانن! ئاغا بیر لە قازانج و بەرژەوندیی ئێوە دەکاتەوە و زەوییەکانی بە ئێوە دەبەخشێ. لە بەرانبەریشدا هیچی لە ئێوە ناوێ. نرخی زەوییەکە لە ڕاسـتیدا دەسـمایە و پاشـەکەوتێکە بـۆ خۆتـان دەبـێ؛ یـانی بـۆ خەڵکـی ئەم ئاواییە و کاروباری گوندەکە دەتوانن کەڵکی لێ وەرگرن.

پیرەپیـاوێکی بـێ ددان دەنگـی هەڵبـڕی و دژایەتیـی خـۆی دەسـت پێکـرد؛ چەند کەسی دیکەش لەگەڵی هاودەنگ بوون:

ـ من واتێدەگەم ئێوە دەتانەوێ زەویی قیسـتیمان پێ بفرۆشـن و لە پەسـتا قیسـت و بەهرەمـان لـێ بسـتێنن. ئـێمە کـاری وا نـاکەین. ئـێمەی دامـاوی چـارەڕەش کەممـان دەرد و نەهـامەتی هەیە، دەتـانەوێ زیاترمـان بە قـوڕدا ببەنە خوارێ؟

ــ هەر بەم شـێوەیەی ئێسـتامان باشـترە، چـاک یـان خـراپ خوومـان پێگرتووە.

نۆخلیدۆڤ کە ئەوەی بیست پێشنیاری پێکردن گرێبەستێک لە سەر کاغەز بنووسـن و هەر دوو لایەنەکە واژۆی بـکەن. دژایەتـی زیـاتر بـوو و هەر کەسەی شتێکی دەگوت:

ـ ئێمە هیچ شتێک واژۆ ناکەین؛ هەر وەک پێشوو کاری خۆمان دەکەین و ئارەق دەڕێژین و ژیانی خۆمان بەڕێوە دەبەین.

ـ ئێمە سەرمان لەو شتانە دەرناچێ و لەو شتانە تێناگەین.

ـ ئەوە لەگەڵ بارودۆخ و خووخدەی ئێمە یەک ناگرێتەوە. خوومان بەم ژیانەی ئێستامان گرتووە. هەر ئەوەمان باشترە، تەنیا بنەتوومان بدەنێ؛ با ناچار نەبین خۆمان بنەتوو بکڕین، هیچی ترمان ناوێ.

تا ئەو کاتە ڕەعیەتەکان خۆیان بنەتوویان دابین دەکرد و داوا کارییان لە ئاغا تەنیا پێدانی بنەتوو بوو. کۆنت نۆخلیدۆڤ وردەوردە هیوا بڕاو بوو، ڕووی لە ڕەعیەتێکی لاوی پێخاوس و جلوبەرگ دڕاو کرد کە کڵاوێکی دڕاوی بە دەستەوە گرتبوو و گوتی:

ـ تۆ دەڵێی چی؟ حەزناکەن زەویتان هەبێ؟

لاوەکە تازە سەربازیی تەواو کردبوو، قاچی بە یەکەوە چەسپاند، قیت ڕاوەستا و گوتی:

ـ بەڵێ جەناب!

ـ ژیانتان باشە؟ ئەو زەوییەی کاری لە سەر دەکەن بژیوی ژیانتان دابین دەکا؟

ـ نا قوربان، نا جەناب!

ـ کەوایە دانیشن و بیربکەنەوە. کڵاوی خۆتان بکەنە قازی و بڕیار بدەن. ئەگەر بۆتان دەرکەوت ئەو کارە بە قازانجتانە، هەر دوو لا گرێبەستەکە واژۆ دەکەین.

پیرەپیاوی بێ ددان گوڕاندی:

ـ بیر کردنەوەی ناوێ؛ هەر ئەوەیە وا گوتمان.

ـ هەتا سبەینێ لێرە دەمێنمەوە. ئەگەر هەتا ئەو کاتە بڕیارەکەتان گۆڕی،ئاگادارم بکەنەوە.

ڕەعیەتەکان ئیتر هیچیان نەگوت. نەتدەتوانی لەو بێدەنگییەیان تێبگەی. نۆخلیدۆڤ گەڕایەوە بۆ ماڵی. کوێخای دەم بە پێکەنین شان بە شانی لەگەڵیدا هەنگاوی دەنا.

ـ گەورەم! خۆ دیتت؟ ئەوانە زۆر منجڕ و خیشەسەرن. بۆ ئەوە نابن قسەیان لەگەڵ بکەی. کاتێک بە جیا قسەیان لەگەڵ دەکەی هەموو شتێک تێدەگەن و قسەی وا دەکەن پێت وایە زۆر ئاقڵن، بەڵام کاتێک لە دەوری یەک کۆ دەبنەوە دەگۆڕدرێن. لاڕێ و خیشەسەرن. وەک گۆچان داهاتوون و ئیتر ڕاست نابنەوە. لە هەموو گۆڕانێک دەترسن. ئەو پیرەپیاوە بێ ددانە و ئەو پیاوە ڕەشتاڵەیان لێدەرچێ، ئەوانی دیکە قسەیان لەگەڵ دێ. دەبێ چەند کەس لە ئاقڵ و ڕیش سپییەکانیان بانگ بکەین بێن و گوێ بۆ وتەکانت ڕاگرن.

نۆخلیدۆڤ ڕووی لە کوێخا کرد و گوتی:

ـ چەند کەس لەو تێگەیشتووانە بانگ کە بابێن و من پلانەکەی خۆمیان بۆ باس بکەم.

کوێخای لێو بە بزە بەڵێنی دا کارەکە جێبەجی بکات.

ـ بۆ سبەینێ چەند کەس بانگهێشتن بکە.

ـ بەڵێ گەورەم، بە سەر چاو!

بەڵام ڕەعیەتەکان کاتێک ئاغا ڕۆیشت، درێژەیان بە قسە و باسەکانیان دا. گوندنشینە ڕەشتاڵەکە و پیرە پیاوی ددان کەوتوو سواری ئەسپەکانیان بوون و شان بە شانی یەک بەرەو ماڵێ وەرێ کەوتن. کابرای ڕەشتاڵە سواری ماینێکی تێروپڕی دابەستە بووبوو. بە پیرە پیاوی گوت:

ـ هاوڕێ! ئاگات لێبوو؟ ئاغا وادیارە فێڵێکی تازەی لە ژێر سەردایە.

ـ گوێت لێبوو چیی گوت؟ بە کەرمان دەزانێ؛ دەڵێ زەویتان پێدەدەم و پارەم ناوێ!

ئەم دوو گوندنشینە زۆربەی کات ئەسپەکانیان بەڕەڵڵا دەکردە نێو لەوەڕگە و دارستانی ئاغاوە بۆ ئەوەی تێر بلەوەڕێن، هەربۆیە دەتگوت دابەستەن، هێندە قەڵەو و بە دەماخ بوون.

ـ ئەو ئاغایانە بە گێل و حەپۆلمان دەزانن. دەیانهەوێ کێچمان بە گا پێ بفرۆشن. خۆ ئێمە لەو خول و گەلحۆیانە نیین وا بیری لێدەکەنەوە. ئەوان هەر چەندە فێڵەباز بن، داوی ئێمە بانادەن.

ـ گوندنشینی ڕەشتاڵە ئاوڕی دایەوە بزانێ جوانووەکەی بە دوایدا دێ یان نا، بەڵام نەیدی و بۆی دەرکەوت چووەتە نێو لەوەڕگەی ئاغاوە.

ـ ئەو تۆپیوە خۆی گەیاندۆتە لەوەرگەی ئاغا؛ چاوی لێکە لەو مێرگەدا کارگی چۆن هەڵتوقیوە؛ بچین منداڵەکان بنێرین ئەو کارگانە کۆ بکەنەوە.

ـ تۆ لە بیری کارگ دای، منیش بیر لەو کڵاوە دەکەمەوە کە ئاغا دەیهەوێ بینێتە سەرمان. دەڵێ گرێبەستەکە واژۆ کەن... هەروا دەکا واژۆی کەین و ئەوی هەیە و نییە هەڵمەقووتی کا!

ـ چاکت ناسیوە!

ئیتر هیچیان نەگوت و جگە لە خرمەخرمی سمی ئەسپەکان لە سەر ڕێگا خیزەڵانەکە هیچ دەنگێکی تر نەدەبیسترا.

# هەشت

نووسینگەی کارەکەی نۆخلیدۆڤیان کردبووە ژووری خەو. چرپایەکی پێچکە بەرز لە سووچی ژوورەکە بوو، بالیف و لێفەی پڕ لە تووکی قوو و ڕووتەختییەکی هەورێشمینی و شەڕابی ڕەنگ بە گوڵدۆزیی وردەوە، کە بێ گومان پاشماوەی جیازیی ژنی کوێخا بوو، لە سەری داندرابوو. کوێخای لێوبەبزە دەیویست سفرەی شێو ڕاخا، بەڵام نۆخلیدۆڤ داوای لێبووردنی لێکرد. دەیویست بە تەنیا بێ و بیر بکاتەوە. قسەی بێ سەرەوبەرەی ڕەعیەتەکان دڵتەنگی کردبوو. لە کۆزمینسکۆیە هەموویان بە ڕوویەکی خۆشەوە قەبووڵیان کردبوو، لێرەش سەرەڕای ئەوەی بۆ ئاسایشی ڕەعیەتەکان زۆری دەستودڵبازی کردبوو، هەموو لێی بە گومان بوون و پێیان وابوو فێڵیان لێدەکا. لەگەڵ ئەوەشدا وەڕووی خۆی نەهێنا و ئارام و ڕازی بوو.

ژوورەکە پیس و هەواکەی قورس بوو. حەزی دەکرد دیسان بچێتەوە بۆ نێو باخەکە و پیاسە بکات؛ بەڵام دەترسا پیاسە کردن بیرەوەریی ئەو شەوە هەوەساوییە لە مێشکیدا زیندوو بکاتەوە، هەر بۆیە پەشیمان بۆوە. ئەو شەوە هەر لەو باخەدا بوو کە بە پشت دارەکاندا خۆی گەیاندە بووە پشت دەربیجەی ژووری تەنیشت چێشتخانەکە و کاتیۆشای لە خشتە بردبوو. بە

ناچاری لە بەر هەیوانەکە و لە نزیک قاڵدرمە دارینەکان دانیشت و هەوای نیوە گەرمی ئەو شەوەی لەگەڵ بۆنی گەڵای تازە ڕسکاوی دارە بووزەکان هەڵمژی. باخەکە لە نێو سێبەری ئێوارەدا ڕەش دەچۆوە. گوێی بۆ دەنگی ئاشە دوورە دەستەکە ڕاگرت. بولبولەکان دەیانخوێند. باڵندەیەک لە نزیک بەنداوەکە لە پەستا دەیچریکاند. مانگ لە پشت ئەمبارەکانی ئەو بەری باخەکەوە هەڵاتبوو و دارە پڕ چرۆکان و ماڵە نیوە ڕووخاوەکانی گوندی تریفە باران دەکرد.

لە دوورەوە دەنگی هەورەگرمە دەهات و بەشێک لە ئاسمانی مەیلەوڕەشی داپۆشیبوو. وردەوردە بولبولەکان بێدەنگ بوون. ئەو باڵندەیەی لە پەستا دەیخویند،بێدەنگ بوو. هاژەی ئەو ئاوە دەهات کە دەڕژایە نێو دۆڵابی ئاشەکەوە. قازەکان دەیانقیڕاند و کەڵەشێرێکی ناوادە جاروبار لەو پەڕی گوندەکەوە دەیخوێند و سەرەتای شەوێکی گەرم و بارانیی ڕادەگەیاند. لە پەندی پێشینیاندا هاتووە دەڵێن ئەگەر کەڵەشێر ناوادە بخوێنێ مزگێنیی شەوێکی خۆش ڕادەگەیێنی. کۆنت نۆخلیدۆڤیش شەوانی شیرین و شادی بەخشی ڕابردووی وەبیر هاتبۆوە. ئەو هاوینە خۆش و دڵگرەی وەبیر هاتەوە کە گەنجێکی پاک و دڵساف بوو و هاتبوو بۆ نێو ئەو باخە سەر سەوزە. وردە وردە خەیاڵەکانی پەلوپۆی هاویشت و ڕۆح و جەستەی بوو بە یەکپارچە خەون و خەیاڵ. هەستی پاک و پڕ لە تامەزرۆیی ئەو ساڵە لە ناخیدا ژیابۆوە؛ دەتگوت گەڕاوەتەوە بۆ ئەو سەردەمە. مەودای خەیاڵەکانی بێ سنوور بوون. ئەو ڕۆژانەی وەبیر هاتەوە کە تەمەنی چاردە ساڵان بوو؛ شەوانە چۆکی دادەدا و دەستی بۆ دۆعا کردن هەڵدەبڕی و بە گریانەوە لە خودا دەپاڕایەوە ڕاستییەکانی بۆ ڕوون بکاتەوە؛ سەری لە سەر ڕانی دایکی دادەنا و دەگریا، سوێندی دەخوارد و دەیگوت هەمیشە پاک و ڕاست دەبێ و

خۆی ڕمووودەی خەتا و خراپەکاری ناکا. لەو ڕۆژانەدا بوو کە بەڵێنی بە هاوڕێی ڕاست و یەکدڵی خۆی نیکۆلا ئیرتنیڤ دا هەتا زیندووە هاوڕێی گیانی گیانی یەکتر دەبن و هەموو ژیانی خۆی بۆ خۆشی و بەختەوەریی خەڵک تەرخان دەکا.

دیسان وەبیری هاتەوە لە کۆزمینسکۆیە، بۆ ساتێک بیرەبیرە بووبوو و لە خۆی پرسیبوو: «بۆ لە خۆڕا ماڵ و دارستان و باخ و لەوەڕگە و زەوییەکانم بدەم بە خەڵکی؟» بەڵام ئێستا ئیتر دوودڵ نەبوو، ئیتر گوێی بە سامان و ماڵی دنیا نەدەدا و دەیزانی چدەکا. گەڕان و دیتنی خەڵکی گوندەکە و ئەو هەموو داماوی و کوێرەوەرییەی هەیانە زۆر شتی فێر کردبوو. ئەو دیمەنە دڵتەزێنانەی دیبووی: ژنێکی چارەڕەشی دیبوو کە مێردەکەی لە بەندیخانە بوو؛ چونکە یەکێک لە دارەکانی مێشەی ئاغای بڕیبوو. ماترنای بە سالاچوو، پووری کاتیۆشای دیتبوو، ئەو پیرێژنە پێی وابوو خودا کچانی گوندنشینی تەنیا بۆ ڕابواردن و کەیف و نەهەنگی ئاغا خولقاندووە؛ منداڵێک بە باوەشی دایکە برسی و نەخۆشەکەیەوە بوو و بزەی سەر لێوی تەزووی بە دڵی پیاودا دەهێنا؛ ژنێکی دووگیان کە بە هۆی لاوازی و بێ هێزییەوە بە حاڵەحاڵ خۆی بە پێوە دەگرت و ئامادە بوو لە پێناوی ئازاد کردنی مانگاکەیدا کە زیانیی وێنجەی ئاغای کردبوو، بچێت بۆ بێگاری. لەو گەڕانە کورتەدا شتی وای دیتبوو لە خۆی لە ژیان و هەناسەکێشان بێزاربووبوو. دیسان باڵی خەیاڵ هەڵیگرت و لە گوندەوە گەیشتە بەندیخانە و بەندییەکانی هێنایە بەر چاوی خۆی، بە سەری تاشراوەوە دەست بەستراو و پێ بە زەنجیر، بەندیخانەش بەو داڵانە بۆگەن و بەندە تاریک و قێزەونانەوە. موچڕک بە دڵیدا دەهات کاتێک ئەو دیمەنە پڕ ئازار و خەڵکە داماو و ڕەشوڕووتەی دەدی و لەگەڵ ژیانی پڕلە ناز و نیعمەت و ماڵوحاڵی بەبریقوباقی

ساماندارەکانی شار هەڵیدەسەنگاندن. بەڵێ، ئیتر بەر چاوی ڕوون بووبۆوە و دەیزانی چبکا، ئیتر ڕێگای خۆی دۆزیبۆوە و دوو دڵیی وەلا نابوو.

تریفەی زێوینی مانگ لە پشت ئەمبارەکانەوە هاتبووە سەرێ. سێبەری دارەکان خۆیان ڕاکێشابوو و شیروانیی ژەنگاوی و شەقوشڕی ماڵەکە لە ژێر تریفە مانگەشەودا دیار بوو. کۆنت لە بەر شۆقی مانگەشەو دانیشتبوو و بیری لەوە دەکردەوە بۆچی ئاوا درەنگ وەڵامی پرسیارەکانی بۆ ڕوون بۆتەوە. لە کۆزمینسکۆیە چەند وەڵامی جیاجیای بۆ پرسیارەکانی خۆی دۆزیبۆوە و نەیدەزانی کامیان هەڵبژێری، بەڵام ئێستا سەرگەردانییەکەی کۆتایی هاتبوو. هەموو شتێک ڕوون و سادە بوو. بیری لە داهاتووی خۆی نەدەکردەوە و تەنیا لە بیری ئەرکی کۆمەڵایەتیی خۆیدا بوو. لێبڕاوانە دەیزانی چبکات و چ کارێک قازانج و بەر ژەوەندیی خەڵکی تێدایە. بە ئەرکی سەر شانی خۆی دەزانی زەوییەکانی بە سەر ڕەعیەتەکاندا دابەش بکات و بە تاونێکی گەورەی دەزانی ئەو هەموو زەویوزارە تەنیا هی خۆی بێ. دەیزانی دەبێ یارمەتیی کاتیۆشا بدات و لەو گێژاوە ڕزگاری بکات. دیزانی پێویستی بە خوێندنەوەی زیاترە و دەبێ لێکۆڵینەوە ئەنجام بدات و بە چاوێکی کراوەترەوە لە دنیا بڕوانێ؛ ڕێگای عەداڵەتی ڕاستەقینە بگرێتە بەر و بگاتە ڕاستی و هەقیقەت. لەو شتانە تێدەگەیشت و دڵی لێوڕێژ بوو لە شادی و نەشە.

گەواڵە هەورە ڕەشەکان نزیکتر بوونەوە و مانگیان لە باوەشی خۆیاندا شاردەوە. هەور دەیگرماند و برووسکە باخ و ماڵە نیوە وێرانەکانی ڕووناک دەکردەوە. باڵندەکان بێدەنگ بوون. تەنیا گەڵای تەرچکی داران بەنەرمی خشەیان دەهات و بە دەم باوە دەشنینەوە. سروەیەکی فێنک خۆی بە ژێر هەیوانەکەدا دەکرد و قژی کۆنت نۆخلیدۆڤی دەشەکاندەوە. دڵۆپەیەک باران

لە ڕوومەتی درا، دڵۆپەیەکی دیکە و ڕێژنە باران دایکرد. باران بە سەر بنجە دڕووەکاندا دەباری و خرمە خرم لە شیروانییە ژەنگاوییەکەی دەدا. هەواکەی گۆڕابوو. تەنیا خرمەی باران و خوڕەی پلووسک و لوساوکان دەهات. نۆخلیدۆڤ گەڕایەوە بۆ ژووری خەوەکەی. بیر و خەیاڵ دەستی لێ هەڵنەدەگرت:

«ئەم ژیانەی ئێمە چ کەڵکێکی هەیە؟ ئامانجمان لەو ژیانە چییە؟ پوورەکانم بۆ لە دایک بوون و چەند ساڵێک لێرە ژیان و مردن؟ بۆ هاوڕێی گیانی گیانیم نیکۆلنکا ئیرتنیڤ ئاوا زوو مرد؟ بۆ من زیندوو مامەوە؟ بۆ چی لەم گوندە چاوم بە کاتیۆشا کەوت ئاوا گەوجانە غەدرم لێکرد؟ بۆ چوومە ڕیزی ئەرتەشەوە؟ بۆ چووم بۆ گۆڕەپانی شەڕ؟ ئەی ئەم وڵاتانە بۆچی لەگەڵ یەک بەشەڕ دێن و خوێنی یەکتر دەڕێژن؟»

هەموو شتێک لە بەر چاوی بێ مانای دەنواند. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕەنگە تێگەیشتن لە ڕازی خیلقەت لە توانای من بەدەربێ، بەڵام توانای ئەوەم هەیە ویستی «ئەو» کە لە ناخمدا نەخشی بەستووە، بەجێ بێنم، چونکە دەزانم تەنیا بەو کارە شادی لە دڵم دەگەڕێ و دەحەسێمەوە.»

باران بە لێزمە دەهاتە خوارێ و پلووسک نەیدەکێشا. جۆگە و جۆبار پڕ بوون لە ئاو. هێندێ جار هەورە تریشقەیەک باخەکەی ڕووناک دەکردەوە. نۆخلیدۆڤ جلەکانی داکەند و لە سەر تەختەکە خۆی لەگەزدا. کێچ و قالۆنچە لە ژێر کاغەز دیوارییە دڕاوەکاندا کەوتنە جموجۆڵ، بەڵام ئەو گوێی بە چزە و پێوەدانی کێچ و مێشووولە نەدەدا و لە نێو بیر و خەیاڵی خۆیدا نوقم بووبوو: «چی لەوە چاکترە بە جێی ئاغایەتی ببمە خزمەتکاری خەڵک.» لە جێی خۆی هەستا. چراکەی کوژاندەوە. مێشووولە چزووی خستە کار تێی هاڵان، بەڵام بیر و خەیاڵ دەستی لە سەری هەڵنەدەگرت: «دەبێ زەوییەکان

دابەش بکەم، لەگەڵ بەندییەکان برۆم بۆ سیبیریا و ئازاری ئەویش وەک ژانی چزووی ئەم کێچ و مێشوولانە تامڵ بکەم!»

خەوی لێ نەدەکەوت. چووە بەر پەنجەرەکە. چاوی لە ئاسمان کرد. با هەورەکانی ڕادەدا و مانگ دیسان وەدیار کەوتەوە.

## نۆ

زۆری نەما بوو سپێدە وڵات زێوئاژن بکات، نۆخلیدۆڤ خەوی لێکەوت و زۆر درەنگ خەبەری بۆوە. لای نیوەڕۆ حەوت کەس لە ڕەعیەتەکان بە نوێنەرایەتیی ئەوانی دیکە هاتن بۆ نێو باخەکە. لە ژێر دار سێوێکدا مێزێک و چەند کورسییان دانابوو. ماوەیەکی خایاند تاکوو کوێخا تێیگەیاندن وا باشترە کڵاوەکانیان داگرن و لە سەر کورسییەکان دانیشن. کوڕێکی لاو کەتازە لە سەربازی تەواو بوو بوو،نەعل و بەلەکپێچی تازەی لە پێدابوو. کڵاوە دڕاوەکەی بە شێوەیەکی سەیر لە پێش خۆیەوە گرتبوو و وای دەنواند کە ڕێز دادەنێ و دەتگوت بەشداری لە ڕێورسمی بەخاک سپاردندا دەکات. لە هەموویان مەند و ماقوڵتر پیاوێکی ڕیش سپی بوو کە ڕیشی هەتا سەر سینگی شۆڕ بووبۆوە. دەتگوت پەیکەرەکەی حەزرەتی مووسایە کە مایکل ئانژ سازی کردووە؛ قژە سپییەکەی لە سەر ناوچاوانی تاوەسووتی لوول بووبوو و حەزی نەدەکرد کڵاوەکەی داگرێ. یەکەم کەس بوو چوو لە سەر کورسییەک دانیشت و ئەوانی دیکەش وەک چاولێکەری لە سەر کورسییەکە دانیشتن.

نۆخلیدۆڤ بەرەوڕوویان دانیشت و هەنیشکی لە سەر مێزەکە دانا. چاوی لەو یادداشتانە دەکرد کە لە بەر دەمی دانابوو و چووە سەر باسەکەی خۆی. سادە و پاراو قسەی دەکرد؛ وێدەچوو هۆی ئەوەبێ ئەمڕۆ تاقمێکی کەمتری بەردەنگ هەبوو یان هۆکارەکەی ئەوەبوو لێبڕاوانە بڕیاری دابوو و ئەمڕۆ دەیزانی دەبێ چ بکات و چ بڵێ. چاوی لە پیرەپیاوە ڕیش سپییەکە کرد و حەزی دەکرد ئەو بەردەنگە ئێسک سووکە لەگەڵ خۆی بکاتە هاوڕا. بەڵام نەیدازانی پیرەپیاو بە پێچەوانەی ڕواڵەتی مەندوماقووڵ و سەرنجڕاکێشی، نە پیاوێکی وریا بوو نە سەری لەو کارانە دەردەچوو؛ تەنیا جاروبار لەخۆڕا سەری دەلەقاند. زۆپاسازی یەکچاوی گوندەکە پیاوێکی ڕیش تەنک بوو، جووتێ کەوشی شڕ و لاروگێڕی لەپێدا بوو، لە پاڵ پیرەپیاوی ڕیش سپی دانیشتبوو قسەکانی کۆنتی بە زمانێکی ساکار و خۆماڵی دووپات دەکردەوە. هێندێک لەولاوەتر پیرەپیاوێکی خڕپلانە دانیشتبوو چاوانی زیت و وریای بریقەی دەهات و هەرکە دەرفەتی دێنا قسەیەکی نەستەقی دەکرد یان فڕولاتاوێکی دەهاویشت. ئەو ڕەعیەتە لاوەی تازە سەربازیی تەواو کردبوو، تاڕادەیەک سەری لەو بابەتە دەردەچوو؛ بەڵام بە داخەوە بارودۆخی نالەبار و پڕ لە گەوجێتیی سەربازخانە و قسە و ئاکاری سەربازەکان هێندێک شوێنی لە سەر دانابوو. لە هەموویان ئاقڵتر ڕەعیەتێکی کەڵەگەت بوو بە دەنگی گڕ و لووتی درێژ و ڕیشێکی تۆپەوە. پاڵتۆیەکی خاوێنی لەبەردا و نەعلی دارینی لەپێ کردبوو. جوان و بەڕێوجێ قسەی دەکرد. دوو پیرەپیاوی تریش هاتبوون، یەکیان هەمان کابرای وردیلە و ڕووگرژ و بێ ددان بوو، وەک ڕۆژی پێشوو دژایەتیی دەکرد. ئەوی دیکەشیان شەل و بەخۆوە بوو؛ پیاوێکی ڕەزاسووک بوو و لاقی بە پەڕۆیەکی سپی بەستبوو. هەردووکیان کەمدوو بوون بە وردی گوێیان شل کردبوو.

نۆخلیدۆڤ هاتبووە سەر باسی زەوی و خاوەنداریێتی و لە ڕاستیدا بیروباوەڕی ئیسپێنسەری بە زمانێکی ساکار بەیان دەکرد.

ـ بە بڕوای من هیچ کەس مافی ئەوەی نییە زەوی بکڕێ یان بیفرۆشێ، چونکە ئەگەر زەوی وەک کالا بۆ کڕین ببێ،ئەوانەی پارەیان زۆرە هەموو زەوییەکان دەکڕن و قازانجی تەنیا بۆ خۆیان دەبێ و بەس؛ مەگین چەند کەس فەلا و سەپان ئامادە دەبن بە نانەزگی کاریان بۆ بکەن و هەموو دەسترەنجی خۆیان بکەنە نێو مشتی ئەوەوە.

ڕەعیەتە قسە قوتەکە گوتی:

ـ کەوایە هیچ ڕێگایەک نامێنێ جگە لە دزی و فزی.

پیرەپیاوی لووت درێژ بە دەنگە گڕەکەی، قسەی نۆخلیدۆڤی پەسەند کرد. لاوە سەربازەکەش لەگەڵی هاوڕا بوو:

ـ بەڵێ گەورەم! ڕاست دەفەرمووی!

پیرەپیاوە شەلەکە و ئەوانی دیکەش وەقسە هاتن و هەرکام شتێکیان دەگوت.

ـ چارەڕەشیی ئێمە هەمووی بەهۆی ئەو بارودۆخەوەیە. ژنێک باوەشێکی گیا لە مەزرای ئاغا ڕنیوە بردوویە بۆ مانگاکەی، ئەو ژنە قوڕبەسەرەیان گرتووە و ئێستا لە بەندیخانەیە.

ـ دەڵێن زەوی بە ئیجارە بگرە؛ زەوییەکیش دەدەن بە ئیجارە پێمان، پێنج کیلۆمەتر لێرەوە دوورە. بۆ کشتوکاڵ نابێ. ئیجارەکەشی هێندە زۆرە کەس دەرەقەتی نایە. ئەوی لە دەستیان بێ دەیکەن و دەیانهەوێ بە قوڕە ڕەشەدا بمانبەنە خوارێ.

نۆخلیدۆڤ لەو باسانە بە ئاکامێکی باش گەیشت و گوتی:

ـ من خاوەنداریێتی و ئاغایەتی بە تاوانێکی گەورە دەزانم. هەر بۆیە بڕیارم داوە زەوییەکانم بە سەر ئێوەدا دابەش بکەم.

ڕەعیەتە ڕیش درێژەکە ئافەرینی پێگوت بەلاّم هێشتا پێی وابوو ئاغا دەیهەوێ زەوییەکانیان بە ئیجارە بداتێ.

ــ بۆ ئەوە نەهاتووم بە ئیجارە ئەو زەوییانەتان بدەمێ؛ من هاتووم گەلاّلەیەک داڕێژم و خۆم لە دەس ئەو زەوییانە دەرباز بکەم، من دەمهەوێ باری ئەو تاوانە لە کۆڵی خۆم بکەمەوە.

پیرەپیاوی ڕووتاڵ و بێ ددان تازە خەریک بوو بابەتەکەی بۆ ڕوون دەبۆوە. گرێی نێو چاوانی کردەوە و گوتی:

ـ کارێکی زۆر باش دەکەی ئاغا! زەوییەکان بدە بە ئێمە و خۆت ڕزگار بکە. ئەگەر قەستی ئەو کارەشت نییە، ئیتر قسە لێکردنی بێ کەڵکە.

نۆخلیدۆڤ هەستی کرد هێشتا ڕەعیەتەکان باوەڕی پێناکەن و لێی بە گومانن؛ لەگەڵ ئەوەشدا خۆی نەدۆڕاند و وردتر بابەتەکەی بۆ شی کردنەوە.

ـ من لە خۆڕا قسە ناکەم؛ دەمهەوێ زەوییەکان بدەم بە ئێوە و بڕۆم خۆم ڕزگار بکەم، بەلاّم دەبێ زەوی بدەم بەکێ و چۆنی بدەمێ؟ بیدەم بە کامتان؟ بۆ ئەو زەوییانە نەدەم بە خەڵکی گوندی دێمین ئیسکێی[٤٤] کە لێرەوە نزیکە و خەڵکەکەشی لە ئێوە داماتر و هەژار ترن.

هەموو مات بوون و چوون لە ماڵی فیکرەوە. لاوە سەربازەکە گوتی:

ـ بەڵێ، ڕاست دەفەرمووی گەورەم!

ـ ئێستا من دڵنیا بکەنەوە. پێم بڵێن ئەگەر تێزار فەرمان دەرکات هەموو خان و ئاغاکان ملک و زەویی خۆیان بە سەر ڕەعیەتەکاندا دابەش بکەن، دەبێ...

---

44. ئەم گوندە لە چەند کیلۆمەتریی(یاسنایا پۆلیانا) زێدی تۆلستۆی هەڵکەوتووە.

ئەمە ڕاستە یان دەنگۆیە؟ تێزار فەرمانێکی ئەو تۆی دەرکردووە؟
ـ نە ڕاستە و نە دەنگۆیە. گوتم وای دانێین تێزار ڕۆژێک ئەگەر فەرمانێکی ئاوای دەرکرد؛ بە بڕوای ئێوە دەبێ ئەو زەوییانە چۆن دابەش بکات؟
کابرای زۆپاسازی یەکچاو لە سەر ئەو باوەڕە بوو زەوییەکان دەبێ بە شێوەی یەکسان بە سەر ڕەعیەت و ئاغا و ڕەشاییدا دابەش بکرێ. یەکێکی دیکەیان گوتی: هەر کەس کار دەکات دەبێ بەشێکی پێبدرێ. نۆخلیدۆڤ لێی پرسی یانی ئەو خزمەتکارانەی کار دەکەن بەڵام نەک لە سەر زەوییەکان، بەشە مووچە و مەزرایان دەدەنێ؟
ـ نا قوربان! نا گەورەم!
پیرەپیاوی ژیری دەنگ گڕ لەگەڵی هاوڕا بوو، دەیگوت ئەگەر زەوییەکان دابەش بکرێن دەبێ هەمووان بەشیان پێبدرێ؟
ـ بڕوانن؛ کارێکی هەروا سووک و ساناش نییە. ئەگەر زەوییەکان بە سەر کرێکار و جووتیار و پێشخزمەت و ئاشپەز و کارمەند و هەموو خەڵکی شار و لادێدا دابەش بکەن، ئەوانەی تاقەتی کاری وەرزێڕی و کشتوکاڵیان نییە، بەشەکەی خۆیان دەفرۆشن بە ساماندارەکان و زەوی دیسان دەکەوێتەوە دەست ئاغا و دیسان دەرەبەگێکی تر سەر هەڵدەدا. دوای چەند بەرە بەشی جووتیارەکانیش بەسەر عەولاد و نەوەکانیاندا دابەش دەبێ و هیچ کەس هیچی بۆ نامێنێتەوە. بەو جۆرە بەشی هەرە زۆری زەوییەکان بە سامانداران دەبڕێ و جووتیارەکانیش بەشێکی زۆر کەمیان بۆ دەمێنێتەوە.
سەربازە لاوەکە قسەکەی پشت ڕاست کردەوە.
ـ بەڵێ ڕاست دەفەرمووی گەورەم!
کابرای زۆپاساز لە سەر ئەو باوەڕەبوو دەبێ کڕین و فرۆشتنی زەوی پێشگیریی لێبکرێ و هەرکەس ناچار بکرێ لە سەر زەویی خۆی کار بکات.

نۆخلیدۆڤ ئەوەشی بە کارێکی دروست نەدەزانی؛ چونکە مەعلووم نەدەبوو کێ لە سەر زەوییەکەی خۆی کار دەکا یان لە سەر زەویی کەسێکی تر. یەکێک لە ڕەعیەتەکان کشتوکاڵ و دابەشکردنی شەریکایەتیی پێشنیار کرد. پیرەپیاوی بێ ددان ناڕازی بوو و دەیگوت بەم جۆرە تەنیا جووتیاران دەبنە خاوەن بەش و کەسانی دیکەش دەملەپووش دەمێننەوە. نۆخلیدۆڤیش لە سەر ئەو فیکرە کۆک نەبوو. چاوێکی بە بەردەنگەکانیدا گێڕا و گوتی:

ـ بەم شێوەیە، ئەو کەسەی کار بکات بەشی هەیە و هەر کەسیش کاری کشتوکاڵ نەکات دەبێ بە برسییەتی سەر بنێتەوە. ئەو کاتە دەبێ هەمووان جۆرێک گاسن و ئامرازی کشتوکاڵیان هەبێ و هەموو وەک یەک و بەقەد یەک کار بکەن، هەر زیانێکیش لە گوندەکە کەوت هەموو بە شێوەی یەکسان تێیدا شەریکن؛ ئەم کارەش کاتێک سەردەگرێ کە هەمووان پێکەوە یەکدەنگ و هاوڕا بن.

ـ بۆ هیچ کارێک لە نێو ئێمەدا هاودەنگی و سازگاری نییە.

ـ ژنەکانیش لە لایەکەوە بە سەروچاوی یەکتردا هەڵدەپڕژێن و سەروقژی یەکتر دەکێشن.

ـ کاتی دابەشکردنی زەوییەکانیش، جێگا باشەکان بە کەسێک دەبڕێ و جێگا خراپەکانیش بە کەسێکی تر. ئەوانەش خۆی لە خۆیدا کێشە و دوژمنایەتیی لێ دەکەوێتەوە.

زۆپاساز لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە زەوییەکان دەبێ دەرەجە بەندی بکرێن و هەر پەڵە زەوییەک بە کەسێک بدرێ. نۆخلیدۆڤ وەبیری هێنانەوە کە دابەشکردنی زەوییەکان هەتا بەربڵاوتر بێ، زیاتری گێرەوکێشە لێ دەکەوێتەوە و ئەگەر بمانهەوێ لە وڵاتێکی پان و بەریندا زەوی دابەش

بکەین، جیاوازیی زەویی خراپ و زەویی پڕ پیت و بەرەکەت زیاتر دەبێ؛ دیارە هەمووانیش دەخوازن زەویی باش و پڕ پیتیان هەبێ.

لاوە سەربازەکە دیسان گوتی:

ـ بەڵێ ڕاست دەفەرمووی گەورەم!

ئەوانی دیکە بێدەنگ بوون و گوێیان بۆ ئاغا ڕاگرتبوو.

ـ بەم شێوەیە، دابەشکردنی زەوییەکان کارێکی سانا نییە. من و ئێوە یەکەم کەس نیین کە لەو کێشە و گرفتانە تێدەگەین. لێرەدا بیرمەندێکی ئامریکایی بە ناوی هانری جۆرج ڕێگەچارەیەکی باشی دۆزیوەتەوە و من لەگەڵی هاوڕام...

پیرەپیاوی ڕووتاڵ و بێ ددان پەڕییە نێو قسەکانی:

ـ هەرچی بێ تۆ ئاغای و زەویش هی تۆیە. ئەگەر بڕیارت داوە زەوییەکانت ببەخشی زوو کارەکە یەکلایی بکەوە و ڕزگارمان کە؛ ئیتر ئەم هەموو لە سەر ڕۆیشتنەی ناوێ.

قسە ڕەقەکەی کابرا نۆخلیدۆڤی ڕەنجاند، بەڵام باش بوو ئەوانی دیکە بە گژیدا هاتن و دەمکوتیان کرد. ڕەعیەتە دەنگ گڕەکە گوتی:

ـ باوە سیمۆن بێدەنگ بە، با ئاغا قسەی خۆی بکات.

ئەم قسانە دڵی نۆخلیدۆڤی چاک کردەوە و گەڵاڵەکەی هانری جۆرجی بە وردی بۆ ڕەعیەتەکان شی کردەوە.

ـ ئەوە بزانن کە زەوی ملکی هیچ کەس نییە؛ زەوی هی خودایە؛ زەوی هی خەڵکە و هەمووان وەک یەک هەقمان بەسەریەوە هەیە. بەڵام زەویی باش و خراپمان هەیە. هەموو کەس دەیهەوێ زەویی باشی هەبێ. ڕێگای عادڵانەش ئەوەیە دەبێ خاوەنی زەوییە باشەکانماڵیاتی زیاتر بدەن و ئەو پارەیەش یارمەتیی ئەو کەسانە دەدا کە لە سەر زەوییە خراپەکان کار دەکەن.

دیاریکردنی ڕادەی ئەو باخ وماڵیاتەش چونکە کارێکی ئاسان نییە، باشترین ڕێگا ئەوەیە هەر کەس زەوییەکی پێدەبڕێ، بە پێی نرخی زەوییەکە دەبێ ماڵیات بدات. بەم پێیە ئەگەر کەسێک زەویوزاری باش و بە پیتی هەبێ ماڵیاتی زیاتر دەدات و کەسێکیش کە لە سەر زەویی خراپ کار دەکا نەک هەر ماڵیات نادات بەڵکوو بۆ گەشە کردنی کارەکەی یارمەتیی ماڵیش وەردەگرێ.

زۆپاساز برۆی هەڵتەکاند و ئەوەی بە باشترین و عادڵانەترین ڕێگا زانی، پیرەپیاوی ڕیش سپیش لەگەڵ ئەو هاوڕا بوو، دەستێکی بە ڕیشیدا هێنا و گوتی:

ـ ئەم جۆرجە ئەمریکاییە بە ڕاستی مێشکێکی سەیری بووە!

ڕەعیەتە دەنگ گڕەکە، لە سەر ئەو باوەڕەبوو کە ماڵیات دەبێ بدرێ، بەڵام بەو مەرجەی لە توانای جووتیارەکەدا بێ.

نۆخلیدۆڤ هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ ئاماژەت بە خاڵێکی زۆر باش کرد. دەبێ ڕادەی ماڵیاتەکە نە زۆر بێ و نە کەم؛ چونکە ئەگەر زۆر بێ دانەکەی دژوارە و ئەگەر کەمیش بێ سندووقی زبارەی گوندەکە ناتوانێ بە باشی یارمەتیی کەسانی هەژار و دەستکورت بدات. تاقمێک لەو کەسانەی زەویی بە پیت و بەرەکەتیان بە دەستەوە نییە ناچار دەبن زەوییەکەیان بفرۆشن و دیسان کێشە و گرفت دەست پێدەکاتەوە. دەبێ هەموومان یەک ئامانجمان هەبێ و ڕاست و بێ دەغەڵە باج و ماڵیاتی مووچە و مەزراکەمان بدەین.

قسەکانی کۆنت نۆخلیدۆڤ شوێنی لە سەر بەردەنگەکانی دانا. پیرەپیاوی ڕیش درێژ دیسان تاریفی بیر و مێشکی هانری جۆرجی کرد، کوێخای دەم بە پێکەنینیش پرسیی، دوای ئەو گۆڕانە، ئەویش دەتوانێ کاری کشتوکاڵ بکا؟

نۆخلیدۆڤ گوتی ئەگەر پەڵە زەوییەکی ئازاد هەبوو ئەویش دەتوانێ وەریگرێ و کاری لە سەر بکات؛ بەڵام پیرەپیاوی خڕیلانە لێرەشدا دەستی لە گەڵتەوگەپ هەڵنەگرت و بە کوێخای گوت:

ـ تۆ کوا پێویستت بە کشتوکاڵە؟ تۆ یاری بە پارە دەکەی؛ کشتووکاڵ بۆ ئێمەی فەقیر و هەژار دەبێ!

باس و ئاخافتن لێرەدا کۆتایی هات و نۆخلیدۆڤ جارێکی تر گەلاڵەکەی بە هەموو وردەکاییەکانەوە بۆ باس کردن و داوای لە نوێنەرەکانی خەڵک کرد قسە لەگەڵ خەڵکی گوندەکە بکەن، ئەگەر ئەم گەلاڵەیان پەسند کرد، ئاگاداری بکەنەوە. گوندنشینەکان بەڵێنیان دا بە مەیلی ئەو بجووڵێنەوە و لە جێی خۆیان هەستان؛ خوداحافیزییان لە کۆنت کرد و ڕۆیشتن. هەموو کێچ کەوتبووە کەوڵیان، هەرکەس شتێکی دەگوت و جۆرێک بیروڕای خۆی دەردەبڕی. ئەم قسە و باس و ڕاوێژانەش لە نێو گوندەکە ئەو شەوە هەتا بەیانیی خایاند.

ڕۆژی دوایی وەرزێرەکان نەچوون بۆ مەزرا؛ لە دەوری یەک کۆ بوونەوە و دەستیان کرد بە باس و ڕاوێژ. گوندنشینەکان بوون بە دوو دەستە: دەستەیەکیان دەیانگوت ئاغا دەیەوێ زەوییەکان بە دیاری بدات بە ئێمە و ئێمەش دەبێ ئەو دیارییە بەبێ دوودڵی وەرگرین؛ دەستەیەکی دیکەش کە سەبارەت بە ئاغا دڕدۆنگ و بە گومان بوون، پێیان وابوو نۆخلیدۆڤ گورگە لە پێستی مەڕدا و دەیهەوێ زەبرێکی کاریگەریان لێ بوەشێنێ. ئەم باس و ڕاوێژانە سێ ڕۆژی خایاند و هەمووان ڕازی بوون، بۆیە نۆخلیدۆڤیان ئاگادار کردەوە کە دیارییەکەی بە گیان و دڵ وەردەگرن و زۆریشی سپاس دەکەن. شتێک کە زۆری شوێن لە سەر ڕەعیەتەکان دانا و کۆتایی بە دژایەتی و نارەزایەتییەکان هێنا، قسەی پیرێژنێک بوو کە دەیگوت کۆنت بۆ

ئاسـووده كردنـی ویـژدان و ڕۆحـی خـۆی ئەو دیـارییه دەدا به ئێـوه و هـیچ مەبەسـتێكی دیـكەی نیـیه. ڕەعیتەكـان هێنـدێك بیریـان كـردەوه قسـەی پیرێژنەكەیان قەبووڵ كرد: چونكه به چاوی خۆیان دیتبوویان ئاغا چۆن پاره دەدا به هەژارەكان و هیچ كەس له بەخشین و دلاوایی خۆی بێبەش ناكا؛ له ڕاستیدا نۆخلیدۆڤ بۆ یەكەم جار دیمەنی تاڵ و پڕ له ئازاری هەژاری و لیقەوماویی لەم گونده دیت و وەها شوێنی له سەر ڕۆح و هەستی دانا بوو، دەستودڵبازانه ئەوی له گیرفانیدا بوو دای به فەقیر و هەژارەكان؛ به تایبەت پارەی مێشەیەک كه له كۆزمینسكۆیه فرۆشتبووی و پێش قیستی كەلوپەل و كەرەسەی نێو ئەمباری گوندەكەشی وەرگرتبوو، بۆیه گیرفانی پڕ بوو له پاره و به دڵ تەخشان و پەخشانی دەكرد.

كاتێک خەڵكی گوندەكانی دەروبەر ئەو هەواڵەیان پێگەیشت و زانییان كۆنت هیچ كەس بێ بەش ناكا، خەڵكی هەژار و ڕەشوڕووت هوروژمیان هێنا و زۆربەیان ژن بوون. نۆخلیدۆڤ له هەمبەر ئەم ئاپۆرەی خەڵكەدا گێژوویژ بووبوو. نەیدەزانی چبكا. تێر و برسی و نیازمەند و بێ نیازیشی بۆ لێک نەدەكرایەوه؛ نەشدەكرا هەر كەس له دەرگاكه هاته ژووری شتێكی بداتێ. بۆیه ناچار بوو زووتر كارەكان یەكلایی بكاتەوه و لەو شوێنه پڕله ئازار و هەژارییه دوور كەوێتەوه. له دوایین ڕۆژی مانەوەیدا، چاوی له دۆلاب و سندووقی پوورەكانی كرد بەلام گوێی بەو هەموو شته ئەنتیكه و به نرخه نەدا. سندووقێک له داری عەبەنۆس له سووچێک بوو، چوار پەیكەرەی شێر له هەر چوار لای داندرابوو، كۆنت چاوی له نێو سندووقه كرد، نامەی پوورەكانی و وێنەیەكی تێدا بوو. لەم وێنەیەدا هەر دوو پوورەكەی و نۆخلیدۆڤ و كاتیۆشا به یەكەوه ڕاوەستا بوون؛ كاتیۆشای پاک و بێگەرد و شوخوشەنگ. كۆنت له یەكەم سەفەریدا بۆ لای پوورەكانی ئەم وێنەیەی بۆ

یادگاری گرتبوو. وێنەکەی هەڵگرت؛ ئەمە تەنیا شتێک بوو کە هەڵیگرت بۆ خۆی و ماڵەکەی بە هەموو کەلوپەلەکانییەوە؛ بە هاوکاریی کوێخای لێو بەبزە، بە نرخێکی زۆر هەرزان فرۆشت بە ئاشەوانێک و بەم شێوەیە خۆی لە دەست ئەم هەموو قەرەوێڵە و کەلوپەل و ملکە ڕزگارکرد. ڕۆژێک کە لە کۆزمینسکۆیە هاتە دەرێ، خۆی بە خەمبار و شەرمەزار دەزانی، بەڵام کاتێک لەم گوندە چووە دەرێ شاد و دڵخۆش بوو، چونکە خۆی لە داوی خاوەنداریێتی و ملکداری دەباز کرد بوو. وەک کەسێک دەچوو کە سەفەر دەکا بۆ وڵاتێکی نەناسراو و بە دوای ژیانێکی نوێدا دەگەڕێ.

## ده

لای ئێوارە گەیشتەوە شار. بە چاوێکی نوێ لە شاری ڕوانی. هەموو شتێک لە بەر چاوی سەیر و سەرسووڕهێنەر بوو. لە وێستگەی شەمەندەفەرەوە هەتا ماڵێ بە بەر شۆقی لەنتەرەکاندا ابە پییان ڕۆیشت. بۆنی نەفتالین ماڵەکەی داگرتبوو. ئاگراڤنا و کۆرنئی، بێ تاقەت و ماندوو بوون. ئەو ڕۆژە چەند جار بە گژ یەکدا چووبوون و دەمەقاڵێیان لێ پەیدا بووبوو، چونکە هەستیان دەکرد کارێکی بێ کەڵک ئەنجام دەدەن. تەواوی جلوبەرگی نێو سندووق و دۆڵابەکانیان دەردە هێنا، دەیانتەکاند و دەیانخستەوە جێی خۆی. لە خۆڕا کەلوپەلەکانیان ئەمبارەوبار دەکرد. ژوورەکەی کۆنتیش هێشتا ئامادە نەکرابوو. هێندەیان کەلوپەل و قەرەوێڵە لە نێو داڵانەکە هەڵڕشتبوو ڕێگا نەبوو بچیە ژووری. چاوەڕوانی گەڕانەوەی نەبوون و ئێستا کە هاتبۆوە گرفتی بۆ ساز دەکردن و ئاگراڤنا و کورنئی دەستیان لە کار سارد بووبۆوە؛

بەڵام تەنیا شتێک کە نۆخلیدۆڤ بیری لێ نەدەکردەوە کاروباری ماڵێ بوو. دوای دیتنــی ژیــانی تــاڵ و پــڕ لە کــوێرەوەریی ڕەعیەتەکــان، ئەم هەمــوو قەرەوێڵە و قەنەفە و کەلـوپەلەی بە شـتێکی زیـادی و بـێ کەڵـک دەزانـی. لە بیری ئەوەدا بوو سبەینێ ماڵێکی چکۆڵە بدۆزتەوە و لەوێدا بژی، ئەم ماڵ و دیوەخـانە گەورە و پڕشـکۆیەش بە گراڤنـا بسـپێرێ تـاکوو بە مەیلـی خـۆی ڕێکوپێکی بکات و چاوەڕوان بێ هەتا خوشکەکەی دێتەوە و هەر چۆنێکی بە باش دەزانێ بڕیاری لە سەر بدا.

سبەینێ، بەیانی زوو لە ماڵێ هاتە دەرێ، لە نزیک بەندیخانە، مـاڵێکی دوو وەتاغەی بە مۆبیل و قەنەفەی خـاوێنەوە پەیدا کرد و دەستووری دا هێندێک کەلوپەلی پێویست لە ماڵەکەیەوە بهێنن بۆ ئەوێ. کە لەم کارە خـاترجەم بـوو، بەرەو ماڵی فانارین وەڕێکەوت. ڕۆژێکی سـارد بـوو. دوای چەند ڕۆژ هەوای خۆشی بە هاری، دیسان شـەپۆلێکی سـەرما و سـۆڵە گەڕابۆوە، وشکەسـەرما بـوو، کزەبـایەکی تونـدی دەهـات و تفت هەڵاویشـتبایە دەیبەسـت. نۆخلیـدۆڤ پاڵتۆیەکی تەنکی لە بەردا بوو، زۆری سـەرما بـوو و بە پڕتـاو هەنگاوی دەنـا بۆ ئەوەی گەرم دابێ.

ئەوەی لەو چەنــد ڕۆژەدا دیتبــووی، لەزەینیــدا زەق بووبــوونەوە. ژن و منــداڵی گوندنشــینەکان و بەســاڵا چــووە داماوەکــان، مــات و خەمبــار بە جلوبەرگی شڕەوە ڕیزیان بەستبوو. منداڵێکی نەخۆش بە باوەشـی دایکییەوە لە بەر ژانی جەستەی قاچی لەیەک دەساوی و بزەیەکـی دڵتەزێن و خەمـاوی لە سـەر لێوی بوو. ئەو دیمەنانە بۆ ساتێک لە بەر چاوی لانەدەچوون.

بە چـاوێکی نـوێ لە گۆشتفرۆشـی و شـیرینی خـانە و ماسـی فرۆشـەکانی دەڕوانـی و دەتگـوت یەکەم جارە ئەو دووکانـانە دەبینێ. دووکانداره قەڵەو و زگهانکەکـان لەگەڵ ڕەعـیەتە هەژارەکـان زۆر جیـاواز بـوون. دەتگـوت ئەم

دووکانـدارانه بـۆ ئەوە هـاتوونه سـەر دنیـا قـۆڵی خەڵکـی ببـڕن و بە زمـانی لووس و فێڵ و تەڵەکە کڕیارەکان هەڵخەڵەتێنن، بەجێی ئەوەی کاڵای بـاش بە نرخێکی گونجاو بە خەڵکی بفرۆشن، هەزار جۆر گزی و فزی بە کـار دێنن و لەو ڕێگایەوە گیرفانی خۆیان دەئاخنن.

فایتوونەوان و عارەبانەچی بە کەفەڵی پان و پاڵتۆی لە پشتەوە بە قۆپچە داخـراو، چـاوی زەق و جاڕزکەریـان زیـت کردبـۆوە و چـاوەڕوانی مسـافیر بـوون. دەرگاوانەکـان بە کاسـکێتی قردێله دارەوە، کەنیـز و قەرەواش بە قژی چــین چــین و بەرهەڵبێــنەی ســپییەوە، زۆر ســووک و چــرووک دەهــاتنه بەرچاوی؛ جاروبار چـاوی بە ڕەعیەتـی لە گونـد تەرە بـووی بەڕیدەی شـاری دەکەوت. دەیزانــی هێنـدێک لە لادێییەکـان لە شـار نێوچاویـان هێنـاویەتی و نانیان کەوتۆتە ڕۆنەوە، وەک ئاغا ڕایدەبوێرن و ژیـانێکی باشـیان هەیە؛ بەڵام زۆربەی ئەوانەی لە گونــدەوە ڕوویــان لە شــار کــردووە، لێــرەش هەژار و داماوترن و ژیانێکی کوڵەمەرگییان هەیە.

پینەچییەکانی دەدی لە قوژبنێکی تاریک خزوان و کەوش و پێڵاوی خەڵکی دەدوورنەوە و هەمووییـــان زەردەڵ و لاوازن. کرێکـــارانی ئوتووخـــانه و جلشـــۆری لەبەر پەنــجەرە ئاواڵەکـان ڕاوەســتاون و لە نێـو چڵـک و کەفـی سـابووندا دەسـتیان پیرەڵـۆک بـووە، جلوبەرگ دەشـۆن، ئوتـووی لێدەدەن و زەند و مەچەکی ڕووتیـان چڵـک و کەفی پێوە نووسـاوە. دوو هەنگـاو لەولای خـۆیەوە چـاوی بە دوو منـداڵ کەوت، شـاگردی ڕەنگڕێـزی بـوون. پێخـاوس بوون، قۆڵی کراسە کۆن و شەقیلە بەستووەکەیان هەڵکرد بوو و باسـکی کز و باریکیـان، دەمارەکـانی بە دیـارەوە بـوو. یەکـی سـەتڵێکیان بە دەسـتەوە گرتبوو و جنێویان بە یەکتر دەدا. شەکەتی و داماوی بە ڕوخسـاریانەوە دیـار بــوو. ئەو شــەکەتی و دامــاوییە بە ڕوخســاری تــۆزاوی و تاوەســووتی

عارەبانەچییەکانیشـــەوە دەبینـــدرا؛ ئەو دامـــاوی و شـــەکەتییە بە دەموچـــاوی پەنەمیوی پیاوان و ژنانی دەرۆزەکەریشەوە دیار بوو کە دەستی منداڵەکانیان گرتبـــوو و ســـواڵیان دەکـــرد؛ ئەو شـــەکەتی و دامـــاوییە بە ڕوخســـاری بە مەشـروب سـوور هەڵـگەڕاوی مەیخانەچییەکـانی سـەر ڕێگاکەشـییەوە دیـار بـــوو. لەو مەیخـــانەیە ســـەر مێزەکـــان پـــڕ بـــوون لە بتڵـــی مەشـــرووب و پێشـخزمەتەکان کەشـەف بە دەسـت، تونـدوتۆڵ و گـورج بە نێـو کورسـی و مێزەکاندا دەگەڕان. لەوێ چەند کەس دەیانگوڕاند. تاقمێک گۆرانییـان دەگـوت، کەسێکیش مەست و کەلەلا لە نزیک پەنجەرەکە ڕاوەستا بوو، بە دەم و لچی شـۆڕ و نێوچـاوانی گـرژەوە چـاوی لە ئەو دەکـرد؛ دەتگـوت لە زەینـی خۆیـدا لەکەسێک دەگەڕێ.

کۆنت نۆخلیدۆڤ گێژ بووبوو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «بۆ ئەم هەمـوو مـرۆڤە لێـرە کـۆ بـوونەتەوە؟» بـایەکی تونـدی دەهـات و لە سـەر شـەقامەکە تەپوتۆز و گێژەڵووکەی ساز کردبوو. بۆنێکی توند لە ڕەنگرێژییەکەوە دەهـات و پانتای شەقامەکەی داگرتبوو. عارەبـانەیەکی گەورە کە بـارەکەی ئاسنەواڵە بـــوو، بە تەقوکـــوت بەرەولای ئەو دەهـــات. نۆخلیـــدۆڤ تونـــدتر هەنگـــاوی هەڵێنـــایەوە بـــۆ ئەوەی لەو تەقوکـــوتە دوور کەوێـــتەوە؛ لەو کـــاتەدا کەســـێک هەرای لێکرد:

- نۆخلیدۆڤ!... خۆتی؟

کۆنـــت هەودای خەیـــاڵی پســـا. ئەو کەســـەی هەرای لێـــدەکرد، لە نێـــو فەیتوونێکدا دانیشـتبوو. پیـاوێکی ڕووکراوە بـوو بە سمێڵی قەیتانی و نـووک تیـژەوە. نۆخلیـدۆڤ هـاوڕێ دێرینەکەی خـۆی ناسـییەوە. شـەنبۆک بـوو، ئەو کوڕە لە ماڵی پوورەکانی جارێک هاتبوو بۆ لای. سـەرەتا بە دیتنی شـاد بـوو؛ بەڵام شـــادییەکەی وەک تەنـــکە هەڵمێـــک ڕەویـــیەوە و هەســـتی کـــرد جێگـــای

خۆشحاڵی نییە! ماوەیەک بوو هەواڵی لە شەنبۆک نەبوو، بەڵام بیستبووی سەرەڕای وازهێنان لە گاردی ئیمپراتۆڕی، لە سوارە نیزامدا ماوەتەوە و لە باری ماڵیشەوە سازە؛ هەموو قەرزەکانی داوەتەوە و ماڵ و سامانێکی زۆری پێکەوە ناوە. شەنبۆک لە فایتوونەکە دابەزی و هات باوەشی بە نۆخلیدۆڤدا کرد:

ـ چەندەم پێخۆشبوو چاوم پێت کەوت. تۆ لە کوێی هاوڕێ؟ لەم شارەدا هیچکام لە هاوڕێیانی قەدیمم نەدیوەتەوە. چەند پیر بووی! بە ڕەوت و ڕۆییشتندا تۆم ناسییەوە. دەبێ نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین و تێروپڕ قسە بکەین.

نۆخلیدۆڤ لە بیری ئەوەدا بوو بیانوویەک بدۆزێتەوە و خۆی لە دەستی دەرباز بکات، لەگەڵ ئەوشدا دڵی هاوڕێکەی نەڕەنجێنێ.

ـ هاوڕێی بەڕێز! جارێ زۆر گرفتارم. پێم بڵێ تۆ بۆ لێرەی؟

ــ زۆرم کار بە سەردا ڕژاوە. فریای سەرخوراندن ناکەوم. حەتمەن بیستووتە؛ من سەرپەرشت و قەویتی ماڵ و حاڵی سامانۆڤم؛ مەبەستم ئەو ساماندارە بەناوبانگەکەیە! گەمژە و خەرەفاوە و خۆی ناتوانێ بەسەر ماڵ سامانەکەیدا ڕابگا. نزیکەی چوارسەت و پەنجا دۆنم زەویی هەیە. پێڕاگەیشتنی ئەو هەموو ملک و ماڵە کارێکی زۆر دژوارە. گوندنشینەکان هەلەکەیان قۆستبۆوە و هەشتا هەزار ڕۆبڵ لە سامانەکەیان پاشقل دابوو. زۆرم هەوڵ دا تا توانیم ئەو قەرزانە لە قورگی ئەو گوندنشینانە دەرکێشم. لە ماوەی ساڵێکدا بە تەواوی بارودۆخەکەم گۆڕی؛ حەفتا لە سەدی قەرزەکانیم وەرگرتۆتەوە و پاشماوەکەشی بەم زووانە دەستێنمەوە.

لووتبەرزانە قسەی دەکرد؛ دەتگوت خۆی خاوەنی ملک و ماڵی سامانۆڤی گەمژەیە و بە قسەکانیدا نۆخلیدۆڤ خەریک بوو ڕاستییەکانی بۆ

دەردەکەوت. لە هاوڕێیـــانی خـــۆی بیســـتبوو لە ســـەر داوای کەســـێکی دەستڕۆیشتوو کراوە بە قەویتی مڵک و ماڵی سامانۆڤ و هەر لەو ڕێگایەوە توانیویە هەموو قەرزەکانی خۆی بداتەوە و پارەیەکی زۆریش پاشقل بدات و درێـژە بە ژیـانی خانەدانیـانەی خـۆی بـدات. شـەنبۆک پێداگریی دەکـرد لە شوێنێک پێکەوە دانیشن تاکوو بەسەرهاتی سەرکەوتنی خۆی بۆ بگێڕێتەوە؛ بەڵام کۆنت نۆخلیدۆڤ بە پێچەوانە دەیویست ڕێگایەک بدۆزێتەوە و خۆی دەربـاز بکـات. هەر لەو کـاتەدا، لەناکـاو بـۆی دەرکەوت دەموچـاو و مـووی چەور و بۆیەکراوی و سمێڵە قەیتانی و نووک تیژەکەی شەنبۆک لەگەڵ لچە شۆڕ و دەموچاوە پەنەمیوکەی ئەو کابرا مەستەی لە دەرگای مەیخانەکەوە چـاوی لە دەرێ دەکـرد، زۆر لەیەک دەچـن؛ بەڵام هەرچـی مێشـکی خـۆی هەڵگوشی ڕازی ئەو وێکچوونەی بۆ دەرنەکەوت!

شەنبۆک گوتی:

ـ ئێسـتا پـێم بڵـێ لە کـوێ نـانی نیـوەڕۆ بخـۆین؟ لە مـاڵی ئێـوە یـان لە ڕیستۆران؟ من ڕیستۆرانە باش و خاوێنەکانی ئەم شارە وەک لەپی دەستم شارەزام.

نۆخلیدۆڤ چاوی لە کاتژمێرەکەی کرد و دیسـان بـۆی ڕوونکردەوە کە ناتوانێ لەگەڵیدا بێ و کاری زەروریی هەیە.

ـ کەوایە دەبێ دوانیوەڕۆ... لە گۆڕەپانی ئەسپ سواری یەکتر ببینین و ...

ـ من دەرفەتم نییە.

ـ خۆم ئەسپم نییە. گرێوم لە سەر ئەسپەکەی گریشین کردووە. لە بیرتە؟ ئەسپی ڕەسەنی هەیە. دوای کێبڕکێکە دەچین پێکەوە شێو دەخۆین.

ـ بە داخەوە بۆ شێویش دەرفەتم نییە.

ـ ئێستا بۆ کام لا دەڕۆی؟ وەرە با بەو فەیتوونە بتگەیێنم!

ـ دەچم بۆ لای فانارین پاریزەری خانەی داد؛ ماڵەکەی لەو کۆڵانەی ڕووبەڕوو دایە.

ـ ئێستا تێگەیشتم. کەوایە ئەوەی بیستوومە ڕاستە. وادیارە بەسەر بارودۆخی بەندییەکاندا ڕادەگەی. یارمەتییان دەدەی. کوورچاگین بۆی باس کردم. حەتمەن ئاگاداری، کوورچاگین و بنەماڵەکەی لێرە ڕۆیشتوون. هەموو شتێکم بۆ باس بکە. دەمەوێ هەموو شتێک بزانم!

ـ ئەوەی بیستووتە هەمووی وایە. من یارمەتیی بەندییەکان دەدەم؛ بەڵام لەو کۆڵانە ناکرێ بۆت باس بکەم.

ـ تۆ هەمیشە لەگەڵ هەمووان جیاواز بووی؛ شێتییەکانیشت تایبەتی خۆت بوو. لە گۆڕەپانی ئەسپ سواری، دەبێ سەرلەبەر هەموویم بۆ بگێڕییەوە.

ـ خۆ پێم گوتی ناتوانم بێم. خۆ لێم دڵمەند نابی؟

ـ بۆ لێت دڵمەند دەبم. ڕۆژێک یەکتر هەر دەبینین و هەموو شتێک لە زمانی خۆت دەبیستم. با کاتێکی تر بێ.

دەستی نۆخلیدۆڤی گوشی و خۆی هەڵدایەوە سەر فەیتوونەکە. پێدەکەنی و ددانە سپی و بریقەدارەکانی بە دیارەوە بوون. فەیتوونەکە وردەوردە دوور کەوتەوە و کۆنت نۆخلیدۆڤ تاسا بوو؛ لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد:

ـ باوەڕ ناکەم من کەسێکی وەک ئەو بووبێتم. یانی منیش وەک ئەو وابووم؟ گریمان وەک ئەویش نەبووبێتم، بەڵام بەو ئاواتەوە بووم لەو ڕێگایانەوە گیرفانم باخنم و پارە کۆبکەمەوە و وەک ئەو بژیم.

# یازدە

فانارین بەبێ ماتڵ کردن نۆخلیدۆڤی وەرگرت و بەبێ پێشەکی چوونە سەر باسی پەروەندەی مەنشۆڤ و ئەوانی دیکە:

ــ پەروەندەکەم خوێندەوە؛ بە بڕوای من تۆمەتەکان بێ بنەمان. دیارە مەیخانەچی خۆی ئەمبارەکەی ئاور تێبەرداوە و ویستوویەتی هەقی بیمەکەی وەرگرێ. مەنشۆڤ و دایکی بە بێ هیچ هۆکار و بەڵگەیەک حوکمیان بەسەردا سەپاوە. ماستاوچێتیی لێکۆڵەر و کەمتەرخەمیی دادیار ئەو دایک و کوڕەی تووشی ئەو گێژاوە کردووە. ئەگەر ئەم پەروەندەیە بەرز کرێتەوە بۆ دادگای شار، فحێلیان دەکەم. هەقی پارێزەریشم ناوێ... بۆ سڕینەوەی تۆمەت لە سەر فێدۆزیا برێوکۆڤ، کە دەڵێن ویستوویەتی مێردەکەی خۆی دەرماندراو بکات، دادنامەیەکم نووسیوە. ئەم جۆرە ناڕەزایەتییانە دیارە دەچێتە بەر دەستی وەزیری داد. وەزیریش بۆ ئەوەی کێشەکە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، بەبێ ئەوەی بیخوێنێتەوە، چەند وشە لە داوێنەکەی دەنووسێ و دەینێرێ بۆ پترزبۆرگ. واباشە خۆت لە پترزبۆرگ وەدوای بکەوی و بە ئاکامی بگەیەنی. بەڵام بۆ ماسلۆڤا کە زۆری پێداگری لە سەر دەکەی، دەبێ هەتا مەقاماتی باڵا بڕۆینە پێشێ.

ـ مەبەستت ئیمپراتۆرە؟

فانارین زەردەیەکی گرت.

ــ گەورەم! بۆ ئاگاداریت هەر لە ئەنجومەنی سەنا کارەکان یەکلایی دەکریتەوە؛ چونکە سەرۆکی لقی داد لە ئەنجومەنی سەنا، سکرتێری کۆمیسیۆنی بەخشین و فحێل کردنە[٤٥] و دەتوانێ کارەکە جێبەجێ بکات.

نۆخلیدڤ نامەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و پیشان فانارینی دا.

ـ ئەم نامەیە چەند کەسی ئیماندار و باوەڕپێکراو واژۆیان کردووە و بۆ منیان ناردووە. بابەتێکیان نووسیوە کە باوەڕ پێکردنی دژوارە. هەر ئەمڕۆ دەبێ بچم لێی بکۆڵمەوە و ڕاستییەکەم بۆ ڕوون بێتەوە.

ـ وادیارە هەرکەس لە لایەکەوە سکاڵای لە دەست زیندان و دەزگای داد هەبێ، پەنا بۆ ئێوە دێنی. بە بڕوای من ئێوە چاک خۆتان تووشی کێشە کردووە. دەترسم لەگەڵ دەزگا داد سەروکلاوتان تێکەڵ بێ.

ـ ڕەنگە قسەی تۆ بێ، بەڵام ئەمە بە ڕاستی سەرسووڕهێنەرە.

کورتەی ڕووداوەکەی بۆ فانارین گێڕایەوە، گوایە ماوەیەک لەمەوبەر لە گوندێک ڕەعیەتەکان لە دەوری یەک کۆبوونەتەوە ئینجیل بخوێنن؛ جەندرمەکان هێرشیان کردۆتە سەریان و بڵاوەیان پێکردوون. یەکشەممەی دواتر، دیسان گوندنشینەکان کۆ دەبنەوە. عەریفی جەندرمەکان ڕووداوەکە دەکاتە سووڕەت جەلەسە و گوندنشینەکان بە دەستی بەسراوەوە دەنێرێ بۆ دادسەرا. لێکۆڵەر و دادیار پەروەندەکە ڕێک دەخەن و دەینێرن بۆ دادگا. قازییەکانیش بڕیاری لە سەر دەدەن و گوندنشینەکان حوکم دەدەن. لە دادگاش بەڵگەی تاوان تەنیا بەرگێک کتێبی ئینجیل بووە، کە لە سەر مێزەکە دایاننابوە.

45 ـ کومیسیۆنی بەخشین و فحێل کردن لە ڕووسیا ساڵی 1810 دامەزرا. هەتا ساڵی 1835 سەر بە ئەنجومەنی باڵای ئیداری بوو، 1835 سەربەخۆ بوو و لە ساڵی 1884 بەدواوە درایە نووسینگەی تایبەتی ئیمپراتۆر.

نۆخلیدۆڤ نەیدەتوانی سەرسووڕمانی خۆی بشارێتەوە، بەڵام فانارین زۆری پێ سەرسام نەبوو.

- گەورەم! سەرت لەچی سووڕماوە؟

ـــ لە هەمـــوو شـــتێک! وای دانێـــین عەریفـــی جەنـــدرمەکان پیـــاوێکی نەخوێندەوارە و پەروەندەکەی سازکردووە، لێکۆڵەر و دادیار و قازییەکانی دادگا خۆ کەسانێکی خوێندەوارن، بۆ دەبێ ئەو گوندنیشینە داماوانە بە تاوانی خوێندنەوەی ئینجیل سزا بدەن؟

- لە بیر و بۆچوونەکانی خۆتاندا شتێکی سەرەکی لەبەرچاوبگرە. ڕاستە لێکۆڵەر و دادیار و قازییەکان کەسانێکی خوێندەوار و ئازادیخواز بوون، بەڵام ئێستا نە ئازادیخوازن و نە خوێندەواریشن؛ فەرمانبەری دەوڵەتن و بیستەمی هەموومانگێک مووچەی خۆیان لە سندووقی دەوڵەت وەردەگرن. ئاساییە بۆ زیاد بوونی ئەو مووچە دوابڕاوەش، ئامادەن هەموو جۆرە مەرایی و تەشی ڕێسییەک بکەن. حەز دەکەن سەد کەسی بێ تاوانیان بکەوێتە داوەوە و هەموویان سزا بدەن.

- قانوون ڕێگە نادا تاقمێک بە تاوانی خوێندنەوەی ئینجیل سزا بدرێن و بۆ سیبیریا دوور بخرێنەوە.

- بە پێچەوانە، یاسا نەک ڕێگە دەدا ئەو تاقمە سزا بدرێن و بۆ سیبیریا دوور بخرێنەوە؛ تەنانەت ڕێگە دەدا ئەو تاقمە بە توندترین شێوەش سزا بدرێن. بە پێی مادەی 196ی یاسای تاوان، هەر کەسێک بە دژی دینی فەرمیی وڵات بانگەشە بکات بە زیندان و کاری قورس سزا دەدرێ. زۆر ئاساییە پەروەندەیەکیش بۆ ئێوە ساز کەن و بڵێن ئینجیلتان بە مەیلی خۆتان شرۆڤە کردووە و مەبەستتان هاندانی خەڵک بووە بە دژی ئەم دوڵەتە.

- نا، شتی وا هەر نابێ!

ـ ئەوەی عەرزتانی دەکەم ڕاستە. زۆر جار بەو بەڕێزانەم گوتووە کە بەرپرسی کار و باری یاسایین و سپاسم لێکردوون کە گەورەیی دەنوێنن و ئازادی و هێمنایەتیی من و خەڵکی دابین دەکەن، چونکە دەتوانن لە چاوترووکاندنێکدا بۆ هەر کەسێک حەزیان لێبێ، پەروەندەیەک ساز بکەن و زیندان و تاراوگەی بۆ ببڕنەوە.

ـ ئەگەر چارەنووسی خەڵک لە دەستی دادستاندا بێ و بە ویستی خۆی لەگەڵیان بجووڵێتەوە، کەوایە ئەم هەموو یاسا و دامودەزگایە چ کەڵکێکی هەیە؟

فانارین دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:

ـ هاوڕێی بەڕێز! ئەمە چ پرسیارێکە؟ دەبێ لەو بوارەدا بە وردی بۆت باس بکەم. ڕۆژی شەممە تەشریف بێنە بۆ ماڵی ئێمە. تاقمێک لە بیرمەندان و هونەرمەندان لەوێ کۆ دەبنەوە و دەتوانین بە چڕوپڕی لە فەلسەفەی درێژەپێدانی ئەم بارودۆخە و کێشەکانی خەڵکی بکۆڵینەوە. ئێوە خۆ خێزانم دەناسن. حەتمەن تەشریف بێنن.

نۆخلیدۆڤ حەزی لەو کۆڕ و کۆبوونەوە و باسوخواسانەی بیرمەندان و هونەرمەندان نەبوو، بەڵام لەبەر دڵی فانارین گوتی هەوڵ دەدا بچێت بۆ کۆڕەکە و مەبەستیشی خۆدزینەوە لەو بانگێشتنە بوو. فانارین بە بزەیەکی مانادارەوە باسی ڕوووداوەکانی دامودەزگای دادی دەکرد و وشەگەلی «فەلسەفەی کۆمەڵایەتی و کێشەی خەڵک»ی بە گاڵتە و تیتاڵەوە دەردەبڕی، نۆخلیدۆڤیش هەستی دەکرد ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە دنیای شەنبۆکەکان و فانارینەکان دوور دەکەوێتەوە کە فیکروزیکریان ئەوەیە دەست و گوێی خەڵک ببڕن و گیرفان و باخەڵی خۆیان پڕ بکەن.

# دوازده

نۆخلیدۆڤ وەدرەنگ کەوتبوو و بەندیخانەش لە ماڵی فانارینەوە دوور بوو. فەیتوونێکی گرت و سوار بوو. لە کاتی ڕۆیشتندا کە بە یەکەم شەقامدا بایان دایەوە، فەیتوونەوانەکە پیاوێکی گەڕاوە بوو بە قەڵافەتێکی پڕ هۆش و دڵسۆزانەوە، ئاوڕی دایەوە و باڵەخانەیەکی بەرزی پیشان نۆخلیدۆڤ دا.

ـ دیتووتە باڵەخانەی چۆن دروست دەکەن؟

جۆرێک قسەی دەکرد دەتگوت خۆی خاوەن یان دروستکەری ئەو بینا بەرزەیە. باڵەخانەیەکی نیوەچڵی گەورە بوو، بە شێوازی بارۆقا[٤٦]، زۆریش سەسووڕهێنەر. چێوبەستی قایمی دەورەکەی بە ئاڵقەی ئاسنین لێک هەڵپێکرا بوون، بە تەیمانێکی دارین لە شەقامەکە جیا کرابۆوە. لەو بەرزاییەوە کرێکارەکان بە قەد میرووڵەیەک دەبوون، سەروسەکوت و جلەکانیان هەموو تۆزاوی و گەچاوی بوو و هەرکام سەرقاڵی کارێک بوون. یەکێک بەردی تێدەگرت، یەکێکی تر بەردەی دەتاشی، تاقمێک ناوەی قوڕیان لە سەر سەدانا بوو و چەند کەسی تر بە غەڕغەڕە بەرمیلی پڕ لە گەچ و گڵیان هەڵدەکێشا. پیاوێکی قەڵەوی بۆشناغ، کە وێدەچوو مێعماری بیناکە بێ لە پاڵ داربەستەکە ڕاوەستا بوو لەگەڵ سەر کرێکارەکە قسەی دەکرد و دیار بوو فەرمانی

---

46. Baroque

پێدەدا. عارەبانەی پڕ لە کەرەسەی بینا سازی لە پەستا دەهاتن بارەکەیان خاڵی دەکرد و دەڕۆیشتن.

نۆخلیدۆڤ چووبوو لە مالّی فیکرەوە: «ئەو چارەڕەشانە پێیان وایە کارێکی بەکەڵک ئەنجام دەدەن؛ ئیتر تێناگەن ئەم کۆشکە قۆڕ و بێ کەڵکە بۆ دەوڵەت یان بۆ ساماندارێک دروست دەکەن کە هەموو ئەو پارەیەی لە ڕێگای دزی و بەرتیل و تالانوبڕۆی خەڵکەوە بە دەست هێناوە، ئەو کرێکارە داماوانەش خۆیان و ژن و منداڵە ڕەشوڕووتەکانیان لە قوژبن و کەلاوە و کاولاشاندا دەژین و نانی شەوییان نییە و زۆربەی کات بە برسێتی سەر دەنێنەوە.» دوای ئەو فیکر و خەیاڵانە، کتوپڕ لە دەمی دەرپەڕی:

- چ بینایەکی قۆڕە!

فەیتوونەوان کە چاوەڕوانی ئەو قسەیە نەبوو، داچڵەکی:

- گەورەم! ئەوە دەفەرمووی چی؟ دەبێ شوکری خودا بکەین کە ئەو هەموو کرێکارە لەو ڕێگایەوە نان دەخۆن.

- ئەو بینا قۆڕە چ قازانجێکی هەیە؟

- بە پێچەوانە زۆریش بەکەڵکە. ئەو هەموو کرێکارەی لە دەوری خۆی کۆ کردۆتەوە.

نۆخلیدۆڤ هیچی نەگوت. هەرا و هاوار و تەقوکوت نەیدەهێشت گوێیان لە قسەی یەکتر بێ. فەیتوونەکە بە شەقامێکی دیکەدا بایدایەوە، سەنگفەڕشەکە کۆتایی هات و گەیشتنە ڕێگایەکی خاکی. فەیتوونەوان بە دەستی ئاماژەی بە دەستەیەک گوندنشین کرد کە تەور و مشار و تەشوێیان پێبوو و بارگەوبنەیان لە کوڵ نابوو.

- گەورەم! بڕوانە چۆن قەوماوە. هەموو بارگەوبنەیان هەڵگرتووە و ڕوو لە شار دەکەن.

ـ هەمیشە هەر وابووە، خۆ شتێکی تازە نییە.

ـ نا، ئەمساڵ زۆر تر بووە. لادێیی ڕژاونەتە شارەکانەوە و لە کارگە و کارخانەکان خەریکی کارن. خاوەنکارەکانیش وەک ئاژەڵ چاویان لێدەکەن و لە گەلیان دەجووڵێنەوە. هاتنی ئەوانە بۆ شار بەڵایەکی گەورەیە. کەس جێگا و ڕێگای نییە و قاتوقڕی پەیدا بووە.

هۆکاری ئەو بارودۆخە چییە؟

ـ حەشیمەت زیادی کردووە.

ـ ئەوانە بۆ لە گوندەکەی خۆیان نامێننەوە؟

ـ لە گوند کار نییە. ئەو چارەڕەشانەش خۆ زەویوزاریان نییە.

قسەکەی کابرای فەیتوونەوان وەک تیر لە دڵی نۆخلیدۆڤ چەقی. وەک ئەوەی خوێ لە برینی بپرژێنن. لەگەڵ کابرای فەیتوونەوان لە قسەگیران. داوای لێکرد باسی خۆی بکات، کە بۆ چی گوندی بەجێهێشتووە و ڕووی لە شار کردووە؟

ـ من و باوک و دایک و برایەکم بووین. برایەکی دیکەشم سەربازە. لەو کاتەوە من هاتووم بۆ شار، ئەوان لەوێ ماونەتەوە و خەریکی کشتوکاڵن؛ بەڵام بۆ نانی شەوێ داماون. ئەو برایەشم کە لە گوند ماوەتەوە خەریکە دەچێ بۆ مۆسکۆ.

ــ زەوییەکتان بە ئیجارە بگرتایە و خەریکی گشتوکاڵ بووایەن باشترنەبوو؟

ـ لە کێی بە ئیجارە بگرین؟ ئاغاکانی قەدیم ئەوی بوویان ئاشتەبایان نەماوە. تاقمێک بازرگان و ساماندار هاتوون ئەوی زەویوزارە کڕیویانە. ئەوانیش زەوی بە هیچ کەس نادەن بە ئیجارە؛ کریکار و سەپان دەگرن و خۆیان کاروبارەکان بەرێوە دەبەن. لە گوندی ئێمە کابرایەکی فەڕەنسی

هـاتووه، تەواوی زەوییەكانی لە ئاغا كڕیوە و گەزێك زەوی بە ئیجارە نـادا. بەزەیشی بە سەغیر و كەبیردا نایە.

ـ ئەو كابرا فەڕەنسییە ناوی چییە؟

ـ ناوی دۆفارە. ڕەنگە بیستبێتت، كڵاو پرچ بۆ ئەكتەرەكانی شـانۆ دروسـت دەكـات. كـارەكەی گەشـەی سـەندووە. سـامانەكەی خسـتۆتە كـار و مڵـك و سـامانێكی زۆری پـێكەوە نـاوە؛ گونـدەكەی ئێمەشـی كڕیـوە. ئـێمە ئێسـتا كەوتـووینەتە داوی ئەو كڵاوسـازە فەڕەنسـییەوە. خـۆی پیـاوێكی خـراپ نییە. ژنەكەی ڕووسـییە و هەمـوو كاروبارەكـان لە دەسـتی ئەودایە. دێـڵە سـەگێكە دەستی شـەیتان لە پشـتەوە دەبەسـتێ. ئـێمەی گوندنشـین دەچەوسـێنێتەوە و دەسـتڕەنجەكانمان ڕادەمـاڵێ، شـەیتانێكە هـیچ كەس بەنـی بانـادا... وادیـارە گەیشـتین؛ لە كـوێ ڕایگـرم؟ لە نزیـك دەرگـای چـوونە ژوورەوەی زینـدان ڕاوەستان قەدەغەیە!

# سێزدە

دڵـی ڕێـك دەگوشـرا و ترسـێكی تێشـكا بـوو. نەیـدەزانی ماسـلۆڤا چـۆنی لەگەڵ بەرەوڕوو دەبێ. ئەوەی لە ڕۆحی بەندییەكان و ئەو شـوێنە داخـراوەدا دەگەڕا، بەلایەوە زۆر سـامناك و ڕازاوی بـوو. قـامكی بە زەنگـی دەرگـا گەورەكەدا نا. پاسـەوانێك دەربیجەكەی كردەوە. نۆخلیدۆڤ گوتی دەیـهەوێ ماسلۆڤا ببینێ. پاسەوان ڕۆیشت و هاتەوە و پێی ڕاگەیاند كە ماسلۆڤا چەند ڕۆژە لە نەخۆشخانە كار دەكا. چـوو بـۆ نەخۆشـخانە. پیرەپیـاوێكی وردیلە لە بەر دەرگاكە بـوو، نۆخلیدۆڤی ڕێنوێنی كرد بۆ بەشـی منداڵان. بۆنی ئەسـید

فینیک وڵاتی داگرتبوو. لە داڵانەکە تووشی پزیشکێکی گەنج بوو، بەشێوەیەکی وشک و فەرمی لە کۆنت نۆخلیدۆڤی پرسی چ کارێکی هەیە؟ ئەم پزیشکە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بەندییەکان باش بوو، بەردەوام لەگەڵ بەڕێوەبەران و فەرمانبەرانی نەخۆشخانە لە کێشەدا بوو. کاتێک نۆخلیدۆڤ گوتی دەیهەوێ چاوی بە ژنێک بکەوێ، پێی وابوو لە لایەن بەڕێوەبەرەوە، هاتووە و بە شێوەی نایاسایی دەیهەوێ ملاقات بکات. نێو چاوانی تێک نا و گوتی:

ـ لێرە ژنی نەخۆشمان نییە؛ ئێرە بەشی منداڵانە.

ـ دەزانم. من کارم بە ژنێکی بەندییە، دەڵێن لێرە کار دەکا.

ـ دوو ژنی بەندی لەم بەشە کار دەکەن، کامیانت دەوێ؟

ـ ناوی ماسلۆڤایە. من بە دوای پەروەندەکەی ئەوەوەم. سبەینێ دەچم بۆ پترزبۆرگ، دەمهەوێ دادنامەی پێدا چوونەوەی حوکمەکەی بۆ دیوانی باڵا بەرز بکەمەوە. هەر وەها وێنەیەکیشم پێیە دەمهەوێ پیشانی بدەم.

نۆخلیدۆڤ پاکەتێکی لە گیرفانی دەرهێنا و وێنەکەی پیشانی دوکتۆردا. دوکتۆر دڵی نەرم بوو.

ـ باشە،کێشەیەک نییە.

بە پیرێژنێکی بەرهەڵبێنە سپیی گوت ماسلۆڤا بانگ بکات. کۆنت سپاسی لێکرد و لێی پرسی لە ماسلۆڤا ڕازییە یان نا؟

ـ خراپ نییە. کارەکانی بە باشی بەڕێوە دەبا. بەپێی ئەو پێشینەی هەیەتی، دەکرێ بڵێین زۆر زەحمەت دەکێشێ... وادیارە ماسلۆڤا هات. بەڵێ، خۆیەتی.

ماسلۆڤا لەگەڵ پەرستارە پیرەکە بوو. بەرهەڵبێنەیەکی سپیی لە سەر جلە ڕێڕێکانی بەستبوو، لەچکەیەکیشی لە سەر و قژی پێچابوو. کە چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوت سوور هەڵگەڕا و بێ ئیختیار ڕاوەستا. سەری داخست و لە ناکاو وەک ئەوەی وەخۆ هاتبێتەوە بە هەنگاوی ورد و خێرا هاتە بەرەوە.

دەستی هێنایە پێشێ و تەوقەی لەگەڵ کۆنت کرد. سوورتر هەڵگەڕا بوو. لەو ڕۆژەوە بە توورەیی نۆخلیدۆڤی جێهێشتبوو، ئیتر چاویان بە یەک نەکەوتبوو. نۆخلیدۆڤ سەرەڕای ئەوەی لە ڕواڵەتی هێمنی ماسلۆڤادا ڕق و بێزاریی بەدی دەکرد، بۆی باس کرد کە سبەینێ دەچێ بۆ پترزبۆرگ و وێنەیەکی ئەو سەردەمەشی دۆزیوەتەوە.

ـ ئەم وێنەیەم لە نێو سندووقی پوورەکانمدا دۆزیەوە؛ ڕەنگە حەز بە دیتنی بکەی.

ماسلۆڤا بە چاوە شیرین خێلەکەی تێی ڕاما. دەیویست شتێک بڵێ؛ بەڵام وشەی گونجاوی نەدەدۆزیەوە. وێنەکەی لێوەرگرت و خستییە گیرفانی بەرهەڵبێنەکەیەوە.

ـ لە گوندی پانۆڤ چاوم بە پوورت کەوت.

دیار بوو ئەو هەواڵە بۆ ماسلۆڤا گرینگ نییە.

ـ کەوایە ئەوت دۆزییەوە!

ـ لێرە ئاسوودەی؟

ـ خراپ نییە، ئاسوودەم.

ـ زۆر ماندوو نابی؟ کاروبارتان زۆر نییە؟

ـ زۆر نییە، بەڵام هێشتا خووم پێ نەگرتووە.

ـ من زۆر خۆشحاڵم کە ئێوە لێرەن؛ هەرچییەک بێ لەوێ باشترە.

ـ لەوێ؟

ـ مەبەستم بەندیخانەیە.

ـ ئێرە کوێی لەوێ باشترە؟

ـ وێدەچی ئەو کەسانەی لێرەن باشتر بن؛ لەگەڵ ئەوانەی ئەوێ جیاوازن.

ـ بەندیخانەش مرۆڤی باشی لێیە.

ـ ئەهـا، پەروەنـدەکەی مەنشـۆڤ، ئەو دایـک و کـوڕە، بـۆ دادگـای پێـدا چوونەوە بەڕێکراوە؛ ڕەنگە بەم زووانە ئازاد بکرێن.

ـ بریا زوو ئازاد بووایەن. ئەو پیرێژنە زۆر ژنێکی باش و دڵسۆزە.

نۆخلیدۆڤ دەیویست شتێک بڵێ ماسلۆڤا دڵی پێی خۆش بێ.

ـ سـبەێنی وەڕێ دەکەوم. لە پترزبـۆرگ بڕیـار وایە پەروەنـدەکەت شـارۆ بکرێ. هیوادارم بڕیارەکەی دادگا هەڵوەشێتەوە.

ـ هەڵوەشێتەوە یان هەڵنەوەشێتەوە بەلامەوە گرنگ نییە.

ـ چۆن گرنگ نییە؟

ـ هەروایە، بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە.

ماسـلۆڤا چـاوێکی خێـرای لە نۆخلیـدۆڤ کـرد. نۆخلیـدۆڤ پێـی وابـوو ئەو ڕوانینـەی ماسـلۆڤا مەبەسـتێکی لە پشـتەوەیە. لە دڵـی خۆیـدا گـوتی: «ڕەنـگە بیهەوێ تێبگـا وەڵامـی ڕەت کـردنەوەی ژیـانی هـاوبەش چ شـوێنێکی لە سـەر داناوە.

ـ پێم سەیرە هیچ شتێک بەلای ئێوەوە گرنگ نییە. دەنا بـۆمن زۆرگـرنگە و نـاتوانم پەرۆش نەبـم، بە هەمـوو توانـامەوە هەوڵ دەدەم نەتـان نێـرن بـۆ تـاراوگە و لە بەندیخانە ئازاد کـرێن. مـن هەروا لە سـەر قسـە و بەڵێنـی خـۆم سوورم .

ماسلۆڤا چاوە ڕەشـەکانی لە کۆنت بڕی. تیشکی ڕوونـاکییەک لە دڵـی گەڕا بـوو؛ ئەگەرچـی هەسـتی دەروونـی لە سـەر ڕوخسـاری بە ڕوونـی ڕەنگـی دابۆوە، بەڵام زمانی شتێکی دیکەی دەگوت:

ـ ئەو قسانە هیچ کـاریگەرییەکی نییە؛ هەمـوو شـتێکم گـوتووە و قسـەیەکی تـازەم بـۆ کـوتن پـێ نییە. منـداڵێک لە دوورەوە هـاواری دەکـرد. ماسـلۆڤا لە تاوی منداڵەکە هەستا سەر پێ.

ـ بانگم دەکەن، دەبێ بڕۆم.

ـ باشە، بڕۆ؛ خودا حافیز.

نۆخلیدۆڤ دەستی بردە پێشێ. ماسلۆڤا وای نواند نەیدیوە و بە هەنگاوی خێرا دوور کەوتەوە. نۆخلیدۆڤ دیسان لەگەڵ کۆمەڵێک پرسیاری بێ وەڵام بەرەوڕوو بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «لە چ حاڵێکدایە؟ چۆن بیر دەکاتەوە؟ چ هەستێکی هەیە؟ دەیهەوێ تاقیم بکاتەوە یان نایهەوێ لە تاوانم خۆش بێ؟ ناتوانێ هەستی خۆی بۆ من دەربڕێ یان نایهەوێ؟ بیروڕای سەبارەت بە من گۆڕاوە یان هەروا ڕقی لە دڵدایە؟» لەگەڵ ئەوەشدا، هەستی دەکرد ماسلۆڤا گۆڕاوە. بۆتە مرۆڤێکی تر. لەگەڵ هەست و بیرێکی تر کەوتۆتە کێشەوە. هەر ئەوەش هیوای پێدەبەخشێ و ڕۆح و دڵیانی لە یەک نزیک دەکردەوە.

ماسلۆڤا چوو بۆ خەوگەی منداڵە نەخۆشەکان. ژوورەکە هەشت تەختی تێدا بوو. ماسلۆڤا دەیویست تەختەکان ڕێکوپێک بکا، لاقی هەڵخلیسکا و سەرەنگرێ بوو، خەریک بوو بە دەمەوە بکەوێ بە زەویدا. کوڕیژگەیەکی سەر پێچراو، دەستی کرد بە پێکەنین. قاقای دەکێشا. ماسلۆڤا کە هیچی لە دەست نەدەهات، لە سەر لێواری تەختەکە دانیشت و دەستی کرد بە پێکەنین. پێکەنین تەنەوەی کردە نێو منداڵەکان و هەموویان پێکەوە قاقایان دەکێشا. پەرستاری پیر بە هەڵەداوان خۆی کرد بە نێو ژوورەکەدا و گوڕاندی بەسەر ماسلۆڤادا:

ـ ئەو قەرەچی ئوینە چییە وەرێت خستووە؟ پێت وایە ئێرەش ئەوێیە جلّف بازاڕی وەڕێ بخەی؟ بڕۆ خۆراکی منداڵەکان بێنە. ئەو ڕۆژە چەند جار وێنەکەی لە گیرفانی بەروانکەکەی دەرهێنا و چاوی لێکرد. شەو بەسەردا هات و دوای تەواو کردنی کارەکانی چوو بۆ ژوورەکەی خۆی.

هــاوژوورەکەی هێشــتا نەهــاتبۆوە. بە دەرفەتــی زانــی و دیســان وێــنەکەی دەرهێنا؛ بە وردی چاوی لێکرد، هەر تاوێ چاوی لە لایەکی وێنە دەکرد و لە چکۆڵەترین شتەکان ورد دەبۆوە. دەموچاوەکان، جلوبەرگەکانیان، قاڵدەمەی بەر هەیوانەکە و دارودیواری ماڵەکە. لەو وێنەیەدا زیاتر لە هەموو شتێک سەرنجی خۆی دەدا؛ چاوی لە جوانی و شۆخوشەنگی و چین چینی کەزیە ڕەشەکەی خۆی دەبڕی و وەها کەوتبووە گۆمی بیر و خەیاڵەوە، نەیزانی ماوەیەک هاوژوورەکەی هاتۆتەوە. هاوژوورەکەی ژنێکی قەڵەوە بوو،هاتبوو لە پشت سەری ڕاوەستا بوو، چاوی لە وێنەکەی دەستی ماسلۆڤا دەکرد.

ـ ئەم وێنەیە ئەو پیاوە پێی دای کە هاتبوو بۆ سەردانت؟ ئەوە تۆی؟ باوەڕ ناکەم تۆ بی!

ماسلۆڤا زەردەیەکی گرت.

- بەڵێ، ئەوە منم.

- ئەمەش ئەو پیاوەیە؛ ئەی ئەوانە کامیان دایکییەتی؟

- ئەوانە پووری ئەون. باوەڕ ناکەی ئەوە وێنەی من بێ؟

- هیچ کوێی لە تۆ ناچێ. دەموچاوت بە تەواوی گۆڕاوە. ئەم وێنەیە دەبێ هی دە ساڵ لەمەوبەر بێ، وایە؟

- تێپەڕینی ساڵ زۆر گرینگ نییە؛ ئەوەی مرۆڤ پیر دەکا ژیانی تاڵ و پڕ لە چەرمەسەرییە.

خەمێک دڵی داگرت. کتوپڕ دڵێ ڕێک گوشرا و گرژ بوو، هاوژوورەکەی لە پەستا پرسیاری لێدەکرد و دەستی هەڵنەدەگرت.

- بەڵام لەوێ... لەو ماڵە خۆشت ڕادەبوارد؛ زۆریشتان کەیف کردووە.

- خۆشی چی و کەیفی چی؟! زۆر لە بەندیخانە ناخۆشتر بوو.

- چۆن؟

ـ لە سەعات هەشتی شەوەوە هەتا چواری بەیانی گرفتار بووین... ئەویش هەموو ڕۆژێک و هەموو شەوێک.

ـ ئەی بۆچی لەوێ مابوویەوە؟ بۆ لەوێ نەدەهاتیە دەرێ؟

ـ مەگین دەتوانی لەوێ بێیتە دەرێ؟ حەز دەکەی بەڵام ناتوانی. ئیتر هەتا بینەقاقا تێچەقیوی، چۆن دێیتە دەرێ، بێیتە دەرێش ڕوو لە کوێ دەکەی؟

ماسلۆڤا بە پەلە هەستا سەرپێ. وێنەکەی خستە نێو چەکمەجەی مێزەکەیەوە و لە ژوورەکە هاتە دەرێ. چاوی پڕ بووبوو لە فرمێسک. ئەو وێنەیە دنیای ڕابردووی هێنابۆوە بەر چاوی. شادی و ئاواتەکانی ئەو سەردەمەی وەبیر دەهاتەوە. چەندەی ئارەزوو لە دڵدا کەڵەکە کردبوو. قسەکانی هاوژوورەکەی ژیانی بەستۆکەخانەی وەبیر هێنا بۆوە. لەو ساڵانەدا چەندەی ئازار کێشا بوو، ئەو شەوەی وەبیر هاتەوە کە لەگەڵ خوێندکارێکی زانکۆ لە کەرنەڤاڵ بەڵێنی ژوانیان دانا بوو. ئەم خوێندکارە پێداگریی دەکرد لەو ژیانە دەست هەڵگرێ و زەماوەندی لەگەڵ بکات. ئەو شەوە کراسێکی ئەرخەوانیی پێسیر ئاوەڵای لە بەردابوو، بە قردێلەیەکی سوور قژە ڕەش و چین چینەکەی ڕازاندبۆوە؛ بەڵام نەیتوانی بچێت بۆ ژوانی ئەو گەنجە خوێندکارە. سەر خۆش بوو، دوای دوو دەور سەما و بەڕێکردنی مشتەرییەکانی هەستی کرد لە هەموو شتێک بێزار و وەڕەز بووە. هاوکارەکەی و کلارا و ژنێکی پیانۆژەن، پێکەوە بڕیاریان دا و هاتنە سەر ئەوەی دەست لەو کارە هەڵگرن و بڕۆن بەدوای ژیانێکی تردا، ڕاست لەو کاتەدا کە پێیان وابوو لێبڕاوانە ترین بڕیاری دنیایان داوە، لە داڵانە دەنگێکی مەستانە بەرز بۆوە و هەر کە هەستی کرد مشتەریی تازە هاتووە، کەمانچەژەن دەستی کرد بە ژەنین. هاوڕێکەی دیکەش لە پشت پیانۆکەی دانیشت و هەوایەکی زۆر شادی سەمای ڕووسیی دەست پێکرد. دوو مشتەری هاتنە ژووری، فراک لەبەر بوون و دیار بوو لە کۆڕێکی شەونشینی گەڕاونەتەوە. یەکەمیان پیاوێکی وردیلە بوو،

دەموچـاوی بە ئـارەقە خووسـابوو، نـزیکەرەی دەدا و دەمـی بـۆگەنی مەشـرووبی لێدەهات، هاتە پێشێ و باوەشی پێداکرد. ئەوی دیکەشیان قەڵەوەیەکی ڕیشـن بـوو، باوەشی لە کلارا وەرهێنا و نـزیکەی سـەعاتێک پێکەوە هەڵخـولان و سـەمایان کـرد. ئەو دوو پیاوە هاواریان دەکرد، مەشـرووبیان دەخـواردەوە و هـەر تـاوێ خۆیـان بـۆ باوەشـی یەکێکیـان دەکوتـا و... ئەم کـارە هەتـا سـاڵێک شـەو و ڕۆژی ژیـانی داگیـر کردین، دوای ئەوە بوو بە دوو ساڵ و سێ ساڵ و گۆڕانی بە سەردا نەهات.

هەستی دەکـرد ئەگەر کۆنـت نۆخلیـدۆڤ و ڕووداوی ئەو شـەوە نەبـووایە؛ تووشی ئەم بەدبەختییە نەدەبوو. ڕق و بێزاری دەرهەق بە نۆخلیـدۆڤ نـاخی داگرتبـوو. دەیویسـت دەسـتی پێـی بگـا و بە سـەریدا بنەڕێنـێ و جنێـو بـارانی بکـات. بە داخەوە بـوو بـۆ چـی هـەر ئەو ڕۆژە بە نۆخلیـدۆڤی نەگوتبـوو، زۆر باشی دەناسێ و ئیتر ناکەوێتە داوییەوە؛ ڕێگەشـی پێـی نـادا وەک چنگـی نـایە ڕۆحی ئاواش چنگ لە جەستەی گیر بکات.

بـۆ دامرکانـدنی گـڕی ئەو هەسـتە تـاڵ و بەژانە پێویسـتی بە مەشـرووبی قەوی هەبــوو. ئەگەر لە بەنــدیخانە بــووایە، تــۆبەی دەشــکاند، بەڵام لێــرە وەدەستی نەدەکەوت. یەکێک لە فەرمانبەرانی نەخۆشـخانە کە هەمیشـە چـاوی بە دوویەوە بــوو، دەیتــوانی مەشــرووبی بــۆ پەیــدا بکــات؛ بەڵام ماســلۆڤا نەیدەویســت ڕوو لە ئەو بنــێ . پێونــدی گــرتن لەگەڵ ئەو جــۆرە کەســانە مەترسـیدار بـوو. ناچـار مەوەیەک لە سـەر کورسـییەک دانیشـت و خەیـاڵ هەڵیگرت. کاتێک ماندوو بوو، گەڕایەوە بۆ خەوگەکەی و بێ ئەوەی وەڵامـی پرسـیارەکانی هـاوژوورەکەی بـداتەوە. مـاوەیەک خـزایە سـووچێک و تیروپـڕ گریا.

# چاردە

نۆخلیدۆڤ بۆ ئەنجام دانی چەند کار هاتبوو بۆ پترزبۆرگ. دەبوو دادنامەی پێداچوونەوەی حوکمەی ماسلۆڤا لە لقی دادی ئەنجومەنی سەنا بە جێیەک بگەیێنێ و داوای بەخشینی فێدۆزیا بە کومیسیۆنی بەخشین و لێبوردن بسپێرێ. لەگەڵ ئیدارەی گشتیی ئاسایش و ئیدارەی سێهەمی پۆلیس[٤٧] سەبارەت بە ئازاد بوونی شۆسترا قسە بکات و ئیجازەنامەیەک وەرگرێ بۆ دایکێک کە بتوانێ لە بەندیخانە چاوی بە کوڕەکەی بکەوێ. کێشەی ئەو گوندنشینانەش کە بە تاوانی خویندنەوەی ئینجیل زیندانی کرابوون و سزای دوورخرانەوە بۆ قەفقازیان بۆ بڕابۆوە، کاریگەرییەکی قورسی لە سەر ڕۆحی دانابوو، بۆیە بە پێویستی دەزانی بەرەڤانی لە ئەوانیش بکات و کارەکەیان یەکلایی بکاتەوە.

لەو ڕۆژەوە کە بە دڵمەندی لە ماڵی ماسلنیکۆڤ هاتە دەرێ و بە تایبەت دوای گەشت و گەڕان لە چەند گوند و بینینی بارودۆخی گوندنشینان، لە کۆڕ و ئەنجومەنی خانەدان و گەورە و ساماندارانی بێزار بوو، کە خۆشی لەو عێل

---

47 ـ ئەم ئیدارەیە بە پێ و شوێنی چالاکانی سیاسییەوە بوو و بەندییە سیاسییەکان لە ژێر چاوەدێریی ئەودا بوون و لە ساڵی 1835 هەتا 1870 دەستی دەکرد بە چالاکی و وابەستە بە وەزارەتی ناوخۆ بوو.

و عەشــیرەتانە بــوو. گەورە و گەورە گەورە و ســامانداران بێــزار بــوو کە خۆشی لەو عێل و عەشیرەتانە بوو. ئەو ئەنجومەنە چەندین میلیۆن کەسی تووشــی چارەڕەشــی و دامــاوی کردبــوو و تەنیــا لە بیــری ئاســوودەیی و ڕابواردنی کەمینەیەکی زاڵم و ستەمکاردا بوو. ئەم ئەنجومەنە ڕاستییەکانی نەدەدی و ئاوڕی لە ڕەنج و کوێرەوەریی چەندین میلیۆن مرۆڤ نەدەدایەوە و زوڵم و جینایەتی خۆیان هەست پێ نەدەکرد. ئیتر نۆخلیدۆڤ مەحاڵ بوو بە دڵــوداو بگەڕێــتەوە بــۆ ئەو ئەنجــومەنە و بچێــتەوە ســەر خولْقوخــووی پێشووی؛ بەڵام بیهەوێ و نەیهەوێ خزم و هاوڕێیانی لەو ئەنجومەنەدا بوون و جگە لەوەش بۆ ڕزگار کردنی ماسلۆڤا و پارێزگاری کردن لە بەندی و لێقەوماوانی داوی عەداڵەت، ناچار بوو یارمەتی لەو ئەنجومەنە بخوازێ و دەستی هاریکاری بۆ لای کەسانێک درێژ بکات کە لێیان بێزار بوو.

کاتێک گەیشتە پتربۆرگ، ناچار چوو بۆ ماڵی پووری، کۆنتس کاترین ئیڤانۆڤنا، کە مێردەکەی کۆنت چارسکی، یەکێک لە وەزیرانی پێشوو بوو. لەو شوێنە ئەشرافییە لەگەڵ هەموو شتێک هەستی بە نامۆیی دەکرد. بەڵام ئەگەر جانتا و کەلوپەلەکانی ببردایە بۆ هوتێل، پووری گلەیی لێدەکرد؛ جگە لەوەش دەیویست کەڵک لە ناسیاویی ئەو لەگەڵ گەورە پیاوانی دەسەڵات وەرگرێ. کۆنتس کاترین ئیڤانۆڤنا هەر لە سەرەتای دانیشتنەکەیاندا، دەیویست سەر لە کاروباری خوشکەزاکەی دەرهێنێ؛ گوتی:

ــ ســەبارەت بە تــۆ زۆر شــت کەوتــۆتە ســەر زار و زمانــان. دەنگــۆ بڵاوبۆتەوە دەڵێن دەتهەوێ پێ لە کەوشی هۆوارد[٤٨] بکەی و لە بەیانییەوە

---

48ـ Jon Howard (1780- 1726) مرۆڤدۆستێکی ئینگلیزی بوو سەبارەت بە بارودۆخی زیندانەکانی بریتانیا کتێبێکی نووسی و نووسینەکانی لە سەر بارودۆخی بەندییەکان

هەتــا شــەوێ بە دوای کــاری بەنــدی و تاوانبارەکــانەوەی. دەڵــێن لە بیــری چاکسازیی ڕەوشتی بەندی و خراپکارەکان دای.

ـ ســەبارەت بە مــن زۆریــان دەنگــۆ و هەراوهوریــا وەڕێخســتووە. تەنیــا یارمەتیی چەند زیندانیم داوە و هێشتا بە هیچ ئاکامێک نەگەیشتووم!

ــ حاشــــای لــــێ مەکە. کــــارێکی زۆر باشــــە. ســــەبارەت بە چیــــرۆکە ئەویندارییەکەشت هێندێ شتم بیستووە. حەز دەکەم هەموو شتێک لە زمانی خۆت ببیستم.

نۆخلیدۆڤ چیرۆکی ئەوینی خۆی و ماسلۆڤای لە نووکەوە بۆ پووری گێڕایەوە. کۆنتس کە هەمیشــە لەگەڵ پوورەکــانی نۆخلیــدۆڤ نــاکۆک بــوو، تەنــانەت ئێســتاش کە نەمــابوون، ددانــی خێــری پێدانەدەهێنان و دەیــدانە بەر پلاری توانج و تەشەر.

ــ خەتــای ئەو دوو خوشــکە هــیچ و پــووچە بــووە؛ ئەو دوو چەتیــوە دەمڕەشەی هیچوپووچە، ئەگەر هەر ئەو کاتە ئەو کچەیان بۆ بخواستبایەی و ژیــانی هاوبەشــیتان پێــک بهێنــایە، هەردووکتــان دەحەســانەوە و ئەم بارودۆخەش نەدەهاتە پێشێ. ئێستا پێم بڵێ بزانم؟ Ell est encore jolie[٤٩]

کۆنتس ئەگەرچی نزیکەی شەست ساڵی تەمەن بوو، هێشتا لەش ساغ و بەگــوڕ بــوو، زۆریــش ســوێر قســە و دەمــتەڕ و پــڕ جموجــۆڵ بــوو. قەڵەو و گۆشتن و پشت لێوی موویەکی زۆری لێ ڕوا بوو. نۆخلیدۆڤ زۆری پووری خۆشدەویســت و بە دیتنــی ئەو دڵــتەڕی و شــاد و بەگــوڕ بــوونەی پــووری، دەگەشایەوە.

---

کــاریگەرییەکی زۆری هەبــوو؛ مافناســانی ڕووســیا ســاڵی 1880 ســەدەمین ســاڵی لە دایــک بوونی ئەویان بەرز ڕاگرت.

49 ـ هێشتا هەر جوانە.

ـ پووریَ گیان! جوانی و ناشیرینی بۆ من جیاوازیی نییه؛ من دەمهەویَ یارمەتیی بدەم. ئەو بێچارەیە بەبیَ تاوان سزادراوە و من بوومە هۆی ئەو سزادرانەی و هۆکاری هەموو چارەڕەشییەکانی من بووم.

ـ بیستوومە دەتەویَ زەماوەندی لەگەڵ بکەی.

ـ حەز دەکەم بەڵام ئەو ڕازی نابیَ.

کۆنتس کاترین ئیڤانۆڤنا پەرۆش و واقوڕماو چاوی لە خوشکەزاکەی بڕی؛ قسەکانی گێژی کردبوو. بە حەپەساوی گوتی:

ـ کەوایە تۆ دەتەویَ ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێک بێنی؟ ئەوەی بیستوومە هەمووی ڕاستە؟

ـ ئەگەر ڕازی بیَ لەڕێوە زەماوەندی لەگەڵ دەکەم.

ـ دوای ئەو هەموو سوکوچرووکی و بیَ ئابڕووییيە، دیسان دەتهەویَ زەماوەندی لەگەڵ بکەی؟

ـ هۆکاری هەموو ئەو ئابڕووچوونانەش من بووم.

کۆنتس دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:

ـ تۆ بەڕاستی شێت و شووری؛ هەربۆیە خۆشم دەوێی... شێت و شوور. شێت و شوور!... هاوڕێیەکی ئێمە بە ناوی ئالین ناوەندێکی کردۆتەوە بۆ ئەو لەشفرۆشانەی تۆبەیان کردووە. جارێک چووم بۆ ئەو شوێنە؛ بەڕاستی ئەو ژنانە ترسناکن. کاتێک لەویَ گەڕامەوە، چەند سەعات دەست و پل و گیانم شۆردەوە. بەڵام ئالین جیاوازە. Corps et ame[50] خۆی بۆ ئەو کارە تەرخان کردووە و بە ڕاستی کەسێکی دڵسۆز و خۆبەخشە. ئەگەر حەز بکەی، ئەو ژنەش دەنێرم بۆ ئەو ناوەندەی ئالین.

---

50 ـ بە ڕۆح و بە جەستە.

ـ پووریَ گیان! ئەو ژنە ئازاد نییە. سزای زیندانی بە کاری قورسەوە بەسەردا سەپێندراوە. من بۆیە هاتووم یارمەتی لە ئێوە بخوازم.

ـ پەروەندەکەی ئێستا لە کوێیە؟

ـ لە لقی دادی مەجلیسی سەنایە.

ـ لیئۆنی ئامۆزام لە مەجلیسی سەنایە؛ بەرپرسی لقی نیشانە و شانازییەکانی بنەماڵەی خانەدانەکانە. بەڵام لە سەناتۆرەکان کەسێکی دەستڕۆیشتوو ناناسم. کەس نازانێ کێیان هێناوە و لەوێ دایاننناون. زۆربەیان بەرەگەز ئاڵمانین و ناوی سەیروسەمەرەیان هەیە. چەند ئیڤانۆڤ و سیمینۆڤ و نیکیتین لەگەڵیان تێکەڵ کراون بۆ ئەوەی ڕەچەڵەکیان هاوتەراز بن. بەڵام خەمت نەبێ، مێردەکەم ئەوانە دەناسێ؛ هەموو جۆرە کەسایەتییەک دەناسێ. دەبێ خۆت بۆی باس بکەی و تێی بگەیێنی. هەموو کەس لە قسەی من تێدەگا مێردەکەم نەبێ.

بۆ ساتێک هەردووکیان بێدەنگ بوون. پێشخزمەتێک هاتە ژووریَ و نامەیەکی لە سەر کەشەفێکی زێوین دانابوو، دای بە کۆنتس و ڕۆیشتەوە دەریَ.

ـ تۆ دەبێ چاوت بە ئالین بکەوێ. ئێستا کە هاتووی بۆ ئێرە، دەبێ لەگەڵ کەیس واتێریش قسە بکەی.

ـ کەیس واتێر کێیە؟

ـ ئەو شەو دێ بۆ ئێرە. دەبێ بیبینی. نازانی چەندە زمان پاراوە. هەر جینایەتکارێکی دڵڕەق گوێی لە قسەکانی بێ، لەبەر دەمیدا چۆک دادەدا و تۆبە دەکا.

سەیر بوو قسەکانی کۆنتس لەگەڵ کارەکانی ئەو یەکی نەدەگرتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا یەکێک لە پێڕەوانی ڕێبازێک بوو کە بۆ دیتنەوەی دینی

مەسیح نەک لە ڕەواڵەتدا بەڵکوو لە ناخ و سەفای ڕاستەقینەیدا هەوڵی دەدا و لەو سەردەمەدا ئەو ڕێبازە باوی ڕۆژ بوو، دارودیواری ژوورەکانی بە وێنە و خاچی جۆراوجۆر ڕازاند بۆوە و بەردەوام سەردانی کلیسای دەکرد و ڕێورەسمە ئاینییەکانی بە وەسواسەوە ئەنجام دەدا؛ لە حاڵێکدا پێرەوانی ئەو ڕێبازە بڕوایان بە وێنە و خاچ نەبوو و دژی ئەو تەشریفاتە ڕواڵەتییانەی ئایینی مەسیح بوون. کەیس واتێریش یەکێک لە بانگەشەکارانی ئەو جۆرە بیرۆکەیە بوو.

ـ ئەو ژنە گوێی لە قسەکانی کەیس واتێر بێ، بە تەواوی دەگۆڕێ. خۆشت دەبێ گوێی بۆ ڕاگری، مرۆڤێکی کەم وێنەیە.

ـ پووری گیان! حەز بە دیتنی ئەو جۆرە مرۆڤانە ناکەم.

ـ ئەگەر بیبینی، بڕوات دەگۆڕێ.

ـ تکایەکی دیکەشم هەیە، ئەویش سەبارەت بە بەندییەکی قەڵای پێتر- و- پۆل ە.

ـ بارۆن کریگسمۆت فەرماندەری ئەوێیە. نامەیەکی بۆ دەنوسم کارەکەت بۆ جێبەجێ دەکا. خۆشت دەبێ بیناسی. یەکێک لە دۆستانی باوکت بووە. زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ بانگ کردنی ڕۆح ڕادەبوێری و لەگەڵ تاقمێک کۆڕێکییان هەیە؛ بەڵام گرنیگ نییە. چ داواکارییەکت لێی هەیە؟

ــ ئیجازە نامەیەکم دەوێ بۆ دایکێک بۆ ئەوەی بتوانێ چاوی بە جگەرگۆشەکەی بکەوێ. بەڵام دەڵێن ئەو جۆرە ئیجازانە بە دەست چرۆیانکسی یە.

ــ حەز بە چارەی چرۆیانسکی ناکەم؛ بەڵام لەگەڵ ماریەتی ژنی دەستەخوشکین.

ـ تکایەکی دیکەشم هەیە؛ چەند مانگە ژنێکیان بەند کردووە، بێ ئەوەی هۆکاری گیرانەکەی مەعلووم بێ.

ــ تۆ ئەو ژنە ڕوو هەڵماڵدراوانە ناناسی. حەتمەن خۆی دەزانێ چ شاکارێکی خولقاندووە. هیچ کەس لە خۆڕا ناگیرێ.

ـ هێشتا دەرنەکەوتووە تاوانی چی بووە، بەڵام دەزانم ئازار دەکێشێ. خۆ ئێوە کەسێکی مەسیحین و ئیمانتان بە ئینجیل هەیە، نابێ لە هەمبەر ڕەنج و ئازاری خەڵکدا کەمتەرخەم بن.

ـ بڕوادار بوون بە ئینجیل لەگەڵ ئەو شتەی من باسی دەکەم پێکەوە ناگونجێن. ئینجیل بە ڕێی خۆی و دوژمنایەتی لەگەڵ خراپکاران بە جێی خۆی. من نەیاری ئەو نیهیلیستانەم[51]؛ بەتایبەت چاوم بەرایی نادا ئەو نیهیلیستە ڕووهەڵماڵدراوانە ببینم!

ـ بۆ چاوت بەرایی نادا بیانبینی؟

ـ دوای ڕووداوی یەکەمی[52] مارس حەز ناکەم ناویشیان ببیستم.

ـ بەڵام هەموو نیهیلیستەکان لەو کارەدا دەستیان نەبوو.

ـ چ جیاوازییەکی هەیە. ئەم ژنە گەوج و کاڵفامانە بۆ چی خۆ لەو کارانە هەڵدەقوتێنن. بۆ چی دەیانەوێ دەرسی هەموو خەڵکی دادەن؟

ـ قەستیان دەرس دادانی خەڵک نییە؛ دەیانهەوێ یارمەتیی خەڵک بدەن.

ـ خەڵک پێویستی بە یارمەتیی ئەوان نییە.

---

51. Nihiliste لە ڕووسیا ماوەیەک شۆڕشگێڕان و دێموکڕاتەکانیان بە نیهیلیست دەزانی چونکە دژایەتییان لەگەڵ سیستەمی کۆنی کۆمەڵایەتی و کۆنەپەرەستی دەکرد. بەڵام نەیارەکان ئەوانیان بە پووچ گەرا و ئاژاوەگێڕ لەقەڵەم دەدا.

52 ـ ئەو ڕۆژەی کە ئەلکساندری دووهەم(1881–1818) بە دەستی نیهیلیستەکان کوژرا.

خۆشەویستی و دڵسۆزیی کۆنتس بووبووە هۆی ئەوەی نۆخلیدۆڤ پریسکەی دڵی خۆی بۆ بکاتەوە و بیرۆکە و بیروباوەڕەکانی خۆی بۆ بدرکێنێ و ڕقی هەستێنێ.

- پووریێ گیان! خەڵکی قوڕیان بەسەردا کراوە. چەند ڕۆژ لەمەو بەر لە گوند بووم. بە چاوی خۆم دیتم وەرزێڕەکان چۆن ئارەق دەڕێژن و شەوانەش بە بێ شێو سەردەنێنەوە؛ لە حاڵێکدا ئێمە و مانان هەتا بینەقاقا لە ناز و نێعمەتداین و بە دڵی خۆمان ڕایدەبوێرین.

- تۆ دەتەوی منیش لە بەیانییەوە هەتا شەوێ ڕەنج بکێشم و بە نانی مەمرمەژی بەڕێ بچم؟

- من ئەوە ناڵێم؛ دەڵێم هەموومان دەبێ زەحمەت بکێشین و تێر بخۆین و ئاسوودە بژیین.

- ڕۆڵە گیان، کوڕی خۆم! خەریکی بە جێیەکی ناسک دەگەی و بۆت بە داخەوەم!

- بۆ پووریێ گیان؟

هاتنەوەی کۆنت چارسکی، مێردی پوورە کاترین ئیڤانۆڤنا، قسەکانی پێ بڕین. کۆنت چارسکی پیاوێکی قەویقۆڵ و تێکسمڕاو بوو، ڕیشی تیفتیفە دابوو و بۆنی عەتری ڕۆژەڕێیەک دەڕۆیشت. نێوچاوانی ژنەکەی ماچ کرد و دەستومشتاخ و ماچوموچی لەگەڵ نۆخلیدۆڤ کرد؛ کۆنتس بە دەم شیلەبزەیەکەوە دەستی کرد بە دەردەڵ کردن:

- ئەیەڕۆ پیاوەکە! نازانی خوشکەزاکەم قسەی چۆن دەکا. پێم دەڵی بەم تەمەنەوە بچم لە قەراغ چۆمی جلوبەرگ بشۆم و تەنیا نان و پەتاتە بخۆم؛ بە جارێ لەونی لێ گۆڕاوە، بەڵام قەیدێ ناکا. هەر کارێکی بوو بۆی جێبەجێ

بکە... ئەریٚ بیستووتە کامنسکایا باری دروونیی زۆر خراپە؛ دەستیان لیٚ داشتووە؟ دەبیٚ بچی بۆ سەردانی.

- بە ڕاستی جێی داخە.

- بچن پێکەوە قسەی خۆتان بکەن. منیش دەبیٚ چەند نامە بنووسم. سەرەتا داواکارییەکە بۆ ماریت دەنووسم.

- زۆر سپاس پووریٚ گیان.

- جێگای ناوی ئەو کوڵکەی سەر بە خوێنە سپی دەهێڵمەوە خۆت بینووسە. ماریت خۆی داوا لە مێردەکەی دەکا، کارەکانت بۆ ڕاپەڕێنی، خەمت نەبیٚ؛ با پێت وانەبیٚ من ژنێکی ناجسنم. هەر چییەک بیٚ ئێمە لەوانە باشترین کە خۆشت دەوێن. خودا هەموویان بێنێتە سەر ڕێگای ڕاست.

نۆخلیدۆڤ و کۆنت چارسکی چۆونە ژوورەکەی تەنیشت.

# پازدە

کۆنت چارسکی یەکێک لە کەسایەتییە دەستڕۆیشتووەکانی وڵات بوو، باوەڕێکی قورس و قایمیشی هەبوو. شێوەی ژیان و بیر و بڕوای لە تافی لاوییەوە هەتا ئەمڕۆ گۆڕانی بە سەردا نەهاتبوو. هەر ئەو جۆرەی یاسای سروشت دایناوە بێچووی باڵندە دەبیٚ کرم و کوللە بخۆن و وردە وردە کەچەڵە بن و پەڕۆپۆ دەرکەن و باڵ بگرن، ئەم بەڕێزەش بۆی بووبووە عادەت کە باشترین و خۆشترین چێشتی دەستاوی شارەزاترین ئاشپەزەکان بخوات، جوانترین و خۆشدرووترین جلوبەرگ لە بەر بکات، سواری ڕەسەنترین و خۆشبەزترین ئەسپ بێت، هەموو شتە باشەکانی دنیا لە بەر

دەستیدا بێ و هەتا ئەو جێیەی بۆی دەکرێ مووچە لە خەزانەی دەوڵەت وەرگرێ، بەر دەوام میدالیا و نیشانی شانازی وەرگرێ و لەگەڵ خانەدان و کەسانی پایە بەرز، ژن و پیاو هاموشۆ بکات. بەدەر لەو بازنەیەی ئەو خووی پێگرتبوو، ئەوەی لە دنیادا بوو لە ڕوانگەی ئەوەوە بێ کەڵک و بێ مانای دەنواند. کۆنت چل ساڵی تەمەنی لە تپرزبۆرگ ڕابوارد بوو و بە پێڕەوی کردن لەو فەلسەفە نەگۆڕە دەستی بە باڵاترین پلەوپایە ڕاگەیشتبوو، ماوەیەکیش لە سەر کورسیی وەزارەت پاڵی دابۆوە.

چەند شت بووبوونە هۆی سەرکەوتنی و بەرز بوونەوەی هەتا پلەی وەزارەت: یەکەم لە هەموو کەلێن و قوژبنەکانی کاری ئیداری شارەزا بوو. نامە ئیدارییەکانی بە شێوەی نووسیارانە و نارێکوپێک، بەڵام بە بێ هەڵە و پەڵە دەنووسی؛ دووهەم قەڵافەت و بەژن و باڵایەکی ڕێک و پێک و شکۆمەندی هەبوو. لە کاتی پێویستدا دەیتوانی فەرمان بە ژێردەستەکانی بدا و دەمارزلی بنوێنێ، شێوەی ڕوحسووکی و فەرمانبەری لە ژێر دەستەکانی فێر بێ و لە جێی خۆیدا لە بەردەم گەورە و باڵا دەستەکاندا خاکەڕایی لە خۆی نیشان بدات؛ سێهەم پابەندی ڕەوشت و شەرافەت نەبوو و دۆستی و دوژمنایەتیی لەگەڵ خەڵک هەمیشەیی نەبوو و بە پێی سیاسەتی ڕۆژ دەجووڵایەوە.

کۆنت وتە و ئاکاری خۆپارێزانە بوو و جگە لە قازانج و بەرژەوەندیی خۆی، بیری لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە. بۆ ئەو گرنیگ نەبوو کە وتە و ئاکاری لەگەڵ ڕەوشت و مرۆڤایەتی سازگارە یان زەبر لە ئیمپراتۆریی ڕوسیا و تەواوی دنیا و مرۆڤایەتی دەدا.

کاتێک گەیشتە پلەوپایەی وەزارەت، کەسوکار و ژێردەستەکانی و تەنانەت تاقمێک لە خەڵکیش پێیان وابوو ئەو کەسایەییەکی زۆر بەهێزی سیاسییە و

زۆر وریا و بە هۆشە. زۆری پێنەچوو هەمووان بۆیان دەرکەوت وانییە؛ نە لە کاروباری ڕیکخراوەییدا لێزان و شارەزایە و نە کارێکی نوێی کردووە و نە هەنگاوێکی بە قازانجی ژێردەستانی و خەڵک هەڵێناوەتەوە،بەرەبەرە وەها پەتەی کەوتە سەر ئاو تاقمێک لە کاربەدەستانی خاون پلەوپایە کەلە نامە نووسین و کاروباری پێچەڵاوپووچی ئیداریدا بەڕادەی ئەو شارەزا بوون، کەوتنە هەوڵ و تەقەلا و کەسێکی دیکەیان لە جێی دانا و ئەویان خانەنشین کرد. دەورانی وەزارەت بۆ ئەو تاقیکارییەک بوو کە سەرکەوتووانە لێی دەرنەچوو. دەرکەوت کەسایەتییەکی هەڵبژاردە و جیاواز نییە و ئەو پیاوە هێژایەش نییە کە خەڵکی بیریان لێدەکردەوە؛ زانیارییەکانیشی لە بابەت و وتاری بێ ناوەرۆکی ڕۆژنامە کۆنەپارێزەکانی تێنەدەپەڕاند. ئەگەر چی خۆشی تێگەیشتبوو تا چ ڕادەیەک لە کراسی خۆیدا پیاوە، بەڵام ئەوەش ڕەنگەدانەوەی لە سەر بیروباوەڕی نەبوو. هەموو ساڵێک گوژمەیەکی زۆری پارە لە سندووقی دەوڵەت وەردەگرت و وەک وەزیری خانشین کراو و خاوەن بیروڕا لە هەموو کاروبارە دەوڵەتی و کۆمیسیۆنەکاندا بەشداریی دەکرد، بۆ ئەوەش دەیان هەزار ڕۆبڵی وەردەگرت؛ لە ڕێورەسمەکاندا ئەوی نیشان و میداڵیای هەیبوو بە سینگیدا هەڵیدەواسی و شان بەشانی کەسایەتییە بەرجەستەکان ڕادەوەستا و ملی هەڵدێنا.

نۆخلیدۆڤ بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە و جەنابی کۆنت چارسکی هەر بەو قەڵافەتە جیددییەوە کە گوێی بۆ ڕاپۆرتی سەرۆکی دایرەکانی ژێر دەستی خۆی ڕادەگرت، گوێی بۆ ئەویش ڕاگرت، دوای قسەکانی نۆخلیدۆڤ، سەری لەقاند و گوتی دوو داواکاریی بۆ دەنووسێ؛ یەکەم داواکاری بڕیار بوو بۆ سەنا تۆر ڤۆڵڤ، ئەندامی لقی دیوانی باڵای وڵات لە ئەنجومەنی سەنا بنووسێ. قەڵەمی بە دەستەوە گرت و ڕووی لە نۆخلیدۆڤ کرد و گوتی:

ـ لە قسەی من دەرناچی؛ هەموو جۆرێک باسی دەکەن، بەڵام پیاوێکی باش و حیسابییە.

دووهەمین نامەش بڕیار بوو بۆ یەکێک لە ئەندامانی کۆمیسیۆنی سکالانامە بنووسێ. بە وردی گوێی بۆ کێشەکەی فیدۆزیا ڕاگرت کە بە تۆمەتی دەرمانداوکردنی مێردەکەی گیرابوو. نۆخلیدۆڤ گوتی دەیهەوێ نامەیەک لەو بارەیەوە بۆ شاژن بنووسێ. بەڵام کۆنت وای بە باش زانی ئەم ماجەرایە لە کۆمیسیۆنی سکالانامە باری ئاسایی خۆی ببڕێ، بەڵام ئەگەر دەرفەتێک هەڵکەوت خۆی بە عەرزی شاژنی دەگەیێنێ، یان لە یەکێک لە کۆڕەکانی ڕۆژی پێنجشەممەدا کە لە وەزارەتی دەربار پێک دێ، لە چەند کەسایەتیی دەستڕۆیشتوو یارمەتی وەردەگرێ.

سەعاتێک دواتر، نۆخلیدۆڤ دوو داوانامەکەی کۆنت و نامەیەکی لە پوورە کاترینی وەرگرت و لە کۆشکی کۆنت چارسکی هاتە دەرێ تاکوو وەدوای کاروبارەکانی خۆی بکەوێ.

لە بیری ئەوەدا بوو سەرەتا بچێت بۆ ماڵی ماریت کە لە منداڵییەوە دەیناسی و نامەکەی پووری بداتێ. بنەماڵەی ماریت ساماندار نەبوون بەڵام بە ڕەچەڵەک خانەدان بوون. وەک باسیان دەکرد مێردەکەی ئەو هەڵسوکەوتێکی توندوتیژی لەگەڵ چالاکانی سیاسی هەیە و ئەمجارەش دیداری ئەو جۆرە کەسانە بۆ نۆخلیدۆڤ زۆر تاڵ و پڕ ئازار بوو. دەچوو بۆ دیداری زاڵم تاکوو داوای یارمەتی بۆ مەزلوم بکات. کارەکەی ئەو بە مانای ئەوە بوو زوڵم بە کارێکی یاسایی دەزانێ، بەڵام تکا لە زاڵم دەکات لە بەر خاتری ئەو چاو پۆشی لە چەند مەزڵووم بکەن و کاریان بە سەریانەوە نەبێ، بەڵام هەر بەلایەک بە سەر ئەوانی دیکە دێنن گرنیگ نییە.

هەستێکی سەیر ڕۆحی داگرتبوو. هەستی بە شەرمەزاری و ناڕەزایەتی دەکرد. لە خۆی دەپرسی: «یانی بایەخی ئەوەی هەیە خۆم چکۆڵە بکەمەوە و بچم لە بەریان بپاڕێمەوە؟» وەڵامەکەشی ئەرێ بوو. چونکە ژنێکی نەخۆش کە لە سووچی زیندان ئازاری دەکێشا، بە یارمەتیی ئەو لەو بەڵایە ڕزگاری دەبوو.

کێشەیەکی تر کە بۆی هاتبووە پێشی ئەوە بوو کە ئەو تاقمە ستەمگەرە ئەویان لە خۆیان دەزانی و بە شێوەیەکی هاوڕێیانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرد، ترسی ئەوەشی بوو دیسان بیخەنە داوی خۆیانەوە و وای لێبکەن دەست لە دژایەتیی ئەوان هەڵگرێ و بگەڕێتەوە سەر دۆخەکەی پێشووی.

ماوەیەک بوو نەهاتبوو بۆ پترزبۆرگ و ئەمجارەیان پایتەخت لە بەر چاوی جیاواز بوو. ئەو پترزبۆرگەی جاران نەبوو. جاران پترزبۆرگ لە بەر چاوی شاد و بێ خەم و خەیاڵ و هەوەسبزوێن و پڕ هەیەجان بوو؛ هەموو شتێک لە بەر چاوی جوان و باش و پاقژی دەنواند. هێمنایەتی و ڕێکوپێکی پترزبۆرگی ستایش دەکرد؛ بەتایبەت ئاکاری خەڵکەکەی بە دڵ بوو کە گوێیان بە ڕەوشت و ئەخلاق نەدەدا و حەزیان دەکرد ئازاد و دڵخۆش بژین؛ بەڵام ئەمجارەیان بە چاوێکی تر لە پترزبۆرگی دەڕوانی.

سواری فەیتونێکی جوان و خاوێن و ڕێکوپێک بوو. فەیتوونەوان زۆر ژیر و بە ئەدەب بوو. لە سەر چوارڕێیان پاسەوانێک ڕاوەستا بوو، بە دەستەوانەی سپییەوە هێندە بە وردی و وریاییەوە فەرمانی دەدا، دەتگوت گرینگترین کاری دنیا ئەنجام دەدا. لە چوار ڕێیانەکە تێپەڕین و گەیشتنە کۆڵانێکی ئاوپڕژین کراو. لە هەر دوو بەری کۆڵانەکە بینای بەرز و ڕازاوە ڕیز بووبوون. ماڵی ماریت لە ئاخری کۆڵانەکە هەڵکەوتبوو.

فایتوونەکە لە نزیک دەرگای چوونە ژووریٚ ڕاوەستا. لە بەر قاڵدرمەکان فەیتوونێـــک بە دوو ئەســـپی ڕەســـەنەوە ڕاگیـــرا بـــوو. فـــایتوونەوان لە ئینگلیزییەکـان دەچـوو. قـژی بە هەر دوو بەری لاجانگیـدا هـاتبووە خـواری و نیـوەی دەموچـاوی داپۆشـیبوو. دەرگاوانێـک کە جلـوبەرگی ڕێکوپێـک و پـڕ زریـــقە و بـــریقەی لە بەردا بـــوو، دەرگـــاکەی بـــۆ نۆخلیـــدۆڤ کـــردەوە. لە سەرســـەرا پێشـــخزمەتێک بە جلـــوبەرگی کەلـــبەدوون کـــراو و قـــژی شـــانە کراوەوە، زۆر بە ئەدەبەوە ڕاوەستا بوو. بە ڕێزەوە چاوی لە نۆخلیدۆف کرد و گوتی:

ـ ژینراڵ کاتی نییە؛ خاتوونی ژینراڵیش ئەمڕۆ هیچ کەس وەرناگریٚ.

نۆخلیـدۆڤ ناسـنامەکەی لە گیرفـانی دەرهێنـا و دای بە پێشـخزمەتەکە، چووە پێشیٚ لە دەفتەری مێزەکەدا شتێک بنووسیٚ و واژۆی بکات کە هـاتووە بۆ دیدەنیی خاتوو ماریت؛ بەڵام پێش ئەوەی قەڵەم بەسـەر کاغەزەکەدا بێنیٚ، پێشـخزمەت بە پەلە چـووە پێشـیٚ و چرپانـدی بە گـوێی دەرگـاوانەکەدا و بە دەنگی بەرز بە فەیتوونەوانی گوت ئامادە بیٚ، لەو عەدوسـەتەدا، خاتوونێک لە قاڵدرمەکان هـاتە خـواریٚ و ڕەوت و ڕۆییـنەکەی تونـد و جڵفـانە بـوو، لەگەڵ ئەوەشـدا بەژن و بـاڵایەکی ڕێکـوپێکی نەبـوو. خـاتوون کڵاوێکـی گەورە و پەڕداری لە سـەر نـابوو، جلـوبەرگی ڕەشـی لەبەر کردبـوو و کەرکەیەکـی کـورتی لە ڕەنگـی جلەکـانی بەشـانیدا دابـوو. تـۆڕێکی ناسـکیش ڕوخسـاری داپۆشیبوو.

کاتێک ئەو خـانمە گەیشـتە نزیک نۆخلیدۆڤ، تـۆڕەکەی سـەر ڕوخسـاری لادا. دەموچاوی ناسک و چاوە گەش و بزەتێزاوەکانی وەدیارکەوت.

ـ کۆنت دیمیتری ئیڤانۆڤیچ ئەوە تۆی! چاکم ناسییەوە.

ـ سەیرە؛ تەنانەت ناو و ناسناوەکەشمت لەبیرماوە. خاتوون بە زمانی فەرەنسی گوتی:

ـ بەڵێ چۆن لەبیرم دەچێتەوە. من و خوشکم ئاشقی تۆ بووین... بەڵام زۆر بەداخەوە دەبێ بڕۆم. چەند خولەک وەرە سەرێ، قەیناکا درەنگتر دەڕۆم.

بەڵام کتوپڕ پەشیمان بۆوە و چاوی لە کاتژمێرە دیوارییەکە کرد.

ـ بەڵام نا... وەدرەنگ دەکەوم. دەبێ بچم بۆلای خاتوو کامنسکایا. دەبێ لە ڕێوڕەسمی پرسە و تازیەباریدا بەشداری بکەم.

ـ ئەو خاتوو کامنسکایایە کێیە؟

ـ خەبەرت نییە؟ کوڕەکەی لە دوئێلدا کوژراوە. تاقانە کوڕی خاتوو کامنسکایا بوو. بێچارە بارودۆخی ڕۆحیی زۆر خراپە. ناهەقی نییە، دایکە و جەرگی سووتاوە! سەیرە چۆن خەبەرت نییە!

ـ با؛ شتێکم بیستووە.

ـ دەبێ بڕۆم. سبەینێ وەرە یەکتر ببینین. یان ئەمشەوت پێ چۆنە؟

ـ ئەمشەو ناتوانم؛ هاتبووم داوای یارمەتییەکتان لێبکەم.

ـ یارمەتیی چی؟

نۆخلیدۆڤ پاکەتێکی لاکومۆر کراوی دایە دەستی.

ـ ئەو نامەیە بخوێنەوە؛ هەموو شتێکی تێدا نووسراوە.

ـ ئێستا تێگەیشتم. کۆنتس کاترین ئیڤانۆڤنا پێی وایە مێردەکەم لە قسەم دەرناچێ؛ بەڵام وانییە. من خۆ لە کارەکانی هەڵناقوتێنم. بەڵام لەبەر خاتری ئێوە و کۆنتس، ڕێساکان دەنێمە ژێر پێ. هەرکارێک بیڵێن بە سەر ئەنجامی دەدەم. ئێستا بە کورتی پێم بڵێ مەسەلەکە چییە؟

ـ کچێکی جحێڵ لە قەڵا بەند کراوە؛ نەخۆشە و بێ تاوانیشە.

- ناوی چییە؟
- لیدیا شۆستۆڤا، ناوی لە نامەکەدا نووسراوە.
- هەرچیم لە دەست بێ دریخی ناکەم.

پێکەوە لە دەرگاکە چوونە دەرێ. ماریت گورج و بە نەرمی سواری فەیتوونە ڕازاوەکە بوو کە لەبەر دەرگا چاوەڕوانی بوو. پێشخزمەتێک پێی لە سەر ڕکێفەکە دانا و ئاماژەی بە فەیتوونەوان کرد وەڕێ بکەوێ. ئەسپەکان بە زەبری قەمچیی فەیتوونەوان جوولان؛ بەڵام لە ناکاو ماریت بە نووکی چەترە هەتاوییەکەی لە شانی پێشخزمەتەکەی کوتا و بە ئاماژەی ئەو فەیتوونەکە ڕاوەستا. ماریت پەردەی دەربیجەکەی لادا و بە بزەیەکی شیرین و دلڕفێنەوە گوتی:

- حەتمەن وەرە بۆلام. ئەمجارە بە ئیشتیا باسی خۆمان دەکەین و گوێ بە کاروباری ئەموئەو نادەین.

دیسان پەردەکەی داوایەوە و بە ئاماژەی ئەو فەیتوونەکە وەڕێ کەوت. نۆخلیدۆڤ بۆ ڕێزگرتن کڵاوەکەی لە سەری داگرت. فەیتوونەکە دوور کەوتەوە و لە سەر سەنگفەڕشە پڕ لە کەندولەندەکە هەر جارێ بە لایەکدا خوارەکە و پێچەکەی دەدایە.

# شازده

پێکەنینی شیرین و هەوەس بزۆینی ماریت نۆخلیدۆڤی خستە بیر و خەیاڵەوە: «تازە لەو گێژاوە هاتوومەتە دەرێ، دەیهەوێ وەسوەسەم بکات و لەگەڵ ئەودا بکەومە گێژاوێکی دیکەوە.» دیسان تووشی خەم دوودڵی بوو و لە خۆی دەپرسی بۆچی دەبێ بچێت بۆ دیداری ئەو مرۆڤە هیچوپووچ و گەندەڵانە و لە بەریان بپارێتەوە؟ بەڵام دەشیزانی جگە لەوە چارەیەکی تری نییە.

بۆ ئەوەی کاتی بە فیڕۆ نەچێ و هاتوچۆکانی بێ ئاکام نەبێ، لە زەینی خۆیدا کارەکانی پترزبۆرگی تاوتوێ کرد و بڕیاری دا سەرەتا بچێت بۆ نووسینگەی ئەنجومەنی سەنا. نووسینگەکە لە تەلارێکی پڕشکودا بوو. فەرمانبەران دەورانەدەور ڕێکوپێک و بە ئەدەب دانیشتبوون. جلوبەرگی جوانیان لەبەر دابوو و بە جوانی وەڵامی پرسیارەکانیان دەدایەوە. بە نۆخلیدۆڤیان ڕاگەیاند سکاڵانامەکەی ماسلۆڤایان ناردووە بۆ سەناتۆر ڤۆلف، بۆ پێدا چوونەوە و بڕیار لەسەردان؛ یانی هەر ئەو کەسەی کە نۆخلیدۆڤ داوانامەکەی بۆ هێنا بوو؛ پێیان گوت وێناچی لە یەکەم دانیشتندا پێدا چوونەوەی بۆ بکری، بەڵام هەوڵی بۆ بدەی لەوانەیە لە دەستووری کاری چوارشەمەی داهاتوودا بگونجێندرێ.

لەگەڵ ئەوەشدا پرسوجۆی دەکرد بۆ ئەوەی زانیاریی زیاتر بە دەست بهێنێ، بۆی دەرکەوت لە هەموو جێیەک باس باسی دوئێل و کوژرانی کوڕە تاقانەکەی خاتوو کامنسکایایە. ئەو کوڕە گەنجە ئەفسەری ئەرتەش بوو، هێندێ جار دەچوو بۆ ڕیستۆرانێک کە ئەفسەری دیکەش دەهاتن و لە خواردنی خۆراک و مەشرووبدا زێدەڕەوییان دەکرد. چەند ڕۆژ لەمەوبەر یەکێک لە ئەفسەرەکان سەرخۆش دەبێ و سووکایەتی بەو لیوایە دەکات کە ئەو کوڕە گەنجە ئەفسەری ئەو بوو . ئەم کوڕە گەنجە بەرهەڵستی دەبێتەوە و دەمقڕە و کێشەکەیان بە جێیەک دەگا کە ئەفسەری وڕێنەچی و چەقەسرۆ زللەیەک لە ڕوومەتی ئەفسەرە گەنجەکە دەدا، دەمەقاڵێیان پەرەدەستێنی و ئەو دوو ئەفسەرە لە هەنتەشی چەند کەسی دیکەدا بڕیار دەدەن بۆ سبەینێ بەیانی بچن بۆ دوئێل و گوللەی ڕەقیب لە زگی ئەفسەری لاو دەدرێ و دوای دوو سەعات گیانی لە دەست دەدا. ئەگەر چی بکوژ و شایەدانی ئەو ڕووداوەیان قوڵبەست کردبوو و لە بەندیخانە زۆریان ئازار دابوون بەڵام دەنگۆ بڵاو بووبۆوە، لە دوو حەوتوو زیاتر لە بەندیخانەدا نابن و ئازادیان دەکەن.

نۆخلیدۆڤ لە نووسینگەی سەنا هاتە دەرێ و چوو بۆ کومیسیۆنی سکالانامە، بەڵکوو چاوی بە بارۆن ڤۆرۆبیڤ بکەوێ کە کەسێکی زۆر دەستڕۆیشتوو بوو و لە بینایەکی بەشکۆی دەوڵەتیدا نیشتەجێ بوو. لەوێ دەرگاوان و خزمەتکار کە زۆر بە توندی و ڕووهەڵماڵدراوی قسەیان دەکرد، نۆخلیدۆڤیان تێگەیاند کە چاوپێکەوتنی جەنابی بارۆن، تەنیا لە ڕۆژانی دیاریکراودا مەیسەر دەبێ و ئەمڕۆ چوون بۆ خزمەتی خاوەن شکۆ ئیمپراتۆری مەزن و سبەینێش بڕیارە ڕاپۆرتێکی گرینگ بۆ پێشکەش کردن بە جەنابی ئیمپراتۆر ئامادە بکات. هەر بۆیە لەو ڕۆژەدا بە هیوای

چاوپێکەوتنی جەنابی بارۆن نەبێ. نۆخلیدۆڤ ناچار بوو نامەکەی پووری بداتە دەست ئەوان کە بیدەنە دەست جەنابی بارۆن. لەوێ هاتە دەرێ و چوو بۆلای سەناتۆر ڤۆلڤ.

ڤۆلڤ تازە لە سەرمێزی ناشتایی هەستا بوو، بۆ هەرسکردنی خواردنەکەی لە نێو ژورەکەدا دەهات و دەچوو و جگەرەیەکی درێژی بە لێویەوە نابوو مژی لێدەدا. هەر لەو کاتە دا نۆخلیدۆڤ چووە ژوورەکەیەوە.

ولادێمیر ڤاسیلیڤیچ ڤۆلڤ، کەسایەتییەکی سیاسیی بە تەواو مانا بوو. خۆی لە هەموو کەسێک بە زیاتر دەزانی و لە سەرەوە چاوی لە خەڵکی دەکرد. ناوبانگی بە دروستکار و ماندوونەناس دەرکردبوو و بە هۆی ئەو خەسڵەتە بەرجەستەیەوە، توانیبووی پلەوپایەی گرنگی خۆی بپارێزێ. پێک هێنانی ژیانی هاوبەش لەگەڵ ژنێکی دەوڵەمەند لە باری گرفتی ماڵییەوە خاترجەمی کردبوو. هەموو ساڵێک هەزار ڕۆبڵی داهات هەبوو. ئەم کەسایەتییە سیاسییە لە ڕواڵەتدا هیچی کەم نەبوو. شانازی بە پاکی و ڕاستی خۆیەوە دەکرد و بەوە خۆی بە سەربەرز دەزانی کە بەرتیلی لە هیچ کەس وەرنەگرتووە؛ بەڵام بە هەزار بیانوو، خەرجی سەفەر و قەرەبووی ژیان و پاداش و دەستخۆشانەی لە سندووقی دەوڵەت وەردەگرت؛ ئەم جۆرە داهاتانەشی لە شیری دایکی بە حەڵاڵتر دەزانی.

لەو ساڵانەدا کە پارێزگاری بەشێک لە وڵاتی پۆڵۆنیا بوو، حوکمی لە سێدارەدان و ڕووخاندنی ماڵ و شاربەدەرکردن و داگیرکردنی ماڵ و سامانی سەدان بێ تاوانی دەرکردبوو کە تاوانیان تەنیا نیشتمان پەروەری و هۆگریی ئایین و داب و نەریتی باب و باپیران بوو.

هاوسەرەکەشی ژنێکی کولۆڵی چارەڕەش بوو. جەنابی سەناتۆر جگە لەوەی دەستی بەسەر ماڵ و سامانەکەیدا گرتبوو، بە فێڵ و دەهۆ ماڵی ژن

خوشکەکەشی داگیر کردبوو، ملکەکەی ئەوی فرۆشتبوو و تەواوی پارەکەی کردبووە حیسابی بانکی خۆیەوە. کچێکی هەبوو نەخۆشی ڕۆحی وای لێکردبوو ترسەنۆک و شەرمن و خەمناک لە سووچێک دادەنیشت. لەم دواییانەدا بۆ دەربازبوون لە دەست ئەو بارودۆخە، چووبووە ڕیزی هۆگرانی ئینجیلەوە و هێندێ جار دەچوو بۆ لای ئالین و کۆنتس کاترین ئیڤانۆڤنا.

کوڕێکی هەرزە و بەڕەڵلاشی هەبوو. لە تەمەنی پازدە ساڵییەوە ئارەق خواردن و ڕابواردن لەگەڵ کچانی دەست پێکردبوو، لە تەمەنی بیست ساڵیدا وازی لە خوێندن هێنا و هێندەی قەرز و قۆڵە هاتەپێ لەرزی خستە دڵی سەناتۆر. جەنابی سەناتۆر جارێک دووسەد و سی ڕۆبڵ و جارێکی دیکەش شەشسەد ڕۆبڵی قەرز بۆ دایەوە، بەڵام بەڵێنی لێ سەند ئەگەر دەست لە کارەکانی هەڵنەگرێ، لە ماڵێ وەدەری دەنێ. بەڵام کوڕە دەستی لەو کارانە هەڵنەگرت و دیسان هەزار ڕۆبڵی قەرز هاتە پێ، باوکی ناچار لە ماڵێ دەری کرد و پێی وابوو بەو شێوەیە کێشە و گرفتی بنەماڵەکەیان چارەسەر دەبێ؛ دوای ئەوە هیچ کەس نەیدەوێرا لای ئەو ناوی کوڕەکەی بێنێ.

سەناتۆر ڤۆلڤ بە تەوسەبزەیەکەوە نۆخلیدۆڤی وەرگرت و ئەمە شێوەی هەمیشەیی ئەو بوو. دەتگوت دەیهەوێ وا بنوێنێ لە هەموو کەس پایەبەرزترە و خۆی پێوە ڕادەنێ. هەروا لە نێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو و جگەرەی دەکێشا، داوانامەکەی لە نۆخلیدۆڤ وەرگرت و داوای لێکرد دانیشێ و لێی گەڕێ جەنابی سەناتۆر لە نێو ژوورەکەدا پیاسە بکات!

ــ هاتووم تکاتان لێبکەم پێدا چوونەوەی پەروەندەکەی ماسلۆڤا بخەنەپێشەوە بۆ ئەوەی زووتر چارەنووسی ڕوون بێتەوە و ئەگەر ناچارە بچێت بۆ سیبیریا، با زووتر خۆی ئامادە بکات.

سـەناتۆر هەروا بە نێـو ژوورەکەدا دەهـات و دەچـوو و بـۆنی جـگەرە و دووکەڵە شـینکەی قەف قەف لە دەمـی دەردەدا و چـاوی لە سـەر سـووتووی جگەرەکەی هەڵنەدەگرت. نەوەک داوەرێتە سەر زەوی.

ـ گوتت ناوی چییە؟

ـ ماسلۆڤا.

ـ بەڵێ. پەروەندەکەی لێرەیە. دڵنیابە ڕۆژی چوارشـەممە پێدا چوونەوەی بۆ دەکرێ.

ـ کەوایە دەتوانم پارێزەرەکەم لەو هەواڵە ئاگادار بکەم.

ـ یانی پارێزەریشت گرتووە؟ پێویست نییە. بەڵام قەیناکا، چۆنتان پێخۆشـە با وابێ.

ــ هۆکــاری هەڵوەشــاندنەوەی حــوکمەکە ڕەنــگە نــاتەواو بــێ. بەڵام پێداچوونەوەیەکی سـەرپێی دەریـدەخا کە بڕیـارەکە بە هـۆی هەڵەیەکـی زۆر ئاساییەوە بووە.

ـ گریمـان واش بێ، دیـوانی بـاڵای وڵات خـۆی لە چییەتیـی کێشـەکە نـادا. تەنیا کاری ئەوەیە بزانێ یاسا بە دروستی بەڕێوە چووە یان نا.

سـەناتۆر زیـاتر وریـایی نیشـان دەدا کە سـووتووی جگەرەکەی نەوەرێتە سەر زەوی و نۆخلیدۆڤ دەیویست کارەکە یەکلایی بکاتەوە.

ـ ئەم پەروەندەیە لایەنێکی جیاوازی هەیە.

ـ دۆستی بەڕێز! هەموو پەروەندەکان لایەنی جیاوازیان هەیە. خەمت نەبێ، ئێمە ئەوەی پێویست بێ ئەنجامی دەدەین.

ـ سـووتووی جگەرەکەی هێشـتا نەوەریبـوو بەڵام درزێکـی مەترسـیداری تێکەوتبوو. بۆیە جەنابی سەناتۆر ناچار بوو سووتووی جگەرەکەی بکاتە نێو تەپڵەکی سـەرمێزەکە و خـۆی لە چنگ ئەو هەمـوو وریـایی و پـارێزە نەجـات

بدا. ئیتر سەبارەت بە پەروەندەکەی ماسلۆڤا قسەیان نەمابوو. جەنابی سەناتۆر باسی کورە تاقانە و جوانەمەرگەکەی خاتوو کامنسکایای هێنایە گۆڕێ و باسی جەرگ سووتانی ئەو دایکە کولّۆلّەی کرد. سەبارەت بە خاتوو کۆنتس کاترین ئیڤانۆڤنا و لایەنگریی ئایینی ئەویش بە وریاییەوە برێکی قسە کرد. هەرچییەک بێ کەسایەتییەکی سیاسی و پیاوێکی پایەبەرز بوو، بۆیە دەبوو دلّی هەمووان ڕاگرێ.

نۆخلیدۆڤ هەستا سەرپێ برِوا؛ سەناتۆر گەورەیی خۆی نواند و گوتی:

- ڕۆژێک وەرە پێکەوە نانی نیوەڕۆ دەخۆین و زیاتر قسە دەکەین. ئەگەر حەزت لێیە، چوارشەممە وەرە تەکلیفی پەروەندەکەی ماسلۆڤاش ڕوون دەبێتەوە.

درەنگ بوو. نۆخلیدۆڤ ڕاست گەڕایەوە بۆ مالّی پووری.

## حەڤدە

سەعات حەوت و نیو لە مالّی کۆنتس شێویان خوارد و شێوازێکی تایبەتیان هەبوو کە بۆ نۆخلیدۆڤ شتێکی تازە بوو. پێشخزمەتەکان دەهاتن خواردنیان لە سەر مێزەکە دەچنی و دەڕۆیشتن. ئەو کاتە تێکردنی چێشت و پڕکردنی قاپ و دەورییەکان لە ئەستۆی پیاوان بوو. دوای تەواو بوونی دەوری یەکەمی خواردن، کۆنتس زەنگی تەنیشت مێزەکەی لێدا و پێشخزمەتەکان هاتنەوە و مێزەکەیان خاوێن کردەوە، دیسان خواردنیان هێنا و لە سەر مێزەکە چنییان و ڕۆیشتن، دیسان نۆرەی پیاوان بوو قاپ و دەوری پڕکەن و شەڕاب تێکەن. شەڕابەکان عالی بوون و چێشت و خۆراکی

خۆش و بەتامیان لە ئاشپەزخانەی گەورە و خاوێنی کۆشک ساز کرد بوو، یەک سەرئاشپەزی فەڕەنسی و دوو هاوکاری شارەزا و دەست ڕەنگین لەو بوارەدا زەوق و سەلیقەی خۆیان تاقی کردبۆوە. لە سەر مێزەکە شەش کەس دانیشتبوون: کۆنت و کۆنتس، کوڕەکەیان کە ئەفسەری گارد بوو، هەنیشکی لە سەر مێزەکەدا نابوو، بە ڕواڵەت زۆر ویشک و جیددی بوو، خاتوونی دەرس وێژی فەڕەنسی و کوێخای مڵکەکەی کۆنت چارسکی کە تازە لە گوندەوە هاتبوو. لەگەڵ نۆخلیدۆڤ دانیشتبوون و ئاساییە باسی هەموو شتێکیان دەکرد و چوونە سەر ڕووداوی دوئێلەکە کە بابەتی ڕۆژ بوو و تەنانەت ئیمپراتۆریش پرسەنامەی بۆ خاتوو کامنسکایا نارد بوو، داوای لە بەر پرسانیش کردبوو لە مەڕ ئەو ڕووداوەوە سەختگیری نەکەن؛ چونکە بەرەڤاینی لە جلوبەرگی سەربازی کردووە. کۆنتس تەنیا کەسێک بوو کە ئەو بیروڕایەی بە دڵ نەبوو و وەک هەمیشە ڕاست و بێ پێچانەوە قسەی خۆی کرد:

ـ ئەفسەرێک مەستی دەکا و ئەفسەرێکی تر دەکووژێ. ئەو کاتە دەڵێن لەگەڵ بکوژەکە بە نەرمی بجووڵێنەوە.

کۆنت بە دوو وشە گوتی سەری لە قسەی ژنەکەی دەرناچێ، کۆنتس ڕووی دەمی لە نۆخلیدۆڤ کرد و گوتی:

ـ دیتووتە گیانە؟ هەموو کەس لە قسەی من تێدەگا جگە لە مێردەکەم. قسەکەی من زۆر سادەیە. سەیرە هەمووان لەگەڵ دایکی کوژراوەکە هاوخەمی دەکەن، کەچی ئیمپراتۆر بە قازانجی بکوژەکە قسە دەکا.

کوڕەکەی کۆنت کە ئەفسەری گارد بوو، لەگەڵ بیروڕای دایکی کۆک نەبوو و دەیگوت، هەر ئەفسەرێک لە جێی ئەو بووایە هەر ئەو کارەی دەکرد. چونکە خۆی لە دوئێل بکێشایەتەوە، وەک ئەفسەرێکی ترسەنۆک و

ئابڕووتکاو لە یەکە نیزامییەکەی دەریان دەکرد. نۆخلیدۆڤ کە خۆی سەردەمێک ئەفسەری گارد بوو، لە دڵی خۆیدا هەقی بە پووری دەدا، بەڵام نەیدەویست لەو باسەدا بەشداری بکات. ئەو وەرزێڕە گەنجەی وەبیر هاتەوە کە بە تۆمەتی پیاوکوژی بەندیان کرد بوو، سەریان تاشیبوو و زەنجیریان لە پێ کرد بوو؛ بۆیە نەیتوانی بێدەنگ بێ. بۆ ئامادە بووانی باس کرد کە ئەو وەرزێڕە بە تۆمەتی کوشتن گیراوە و لە ماڵ و منداڵەکەیان دابڕیوە و لە زیندان سووکایەتی و بێ ڕێزیی پێدەکرێ و بڕیار وایە بینێرن بۆ سیبیریا و تاراوگەی بە کاری قورسەوە بۆ بڕاوەتەوە؛ کوشتنەکەش لە کاتێکی نائاسایی و شێتیدا ڕووی داوە. بەڵام ئەو ئەفسەرەی هاوڕێکەی خۆی کوشتووە، بردوویانە بۆ گرتووخانەیەکی تایبەت. خواردن و مەشرووبی باشی دەدەنێ، کەلوپەلی ڕابواردن و متاڵای بۆ دابین کراوە و دوای چەند ڕۆژی تر ئازادی دەکەن، تاکوو بە ئازایەتی و بێباکیی خۆی بنازێ و لووتی هەڵێنێ.

نۆخلیدۆڤ بیروباوەڕی خۆی دەردەبڕی. کۆنتس و کوڕەکەی ئیتر هیچیان نەگوت، ئەویش هەستی کرد قسەکانی لەگەڵ بارودۆخی ئەم کۆڕە هیچ ساز گارییەکی نییە.

سەعاتێک دواتر چوون بو تەلاری گەورەی کۆشک کە بۆ وتار و لێدوان ئامادە کرابوو. کورسییەکانیان ڕیز کرد بوو و ئەسکەملێکی دەسکداریان لە پشت مێزێکی گەورە دانا بوو بۆ ئەوەی وتاربێژ لە سەری دانیشێ. تەلارەکە لەو پەڕی جوانی و ڕازاوەییدا بوو. پۆلێک خاتوون بە جلوبەرگی مەخمەر و هەوریشم و تۆڕەوە، بە کڵاوپرچی ڕازاوە و سەرتا پا نوقمی خشڵ و زەمبەرەوە لە سەر کورسی دانیشتبوون. چەند کەس لە پایەبەرزەکانی دەوڵەتی و لەشکری لە نێو ژنەکاندا وەبەر چاو دەکەوتن، پێنج کەسی

ئاساییش لە سەر کورسی دانیشتبوون؛ یەکیان نۆکەر بوو، دووهەمی عەتار، سێهەمی عاربانە چی و چوارەمی و پێنجەمیش دەرگاوان بوون.

کەیس واتێر پیاوێکی قەڵەوە بوو بە سەر و ڕیشی خۆڵەمێشییەوە. بە زمانی ئینگلیزی قسەی دەکرد و کچێکی چاویلکە لە چاوی بەژن زراڤ، بە زمانێکی پاراو و بە توندی قسەکانی ئەوی بە ڕووسی وەردەگێڕایەوە:

ـ ئاخ، تاوانمان چەندە زۆرە و تاوانەکانیشمان بۆ بەخشین و لێبوردن نابن! چ عازابێکی ترسناک چاوەڕوانمانە. خوشکان و برایانی بەڕێز! با وەخۆبێینەوە! سەبارەت بە خۆمان و زمان و ئاکارمان بیر بکەینەوە و تێبگەین کارەکانی ئێمە چەندە خودای گەورە و دڵۆڤان توورە دەکات؛ با بۆمان دەرکەوێ بەو هەموو تاوانەوە نابی چاوەڕوانی بەخشین بین، چونکە ڕێگای ڕزگار بوونمان بەستراوە. سزایەکی قورس لە ڕێمانە و دەکەوینە نێو عازابێکی هەتاهەتاییەوە. خوشکان و برایانی من! هەمووتان دەپرسن ڕێگای ڕزگاری هەیە؟ دەتوانین لە ئاوری دۆزەخ ڕزگار بین؟ هەموومان دەڵێین ئێمە سەرگەردان و سەرلیشێواوین، گومڕا و بێ دەرەتانین و عازابێکی هەتاهەتایی چاوەڕوانمانە.

ساتێک بێدەنگ بوو. هەموو فرمێسک بە چاویاندا هاتە خوارێ. هەشت ساڵ بوو ئەم واعیزە ئەڵمانییە کە بە زمانی ئینگلیزی قسەی دەکرد، ئەو قسانەی دووپات و چەند پات دەکردەوە و کاتێک دەگەیشتە ئەم بەشەی وتەکانی، دڵی پڕ دەبوو. ئۆناقێک گەرووی دەگوشی و وەک ئەکتەرێکی جادووباز فرمێسک لە چاویدا قەتیس دەما. کۆنتس کە دەیان جار ئەو قسانەی بیستبوو، سەری نابووە بەینی دەستییەوە و شانی هەڵدەتەکاند و لەبەر خۆیەوە دەکوڵا. کابرای عارەبانەچی مات و واق وڕماو چاوی لەو واعیزە ئەڵمانییە بڕیبوو کە بە زمانی ئینگلیزی قسەی دەکرد. زیاتر ئەو کاتانە

تووشی ئەو حاڵەتە دەبوو کە منداڵێک هەڵدەهاتە بەر عارەبانەکەی و دەترسا وەبەر بکەوێ. زۆربەی بیسەران وەک کۆنتس لەبەر خۆیانەوە دەگریان و فرمێسکیان هەڵدەوەراند. کچی سەناتۆر ڤۆلڤ کە جلوبەرگی دوایین مۆدەی ڕۆژی لەبەر کردبوو و دەتگوت باوکی بە دەم دایناوە، چۆکی دادا بوو و هەر دوو دەستی بەبەر دەموچاوییەوە گرتبوو.

لە نێوان ئەم دڵپڕی و حەپەسان و گریانەدا، کابرای واعیز لە ناکاو سەری هەڵبڕی و زەردەیەکی گرت. وەک ئەکتەرێک دەچوو کە دەیهەوێ خۆی نیشان بدات. قسەکانی لە دڵ دەنیشت و لەسەرەخۆ دەدوا:

ـ خوشکانی من! برایانی من! ڕێگای ڕزگاری هەیە. قەت نابێ لە بەخشین و لێبوردنی خودای دڵۆڤان ناهومێد بن. بەخشین و لێبوردن لە بەر دەستی خۆماندایە، دەستمان پێی ڕادەگا؛ خودای مەزن تاقانە کوڕی خۆی، مەسیحی پاک و ڕاستی لە بەر خاتری ڕزگاریی مرۆڤایەتی شەهید کرد، خوێنی ئەوی تەنیا لە بەر خاتری بەخشین و لێخۆشبوونی ئێمە ڕشتە سەر زەوی، ڕەنج و ئازاری مەسیح، خوێنی مەسیح ڕزگاریدەری ئێمەیە.

پێکەنین لە سەر لێوی کاڵ بۆوە و دیسان فرمێسک لە چاویدا قەنیس ما:

ـ خوشکانی من! دەبێ سپاسی خودای مەزن بکەین، خودای بەخشندە و دڵۆڤان، کە بۆ ڕزگاریی ئێمە تاقانە کوڕەکەی خۆی ناردە قوربانگە و خوێنی پیرۆزی ئەو...

نۆخلیدۆڤ خۆی دەخواردەوە و بێزی لەو هەموو درۆ و قسە بێ سەرە بەرانە هەستا بوو. شەرمی دەکرد کە گوێی بۆ ئەو قسە هیچوپووچانە ڕاگرتووە؛ بە پێدزکە لە تەلارەکە چووە دەرێ و خۆی کرد بە ژووری خەوەکەدا.

# هەژدە

سبەی بەیانی، نۆخلیدۆڤ خەریک بوو جلوبەرگی لە بەر دەکرد تاکوو خۆی ئامادە بکات و بچێت بە دوای کارەکانیدا، پێشخزمەتێک کارتی جەنابی فانارینی بۆ هێنا کە لە مۆسکۆوە هاتبوو. دەرکەوت جەنابی پارێزەر بێ ئەوەی تیلگەڕافی نۆخلیدۆڤی بە دەست بگات، بۆ ئەنجام دانی کارەکانی خۆی هاتبوو بۆ پترزبۆرگ، هاتبوو سەرێک لە ئەویش بدات و ئەگەر پێویست بێ لە دانیشتنی پێدا چوونەوەی پەروەندەکەی ماسلۆڤا لە دیوانی وڵات ئامادە بێ. نۆخلیدۆڤ بە پەلە چوو بۆ لای و بۆی ڕوون کردەوە کە ڕۆژی چوارشەممە پێداچوونەوە بۆ پەروەندەکە دەکرێ، ناوی سێ سەناتۆریشی برد کە بڕیاری لە سەر دەدەن. پارێزەر تۆزی بیری کردەوە و گوتی:

ـ تێکەڵاوێکی باشە؛ ئەو سێ کەسە جەنابی ڤۆلڤ خاوەن ئەزموونی ئیدارییە. سۆکۆردنیکۆڤ مافناسێکی بیرمەندە و لە هەمووشی گرنیگتر سەناتۆر«ب» قازییەکی زانا و بە ئەزموونە و لەو دوو کەسەی دیکە باشترە و لە باری زانستیشەوە شارەزاترە. ئەگەر هیوایەک هەبێ، لە دەستی ئەو قازییەدایە. دەی پێم بڵێ کاری کۆمیسیۆنی سکاڵانامە بە کوێ گەیشت؟

ـ ئەمڕۆ بڕیار وایە چاوم بە بارۆن ڤۆرۆبیڤ بکەوێ؛ دوێنێ چوو بوو بۆ دەربار.

فانارین کە بۆی دەرکەوت نۆخلیدۆڤ لە تێکەڵاویی ڤۆرۆبیڤ کە ناوێکی ڕووسییە و ئاوەڵناوێکی خانەدانەکانی هەندەرانە، تووشی سەر سوورمان بووە، بۆیە بۆی ڕوون کردەوە کە باپیرەگەورەی ئەو تەمەنێک خزمەتکاری ئیمپراتۆر پۆل بووە، دوای تەمەنێک خزمەت و هەڵسووڕان داوای لە ئیمپراتۆر کردووە ئاوڵناوی بارۆنی پێ ببەخشێ. ئیمپراتۆریش کە زانیویە داواکارییەکەی زیانی بۆ پەز نییە، دڵی نەشکاندووە و ئەو ئاوەڵناوەی پێ بەخشیوە، منداڵ و نەوەکانیشی ئەو ئاوڵناوەیان پاراستووە و شانازیی پێوە دەکەن. نۆخلیدۆڤ کە لەو ڕازە گەورەی بنەماڵەی ڤۆرۆبیڤ تێگەیشتبوو، لەگەڵ فانارین لە ماڵێ هاتە دەرێ. یەکێک لە خزمەتکارەکان بە هەڵەداوان چوو بۆ لای و نامەیەکی دایە دەستی کە ئەو کاتە گەیشتبوو. نامەکە لە لایەن ماریتەوە بوو و بە زمانی فەڕەنسی نووسیبووی:

«لە بەر دڵی ئێوە یاسا و ڕێساکانم خستە ژێر پێ و داوام لە مێردەکەم کرد لە بارەی ئەو ژنەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدات. دەرکەوتووە ئەو ژنە بێ تاوانە و دەبێ دەستبەجێ ئازاد بکرێ. مێردەکەم نامەیەکی بۆ فەرماندەری قەڵا نووسیوە بە بێ ڕاوەستان ئەو ژنە ئازاد بکەن. ئێستا کە داواکارییەکەتان جێبەجێ کراوە، تکای من قەبووڵ بفەرموون و لە یەکەم دەرفەتدا وەرە بۆ سەردانم. چاوەڕوانتانم. م.»

نامەکەی بۆ پارێزەر خوێندەوە.

ـ دیتووتە؟ بەڕاستی شوورەیییە، پیاو لەوانەیە مێشکی بتەقێ. کەسێک حەوت مانگ بەبێ تاوان لە سووچی بەندیخانەدا دەستبەسەر دەکەن، پاشان بە یەک وشە ئازادی دەکەن.

ـ گەورەم! هەر ئەوەیە کە دیتوتە؛ دەبێ شوکرانە بژێر بی کە بە ئامانجت گەیشتووی.

ـ چەندە بە دوای ئەو کارەدا هەڵاتم. هەر بە ڕاست مەعلوومە دنیا بەری بە کوێوەیە؟ بەر پرسی ئەو هەموو زوڵم و بێ عەداڵەتییە کێیە؟

ـ وا باشترە خۆ لەو کارانە وەرنەدەی و خۆی پێوە ماندوو نەکەی. هەر ئەوەی ئەو ژنە ئازاد بووە، بەسمانە. ئێستا وەرەبا بڕۆین؛ هەتا ماڵی بارۆن لەگەڵتان دێم.

فەتیوونێکی ڕازاوە لە بەر دەرگا ڕاوەستا بوو. هەر دووکیان سوار بوون و نۆخلیدۆڤ لە بەر دەرگای ماڵی بارۆن ڤۆرۆبیڤ دابەزی. بەختەوەرانە بارۆن لە نووسینگەی کارەکەی بوو. گەنجێکی بەلەباریکە و مل درێژ لە ژووری چاوەڕوانی هاتە پێشێ کە سێوکی بەر ملی زۆر دەرپەڕیبوو، ناوەکەی لێ پرسی.

ـ جەنابی بارۆن چاوەڕوانی ئێوەیە. تکایە تۆزێ ڕاوستن.

چووە ژوورێ و دوای خولەکێک گەڕایەوە. خاتوونێکی ڕەشپۆش و لاواز کە فرمێسک بە چاویدا دەهاتە خوارێ، لەگەڵ ئەودا لە نووسینگەکەی بارۆن هاتە دەرێ. لاوی بەلەباریکە ئاماژەی بە نۆخلیدۆڤ کرد بچێتە ژووری کارەکەی بارۆن.

بارۆن ڤۆرۆبیڤ قەڵەو و تێکسمڕاو، مووی سەری کورت و سپی، ڕیش و سمێڵەکەشی لە سەر دەموچاوە سوورهوولەکەی جوانییەکی تایبەتی هەبوو. لە پشت مێزێکی گەورە دانیشتبوو و بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازیی لە نۆخلیدۆڤ کرد.

ـ بە دیتنت خۆشحاڵم. لەگەڵ دایکی خوداڵیخۆشبووت نێوانمان زۆر خۆش بوو. منداڵیی تۆم زۆر باش لە بیرە. دواتر بیستم بوویەتە ئەفسەری ئەرتەش؛ دەی فەرموو دانیشە و پێم بڵێ بزانم چ خزمەتێکم لە دەست دێ؟

نۆخلیدۆڤ بەسەرهاتی فیدۆزیای بۆ باس کرد و داواکاریی بەخشینی ئەوی لە گیرفانی دەرهێنا و گوتی:

- دەمویست تکاتان لێ بکەم ئاگاتان لێی بێ و بە چاوێکی دڵسۆزانەوە لە پەرەوەندەکەی بڕوانن.

ـــ خەمەت نەبێ. خۆم لە کۆمیسیۆن وەدووی کارەکەی دەکەوم. بە سەرهاتێکی خەماوییە. ئەو کچە تەمەنی کەم بووە شووی بەو گەنجە هەرزە و کاڵفامە کردووە. مێردەکەی زۆر تووڕە و دڵڕەقانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووە، ئەو ژنە بیرتەسک و کەم تەمەنە ویستوویەتی مێردەکەی دەرمانداو بکات. ڕەنگە ئەو کارەشی نەکرد بێ و تۆمەتیان دابێتە پاڵی. بە هەرحاڵ دوای چەندین ساڵ کە ئەزموونیان بە دەست هێناوە و لە بۆتەی ژیاندا قاڵ بوون و دەستیان لە ناسازگاری هەڵگرتووە، پەروەندەی ئەو ژنە دەدرێ بە دادگا و بە تۆمەتی دەرمانداو کردنی مێردەکەی سزای زیندانی بۆ دەبڕنەوە. بەڕاستی سەیرە. دەبێ لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ ئەنجام بدەم و سکاڵانامەیەک بنووسم کە شوێنێکی کاریگەر دابنێ.

- کۆنت چارسکی گوتیان دەیانهەوێ مەسەلەکە لەگەڵ شاژن بێننە گۆڕێ.

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو، بارۆن ڕەنگی تێکچوو.

- ئەگەر کارەکە بەو جێیە بگات وا باشترە سکاڵانامەکە بدن بە سکرتاریا و تۆماری بکەن؛ خۆم وەدووی دەکەوم.

لەو کاتەدا گەنجە لاوازەکە لەگەڵ ژنە ڕەشپۆشەکە هاتنە ژوورێ.

- ئەم خاتوونە پێداگری دەکات کە دوو وشەی تر بە عەرزی ئێوە بگەیێنی.

بارۆن سەری هەڵبڕی، چاوی لە نۆخلیدۆڤ کرد و گوتی:

ـ دیتووته، لێره دەبێ چەندە گوێ له گریان و کڕووزانەوەی خەڵک بگرم؟ خۆزگه بمتوانییایه برینی هەموو دڵه داخدارەکان ساڕێژه بکەم و خەمی دڵیان بڕەوێنم. مخابن له توانامدا نییه.

خاتوونی ڕەشپۆش به دەم کوڵی گریانەوه قسەی دەکرد:

ـ جەنابی بارۆن! له بیرم نەبوو عەرزتان بکەم، تکایه مەهێڵن کچەکەی شوو بکات.

ـ خاتوونی بەڕێز... خۆمن پێم گوتی، ئەوی له دەستم بێت درێغی ناکەم. به وەزارەتی داد ڕادەگەیێنم، دوای ئەوەی وەڵامیان دامەوه، هەتا ئەو جێیەی له توانامدا بێ هەوڵ دەدەم.

نۆخلیدۆڤ لەوێوه چوو بۆ سکرتاریای کومیسیۆنی سکاڵانامه، ئەویش وەک نووسینگەی ئەنجومەنی سەنا له تەلارێکی زۆر ڕازاوەدا بوو، فەرمانبەرەکان هەموویان ڕێک و پێک و به ئەدەب، به جلوبەرگی یەکدەستەوه، قیتوقۆز و بۆشناغ له پشت مێزەکان دانیشتبوون. نۆخلیدۆڤ دیسان خەیاڵ هەڵیگرت: «ئەم هەموو فەرمانبەره! چەندەش تەڕپۆش! بەو پێڵاوه بریقەدارانەوه تێر و بەکیف دانیشتوون و ئاگایان له مەحموودی بێ زەواڵ نییه. باشه ئەمانه چ جیاوازییەکیان لەگەڵ ئەو بەندییه چارەڕەش و کوڵۆڵانه و ئەو وەرزێڕ و کرێکاره برسی و نەخۆشانه هەیه.»

# نۆزدە

مەرگ و ژیانی بەندییەکانی قەڵای سەن پترزبۆرگ لە دەستی ژینڕاڵێکی پیردا بوو، کە بە ڕەچەڵەک دەچووەوە سەر بارۆنەکانی ئەڵمانیا و لە ماوەی خزمەت و چالاکییەکانیدا زۆری میدالیا و نیشانەی شانازی وەرگرتبوو، ئەگەر چی خۆی بە شیاوی ئەو هەموو پلەوپایە و شانازییەش دەزانی بەڵام تەنیا نیشانی خاچی سپیی بە سنیگیدا هەڵدەواسی. تاقمێک دەیانگوت ئەقڵی لە چۆکی دایە. ئەو نیشانەی خاچی سپیش کاتی خزمەت و چالاکی نواندن لە قەفقاز بە دەستی هێنا بوو؛ چونکە لەو ئەرکەدا کە لەو مەڵبەندە پێی سپیردرابوو، تاقمێک لە وەرزێڕانی ڕووسیی چەکدار کردبوو و ناردبوونی بۆ شەڕ بە دژی ئازادیخوازانی ئەو وڵاتە، هەزاران کەس لەو قەفقازییانەش کە بۆ ئازادیی وڵات و بەرەڤانی کردن لە ماڵ و خاک و ناموسی گەلەکەیان خەباتیان دەکرد، بە پیلان و فەرمانی ئەو قەلاچۆ کران و لە خوێندا گەوزین. ئەو کاتەی لە لەهێستانیش خزمەتی دەکرد، وەرزێڕانی ڕووسیی بەگژ خەڵکی ئەو وڵاتەدا دەکرد و هەزاران کەس لە خەڵکی بێ تاوان و لاوانی ئازادیخوازی ئەو وڵاتەی لەنێوبردبوو. بۆ ئەو جینایەتەش چەند میداڵیا و نیشانی نوێی خستبووە سەر خەرمانی شانازییەکانی. زۆری لەو شاکارانە خولقاندبوو، ئێستاش بووبووە پیرەپیاوێکی شەکەت و پەک کەوتە، کارێکی سازگار لەگەڵ تەمەنی خۆی پێدرابوو، ماڵی باش و مووچە و مزی باشی

وەردەگرت و لە تەڕی دەخوارد و لە وشکی دەخەوت. دەستووری کەسانی باڵادەستیشی مووبەموو بەڕێوە دەبرد، بە موو لەو فەرمان و دەستوورانە لای نەدەدا و دەتگوت لە ئاسمانەوە بۆی نازڵ بووە، لادان و سەرپێچی کردنیشی بە تاوانێکی گەورە دەزانی.

لەم دە ساڵەی دواییدا زیندانییە سیاسییەکانی وەها خستبووە گوشارەوە و ئەشکەنجەی دەدان، نیوەیان لەو بەند و چاڵەڕەشانەدا ڕزین و لە ژێر زەبر و ئەشکەنجەدا بوونە قوربانی؛ تاقمێک تووشی نەخۆشی سیل بووبوون و تەنانەت چەند کەس شادەماری دەستی خۆیان بڕیبوو یان خۆیان هەڵواسیبوو یان ئاوریان لە خۆیان بەردابوو، بۆ ئەوەی خۆیان بکووژن و لەو ئازار و چارەڕەشییە ڕزگاریان ببێ.

ژنیراڵ هەموو شتێکی خستبووە ژێر چاوە دێری و ئاگاداری هەموو شتێک بوو؛ بۆ ئەو ڕووداوە دڵتەزێنانەش مێشێکی میوان نەبوو. بە چاوێک لەو کارەساتانەی دەڕوانی وەک ئەوەی بە هۆی سێلاو و هەورەبرووسکەوە ڕووی دابێ؛ لە حاڵێکدا هۆکاری تەواوی ئەو ڕووداوانە بە هۆی دڵڕەقی و زەبروزەنگی ئەوەوە بوو؛ چونکە لە سەر ئەو باوەڕە بوو هەر دەستوورێک لە مەقامی باڵاوە پێی بدرێ بە ناوی مەزنی ئیمپراتۆرەوە دەردەچێت و دەبێ بە بێ سێ و دوو بەڕێوە بچێت، ئاکامەکەشی چۆن دەبێ و چێی لێدەکەوێتەوە گرنیگ نییە. ژنیراڵی پیر بیری لە چەند و چۆن و ئاکامی کردەوەکانی نەدەکردەوە، چونکە لە سەر ئەو بەوەڕە بوو ئەرکی نیشتمانپەروەری دەبێ بە شێوەیەکی لێبراوانە و بە بێ دوودڵی بەڕێو بچێت و بیر لێکردنەوە و تێفکرین دەبێتە هۆی گومان و دڕدۆنگی و ورە و توانایی دادەبەزێنێ.

بە پێی یاساوڕێسای بەندیخانە، ژنیراڵ حەوتووی جارێک سەردانی سیاچاڵەکانی دەکرد و بەوردی گوێی بۆ سکالای دیلەکان ڕادەگرت، بەڵام لەم گوێیەوە دەهات و لەو گوێیەی دیکەیەوە دەردەچوو؛ چونکە هەموویانی بە نەیار و دوژمنی وڵات و یاسا دەزانی.

نۆخلیدۆڤ بە سواری هێلینگەیەک هاتبوو بۆ ئەو زیندانە. کاتێک گەیشتە بەر دەرگای قەڵاکە، گوێی لە زڕەی گازەنگی سەر برجەکان بوو هەوایەکیان دەژەنی ـــ سروودێک بۆ بیرهاتنەوەی دروشمی دیسامبریستەکان[53] کە ئەو دەم دەیانگوتەوە. دوای ئەو سرووده، گازەنگەکان کاتژمێر دوویان ڕاکژگەیاند و نۆخلیدۆڤ لە بیری ئەوەدابوو بەندییەکان هەموو سەری سەعاتێک ئەو سرووده نەرم و دڵبزوێنە لە گازەنگەکان دەبیستن، بەڵام دیار نییە ئەم سرووده کە لە پەستا خۆ لە پەردەی گوێچکەیان دەهاڵێنێ، چ کاردانەوەیەکی تاڵی لە سەر ڕۆحیان دەبێ! لەو کاتەدا ژێنراڵی پیر لە تەلارێکی نیوە تاریکدا خەریکی پرسیار و وەڵام بوو لەگەڵ ڕۆحەکان. ئەو و لاوێکی شێوەکار و برای یەکێک لە ئەفسەرە ژێردەستەکانی، بەرەوڕووی یەکتر دانیشتبوون. لە سەر مێزێک دەورییەکی خەتداریان لە سەر کاغەزێک دانابوو و دەیانجووڵاندەوە. ژینراڵی پیر و شێوەکاری گەنج پەنجەیان لە پەنجەی یەکتر هەڵپێکابوو. قامکە زبر و ئەستوورەکانی ژینراڵ، قامکە کز و ڕەقەڵەکانی لاوی شێوەکایان دەگوشی و دەورییەکەیان بە هێواشی لە نێو قامکەکانیاندا هەڵدەسووڕاند، چاویان لێدەکرد بزانن خەتی درشتی سەر دەورییەکە ڕووی کردۆتە کام پیتی سەر کاغەزەکە. ئەو ڕۆژە ڕۆحی ژاندارکیان بانگ کردبوو و بەو کارە دەیانویست لێی بپرسن ڕۆحەکان لە کوێ و چۆن دەچن بۆ دیداری یەکتر؟ لە جەنگەی ئەو کارە پڕ هەیەجانەدا، پێشخزمەتێک هاتە ژوورێ و کارتی نۆخلیدۆڤی دایە دەست ژینراڵ.

53. Decembriste ئەوانە لە دیسامبری 1825دا ڕاپەڕین.

ژینـڕاڵ هـۆش و ئیختیـاری لا نەمـابوو وچـاوەڕوان بـوو ژانـدارک لەو دنیـایەی دیـکەوە وەڵامـی بـداتەوە. هەتـا ئەو کـاتە سـێ پیتـی «پ»،«ئـوو» و «ل» بە هەڵسووڕانی دەورییەکە بە دەست هـاتبوو و بەو پێیە کچی قارەمـانی فەڕەنسـی لەو دنیـایەی دیکەوە وەڵامـی دابـۆوە: ڕۆحەکـان لە عـالەمی بەرزەخـدا دەچـن بـۆ دیـداری یەکتـر؛ بەڵام شـێوەکاری لاو لە سـەر ئەو بـاوەڕە بـوو هێڵـی سـەر دەورییەکە ڕووی لە پیتی «پ» یە و مەبەستی ئەوەیە ئەو نوورەی لە وجوودی گەڕۆک و نادیاری ڕۆحەکاندا دەدرەوشێتەوە، پێکەوە لێک دەدرێن؛ لە نێوان ئەو دوو وەڵامەشـدا جیـاوازییەکی زۆر هەیە! ژینـراڵ دەسـتووری دا پێشـخزمەتەکە نۆخلیدۆڤ بەرێ بۆ نووسینگەی کارەکەی، زۆریش تووڕە بوو کە لە جەنگەی بانگ کردنی ڕۆحەکان و ئەو دۆزینەوە گرنیگەدا ئەو ملۆزمەیان لێ پەیدا بووە. لاوی شـێوەکار لاواز و ڕەنگ بزرکاو چەند لقی لە قژە تەنکەکەی بردبـۆوە بـۆ پشت گوێچکەی؛ ئیزنی لە ژینراڵ خواست لە کاتی ڕۆیشتی ئەویشدا، دەتوانێ درێژە بە پرسیار و وەڵام لەگەڵ ڕۆحی ژاندارک بدات؟

ـ قەیناکا. بە تەنیا درێژەی پێبدە و دواتر دەرەنجامەکەیم پێ بڵێ. بـارۆن بە هەنگاوی توند و خێرا چوو بۆ نووسینگەی کارەکەی و بە دەنگە گڕەکەی بەخێرهاتنی نۆخلیدۆڤی کرد.

ـ زۆر بە دیتنتان خۆشحاڵم؛ لە مێژە تەشریفتان نەهێناوە بۆ پترزبۆرگ! دانیشتن و ژینراڵ سەری قسەی کردەوە:

ـ دایکت حاڵی باشە؟

ـ دایکم نەماوە، ماوەیەکە عومری درێژی بۆ ئێوە بەجێهێشتووە.

ـ بەداخەوەم؛ ئاگادار نەبووم. کوڕەکەم جاروبار باستان دەکا. وا دیـارە چەند جار چاوی بە ئێوە کەوتووە.

کوڕەکەی ژینراڵ هەر لەو بوارەی باوکیدا چالاکیی دەنواند. دوای تەواو کردنی فێرگەی سەربازی چووە ڕێکخراوەی ئاسایشەوە و شانازیی بەوە دەکرد کە بۆتە باوەڕپێکراوی ڕێخراوەکە و کاروباری سیخوڕییان بە ئەو سپاردووە.

ـ نا، ماوەیەکە وازم لە کاروباری دەوڵەتی هێناتوە.

ژێنرال وەڵامەکەی بە دڵ نەبوو. نۆخلیدۆڤ چووە سەر باسی داواکارییەکەی خۆی.

ـ جەنابی ژینراڵ! من هاتووم تکاو داوایەکتان لێ بکەم.

ـ زۆرم پێخۆشە کارێکم بۆ ئێوە لە دەست بێ و ئەنجامی بدەم.

ــ ئەگەر داواکارییەکەم بێ هۆ بێ، داوای لێبوردن دەکەم. ناچارم ئەو داوایەتان لێ بکەم.

ـ کێشەکە چییە؟

لە نێو بەندییەکانی ئێوەدا کەسێک هەیە بە ناوی گۆرکۆڤیچ؛ دایکی دەیهەوێ چاوی پێی بکەوێ، کتێبی زانستیی بۆ بەرێ.

ژینراڵ ویشک و بێ هەست گوێی ڕاگرتبوو. سەری داخستبوو و پێڵووی بە سەریەکدا نابوو. وای دەنواند بیر دەکاتەوە؛ بەڵام بیری لە هیچ شتێک نەدەکردەوە و هۆشی لە لای قسەکانی نۆخلیدۆڤ نەبوو؛ چونکە لە سەر ئەو باوەڕە بوو ئەوەی گرنیگە بەڕێوە بردنی یاسا و دەستووراتی باڵایە.

ــ ئەم بابەتە هیچ پێوەندییەکی بە منەوە نییە. لێرە یاساو ڕێسایەک بۆ ملاقاتی زیندانی هەیە کە بۆ دەست تێوەردان نابێ. کتێبیش هەر باسی مەکە. ئێمە لێرە کتێبخانەیەکی گەورەمان هەیە و زیندانییەکان دەتوانن کەڵکی لێوەرگرن.

ــ ڕاســت دەفەرمــووی؛ بەڵام ئەو کــوڕە پێویســتی بە کتێبــی زانســتییە. دەیهەوێ لەو بوارەدا متاڵا بکات.

- بڕوا بەو قسانە مەکە. ئەوانە پیاوی خوێندن و متاڵا نین؛ تەنیا قەستیان گێرەشێوێنییە و بەس .

ــ بە بـڕوای مـن، لە شـوێنێکی ئەوتـۆ جـگە لە خوێنـدنەوە و متـاڵا کـردن کارێکی تر ناکرێ.

ــ ئەوانە هەموویــان لە دەســت بــارودۆخەکە ســکاڵا دەکەن. دەڵــێن لە بــارودۆخێکی خــراپ دایــن، بۆمــان تامــڵ نــاکرێ؛ لە حاڵێکــدا ئێــرە لە هەمووبەندەکانی تر باشترە.

وەهـا کەوتە تـاریف و پیاهەڵدانی بەندیخانەکە بیسـەر پێی وابـوو شـوێنی ڕابواردن و خۆشگوزەرانییە و لە خۆڕا ناویان ناوە بەندیخانە.

- بەڵێ، پێشتر ئێرە لە بارودۆخێکی باشدا نەبووە؛ بەنـدی لە ژێر گوشـاری ڕۆحــی و جەســتەییدا بــووە؛ بەڵام ئێســتا هەتــا ئەو جێگــایەی گونجــابێ گوشـارەکانمان کەم کـردۆتەوە. سـێ ژەم خواردنیـان پێدەدەین، کە ژەمێکیـان حەتـمەن گۆشـتە. گۆشـتی بـرژاو یـان کەبـاب. یەکشــەممانە یەک دیســێڕی زیادییان پێدەدین. لە کوێی ڕووسیا خواردنی خەڵک ئاوا باش و ڕێکوپێکە؟

ژینڕاڵ وەکوو هەموو کەسانی بە ساڵاچوو قسەکانی دوو - سێ جار پاتە دەکردەوە.

ــ بـا بێیـنە ســەر باســی کتێـب. کتێبــی ئــایینی و ڕۆژنــامە کۆنەکـان لە بەر دەسـتیاندایە. کتێبخـانەیەکی باشـمان هەیە. بەڵام خـۆ کتێـب خـوێن هەر نییـە! کتێبە نوێیەکان دەدڕێنن و کتێبە کۆنەکان لێک ناکەنەوە. هێندێ جار نیشـانەیەک دەخەینە نێوان کتێبێکەوە، بۆ ئەوەی بۆمـان دەرکەوێ ئەو کتێبەی وەریدەگرن دەیخـوێننەوە یان نـا. ئەو نیشـانەیە هەروا دەست لێنەدرا دەمێنێتەوە. تەنـانەت ڕێگەیـان پێدەدەین

بشنووسن. تەختەڕەشە و گەچمان پێداون بۆ ئەوەی هەرچی پێیانخۆشە لە سەری بنووسن و پاکی بکەنەوە و سەر لە نوێ بینووسنەوە. بەڵام ئەوان کوا پیاوی نووسینن؟ لە سەرەتاوە کە دین بۆ ئێرە هێندێک هەست و سۆزیان هەیە بەڵام وردە وردە ئەوەش دادەمرکێتەوە و وازی لێدێنن؛ تەنانەت هێندەش قەڵەو و تەوەزەل دەبن، نە تاقەتی خوێندنەوەیان دەمێنێ نە نووسین. ئیتر کاس و وڕ سەر دادەخەن و ورتەیان لێوە نایە.

ژێنڕاڵ بێ ئەوەی لە مانای وتەکانی خۆی تێبگا، ڕاستییەکی تاڵی درکاند. نۆخلیدۆڤ گوێی بۆ دەنگە گڕ و ناخۆشەکەی ژێنڕاڵ ڕاگرتبوو و چاوی لە قەڵافەتی زەلام و چاوی کز و ڕیشی سپی و بڕۆی پڕی بڕیبوو. پێستی ڕوومەتی لە هەر دوو لاوە شۆڕ بووبۆوە و چووبوو بە نێو ملیوانەی چاکەتە ئەفسەرییەکەیدا. نیشانی خاچی سپی بە سەر سینگییەوە بوو، ئەوەش هەر ئەو نیشانەیە بوو کە دوای کوشتوبڕ و قەلاچۆی خەڵکی قەفقاز پێیان بەخشیبوو. کۆنت نۆخلیدۆڤ دەیزانی قسە کردن لەگەڵ پیاوێکی وا کەڵکی نییە. ناچار سەبارەت بە ئازاد بوونی لیدیا شۆستۆڤا پرسیاری لێکرد.

ـ گوتت لیدیا شۆستۆڤا؟... شۆستۆڤا! تا ئێستا ئەو ناوەم نەبیستووە. هێندە زۆرن خۆ پیاو ناوەکانیان فێرنابێ.

کەسێکی نارد بە دوای سەرۆکی نووسینگەی بەندیخانەدا، بۆ ئەوەی بێت و لە چارەنووسی شۆستۆڤا ئاگاداریان بکات، لەو دەرفەتە کەڵکی وەرگرت و داوای لە نۆخلیدۆڤ کرد دیسان دەست بکاتەوە بە کاروباری دەوڵەتی و لە سەر ئەو باوەڕە بوو تێزار و وڵات پێویستیان بە مرۆڤی باش و ڕاست هەیە و هەر بەو هۆیە، خۆی هەتا ئەو کاتەی بتوانێ بە ڕێدا بڕوا ڕێگە بە خۆی نادا واز لە کاروباری دەوڵەتی بێنێ.

هێشتا ئامۆژگارییەکانی تەواو نەبووبوو سەرۆکی نووسینگە هات. پیاوێکی گرژ و بە تاڵووکە بوو. دەیگوت شۆستۆڤا لە بەندی تایبەتدایە و هەتا ئێستا دەستووری ئازادییەکەی نەگەیشتۆتە دەستیان. ژینراڵ بە تەوسەوە گوتی:

ـ لەگەڵ گەیشتنی حوکمی ئازادییەکەی، ئازادی دەکەین؛ خۆ ئێمە حەز ناکەین ئەوان بە زۆری لێرە ڕاگرین.

نۆخلیدۆڤ زۆری ددان بە خۆیدا گرت بۆ ئەوەی ڕق و بێزاریی خۆی لەو پیرەپیاوە گەمژە و دڵڕەقە بشارێتەوە؛ لە لایەکی ترەوە بەزەییشی پێیدا دەهات؛ ژنیراڵی پیریش پێی وابوو ئەو تووشی سەرلێشێواوی بووە، بەڵام هەرچییەک بێ کوڕی هاوڕێی کۆچکردوویەتی و دەبێ بە دڵسۆزییەوە ڕەفتاری لەگەڵ تکات و بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست.

ـ قسەکانی من لە دڵ مەگرە؛ بەڵام ئەو ئامۆژگارییەم لە گوێ بگرە و لەگەڵ کەسانی وەک ئەم بەندییانەی ئێمە هەڵسوکەوت مەکە. دڵت پێیان نەسووتێ. ئەوانە تەنانەت یەک کەسیشیان بێ تاوان نییە. هەموو گومڕا و سەر لێشێواون، ئێمەش بۆیە لێرەین و دەوڵەت مووچەی بۆ بڕیوینەتەوە، کە ئەو مرۆڤە یاغی و گومڕا و مەترسیدارانە سەرکوت بکەین.

ئەوەی دەیگوت لە ناخی دڵیەوە هەڵدەقولا و بڕوای پێی هەبوو. ئەقڵی لە چاویدا بوو. خۆی بە قارەمان دەزانی و ژیانێکی خۆش و پڕ لە ناز و نیعمەتی هەبوو؛ بەڵام لە ناخەوە پیاوێکی خوێڕی و نابار بوو. ویژدانی خۆی دەنایە ژێر پێ و دەیویست هەتا گۆتاییی تەمەنی لە ڕێگای فرۆشتنی ویژدانییەوە بژی و کورسی و دامودەزگاکەی پارێزراو بێت.

ـ کوڕم! بگەڕێوە سەر کاروباری دەوڵەت، خزمەت بە تێزار و وڵاتەکەت بکە. نیشتمان پێویستی بە کەسانێکی شەرافەتمەندی وەک ئێوە هەیە. ئێمە لە

لایەکەوە ڕەخنە لە دەوڵەت دەگرین و لە لایەکیشەوە ئامادە نیین یارمەتیی دەوڵەت بدەین و کیشە و کەموکووڕییەکانی لە کۆڵ بکەینەوە.

نۆخلیدۆڤ دەستی چرچولۆچی ژینراڵی گوشی و لە نووسینگەی کارەکەی هاتە دەرێ. ژینراڵ دەستێکی بە هەر دوو لاکەلەکەیدا هێنا و دیسان گەڕایەوە بۆ هۆڵە نیوە تاریکەکە. لاوی شێوەکار وەڵامی ژاندارکی مردووی یادداشت کردبوو.

ـ ژینراڵ! ئەمە وەڵامە کەیەتی: تیشکێک لە وجوودی گەڕۆک و نادیاری ڕۆحەکان هەڵدەستێ و لەیەک دەدرێن.

ژینراڵ چاوی قووچاند و بیری کردەوە.

ـ بەڵام ئەگەر تیشکەکان وەک یەک وابن، ڕۆحەکان چۆن یەکتری دەناسن؟

دیسان ژینراڵ و لاوی شێوەکار لەم بەر و ئەو بەری مێزەکە دانیشتن و پەنجەیان لێک هەڵپێکا تاکوو ڕۆحی ئەو ژنە کۆچکردووە بانگ بکەن و کێشە و گرفتەکانی خۆیانی لێ بپرسن. فەتیونەوان کاتێک کۆنت نۆخلیدۆڤی لە قەڵاوە دەهێنایەوە، لەشی داگیرابوو. بە بێ تاقەتییەوە گوتی:

ـ گەورەم! ئێرە زۆر شوێنێکی خەفەت هێن و ناخۆشە. خەریک بوو چاوەڕوانت نەمێنمەوە و زوو لێرە بڕۆم.

ـ بەڵێ وایە، زۆر ناخۆش و خەماوییە.

نۆخلیدۆڤ هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و چاوی لەو گەواڵە هەورە خۆڵەمێشینییەکان کرد کە ئاسمانی پترزبۆرگیان داپۆشیبوو. ڕووباری نۆڤا لە دووەوە دیار بوو. گەمیە و پاپۆڕی هەڵمی بەسەر سینگیدا دەخوشین و هێڵێکی زێوینیان لە دوای خۆیان بەجێ دەهێشت. کۆنت نۆخلیدۆڤ وردە وردە هێور بۆوە و تەمی خەم و خەفەتەکەی ڕەوییەوە.

# بیست

سبەینێی ئەو ڕۆژە نۆرەی پێداچوونەوەی پەروەندەکەی ماسلۆڤا بوو، بۆیە نۆخلیدۆڤ چوو بۆ ئەنجومەنی سەنا. لەبەر قاڵدرمەکانی بینای پڕشکۆی سەنا تاقمێک چاوەڕوان ڕاوەستا بوون. فانارینیش لەوێ چاوەڕوانی کۆنت نۆخلیدۆڤ بوو، چونکە هەموو سووچ و قوژبنەکانی ئەو بینایە شارەزا بوو، نۆخلیدۆڤی لەگەڵ خۆی برد بۆ نهۆمی دووەم. دالانێکی پان و بەرین لە دەستی ڕاست هەڵکەوتبوو. دەستووری بڵاو کراوەی یاسای مەدەنی لە قەتحەیەک گیرا بوو و بە دیواردا هەڵواسرابوو. لە یەکەم ژوور پاڵتوکانیان داکەند و دایانە دەست بەر پرسی دیوی جلان و لێیان پرسی سەناتۆرەکان هەموویان هاتوون یان نا و دەرکەوت دوایین کەسیان ساتێک لە مەو بەر هاتووە. فانارین فەراکی لە بەردا و بۆینباخی سپی لە ملی کرد بوو. لەویۆە چوون بۆ ژووری تەنیشت کە شوێنی چاوەڕوانی بوو و دەرگاکەی بەرەو دیوێکی گەورەتری جلان دەکرایەوە، لە سووچێکی ژوورەکە قاڵدرمەیەکی مارپێچ هەبوو کە فەرمانبەرانی تەرپۆش و ڕێکوپێک بە جانتاوە پێیدا دەهاتنە خوارێ. پیرەپیاوێکی وردیلە کە قەڵافەتێکی باوکانەی هەبوو و چاکەت و پانتۆڵێکی خۆڵەمێشینی لە بەردا بوو، بۆ گۆڕینی جلەکانی چوو بۆ ژووری جلان و دوای چەند خولەک بە جلوبەرگی کەلبەدوون کراو و کراسی سپیی

ملیوانە شەق و ڕەقەوە هاتە دەرێ. بەو جلوبەرگە فشوفۆڵەوە دەتگوت مریشکی ماڵییە. دیار بوو خۆشی بەو جلوبەرگەوە ئاسوودە نییە و ئازار دەکێشێ. ئەو پیاوە وردیلەیە سەناتۆر«ب» بوو کە بە بڕوای فانارین باشترین ئەندامی ئەو لقەی ئەنجومەنی سەنا بوو. فانارین چاوی بە یەکێک لە هاوکارانی پترزبۆرگیی خۆی کەوت و دەستی کرد بە قسە کردن لەگەڵی. نۆخلیدۆڤ چاوێکی بە ئامادەبوواندا گێڕا، نزیکەی یازدە کەس بوون. دوو ژن، یەکێکی چاویلکە لە چاو و ئەوی دیکەیان سەرەژنێکی سەروقژ ماشوبرنجی لەوێ بوون. ئەو ڕۆژە بڕیار بوو لە پەروەندەی ڕۆژنامە نووسێک بکۆڵنەوە کە تۆمەتی لە سەرۆکی کۆمپانیایەکی باوەڕپێکراوی بازرگانی دابوو. ئەو پەروەندەیە ماوەیەک بوو کەوتبووە ڕۆژەڤەوە و دەنگی دابۆوە، ڕۆژنامە نووسەکەش چاوەڕوانی بڕیاری دیوانی باڵای وڵات بوو.

چاوەدێر کە پیاوێکی قەڵافەت لەبار و تەڕپۆش بوو، کاغەزێکی بە دەستەوە هات بۆ لای فانارین، تاکوو بزانێ ئەو بۆ چی هاتووە؟ کاتێک بۆی دەرکەوت بۆ پەروەندەکەی ماسلۆڤا هاتووە، مەبەستەکەی یادداشت کرد و ڕۆیشت بە دوای کاری خۆیدا.

دوای چاوەڕوانییەکی زۆر نۆخلیدۆڤیش لەگەڵ ئەوانی دیکە چووە تەلارەکەوە و هەموویان لە پشت لاجامەکان لە سەر کورسیی تەماشاچیان دانیشتن؛ تەنیا پارێزەری پترزبۆرگی کە یەکێک لە دۆستانی فانارین بوو، چوو بۆ شوێنی پارێزەران. ئەم تەلارە، زۆر لە تەلاری دادگای قەزا چکۆلەتر بوو، زۆریش ساکار و بێ بریقوباق بوو. ڕووپۆشی مێزەکانی ئێرە مەخمەرێکی بەڵاڵووکی بوون بە ڕیشکۆی زێڕینەوە. جۆری دانانی ئاوێنەی عەداڵەت لە سەر مێزەکە و وێنەی حەزرەتی مەسیح و ئیمپراتۆر لەچاو دادگای قەزا جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو. کاتێک چاوەدێر فەرمی بوونی

کۆڕەکەی ڕاگەیاند، هەموو لە جێی خۆیان هەستان و سەناتۆرەکان بە جلوبەرگی فەرمییەوە هاتن لە سەرکورسییە دەسکدارەکان دانیشتن، هەنیشکیان نایە سەر مێزەکە و هەوڵیان دەدا هەڵسوکەوتیان ئاسایی بنوێنێ.

سەناتۆرەکان چوار کەس بوون. سەرۆکی ئەوان نیکیتین سەری بێ تووک و دەموچاوی باریک و چاوانی کز و بێ برووسکە بوون. سەناتۆر ڤۆلف لێوی بە سەریەکدا نابوو و پەروەندەکەی هەڵدەدایەوە. سەناتۆر سێکۆڤێردنیکۆڤ قەڵە و خڕیلانە و قورس، بە دەموچاوی هاولاوییەوە، چاوی لە شوێنێکی نادیار بڕیبوو؛ ئەو کەسێکی بیرمەند و مافناس بوو. چوارەمین کەسیش سەناتۆر«ب»، بە قەلافەتێکی باوکانەوە دانیشتبوو و لە هەموویان دەرەنگتر هاتبوو. نووسیاری دادگا و دادیاریش بە جلوبەرگی فەرمییەوە هاتبوون. دادیار ساردوسڕ و جیددی بوو، بە دەموچاوێکی ڕەشتاڵە و سەرنجێکی خەمناکەوە. کۆنت نۆخلیدۆڤ لە ڕێوە ناسییەوە. شەش ساڵ بوو چاوی پێی نەکەوتبوو. یەکێک لە هاوڕێیانی سەر دەمی زانکۆی بوو. فانارین چرپاندی بە گوێیدا:

ـ ئەوە سێلێنین، دادیاری دیوانی باڵایە.

ـ هاوڕێی کۆنی خۆمە، دەیناسم؛ کەسێکی باشە.

ـ بریا بچووبایەی بۆ لای.

ـ ئەگەر بمزانییایە، دەچووم. خەمت نەبێ، ویژدانی خۆی پێشێل ناکات.

نۆخلیدۆڤ هێندەی باسی هاوڕێیەیی گەرموگوڕ و شەرافەت و مافخوازیی سێلێنین کرد، فانارین هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ حەیف، تازە دەستمان پێی ڕاناگا، بریا پێش ئێستا چاوت پێی بکووتایە و قسەت لەگەڵ بکردایە.

باسـێکی چڕوپـڕ لە دادگـا دەسـتی پێکـرد. نۆخلیـدۆڤ بە وردی گـوێی ڕاگرتبوو بۆ ئەوەی مەسەلەکانی بۆ ڕوون بێتەوە. ئێرە بە پێچەوانەی دادگا ئاسـاییەکان، قسـەیان لە سـەر کێشـە و چییەتیی ڕووداوەکە دەکـرد و تەنیـا پێداگرییان لە سـەر پێداچوونەوە و چـۆنیەتیی بەڕێوەچـوونی یاسـا دەکـرد. باسەکەیان لە سەر وتارێک بوو کە لە یەکێک لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو کرابۆوە و ساختەکاریی سەرۆکی شەریکەیەکی بازرگانیی ئاشکرا کردبوو. لێرەدا باس لە سـەر ئەوە نەبوو کە سـەرۆکی شـەریکەیەک گزە و گەندەڵکاریی کـردووە، بەڵکوو بـاس لە سـەر ئەوە بـوو کە ئەو ڕۆژنـامەیە مـافی چـاپ کردنـی ئەو جۆرە بابەتـانەی هەیە یـان نـا؟ ئەگەر مـافی ئەوەشـی نییە دەبێ چبکەن؟ لەم نێوانەدا زۆر مەسەلەیان هێنایە گۆڕێ کە جگە لە شـارەزایاتی ئەو بوارە هیچ کەسی تر سەری لێی دەرنەدەچوو. مـاوەیەک بـاس لە سـەر ئەوە بـوو کە ئەو تـۆمەتە وەک سـووکایەتی و بوختـان دێـتە ئەژمـار... هەر وەهـا هێنـدێ وردەکـاریی تـر کە بـۆ ئەو کەسـانەی شـارەزای ئەو بـوارە نەبـوون، زۆر جاڕزکەر بوو.

نۆخلیدۆڤ ئەو خاڵەی بۆ ڕوون بووبۆوە کە سـەناتۆر ڤۆلـڤ دەرەنجامی ڕاپـۆرتەکەی ئامـادە کـردووە و بە پـێچەوانەی وتەی خـۆی کە دیـوانی بـاڵا ناچێتە سەر چییەیتی مەسەلەکە، چووبووە سەر باسێکی تـر و یاسـای پێشـێل کردبـوو. سـێلێنین کە وەک کەسـێکی خوێنسـارد و لەسـەرەخۆ ناوبـانگی دەرکردبوو، لە هەمبەریدا ڕاست بۆوە و دەرهەڵبوو، ئەو نەیدەویست بە هیچ جۆرێـک بڕیارێـک بە قـازانجی ئەو پیـاوە سـامانداره دەرچـێ. بەتـایبەت کە ئاگادار کرابۆوە، ئەو سەرۆکی شەریکەیە، شەوی ڕابردوو سەناتۆر ڤۆلڤی بۆ مـاڵی خۆیـان بانگهێشـتن کـردووە و ئاهەنـگ و میـوانییەکی پڕشـکۆی بەو بـۆنەیەوە بەڕێـوە بـردووە، هەر وەهـا کاتێـک سـەناتۆر ڤۆلـڤ بە پـارێز و

زیرەکییەکی زۆرەوە پیشتیوانیی لە سەرۆکی کۆمپانیاکە دەکرد، سێلێنین وەهای گوڕاند بە سەریدا، سەناتۆر ڤۆلف سوور هەڵگەڕا و بە جارێ شڵەژا؛ سەناتۆرەکانی دیکەش کە دتییان بارودۆخەکە خەریکە ئاڵۆز دەبێ، کۆتاییان بە باسەکە هێنا و چوون بۆ ژووری ڕاوێژکاری.

فەرمانبەری چاوەدێری دیسان چوو بۆ لای فانارین و گوتی:

ـ فەرمووت بۆ کام پەروەندە هاتووی؟

ـ پەروەندەی کاترین ماسلۆڤا.

ـ ئەمڕۆ دەبێ ئەو پەروەندەیەش بکەوێتە بەر باس بەڵام دەترسم...

ـ لە چی دەترسی؟

ـ پەروەندەی چاپەمەنییان برد لە ژووری داخراودا بڕیاری لە سەر بدەن. مەحاڵە سەناتۆر دوای تەواو بوونی ئەو کارە تاقەتی ببێ بچێتە سەر پەروەندەیەکی تر.

ـ بەڵام ئێمە لە ڕێگایەکی دوورەوە هاتووین.

ـ من هەوڵی خۆم دەدەم.

فەرمانبەری چاوەدێری شتێکی یادداشت کرد و ڕۆیشت، لە ڕواڵەتدا وا دیار بوو سەناتۆرەکان دەیانهەوێ سەروبەری مەسەلەکە وێک بێننەوە و پاشماوەی کارەکان هەڵگرن بۆ ڕۆژێکی تر.

# بیست و یەک

چوار سەناتۆر لە سەر مێزێک دانیشتن و جەنابی ڤۆڵڤ بە گوڕوتینەوە بەڵگەی دەهێنایەوە و دەیویست ئەوانی دیکە قانع بکات کە حوکمی دادگا هەڵوەشێننەوە. سەناتۆر نیکیتین، کە سەرۆکی گۆڕەکە بوو گوێی بە قسەکانی نەدەدا. خۆی لە خۆیدا مرۆڤێکی دڵپاک و ڕۆحسووک نەبوو، ئەو ڕۆژەش گرژ و بێ تاقەت بوو. لە سەرەتاوە بڕیاری خۆی لە سەر ئەو پەروەندەیە دابوو. ئیتر بە پێویستی نەدەزانی گوێ بۆ قسەی ئەوان بگرێ. لە بیری ئەو یادداشتانەدا بوو کە شەوی ڕابردوو نووسیبووی. ماوەیەک بوو بیرەوەرییەکانی ڕابردووی دەنووسییەوە و دوێشەو گەیشتبووە ئەو جێیەی کەسێک بە ناوی ویلیانۆڤ بەردی خستبووە سەر ڕێگای و نەیهێشتبوو بەو پلەوپایە بگا کە حەزی لێیبوو، چونکە ئەو کارە دەبووە هۆی ئەوەی نانی بکەوێتە ڕۆنەوە.

بیرەوەرییەکانی بە وردی و بەوەسواسێکی زۆرەوە دەنووسی و لە سەر ئەو باوەڕە بوو بیروڕای ئەو سەبارەت بە فەرمانبەران، لە هەر پیشە و پلەوپایەیەکدا بووبن و پێوەندی نزیکیان لەگەڵی بووبێ، دەبێ ڕێزی بۆ دانێن و کارەکەی ئەو بە گرنیگ بزانن. لە بەشێکی ئەو یادداشتانەدا، تاقمێکی لە فەرمانبەران بەوە تۆمەتبار کردبوو کە بوونەتە بەربەستی ڕێگای خەڵک و ناهێڵن ڕووسیا لەو گێژاوە ڕزگار بێ کە تێی کەوتووە؛ لە ڕاستیدا ئەو تاقمە

لە فەرمانبەران کەسانێک بوون کە نەیاندەهێشت سەناتۆر بە ئامانجی خۆی بگا و مووچە و پاداشی زیاتر وەرگرێ. بە هەر حاڵ، ئەم سەناتۆرە پایەبەرزە لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە یادداشتەکانی دەبێ چاپ بێ بۆ ئەوەی ببێتە عیبرەت بۆ هەمووان و بەرەکانی داهاتووش پەندی لێ وەرگرن. سەناتۆر ڤۆلف یەک ـ دوو جار لە بەینی قسەکانیدا داوای لە جەنابی سەرۆک کرد قسەکانی پشت ڕاست بکاتەوە، ئەویش کە نوقمی بیر و خەیاڵ بوو تەنیا سەرێکی لە قاند و گوتی:

ـ بەڵێ... ئەوەی دەفەرمووی هەروایە!

سەناتۆر«ب»،خۆی گرژ و خەمبار نیشان دەدا. لە سەر کاغەزەکەی بەر دەستی گوڵێکی دەکێشایەوە. یەکێک لە لیبراله خاوەن پێشینەکان بوو. بێ لایەن و بەبێ هیچ مەبەستێک بڕیاری دەدا؛ لە هەمبەر هەر شتێکدا کە ئازادیی سنووردار بکردایە بەربەرەکانێی دەکرد و لەم مەسەلەیەشدا لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە نابێ حوکمی ئەم کابرا ساماندارە هەڵوەشێتەوە، چونکە پیاوێکی گەندەڵکار و ناوزڕاوە و لەوەش گرینگتر نابی بەرگری لە ئازادیی ڕۆژنامە و بڵاڤۆک بکرێ. دوای ڤۆلف، سەناتۆر «ب» دەستی لە وێنەکێشان هەڵگرت و بە دەنگی گڕ و خەم تێزاو بەڵگەی قورس و قایمی هێنایەوە و دیسان دەستی کردەوە بە وێنەکێشان.

سیکۆردنیکۆڤ کە بەرەوڕووی ڤۆلف دانیشتبوو، جار جار بە قامکی ئەستووری ڕیشی خۆی هەڵدەکەند و جارجاریش سمێڵی دەکرۆشت، بە ڕاشکاوی گوتی سەرەڕای بەدناویی سەرۆکی شەریکە، ئەگەر بەڵگەکان بۆ هەڵوەشاندنەوەی حوکمەکە بەجێ و بێ کەموکووڕی بووایەن، لایەنگریی لێدەکرد و دەنگی پێدەدا؛ بەڵام چونکە بەڵگەی پێویست بە دەستەوە نییە، من دژی هەڵوەشاندنەوەی حوکمەکەم. سەناتۆر«ب»، قسەکەی ئەوی پشت

ڕاســت کــردەوە و ســەرۆکیش گــوتی لە گەڵیــدا هــاوڕایە؛ بەم شــێوەیە سـکالانامەی پێـداچوونەوە و هەڵوەشـاندنەوەی حـوکمی سـەرۆکی شـەریکە ڕەدکرایەوە.

سـەناتۆر ڤۆلـڤ تـووڕە بووبـو؛ بەڵام سـەرەڕای ئەوەی لەو مەسـەلەیەدا شکسـتی خواردبـوو، وای دەنوانـد گـوێی لـێ نییە. ئیتـر وێـدەچوو کارێکیـان نەمـابێ و هیچیـان لە بیـری پەروەنـدەی دواییـدا نەبـوون. لە زەنگیـان دا و چاییـان هێنـا، بـاس هـاتبووە سـەر مەسـەلەی ڕۆژ. باسـی دوئێـل و کـوژرانی کـوڕەکەی خــاتوو کۆمنســکایا مــاوەیەک ســەرقاڵی کــردن. پاشــان باســی ڕووداوێکـی تـازە هـاتە گـۆڕێ کە زۆر سـەرنج ڕاکـێش بـوو. گۆیـا سـەرۆکی یەکێـک لە فەرمانگەکـان مـاوەیەک لە مەوبەر لە کـاتی نێربازیـدا گیـراوە؛ ئەم تـاوانەش دیـارە لە ڕوانـگەی یاسـاییەوە بە پێـی مـادەی 995 پێویسـتی بە لێکۆڵینەوە و بە دوادا چوون هەبوو. سەناتۆر«ب» بە ڕق هەستاوی گوتی:

ـ بەڕاستی کارێکی دزێوە!

سەناتۆر سیکۆردنیکۆڤ دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:

ــ ئەوەنــدە خۆتــان ســەغڵەت مەکەن. نووســەرێکی ئەڵمــانی مــاوەیەک لەمەوبەر کتێبێکـی نووسـیوە و پێشـنیاری کـردووە پیـاو دەتـوانی لەگەڵ پیـاو ژیانی هاوبەش پێک بێنێ و وا باشە یاسا ڕێگای پێ بدا.

سـەناتۆر«ب» بـڕوای بە قسـەکەی نەدەکـرد، بەڵام سـیکۆردنیکۆڤ نـاوی نووسەر و چاپخانە و ڕێکەوتی چاپی کتێبەکەی گوت و بەڵێنی پێدان کتێبەکە بێنێ پیشانیان بدا. نیکیتین پەڕییە نێوقسەکانیان و گوتی:

ـ لە هەمووی گرنیگتـر پیشـەی نوێی ئەو بەر پرسـەیە. کراوە بە قایمقامی یەکێک لە شارەکانی سیبیریا و گوایە چۆتە سـەر کارەکەی،یان خـۆی ئامـادە کردووە وەڕێ بکەوێ.

سیکۆردنیکۆڤ مەسەلەکەی بە گاڵتە زانی و گوتی:

ـ لێی پیرۆز بێ. بیهێننە بەر چاوی خۆتان، جەنابی ئوسقۆف خاچ بە دەستەوە دەگرێ و بە کۆڵێ تەشریفاتەوە دێ بەرەوپیری قایمقامێکی ئاوا! بۆ وێنە من ئوسقۆفێک دەناسم لەگەڵ ئەو قایمقامە هاوسەلیقەیە و ئەگەر ئەو بەڕێزە ڕازی بێ ئامادەم ئەو ئوسقۆفەی پێ بناسێنم؛ ئەو کاتە دەتوانن دەست بدەنە دەستی یەک شارەکە بەڕێوە بەرن و بە ئاسوودەیی بە کاروبارەکانیان ڕابگەین.

سکۆردنیکۆڤ دوای ئەو گاڵتەوگەپ و باسانە جگەرەکەی کوژاندوە و دەستی کردەوە بە کرۆشتنی سمێڵ و هەڵکەندنی ڕیشی خۆی. فەرمانبەری چاوەدێری هەلەکەی بە لەبار زانی بوو، هات و گوتی فانارین و نۆخلیدۆڤ دەخوازن چارە نووسی پەروەندەکەی ماسلۆڤا ڕوون بکەنەوە. ڤۆلف لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەو پەروەندەیە وەک چیرۆک دەچێ، ئەوەی سەبارەت بە کۆنت نۆخلیدۆڤ و کاترین ماسلۆڤا دەیزانی بە وردی و بە تام و خوێوە بۆ سەناتۆری گێڕایەوە. چەند خولەکێک بە سەر هاتی ئەو ژنە سەرقاڵی کردن و یەکی جگەرەیەکی دیکەیان کێشا و چوون بۆ نێو تەلارەکە. لەوێ دوای فەرمی بوونی کۆڕەکە، ڤۆلف ڕاپۆرتێکی ئامادە کردبوو، خوێندییەوە و داوای کرد حوکمەکەی دادگا هەڵوەشێتەوە. سەرۆک ئاماژەی بە فانارین کرد ئەگەر قسەیەکی هەیە، بیکات.

فانارین بە فەراک و کراسی ملیوانە سپییەوە لە جێی خۆی هەستا و بەرەڤاینی لە سکاڵانامەکە کرد و شەش خاڵی باس کرد کە ڕێسای دادیارییان پێشێل کردووە، لەگەڵ وتەکانی داوای لێبوردنی لە سەناتۆرەکان کرد کە ئەو بابەتانەیان بە ئاگاداری دەگەیێنێ، دەنا بە باشی دەزانی ئەوان خۆیان لەو شتانە ئاگادارن و لە هەموو شتێک تێدەگەن.

فانارین دوای کۆتایی هاتنی وتەکانی، بە بزەیەکی سەر کەوتووانەوە لە جێی خۆی دانیشتەوە و کۆنت نۆخلیدۆڤ کاتێک بزەکەی فانارینی دی دڵی خۆش بوو و بە خۆی گوت: «وادیارە کارەکەمان گرتی و هێندەی نەماوە هەڵوەشاندنەوەی حوکمی دادگا ڕاگەیێنن.» بەڵام کە چاوی لە ڕوخساری دادیار و سەناتۆرەکان کرد، بۆی دەرکەوت بزەی سەرکەوتووانەی جەنابی پارێزەر هیچ کاردانەوەیەکی لە سەر ئەوان نەبووە و دەتگوت هەموویان بە زمانی چاویان دەڵێن ئێمە زۆرمان لەو وتار و باسانە بیستووە و زۆرمان سکاڵانامەی ئاوا دیتووە؛ ئەو قسانەش هیچ کەڵکێکی نییە! دوای فانارین، نۆرەی سێلێنین بوو قسە بکات. ئەو وەک دادوەر لە وتەکانیدا بە کورتی و بەوردی ڕایگەیاند کە بەڵگەی پێویست بۆ هەڵوەشاندنەوەی حوکمەکە لە بەر دەستدا نییە و دوای ئەو وتانە، سەناتۆرەکان بە دوو دەستە دابەش بوون. ڤۆڵف ڕازی بە هەڵوەشاندنەوەی حوکمەکە بوو. سەناتۆر«ب» ش کە لە هەموویان تیگەیشتووتر بوو، ڕاستییەکەی بۆ دەرکەوتبوو و ڕازی بوو حوکمە هەڵوەشێتەوە، بە ڕاشکاویش بۆ هاوکارەکانی ڕوون کردەوە کە لیژنەی داوەران تووشی هەڵە بوون. بەڵام نیکیتین وەک هەمیشە لایەنگری لە لێبڕاوی دەکرد و زیاتر لە هەموو شتێک گرنگیی بە ڕواڵەتی ڕووداوەکان دەدا و لێرەشدا دژی هەڵوەشاندنەوەی حوکمەکە بوو. ڕەنگە بەو هۆیەش بێ کە ئەو لە پێڕەوانی داروین و بڕوامەندانی تاقمی ماتریالیزم بوو، باوەڕی بە ڕێسای ڕەوشت و ئایین نەبوو و لێرەشدا کە بۆی دەرکەوت کۆنتێکی وەک نۆخلیدۆڤ بە هۆی ڕەوشت و دەروەست بوونەوە دەیهەوێ لەگەڵ لەشفرۆشێکی بەستۆکەی وەک ماسلۆڤا زەماوەند بکات، بۆ قەرەبووی تاوانەکەشی خۆی بە ئاو و ئاوردا دەدا و پارێزەرێکی لێزانی لەگەڵ خۆی هێناوە بۆ دیوانی سەنا، تاکوو ماسلۆڤا لە بەندیخانە ڕزگار بکات، شڵەژا و

ڕقی هەستا. چونکە ئەو کارانەی بە دڵ نەبوو. هەر بەو هۆیەش لە کاتێکدا کە سمێڵی خۆی دەکرۆشت و ڕیشی هەڵدەکەند، گوتی بەڵگەی تەواو بۆ هەڵوەشاندنەوەی حوکمەکە نییە و لەگەڵ سەرۆک هاوڕایە.

بەم شێوەیە سکاڵانامەی پێدا چوونەوە ڕەدکرایەوە.

# بیست و دوو

نۆخلیدۆڤ لە تەلارەکە هاتە دەرێ و ڕووی لە فانارین کرد کە خەریک بوو کاغەزەکانی دەخستە نێوجانتاکەیەوە، گوتی:

ــ بە ڕاستی هیچوپووچن. لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو شتێک ڕوون و ئاشکرا بوو حوکمەکەیان هەڵنەوەشاندەوە.

ـ کارەکە لە سەرەتاوە هەڵە بوو؛ خەتای دادگای تاوانەکان بوو.

ــ تەنانەت سێلینین کە پێم وابوو کەسێکی باشە، دژی سکاڵانامەکە ڕاوەستا. زۆر سەیرە! باوەڕ ناکەم. ئێستا چبکەین؟

ـ دەبێ داوای بەخشین بکەین. من دەقی داخوازییەکە دەنووسم. ئێوە هەتا لە پترزبۆرگن داخوازییەکە بگەیەننە کومیسیۆنی بەخشین و لێبوردن.

سەناتۆر ڤۆلڤ کە بە جلوبەرگی کەلبەدوون کراوەوە و بە تەنیشت نۆخلیدۆڤدا تێپەری، دڵخۆشیی دایەوە.

ـ کۆنتی بەڕێز! خەتای ئێمە نییە؛ بەڵگەکان ناتەواو بوون.

سێلێنین کە لە هاوکارەکانی بیستبوو هاوڕێی لە مێژینەی خۆی نۆخلیدۆڤ لەوێیە، بە پێکەنینەوە هات بۆلای.

ـ قەت بڕوام نەدەکرد تۆ لێرە ببینم.

ـ منیش نەمدەزانی تۆ بویەتە دادستانی گشتی!

ـ دادستانی گشتی نا، دادیارم. بیستم هاتووی بۆ پترزبۆرگ. بەڵام پێم سەیرە هاتووی بۆ ئێرە.

ـ هاتووم بۆ ئێرە، چونکە پێم وابوو مرۆڤێکی عەداڵەت خوازی و ئامادەی ژنێکی بێ تاوان لە بەندیخانە ڕزگار بکەی

ـ مەبەستت کام ژنە؟

ـ هەر ئەو ژنەی سکاڵانامەی هەڵوەشاندنەوەی حوکمەکەیت ڕەد کردەوە.

ـ مەبەستت پەروەندەکەی ماسلۆڤایە؟ ئەم سکاڵانامەیە بێ بنەمابوو.

ـ سکاڵانامەکە گرنیگ نەبوو، ئەو ژنە بێ تاوانە.

ـ وێدەچێ بێ تاوان بێ، بەڵام...

ـ من دڵنیام ئەو ژنە بێ تاوانە.

ـ چۆن ئاوا دڵنیای؟

ـ خۆم ئەندامی لیژنەی داوەران بووم. بۆیە لێم ڕوونە چ هەڵەیەک ڕووی دا.

سێلێنین چوو لەماڵی فیکرەوە و دوای تاوێک گوتی:

ـ دەبوو ئەو کاتە پێت بگوتبایەین و سوورەت جەلەسەیەکت بنووسیبایە و ڕەگەڵ سکاڵانامەکەت بخستبایە.

سێلێنین زیاتر بیری لە لای کاروبارەکانی خۆی بوو و زۆر کەم کاتی ئەوەی بوو لەگەڵ خەڵک هەڵسوکەوت بکات، هەر بۆیە تا ئێستا بەسەرهاتی نۆخلیدۆڤ و ماسلۆڤای نەبیستبوو، لەوەش سەری سوورمابوو بۆچی نۆخلیدۆڤ ئاوا بە پەرۆشەوە باسی پەروەندەکەی ماسلۆڤا دەکات.

ـ پەروەندەکە بە باشی دەریدەخات ماسلۆڤا بێ تاوانە.

ـ ئەنجـومەنی ســەنا نەچـووە ســەر چیەیتــی ڕووداوەکە. ئەگەر بە پێــی بەڵـگەی تـایبەتیش حـوکمی دادگـای تاوانەکـان هەڵوەشـێنێتەوە، هاوسـەنگی و بارودۆخی یاسا تێک دەچێ و ناتوانێ پاڵپشتێک بێ بۆ دەزگای یاسایی وڵات و متمانەی خۆی لە دەست دەدات.

ـ هەر ئەوەندە دەزانم ئەو ژنە بێ تـاوانە و دوایـین هیـوای ئێمەش بڕدرا؛ بالاترین ناوەندی یاسایی وڵات کاری هەڵەی دادگای تاوانەکانی پەسند کرد.

ـ هەڵەی تـۆ لێـرەدایە. سـەنا بڕیـاری دادگـای تاوانەکـانی پەسـند نەکـرد؛ چونکە بڕیاری لە سـەر چییەتی ڕوووداوەکە نەدا. بۆ ئەوەی بـابەتە بگۆڕێ، لێی پرسی:

ـ دەڵـێن لە مـاڵی پـوورتی. دوێشــەو بیسـتم. بـۆ کـۆڕی دۆعـا و پـاڕانەوە بانگهێشتن کرابووم.

ـ خودا و ڕاستان منیش دوێشەو لەو کۆڕە بووم و حاڵم تێکچوو.

ـ بۆ حاڵت تێکچوو؟ هەر چییەک بێ کۆڕێکی ئایینییە؛ ئەگەر چـی دەسـتە و تــاقمێکی کەمــین! ڕاســتییەکەی ئەوەیە ئــایین بە باشــی ناناســین و ڕۆح و ڕەسەنایەتییەکەیمان بۆ دەرنەکەوتووە.

نۆخلیدۆڤ کە لە سالانی ڕابردووەوە دەیناسی، سەری لێی سـوورما بـوو. سـێلێنین مـات و خەمبـار دیـار بـوو. هـێمن و دڵنیـا دەدوا و نۆخلیـدۆڤ پێـی وابوو بە پێچەوانە لێی حاڵی بووە.

ـ کەوایە تۆ بڕوات بە کلیسا و بابەتەکانی ئەو تاقمە هەیە؟

ـ بڕوام بەو شتانە نییە؛ بەڵام باوەڕم بە ئایین هەیە.

ـ سەیرە.

فەرمانبەری چاوەدێری هاتبوو سێلێنین بانگ بکات بۆ تەلارەکە و ئەو ئاماژەی پێکرد کە دوای چەند خولەکی تر دێ، داوای لە نۆخلیدۆڤ کرد لە شوێنێک چاویان بە یەکتر بکەوێ و بە پێدا گرییەوە گوتی:

ـ پێم خۆشە یەکتر ببینین و زیاتر پێکەوە قسە بکەین. من هەمیشە سەعات حەوتی دوانیوەڕۆ دەچمەوە بۆ ماڵێ. هەر ئێستا ناونیشانی ماڵەکەمت بۆ دەنووسم. حەتمەن وەرە، دەمهەوێ زۆر شتت بۆ باس بکەم. لەو ماوەیەدا کە یەکترمان نەدیوە بە تەواوی گۆڕاوم. بە چەند وشە ناکرێ هەموو شتێکت تێگەیێنم.

ـ حەتمەن دێم.

نۆخلیدۆڤ هەستی دەکرد ئەم کەسە کە لە ڕابردوودا ئەو هەمووە بەلایەوە خۆشەویست و بەڕێز بوو، ئەمڕۆ بە تەواوی نامۆیە بۆی و هێندە لە یەک دوور کەوتوونەوە لە قسەی یەکتر تێنا گەن.

# بیست و سێ

نۆخلیدۆڤ و سێلێنین لە کاتی خوێندنی زانکۆدا پێکەوە ئاشنا بووبوون و هاوڕێ و هاوڕازی یەکتر بوون. لەو کاتەدا، سێلێنین لاوێکی جوانچاک و تەڕپۆش و بەژنوباڵا جوان بوو. مەند و ماقووڵ و لە چاو تەمەنی خۆی زانیارییەکی زۆر باشی هەبوو. کوڕێکی ڕاست و بەشەرەف بوو، بە هۆی بەهرەمەندی و یەکەم بوون لە خوێندندا چەند میداڵیای ئاڵتوونی وەرگرتبوو. ئاواتی ئەوە بوو بە زمان و بە کردەوە خزمەتکاری خەڵک بێ و پێی وابوو لە دامودەزگای دەوڵەتیدا باشتر دەتوانێ خزمەت بکات. دوای کۆتایی هاتنی

خوێندنەکەی، ماوەیەک بۆ هەڵبژاردنی پیشە متالای کرد و لە ئاکامدا لە وەزارەتی داد، بوو بە فەرمانبەری دایرەی ئامادە کردن و چاکسازیی یاساکان. پێی وابوو لەو شوێنە بە نووسینی بابەت و عەریزەی بەکەڵک باشتر دەتوانێ خزمەت بکات. زۆری نەخایاند بۆی دەرکەوت هەر چەند کارەکانی بە شێوەیەکی سادقانە ئەنجام دەدا،کەڵکی بۆ هیچ کەس نییە. لە هەمووشی خراپتر لەگەڵ بەرپرسی دایرەکەیان کە پیاوێکی خوێڕی و لەخۆڕازی بوو، سەر و کڵاویان تێکەڵ بوو؛ بە ناچاری دەستی لە کار کێشایەوە و چووە بەشی یاسایی ئەنجومەنی سەناوە. لەوێش دڵی ئاوی نەخواردەوە و وردە وەردە هەستی کرد هیچ شتێک بە پێی مەیلی ئەو نییە و هیچکام لەو کارانەش ئەوە نییە کە چاوەڕوانی دەکرد. لەو کاتەدا کە لە ئەنجومەنی سەنا کاری دەکرد، خزم و کەسە دەستڕۆیشتووەکانی توانییان وەک پێشخزمەتی تایبەتی خاوەن شکۆ ئیمپراتۆر دایمەزرێنن و زیاتر ببێتە باوەڕپێکراو و جێ متمانەی دەوڵەت و هەتا ماوەیەک ناچار بوو جلوبەرگی کەلبەدوونکراو لە بەر بکات، سواری فەیتوونی تایبەت بێ و بچێت بۆ خزمەتی کەسایەتییە پایەبەرزەکانی وڵات؛ سەری ڕێزیان بۆ دانەوێنێ کە پیشەیەکی ئاوا باش و پڕ بایەخیان پێداوە. دیسان زۆری نەخایاند هەستی کرد لەم پیشە و پلەوپایەیەش دڵی ئاو ناخواتەوە و ویژدانی ڕازیی ناکات. بەڵام کاتێک لەبەر ئاوێنەیەکی بالانوێن ڕاوەستا و خۆی بەو جلوبەرگە کەلبەدوونکراوە و ئەو هەموو باقوبریقەوە دی، ویژدان و ڕەزایەتی ڕۆحیی وەلانا و دڵی حەسایەوە.

بۆ پێک هێنانی ژیانی هاوبەشیش تووشی ئەو گرفتە بوو. بەڵام گەورەکان بە هانایەوە هاتن و کچێکی جوانیان لە بنەماڵەیەکی ناوبەدەرەوە بۆ دەستنیشان کرد و دەستیان لە دەستی یەک نان. ئەو بە دڵ یان نابەدڵ ملی

پێدا کرد، چونکە نەیدەویست هەستی ئەو کچە شۆخوشەنگە بڕووشێنێ و گەورەکانیش لە خۆی زویر بکات و دڵیان بڕەنجێنێ. جگە لەوانەش ئەو زەماوەنده بارودۆخی کۆمەڵایەتیی ئەوی بەرز دەکردەوە و هەستی خۆپەرەستییەکەی پاراو دەبوو. دیسان زۆری نەخایاند هەستی کرد ئەم زەماوەندەش دڵی ڕازی ناکات و بە ویستی دەروونیی ناگەیێنێ.

ساڵێک دوای زەماوەندەکەی، کچێکیان بوو و دوای چەند ساڵ، ژنەکەی تێیگەیاند کە ئەوە یەکەمین و دوایین منداڵیانە و ئەو نایهەوێ تەندروستی و جوانیی جەستەی خۆی بخاتە مەترسییەوە؛ منداڵە بەری ژیانی کۆمەڵایەتی و سەردان و ڕابواردنی لێ تێکدەدات. ژنەکەی خەیانەتی پێ نەدەکرد، بەڵام زۆر تامەزرۆی گەورەیی و شکۆ و هەڵسوکەوت لەگەڵ گەورەپیاوان بوو؛ سێلێنینیش کە حەزی لە تەنیایی و بیرکردنەوە و بەخۆداچوونەوە بوو، ئەو کۆڕ و هاتوچۆیانە زۆری بێزار دەکرد و هەرچی هەوڵی دەدا نەیدەتوانی ڕەفتاری ژنەکەی بگۆڕێ. هەرچی پێی دەگوت و شێروڕێویی بۆ دەهێنایەوە، بەم گوێچکەیدا دەچوو و بە ئەوی دیکەیدا دەهاتە دەرێ. هەموو خزم و دۆستانیش هاوفکر و پشتیوانی ژنەکەی بوون، بۆیە ناچار بوو سەری داخات و هیچ نەڵێ. کچە وردیلە و ژیکەڵە و کەزیە زێڕینەکەشی لێی نامۆ بوو. تەنانەت هەقی نەبوو بە پێی مەیلی خۆی پەروەردەی بکات. هیچ چەشنە خۆشەویستی و سازگارییەک لە نێوان ئەو ژن و مێردەدا نەبوو. نەیاندەهێشت خەڵکی بە کێشەکانیان بزانێ و ددانیان بە خۆیاندا دەگرت، بەڵام قەت پێکەوە دانوویان نەدەکولا. سێلێنین زۆر لە ژیانی هاوبەشیی خۆی بێزار بوو و هەستی دەکرد ئەم بارودۆخە زۆر زیاتر لە ئیشەکەی ئەنجومەنی سەنا و ئەرکەکانی دەربار ڕۆحی ئازار دەدا.

لە نێو گێژاوی ئەم هەموو ناکۆکی و ئازارە ڕۆحییەدا پەلەقاژەی دەکرد و لە ژیان و هەموو شتێکی دەوروبەری وەڕەز بوو؛ بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو گرفت و تەنگژانە جاروبار بیری لە بڕوا ئایینییەکانی خۆی دەکردەوە. سەردەمی لاوی، وەک هەموو کەسانی هاوشانی خۆی لە دین و ئایین دابڕا بوو. تەنانەت خۆشی لە بیری نەبوو لە چ کاتێکەوە لەو بیروباوەڕانە دوور کەوتۆتەوە. لەو کاتەدا کە لەگەڵ نۆخلیدۆڤ هاوڕێ و هاودەرس بوون، هیچکامیان لەو بیروباوەڕانەیان نەبوو. تێپەڕینی ساڵەکان ئاڵوگۆڕی بە سەر زۆر شتدا هێنا بوو. ئەو ئیتر ئەو خوێندکارە دڵساف و ساکارە نەبوو، بووبووە پیاوێکی خاوەن ناو و پلەوپایە؛ سەرێک بوو لە نێو سەران و ناچار بوو لە زۆربەی ڕێوڕەسمی ئەنجومەنەکاندا بەشداری بکات. وردە وردە بووبووە کەسێکی خۆپارێز. نەیدەتوانی وەک سەردەمی لاوی کەمتەرخەم و بێ موبالات بێ. دوای مەرگی باوکی، دایکی بۆ ئەرکی ئایینی هانی دەدا و لە سەر بەڕێوە بردنی ئەو ئەرکانە پێداگر بوو. بە هۆی پلەوپایە و بارودۆخی کۆمەڵایەتییەوە ناچار بوو لە ڕێوڕەسمەکانی دۆعا و پاڕانەوەدا بەشداری بکات؛ بەتایبەت بەهۆی پلەوپایەی دەربارییەوە ئەم جۆرە ڕێوڕەسمانە زۆر بوون و ئامادەبوونی ئەویش پێویست بوو. بۆ کەسێکی وەک ئەو کە پیاوێکی سادق و دروستکار بوو و حەزی نەدەکرد ویژدانی خۆی بخاتە ژێرپێ و درۆ لە خۆی بکات، بەشداری کردن لەو جۆرە ڕێوڕەسمانەدا بەبێ هیچ چەشنە بڕوایەکی ڕۆحی، جۆرێک ڕیاکاری دەهاتە ئەژمار و ئەو نەیدەویست کەسێکی ڕیاباز و درۆزن بێ. هەتا ئێرە ملی بۆ هەموو شتێک داخستبوو. ئەگەرچی کارەکەی خۆی بە دڵ نەبوو و لە پلەوپایەکەی خۆی وەڕەز بوو، نازناوی دەرباریی خۆی بە سووکایەتی دەزانی و هەمووانی بە دژبەری ویژدان و ڕەوشتی ئینسانی دەهاتە بەرچاو، سەری داخستبوو و شێلگیرانە و

سادقانە کاری خۆی ئەنجام دەدا. سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ ژنەکەیدا ناسازگار بوون، لەبەر دەستیدا وەک مێووڕۆنی لێ هاتبوو و لەگەڵیدا بۆ هەموو میوانییەکی گەورە و خانەدانەکان دەچوو و ئازاری تەواوی ئەو هاموشۆ تاڵ و جارزکەرانەی تامڵ دەکرد. کاتی تەشریفات و ڕێورەسمی ئاییینیش هەر ئەوە حالی بوو. ئەگەر سەرەڕۆیی بکردبایە و بیگوتایە باوەڕی بەو شتانە نییە، ئیش و پلەوپایەکەی لەدەست دەدا، لە ئەنجومەنی سەناش دەردەکرا و ژیانی بنەماڵەکەی لە ڕێسمە دەچوو. وردەوردە لەو بوارەدا ملی داخست و نەرم بوو. خووی بە هەموو شتێک گرتبوو. فێری مەرایی و درۆ و دەلەسەش بوو و هەتا بینە قاقا کەوتە گێژاوی ڕیاکاری و دووڕوویییەوە.

ئایین بەلایەوە گرینگ بووبوو. بەردەوام بیری دەکردەوە و دەیویست وەڵامی پرسیارەکانی بدۆزێتەوە. لە بنەماڵەیەکی مەسیحیدا لە دایک بووبوو. لەگەڵ مەسیحییەکان گەورە بووبوو و زۆربەی دەوروبەرییەکانی مەسیحی بوون. ئەو دەبوو ڕاستییەکان بدۆزێتەوە؛ بەرهەمی ڤۆلتێر، شۆپێنهاوێر، ئیسپێنسەر و ئاگوست کۆنتی چەندین جار خوێندبۆوە. بەرهەمە فەلسەفییەکانی هیگل و ئەندێشە ئایینییەکانی ڤینەت[٥٤] و خۆمیاکۆڤی[٥٥] بە وردی خوێندبۆوە و زۆر شتیان لێ فێر بووبوو. بەهۆی ئەو موتالا و ئەزموونانەی خۆیەوە بە جێیەک گەیشتبوو ئەگەر ئایین نەبێ، زۆربەی کارەکانی کۆمەڵگا ڤەشەڵ دێنێ و بەبێ ئایین کێشەکان زۆرتر دەبن. بۆیە هاتبووە سەر ئەو باوەڕەی مرۆڤ جگە لە سەرداخستن لە هەمبەر ئایین و تەشریفات و ئەرکەکانی چارەیەکی تری نییە. مل داخستنی ئەو لێرەوە دەستی پێکرد و وردە وردە نەک لە هەمبەر ئایینـدا، بەڵکوو لە هەمبەر

---

54. A.vinet (1797-1847)یەکێک لە عالمەکانی سویس بوو.
55. Khomiakov (1804-1860)بەرەچەڵەک ئیسلاوی و عالمێکی دینی بوو.

جوانییەکانی دینی مەسیحدا سەری داخست. بەڕێوەبەرانی کلیسا دەیانگوت بە ئەقڵ و ئاوەز ناتوانی بە ڕاستییەکان بگەی؛ ڕاستییەکان دەبێ لە ڕێگای کەشف و شهوود و ئیلهامەوە بە دەست بێنی و تەنیا کلیسایە دەتوانێ کۆمەڵێک لە دەوری یەک کۆبکاتەوە و بە پڕشنگی ئیلهام ڕاستییەکان ڕووناک بکاتەوە. سێلێنین تەنانەت ئەو هەڵەویژی و قسە بێ سەرەوبەرانەشی قەبووڵ کرد و بەرە بەرە هێور بۆوە. ئیتر هەستی نەدەکرد بەدرۆ و ڕیاکاری لەو ڕێوڕەسمانەدا بەشداری دەکات و دەستی دۆعا و پاڕانەوە هەڵدەبڕێ. وردە وردە هەموو شتێکی بۆ ئاسایی بوو بوو. لە هەمبەر وێنەی مەسیحدا چۆکی دادەدا، خاچی دەکێشا و هەستی دەکرد کارەکانی چەندە بە سانایی دەڕۆنە پێشێ و کێشەکانی چارەسەر دەبن و تووشی گرفت و تەنگژە نابێ. لەگەڵ ئەوەشدا هێندێ جار تروووسکەیەک لە مێشکی دەدا و بۆی دەردەکەوت ئەوەش ئەوپەڕی ویستەکانی نییە و بە زۆری ملی بۆ ئەو کارە داخستووە.

ئەو ڕۆژە کە چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوتبوو، کاس و وڕ بووبوو، ئەو کاتەی وەبیر دەهاتەوە کە هاوڕێ و هاودەرس بوون و درۆ و ڕیایان نەدەزانی؛ کاتێک کۆنت نۆخلیدۆڤ سەبارەت بە بیروباوەڕی پرسیاری لێکرد، زیاتر شڵەژا و هەر بەو هۆیەش ئاوا مات و گرژ بوو. دەتگوت هەردووکیان هەست دەکەن تێپەڕینی زەمەن دیوارێکی لە نێوانیاندا هەڵچنیوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێنیان دابوو یەکتر ببینن، هیچکامیان نەچوون بۆلای ئەوی تر.

# بیست و چوار

نۆخلیدۆڤ لەگەڵ فانارینی پارێزەر لە کۆشکی سەنا هاتە دەرێ. فانارین بە فەیتوونەوانی گوت بە هێواشی بە دوای ئەواندا بێ و لەگەڵ نۆخلیدۆڤ وردەوردە بە پێیانەڕێکەدا ملیان پێوەنا. فانارین بۆ ئەوەی نۆخلیدۆڤ لەو گێژاوە خەم و دڵتەنگییە دەرکێشێ، دەستی کرد بە باسی کارە جوان و بەڕێوجێکانی ئەو سەناتۆرە پایەبەرزانە. سەرەتا باسی ئەو کەسایەتییە پایەبەرزەی دەوڵەتی کرد کە ئەو ڕۆژە بووبووە بنێشتە خۆشکە و سەناتۆرەکانیش لە دانیشتنی تایبەتی ژووری ڕاوێژکاریدا باسیان دەکرد. فانارین بە وردی ڕووداوەکانی بۆ باس کرد و گوتی کە ئەو بەڕێزە لە کاتی نێربازیدا گیراوە و ددانی بە کارەکەی خۆیدا ناوە. مەقاماتی باڵاتریش بە جێی ئەوەی بینێرن بۆ بەندیخانە و بە پێی یاسا سزای بدەن، دەیکەن بە قایمقامی شارێکی گرینگی سیبیریا.

فانارین پاشان چووە سەر بابەتێکی تر و بە گاڵتە و پێکەنینەوە باسی ئەو بینا نیوەچڵەی کرد کە نۆخلیدۆڤ بەیانیی ئەو ڕۆژە کاتێک بەلایدا تێپەڕین و چاوی پێی کەوت لەگەڵ عارەبانەچییەکە باسیان کردبوو. ئەو جۆرە جەنابی پارێزەر باسی دەکرد، کەسانێکی زۆر هەزاران هەزار ڕۆبڵیان بۆ تەواو کردنی ئەو بینا بەشکۆیە،ناوەتە تەنگەی باخەڵیان و وای بە باش دەزانن

هەروا بە نیوەچڵی بمێنێتەوە و بۆ کەسانی دیکەش ببێتە سەرچاوەی داهات و گیرفان ئاخنین. جەنابی فانارین بەسەرهاتی کەسایەتییەکی گەورەی گێڕایەوە کە ژنەکەی خۆی فرۆشتووە و یەکێکی تر لە گەورەکان لێی کڕیوە. باسی گراوی یەکێک لە پایەبەرزەکانی کرد کە لە بوورسدا چەند میلیۆن ڕۆبڵی قازانج کردووە؛ باسی تاقمێک لە ناودار و گەورەکانی پلە یەکەمی پترزبۆرگی کرد کە دەستیان بۆ هەزار جۆر دەهۆ و ساختەچێتی بردووە و بە جێی ئەوەی بکەونە زیندان، پلەوپایەیان بەرزتر کراوەتەوە. دەتگوت بە گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتانە دەیهەوێ پێی بڵێ لەچاو ئەو هەموو دزی و فزی و فێڵ و تەڵەکەیەی کەسایەتییە پایەبەرزەکانی پترزبۆرگ، ڕێگای کەسپی داهاتی ئەو چەندە ڕەوا و یاساییە!

جەنابی پارێزەر تازە شەویلکەی گەرم داهاتبوو و دەیویست بە سەرهاتی سەیر و سەرنجڕاکێشتر بگێڕێتەوە، نۆخلیدۆڤ کە لەوە زیاتر تاقەتی گوێگرتنی نەبوو، خوداحافیزیی کرد و بە سواری عارەبانەیەک چوو بۆ ماڵی پووری.

خەم و خەفەت لە سەر دڵی قورسایی دەکرد. ڕەد کردنەوەی سکاڵانامەی پێدا چوونەوەی پەروەندەکەی ماسلۆڤا دڵتەنگی کرد بوو. بیستنی ئەو ڕاستییانە سەبارەت بە کار بەدەستانی وڵات، ئەویش لە زمانی فانارین و ئاوا بە خەستوخۆڵی، داخێکی قورسی لە سەر دڵی دانابوو. ڕوخساری خەمبار و پەرۆشی سێلێنین، پیاوێک کە سەردەمێک باشترین و پاکترین هاوڕێی بوو، لە بەر چاوی لانەدەچوو.

دەرگاوان کاتێک چاوی بە کۆنت نۆخلیدۆڤ کەوت، کڕنۆشی بۆ برد و دوو نامەی دایە دەستی. سەبارەت بە یەکەم نامە، گوتی:

ـ ژنێک هات هەر لێرە لە سەر ئەو سەکۆیە دانیشت و ئەم نامەیەی بۆ بەڕێزتان نووسی.

ئەو ژنە، کە دەرگاوان بە سووکایەتییەوە باسی دەکرد، دایکی شۆستۆڤا بوو، لە نامەکەیدا سپاس و پێزانینی خۆی دەربڕیبوو کە نۆخلیدۆڤ گەوریی نواندووە و بۆ ئازاد بوونی کچەکەی هەوڵی داوە، داواشی لێکردبوو سبەینێ بەیانی سەرێکیان لێ هەڵێنێ و چاو و دڵیان بە دیداری ڕوون بێتەوە. ناونیشانی ماڵەکەشی کە لە دوڕگەی ڤاسیلی[56] هەڵکەوتبوو، لە داوێنی نامەکەدا نووسیبوو.

نامەی دووهەم، لە لایەن بۆگاتیرۆڤ ئاجوودانی ئیمڕاتۆرەوە هاتبوو، کە یەکێک لە هاوڕێیانی کۆنی بوو. نۆخلیدۆڤ داوای لە ئەویش کرد بوو، سکاڵانامەی تاقمێک لە گوندنشینان کە بە تاوانی خوێندنەوەی ئینجیل بۆ قەفقاز دوور خرابوونەوە، بداتە دەستی تێزار. بۆگاتیرۆڤ لەو نامەیەدا بەڵێنی دابوو کە سکاڵانامەکە دەداتە دەستی مەبارەکی خاوەن شکۆ ئیمپراتۆر، بەڵام بە بڕوای ئەو واباشتر بوو نۆخلیدۆڤ خۆی بچێت بۆ لای کەسێک کە بە کاروباری پەروەندەکە ڕادەگا و ئاوا باشتر کێشەکەی بۆ ڕوون دەبێتەوە.

نۆخلیدۆڤ دوای شکستی ئەمڕۆ لە ئەنجومەنی سەنا، بەو دوو نامەیە تۆزێ دڵگەرم بوو. ئەگەرچی هیوا و ئاواتەکانی لە پترزبۆرگ وەک بیر و خەیاڵەکانی سەردەمی منداڵی، کاتی بەرەوڕوو بوون لەگەڵ ڕاستییەکان، لە نێوچوو بوو، دیسان دەیدی تاڕادەیەک لە هەوڵەکانیدا سەرکەوتوو بووە. شۆستۆڤا ئازاد بووە و بنەماڵەکەی شاد بوون، ئێستاش باش یان خراپ،

---

56 ـ دوڕگەی ڤاسیلی vassili گەورەترین دوڕگەی ڕووباری دلتایە. پێتری مەزن، سەرەتا دەیویست ئەو شوێنە بکات بە ناوەندی شار، بەڵام دواتر پەژیوان بۆوە و لە دەستە چەپی ڕووبارەکە شاری ساز کرد.

هاتووه بۆ پترزبۆرگ و نابێ ئەو هەلانە لە کیس بدات و کارەکان بە نیوەچڵی بەجێبێڵێ. وای بە باش زانی بەرنامەی سبەنێی بە سەردانی بۆگاتیرۆڤ دەست پێبکات و دوای ئەو، بچێت بۆ لای کەسێک کە پەرەوەندەی گوندنیشنەکانی لە بەر دەست دایە.

سکاڵانامەی گوندنشینەکانی لە گیرفانی دەرهێنا و جارێکی تر خوێندییەوە. پێشخزمەتێک هات و ئاگاداری کردەوە کە خاتوو کۆنتس لە تەلاری گەورە، بۆ خواردنەوەی چایی چاوەڕوانییەتی! نۆخلیدۆڤ کاغەزەکەی نایەوە گیرفانی و بە قاڵدرمەکاندا سەرکەوت. لە پەنجەرەی نێوانی قاڵدرمەکانەوە چاوێکی لە کۆڵان کرد و چاوی بە فەیتوونەکەی ماریت کەوت بە دوو ئەسپی کەحێلەوە لە بەر دەرگای پشتەوە ڕاوەستا بوو، بێ ئیختیار دڵی کرایەوە.

ماریت بە کڵاو و جلوبەرگی جوانەوە، بەرەوڕووی کۆنتس دانیشتبوو و پەرداخی چایی بە دەستەوە بوو. شاد و گەشاوە و لێو بەبزە بوو. کاتێک نۆخلیدۆڤ چووە ژووری، دیاربوو ماریت، نوکتەیەکی پێکەنینیی بۆ کۆنتس گێڕاوەتەوە و پووره خانم وەها پێدەکەنی ئاو بە چاویدا دەهاتە خوارێ. نۆخلیدۆڤ تەنیا چەند وشەی کۆتایی نوکتەکەی گوێ لێبوو و بۆی دەرکەوت ئەو بابەتە پێکەنینییە پێوەندیی بە ڕووداوی ئەو کەسایەتییە پایەبەرزەوە هەیە کە لەم دواییانەدا کراوە بە قایمقامی سیبیریا. ماریت کە زۆر ژنێکی قەشمەری و لە گێڕانەوەی نوکتە و قسەی خۆشدا شارەزا بوو، پووره خانمی وەها خستبووە سەر باڵی پێکەنین، هۆش و ئیختیاری لا نەمابوو، گوتی:

ـ ماریت! بەو قسانەت ژانم پێدەکەی!

نۆخلیدۆڤ سڵاوی کرد و دانیشت. مەندی و ماقووڵیی ئەو بووە هۆی ئەوەی ماریتیش دەست لە گاڵتەوگەپ هەڵگرێ و بۆ ڕاکێشانی هەستی

خۆشەویستیی ئەو پیاوە، بەمەیلی ئەو ڕەفتار بکات. لەو ڕۆژەوە کە دوای چەندین ساڵ چاوی پێی کەوتبۆوە، دڵی دەیکورکاند بۆی و دەیویست بە هەر فێڵ و مەکر و نازێک بێ خۆی لێ نزیک بکاتەوە و دڵی بڕفێنێ. هێندێ خۆی مات کرد و لەمەڕ کارەکەی ئەنجومەنی سەناوە پرسیاری لێکرد. نۆخلیدۆڤ باسی شکست هێنانەکەی بەوردی بۆ گێڕانەوە و پاشان باسی سیلێنین و چاوپێکەوتنەکەی کرد. هەر دوو ژنەکە کاتێک ناوی سیلێنینیان بیست، گوتیان بەڕاستی ڕۆحێکی پاک و بێگەردی هەیە و لە کۆمەڵگای پترزبۆرگدا هەموان پاکی و ڕۆحسووکی ئەویان بۆ دەرکەوتووە و نازناوی Chevalier sans peur et sans reproche[٥٧]ی بەسەردا بڕاوە! نۆخلیدۆڤ لە ماریتی پرسی ژنەکەی سیلێنین چ جۆرە مرۆڤێکە.

- داوەرییەکەی دژوارە، دەڵێن لەگەڵ مێردەکەی دانوویان پێکەوە ناکوڵێ. بەڵام ئەوە سەیرە سیلێنین بۆ هەڵوەشاندنەوەی حوکمی ئەو ژنە چارەڕەشە ڕازی نەبووە.

نۆخلیدۆڤ بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێ، باسی ئازاد بوونی شۆستۆڤای هێنایە گۆڕێ.

- بیری لێ بکەنەوە کچێک لە بنەماڵەکەی دادەبڕن و دەیخەنە بەندیخانە؛ هیچ کەسیش نەبێ بگاتە فریای ئەو بنەماڵەیە و بە کار بەدەستان و بەر پرسان بڵێ بۆچی ئەو کچە بێ تاوان و داماوەتان دەستبەسەر کردووە؟ ئێستا ئەو بنەماڵەیە ئەو چاکەیە لە خاتوو ماریت دەزانن و قەتیان لە بیر ناچێ.

ـ هەر باسیشی مەکەن؛ من بە ئەرکی سەرشانی خۆمم زانیوە. کاتێک مێردەکەم گوتی ئەو ژنە بێ تاوانە و چەند مانگە لە بەندیخانەیە، دڵم داکەوت

57 ـ پاڵەوانی بێ باک و بێ خاڵی لاواز.

و باوەڕم نەدەکرد. بەڕاستی ئەو بارودۆخە تاڵ و پڕ لە زوڵم و ستەمە تاقەتبڕ و دڵتەزێنە.

ماریت هەموو قسەکانی بەڕێوجێ بوون و بە دڵی نۆخلیدۆڤ دەدوا. کۆنتسیش خۆشحاڵ بوو کە ئەو ژنە شۆخوشەنگە ئاوا شەیدای خوشکەزاکەیەتی و داوای لە هەردووکیان کرد سبەی شەو بچن بۆ ماڵی ئالین و گوێ بۆ وتەکانی کەیس واتێر بگرن؛ بۆ ئەوەی دڵی نۆخلیدۆڤیش نەرم بکات، باسی جەنابی قەشەی بۆ کرد و گوتی:

- il vous aremarque[58]. دوێشەو کاتێک بۆم باس کرد کە تۆ چەندە بۆ بەندی و لێقەوماوان دڵ بەخەمی و زەحمەت دەکێشی، گوتی کەسێکی ئاوا حەتمەن ئاشقی مەسیحە و ڕوو لە دینەکەی دەکا... ئێستا کە کەیس واتێر ئاوا هۆگری تۆیە حەتمەن دەبێ سبەی شەو بێی!

ماریتیش ڕاشکاوانە دژی ئەو وتە و حەدیسانە بوو و دەیگوت حەز بە بیرۆکەی پێڕەوانی ئەو تاقمە ئایینییە ناکا. خاتوو کۆنتسیش وەدەنگ هات.

ـ تۆ هەمیشە لە سەر هەوای خۆتی و بە پێچەوانەی ڕەوتی ئاو مەلە دەکەی.

- بەپێچەوانە بیروباوەڕی پاکی من وەک بیروباوەڕی وەرزێڕێکی ساکار وایە و نامەوێ بیر کردنەوەم لەگەڵ خەڵکی جیاواز بێ. لەوەش گرنیگتر سبەی شەو شانۆی فەڕەنسی بەرنامەیەکی باشی هەیە. ئەستێرەی درەوشاوەی هونەر و شاجوانی فەڕەنسی لەو شانۆیەدا دەوردەگێڕێ.

ماریت تاریفی ئەو شاجوانەی دەکرد و دەیویست تێکرا بچن بۆ سەیری ئەو شانۆیە. نۆخلیدۆڤ بە پێکەنینەوە گوتی:

---

58 ـ ئەو حەز دەکا بتبینێ.

ـ نازانم پووریَ گیانم کامیانی زیاتر بە دڵە؛ کەیس واتێر یان ئەو شاجوانە فەڕەنسییە؟

کۆنتس خەریک بوو ڕقی هەڵدەستا. نۆخلیدۆڤ دەیویست هێوری بکاتەوە و خۆی شیرین دەکرد.

ـ پێم وایە باشترە سەرەتا بچین بۆ کۆڕی دۆعا و پاڕانەوە؛ چونکە ئەگەر سەرەتا بچین بۆ شانۆکە، دوایی دیتنی ڕیش و پەشمی بەڕێز کەیس واتێر شەوەکەمان لیَ تاڵ دەکا.

ماریتیش هەوای جەفەنگ لە سەری دابوو؛ گوتی:

ـ وا باشترە سەرەتا بچین بۆ شانۆکە و پاشان بێنەوە لە سەر دەستی جەنابی کەیس واتێر تۆبە بکەین.

کۆنتس ئیتر تاقەتی نەهێنا و دەرهەڵبوو.

ـ مەیکەنە قەشمەرجاڕی! شانۆ بە جیی خۆی و کۆڕی دۆعا و پاڕانەوەش بە جییَ خۆی. هەر شتێک لە جێی خۆیدا باشە. پێویست ناکا هەمیشە ئەژنۆی خەم لە باوەش بگرین و فرمێسک هەڵوەرێنین. دەبیَ ئیمانمان هەبیَ و دڵێکی شاد.

ـ پووریَ گیان! پێموایە تۆ زۆر لە کەیس واتێر باشتر مەوعیزە دەکەی .

ئیتر درێژەیان بە باسەکە نەدا. ماریت داوای لە نۆخلیدۆڤ کرد سبەی شەو حەتمەن بێت بۆ شانۆکە تاکوو لە لۆژی تایبەتدا پێکەوە دانیشن. نۆخلیدۆڤیش گوتی لەوانەیە درەفەتی نەبیَ. لەو کاتەدا خزمەتکارێک هاتە ژووریَ و بە کۆنتسی ڕاگەیاند نووسیاری ئەنجومەنی چاکەکاری لە سەرسەرا چاوەڕوانییەتی.

کۆنتس لێوی هەلقورتاند و گوتی:

ــ نازانن چەندە پیاوێکی خوێنتاڵ و کانێس ئەستوورە. ئەم جەنابە، نووسیاری ئەو ئەنجومەنی چاکەکارییەیە کە بەرپرسایەتیی ئیفتخاریی بە من سپێردراوە. دەچم لە سەرسەرا تۆزی قسەی لەگەڵ دەکەم و دەگەڕێمەوە. خۆتان چایی تێکەن و بخۆنەوە.

کۆنتس بە گورجی هەستا ڕۆیشت و ئەوانی پێکەوە بەجێهێشت. ماریت دەستەوانەکانی داکەند. دەستە سپی و ناسکەکانی لە سەر یەک دانا. چادانەکە لە سەر چرا ئەلکۆلییەکە بوو.

ـ بەڕێز کۆنت! ئێوە حەزتان لە چاییە؟

ماریت سوور هەڵگەڕا بوو و خەیاڵێک لە مێشکیدا کەوتبووە جووڵەجووڵ. دەتگوت دەیهەوێ ڕازێک بدرکێنێ:

ـ ئەو کەسانەی من ڕێز بۆ بیروباوەڕیان دادەنێم، نازانن چیم لە دڵ دایە. هەمووان پێیان وایە ژنێک لەو بارودۆخەی مندا دەبێ جۆرێکی تر بێ!

پەشۆکابوو. قسەکانی تا ڕادەیەک بێ مانابوون. لەگەڵ ئەوەشدا نۆخلیدۆڤ لە کاکڵی وتەکانی تێدەگەیشت و هەستی بە ئەو پەڕی جوامێری و چاکە کاری دەکرد. چاوە جوانەکانی ماریت و وتە پڕ ماناکانی ڕۆح و دڵی ئاوپژێن دەکرد. چاوی لێکرد و ئیتر نەیتوانی چاو لە سەر ڕوخساری جوان و دڵڕفێنی هەڵگرێ، ماریت هەروا قسەی دەکرد:

ـ ڕەنگە من لە کاکڵی کارەکانی ئێوە تێنەگەیشتبێتم. سەرم لە بیرۆکەکانی ئێوە دەرناچێ، بەڵام هەر ئەوەندە دەزانم خەریکی کارێکی و لە دڵەوە ئافەرەمتان پێدەڵێم؛ چونکە کارێکی باشو جێگای ڕێزە.

ــ زۆر سپاس. ڕاستت دەوێ من هێشتا کارێکی باش و بەرچاوم نەکردووە.

ـ ئەوەی گرینگە هەست و ویستەکانی ئێوەیە، ئێوە دەتانەوێ یارمەتیی کەسانێک بدەن کە ئازار دەکێشن و خەریکن لە سووچی بەندیخانەدا دەڕزێن؛ لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا دەتوێنەوە و بەبێ تاوان دەبنە قوربانیی زوڵم و بێ عەداڵەتی و جیاوازیی ڕەگەز و چینایەتی، هیچ کەس بە هانایانەوە ناچێ؛ من ئامادەم بە هەموو توانامەوە لە خزمەت ئێوەدا بم و یارمەتیتان بدەم. هەموو ئەو قسانەی تەنیا بۆ ڕاکێشانی سەرنجی نۆخلیدۆڤ و لێ سەندنی دڵی بوو.

ـ ماریت! شتێکی تایبەتیتان لێدەپرسم؛ لە ژیانی خۆتان ڕازین؟

ـ ناچارم ڕازی بم، بەڵام جاروبار لە ناخی گیانمەوە دەنگێک دەبیستم.

ـ ئەو دەنگە مەهێڵە بەند کرێ و ئازادی بکە.

نۆخلیدۆڤ بۆی دەرکەوتبوو کاتێک ماریتی شۆخ و نازەنین باسی ئازار و چارەڕەشیی بەندییەکانی دەکرد، بە جێی ئەوەی بە داخەوە بێ و خەمێک لە وتەکانیدا ڕەنگ بداتەوە، زیاتر ناز و دڵڕفێنییەکی تاسەمەندانە بە وتەکانییەوە دیار بوو؛ دەیزانی ئەو ژنە جوانە هەموو ئەو درۆ شیرین و قسە پڕهەستانەی تەنیا بۆ لە داو خستنی دڵی ئەوە و دڵیشی بۆ ئەو بەندییە قوربەسەرانە داناچڵەکێ.

کاتێک خاتوو کۆنتس هاتەوە، ئەوان چاویان لە چاوی یەکتر بڕیبوو، باڵی خەیاڵ هەڵیگرتبوون و تەنیا بە جەستە لەوێ مابوون و باسی بێ عەداڵەتی و ستەمی دامودەزگای دەوڵەت و چارەڕەشی و گرفتاریی چینی هەژاری کۆمەڵگایان دەکرد؛ بەڵام لەگەڵ هەر وشەیەکدا و لەگەڵ هەر ڕوانینێکدا لە یەکتریان دەپرسی: «دەتوانین پێکەوە بین؟» وەڵامەکەشیان: «ئەرێ! ئەی بۆ ناتوانین!» بوو. هەردووکیان هەستیان دەکرد بێ ئیختیار بۆ لای یەکتر دەکێشرێن.

کاتی ڕۆیشتن، ماریت بەڵێنی پێدا ئەوی لە دەستی بێ لە بەر دڵی ئەو دەیکا و لە هیچ شتێک دریغی ناکات. گوتیشی لە لۆژی شانۆ چاوەڕوانی دەبێ و لەوێ بابەتێکی زۆر گرنیگی بۆ باس دەکا؛ چەن دجاریش دووپاتی کردەوە:

ـ بەڵێن دەدەی حەتمەن بێی؟

نۆخلیدۆڤ چەند جار بەڵێنی پێدا:

ـ دێم، حەتمەن دێم.

ئەو شەوە کۆنت نۆخلیدۆڤ مۆمی ژووری خەوەکەی کوژاندەوە و لە سەر پێخەفەکەی ڕاکشا. ماسلۆڤای وەبیر هاتەوە کە سکالانامەکەی لە ئەنجومەنی سەنا ڕەد کراوەتەوە و دەبێ خۆی بۆ تاراوگە و سەرما و سەغڵەت و کاری قورس ئامادە بکات. خەیاڵی چاکسازیی زەویوزار و دابەشکردنی زەوییەکانی بە سەر ڕەعیەتەکاندا، دەستی لە سەری هەڵنەدەگرت. لە لایەکی دیکەشەوە ماریت بەو هەموو جوانی و شوخوشەنگییەوە دەهاتە بەر چاوی و بە زەردەخەنەیەکی شیرین و لێوڕێژ لە نازەوە دەیگوت: «بەڵێنی دەدەی بێی؟» هەموو شتێک لە مێشکیدا تێک دەهالان و خەریک بوون ئاراوقارایان لێ هەڵدەگرت. تووشی دوودڵی بووبوو: «کام ڕێگایان هەڵبژێرم؟ بڵێی کارێکی ژیرانە بێ لەگەڵ ماسلۆڤا بچم بۆ سیبیریا؟ دەست لەو هەموو ملک و ماڵ و سامانە هەڵگرم و چاوپۆشیی لێ بکەم؟ یانی کارێکی باش بوو ئەو هەموو زەویوزارەم بە سەر ڕەعیەتەکاند دابەش کرد؟» پرسیارەکان لە مێشکیدا ڕیزیان دەبەست و وەک هەنگەژاڵەی هارووژاو هورووژمیان بۆ دێنا؛ سەیریش ئەوە بوو، وەڵامەکانی بە پێچەوانەی چەند حەوتوو لە مەوبەر،لیل و تەمومژاوی بوون. دیسان تووشی دوودڵی بووبوو. هەموو شتێک لە مێشک و خەیاڵیدا تێکەڵ پێکەڵ بووبوون. بیری لە خەونە مرۆڤدۆستانەکانی خۆی دەکردەوە. بەداخەوە ئەو خەون و خەیالانە

ئەمشەو لێی دابڕابوون و دوور کەوتبوونەوە. یان وەک جاران حەزی نەدەکرد باوەشیان بۆ بکاتەوە! «ئەگەر لەم ڕێگایەوە بە هیچ ئاکامێک نەگەم و ئەگەر توانایی ئەوەم نەبێ لەگەڵ خەڵکانی چارەڕەش و داماو بژیم،خۆ دەتوانم پەشیمانیی خۆم دەبڕم؟» بەڵام بۆ ئەوەش هیچ وەڵامێکی نەبوو. خەم و هیوابڕاوی چوکی لە سەر سینگی دادابوو. لە مێژ بوو هەستی بە خەمێکی ئاوا قورس نەکردبوو. ئاخری خەیاڵ و بیرکردنەوە ماندووی کرد و خەوێکی قورس دایگرت. وەک قوماربازێک دەچوو کە دار و نەداری خۆی دۆڕاند بێ و لە حەیبەتی خەم و داماویی خۆی پەنا بۆ خەو بەرێ.

# بیست و پێنج

بەیانی کە چاوی هەڵێنا، دڵتەنگ بوو. بیری کردەوە، نەکا لەم چەند ڕۆژەدا کە لە پترزبۆرگ بووە ئازاری بە کەسێک گەیاندبێ. کە ئاوا ویژدانی ئازاری دەدا. تۆزێ زیاتری بیر کردەوە و بۆی دەرکەوت ئەم دڵتەنگییە بە هۆی خەیاڵە خراپەکانی شەوی ڕابردووەوەیە. دوێشەو دیسان ئەو فکرە بە سەریدا زاڵ بوو کە ڕەگەڵ کەوتنی کاتیۆشا و پێشنیاری ژیانی هاوبەش لەگەڵیدا و دابەشکردنی ئەو هەموو زەویوزارە بە سەر ڕەعیەتەکاندا، کارێکی بێهوودەیە و ئاکامێکی باشی نییە؛ ئەو شێوازە تازەیەش کە هەڵیبژاردووە، بێ بنەما و ساختە و دوور لە ئەقڵە، بۆیە وا باشترە دەست لەو خەیاڵە خاوە هەڵگرێ و بگەڕێتەوە سەر شێوازی ڕابردوو و دەست لەو یارییە هیچوپووچە هەڵگرێ.

ئەگەرچی کارێکی نەشیاوی نەکردبوو، بەڵام بیر و خەیاڵی نەشیاو خۆیان لە مێشکی دەپەستاوت؛ ئەوەش لە هەموو کارێک خراپتر بوو، دیارە سەر چاوەی هەموو کارە خراپەکانیش بیر و خەیاڵی خراپ و نەشیاوە. دەکرێ ئاسەوار و کاردانەوەی کاری خراپ لە نێو بەری، بەڵام بیر و خەیاڵی خراپ بەردەوام هەڵدەقوڵێ و پەرەدەستێنێ؛ ڕۆح دادەگرێ و بەرە و ناپاکی پاڵی پێوە دەنێ. کاری خراپ، ڕێگای خراپت دەخاتە بەرپێ و وردە وردە وات لێدەکا بۆ لای کاری خراپتر بخوشێی؛ بەڵام خەیاڵی خراپ زۆر بە خێرایی دەمانخاتە سەر ڕێگای خراپ. نۆخلیدۆڤ کە بیری لەو بیر و خەیاڵانەی دوێشەوی خۆی دەکردەوە، هەستی بە شەرمەزاری دەکرد.

ئەو شێوازە نوێیەی ژیان لە لایەکەوە دژوار بوو بۆی و هێندێ جار ئازاریشی دەدا، بەڵام بۆی دەرکەوتبوو تەنیا ڕێگای گەیشتن بە ڕزگاری و حەسانەوە ئەو شێوازەیە کە هەڵیبژاردووە؛ دشیزانی ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ شێواز و ژیانی ڕابردوو، تێدا دەچێ.

دەتگوت لە خەونێکی بەسام و پڕ لە هاشەوپاشە ڕاچەنیوە. حەزی نەدەکرد لە پێخەفەکەی بێتە دەرێ، بەڵام وەبیری هاتەوە کاتی هەستان و وەدوا کەوتنی کاروبارە زەروورییەکانە.

دوایین ڕۆژی مانەوەی بوو لە پترزبۆرگ. سەرەتا چوو بۆ دوڕگەی ڤاسیلی کە چاوی بە شۆستۆڤا و بنەماڵەکەی بکەوێ. ماڵەکەیان لە نهۆمی دووهەمی بینایەکدا بوو. دەرگاوان ڕێنوێنیی کرد. نۆخلیدۆڤ گەیشتە سەر سەرایەکی نیوە تاریک، لە قاڵدرمەیەکی نیوە ڕووخاو وەسەرکەوت و لە نهۆمی دووهەم چووە چێشتخانەیەک کە دەرگاکەی کرابۆوە. بۆنی چێشتی سەر وەجاخەکە دەهات، پیرێژنێک لە بەر وەجاخەدا ڕاوەستا بوو، چێشتەکەی دەشێواند و لە سەرووی چاویلکەکەیەوە لێی دەڕوانی.

ـ بەڕێز! کارت بە کەسێکە؟

بەڵام لە پڕ بۆی دەرکەوت دەبێ کێ بێ. بە دەنگێکی لەرزۆک و ئاوێتەی ترس و ڕێز و شادی دەنگی هەڵبڕی:

ـ جەنابی کۆنت نۆخلیدۆڤ! خۆتی؟ ئێوە فریشتەی ڕزگارین. دوێنێ لە سەر داوای خوشکم هاتم، بەڵام ئێوە لەوێ نەبوون.

بە بەروانکەکەی دەستی سڕی و هاتە پێشێ دەستی نۆخلیدۆڤی گرت و ماچی کرد.

ـ تکایە فەرموون، لەم لایەوە...

نۆخلیدۆڤ بە دوایدا پێی نایە دالانێکی نیوە تاریکەوە. پیرێژن شڵەژاوانە دەستی بە سەر و جلەکانیدا دەهێنا و لە پەستا قسەی دەکرد.

ـ خوشکم ناوی کرنیلۆڤایە. ڕەنگە ناوەکەیت بیستبێ. کەسێکی سیاسییە؛ زۆر تێگەیشتووە.

دەرگایەکی کردەوە؛ نۆخلیدۆڤ چووە ژوورێ. ژوورێکی چکۆڵە بوو. کچێک و کوڕێک لە پشت مێزێک لە سەر کورسی دانیشتبوون. کچە چین چینی قژە کاڵەکەی ڕژابووە سەر دەموچاوە خڕەکەی. وەک دایکی ڕەنگ بزرکاو بوو. کوڕە سمێڵی ڕەش و ڕیشێکی بزنانەی هەبوو. کراسی ملیوانە ڕووسیی لە بەردا و بە گوڕوتینەوە قسەی دەکرد.

ـ لیدیا!...بڕوانە! بەڕێز کۆنت نۆخلیدۆڤ هاتووە.

لیدیا، ئەو کچە ڕەنگ بزرکاوە، لە جێی خۆی هەستا و دەستێکی بە قژیدا هێنا و لەبەر چاوی لایدا. تووڕە و دڵتەنگ دیار بوو. لە شتێک دەترسا. نۆخلیدۆڤ زردەیەکی گرت و دەستی گوشی.

ـ کەوایە تۆ ئەو کچە مەترسیدارەی کە خاتوو وێرا باسی دەکرد.

پێکەنینێکی منداڵانە لێوی کردەوە. ددانە سپی و ڕێکوپێکەکانی وەدیار کەوتن.

ـ بەڵێ، خۆمم. هەر ئێستا دەچم پوورم بانگ دەکەم. دەیویست چاوی پێت بکەوێ.

دەرگای ژوورێکی کردەوە و پووری بانگ کرد و خێرا گەڕایەوە، زاخارۆڤی ئامۆزای بە نۆخلیدۆڤ ناساند.

ـ فەرموون دانیشن!

نۆخلیدۆڤ لە سەر کورسیلەیەکی چەپرەک دانیشت. زاخارۆڤ لە پەنایدا دانیشت. کوڕێکی دە ـ دوازدە ساڵان لە دەرگای ژوورێکی تر هاتە دەرێ و بێ ئەوەی قسە بکات، چوو لە بەر پەنجەرەکە دانیشت.

ـ ویْرا زۆری خەمی ئێوە بوو کە بە بێ تاوان دەستبەسەر کراون.

ـ ویْرا یەکێک لە باشترین هاوڕێیانی پوورە کرنیلۆڤامە. من ویْرام زۆر نەدیوە.

دیسان دەرگاکە کرایەوە و کرنیلۆڤا بە فانیلەی سپی و کەمەربەندی قایشەوە هات بۆ لایان. ڕوخسارێکی شیرین و وشیارانەی هەبوو.

ـ گەورەییت نواند تەشریفت هێنا؛ زۆرت سپاس دەکەم... باسی ویْرام بۆ بکە. بەندیخانە چیی بە سەر هێناوە؟

ـ ژنێکی خۆ ڕاگرە. سکاڵا و کوڕووزانەوە نازانێ. خۆی گوتەنی ورەی قارەمانێکی هەیە.

ـ کەسایەتییەکی بەرجەستەیە. هیچ شتێکی بۆ خۆی ناوێ، تەنیا لە بیری خەڵکیدایە. بەڕاستی شێرەژنە.

ـ سەیرە ئەو ژنە هیچ شتێکی بۆ خۆی نەویست. لەگەڵ ئەوەشدا خۆی گرفتار و بەندییە، لە بیری لیدیادا بوو کە بەبێ تاوان بەند کراوە.

کرنیلۆڤا چاوێکی لە لیدیا کرد و گوتی:
ـ لیدیا بە هۆی منەوە کەوتە زیندان و تووشی ئەو چەرمەسەرییە بوو.
لیدیا نارەزایەتیی دەربڕی:
ــ پووریّ گیان! ئەگەر تۆش نەتگوتایە،من ئەو شتانەم لە لای خۆم هەڵدەگرت.

ـ با هەموویت بە وردی بۆت بگێڕمەوە. لە تۆ چاتر ئاگاداری مەسەلەکەم. ڕووداوەکە لێرەوە دەستی پێکرد؛ ڕۆژێکیان کەسێک هات و داوای لێکردم، هێندیّ بەڵگەنامە و کاغەز لە لای خۆم ڕاگرم و ئاگاداریی لیّ بکەم. منیش چونکە جێگا و ڕێگای باشم نەبوو، دامە دەستی لێدیا. بۆ بەدبەختی هەر ئەو شەوە ئاسایش لەماڵەکەمان وەربوون و هەموو کەلێن و قوژبنی ماڵەکەیان پشکنی و بەڵگەنامە و کاغەزەکانیان دۆزییەوە و لیدیایان قۆڵبەست کرد و بردیان. ماوەیەکی زۆر لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا خۆڕاگریی کرد و دانییپێدا نەنا کە ئەو کاغەزانەی لە کیّ وەرگرتووە.

لیدیا شڵەژا بوو. بسکی لە قامکی هاڵاندبوو و بایدەدا.
ـ پووریّ گیان! خۆ من هیچم نەگوت.
ـ منیش هەر ئەوە دەڵێم. خۆ دەزانم تۆ هیچ کەست تێوە نەدا.
ـ براوام پێبکەن من میتینم بە گرتن نەدا.
پیرێژنی چاویلکە لە چاو هاتە هانای کچەکەی و گوتی:
ـ کچم! خۆت سەغڵەت مەکە. پێویست ناکا لە سەر ئەو شتانە بڕۆی.
ـ وانییە، من دەبیّ قسەی خۆم بکەم.

سوور هەڵگەڕا بوو. بە شڵەژاوی چاوی لە دەوروبەری خۆی دەکرد؛ دەتگوت لە شتێک دەترسیّ. دیسان چووە سەر باسی بەندیخانە و پترۆڤی لێکۆڵەری ئەشکەنجە چی.

ــ ئەو هەمووەیــان ئــازار و ئەشـکەنجە دام زمــانم نەگەڕا. هەتــا ڕۆژێـک پترۆڤ کوتی ئێمە دەزانین تۆ بەبێ تاوان کەوتوویە بەندیخانە. پێویست ناکا ناوی کەسێک بدرکێنی، چونکە جگە لە تۆ کەسانێکی دیکەش دەستەبەسـەر کــراون؛ ئەویــش بە هــۆی ئەو پەڕە کــاغەزانەوە... هەروا قســەی دەکــرد و بەربووبـووە درێـژدادڕی؛ تـۆ بە جێـی حاشـاکردن، بێـدەنگ بە. نـاوی چەنـد کەسی گوت. میتین یەکێک لەو ناوانە بوو.

ـ باشە لیدیا گیان! لە سەری مەڕۆ... هەموو شتێکت گوت.

ـ نا پووریێ گیان! لێم گەڕێ با بە وردی بۆتـان بگێڕمەوە. ئاوا کولۆکۆی نــاخم دادەمرکــێ... بەڵــێ... کاتێـک دوای ئەو لێپێچیــنەوەیە بیســتم میتینیــان قۆڵبەست کـردووە، خـوودار بـووم. ئاراو قـارام لـێ هەڵگیـرا. پێم وابـوو مـن میتینم پێوە کردووە. ئەو خەمە شەو و ڕۆژ هەڵیدەچۆقاندم.

ــ هەمـووان دەزانـن تـۆ ئەوت بە گـرتن نەداوە و خەتـای تـۆ نیـیە. هـیچ کەسیش ئەو تۆمەتەت ناداتە پاڵ.

ـ بەڵام خۆ من ئاگام لەو مەسەلەیە نەبوو، لە زیندانی تاکەکەسیدا ئاگام لە هـیچ شـتێک نەبـوو. پـێم وابـوو مـن میتیـنم پێـوە کـردووە. شـەوانە کە چـاوم دەقووچاند، دەنگێک دەیچرپاند بە گوێمدا و دەیگوت: «میتینت پێوە کرد، تۆ میتینـت پێـوە کـرد.» تـرس و خەیـاڵ لە ڕۆح و مێشـکم هـاڵا بـوون و خەریـک بـوو شـێت دەبـووم. گوشـارم بـۆ خـۆم دەهێنـا بیـر لە هـیچ شـتێک نەکەمەوە؛ بەڵام نەمدەتوانی.

لیدیا جار لەگەڵ جار زیاتر دەشڵەژا و سوور هەڵدەگەڕا. قژی لە قـامکی دەهاڵانـد و دەیکـردەوە. دایکـی دەسـتی خسـتبووە سـەر شـانی و دڵخۆشـیی دەدایەوە. دەگریا.

ـ لە هەموو ناخۆشتر ئەوە بوو...

ئیتر نەیتوانی قسە بکات. بە گریانەوە لە جێی خۆی هەستا و لە ژوورەکە چووە دەرێ. دایکی بە هەڵەداوان بە دوایدا ڕۆیشت. کوڕە مێرمنداڵەکە لەبەر پەنجەرەکە دانیشتبوو سەری هەڵێنا و گوتی:

ـ ئەو خوێڕی و ترسەنۆکانە دەبێ لە سێدارە بدرێن.

کرنیلۆڤا گوڕاندی بە سەریدا:

ـ چیت گوت؟

ـ من...من...هیچم نەگوت.

کوڕە جگەرەیەکی لە سەر مێزەکە هەڵگرت و دایگیرساند.

# بیست و شەش

کرنیلۆڤا جگەرەیەکی داگیرساند، سەری لەقاند و گوتی:

ـ بۆ کچانی جحێڵ بەندی تاکەکەسی زۆر سامناکە.

ـ بە بڕوای من بۆ هەموو کەسێک سامناکە.

ـ نا بۆ هەمووان نا؛ بۆ کەسێکی شۆڕشگێڕی گیان لە سەر دەست، یانی کەسێکی کە بە دویدا دەگەڕێن و ناچارە لە حەوت کوندا خۆی بشارێتەوە و دەبێ هەمیشە گوێ قولاخ بێ، بەردەوام لە بیری خۆی و هاوڕێکانیدا بێ، بەندیخانە جێگای پشوودان و حەسانەوەیە، جێگای ورە کۆکردنەوە و بە خۆدا هاتنەوەیە! چەند کەس لە هاوڕێیان کە لەو بارودۆخەدان، دەیانگوت کاتێک قۆڵبەستمان دەکەن، هەناسەیەکی ئاسوودە هەڵدەکێشین. بەڵام بەندیخانەی تاکەکەسی، بۆ لاوەکان، بەتایبەت کەسێکی وەک لیدیا کە چالاکیی سیاسی نەبووە، زۆر زەبرێکی کاریگەرە. بێ بەش بوون لە ئازادی، دابڕان لە

بنەماڵە، هەڵسوکەوتی خراپی کاربەدەستان و پاسەوانەکان، نەبوونی هەوا و خواردنی پێویست تامڵ دەکرێ؛ تەنانەت ئەگەر گوشارەکانی زیندان ببێتە چەند هێندەش، دیسان دەتوانی خۆڕاگری بکەی، بەڵام زەبرێک کە لە ڕۆح و کەسایەتیت دەدرێ، وەک برینی تیروای وایە و چاک نابێتەوە.

ـ ئێوەش ئەو هەستەتان هەبووە؟

ـ من دوو جار کەوتومە بەندیخانە. یەکەم جار کە گرتیانم بێ تاوان بووم. بیست و دوو ساڵم تەمەن بوو؛ منداڵێکم هەبوو. منداڵێکی دیکەشم لە زگدا بوو. بێبەش بوون لە ئازادی و دابڕان لە مێرد و منداڵەکەم زۆر دژوار و تاقەتبڕ بوو، بەڵام لەوەش ناخۆشتر ئەوە بوو کە هەستم دەکرد وەک دار و بەرد هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکەن. هەستم دەکرد وەک مرۆڤێک چاوم لێ ناکەن و ئەوەش بۆ من زۆر زەبرێکی گورچووبڕ بوو. خستیانمە نێو عارەبانەیەکەوە و بردیانم. تەنانەت نەیانهێشت منداڵەکەشم ماچ بکەم و خودا حافیزیی لێ بکەم. هەرچی پرسیم بۆ کوێم دەبەن، وەڵامیان نەدامەوە. دوای لێپرسینەوە، جلەکانیان لەبەر داکەندم، جلی ژمارەداری بەندیخانەیان لە بەر کردم، بردیانم بۆ بەندی تاکەکەسی، دەرگایان لە سەر گاڵەدام و ڕۆیشتن. پاسەوانێک بە چەکەوە لە نێو داڵانەکەدا دەگەڕا و هێندێک جار دەهات لە دەربیجەکەوە چاوی لە نێو بەندەکەم دەکرد. هەستم دەکرد شتێکی قورسم بە سەردا کەوتووە. سەیر ئەوە بوو ئەفسەری جەندرمەکان کاتی لێپرسینەوە جگەرەیەکی پێدام. دەمزانی لەو جۆرە کاتانەدا مرۆڤ ئەگەر گیرۆدە بە جگەرەش نەبێ، پێویستی پێیەتی. ئەم پرسیارە لە مێشکمدا بوو، یانی ئەو ئەفسەرە دەیزانی لەو کاتەدا مرۆڤ پێویستی بە جگەرەیە، بەڵام نەیدەزانی مرۆڤ پێویستی بە ئازادی و ڕووناکی هەیە؟ نەیدەزانی منداڵان چەندەیان دایکیان خۆشدەوێ و دابڕان لە دایک هەست و ڕۆحیان دەڕووشێنێ؟ کەوایە

بۆ ئاوا بێ بەزییانە لە بنەماڵە و خۆشەویستەکانیان دابڕیم؟ بۆ چی وەک ئاژەڵێک قۆڵبەستیان کردم و لە تەلبەندیان خستم؟ هەتا ئەو ڕۆژە باوەڕم بە خودا و ویژدان و عەداڵەتی مرۆڤ بوو، بەڵام ئیتر دوای ئەوە باوەڕم پێی نەما و بۆم دەرکەوت مرۆڤ ناپاکترین بوونەوەری سەر گۆی زەوییە و دەسەڵاتخوازی چاوی کوێر دەکا. بۆیە دڵم پڕ بوو لە ڕق و بێزاری.

زەردیەکی گرت. دایکی لیدیاش هات و گوتی کچەکەی حاڵی باشە و دەیهەوێ لە ژوورەکەیدا بە تەنیا بێ. کرنیلۆڤا زۆر پەرۆش و دڵتەنگ بوو. گوتی:

ــ بۆ دەبێ ئەوە چارەنووسی ئەو کچە داماوە بێ؟ هۆکاری چارەڕەشییەکەی من بووم.

دایکی لیدیا گوتی دەیهەوێ لەگەڵ کچەکەی بڕوات بۆ گوند؛ لەوێ باوکی دەبینێ و ڕەنگە دوور کەوتنەوە لە پترزبۆرگ ئارامی بکاتەوە و بە خۆدا بێتەوە. کرنیلۆڤا دیسان سپاسی لە نۆخلیدۆڤ کرد.

ـ ئەگەر گەورەیی ئێوە نەبووایە، ئەو کچە لە بەندیخانەدا تێدادەچوو. تکایەکیشم لیتان هەیە. ئەم نامە سەر ئاوەڵایە بگەیەننە دەستی ویرا. تکایە نامەکە بخوێننەوە و ئەگەر بەباشت زانی بیدەیە. هیچ شتێکی خراپ و مەترسیدارم تێدا نەنووسیوە.

نامەکەی دایە دەستی نۆخلیدۆڤ. ئەویش وەریگرت و بەڵێنی دا بیگەیێنێتە دەستی ویرا، هەستا خوداحافیزیی لە هەمووان کرد و ڕۆیشت. گەیشتە کۆڵان، بەبێ ئەوەی نامەکە بخوێنێتەوە نایە گیرفانییەوە.

# بیست و حەوت

تەنیا کارێک کە لە پترزبۆرگ مابووی، پەروەندەی ئەو گوندنشینانە بوو کە بە تۆمەتی لادینی دەستبەسەر کرابوون و حوکمی دوور خرانەوە بۆ قەفقازیان بۆ بڕیبوونەوە. نۆخلیدۆڤ داوای لە بۆگاتیرۆڤ، هاوڕێ و هاوقەتاری سەردەمی سەربازیی کردبوو داخوازینامەکەی ئەو داماوانە بداتە دەستی تێزار. بەیانی زوو گەیشتە بەر دەرگای ماڵی بۆگاتیرۆڤ. بۆگاتیرۆڤ خەریک بوو ناشتایی دەخوارد و ئامادە بێ بڕوات بۆ سەر کارەکەی. پیاوێکی کورتەباڵا و قەڵەوە، توند و تۆڵ و چالاک و بە گوڕوتین بوو. پیاوێکی پاک و ڕاست و هەموو کارەکانی یاسایی بوون. تاڕادەیەک سەر بە لیبڕاڵەکان و سەرەڕای هەموو ئەوانەش پیاوێکی دەرباری و ئاجوودانی تایبەتی تێزار بوو. تێزار و ماڵباتەکەی لە ناخی دڵەوە خۆشدەویست. لەگەڵ ئەوەدا کە پیاوێکی دەرباری و خاوەنی پیشەیەکی لەو شێوەیە بوو، بە دوور بوو لە هەموو گەندەڵی و خراپەکارییەک. بەڵام چاوپۆشی لە گەندەڵی و کاری خراپی پایەبەرزەکان دەکرد و وەڕووی خۆی نەدەهێنا. هێندێ جاریش کە شتێکی دەگوت دەیخستە باری گاڵتە و گەپ و نقورچکی خۆی دەگرت. جاروباریش هەوا لە سەری دەدا و ئازایانە قسەی خۆی دەکرد، هەموو ئەو کارانەشی بە هۆی بەرژەوەند خوازییەوە نەبوو، بەڵکوو خووخدەی بەو شێوەیە بوو. کاتێک چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوت لە ناخی دڵەوە شاد بوو.

ـ کارێکی زۆر باشت کرد هاتی بۆ لام. چی دەخۆی؟... من هێشتا ئیشتیایەکی باشم هەیە. بەیانیان بیفتەک دەخۆم. خواردنەکەم بە شتێکی

وزەبەخـش دەسـت پێـدکەم و بە شـتێکی باشـتریش تەواوی دەکەم... هە هە هە!... ئەگەر بیفتەک ناخۆی، هێندێک شەڕاب بۆ خۆت تێکە... پێت وانەبێ تۆم لە بیر نەبووە! خۆم داخوازینامەکە دەدەم بە خاوەن شکۆ. دڵنیا بە. بەڵام هەر وا کە بۆم نووسیبووی، وا باشە سەرەتا سەرێک لە پتۆرۆڤ هەڵێنی. ڕەنگە هەر لەوێ کارەکەت جێبە جێ بێ و پێویست نەبێ ئەو داخوازینامەیە بدرێ بە خاوەن شکۆ.

نۆخلیدۆڤ کاتێک ناوی پتۆرۆڤی بیست، گرژ بوو. بۆگاتیرۆڤ گوتی:

ـ خۆت سەغڵەت مەکە! چاوپێکەوتنێکی بێ قازانج نییە.

ـ ئەگەر تۆ بە باشی بزانی دەچم بۆ لای.

ـ دەی هاوڕێ باسم بۆ بکە؛ پترزبۆرگ ت پێخۆشبوو؟

ـ پترزبۆرگ خەریکە کاس و وڕم دەکات.

ـ بۆگاتیرۆڤ دای لە قاقای پێکەنین و بە خاولی سمێڵی سڕی.

ـ ئەگەر بڕیارت داوە پتۆرۆڤ ببینی، هەر ئێستا بچۆ. سبەینی لە کارەکەت ئاگادارم بکەوە.

بۆگاتیرۆڤ هەستایە سەر پێ. خاچی خۆی کێشا و شمشێرەکەی لە نێو قەدی بەست. سڕینی سمێڵی بە خاولی و کێشانی خاچ و بەستنی شمشێر بۆی بووبووە عادەت. نۆخلیدۆڤیش لەگەڵیدا لە ماڵەکە هاتە دەرێ. لە بەر دەرگای دەرێ تەوقەیان کرد و لە یەک جیابوونەوە. بۆگاتیرۆڤ دەستی بە هێز و پڕ ماسوولکە بوو. نۆخلیدۆڤ بە دیتنی ئەو هاوڕێ لە مێژینەیە زۆر شاد بوو؛ بەڵام دەیزانی چاوپێکەوتنی پتۆرۆڤ ناخۆشە و گیانی داگیرابوو. بەو شێوەیە گەیشتە نووسینگەکەی پتۆرۆڤ. پەروەندەی ئەو گوندنیشینە داماوانەی مۆرکی لادینییان لە نێوچاوانیان دابوو، لە بەر دەستی ئەودا بوو. بۆ کەسێک کە بیهەوێ تووشی گرفتێکی ئاوا بێ، دووشت پێویستە: کاڵفامی

و سادەیی و نەبوونی ویژدانێکی مرۆڤانە و ڕەوشتی باش! پتۆرۆڤ ئەو دوو خەسڵەتەی هەبوو؛ بەڵام دژوازییەکی سەیریش لە کاروبارەکەیدا بەر چاودەکەوت؛ سەرۆکی ڕێکخراوەیەک بوو کە دەبوو بە هەر شێوەیەک بۆی دەلوێ، ئەگەر بە توندوتیژیش بێ، دەبێ ئایین و کلیسا لە مەترسیی ئەو کەسانە بپارێزێ کە بیرۆکەیەکی جیاوازیان هەیە. کلیسایەک کە لایەنگرانی پێیانوایە ماڵی چاکەکارانە و هەر کەس بیکاتە داڵدەی خۆی لە دۆزەخ بە دوور دەبێ؛ ڕێگا نهێنییەکانیشی دەچنەوە کۆشکی فەرمانڕەواکان و بەرژەوەندی و کاروبارەکانیشی بەو دامودەزگایە سپێردراوە کە بە دەستی کەسێکی وەک پتۆرۆڤ هەڵدەسووڕێ. ئەو و ژێردەستەکانی بە ئەرکی سەر شانی خۆیان دەزانی لە سەرانسەری ئیمپراتۆریی ڕووسیادا، هەموو شتێک بخەنە ژێر چاوەدێریی خۆیان و ئەگەر دینداریکی شەونخوونی کێش، یان پێشنوێژ و قەشەی گوندێک یان شارێکیی دوورەدەست لە ڕێگای دین کلا بوو، یان بە ئاستەم بەرەو گومڕایی کێشرا، دەمودەست بگەنە سەری و تاوانباری لە دین دەرچوو سزا بدەن، نەک خودای نەخواستە دەزگای پاک و خودایی کلیسا تووشی زیان بێت؛ هەڵبەت ناسینی ئەو تاوانە و بەدوادا چوونی لە ئەستۆی دەسەڵاتدارانی ئەو ناوچەیە بوو. ئایینی مەسیح هەموو مرۆڤەکان بە برای یەک دەزانێ و لە ڕوانگەی ئەو دینەوە دەبێ هەموو یەکسان بن. بەڵام پتۆرۆڤ لە سەر ئەو باوەڕە بوو، ئەو کەسێکی جیاوازە و خۆی لە خەڵکی ئاسایی بە زیاتر دەزانی، هەر بەو هۆیەش،مافی ئەوەی هەیە هەموو بەلایەکیان بە سەر بێنێ و ئەگەر چی لە ناخی دڵەوە ئیمانی بە هیچ شتێک نەبوو و پابەندی ئایینیش نەبوو، لادینی بۆ ئەو چێژێکی تایبەتیشی هەبوو، بەڵام نەیدەهێشت هیچ کەس بە ڕاز و نهێنیی بزانێ و لە سەر ئەو

باوەڕە بوو مرۆڤی ئاسایی مافی ئەوەیان نییە وەک ئەو بیر بکەنەوە و ئیمانیان لاواز بێ.

لە کتێبێکی ئاشپەزیدا خوێندبوویەوە کە قرژاڵ حەز دەکەن بە زیندوویی بیانبرژێنن! لە سەر ئەو بابەتە بێ واتایە ئەم ڕستەیەی دروست کردبوو: «مرۆڤەکان حەز دەکەن هەتا ئەو کاتەی زیندوون هۆگری بیروباوەڕی پڕوپووچ بن!»

لەگەڵ ئەوەشدا بەرەڤانیی لە ئایینی فەرمی دەکرد، لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەم جۆرە خوڕافات و بیرە پڕوپووچانە تەنیا بەکەڵکی خەڵکی ڕەشۆکی دێن. بە گاڵتەوە بە هاوڕێکانی دەگوت خاوەن مریشکەکان کەلاکی مردارەوە بوو دەدەن بە مریشکەکانیان بەڵام خۆیان هیچکات گۆشتی ئاوا ناخۆن و بەو پێیە خۆیان بە خاوەن مریشک دەزانی و خەڵکیش بە مریشکی جووجەخانە.

بە بڕوای ئەو پەیکەرە و وێنەکانی حەزرەتی مریەم کە لە غازان[59] و سمۆلنسکەوە هێناویانە بۆ پترزبۆرگ، تەنیا چەند ڕەسمی خەیاڵی و خورافاتین و هیچی تر؛ بەڵام چونکە خەڵک حەزیان لەو شتانەیە و باوەڕی پێدەکەن، دەبێ ئەم جۆرە خوڕافات و باوەڕە پڕوپووچانە پەرە پێبدەن و خەڵکی بۆ هان بدەن. پتۆرۆڤ یان ڕاستییەکانی دەشاردەوە یان لەو ڕاستییە نەدەگەیشت کە ئەو و کەسانی وەک ئەو خەڵکی لە نەزانی و گومڕاییدا دەهێڵنەوە و بەجێی ئەوەی دەستی خەڵکی بگرن و لە شەوەزەنگی نەزانی و

59 ـ وێنەی حەزرەتی مریەم کە لە غازانەوە بۆ نواندن هێنابوویان بۆ کلیسای بەناوبانگی پترزبۆرگ، بەناوبانگترین و خۆشەویسترین وێنەی ئایینی بوو کە بە وردە بەردی بە نرخ سازکرابوو.

دواکەوتویی دەربازیان بکەن، زیاتر لە گێژاوی ڕەش و خوڕافاتدا نوقمیان دەکەن.

کاتێک نۆخلیدۆڤ گەیشتە ژووری چاوەڕوانیی نووسینگەکەی پتۆرۆڤ، ئەو لە نووسینگەکەی خۆی لەگەڵ ژنێکی ڕووحانی سەرقاڵی ئاخافتن بوو؛ ئەو ژنە بەرپرسی پەرستگەیەک و لە بنەماڵەی خانەدانەکانی ڕووسیا بوو. ئەو ژنە ڕێزدارە و دەستپەروەردەکانی، لەگەڵ«ئوونیات»[٦٠]ە کانی ڕۆژاوای ڕووسیا لە کێشەدا بوون و بانگەشەیان بۆ ئایینی ئۆرتۆدۆکس دەکرد و بە زۆر دەیانویست هەمووان بێننە سەر ڕێبازەکەی خۆیان.

نووسیاری تایبەتی پتۆرۆڤ لە نۆخلیدۆڤی پرسی بۆچی هاتووە؟ ئەویش خێرا سکاڵانامەی گوندنیشنەکانی پێشان دا و گوتی دەیهەوێ بەر لەوەی ڕادەستی خاوەن شکۆ ئیمپڕاتۆری بکات، بیروڕای جەنابی پتۆرۆڤ لەو بارەوە وەرگرێ. نووسیار سکاڵانامەکەی لێوەرگرت و بردی پیشان بەرپرسەکەی خۆی بدا. لەو کاتەدا خاتوونی بەڕێز و ئیماندار لە نووسینگەی کاری جەنابی پتۆرۆڤ هاتەدەرێ. جلوبەرگی ڕازاوەی لەبەردا و بە خەستی ئاڕایشتی کردبوو. بە تۆڕێکی چیندار دەموچاوی داپۆیشبوو و بە دەستە سپی و ناسکەکەی خاچە چکۆلە زمڕووتەکەی سەر سینگی گرتبوو.

پتۆرۆڤ دوای ڕۆیشتنی خاتوونی ڕووحانی بە تەنیا دانیشتبوو.

نووسیار سکاڵانامەکەی دایە دەستی و کە نامەکەی خوێندەوە بۆی دەرکەوت مەسەلەیەکی ئاسایی نییە. «ئەگەر ئەو سکاڵانامەیە بگاتە دەستی ئیمپڕاتۆر، یان لە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی دەرەوەدا بڵاوبکرێتەوە، کێشەی بۆ

60. Uniates تاقمێک لە مەسیحییەکانی یۆنان و ڕووسیا کە ڕێبەریی پاپیان قەبووڵ کردبوو، لە زۆربەی ناوچەکانی ڕووسیا لایەنگریان هەبوو.

ساز دەکات؛ بەتایبەت ئەوەش کە کەسێکی ناودار و دەسترۆیشتوو بە دوای کارەکەوەیە!» داوای لە نووسیار کرد نۆخلیدۆڤ بنێرێتە ژووری.

کێشەکەی بە باشی وەبیر هاتەوە؛ تا ئێستا چەند سکالانامەی دیکەشی لەو بارەوە پێگەیشتبوو. ماجەراکە ئەوە بوو کە تاقمێک لە گوندنشینان لە مەزهەبی ئۆرتۆدۆکس لایان دابوو و چوو بوونە سەر ڕێبازێکی دیکەی مەزهەبی. ئەوان بەو تاوانە دەستبەسەر و ڕادەستی دادگا کرابوون. بەڵام دوای لێپرسینەوە دادگا ئەوانی ئازاد کردبوو. ئوسقوف و دەسەڵاتدارەکانی ناوچەش بۆ سڕینەوەی ئەو ئاژاوەیە، فێڵ و دەهۆیەکی نوێیان گرتەبەر. کلیسا لە سەر داوای ئەوان ڕایگەیاند کە ئەو تاقمە لە دین لایان داوە و ناتوانن ژیانی هاوبەشی پێک بێنن، چونکە هاوسەرگیرییەکەیان ناشەرعییە و منداڵەکانیان حەرامزادەن. ئەو کاتە جەندرمەکانیان کرد بە گژیاندا و ژن و پیاو و منداڵیان لێک جیا کردەوە بۆ ئەوەی بنەماڵەی ئەو چارەڕەشانە لە بەریەک هەڵوەشێنن. گوندنشینەکان دەستیان لە خەبات و بەربەرەکانێ هەڵنەگرت و دیسان لە کلیسای گوندەکەیان لە دەوری یەک کۆبوونەوە و کۆڕی خوێندنەوەی ئینجیلیان بەست. ئوسقووف و دەسەڵاتدارانی ناوچەکە دەستیان دایە دەستی یەک و بە یارمەتیی پتۆرۆڤ ئەو تاقمەیان قۆڵبەست کرد و هەر کامەیان بۆ شوێنێک دوور خستەوە بۆ ئەوەی گوندنشینەکانی دیکەش لە دین کلا نەکەن؛ بەم چەشنە کێشە و ئاژاوەکەیان دامرکاند،چەند بنەماڵەیان شێواند و ژیانیان لێ تاڵ کردن؛ بەو شێوەیەش پیشانیان دا چەندە هۆگری مەزهەبی ئۆرتۆدۆکسن! لە تەواوی ئەو ماوەیەدا پتۆرۆڤ و دامودەزگاکەی خەریکی گرتن و ئازاردانی خەڵکی هەژار بوون و هەموو کارەکان لە ژێر چاوەدێریی ئەواندا بەڕێوە دەچوو. بەڵام ئەمڕۆکە پیاوێکی وەک کۆنت نۆخلیدۆڤ وەدووی کارەکە کەوتبوو و یەکێک لە پیاوە پلە

یەکەکانی پترزبۆرگ دەهاتە ئەژمار و دەیویست سکاڵانامەی گوندنشینەکان بگەیێنێتە دەستی ئیمپراتۆر، پتۆرۆڤ ترسی لێ نیشتبوو. چونکە ئەگەر ئاشکرا بووایە چەندە بێ بەزەییانە لەگەڵ تاقمێک خەڵکی داماو و ڕەشوڕووت جووڵاوتەوە، ڕۆژنامەکانی دەرەوە مەسەلەکەیان گەورە دەکردەوە، هات و هاواریان وەڕێ دەخست و کارەکەی لێ ئاشکرا دەبوو. هەر بۆیە پتۆرۆڤ لەڕێوە کەوتە بیری ئەوەی چارەسەرێک بۆ ئەو مەترسییە بدۆزێتەوە و پووشبەسەری بکات.

نۆخلیدۆڤ چووە ژووریٚ. پتۆرۆڤ وای نواند کە هێندەی کار بە سەردا ڕژاوە، فریای سەرخوراندن ناکەویٚ و ناکریٚ یەک خولەک کاتی خۆی بە هەدەر بدات؛ بە بێ پێشەکی چووە سەر باسی سەرەکی.

ــ بە چاولێکردنێکی ئەو ناوانەی ژێر سکاڵانامەکە هەموو مەسەلە و ڕووداوەکەم وەبیر هاتەوە. دەبێ سپاستان بکەم کە ئەو داماوە لە بیر کراوانەت وەبیرهێنامەوە. بەڵێ... کاربەدەستانی ناوچەکە هێندێک زێدەڕەوییان کردووە. بەڵام خاترجەم بە کارێک دەکەم بە زووترین کات ئەو داماوانە بچنەوە سەر ماڵ و ژیانیان.

نۆخلیدۆڤ بێدنگ بوو و بە ڕقەوە چاوی لێدەکرد.

ـ کەوایە پێویست ناکات سکاڵانامەکە بگەیەنمە دەستی خاوەن شکۆ.

ـ نانا، پێویست ناکات؛ من بەڵێنیتان دەدەمێ. هەر ئێستا خۆم... نامەیەک دەنووسم ئازادیان بکەن.

وەها ددانی دەنا بە وشەی «خۆم» دا کە دەتگوت قسەی ئەو لە ڕووسیا دا لە سەرووی قسەی هەمووانەوەیە؛ چووە پشت مێزەکەی دانیشت نامەکە بنووسێ. نۆخلیدۆڤ چاوی لە سەر سەری ساف و چکۆڵەی ئەو پیاوەوە خزی و لە سەر دەستە کۆشتن و دەمارە هەستاوەکانی گیرسایەوە، کە بە

خێرایی بە سەر کاغەزەکەدا دەگەڕا و پێی سەیر بوو کە پیاوێکی ئاوا دڵڕەق و بێ بەزەیی کە لە هەمبەر مەرگ و ژیانی مرۆڤەکاندا بێ موبالاتە و مێشێکی میوان نییە، ئاوا خێرا داخوازی دەنووسێ و دەیهەوێ بەندی و تاراوەکان ئازاد بکات و بیانگێڕێتەوە بۆ سەر ماڵ و ژیانیان.

پتۆرۆڤ نامەکەی نایە پاکەتێکەوە، مۆری کرد و پێکەنینێک نیشتە سەر لێوێ و گوتی:

ـ تەواو بوو... مزگێنی بە گیراوەکان بدە ئیتر ئازاد دەبن.

نۆخلیدۆڤ نامەکەی لێ وەرگرت بەڵام نەتیوانی بێدەنگ بێ.

ـ کەوایە بۆ تا ئێستا ئەو داماوانە ئەو هەموو ئازارەیان کێشاوە؟

پتۆرۆڤ لە جێی خۆی هەستا. گرژییەوە. وای نواند کە نۆخلیدۆڤ پرسیارێکی بە جێی کردووە.

ـ ئەوە ئیتر نهێنییەکی دەوڵەتییە؛ تەنیا ئەوەندە دەڵێم کە گرنیگترین شت بەرژوەندیی وڵاتە؛ کاربەدەستانی ناوچە هەتا توندوتیژیی زیاتر بنوێنن، بە قازانجی وڵات و بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتە.

ـ کام بەرژەوەندی؟ تاقمێک مرۆڤی داماو و زەحمەتکێش بە ناوی دین و ئایینەوە دەستبەسەر کراون، ژنانتان بۆ لایەک ناردووە و مێردەکانیشیان بۆ لایەک، منداڵەکانیشتان بۆ شوێنێک ناردووە، هیچ هەواڵێکیان لە دایک و باوکیان نییە. ئێوە ناوی ئەو کارە دەنێن چی؟

پتۆرۆڤ بزە لە سەر لێوی نەدەڕەوییەوە. جۆرێک لووتی هەڵێنابوو دەتگوت تەواوی بەرژەوەندییەکانی وڵات و مەزهەبیان بە ئەو سپاردووە و دەبێ لە هەمبەر کەسێکی کاڵفامدا کە سەری لە بەرژەوەندییەکانی وڵات دەرناچێ، وەڵام بداتەوە و ڕێنوێنیی بکات.

ـ بەڵێ، ئەگەر لە ڕوانگەی تاکە کەسییەوە چاوی لێبکەی، قسەکەی ئێوە ڕاستە؛ بەڵام ئەگەر لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتی و لە ڕووبەرێکی بەر فراوانتردا لێی بکۆڵییەوە، بەو ئاکامە دەگەی کە ئەو جۆرە توندوتیژییانە پێویستە. لەوانە گەرێین خۆشحاڵم کە ئەم مەسەلەیە بوو بە هۆی ئەوەی لەگەڵ بەڕێزتان ئاشنا بم.

دەستی بردە پێشێ. نۆخلیدۆڤ تەوقەی لەگەڵ کرد و لە ژوورەکە هاتە دەرێ. لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد: «ئەم کابرایە هەر دەڵێ بەرژەوەندیی وڵات و بەرژەوەندیی ئایین و بەرژەوەندیی نەتەوەیی و... وا باشتر بوو بڵێ؛ بەرژەوەندیی خۆم و بەرژەوەندیی خۆم!...» لە مێشکی خۆیدا هەموو خاوەن پیشەکانی دادگایی دەکرد. لە لایەک کەسانێکی دەدی کە پیشە و پلەوپایەیەکیان هەیە و خاوەن دەسەڵاتن و هەرچی حەزیان لێ بێ دەیکەن، لە لایەکی دیکەشەوە، خەڵکێکی داماو دەبینی بە دەستی ئەو زاڵمانەوە پێوە بوون؛ کەسێکی وەک ئەو ژنەی کە بە تاوانی فرۆشتنی مەشرووبی قاچاخ بەندکراوە؛ وەک ئەو گەنجەی بە تاوانی دزینی بەڕەکۆنێک دەستبەسەر کراوە، کەسانێکی تر بە تۆمەتی بەرەڵڵایی و ئاورتێبەردانی ئەمبار و گەندەڵی کەوتوونە زیندان، یان وەک لیدیا کە نەیویستووە ناوی هیچ کەس بدرکێنێ؛ وەک ئەو گوندنشینە لێقەوماوانە کە مەزهەبێکی جیاواز لە مەزهەبی فەرمیی وڵاتیان هەیە؛ وەک گوورکۆڤیچ کە گوتوویەتی من ئازادیم خۆشدەوێ. نۆخلیدۆڤ لەو ڕاستییە دەگەیشت کە ئەم چارەڕەش و داماوانە بەو هۆیە بەند نەکراون کە لە ڕێگای عەدالەت و یاسا لایان داوە، بەڵکوو تاوانیان ئەوەیە دەردەسەریان بۆ کاربەدەستانی پایەبەرزی دەوڵەت و سامانداران ساز کردووە و بەرژەوەندیی نەتەوەیی کە باسی دەکەن تەنیا بەرژەوەندیی ساماندارانە و بەس.

له لایەکەوە ئەوانەیــان خســتۆتە ژێــر گوشــارەوە و له لایەکــی دیکەشــەوە فەرمانبەران له بیری ئەوەدان کەسێکی تازە بدۆزنەوە و تاوانێکی بۆ دابتاشن. لیدیا بە تاوانی نەدرکاندنی ناو و نهێنیی هاوڕێیان، گوورکۆڤیچ بە تاوانی ئازادیخوازی، پیرێژنــی دامــاو بە تــۆمەتی فرۆشــتنی مەشــرووبی قاچــاخ و ئەم گوندنشــینە قوربەســەرانەش بە نــاوی لادینــی و هەر کەســەی بە ناوێــک و بیــانوویەک دەستبەســەر دەکەن و ئــازارو ئەشــکەنجەی دەدەن؛ لەو یــارییە سامناکەشــدا له کەسانێکی پایەبەرزی وەک مێردەکەی پوورییەوە بگرە هەتا دەگاتە سەناتۆر و پتۆرۆڤ و کاربەدەستە وردیلەکانی تر کە جلوبەرگی ڕێکوپێک لە بەر دەکەن و وەک کــاتژمێر کــاردەکەن، هەر کــام ڕۆڵێــک دەگێــڕن. ئەوانەی له پشــت مێــزی وەزارەتخانەکان دانیشتبوون، کوا ئاگایان له ڕەنج و ئازاری خەڵکی هەیە؟ تەنیا له بیــری کورســییەکەی خۆیــان دان و هەر کەس ببیــنن دژ بە خۆیــان و کاروباریــان دەجووڵێتەوە، تاوانێکی بۆ دەدۆزنەوە و له سەر ڕێگای خۆیانی لادەبەن.

ئەگەر بــێ تاوانێــک لەگەڵ دە کەســی تاوانبــار بکەوێــتە دەســتی ئەو جەلــلادانە، هەموویــان پــێکەوە ســزا دەدرێــن و ســەریان دەپەڕێــنن؛ ئەگەر تاوانبارێکیش لەگەڵ دە کەسی بێ تــاوان بکەوێتە چنگیــان، بە جێی ئەوەی ئەندامی مەترسیدار وەک سەقاملووس دەرهێنن، ڕەحم بە هیچکامیان ناکەن و تەڕ و وشک پێکەوە دەسووتێنن.

نۆخلیدۆڤ هەمــوو شــتێکی بە ڕوونــی دەدی و ئەو شــتانە هێنــدە له بەر چــاوی ســادە و ئاســایی بــوون، ئەو گومــانەی له لای دروســت بــوو کە بــارودۆخی پێچەڵاوپــووچی کــۆمەڵایەتی ئــاوا بە ئاســانی شــرۆڤە دەکــرێ؟ لەوەش ســەری ســووڕمابوو کە بــۆچی ئەو وشــە جــوانەی وەک خــودا و عەداڵەت و خێرخوازی و یاسا و ئیمان، دەبێ بکرێنە سەرپۆش بۆ ستەم و جینایەت و گەندەڵکارییەکانی دەسەڵاتداران و پیاوانی دەوڵەت؟

# بیست و هەشت

نۆخلیدۆڤ دەیویست بە شەودا وەڕێ بکەوێ و پترزبۆرگ بە جێ بێڵی، بەڵام کتوپڕ وەبیری هاتەوە دەبێ بەڵێنی خۆی بەجێ بێنێ و بچێت بۆ دیتنی ماریت لە هۆڵی شانۆ، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئاگای لە وەسوەسەکانی ئەو دیدارە هەبوو، بە بیانووی ئەو بەڵێنەوەکە دابووی، خۆی تووشی ئەو داوە کرد. ئەو درۆی لەگەڵ خۆشی دەکرد: «دەبێ هێزی خۆم لە هەمبەر هەوەس و نەفسدا تاقی بکەمەوە و ئەمەش ڕەنگە دوایین تاقیکاری بێ!»

بە جلوبەرگی ڕازاوە و سەروپۆتراکی ڕێکوپێکەوە چوو بۆ شانۆ. جێگای خاڵی نەمابوو. بە ڕێزەوە شوێنی تایبەتی ماریت و مێردەکەیان پیشاندا. کاتێک گەیشتە شوێنەکە، چاوێکی خێرای بە هەموو تەلارە نیوەتاریکەکەدا گێڕا. جێگای خاڵی لە هیچکام لە لۆژەکان و کورسییەکانی خوارێ وەبەرچاو نەدەکەوت. هەموو چاویان لە پەردەکە بڕیبوو و تەنیا سەریان دیار بوو؛ بە قژی لوول و ساف، ڕۆن لێدراو، سپی و ڕەش و ماشوبرنجییەوە، لەو نێوانەدا کڵاو پرچی ژنەکان زیاتر بە چاو بوو. نۆخلیدۆڤ لە کاتی پەردەی دووهەمی شانۆکەدا گەیشتبوو. ڕۆڵی خاتوو کامیلیایان[٦١] دەگێڕا. ئەکتەرێک کە ئەو ڕۆڵەی دەگێڕا، لەشولارێکی باریک و ڕەقەڵەی هەبوو، کراسی

61 ـ خاتوو کامیلیا، یەکێک لە قارەمانەکانی چیرۆکی بەناوبانگی ئەلکساندر دۆمای کوڕ.

هەوریشمی ڕەشی لە بەردا و بە دەنگێکی پڕسۆز و کوڵەوە دەردی ئەشق و دڵی سووتاوی خۆی بەیان دەکرد.

نۆخلیدۆڤ لەگەڵ چوونە ژوورەوە، تێک هەڵەنگووتنی هەوای سارد و گەرمی لە سەر ڕوومەتی خۆی هەست پێکرد. لەو شوێنە دوو ژن و دوو پیاو دانیشتبوون. ئەو دوو ژنە یەکیان ماریت و ئەوی دیکەیان خاتوونێک بوو بە تۆڕی سوور و قردێلە قژی ڕازاندبۆوە. پیاوەکانیش یەکیان مێردی ماریت بوو. ژنیڕاڵێکی کەڵەگەت و لووت قەڵەنگی، جلوبەرگە ئەفسەرییەکەی بە کۆبە و قردیلەی بریقەدار ڕازابۆوە. پیاوی دووهەم قژی بۆز و لە دوو لاوە قژی کەوتبووە سەرلاجانگی و وەک ئەگریجەی دەنواند . ماریت خۆی لەگوڵ دابوو، شان و ملە سپی و ناسکەکەی بە خاڵێکی ڕەش و جوانی لاملییەوە دەرخستبوو، بە ناز سەری هەڵێنا و بە بزەیەکی شیرینەوە داوای لێکرد دانیشێ. بزەیەکی زۆر پڕمانا! ژنیڕاڵ قورساخانە و بە هێواشی سەری وەرسووڕاند و سەری لەقاند. بە هەموو جووڵە و ڕوانینەکانی خۆی دەیویست وا بنوێنێ کە کەسایەتییەکی گرنیگە و خاوەن و مێردی ئەو خاتوونە شۆخوشەنگەیە.

پەردەی دووهەم بە چەپڵەی بینەران کۆتایی هات. ماریت لە جێی خۆی هەستا و داوێنی کراسەکەی بە ناوەزەوە بە دوای خۆیدا کێشا و لە نێوان نۆخلیدۆڤ و مێردەکەیدا دانیشت و ئەوانی بە یەکتر ناساند. ژنیڕاڵ زەردەیەکی گرت و دیسان لووتی هەڵێنا و چاوی لە پێش خۆی بڕی.

ـ دەمویست هەر ئەمشەو بگەڕێمەوە؛ بەڵام چونکە بەڵێنم وابوو، هاتم.

ـ ئەگەر بۆ چاوپێکەوتنی منیش نەبوایە، لانیکەم بۆ دیتنی هونەرنوێنیی ئەو ئەکتەرە دەبوو بێی. دیتووتە چەندە ڕۆڵەکەی بە باشی دەگێڕی و دڵت

وەکول دێنێ. داوای لە مێردەکەی کرد قسەکەی پشتڕاست کاتەوە، ئەویش لووتبەرزانە سەرێکی لەقاند؛ بەڵام نۆخلیدۆڤ قسەیەکی دیکەی هەبوو:

ـ من زۆرم لەو جۆرە هونەرە نوێنییانە دیتووە و ئیتر هیچ کاریگەرییەکی لە سەر من نییە. ئەمڕۆ هێندەم ڕووداوی خەماوی و دڵتەزین دیوە کە...

ـ هەموویم بۆ باس بکە.

ژنیڕاڵ گوێی بۆ قسەکانیان شل کردبوو و بەبێ ئەوەی شتێک بڵێ، تەوسەبزەیەک نیشتبووە سەر لێوی.

ـ چووم چاوم بە ئەو کچە کەوت کە دوای چەند مانگ زیندان ئازاد بووبوو؛ فەقیرە وەک شێتی لێ هاتووە. ماریت مێردەکەی تێگەیاند کە باسی ئەو کچە دەکات وا ئەو بۆتە هۆی ئازاد بوونی. ژینڕاڵیش گوتی زۆر خۆشحاڵە کە ڕزگار بووە. دیسان بە تەوسەبزەیەکەوە هەستا، بەجێی هێشتن و چوو لە دالانەکە جگەرەیەک بکێشێ.

نۆخلیدۆڤ چاوەڕێ بوو ماریت باسی مەبەستێکی گرنیگ بکات کە بەڵێنی پێدا بوو، بەڵام هەرچی ڕاوەستا هیچ شتێکی گرنیگی لێ نەبیست . ماریت تەنیا خۆی شیرین دەکرد و سەبارەت بە شانۆ و بابەتی تر دەدوا. نۆخلیدۆڤ بۆی دەرکەوت مەسەلەیەکی گرنیگ لە ئارادا نەبووە و مەبەستی ماریت لە ڕاکێشانی ئەو بۆ هۆڵی شانۆ تەنیا بۆ ئەوە بووە سەر و سینگی جوان و هەوەسبزوێنی خۆی پیشان بدات و دڵی لێ بستێنێ.

ئەمشەو ئیتر شەرم و حەیای دوێنێی وەلانابوو و هەموو شتێکی بە ڕووتی دەنواند و نۆخلیدۆڤیش ڕاستییەکانی بەڕوونی دەدی. ماریت ئیتر لە بەر چاوی دڵڕفێن نەبوو؛ ژنێکی درۆزن و ڕیاباز بوو، هاوسەری ژینڕاڵێک بوو کە بینای ژیانی لە سەر خوێن و فرمێسکی سەدان مرۆڤی چارەڕەش و داماو هەڵچنیبوو. دیار بوو دڵسۆزییەکانی دوێنێی بۆ خەڵکی هەژار و

لێقەومـاو هەمـووی درۆ و فڕوفێڵ و مەبەسـتی تەنیـا ڕاکێشـانی سـەرنجی نۆخلیـدۆڤ بـووە. ئیتـر تـاقەتی نەبـوو گـوێ لە ژنێکـی ئـاوا خـراپ و بەدزات بگـرێ. هەسـتا بـڕوا. کـڵاوەکەی بە دەسـتەوە گرتبـوو. ژینـڕاڵ کە جگەرەکەی کێشـابوو،گەڕایەوە بـۆ لـۆژەکە؛ نۆخلیـدۆڤ ئیتـر ڕانەوەسـتا. لە لـۆژەکە هـاتە خـــوارێ و بە پەلە خـــۆی گەیانـــدە ســـەر شـــەقام. ژنێکـــی بـــاڵا بەرز و ڕازاوە،بەڕەوت و ڕۆیینـی نەرم و هەوەسـبزوێنەوە،لە پـێش ئەوەوە لە سـەر شۆستەکە پیاسەی دەکرد. هەر کەس بە تەنیشتیدا تێدەپەری ئـاوڕی دەدایەوە و چاوی لێدەکرد. نۆخلیدۆڤیش کاتێک گەیشتە لای بێ ئیختیـار لای کـردەوە و چـاوی لێکـرد، ژنە ڕاوەسـتا و زەردەیەکـی گـرت. دەموچـاوی بە سـووراو و سـپیاو داپۆشـیبوو، زۆری شـێوەی ماریـت دەدا! دیسـان ئەو هەسـتە لە دەروونی نۆخلیدۆڤدا سەری هەڵدا، بەرەولاشی ڕادەکێشرا و لێشی بێزار بوو. خیراتـر هەنگـاوی هەڵێنـایەوە و لێـی دوور کەوتەوە و بەرەو کامنسـکایا بایدایەوە. مـاوەیەک لە سـەر پردەکە هـاتوچۆی کـرد. پۆلیسـێک کە ئەو پیـاوە تەنیایەی لە سەر پردەکە دی، لێی بە گومان بوو!

نۆخلیدۆڤ لە بیری ئەودا بـوو بـزەی ئەو ژنە بەسـتۆکەیە و بـزەی ماریت زۆر لە یەک دەچـوون. ئەم دوو بـزەیە یەک مانایـان هەبـوو؛ تەنیـا جیـاوازیی ئەو دووانە ئەمەبـوو کە ژنە بەسـتۆکەکە سـادقانە قسـەی خـۆی دەکـرد و بە بـزەکەی دەیگـوت: «ئەگەر منـت دەوێ لەگەڵ خـۆت بمـبە، ئەگەر حەزیـش ناکەی ملی ڕێ بگرە و بڕۆ» ئەو ژنەش لە شانۆکە ویست و حەزی خۆی لە حەوت بەرگ دەپێچا و لەگەڵ هەزار جۆر ناز و ئەدا ئـاوێتەی دەکـرد و دەیدا بە ڕووتا. ئەمەیان ڕاست و بێ فڕوفێڵ و ئەوی دیکەشیان فێڵەباز و ڕیاکار. ئەمەیـان لە بەر ئاتـاجی و نەبـوونی بژیـوی ژیـان خـۆی دەفرۆشـی و ئەوەی دیکەیان ویستی تەنیا دامرکاندنی گڕی هەوەسی خۆیەتی. ئەم ژنە کۆڵانگەڕە

ئـاوی سـوێر و قێـزەون دەکـا بە گەرووی تینووەکانیـدا و ئەوی دیکەشـیان ژارێکـی بکـوژ تـێکەڵ خـوێنی تامەزرۆیـانی خـۆی دەکـا. نۆخلیـدۆڤ پێونـدیی خۆی لەگەڵ ژنی شۆخوشەنگ و بە نازی مارشالی ئیفتیخاری وەبیر هـاتەوە و بێـزی لە خـۆی هەسـتا. بەڵام کاتێـک مـرۆڤ بەرگێکـی شـاعیرانە لە بەر هەوەسی خۆی دەکا، چاکە و خراپە لێک ناکاتەوە و تەنـی کاتێک چاوی بە رووی ڕاسـتییەکاندا دەکرێتەوە، کە ژەنگی ناپاکی لە ڕۆحـی خـۆی دامـاڵێ و پاکی بکاتەوە.

لە سەر پردەکەوە، کۆشکەکانی تیزار، بەرز و ئاسمان قەڵێیش، ڕووبـار و گەمیە و باڵەخانەی بوورسی لێ دیار بوو. هەموو شـتێک لە تاریکیدا ئۆقرەی گرتبـوو. هەستی دەکرد ئەم هەمـوو بینـا و باڵەخـانە بەشکۆیە و ئەو هەمـوو بریقوباقەی چاو وەشەوارە دەخـا، سەرپۆشـێکە بە سـەر ڕاسـتییەکاندا کشـاوە و لە ئێمە شاردراوەتەوە.

نۆخلیــدۆڤ نە دەیویســت بزانـــێ؛ نە دەیویســـت بە چـــاوی کـــراوە لە ڕاسـتییەکان بڕوانـێ؛ بەڵام ئیتـر دەرنـگ بووبـوو، گەیشـتبووە سـەر چـاوەی رووناکی، ڕاستییەکانی بە ڕوونـی دەدی. لە سـەر پردەکەوە چاوی لە شـوێنە دوورەدەسـتەکان بڕیبـوو، ڕوونـاکیی لە نـاخی خۆیـدا بەدی دەکـرد؛ شـادی و خەم لە ناخیدا ئاوێتە بووبوون.

# بیست و نۆ

نۆخلیدۆڤ یەکەم ڕۆژ کە گەیشتەوە مۆسکۆ، چوو بۆ نەخۆشخانەی زیندان تاکوو ماسلۆڤا لە ئاکامی پێدا چوونەوەی حوکمەکە ئاگادار بکات و پێی بڵێ خۆی ئامادە بکات بۆ سیبیریا، هەر وەها داخوازینامەی بەخشینەکەی پێ واژۆ بکات. فانارین دەقی ئەو داخوازینامەی ئامادە کردبوو، بەڵام نۆخلیدۆڤ هیوایەکی ئەوتۆی بە بەخشین نەبوو و خۆی ئامادە کردبوو لەگەڵ بەندییە سیاسییەکان و حوکم دراوانی دورخرانەوە و کاری دژوار بڕوات بۆ سیبیریا. دەتگوت ئیتر بیر لە ئازادی ناکاتەوە. ڕەنگە بەو هۆیەی ئەگەر ماسلۆڤا ئازادبووایە و شووی پێ بکردایە لەگەڵ گرفت و کێشەی زیاتر بەرەوڕوو دەبوو. مەسەلەیەکی گرنیگتریش مێشکی ئەوی بە خۆیەوە خەریک کردبوو. تۆروو[٦٢] نووسەری ئەمریکایی لە یەکێک لە بەرهەمەکانیدا نووسیویەتی: «لە وڵاتێکدا کە پشگیری لە کویلەداری بکرێ، باشترین شوێن بۆ پیاوانی بەشەرەف زیندانە.» نۆخلیدۆڤیش بەو ئاکامە گەیشتبوو و لەو سەفەرەیدا بۆ پترزبۆرگ ئەو ڕاستییەی زیاتر بۆ دەرکەوتبوو.

---

62. Thoreau نووسەری بیرمەندی ئەمریکایی«1817ـ1862» دژی کۆیلەداری.

«بەڵێ! لە چاخی ئێمە دا و لە ڕووسیا، تەنیا جێگای باش بەندیخانەیە!» تەنانەت کاتێک لە بەندیخانە نزیک بۆوە و بینای گەورە و سامناکی زیندانی دی، زیاتر لە سەر بیروباوەڕی خۆی سوور بوو. دەرگاوانی نەخۆشخانەی زیندان ناسییەوە و پێی ڕاگەیاند کە ماسلۆڤا ئیتر لەوێ نییە.

ـ ئەی لە کوێیە؟

ـ ناردوویانەتەوە بۆ بەندیخانە.

ـ بۆ؟

ـ گەورەم! ئێوە ئەو ژنە سوکوچروک و خراپکارانە ناناسن! وەک دەڵێن لەگەڵ پزشێکی نەخۆشخانە کەینوبەنییان هەبووە. سەرۆکی نەخۆشخانە ناچار بوو بینێرێتەوە بۆ بەندیخانە.

نۆخلیدۆڤ حەپەسابوو؛ دەتگوت هەواڵی کارەساتێکی گەورەیان پێداوە. هەستی بە شەرمەزاری دەکرد و لە ناخەوە ئازاری دەکێشا. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «کەوایە لە تەواوی ئەو ماوەیەدا خۆم فریو داوە. چەندەم هەوڵ دا ئەو ژنە بگۆڕم و دەست لە کارەکانی ڕابردووی هەڵگرێ. دیارە ئەو ژنە بەستۆکە و درۆزنە، قەستی ئەوە بووە بەو ناڵە و کڕووزانەوە و یارییانە خاوم ببەستی. دوایین جار کە چاوم پێی کوت، چەندە حیز و بێ شەرمانە چاوی لێدەکردم. ئەو ژنە تازە چاک نابێ و نایەتەوە سەر ڕێ!»

پەشۆکا بوو، وەک شێت لە بەر خۆیەوە قسەی دەکرد: «چبکەم؟ دیسان هەوڵ بدەم و وەڕووی خۆمی نەهێنم، یان وازی لێ بێنم و بڕۆم بە دوای ژیانی خۆمدا؟» بەڵام ئەوەی نەدەزانی ئەگەر هەموو شتێک بە نیوەچڵی بەجێ بێڵێ و وەدووی کاری خۆی بکەوێ، ماسلۆڤا زەبرێکی ئەوتۆی لێ ناکەوێ، بەڵکوو زەبری گورچوو بڕ لە خۆی دەکەوێ و بە سزای خۆی دەگا.

«نــا!... ئەوەی ڕووی داوە، مەســەلەکە نــاگۆڕێ و نــابێ شــوێن لە ســەر بڕیارەکەم دابنێ. من دەبێ خۆم بە ویژدانم بسپێرم. گریمان لەگەڵ پزشیکی نەخۆشخانە کەینوبەینی بووە، ئەمە پێوەندیی بە خۆیەوە هەیە. ئەرکی من ئەوەیە وا ویژدانم پێم دەڵێ. ویژدانم دەڵێ: بۆ قەرەبووکردنەوەی تاوانی ڕابردوو، نابێ دەستی لێ هەڵگرم؛ هەر چۆنێکە دەبێ زەماوەندی لەگەڵ بکەم و بۆ هەر کوێیەک چوو، وەک نیسێ وەدوای کەوم!»

بە هەنگاوی خێرا و لێبڕاوانە ڕۆیشت بۆ لای بەندیخانە و لەوێ پرسیاری ماسلۆڤای لە پاسەوانی بەر دەرگاکە کرد. پاسەوان کە نۆخلیدۆڤی دەناسی، پێی گوت لە ماوەی ئەم یەک ـ دوو حەوتووەدا زۆر شت گۆڕاوە؛ سەرۆکی پێشوو خانەنشین کراوە، سەرۆکێک کە هاتۆتە جێی ئەو زۆر سایەقورس و سەختگیرە.

ـ بەڵێ گەورەم! ئەم سەرۆکە نوێیە گاڵتە نازانێ. خۆتان قسەی لەگەڵ بکەن، بەڵکوو ڕێگەتان پێ بدا ملاقاتی بکەن؛ ئەوەتا،ئەو پیاوەیە وا بەرەو ئێرە دێ!

ســەرۆکی نــوێ پیــاوێکی تەژەی ڕەقەڵە بــوو. کەڵەبــابەی بەرملــی دەرپەڕیبوو، گرژ و مۆن و کانێس ئەستوور، بە هێواشی هەنگاوی دەنا. کۆنت نۆخلیدۆڤ چووە پێشێ و داوای لێکرد ڕێگەی ملاقاتی پێ بدا.

ـ ملاقات تەنیا لە ڕۆژانی دیاریکراو دایە و لە شوینی تایبەت.

ـ داخوازینامەی بەخشینم پێیە و هێناومە بەندییەکە واژۆی بکات.

ـ داخوازینامەکەم بدەیە، خۆمان بۆی دەبەین واژۆی بکات.

ـ دەبێ چاوم بەو بەندییە بکەوێ؛ پێشتر ڕێگەیان پێدەدام.

سەرۆک بە توندی چاوی لە نۆخلیدۆڤ کرد.

ـ پێشتر تەواو بوو.

ـ من ئیجازنامەی حوکمڕانم پێیە.

سەرۆکی بەندیخانە بە قامکە باریکەکانی کاغەزەکەی وەرگرت و خوێندییەوە.

ـ تکایە وەرە بۆ نووسینگە.

ئەمجارەیان نووسینگە چۆڵ بوو و هیچ کەس نەهاتبوو بۆ ملاقاتی کەسەکانی خۆی. سەرۆک لە پشت مێزەکەی دانیشت و دەستی کرد بە خوێندنەوەی نامە ئیدارییەکان. نۆخلیدۆڤ داوای لێکرد ڕێگەی پێ بدا چاوی بە بەندیی سیاسی ویرا بکەوێ و سەرۆک ڕاشکاوانە پێی گوت ملاقاتی زیندانی سیاسییە یاساخە! نۆخلیدۆڤ دەیویست لەو ملاقاتەدا نامەکەی کرنیلۆڤا بدات بە وێرا، بەڵام هیواکەی لە دەست چوو.

سەرۆکی بەندیخانە دیسان خۆی بە کاغەزەکانەوە سەرقاڵ کرد. زۆری نەخایاند ماسلۆڤا هات. تەنوورە و فانیلەیەکی سپیی لە بەردا و لەچکەیەکی بە سەریدا دابوو. نۆخلیدۆڤ ساردوسڕ و بە تووڕەیی چاوی لێکرد. ماسلۆڤا سوور هەڵگەڕا و سەری داخست؛ لە یەکەم ڕوانینیدا بۆی دەرکەوت دەرگاوانی نەخۆشخانە کاری خۆی کردووە! نۆخلیدۆڤ هەوڵی دەدا وەک جاران وابێ، بەڵام نەیتوانی. ڕقی لێی هەستا بوو.

هەواڵێکی ناخۆشم پێیە بۆتان، ئەنجومەنی سەنا بڕیاری لە سەر هەڵوەشانەوەی حوکمەکە نەدا.

ـ لە سەرەتاوە دەمزانی.

نۆخلیدۆڤ بە پێچەوانەی جاران، هیچی لێ نەپرسی. ژنە چاوی پڕبووبوو لە فرمێسک. نۆخلیدۆڤ گوتی:

ـ بێ هیوا مەبە؛ داخوازنیامەی بەخشین لەوانەیە بە جێیەک بگا.

ماسلۆڤا بە چاوی فرمێسکاوییەوە لێی دەڕوانی. چاوی خێلتری دەنواند. بە دەنگێکی گریاناوییەوە گوتی:

ـ مەسەلەکە شتێکی ترە.

ـ چییە؟

ـ حەتمەن چووی بۆ نەخۆشخانە و شتێکیان پێگوتووی.

ـ هەر شتێک ڕووی دابێ پێوەندیی بە خۆتەوە هەیە.

نۆخلیدۆڤ هەستی دەکرد، غیرەت و ئابڕووی سووکایەتیی پێکراوە؛ لە دڵی خۆیدا گوتی: «من پیاوێکی ناوبەدەرەوەم، کچانی خانەدان و نەجیبزادەی وڵات قوڕاو خۆرن بچمە خوازبێنییان، بەڵام هاتم خۆم سووک کرد و پێم بە ئابڕووی خۆمدا ناو داوام لەو ژنە کرد شووم پێ بکا. چەندەم زەحمەت بۆ کێشا و دەرگای مەرد و نامەردم کوتا؛ بەڵام ئەم ژنە سووک و هەرزەیە نەیتوانی بەر بە هەوەسی خۆی بگرێ. هێشتا هیچ نەبووە لەگەڵ کۆلکە پزیشکێک دەستی تێکەڵ کرد.

ـ جارێ ئەو کاغەزە واژۆ بکە.

ماسلۆڤا بە چمکی لەچکەکەی فرمێسکی چاوی سڕی و لە پشت مێزەکە دانیشت و لێی پرسی کوێ واژۆ بکات؟ نۆخلیدۆڤ داوێنی کاغەزەکەی پیشان دا و هەر لەو کاتەدا چاوی لێکرد کە لە پەستا هەناسەی هەڵدەکێشا و هەنیسکی دەدا. دوو شت لە ناخی نۆخلیدۆڤدا تێک هاڵابوون و زۆرەبانییان دەگرت؛ دڵسۆزی و بێزاری. لەو کێشە و تێکهەڵچوونەدا، دڵسۆزی سەرکەوت. مەگین ئەو خۆی وەک ئاوی شەوێ پاکە و ڕمموودەی تاوان نییە؟ بۆ دەبێ ئەو ژنە سەرکۆنە بکات کە دیسان تووشی تاوان بووە؟

ماسلۆڤا کاغەزەکەی واژۆ کرد و قامکە جەوهەراوییەکەی بە چمکی تەنوورەکەی سڕی. نۆخلیدۆڤ چاوی لە چاوی بڕی و گوتی:

ـ خەمت نەبێ؛ بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە و بڕیاری خۆم ناگۆڕم. ئەوەی لە دەستم بێ دەیکەم و هەتا ئەو سەری دنیاش بێ لەگەڵتا دێم.

ـ ئەو کارانە کەڵکی نییە.

زوبر بوونەکەی شوێنی لە سەر نۆخلیدۆڤ دانابوو.

ـ خۆت بۆ سەفەر ئامادە بکە. پێم بڵێ چیت پێویستە.

ـ هیچ شتێکم ناوێ؛ سپاس.

سەرۆک هاتە پێشێ. بەر لەوەی شتێک بڵێ، نۆخلیدۆڤ سەری لەقاند و لەوێ چووە دەرێ. هەستی بە دڵخۆشی دەکرد. هێمنایییەتییەک ڕۆحی داگرتبوو. هەستی دەکرد مرۆڤەکانی خۆشدەوێ. ویژدانی بە ئاگا هاتبوو. ئیتر بۆ ئەو جیاواز نەبوو ماسلۆڤا چ دەکا. لە لووتکە نزیک بووبۆوە و مەودایەکی ئەوتۆی نەمابوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «گریمان کەینوبەینی لەگەڵ ئەموئەویش هەبێ، ئەرکی من ئەوەیە ئەوم لەبەر ڕەزای خودا خۆش بووێ!»

بەڵام ماسلۆڤا لەو مەسەلەیەدا بێ تاوان بوو. مەسەلەکە لەوەوە دەستی پێکرد بوو؛ ماسلۆڤا چووبوو بۆ دەرمانخانە دەرمانێک بێنێ. دەرمانخانەکە لەو سەری داڵانەکە بوو، پزیشکی نەخۆشخانەش لەوێ بۆ دەوایەک دەگەڕا. پزیشکەکە پیاوێکی بەلەباریکە و دەموچاو زیپکاوی بوو. ماوەیەک بوو بە دەوری ماسلۆڤادا دەهات و دەستی لە کۆڵ نەدەکردەوە. ئەو ڕۆژە کە ئەوی بە تەنیا لە دەرمانخانەکە دی، بە زۆری باوەشی پێداکرد، ماسلۆڤا بە هەموو هێزی خۆی پاڵی پێوە ناو خۆی لە چنگی ڕاپسکاند، پیاوەش خۆی بۆ نەگیرایەوە و درا بە قەفەسەیەکی پڕ لە دەرماندا، دوو شووشە کەوتە خوارێ و شکان. سەرپەرەستی نەخۆشخانەکە لەو دەوروبەرە بوو، تەقەی شکانی شووشەکانی بیست و چاوی بە ماسلۆڤا کەوت سوور هەڵگەڕاوە و بە هەڵەداوان لە دەرمانخانەکە هاتە دەرێ. گوڕاندی بەسەریدا:

ــ ئەگەر دیسان دەتەوێ دەردەسەری سازکەی و بیری کارەکانی ڕابردووت کردووە، دەتنێرمەوە بۆ بەندیخانە!

سەرپەرست لە سەرووی چاویلکەکەیەوە لە ماسلۆڤای ڕوانی و چونکە ماسلۆڤا هیچی نەگوت، پزیشکی دەموچاو زیپکاویی بانگ کرد و مەسەلەکەی لێپرسی، ئەویش درۆیەکی سازکرد و تاوانەکەی خستە ئەستۆی ماسلۆڤا؛ هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی دیسان بینێرنەوە بۆ بەندیخانە.

ناردنەوەی بۆ بەندیخانە، ئەو ڕووداوە زەبرێکی کاریگەری لە ڕۆحی دابوو. لەو ڕۆژانەوە کە نۆخلیدۆڤ دەهات بۆ ملاقاتی وەها گۆڕابوو، کە ئیتر بێزی لە پێوەندی جنسی هەڵدەستا؛ بەڵام پیاوان لە کۆڵی نەدەبوونەوە. هەموویان بە چاوی لەشفرۆشێک لێیان دەڕوانی. ئەو پزیشکەش هەر بەو چاوە لێی دەڕوانی و کاتێک دیتی خۆی بۆ شل ناکا، تووشی واق وڕمان بوو. ماسلۆڤا دەیویست هەموو شتێک بە نۆخلیدۆڤ بڵێ. بەڵام کاتێک چاوی پێی کەوت و گوێی لە قسەکانی بوو، زانیی باوەڕ بە قسەکانی ناکات. بۆیە ناچار بوو زمانی نەگەڕێ و جگە لە فرمێسک هەڵوەراندن هیچ قسەیەکی تری نەبوو.

ماسلۆڤا تێگەیشتبوو نۆخلیدۆڤ لێی توورەیە و بێزار بووە و ئەو بێزارییەی ئەو ژانی بە دڵی گەیاندبوو. ڕاستە لە ملاقاتەکانی پێشوودا هێندێ جار بە توندی قسەی لەگەڵ کردبوو، بەڵام خۆشەویستیی ئەو لە دڵیدا ڕیشەی داکوتابوو و هەموو کارێکی بە قسەی ئەو دەکرد. لە سەر داوای ئەو ئیتر دەمی لە مەشرووب نەدەدا، جگەرەی نەدەکێشا و جلوبەرگی ڕێکوپێکی لە بەر دەکرد. لە بەر دڵی ئەو چوو بۆ نەخۆشخانە و لەوێ بە دڵ کاری دەکرد. بۆیەش پێشنیاری زەماوەندی لەگەڵ کۆنت نۆخلیدۆڤ قەبووڵ نەدەکرد، پێی وابوو دەبێتە هۆی چارەڕەشی پیاوێکی خانەدان کە خووی بە ناز و نیعمەت و خۆشگوزەرانی گرتووە. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، ئێستا کە دەیدی نۆخلیدۆڤ باوەڕی بەو قسانە کردووە و وەک ژنێکی سووک و

هەرزە چاوی لێدەکات، دڵی ڕێک دەگوشراو وەها ژان بە جەرگی گەیشتبوو، تەنانەت هەواڵی ڕەدکرانەوەی سکاڵانامەکەی لە ئەنجومەنی سەنا و دوورخرانەوەی بۆ سیبیریا بەو ڕادەیە بە لایەوە گرنیگ نەبوو!

## سی

پێشبینی دەکرا لەگەڵ یەکەم کاروان، ماسلۆڤا بنێرن بۆ سیبیریا و نۆخلیدۆڤ چەند کاری بە دەستەوە بوو کە دەبوو هەتا ئەو کاتە هەمووی جێبەجێ بکات. کارەکانیشی هێندە زۆر و جۆراوجۆر بوون دواییان نەدەهات.

بارودۆخی ژیان و کاروبارەکانی بە تەواوی گۆڕانی بە سەردا هاتبوو. لە ڕابردوودا هەر کارێکی دەکرد تەنیا لە بەر کەسایەتیی بەرزی دیمیتری ئیڤانۆڤیچ نۆخلیدۆڤ بوو و هەر بەو هۆیەش زوو لە کارەکانی ماندوو دەبوو. بەڵام ئێستا بارودۆخەکە گۆڕا بوو؛ هەر کارێکی دەکرد لە بەر خەڵکی بوو، نەک لە بەر دیمیتری ئیڤانۆڤیچ نۆخلیدۆڤ، هەر بۆیە لەو کارانە ماندوو نەدەبوو.

تا ئەو کاتەی کاری بۆ خۆی دەکرد، لە کار بێزاربوو، بەڵام ئێستا کە بەشوێن کاری خەڵکدا هەڵدەهات و هەوڵی دەدا، سەرەڕای زۆر بوونی کاری جۆراوجۆر، چونکە کارەکەی پێخۆش بوو، هەتا زیاتر هەڵدەسووڕا و خۆی ماندوو دەکرد لێی سەر و دڵ خۆشتر بوو.

کاتەکانی خۆی کردبوو بە سێ بەشەوە و سێ پەروەندەی جیاجیای دروست کرد بوو، بۆ ئەوەی کارەکانی تێکەڵ پێکەڵ نەبن؛ پەروەندەی یەکەم

تـــايبەت بە ماســـلۆڤا بـــوو، كە لە ئێســـتادا داخوازينـــامەی بەخشـــين و دورخرانەوەی بۆ سيبيريا سەرە كيترين گرفتاريی ئەو بوو.

ئەوەی پێوەنديی بە ملْك و سامانەوە بوو لە پەروەندەی دووهەمدا بوو. لە گوندی پانۆڤ و گوندكانی دەوروبەری، ملْك و زەويوزارەكانی بە سەر ڕەعيەتەكاندا دابەش كردبوو و بڕيار وابوو گوندنشينەكان ماڵياتی گشتی لە سندووقلْك بكەن و نياز و پێداويستييەكانی ناوچەی پێ دابين بكەن. ئەو كارەش هێشتا پێويستی بە هەڵسووڕان و هێندێک گرێبەست و بەڵگە و تاپۆ هەبوو. لە گوندی كۆزمينسكۆيە و گوندەكانی دەوروبەری كاروبارەكە جۆرێكی تر بوو. لەوێ بڕيار وابوو جووتياران بەشە داهاتی ماليک بدەن و ماليک لەو بەشەی خۆی بڕێكی بداتەوە بە جووتياران و باقييەكەی دانێ بۆ خەرج و پێداويستييەكانی خۆی. نۆخليدۆڤ حيسابی دەكرد و دەيزانی سەفەری سيبيريا خەرجێكی زۆری دەوێ و ناتوانێ لەو داهاتە چاوپۆشی بكات و هەمووی بدات بە ڕەعيەتەكان.

سێهەمين پەروەندە تايبەتی زيندانييەكان بوو؛ هەموو ڕۆژێک تاقمێكی تر زيندانی نامەيان بۆ دەنارد و تكايان لێدەكرد بە هانايانەوە بچێ، بۆيە ئەو پەروەندەيەش ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ قەبەتر و گەورەتر دەبۆوە.

ڕۆژانـــی ســـەرەتا كە وەدووی ئەو كـــارانە دەكەوت، لەگەڵ گەيشـــتنی سكاڵانامەی بەندييەک، دەكەوتە دوای كارەكەی و قسەی لەگەڵ بەر پرسان دەكرد، بەڵام وردە وردە ئەو سكاڵانامانە هێندە زۆر بوون، دەرفەتی نەبوو بە كاروباری هەموويان ڕابگا، هەر بۆيە ناچار بوو پەروەندەی چوارەم بكاتەوە.

لە پەروەندەی چوارەمدا ئاكامی هەوڵ و لێكۆڵينەوەكانی خۆی تۆمار دەكـــرد. ئەو مـــاوەيەک پێشـــتر لە بيـــری ئەوەدا بـــوو دادگـــای تـــاوان و

حوکمـدراوەکانی باشـتر بناسـێ و بچێـتە بـنج و بنـاوانییەوە، تـاکوو بـۆی دەرکەوێ ئەو دەزگا گەورەیەی داد بۆچی دروست کراوە، مشتەرییەکانی ئەو کێن و ئەم هەموو گرتووخانەیە لە قەڵای پتر و پۆلەوە بگرە هەتا ساخالین[٦٣] کە هەر کام دەرگا و دیواری پۆلا و کۆنکرێتیان بۆ کراوە و هەزاران بەندی و قوربانی لەم بەند و سیاچاڵانەی ئەو دەزگا گەورە و گرانەدا دەڕزێن، کێن و ئەوانە چ جـۆرە بـوونەوەرێکن و بـۆچی لەو بەنـد و سـیاچاڵانەدا دیلیـان کردوون؟

لەو بــوارەدا زۆری زانیــاری کــۆ کــردەوە. ناســینی بەنــدییەکان و پارێزەرەکانیان، بەرپرسی زیندان و قەشـە و پیاوە ئاینییەکان کە هـاتوچۆی بەندیخانەیان دەکرد و زۆر شتی دیکەی بۆ ڕوون بۆوە. ئەو بەندییەکانی بە پێنج دەستە دابەش دەکرد.

دەستەی یەکەم بێ تاوانەکانن. کە قوربانیی هەڵە و کەمتەرخەمیی دەزگای داد و لێپرسـینەوە بـوون؛ وەک مەنشـۆڤ و ماسـلۆڤا و کەسـانی دیـکە. قەشـەکان لە سـەر ئەو بـاوەڕە بـوون کە ئەوانە تـاقمێکی کەمـن و حەوت لە سـەدی بەنـدییەکان پێـک دێـنن؛ بـۆیە پێویسـتە ئەو تـاقمەکە بەبـێ تـاوان کەوتوونە بەندیخانە زیاتریان ئاوڕ لێ بدرێتەوە.

دەسـتەی دووەم کەسـانێکن کە لە بـارودۆخێکی جیـاوازدان، بە هـۆی تـووڕەیی و ئێرەیـی و مەسـتییەوە تووشـی تـاوان بـوون؛ لەو حاڵەشـدا هەر کەس بە جێی ئەوان بووایە ڕەنگ بوو ئەو کارە بکات. خاوەنڕایـان دەیانگوت نیوەی بەندییەکان لەو جۆرە کەسانەن.

تـاقمی سـێیەم تاوانەکەیـان شـتێک بـوو کە خۆیـان بە تاوانیـان نەدەزانـی، بەڵکوو بە کـارێکی ئاسـایی و تەنـانەت بە کـارێکی شیاویشـیان دەزانـی. بەڵام

63 ـ لە زەریای ئەختسەک و ڕۆژهەڵاتی دوور هەڵکەوتبوو.

یاسادانەران لەگەڵ ئەوان هاوڕا نەبوون و ئەو کارانەیان بە تاوان دەزانی؛ قاچاخچێتی، بڕینی داری لێڕەوار و زیانی کردنی لەوەڕگەی تایبەتی ئاغا بەشتێک لەو تاوانانە بوون. چەتە و دزەکانی کەلوپەلی کلیساش لەو دەستەیە بوون.

تاقمی چوارەم لەو زیندانییانەن کە لە خەڵکی ئاسایی تێگەیشتووتر و ڕۆشنبیرترن، خودموختاری خوازانی پۆڵۆنیا و چەرکس[٦٤]، زیندانییە سیاسییەکان و سۆسیالیستەکان، نیهیلیستەکان و کرێکارانی مان گرتوو کە لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەت تێکهەڵدەچن، لەو دەستەیەن؛ دەکرێ بڵێین ئەو دەستەیە هیوا و هومێدی کۆمەڵگان و لە سەر بیروباوەڕیان کەوتوونەتە بەندیخانە.

تاقمی پێنجەم کەسانێکن چارەڕەش و داماو کە بە هۆی بێ عەداڵەتیی کۆمەڵگاوە تووشی ئەو بارودۆخە تاڵە بوون و زیان بە خۆیان و کۆمەڵگا دەگەیەنن. ئەو تاقمە لە کۆمەڵگا تەرە کراون، لە ژێر گوشار و ئازاری ژیاندا مێشکیان خراپ دەبێ و فریوی وەسوەسەی نەفس دەخۆن، تاوان و کاری خراپ ئەنجام دەدەن و دەکەونە داوەوە؛ وەک ئەو گەنجە چارەڕەشەی بەرەکۆنەکەی دزیبوو، وەک سەدان کەسی تر کە لە بەندیخانەدان، یان هێشتا ئازادن و قۆڵبەست نەکراون. بارودۆخی کۆمەڵگاش هەر چۆنێک بێ ئەوانە بەرەو تاوان و جینایەت پەلکێش دەکا.

نۆخلیدۆڤ لەگەڵ تاقمێک دز و پیاو کوژ ئاشنا بووبوو، کە لە دابەشکردنەکەدا کەوتبوونە دەستەی پێنجەمەوە، سەبارەت بەوان هێندێ لێکۆڵینەوەی ئەنجام دابوو. ئەوانش هانایان بۆ هێنابوو و داوایان لێدەکرد کارێکیان بۆ بکات. نۆخلیدۆڤ هەلی بۆ ڕەخسا بوو باشتریان بناسێ و دوای

64 ـ خەڵکی ناوچەی باکووری قەفقاز.

ئەوە بە چاوێکی تر لەو تاقمەی دەڕوانی. زۆربەی خراپکاران کە لە مەکتەبە نوێیەکانی زانستدا،وەک تاوانباری زگماک دەهاتنە ئەژمار، لەو دەستەیەن و تەنانەت کارەکە بەجێیەک گەیشتووە، تاقمێک لە بیرمەندان لە سەر ئەو باوەڕەن کە ئەو هەموو حوکم و یاساوڕێسا و سزادانە سەیروسەمەرانە، تەنیا بۆ چاوترسێن کردن و تەمبێ کردنی ئەو دەستەیە داندراوە؛ بەڵام نۆخلیدۆڤ بەو ئاکامە گەیشتبوو، ئەو چارەڕەشانە بەرلە کۆمەڵگا زیان بە خۆیان دەگەیەنن؛ دیارە ئەو هەژاری و بێ بەشییەش میراتێکە لە باوک و دایک و ئەژدادیانەوە بۆیان ماوەتەوە و بە هۆی بارودۆخی خراپ و نالەباری کۆمەڵگاوە ڕوو لە هەڵە و تاوان دەکەن.

نۆخلیدۆڤ لەگەڵ چەند کەس لەو تاقمە ئاشنا بووبوو کە چەندین جار دزییان کردبوو. یەکێک لەو کەسانە ناوی ئۆخۆتین بوو. دایکی، ژنێکی لەشفرۆش بوو. خۆشی بەرهەمی ئەشقێکی حەرام بوو. لە خانەی لێقەوماوان و سواڵکەرزادەکاندا گەورە بووبوو. لە ژیانیدا کەسێکی نەدیبوو لە پاسەوانێک ئاقڵ و تێگەیشتووتر بێ. هەر لە سەرەتای منداڵییەوە لەگەڵ کەسانی دز و خوێڕی و بەرەڵڵا هەڵسوکەوتی کردبوو. مرۆڤێکی حەنەکچی و قەشمەر بوو. بە گاڵتە و گەپ و قسەی خۆش هەمووانی لە دەوری خۆی کۆدەکردەوە. تەنانەت ئەو ڕۆژەش کە دەردەدڵی خۆی بۆ نۆخلیدۆڤ هەڵدەڕشت، گاڵتە و تیتاڵی بە قازییەکان و کاربەدەستانی بەندیخانە و یاسای خودایی دەکرد. دزێکی تر کە نۆخلیدۆڤ بارودۆخی ژیانی بۆ دەرکەوتبوو ناوی فیدرۆڤ بوو. لاوێکی جوانچاک و خوێن شیرین بوو. تاوانیشی ئەوە بوو لەگەڵ هاوڕێیانی پیرەپیاوێکیان کوشتووە و ماڵەکەیان تاڵان کردووە. باب و باپیری جووتیار بوون. ئاغا بە زۆر باوکی ئەوی لە ماڵەکەی دەرکردبوو و مووچە و مەزراکەی لێ سەندبۆوە. فێدرۆڤ لە کاتی

سەربازیدا ئاشقی گراوی فەرماندرەکەی خۆی بوو بوو، لە سەر ئەو کارەش گەلێ سەرکۆنە کرابوو و کەوتبووە بەر لێشاوی توانج و تەشەر. پیاوێکی ڕۆحسووک و گورجوگۆڵ بوو. ئەوەی زۆری بەلاوە گرنیگ بوو خۆشگوزەرانی و ڕابواردن لەگەڵ ژنان بوو، پێشی وابوو مرۆڤ تەنیا بۆ هەوەسبازی خولقاوە و پێی ناوەتە سەر گۆی زەوی. لە تەواوی ماوەی تەمەنیدا کەسێکی خیرخواز و تێگەیشتووی نەدیبوو کە بەرە و ڕێگایەکی ڕاست ڕێنوێنیی بکات. بە بڕوای نۆخلیدۆڤ، ئەم دوو کەسە و سەدانی تر وەک ئەو، ڕوەکی خۆڕسک بوون و هیچ کەس پەروەردەیان ناکات. ئەو کەسانە لە خوڕا و بەبێ هۆ گەشە دەکەن و زۆر زووش وشک دەبن و لە نێو دەچن. لە نێو بەندییەکاندا لاوێکی بەرڵلا و ژنێکی سووکوچرووک وەبەر چاو دەکەوتن،کە لە هیچ کارێک نەدەپرینگانەوە و خووخدە و ئاکاریان زیاتر وەک حەیوانێکی دڕندە دەچوو. ئەو دوو کەسە زۆر بەدڕەوشت و ناڕەسەن بوون و ئاکار و هەڵسوکەوتیان بۆ هیچ کەس تامڵ نەدەکرا. بەڵام لە چوارچێوەی تاوانباری زگماکدا، کە بیرمەندانی مەکتەبەکانی ئیتالیا باسی دەکەن، نەدەگونجا و بە بڕوای نۆخلیدۆڤ ئەو دوو بوونەوەرە قێزەونە، زۆر لە کەسانی تەڕپۆش و بەڕێزی کۆمەڵگا ماقووڵتر و بێ زیانتر بوون.

کۆنت نۆخلیدۆڤ لەوە سەری سووڕمابوو کە بۆ دەبێ کەسانێکی ئاوا چارەڕەش و داماو بخرێنە بەندیخانەوە؛ بەڵام لە هەمان حاڵدا کەسانێکی خوێڕی و دڵڕەش بە ئازادی بسووڕێنەوە و تەنانەت کورسی و پلەوپایەی گرنگیشیان پێدەدرێ؟ بۆ ئەو پرسیارەش هیچ وەڵامێکی نەدەدۆزییەوە. بەو هیوایەی وەڵامێک بدۆزێتەوە؛ بەرهەمی بیرمەندانی وەک تارد، لۆمبرۆزۆ، گارۆڤالوو، لەیست و مەدسلی[٦٥] بەوردی متالا کرد، بەڵام دوای ئەو متالا و

---

65 ـ سەبارەت بە لۆمبرۆزۆ و تارد لە ژێرنووسەکانی پێشوودا باسمان کردووە.

لێکۆڵینەوەیە زیاتر هیوا بڕاو بوو؛ چونکە هیچ وەڵامێکی نەدۆزییەوە. ڕەنگە هەڵەی ئەو لەوەدابێ کە کتێبە زانستییەکانی لەگەڵ بەرهەمی ئەدەبی و باسی فێرکاری لێ تێکچووبوو و چاوەڕوانییەکی بێ جێی لەو کتێبانە هەبوو. پرسیارێک کە لەو بیرمەندانەی دەکرد، زۆر سادە وئاسایی بوو؛ وەڵامەکەشی کە پێی دەدرایەوە پڕبوو لە وردەکاریی زانستی و فەننی ماف و سزا. پرسیارەکە وەک ئاو خواردنەوە وابوو،ڕوون و ئاسان؛ دەیپرسی،بۆچی و لە سەرچی دەستەیەک دەگرن و دەیانخەنە بەندیخانە، ئازار و ئەشکەنجەیان دەدەن و تەنانەت لە داریشیان دەدەن، لە حاڵێکدا سازدەران و بەڕێوەبەرانی ئەو هەموو زیندانە و هۆکارانی ئەو هەموو ئازار وئەشکەنجە و مەینەتە، زۆر لە دیل و یەخسیرەکان گەندەڵتر و گومڕاترن؟ بەڵام بیرمەندان لە کتێبەکانیاندا زۆر شتی سەیریان دەنووسی. مەسەلەی جەبر و ئیختیاریان دەهێنایە گۆڕێ؛ دەیانگوت شکڵی کاسەسەری هەر کەسێک لە سەر بڕیاردان و خووخدەی کاریگەریی هەیە. دەیانگوت ڕەگەز تاڕادەیەکی زۆر کاریگەریی لە سەر هەڵە و تاوان هەیە. دەیانگوت ئاو و هەواو جۆری خۆراکیش کاریگەریی هەیە. باسی ڕەوشت و یاسا و پێچەڵاوپووچیی زاتی مرۆڤیان دەکرد. دەیانگوت تا ڕادەیەکی زۆر لاسایی یەکتر دەکەنەوە. دەیانگوت هێندێک لە کێشەکان بە هیپنۆتیزم چارەسەر دەکرێن. سەبارەت بە کۆمەڵگا و ئەرکی کۆمەڵایەتی کەسەکان باسی زۆر قووڵ و پڕ گرێوگوڵیان دەهێنایە گۆڕێ.

---

ڕافائیل گارۆفال R. Garo falo (1851 ـ 1934) تەن ناس بوو لەگەڵ لۆمبرۆزۆ و فێرڕی Ferri مەکتەبێکی نوێیان لە بواری تەن ناسیدا دامەزراند. هانری مەدسلی (1835ـ 1908) پزیشکی دەروونناسی ئینگلیزی، ئەویش وەک لۆمبرۆزۆ لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە دەبێ بە چاوی نەخۆش لە خراپکار و تاوانبار بڕوانی و بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی هەوڵ بدەی.

وەڵامی پڕ پێچوپڵووچی بیرمەندان بۆ ئەو پرسیارە ساکارە، چیرۆکێکی خۆشی وەبیر هێنایەوە: منداڵێکیان برد بۆ قوتابخانە و بڕگەبەندییان فێرکرد. ڕۆژێک مامۆستاکەی بۆ تاقیکردنەوە لێی پرسی بڕگەبەندی فێر بووە؟ منداڵە زیت و وریاکە گوتی، بەڵێ چاک فێر بووم. مامۆستاکە گوتی ئەگەر دەزانی هەستە «پێ» بڕگەبەندی بکە. منداڵە شەتیانەکە گوتی: مامۆستا! کام «پێ»؟ پێی مرۆڤ یان پێی سەگ؟ وەڵامی بیرمەندانیش بۆ ئەو پرسیارە ساکارەی ئەو، وەک قسەی ئەو منداڵە وریایە دەچوو.

بیرمەندان هەموو بیر و هۆش و زانستی خۆیان خستبووە کار و بابەتگەلێکی سەرنجڕاکێش بەیان کردبوو؛ بەڵام پرسیاری سەرەکی هەروا بێ وەڵام مابۆوە. بۆچی مرۆڤێک هەق بە خۆی دەدا کە مرۆڤێکی تر سزا بدات؟ بیرمەندان کە پشت بە زانست و لێکۆڵینەوەکانی خۆیان دەبەستن، بەجێی وەڵام، بەرهەق بوونی سزایان دەسەلماند و پێویست بوونی سزادانیان بە ڕاستییەکی ڕوون و حاشاهەڵنەگر دەزانی. نۆخلیدۆڤ ئەو کتێبانەی، نەک بەڕێکوپێکی، بەڵکوو هەر جۆرێک دەکەوتە دەستی، دەیخوێندەوە و هەر کتێبێکی تەواو دەکرد پێی وابوو وەڵامی خۆی لە کتێبی دواتردا دەدۆزێتەوە، هێندێ جار پێی وابوو بە باشی و ڕێکوپێکی ئەو کتێبانەی نەخوێندۆتەوە، وەڵامەکەی نەدۆزیوەتەوە و دیسان چاوەڕوان بوو ڕۆژێک کتێبێکی وەگیر بکەوێ و وەڵامی خۆی تێدا بدۆزێتەوە.

# سی و یەک

هەواڵیان هێنا کە ماسلۆڤا لەگەڵ کاروانی دوورخراوەکان ڕۆژێ پێنجەمی ژوییە بەرەو سیبیریا وەڕێ دەکەوێ. نۆخلیدۆڤیش خۆی ئامادە کردبوو لەگەڵیدا بچێ. ڕۆژێک پێش ئەو هەواڵە، ناتالیای خوشکی نۆخلیدۆڤ و مێردەکەی گەیشتنە مۆسکۆ و لە هوتێلێک نیشتەجێ بوون. ناتالیا ئیڤانۆڤنا ڕۆگۆژنیسکایا دەساڵ لە براکەی گەورەتر بوو و ڕۆڵێکی بەر چاوی لە پەروەردەکردنیدا هەبوو. ئەوان زۆریان یەکتر خۆشدەویست. کاتێک ناتالیا تەمەنی گەیشتە بیست و پێج ساڵان، لەگەڵ نیکۆلیکا ئیرتنیڤ ژیانی هاوبەشی پێک هێنا؛ نیکۆلنکا لاوێکی باش و تێگەیشتوو بوو. کوڕێکی ژیر و خاوەن ژیار بوو. نۆخلیدۆڤ پڕ بە دڵ خۆشی دەویست و کاتێک گەورەش بوو، بوون بە هاوڕێ و مەحرەمی نهێنییەکانی یەکتر. بەداخەوە نیکۆلنکا ئەجەل مەودای نەدا و زۆر زوو مرد.

زۆری نەخایاند نۆخلیدۆڤ چوو بۆ سەربازی و لە خوشکی دوور کەوتەوە. ناتالیا چەند ساڵ دوای مردنی مێردەکەی یەکەمی، لە ڕووی هەوەسەوە ئاشقی پیاوێک بوو کە لەگەڵ مێردەکەی پێشووی بارتەقای عەرز و ئاسمان جیاوازیی هەبوو. مێردی دووهەمی ناوی ڕۆکۆژنیسکی بوو، ڕێزەیەک شەرەف و پاکی لە وجوودیدا نەبوو. پیاوێکی هەلخواز بوو. لە

هەمــوو ڕووداو و پێشــهاتێکدا قــازانجی خــۆی لە بەر چــاو بــوو و لە ڕێــوە هەلەکەی دەقۆستەوە.

ڕۆگۆژنیسـکی لە بنەمـاڵەیەکی مامناوەنیـدا لە دایـک بووبـوو. مـاڵی دنیـای نەبـوو. بەڵام لە فێڵ و زیرەکیـدا هـیچ کەس دەسـکی لە دوو نەدەکـرد. هێنـدێ جـار دەبـووە لیبـرال و هێنـدێ جـاریش ترسـەنۆک و خۆپـارێز. نـانی بە نرخـی ڕۆژ دەخـوارد و لە هەر لایەکەوە بـای بهاتـایە شـەنی دەکـرد، هەر بەو فێڵ و دەهۆیانەش توانیبووی لە دەزگای دادا پلەیەکی گرنیگ بە دەسـت بێنـێ. جگە لەو تایبەتمەندییانەی، مرخ و لێهاتووییەکی تریشی هەبوو؛ دەیزانی چۆن ژنان لە خشتەبەرێ و دڵیان لێ بستێنێ. بە کەڵـک وەرگـرتن لەو مـرخە خـودادادییە تــوانیی ناتالیــاش هەڵفریــونێ. کــارەکەش بە جێــیەک گەیشــت کە ســەرەڕای نــاڕەزایەتیی دایکــی، هەر دوو پێــی لە کەوشــێک کــرد و گــوتی شــووی هەر پێدەکەم.

نۆخلیــدۆڤ زۆری ڕق لە مێــردەکەی خوشــکی بــوو. دەیزانــی چەنــدە خوڵقوخــوویەکی نــاحەز و دواکەوتــووانەی هەیە. زۆر داوێــن پــیس و لە خۆڕازی بـوو. سـەرەڕای ئەوانەش ناچـار بـوو لە بەر دڵـی خوشـکی هەسـتی خۆی بشارێتەوە و قسەی لەگەڵ بکـات. لە لایەکەوە زۆریشـی پـێ سـەیر بـوو کە خوشکی بەو هەمـوو جوانی و شۆخوشـەنگییەوە شـووی بە پیـاوێکی ئـاوا کۆلکن و کـانێس ئەسـتوور کـرد و بـوو بە ژنـی گولەپیـاوێکی ئـاوا خـوێڕی و هیچوپووچ. تەنانەت کاتێک ئاگادار بـوو خوشـکی منداڵی بـووە، ئەوەنـدەی تـر دڵـی ڕێـک گوشـرا و نـاڕەحەت بـوو، چـونکە دەیهێنـایە بەر چـاوی خـۆی کە خوشکی بە هۆی نزیکی کـردن لەگەڵ ئەو بۆرە پیـاوە بۆرەکە و کـرێتە زگـی پڕ بووە.

لەو سەفەرەدا ناتالیا و ڕۆگۆژنیسکی کچ و کوڕەکەیان لەگەڵ خۆیان نەهێنا بوو. لە هوتێلێکی زۆر باش جێیان گرتبوو و ناتالیا بەبێ ڕاوەستان چوو بوو بۆ ماڵی براکەی. ئاگراڤنا پێی گوتبوو براکەی لەوێ ڕۆیشتووە و لە نزیک بەندیخانە دوو ژووری چکۆڵەی بەکرێ گرتووە. ناونیشانی ماڵەکەی لێوەرگرت و ڕۆیشت بۆ لای. کوڕێژگەیەکی شڕۆڵە ناتالیای برد بۆ ماڵەکەی نۆخلیدۆڤ. لەو کاتەدا لە ماڵێ نەبوو. دالانی ماڵەکە بۆگەن و نیوە تاریک بوو. ناتالیا چاوی لە هەر دوو ژوورەکە کرد و زۆر ڕێکوپێکی هاتە بەر چاو. دەیزانی براکەی چەندە گرنگی بە پاکوخاوێنی و ڕێکوپێکی دەدا، بەڵام ساکاری و چکۆڵەیی ماڵەکەی دڵتەنگی کرد. هەموو شتێک بۆ ئەو تازەی دەنواند. بە وردی چاوی لە مێزی کاری براکەی کرد؛ پەیکەرەی مەفرەقی سەگێک، جانتای پەروەندەکان و چەند کتێب لە سەر مێزەکە دانرابوون. کتێبی کۆمەڵە یاسای سزا، بەرهەمی هێنری جیمز بە زمانی ئینگلیزی و بەرهەمی تارد بە زمانی فەڕەنسی. لە بەینی ئەو کتێبەشدا کاغەزبڕێکی عاجی دی.

نامەیەکی بۆ براکەی نووسی و لە سەر مێزەکە داینا و داوای لێکرد هەر ئەو ڕۆژە بچێت بۆ لای، پاشان بە دڵتەنگی بەرە و هوتێلەکە گەڕایەوە.

بیری لە دوو شت دەکردەوە و دەیویست لە بارەیانەوە قسە لەگەڵ براکەی بکات؛ یەکیان مەسەلەی زەماوەند کردن لەگەڵ کاتیۆشا کە بووبووە بنێشتە خۆشکەی سەر زاری خەڵک و لەو شارە چکۆڵەدا دەنگی دابۆوە؛ مەسەلەی دووهەمیش دابەشکردنی مڵکەکانی کە بە بڕوای هێندێ کەس کارێکی سیاسی و مەترسیدار بوو. پێشتر هێندی شتی سەبارەت بە کاتیۆشا و کەینوبەینی لەگەڵ براکەی بیستبوو، لە سەرەتاوە پێی ناخۆش نەبوو براکەی لەگەڵ کچێکی ئاوا ساکار و بێ فڕوفێڵ زەماوەند بکات، بەڵام ئێستا بیروڕای گۆڕا بوو، بە هیچ شێوەیەک حەزی نەدەکرد ژنێکی ناوزڕاو

ئابڕووی بنەماڵەکەیان بەرێ. دابەشکردنی زەویوزارەکەی بە بڕوای ئەو زۆر گرنیگ نەبوو، بەڵام مێردەکەی پێداگریی دەکرد و دەیگوت کەڵک لە دەسەڵاتی دەوڵەتیی خۆی وەردەگرێ و ناهێڵێ ئەو کارە بکات. ڕۆگۆژنیسکی لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەم بڕیارە بە هۆی کاڵفامی و غوروورەوەیە و نۆخلیدۆڤ ویستوویەتی بەو کارە سەیروسەمەرەیە سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشێ و دەمار فرۆشی بکات، بە ناتالیای دەگوت:

ـ زۆر بێ مانایە ئەو هەموو زەویوزارە بە داهاتەکەیەوە. بدەی بە گوندنشینەکان؟ ئەگەر ئەو مەبەستەشی بووە چاکە لەگەڵ خەڵک بکات، دەبوو لە ڕێگای بانکی کشتوکاڵەوە کارەکە جێبەجێ بکات و لە ڕێگەی یاساییەوە بڕواتە پێشێ.

ڕۆگۆژنیسکی دەیگوت نۆخلیدۆڤ تووشی جۆرێک شێتی بووە و دەبێ داوا لە دادگا بکەین قەویتێکی بۆ دەستنیشان بکات و بە سەر ماڵ و مڵکەکانیدا ڕابگا!

# سی و دوو

نۆخلیدۆڤ چاوی بە نامەکەی خوشکی کەوت و بەبێ ڕاوەستان ڕۆیشت بۆ لای. عەسر بوو، مێردەکەی خوشکی لە ژوورەکەی تەنیشت خەوتبوو و خوشکی بە تەنیا چاوەڕوانی ئەو بوو. ناتالیا کراسێکی حەریری ڕەشی لە بەردا قردێلەیەکی سووری لە سەر سنیگی دابوو. قژی بە مۆدەیەکی نوێ لە سەر سەری بەستبوو بۆ ئەوەی جحێڵتر بنوێنێ. کاتێک چاوی بە براکەی کەوت، شاد و لێو بەبزە هەستا و تەشکی کراسە حەریرەکەی کەوتە

خشـەخش و هـات باوەشـی بە براکەیدا کـرد. چاویـان لە یەکتـر بڕیبـوو و پێدەکنین. نیگایان پڕ لە ڕاز و باسوخواس بوو. چاویان کەلاوڕێژ بوو لە وتە و بە زمـان نەیانـدەتوانی بیـدرکێنن. لە دوای مەرگـی دایکـی ئیتـر یەکتریـان نەدیتبوو.

ـ خوشکێ چەند جوان و گەنج بوویەتەوە!

ناتالیا تاریفەکەی ئەوی بەدڵ بوو.

ـ بەڵام تۆ زۆر لاواز بووی!

ـ مێردەکەت لە کوێیە؟

ـ لەو ژوورەی تەنیشتە. ڕاکشاوە، دوێشەو نەخەوتووە.

زۆریـان قسـە بـوو بە یەکتـری بڵـێن و کەسـی سـێیەم لە نێوانیانـدا نەبێ؛ قسەی وا کە بە زمان ناگوترێ.

ـ براکەم! ئەمڕۆ چووم بۆماڵەکەت. چاوم بە ئاگراڤنا کەوت.

ـ کەوایە لە هەمـوو شـتێک ئاگـاداری. ئەوێ بـۆ مـن زۆرگەورە بـوو. لەو شـوێنە دڵـم دەگیـرا. مـن پێویسـتم بەو هەمـوو قەنەفە و کورسـی و کەلـوپەلە نەبوو. ئەگەر حەز دەکەی بیانبە بۆ خۆت.

ـ سپاس، بەڵام...

پێشخزمەتی هوتێل پەرداخی زێوینی چایی هێنا و لە سـەر مێزەکە داینـا و ڕۆیشت. ناتالیا قۆرییەکەی هەڵگرت چایی تێکا. نەیدەزانی چۆن دەست بکات بە قسە کردن و لە کوێوە دەست پێبکا.

ـ براکەم! هەموو شتێک دەزانم.

ـ ئاوا باشترە.

ـ یـانی پێـت وایە ئەو ژنە چـاک دەبـێ؛ پێـت وایە دوای زەماوەنـدەکەتان دەست لەو کارانە هەڵدەگرێ؟

نۆخلیدۆڤ ڕاست دانیشتبوو. گوێی بۆ قسەی خوشکی ڕاگرتبوو. هێشتا قسەکانی ماسلۆڤا لە گوێیدا دەزرنیگایەوە. حەزی کرد خۆی لە بیر بەرێتەوە و لە بیری خەڵکیدا بێ.

ـ خۆ من نامەوێ ئەو بێنمە سەر ڕێ، دەمەوێ خۆم وەک مرۆڤ بژیم.

ـ بۆ ئەو جۆرە شتانە جگە لە زەماوەند ڕێگای تریش هەیە.

ـ زەماوەند کردن لەگەڵ ماسلۆڤا زۆر کێشە و گرفت چارەسەر دەکا؛ وام لێدەکا زیاتر لە بیری خەڵکیدا بم و لە نێو ئەواندا بژیم.

ـ من گومان ناکەم بەو کارانە بەختەوەر بی.

ـ بەختەوەری ئەگەر هەیە، دەبێ بۆ هەمووان بێ.

ـ براکەم! ئەگەر ئەو ژنە دڵی بووبووایە. هەست و سۆزی بووبووایە، نەدەبوو پێشنیاری تۆ قەبووڵ بکات.

ـ ڕاست وایە، قەبووڵی نەکردووە.

ـ کەوایە مەبەستت چییە؟ بۆ دەتەوێ ژیانی خۆت لە ڕێی ئەودا بەخت بکەی؟ ئەوت بۆ چییە؟

نۆخلیدۆڤ چاوی لە ڕوخساری جوانی خوشکی بڕیبوو. دەوری چاو و لێوی بە ئاستەم چرچولۆچی تێکەوتبوو.

ـ خوشکێ! ویژدان و ئەرکی مرۆڤانە، حوکم دەکا زەماوەندی لەگەڵ بکەم.

ـ تێناگەم. بەڕاستی سەرم لەو کارانەی تۆ سووڕماوە.

کۆنت نۆخلیدۆڤ سەردەمی منداڵیی وەبیر هاتەوە. وەبیری هاتەوە ئەو کاتە خوشکی چەندە کچێکی پاک و بەبەزەیی بوو و خەڵکی خۆشدەویست. بیری لەوە دەکردەوە خۆشکی بۆ ئاوا گۆڕاوە! دەرکەوتنی قەڵافەتی دزێوی ڕۆگۆژنیسکی هەودای خەیاڵی پساند. بزەیەکی قۆڕەدەماخانەی لە سەر لێو

بوو. چاویلکه و سەری ساف و ڕدێنە ڕەشەکەی بریقەیان دەهات و پێکەوە تێکەڵ دەبوون. وەک هەمیشە لە سەرەوە چاوی لە هەمووان دەکرد.

ـ بەخێر بێی.

هیچکات پێکەوە خۆمانە نەبوون و بە یەکتریان دەگوت «ئێوە». دەستی یەکتریان گوشی و دانیشتن.

ـ خۆ قسەکانم لێ تێک نەدان؟

ـ نانا، من قسەیەکم نییە لە کەسێکی بشارمەوە.

نۆخلیدۆڤ چاوی لە دەستی تیسکن و سەری بێ تووکی ڕۆگۆژنیسکی کرد. دەنگی لە خۆبایی بوونی پێوە دیار بوو و جۆرێک دەدوا، دەتگوت ڕێبەر و ڕێنوێنێکی خێرخوازە و بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ هەمووان ڕێنمایی بکات. ناتالیا چایی بۆ ئەویش تێکرد و گوتی سەبارەت بە کاروباری براکەی قسە دەکەن.

ـ چ کاروبارێک؟

ـ سبەینێ دەمهەوێ لەگەڵ کاروانی زیندانییەکان بڕۆم بۆ سیبیریا؛ بە دوای ئەو ژنەدا دەڕۆم کە غەدرم لێکردووە.

ـ وەک بیستوومانە قەستت تەنیا هاوڕێیەتی نییە و وەک دەڵێن لەوانە زیاترە!

ـ مەبەستت زەماوەندە؟ بەڵێ، بە گیان و دڵ پێوەم ئەو کارە بکەم.

ـ ئەگەر دەکرێ، دەمانەوێ بزانین بۆچی ئەو بڕیارەتان داوە؟

نۆخلیدۆڤ نەیدەزانی چۆن قسەکانی دەربڕێ و بە ئاسانی وشەکانی بۆ نەدەچۆوە سەریەک، گوتی:

ـ بەڵگەی من بۆ ئەو قسـەیە ئەوەیە... ئەوەیە کە یەکەم کەس بووم بوومە هـۆی گـومڕا بـوونی ئەو... هەر بـۆیە خـۆم بە تاوانبـار و شـیاوی سـزادان دەزانم.

ـ بەڵام ڕەنگە ئەویش بێ تـاوان نەبوو بێ. مەگین لە دادگـا حـوکمی بـۆ نەبڕاوەتەوە؟

ـ سەتاسەد بێ تاوان بوو.

نۆخلیدۆڤ چۆنیەتیی دادگایی کردنەکەی بە وردی و لە نووکەوە بۆ بـاس کردن.

ـ وای دانێن هەڵەیەک ڕووی دابێ، دەبێ داوای پێداچوونەوە بەرز بکەنەوە بۆ ئەنجومەنی سەنا و ئەوان بڕیاری لە سەر بدەن.

ـ سەنا سکاڵانامەکەی ڕەد کردەوە.

ڕۆگۆژنیسـکی لەو قازییـانە بـوو کە دەیگـوت ڕاسـتییەکان لە کـاتی لێپرسینەوەدا دەردەکەون.

ـ ئەگەر ئەنجـومەنی سـەنا سـکاڵانامەکەی ڕەد کـردبێتەوە، دیـارە بەڵـگەی پێویست بۆ هەڵوەشاندنەوەی حـوکمەکە لە بەر دەسـتدا نەبـووە. چـونکە سـەنا ناچێتە سـەر چلۆنـایەتی و ئەگەر لە دادگـا هەڵەیەک ڕووی دابێ، دەبێ داوای بەخشین بکەن.

ـ ئەو کارەشمان کردووە، بەڵام هیچ هیـوایەک نییە؛ چـونکە کاربەدەسـتانی باڵا پرسیار لە خـانەی داد دەکەن؛ وەزارەتخـانەش پرسـیار لە سـەنا دەکات و سەناش پشتیوانی لە بڕیاری خۆی دەکات؛ ئیتر کـارەکە دەبـڕێتەوە و بەنـدیی بێ تاوانیش وەک هەمیشە لە بەندیخانەدا دەمێنێتەوە.

ڕۆگۆژنیسکی لووتبەرزانە گرژییەوە و گوتی:

ـ با وردتر له بابەتەکە بکۆڵینەوە؛ یەکەم، وەزارەتخانە پرسیار لە دادگا ناکات. دادگا بۆ بڕیاری کۆتایی پەروەندەکە دەنێرێ بۆ ئەنجومەنی سەنا؛ دووەم بێ تاوانەکان حوکمیان بۆ نابڕدرێتەوە، کەسێک حوکم دەدرێ کە تاوانبار بێ. نۆخلیدۆڤ بە ڕقەوە چاوێکی لە مێردەکەی خوشکی کرد.

ـ بە پێچەوانە بێ تاوانەکان دەبنە قوربانیی دادگاکانی ئێوە .

ـ بۆ ئەو قسانە بەڵگە پێویستە.

ـ زۆربەی ئەو حوکم دراوانە بە ڕاستی بێ تاوانن؛ وەک ئەو ژنەکە بە دەرمانداو کردنی کەسێک تۆمەتبار کراوە؛ ئەگەرچی ئەو تۆمەتەشی لە سەر لاچوو، کەچی دادگا حوکمی بۆ بڕییەوە. وەک دایک و کوڕێک کە بە ئاورتێبەردانی ئەمبارێک تۆمەتبار کراون و پاشان دەرکەوت کەسێکی تر ئاوری تێبەرداوە، بۆ ئەوەی پارەی بیمەکەی وەرگرێ، بەڵام ئەو دایک و کوڕەیان مەحکووم کردووە، وەک سەدان کەسی تر.

ـ هەڵبەت هەمیشە وانییە و جاروبار هەڵدەکەوێ. مرۆڤ جاری وایە تووشی هەڵە دەبێ، بەڵام لە ڕاستیدا وانییە.

ـ خاڵێکی تریش هەیە؛ زۆربەی حوکمدراوان بێ تاوانن؛ چونکە لە شوێنێک گەورە بوون کە ئەو شتانە بە تاوان نازانن.

ـ نا، وانییە. هەموو دزەکان دەزانن دزی کردن کارێکی خراپە؛ دزی بە پێچەوانەی ڕەوشتی مرۆڤە و دزی یاساغە.

ـ بەڵێ، ئەوەیان پێگوتووە، بەڵام ئەو بە چاوانی خۆی دەبینێ خاوەنکار و کارخانەدار بەشێک لە هەقدەستی ئەو پاشقل دەدەن؛ دەبینێ دەوڵەت و فەرمانبەرەکانی بە ناویماڵیات و هەزار فێڵ و تەڵەکەی تر ئەو تالان دەکەن، ئەویش فێر دەبێ.

ڕۆگۆژنیسکی بزە لووتبەرزانەکەی هەر وا لە سەر لێو بوو:

ـ ئەو قسانەی تۆ، لایەنگری کردنە لە ئاژاوە و ئاڵۆزی.

ـ ئەم قسانە هەر ناوێکی لێدەنێی، بینێ، بەڵام ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە. دز دەزانێ ئێمە، یانی ئاغاواتی خاوەن مڵک و زەویوزاری زۆر، ساڵانێکی زۆرە بەرهەمی ڕەنجی ئەو ڕادەماڵین و ڕەنجبەخەساری دەکەین؛ لە حاڵێکدا زەوی هی خۆیەتی، چونکە زەوی هی ئەو کەسەیە وا کاری لە سەر دەکات. ڕەعیەتی داماو کاتێک چەند وشکەدار و چیلکە و چاڵ کۆدەکاتەوە بۆ ئەوەی تەندوورەکە پێ داخا و سۆبەکەی پێ گەرم دابێنێ، ئێمە دەیگرین و بە ناوی دز دەیخەینە بەندیخانە. لە حاڵێکدا ئەو زۆر بە باشی دەزانێ دز نییە و دز ئەو کەسەیەکە وا زەویوزارەکەی لێ داگیر کردووە و دەستڕەنجی ئەو بە تاڵان دەبا. دەبێ ئەو ڕاستییە قەبووڵ بکەین کە دزی کردنی ئەوان، جۆرێک تۆڵە کردنەوەیە. لە ڕاستیدا بۆ Restitution[٦٦] هەقی خۆیان ئەو کارە دەکەن و ئەوەش مافی ڕەوای خۆیانە.

ـ من لە قسەکانی ئێوە تێناگەم. یان تێدەگەم و لەگەڵ ئێوە هاوڕا نیم. زەوی خاوەنی هەیە و دەبێ کەسێک خاوەنی بێ. ئەگەر بە شێوەی یەکسان بە سەر تاقمێکدا دابەشی بکەن، دوای ماوەیەک، چەند کەس کە لە خەڵکی زیرەکتر و لێزانترن، زەوییەکانیان لە چنگ دەردێنن و دەبنە مالیک.

ڕۆگۆژنیسکی وردە وەردە بۆی دەرکەوتبوو قسەکانی نۆخلیدۆڤ بۆنی بیروباوەڕی سووسیالیستییان لێدێ؛ چونکە تەنیا سووسیالیستەکان ئەو بیروباوەڕەیان هەبوو؛ پێی وابوو ئەو جۆرە بیروباوەڕەش بێ مانا و گەوجانەن. بەڵام نۆخلیدۆڤ ئەو هەڵەیەی بۆ ڕوون کردەوە.

66 ـ وەرگرتنەوە (بە زمانی فەرەنسی).

ـ هیچ کەس لێرەدا باسی دابەشکردنی زەویوزاری بە شێوەی یەکسان نەکردووە. زەوی نابێ ملکی کەسێک بێ و بتوانێ بیکڕێ و بیفرۆشی یان بیدا بە ئیجارە.

ـ بەڕێز! مافی خاوەنداریێتی لە زاتی مرۆڤدا هەیە. ئەگەر مافی خاوەنداریێتی نەبێ، هیچ کەس دەست و دلی بۆ کار ناچێ تاکوو لە سەر زەوییەک کار بکات و شوێنێک ئاوەدان بکاتەوە. تۆ ئەگەر ئەو مافە لە نێو بەری، مرۆڤ بەرەو چاخی بەردین و کێوی بوون دەگێڕییەوە.

هەر ئەو قسە کۆنانەی کاوێژ دەکردەوە کە بەڵگەیان دەهێنایەوە و دەیانگوت خاوەنداریێتی زەویوزار مافی ڕەوای مرۆڤە و ناکرێ بیسڕیەوە؛ چونکە مەیلی خاوەنداریێتی لە زاتی مرۆڤدا هەیە و خاوەنداریێتی زەیوزار دەبێ بەرز بنرخێندرێ. بەڵام نۆخلیدۆڤ نەچووە سەر قسەکەی و لە وەڵامیدا گوتی:

ـ بە پێچەوانە، ئەگەر خاوەنداریێتی زەویوزار هەڵنەوەشێتەوە، زەوی بە باشی کشتوکاڵی لە سەر ناکرێ و جووتیار بە دڵ لە سەر زەوییەکان کار ناکا. چونکە مالیک و خاوەن زەوییەکان وەک سەگ بە دەوری خەرمانەکەدا دەسووڕێنەوە و دەست دەکەن بە چەقوڵوور بۆ ئەوەی هیچ کەس لێی نزیک نەبێتەوە و کەڵکی لێ وەرنەگرێ.

ڕۆگۆژنیسکی ڕقی هەستا بوو؛ لێوی دەلەرزی.

ـ گوێ بگرە دیمیتری ئیڤانۆڤیچ! هەڵوەشاندنەوەی مافی خاوەنداریێتی ئەو پەڕی شێتییە! لەم سەردەمەدا ئەوە بە هیچ شێوەیەک ناگونجێ. ئەم قسەیە بۆ ئێوە جۆرێک Dada[٦٧]یە. تۆزێ بیر بکەوە. بەر لەوەی زەوییەکانت دابەش

67 ـ دڵخۆشییە.

بکەی،زیاتر لەو بوارەدا متالاّ بکە و بیر بکەوە، پەلەپەل مەکە و ماوەیەک دەست ڕاگرە!

ـ بەڕێز! خەریکی خۆت لە کارە تایبەتییەکانی من وەردەدەی و من مافی ئەوەت پێ نادەم!

ڕۆگۆژنیسکی گوێی بە ناڕەزایەتییەکەی ئەو نەدا و لە سەر قسەی خۆی سوور بوو. لووتی هەڵێنا و گوتی:

ـ لێم گەڕێ با ڕاست و ڕەوان بۆت لە بنی کوولەکەکە بدەم. پێت وانەبێ من لە بەر خۆم یان منداڵەکانم ئەو قسەیە دەکەم. بەختەوەرانە ئێمە ماڵ و سامانێکی زۆرمان هەیە و لێمان سەروزیادە. چاوی تەماحیشمان لە ماڵی هیچ کەس نەبڕیوە. ئەگەر قسەیەکیش دەکەم لەبەر هۆکاری تایبەت بە خۆمە؛ لە بەر یاساوڕێسای وڵات. لە بەر دژبەری کردن لەگەڵ بیروباوەڕی ئێوە. داوات لێدەکەم زیاتر بیر بکەیەوە؛ زیاتر کتێب بخوێنەوە و تەنیا پشت بە چەند کتێب مەبەستە.

نۆخلیدۆڤ، سوور هەڵگەڕا بوو؛ نەیدەتوانی ددان بە خۆیدا بگرێ. بە تووڕەیی دەنگی هەڵبڕی:

ـ بەڕێز! ڕێ و شوێن بۆ من دامەنێ. من خۆم دەزانم چی بخوێنمەوە و چۆن بڕیار بدەم.

نۆخلیدۆڤ وەها ڕقی هەستا بوو، چەقۆت لێدایە خوێنی نەدەهات؛ بەڵام ددانی بە جەرگیدا گرت و بێدەنگ بوو. چاییەکەی هەڵگرت و خواردییەوە.

# سی و سێ

نۆخلیدۆڤ بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕی، لە خوشکی پرسی:

ـ منداڵەکان چیدەکەن، چۆنن؟

ـ لە لای دایەگەورەیانن.

ناتالیا زۆری پێخۆشبوو چەلەحانیێ پیاوەکان کۆتایی هات و باسی خۆمانە هاتە پێشێ. باسی منداڵەکانی و بووکەڵە و لەیستۆکەکانیانی کرد و چووە سەر باسی بیرەوەریی سەردەمی منداڵیی خۆیان کە دوو بووکەڵەیان هەبوو؛ یەکیان ڕەش و عەرەبی دەشتەکی، ئەوی دیکەشیان سوور و سپی و خاتوونی فەرەنسی بوو!

ـ خوشکێ تۆش شتی سەیرت لە بیر ماوە.

ـ کوڕ و کچەکەشم یارییەکانیان ڕاست وەک یارییەکانی ئێمە وایە.

ناتالیا دڵی ئارام بووبۆوە و خۆشحاڵ بوو، کە ئیتر باس و چەلەحانیی هەستڕووشێنی پیاوانە تەواو بووە. لەگەڵ براکەی هێندێ قسەی هەبوو کە نەیدەویست لە لای مێردەکەی پێی بڵێ، حەزی دەکرد بە تەنیا بن و زۆر شتی لێ بپرسێ. باسی دۆئێلی تاقانە کوڕی خاتوو کامنسکایا هاتە گۆڕێ. ناتالیا زۆر بە داخەوە بوو کە ئەو ژنە کوڕە تاقانەکەی لە دەست داوە. ڕۆگۆژنیسکی دیسان باسێکی کۆمەڵایەتیی دەست پێکرد.

ـ نـا بەڕێـز! تەنیـا یەک ڕێـگە چـارە هەیە؛ دەبـێ کوشـتن لە دۆئێلـدا لە ڕوانگەی مافی گشتییەوە بخرێتە ڕیزی تاوانەکانەوە؛ تەنیا لە ڕێگەی یاساوە دەتوانین بەر بەو تاوانە بگرین.

نۆخلیدۆڤ دیسان بەرهەڵستی قسەکانی ئەو بۆوە و دیسـان چەلەحانێ و مشتومڕ دەستی پێکردەوە. هەر کام لە سـەر بیروبـاوەڕی خۆیـان پێداگرییان دەکـرد و ڕێگەیـان بە حەریفەکەیـان نەدەدا قسـەی خـۆی بەرێـتە سـەرێ. ڕۆگۆژنیسکی هەستی کردبوو ژنبراکەی بە چاوێکی سووک لێی دەڕوانێ و دژایەتی لەگەڵ هەموو کار و بیروباوەرەکانی دەکات. نۆخلیدۆڤ ئەگەرچی نەیدەویسـت بێبـوغزێنێ و بیروبـاوەڕی دواکەوتـووانەی ئەوی سـەبارەت بە دابەشکردنی زەیـوزار بە هەند نەدەگرت، بەڵام ڕقی لەوە هەستابوو کە ئەو بۆرەکەیە تا ئەو ڕادەیە لە خۆ ڕازییە و ئاوا لێبڕاوانە قسە دەکات؛ پێی وایە لە ئاسمانەوە هاتۆتە خوارێ و ئەرکی ڕێنوێنی و ڕوونکردنەوەی خەڵکی پێ سـپێردراوە، ئێسـتاش لە سـەر ئەوە پێداگر بـوو کە مەسـەلەی کوشـتن لە دۆئێلـدا دەبـێ بخـرێتە چوارچێـوەی یاسـاوە و تاقمێـک لە سـەر ئەو کـارە قۆلبەست بکرێن و بدرێن بە دادگا.

ــ دەبــێ هەر کەســێک لە دۆئێلــدا بەشــداریی کــرد، لە لایەن یاســاوە دەسبەسەر بکرێ و هەر دوو لایەنەکە حوکمی زیندان و کاری دژواریان بۆ ببڕدرێتەوە.

ـ دەکرێ بفەرمووی ئەو کارە چ قازانجێکی هەیە؟

ـ قازانج؟... دەبێ عەداڵەت بەڕێوە بچێ.

ـ ئەم دەزگای دادە کوا عەداڵەت و یاساکەی؟ لە کام بواردا عەداڵەتی لە بەر چاو گرتووە، کە ئەمە دووهەمینەکەی بێ.

ـ دەزگای داد ئەگەر عەداڵەت بەڕێوەنابا، ئەی چ دەکا؟

ــ زۆر ڕوون و ئاشکرایە؛ ئەو دەزگـایە تەنیـا کـاری ئەوەیە پـارێزەری قازانج و بەرژەوەندیی چێنکی تایبەت بێ. ئەو دادگایانە تەنیا ئەڵقەیەکن لە زنجیـری دەزگـای بەڕێـوەبەرایەتی؛ ئامانجیشـیان تەنیـا پاراسـتنی ئەو سیستەمەیە و هیچی تر.

ڕۆگۆژنیسکی بزەیەکی بەزۆری هەروا لە سەر لێوی بوو.

ـ بەڕێز! ئەوانە تەنیا قسەی خۆتن. دادگا ئەرکێکی گرنیگی لە سەرشانە و کاری زۆر باش و بەکەڵکیش ئەنجام دەدا.

ـ لە سەر کاغەز وایە، بەڵام لە کردەوەدا داشتێکی جیا لەوەیە. خۆم شایەد بـووم دادگاکـان چ زەحمەتێک دەکێشـن و چەنـدە هەوڵ و تەقـالا دەدەن بـۆ ئەوەی نەزم و ڕێکـوپێکی لە کۆمەڵگـادا مسـۆگەربێ! هەر کەس خـاوەنی بیرێکی ڕووناک بێ و بیهەوێ بارودۆخی کۆمەڵگا بگۆڕێ و چاکسازیی بۆ بکا، لەو دادگایانەدا وەک تاوانبارێکی ئاسایی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەن و حوکمی بە سەردا دەسەپێنن.

ـ مـن لەگەڵ ئەو قسـەیەدا نـیم. ئەوانە نـاوی چـالاکی سیاسیی لە خۆیـان دەنێن و خۆیان لە خەڵکی بە زانا و تێگەیشتووتر دەزانن، لە حاڵێکدا وانییە، ئەوانە کەسانێکی گومڕا و تەرەبووی کۆمەڵگان. لە خەڵکی ڕووناکبیرتر نین؛ لە کاسانی دیکەش ئاقڵتر و تێگەیشتووتر نین؛ ئەوانە کەسانێکی سەرلێشێواو و دوژمنی کۆمەڵگان؛ بۆیە دادگاکان دەبێ بڕیاریان لە سەر بدەن.

ـ مـن تاقمێـک لەو کەسـانە دەناسـم. قسـەم لەگەڵ دەکەن. زۆربەیـان لەو قازییانە تێگەیشتووترن کە دادگاییان دەکەن. کەسانێکی بوێر و ئاکار جوان و ڕووناکبیرن.

ڕۆگۆژنیسکی حەزی نەدەکرد هیچ کەس قسە لە قسەیدا بکات. گرنگیی بە قسەی ژنبراکەی نەدەدا و لە سەر قسەی خۆی سوور بوو.

ـ بە هەر حاڵ ڕۆڵی دادگاکان تەنیا پاراستنی ئەم سیستەمە نییە؛ دادگاکان ئامانجێکی مەزن و زۆر پاک و بێگەردیان هەیە؛ دەزگای داد ئامانجی چاکسازیی کۆمەڵگایە.

ــ ئەگەر بچی سەرێک لە بەندیخانەکان هەڵێنی، جا بۆت دەردەکەوێ دەزگای داد چ چاکسازییەکی کردووە!

ـ بەڕێز! دەزگای داد بۆ گاڵتە نابێ. دەبێ کەسانی پیس و خراپکار سزا بدرێن. کەسانی وا هەن لە هەموو ئاژەڵێک دڕندەترن؛ پەست و خوێڕین؛ خۆ لە هیچ تاوان و خراپەکارییەک نابوێرن.

ــ ئەو کارانەی دادگاکانی ئێمە ئەنجامی دەدەن، پێش بە تاوان و خراپەکاری ناگرێ.

ـ ڕەنگە پێت سەیر بێ، بەڵام بە بڕوای من دوو جۆر سزادان هەیە کە لە کۆنەوە بووە و باش یان خراپ کاریگەریی باشی هەبووە؛ یەکیان سزادانی جەستەیی و ئەوی دیکەیان لە سێدارەدان، کە ئەم سزایانە بە هۆی ناسک بوونی هەست و دڵی خەڵک و بیروڕای گشتی، خەریکە لە نێو دەچێ.

ـ پێم سەیرە ئێوە قسەی ئاوا دەکەن!

ـ خۆ گوتم من کارم بە سەر چاکی و خراپییەکەیەوە نییە، بەڵام سزای جەستەیی دەبێتە هۆی ئەوەی تاوانبار بترسێ و ئیتر هەڵە و تاوانەکانی پێشوو دووپات نەکاتەوە. لە سێدارەدانیش بۆ هەمیشە تاوانبار لە نێو دەبات و لە کۆمەڵگادا دەیسڕێتەوە. ئەم دوو سزادانە بێ بەزەیییانەیە، بەڵام لانیکەم مەنتقییە. جگە لەو دوو جۆرە سزادانە، ئەوانی دیکە بێ بەزییانەشن و نامەنتیقیشن. چ کەڵکێکی هەیە کەسێکی تاوانبار لە سووچی بەندیخانەدا ڕاگری؟ جگە لەوەی ئەو خراپکار و گومڕایانە لەوێ لەگەڵ کەسانی لە خۆیان خراپتر ئاشنا دەبن و فێڵ و دەهۆی وا فێر دەبن کە پێشتر بە بیریشیاندا

نەهاتووە. چ کەڵکێکی هەیە ئەو چارەڕەشانە بە خەرجی دەوڵەت لە "توولا"وە دوور بخەنەوە بۆ "ئیرکۆتسک" و "کۆرسک[٦٨]"؟ بیستوومە دوورخستنەوەی هەر بەندییەک بۆ دەوڵەت، پێنجسەد ڕۆبڵ هەڵدەگرێ؛ یان ئەوەندە بۆ دەوڵەت حیسابسازی دەکەن.

ـ ئەگەر ئەو زیندان و دوورخستنەوانە نەبووایەن، هێمنایەتیی وڵات لە نێو دەچوو و من و ئێوە نەماندەتوانی بێ خەم و خەیاڵ لە ماڵەوە دانیشین و پێکەوە مشتومڕ بکەین.

ـ هێمنایەتی بە زیندان و تاراندن پێک نایە و مسۆگەر نابێ. خۆ زیندانی هەتا کۆتایی تەمەنی لە بەندیخانەدا نامێنێتەوە؛ دوای ماوەیەک ئازاد دەبێ و ئەمجارەیان شارەزاتر و بەئەزموونترە و زۆریش مەترسیدارە.

ـ کەوایە ئێوە لە سەر ئەو باوەڕەن دەبێ جۆری سزادانەکان بگۆڕدرێن و بەندیخانەکان بە شێوەیەکی نوێ بەڕێوە ببرێن.

ــ ئەو کارانە خەرجی زۆرە و ئەم خەرجانەش بارێکی تازە دەخەنە سەرشانی خەڵک.

ڕۆگۆژنیسکی دیسان درێژەی بە قسەکانی دا:

ــ گریمان بەندیخانەکان لە بارودۆخێکی خراپ دان و سزادانەکانیش کەموکووڕییان هەیە، خۆ ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی دادگاکان بە خەتابار بزانین.

ـ ئەو کەموکووڕییانە مەحاڵە چاک بکرێن.

ڕۆگۆژنیسکی بزەیەکی سەرکەوتووانە نیشتە سەر لێوی و گوتی:

---

68. Toolaلە باشووری مۆسکۆ، ئیرکۆتسک لە ناوەندی سیبیریا و کۆرسک Koursk لە نزیک ئۆکراین هەڵکەوتوون.

ـ کەوایە دەفەرمووی هەموویان لە نێو بەرین، یان بە قەولی یەکێک لە هاوکارانم چاوی هەموویان دەرهێنین؟

ـ ئەگەر ئەوەیان بکردایە ئەگەرچی بێ بەزییانە بوو، لانیکەم مەنتیقی و عاقلانە بوو. ئێمە ڕێگایەکمان گرتۆتەبەر کە بێ بەزەییانەشە و گەوجانەش. لە هەمووشی خراپتر ئەوەیە تاقمێک مرۆڤی پاک و ڕاست دەبێ هاوکاریی ئەو دادگایانە بکەن و لەو کارە بێ بەزییانە و گەوجانەیەدا بەشداری بکەن. ڕۆگۆژنیسکی ڕەنگی هەڵبزرکا.

ـ بەڕێز! لە بیرت نەچێ من یەکێک لە قازییەکانی ئەو دادگایانەم.

ـ تۆ ئەرکی خۆت باشتر دەزانی؛ بەڵام من سەرم لەوانە دەرناچێ و نازانم ئەم دادگایانە بە کەڵکی چی دێن؟

ـ زۆر شت هەیە من و تۆ سەرمان لێی دەرناچێ.

ـ لە دانیشتنێکی دادگادا دیتم گەنجێکی داماو بە تاوانی دزینی بەڕەیەکی کۆن دادگایی کرا. هەمووان دڵیان پێی دەسووتا، بەڵام دادیار یەک سەعات قسەی کرد و داوای لە دادگا کرد بە توندی سزای بدات. لە دادگایەکی تر تاقمێک گوندنشینی چارەڕەش حوکم دراون. تاوانیشیان ئەوە بووە ئینجیلیان بە شێوازی مەزهەبی خۆیان شرۆڤە کردووە.

ـ ئەگەر وەک ئێوە بیرم بکردایەتەوە هیچکات نەدەبوومە قازی.

لە جێی خۆی هەستا. چاوی پڕ بووبوو لە فرمێسک. چوو بۆ بەر پەنجەرەکە. چاویلکەکەی داکەند و بە دەسرەیەک چاویلکەکەی و چاوی سڕی. نۆخلیدۆڤ خەم و شەرم دایگرت. چونکە سبەینێ دەچوو بۆ سەفەر و لەوانەیە بەم زووانە خوشکی و زاواکەیان نەبینێتەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «یانی بە ڕاستی گریاندم؟ بۆ چی لە بەر چاوی خوشکم ئاوا بوومە هۆی

ئەوەی بە خۆیدا بشکێتەوە؟ یانی هەقی ئەوەم بوو ئاوا ئازاری بدەم و خوشکیشم ئاوا زویر بکەم؟ بۆ وام کرد؟؟»

# سی و چوار

بڕیار بوو شەمەندەفەری ڕاگوێستنی بەندییەکان سەعات سێی دوانیوەڕۆ لە وێستگەوە بکەوێتە ڕێ. نۆخلیدۆڤ بڕیاری دا پێش دوانیوەڕۆ لە بەر دەرگای بەندیخانە بێ، تا لەوێوە ڕەگەڵ کاروانەکە بکەوێ.

ئەو ڕۆژە بەیانی زوو لە خەو هەستا و کاغەز و پەروەندەکانی ڕێکوپێک کرد. لە بەینی پەروەندەکاندا چاوی بە دەفتەری بیرەوەرییەکانی کەوت، بێ ئیختیار هەڵیگرت و لاپەڕەکانی هەڵدایەوە و چەند دێڕی لێ خوێندوە. بەر لە سەفەر کردن بۆ پترزبۆرگ لە دەفتەرەکەدا نووسیبووی: «... کاتیۆشا نایهەوێ من فیدارکاری بکەم و حەز دەکات خۆی فیداکار بێ و هەر دووکمان بە ئاواتی خۆمان گەیشتووین. هەست دەکەم گۆڕاوم. ئیتر ئەو مرۆڤەی ڕابردوو نیم. کاتیۆشاش بۆتە مرۆڤێکی تر؛ دەڵێی تازە لە دایک بۆتەوە.» لە دوایین لاپەڕەدا نووسیی: «... ئازارێکی زۆرم کێشا هەتا گەیشتمە ئیرە و ئەوەی بە دەستم هێناوە زۆر گرینگە، زۆریش خۆشحاڵم. کاتێک لە نەخۆشخانە بە خراپە باسی ماسلۆڤایان دەکرد. وەها گێژ بووبووم لەوانە بوو شێت بم. کاتێک چاوم بە ماسلۆڤا کەوت، بەڕقەوە چاوم لێکرد. ئەوەی بە زارمدا دەهات تاڵ و ڕەق بوو. بەڵام زۆر زوو وەخۆ هاتمەوە. بیرم لەوە نەکردبۆوە کە خۆشم زۆر جار تووشی ئەو هەڵەیە بووم و ئێستاش هەر هەنگاوێک هەڵدێنمەوە هەزار جۆر بە لاڕێدا دەڕۆم. بۆ دەبێ

سەبارەت بە خەڵکی ئەوەندە سەختگیر بم؟ لە ناکاو ڕقەکەم نیشتەوە و دڵسۆزی جێگای گرتەوە. هەستم دەکرد بەرەو بەرزایی هەڵدەکشێم و خەریکم دەگەم بە لووتکە... بەڕاستی هەڵسوکەوتم لەگەڵ ناتالیا و مێردەکەی ناحەزبوو. زۆر بەتوندی قسەم کرد؛ زۆرم ئازار دان...»

دەیویست سەرەتا بچێت بۆ لای خوشکی و داوای لێبوردن لە ئەو و مێردەکەی بکات و دڵیان چاک بکاتەوە؛ بەڵام دەرفەتی نەبوو. شەمەندەفەری بەندییەکان دوو سەعات زووتر لە شەمەندەفەری مسافیر هەڵگر وەڕێ دەکەوت و نۆخلیدۆڤ کە بڕیاری دابوو نەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنە، حیسابەکەی لەگەڵ خاوەنماڵ پاکتاو کرد.

بڕیار بوو شەمەندەفەری مسافیرانی ئاسایی دوو سەعات دەرەنگتر لە شەمەندەفەری بەندییەکان وەڕێ بکەوێ. نۆخلیدۆڤ بە سواری فەتیوون ڕۆیشت بۆ لای بەندیخانە بۆ ئەوەی چاوی بە ماسلۆڤا بکەوێ. مانگی ژوییە بوو، هەواکەشی زۆر گەرم بوو. سەنگفەڕشی شەقام و شیروانیی سەربانەکان لە بەر تیریژی خۆر گەرم داهاتبوون. هەواکەی شێدار بوو، سریوەی با نەدەهات، جاروباریش کە شنەیەک هەڵیدەکرد، تۆز و خۆڵ و گەرما و بۆنی ڕۆن و چەورایی ویستگەکەی بڵاو دەکردەوە. شەقامەکان چۆڵ بوون. جاروبار ڕێبوارێک دەکەوتە بەر چاو و بە ژێر سێبەری دیوارەکاندا دەڕۆیشت. تەنیا بەردبڕەکان لە نێوەڕاستی شەقامەکە دانیشتبوون و بە چەکوش لە سەنگفەڕشەکانیان دەدا. ترامۆڤاکان پەردەی لای خۆرئاوایان دادابۆوە و خەریکی هاتوچۆ بوون، زرەی زنگوڵەی ملی ئەسپەکان لە دوورەوە دەهاتە گوێ.

نۆخلیدۆڤ لە بەر دەرگای بەندیخانە دابەزی. هێشتا کاروانی بەندییەکان وەڕێ نەکەوتبوو. بەندییەکان سەعات چواری بەیانی لە خەو هەستابوون،

کەرەسە و کەلوپەلی پێویستیان لە ئەمبار وەرگرتبوو. شەسسەد و بیست و چوار پیاو و شەشت و چوار ژن لەگەڵ ئەو کاروانە بەرەو سیبیریا دوور دەخرانەوە. دابەشکردنیان کارێکی سادە و ئاسایی نەبوو. دەبوو نەخۆش و کەلەلا و مرۆڤە لاوازەکان، دەستنیشان بکەن و دوای پشکنین و تۆمار کردنی ناو و ناسنامەیان بیاندەنە دەست فەرماندەری کاروانەکە.

سەرۆکی نوێی بەندیخانە لەگەڵ دوو جێگرەکەی و پزیشک و پەرستار و فەرماندەری کاروان و بەرپرسی نووسینگە لە حەوشەی بەندیخانە لە پشت مێزێک دانیشتبوون و ناوی بەندییەکانیان یەک لە دوای یەک تۆمار دەکرد و دەیانناردن بۆ ڕیزی دوایی. هەتاو نیوەی مێزەکەی گرتبوو. هەواکەی قورس و شێدار بوو. بەندییەکان زۆر بوون و لە نێو حەوشەی بەندیخانەدا جمەیان دەهات و قرچەی گەرما جاڕزی کردبوون. ملازمێک کە ئەرکی ئەو بەندییانەی پێ سپێردرابوو ئاراوقارای لێ هەڵگیرابوو.

- وەڕس بووم. ئەم هەموو مرۆڤە داماوەتان لە کوێ هێناوە؟ ئەی کەنگێ تەواو دەبن.

فەرماندەری کاروان پیاوێکی سوور هوول و قەڵەو بوو بە دەستی قوڵەو قامکی ئەستوورەوە. لە پەستا مژی لە جگەرەکەی دەدا و دووکەڵ لە ژێر سمێڵە زلەکەیەوە دەهاتە دەرێ. نووسیار کاتێک دیتی فەرماندەر ئارام و ئۆقرەی لێ هەڵگیراوە، چاوێکی لە دەفتەرەکەی دەستی کرد و گوتی:

- هێشتا بیست و چوار کەس لە پیاوەکان ماون. دوای ئەوان ئینجا نۆرەی ژنەکانە.

- کەوایە زووکە... خێراتر کارەکە تەواو کە.

بەندییەکان بە ڕیز لە بەر قرچەقرچی خۆرەتاو ڕاوەستا بوون. هێندێکیان ماوەی سێ سەعات بوو لە ڕیزەکەدا بوون. بەڵام بەر دەرگای بەندیخانە

تێکەولـێکەیەک بـوو کەس ئاگـای لە کەس نەبـوو. پاســەوان چەکـی لە شــان کردبـوو و لە بەر دەروازەکەدا دەهـات و دەچـوو. پـازدە ـ بیسـت عارەبـانە و هێلینگەی شەقوشڕ و چەپرەک ڕیزیان بەستبوو و دەیانوسیت بەندییە کەلەلا و نەخـۆش و بـێ هێزەکـان ڕاگـوێزن بـۆ وێسـتگەی شـەمەندەفەر. تاقمێـک لە خـزم و کەسـوکاری بەنـدییەکان لە سـووچێک کۆبووبـوونەوە و چـاوەڕوان ڕاوەستا بوون. نۆخلیدۆڤیش لە نێو ئەواندا بوو. سەعاتێک بە پێوە ڕاوەستا و چاوەڕوان ما، تا لە دوورەوە دەنگی یەکەم فەرمانی فەرماندەری کاروان هـاتە گـوێ. بەو فەرمـانە، پێشـەنگەکانی کـاروان وەڕێ کەوتـن. تەقوکـوتی لاق و زڕەی زنجیـر پـێکەوە تـێکەڵ بـوون. پێـنج خـولەکی خایانـد هەتـا دەرگـایەکی چکۆلە کرایەوە. زڕە و تەقوکوت نزیکتر بۆوە. خڕە و زڕەی زنجیر بە باشـی دەبیسترا. سەربازانی سپی پۆش و چەک لە شـان لە دەرگـاکە هـاتنە دەرێ و لەبەر دەروازە گەورەکە بە شـێوەی بـازنەیی ڕاوەسـتان. دەنگـی دووهەمـین فەرمـان هـات. بەنـدییەکان دوو ـ دوو وەڕێ کەوتـن. ئەوانەی مەحکـووم بە کـاری دژوار بـوون، لە پێشـەوە دەهـاتن؛ زنجیـر لە پێدا و کۆڵێکی قـورس بە کـۆڵەوە. سـەریان تاشـیبوون و کڵاوێکیـان لە سـەریان کردبـوو. بە دەسـتی چەپیان ژێر کۆڵەکەیان گرتبوو و دەستی ڕاستیان توند و قایم ڕادەوەشاند.

ئەو بەندییانەی سزای کاری قورسیان بۆ بڕابۆوە، کراسـی خۆڵەمێشـینیان لە بەردا و نێـو پشـتەکەی چوارخـانەیەکی ڕەشـی پێدا دووڕابـوو. لە هەمـوو جۆرێـک بـوون؛ پیـر و لاو، لاواز و قەلەو، زەردەڵ و سـوورهووڵ، سـپی و ڕەش و ڕەشتاڵە، ڕیشن و سمێڵدار، ڕیش و سمێڵ تاشـراو، ڕووس و تاتـار و جـوولەکە و... دەسـتیان وا ڕادەوەشـاند دەتگـوت دەچـن بـۆ ڕێپێـوانێکی دوورودرێژ. بەڵام هێشتا بیست هەنگاو دوور نەکەوتبوونەوە، بە چوار ڕیز لە پشت سەری یەک ڕاوەستان.

بە دوای ئەوانـدا تـاقمێکی تـر هـاتن؛ زەنجیریـان لە پێـدا نەبـوو بەڵام جلەکانیـان لەگەڵ جلـی سـزادراوان بە کـاری دژوار، جیـاوازیی نەبـوو. ئەوانە سـزای دوورخرانەوەیـان بـۆ بڕابـۆوە. بە پەلە هـاتن و لە ڕیـزی چوارمـدا ڕاوەستان. پاشان نۆرەی سزادراوانی کۆمەڵایەتی هات کە ئەنجومەنی لادێ بڕیـاری دوورخسـتنەوەیانی دابـوو[٦٩]. بە دوای پیاوانـدا، ژنـان هـاتن، ئەوانەی سـزایان دوور خـرانەوە بـوو، لەگەڵ ئەوانەی وا سـزای کـاری قورسـیان بـۆ بڕیبـوونەوە. تـاقمێکیش بە جلـوبەرگی ئاسـایی شـاری و لادێییـیەوە لە ڕیـزی دواوە ڕاوەستابوون. ئەوانیش ئەو کەسـانە بـوون کە خـۆ بەخشـانە هـاتبوون لەگەڵ ژن، مێرد یان کەسێکی خۆیان بڕۆن بۆ تاراوگە. لە نێو ژنەکاندا چەند کەسیان منالّی بەرمەمکانیـان بە باوەشـەوە بـوو. منداڵەکانی دیکەش بە دوای ڕیزەکانـدا هەڵـدەهاتن. وەک ئەو جوانـووە ئەسـپانە دەچـوون کە بە دوای ڕەوەدا هەڵدێن.

پیاوەکـان کەمتـر قسـەیان دەکـرد. هێنـدێ جـار دەکـۆخین، بەڵام ژنەکـان بە پـێچەوانەی ئەوان بەردەوام قسـەیان دەکـرد و خەریکـی چپەوسـرتە بـوون. نۆخلیدۆڤ بەوردی چاوی دەگێڕا بەڵکوو ماسلۆڤا بدۆزێتەوە، بەڵام هەر چی هەوڵـی دا بـۆی نەدۆزرایەوە. ژنەکـان لە کۆمـایەکی پەڕۆ و پـاڵی خۆڵەمێشـین دەچـوون کە دەجـوولانەوە و هیچیانـت بـۆ لێـک نەدەبـۆوە. تاقمێکیـان کـۆڵ بە کۆڵ بوون و هیچ کەس ئیتر خۆی نەبوو؛ بەڵکوو یەکێک لە دەستەکە بوو.

لە بەر دەرگـای زینـدان دیلەکانیـان دەژمـارد. سـەربازەکانیش هەر کـام لیسـتەی جیاوازیـان بە دەسـتەوە بـوو و دەیـانبژاردن. هێنـدێک لە بەندییەکان دەجووڵانەوە و جێگاکەیان دەگۆڕی و سەربازەکان حیسابەکەیان لێ دەشـێوا.

---

69 ـ ئەنجومەنەکانی لادێ تاقمێک لە جووتیارەکانیـان بە تۆمەتی نافەرمـانی وەک کەسـانێکی ئاژاوەگێڕ ناساند و حوکمی دوورخستنەوەیان بۆ بڕینەوە.

ڕقیان هەڵدەستا و جنێویان دەدا، دەیانگوڕاند و بۆ هەموو لایەک پاڵیان پێوەدەنان. بەندییەکان ڕقی خۆیان لە دڵیاندا کۆدەکردەوە و هیچیان نەدەگوت.

کاتێک ژماردن تەواو بوو، ملازمی فەرماندەر ئاماژەی کرد، ژنان و منداڵان و نەخۆش و کەلەلاکانیان برد بۆ لای عارەبانەکان. ژنان کۆڵەپشتی و منداڵەکانیان دەخستە سەر عارەبابەکان و پاشان خۆیان وەسەر دەکەتن و لە سەر کۆڵەپشتییەکانیان دادەنیشتن.

چەند کەس لە نێو پیاوەکانەوە کڵاویان لە سەر داکەند و چوون لەگەڵ ملازمی فەرماندەر قسەیان کرد. نۆخلیدۆڤ لە دوورەوە بۆی دەرکەوت ئەو تاقمە دەپاڕێنەوە بە سواری عارەبانە بیاننێرن؛ بەڵام ملازم مژی لە جگەرەکەی دەدا و گوێی بۆ قسەکانیان ڕانەدەگرت. تەنانەت دەستی بەرز کردەوە لە یەکێکیان بدات و گوڕاندی بە سەریدا:

- دەبێ بە پێیان بڕۆی بۆ ئەوەی دەست و پێ سپلکەییت لە بیر بچێتەوە[٧٠]!

تەنیا پیرەپیاوێک کە دەشەلی و زۆریش لاواز بوو، ڕێگایان پێدا سواری عارەبانە بێ، ئەو بێچارەیە کڵاوەکەی داکەند و خاچی خۆی کێشا و بە شەلەشەل ڕۆیشت بۆ لای عارەبانەکە، بەڵام نەیدەتوانی وەسەر بکەوێ. یەکێک لە ژنەکان چووە ژێر باڵی و بەرزی کردەوە.

کاتێک هەموو عارەبانەکان پڕ بوون، ملازمی فەرماندەر دەستەسڕەکەی دەرهێنا، عارەقەی نێوچاوان و سەرە بێ تووک و ملە ئەستوورەکەی سڕی و فەرمانی دا:

- کاروان! بۆ پێشەوە.

70 - تاقمێک لە بەندییە سیاسییەکان کە لە چینی ئاغاوات و خانەدانەکان بوون، مافی ئەوەیان نەبوو بە سواری ئارەبانە ئەو مەودایە ببڕن.

سەربازەکان تفەنگەکانیان لە شانیان توند کرد. دیلەکانیش خاچی خۆیان کێشا و ئەو کەسانەی هاتبوون بۆ بەڕێ کردنی کەسەکانیان دەستیان کرد بە گریان. ئەو ژنانەش کە لە نێو عارەبانەکاندا دانیشتبوون، دەنگی گریان و هاواریان بەرز بۆوە. سەربازی سپی پۆش دەورانـدەوری کاروانەکەیان گرتبوو. کاروان وەڕێ کەوت. زرەی زنجیر بەرز بۆوە و تەپوتۆز هەستا.

چەند سەرباز لە پێش هەمووانەوە بوون. بە دوای ئەواندا بەندییە زنجیر لە پێکان لە ڕیزی چوارەمدا بوون؛ بە دوای ئەواندا، سزادراوانی تاراوگە، سزادراوانی کۆمەڵایەتیش کەلەپچە کراو، دەڕۆیشتن، لە دواوەش عارەبانەکان تەقوکوتیان دەهات و بە دوای کاروانەکەدا دەهاتن. ژنەکان وردە وردە هێور بوونەوە؛ یەکیان نەبێ، بە بانگ و سەڵا هاواری دەکرد و دەگریا.

# سی و پێنج

سەر و بنی کاروان زۆر لەیەک دوور بوو. کاتێک دوایین عارەبانە بە تەقوکوت وەڕێ کەوت، سەر کاروان دیار نەبوو. نۆخلیدۆڤ بە سواری هێلینگە لە دوای کاروانەکەوە دەڕۆیشت و بە عارەبانەچییەکەی گوت بە هێواشی شان بە شانی ئەوان بڕوا. دەیویست ماسلۆڤا بدۆزێتەوە و لێی بپرسێ ئەو کەلوپەل و پێداویستییانەی ناردوویەتی، بە دەستی گەیشتووە یان نا، پێویستیشی بە شتێکی تر هەیە بۆی دابین بکات؟

قرچەی گەرمای نێوەڕۆ بوو. هەوا قورس و بێ جووڵە بوو. تەپوتۆزی کاروان هێندەی تر هەواکەی قورس کردبوو و سروەیەک نەدەهات تۆزێ ئەو تەپوتۆزە بڕەوێنێ؛ سەدان کەس بە نێو تەپوتۆز و بە ژێر قرچە و کۆڵەکۆڵی

خۆرەتــاودا دەڕۆیشــتن. نۆخلیــدۆڤ بە ســواری هێلیــنگە شــان بە شــانی کاروانەکە دەڕۆیشتە پێشێ و چاوی لەو ڕیزە دوورودرێژە دەکرد.

هەنگاوەکـان هەڵدەهاتنەوە و دادەنـرانەوە. دەسـتەکان دەچـوونە سـەرێ و دەهــاتنەوە خــوارێ. ڕوخســارەکان نــامۆ بــوون. جــووڵان و ڕۆیشــتنی ئەو کاروانە غەریب و سامناک بوو. نۆخلیدۆڤ هەستی دەکرد ئاپۆرەیەکی بەسام دەبینێ کە لە ناخی ئەفسانەکانەوە دێنە دەرێ و هیچ پێوەندییەکیان بە دنیای مرۆڤەکانەوە نییە. تەنانەت کاتێک چەند دەموچاوی ناسراویشـی لە نێو ئەو ڕێـزە دوورودرێـژەدا دی، ئەو هەسـتە هەروا بە سـەریدا زاڵ بـوو. فێـدرۆڤی پیاوکوژ و ئۆوخۆتینی دز و یەکێک لە هەرزە و بەرەڵلاکـانی دی و ناسـییەوە. بەندییەکان ئاوڕیـان دەدایەوە و بە سەرسـووڕمانەوە چاویـان لێدەکرد کە بە سـواری هێلیـنگە شـان بە شـانی ئەوان دەڕوا. فێـدرۆڤ سـەرێکی بـۆ لەقانـد. ئووخـۆتین چـاوێکی لـێ قرتانـد. هیچیـان سـڵاویان نەکـرد و زمانیـان نەگەڕا؛ چونکە قسە کردن لەگەڵ ئەم و ئەو یاساغ بوو.

کاتێـک نۆخلیـدۆڤ گەیشـتە نزیـک ڕیـزی ژنـان، چـاوی بە ماسـلۆڤا کەوت لە ڕیزی دووهەمـدا بوو. لە ڕیـزی پێش ئەوەوە ژنێکـی ناشـیرین و کوڵەبنە و قەڵەو هەنگـاوی دەنـا و پشـتێنێکی ڕەشـی لە سـەر کراسـە خۆڵەمێشـینەکەی بەسـتبوو. ئەویش «ژیکەڵەی»ی بەناوبانـگ بـوو. لە تەنیشـت ئەویشـەوە ژنێکـی دووگیـان و دوای ئەویـش ماسـلۆڤا بـوو. کـۆڵێکی بە کـۆڵەوە بـوو، چـاوی لە بەرپێـی خـۆی بڕیبوو. ئارام و توندوتۆڵ هەنگاوی دەنـا. کەسـی چـوارەم ژنێکـی ڕەزاسـووک، بە کراسێکی قوڵە و لەچکەوە دەکەوتە بەر چاو، ئەویش فێدۆزیا بوو.

نۆخلیدۆڤ لە هێلینگەکە دابەزی و چـوو بـۆ لای ڕیـزی ژنەکـان، تـا لەگەڵ ماسـلۆڤا قسـە بکـات. پاسـەوانێک کە بە تەنیشـت ڕیـزەکەدا دەڕۆیشـت، بە هەڵەداوان چووە پێشێ و گوڕاندی

ـ بڕۆ دواوە! نزیک بوونەوە لە بەندییەکان یاساغە.

کاتێک هاتە پێشترەوە، کۆنت نۆخلیدۆڤی ناسییەوە، لە بەندیخانە هەموو ئەویان دەناسی. سڵاوی لێکرد و گوتی:

ـ جارێ ڕێگە نییە قسە بکەی، ڕەنگە لە وێستگەی شەمەندەفەر هەلێک هەڵکەوێ.

پاشان ڕووی کردە بەندییەکان و دەنگی هەڵبڕی:

ـ دەی زووکەن، دەی خێراتر.

ئەوەش سەیر بوو لەو هەوا گەرم و قرچەی سوورەتاوەدا، توندوتۆڵ و وریا، بە پوستاڵی نوێوە بە ملاو بە ولادا هەڵدەهات.

نۆخلیدۆڤ گەڕایەوە بۆ سەر شۆستەکە و بە عارابانەچییەکەی گوت هەروا ئارام و لەسەرەخۆ بڕوات و خۆی بە پێیان بەدوای کاروانەکەدا ملی ڕێی گرت.

جار جار تاقمێک بەترس و سەرسووڕمانەوە چاویان لە کاروانەکە دەکرد. هەر کەس بە سواری فەتیوون و هێلینگە لەوێوە تێدەپەڕی بە سەرسامییەوە لەو ڕیزە دووردرێژەی دەڕوانی. ڕێبواران ڕادەوەستان و دەیانڕوانی. هێندێ کەس دەچوونە پێشترەوە و دەیانویست سەدەقەیان بدەنێ، بەڵام سەربازەکان نەیاندە هێشت بیدەن بە بەندییەکان و سەدەقەکەیان لێ دەساندن. هێندێ کەس وەک جادوولێکراو بە دوای کاروانەکەدا دەهاتن و خۆیان لە بیر چووبۆوە.

لە سەر چوار ڕێیانێک، کاروانەکە ڕێی لە تێپەڕینی فەتیونێکی جوان و ڕازاوە گرتبوو. فەتیوونەوان کە پیاوێکی چاو و برۆ گەورە و کەفەڵ پان بوو، کەرکەکەی بە قۆپچە لە دواوە داخستبوو، هەوساری ئەسپەکەی کێشا و فەتیوونەکەی ڕاگرت. لەو فەتیوونەدا ژن و پیاوێک و کوڕ و کچە

چکۆڵەکەیان دانیشتبوون. ژنە کز و سپیکەڵانە بوو. کراسێکی هاورێشمینی لە بەر دا و چەترێکی هەتاویی جوانی بە دەستەوە بوو، مێردەکەی پیاوێکی بۆشناغ و تەڕپۆش بوو. کچەکەیان جوان و ژیکەڵە، دەتگوت تۆپی گوڵە. قژە زێڕینەکەی دەوری دەموچاوی گرتبوو و چەترێکی هەتاویی چکۆڵەی بە دەستەوە بوو. کوڕەکەشیان لاواز و مل درێژ، کڵاوێکی مەنگۆڵەداری تایبەتی دەریاوانەکانی لە سەر نابوو.

ئەو پیاوە تەڕپۆش و خانەدانە، دەنگی هەڵبڕی و داوای لە فەتیوونەوان کرد فەتیوونەکە ڕانەگرێ و بە نێو ڕیزەکەدا تێپەڕێ. ژنەکەی عاجز بوو، چونکە خۆرەتاو لە پێشەوە لە چاوی دابوو. فەتیوونەوانی کەفەڵ پان، نێو چاوانی تێکنا، نەیدەزانی چ بکات. بە زەحمەت هەوساری ئەسپەڕەشەکانی دەکێشا بۆ ئەوەی ڕایانگرێ. پاسەوانی ڕێنمایی کە چاوی بەو فەتیوونە ڕازاوەیە کەوتبوو، دەیویست ڕێگای بۆ بکاتەوە، بەڵام سامی قورس و شوومی کاروانەکە بە سەریدا زاڵ بووبوو و پەشۆکا بوو؛ ناچار سڵاوی لە ژن و پیاوی نێو فەتیوونەکە کرد و ڕێزی بۆ ئەو دوو خودایەی نێعمەت و سامان دانا و دوای کڕنۆشێک دیسان چاوی لە کاروانەکە بڕی؛ ئەو ژن و پیاوە و دوو جگەرگۆشە نازپەروەردەکەیان ناچار بوون لە پشت پەنجەرەی فەتیوونەکەوە چاو لەو کاروانە بکەن و زڕەی زنجیر و شەقوکوتی تایەی عارەبانەکان ببیستن. ژنێکی نەخۆش کە لە سەر کۆڵەپشتییەکانی نێو عارەبانەیەک دانیشتبوو و لە بەر خۆیەوە دەگریا و فرمێسکی هەڵدەوەراند، هەرکە چاوی بەو فەتیوونە ڕازاوەیە کەوت، دیسان دای لە قوڵپەی گریان و بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد.

دوای تێپەڕینی کاروانەکە فەتیوونەوان هەوساری ئەسپەکەی شل کرد و بە ئاماژەیەکی ئەو، ئەسپە ڕەشەکان وەڕێ کەوتن. بە لۆقە دەڕۆیشتن و

زەبری سیمیان لە سەر سەنگفەرشی شەقامەکە دەنگی دەدایەوە و دەبوو بەزایەڵەیەکی یەکهاوی. ئەو فەتیوونە خانم و مێرد و منداڵەکانی دەبرد بۆ سەیرانگایەکی دەرەوەی شار. ئەو ژن و پیاوە سامانداره سەبارەت بەو کاروانە شوومە نەدوان و کچ و کوڕەکەشیان هەر کام لە زەینی خۆیاندا و بە ئەقڵی خۆیان ئەوەی دیتبوویان شرۆڤەیان دەکرد. کچۆڵەی کەزیە زێڕین پێی وابوو ئەو تاقمە لە چینی دایک و باوک و خزمەکانی ئەوان نین و دەبێ ئەوانە کەسانێکی هەرز و ئاژاوەچی بن بۆیە ئاوا گیریان خواردووە و تووشی ئەو بەڵایە هاتوون. خۆشحاڵیش بوو کە کاروانەکە لێیان دوورکەوتۆتەوە و ئیتر ئەو مرۆڤە خراپکار و ناڕەسەنانە نابینێ. بەڵام کوڕەکەیان کە بەتەمەنتر بوو، چاوی لە کاروانەکە بڕیبوو و دەتگوت پێی ئیلهام کراوە کە ئەو بوونەوەرە چارەڕەشانەش دەبێ مرۆڤ بن و نابێ ئاوا خراپ و بێ بەزیییانە ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن. سەری تاشراو و پێی پەتی و زنجیر تێکراوی ئەو دیلانە ترسی شکاندبووە گیانی و خستبوویە بیر و خەیاڵەوە، هەر بۆیە سەری بە خوزداگرتبوو و لێوی داچۆڕابوو؛ دڵی پڕ بووبوو و دەیویست دەست بکات بە گریان، بەڵام ددانی بە خۆیداگرت؛ چونکە پێی عەیب بوو بگری.

# سی و شەش

نۆخلیدۆڤ هەروا بە پێیان بە دوای کاروانەکەدا دەڕۆیشت . ئەگەر چی کراسێکی تەنکی لە بەردابوو. هەستی بە گەرما دەکرد. هەوا کەی قورس و گەرم، تەپوتۆز وڵاتی داگرتبوو و نەدەڕەوی. دەتگوت ئاور دەبارێ. ناچار سواری هێلینگەکەی بوو و پێش کاروانەکە کەوت.

هێندێ جار دەکەوتە بیری خوشکی و زاواکەی کە دڵی ڕەنجاندبوون، بەڵام ئەو بیرە زۆر زوو لە مێشکی دوور دەکەوتەوە. ئەوەی لە دەوروبەری تێدەپەڕی، شوێنێکی قووڵی لە سەر ڕۆحی دادەنا. ئەگەرچی وردە وردە خووی بەو کاروانە شوومە گرتبوو، بەڵام گەرما زۆری ئازار دەدا. لە ژێر سێبەری دارێک چاوی بە دۆندرمە فرۆشێکی گەڕۆک کەوت کە هەڵتروشکابوو و دۆندرمەی بە دوو قوتابی دەفرۆشت[٧١]. یەکێک لە منداڵەکان دۆندرمەکەی وەرگرتبوو و زمانی پێدا دەهێنا، ئەوی دیکەشیان چاوەڕێ بوو وەریگرێ.

71 ـ دۆندرمە فرۆشە گەڕۆکەکان ئەو سەردەمە، دەفری دۆندرمەیان لە زەمبیلەیەک دەخست و لە سەر سەریان دادەنا و کاتێک تووشی کڕیارێک دەبوون، هەڵدەترووشکان تاکوو زەمبیلەکە لە سەر سەریان داگرن.

نۆخلیدۆڤ داوای لە عارەبانەچییەکە کرد لە شوێنێک ڕایگرێ بۆ ئەوەی بتوانی تۆزێ دانیشێ و شتێک بخواتەوە. عارەبانەچی بردی بۆ کۆلانێکی ئەو دەوروبەرە کە تابلۆی گەورەی کافتریاکە لە دوورەوە دیار بوو.

بەرپرسی کافتریاکە قەڵەو و پەنەمیو، لە پشت خوانچەکە دانیشتبوو. کورسییەکان خالّی بوون، تەنیا دوو کەس لە سووچێک دانیشتبوون؛ یەکیان چایی دەخواردەوە و ئەوی دیکەشیان ساردی، پێکەوە قسەیان دەکرد. دوو پێشخزمەتی کافتریاکە بە بەروانکەی ڕەنگ بواردووەوە، کاتێک چاویان بە کۆنت نۆخلیدۆڤ کەوت کە ئاوا پیاوێکی ڕێکوپێک و بۆشناغە، بە هەڵەداوان چوون بۆ لای. ئەم پیاوە لەگەڵ مشتەرییە ئاساییەکانی دیکەی کافتریاکە زۆر جیاواز بوو. کۆنت نۆخلیدۆڤ لە سووچێک دانیشت و داوای ئاوی ساردی کرد. چاوێکی لە سەرپۆشی مێزەکە کرد، زۆر پیس بوو. لە هەر شوێنێکی دەڕوانی، چاوی لە سەر یەکێک لەو دوو پێشخزمەتە دەگیرسایەوە. یەکیان سەرساف و ڕیش درێژ، بەو ڕدێنە ڕەشەوە زۆری شێوەی مێردەکەی خوشکی دەدا. دیسان خوشکی و مێردەکەی خوشکی وەبیر هاتەوە. داوای لە پێشخزمەتەکە کرد کاغەز و پاکەت و پوولی پۆستەی بۆ بێنی، تاکوو شتێک بۆ خوشکی بنووسێ و داوای لێبوردنی لێ بکا. بیری کردەوە؛ دەبێ چی بنووسێ؟ پەشۆکابوو. نامە نووسین زۆر دژوار بوو بۆی. قەڵەمەکەی لە سەر کاغەزەکە دانا: «ناتالیای خۆشەویست! بەر لە سەفەر چەند وشەیەکت بۆ دەنووسم؛ چونکە دەترسم دڵی تۆم ڕەنجاندبێ...» ئیتر قەڵەمەکەی نەدەجوولا. بیری کردەوە: «ئەگەر داوای لێبوردن بکەم بۆ ئەو قسانەی کردوومە، ڕۆگۆژینسکی پێی وادەبێ لە قسەی خۆم پاشگەز بوومەتەوە و دەستم لە بیروباوەڕەکانم هەڵگرتووە. لە لایەکیشە ئەو پیاوە دەیویست خۆ لە کاروبارەکانم وەردا و دەیویست ڕێوشوێنم بۆ بکێشێ. نا!

نابێ هیچ بنووسم!» دیسان بێزاری لە مێردەکەی خوشکی دڵی داگرت. کاغەز و پاکەتەکەی خستە گیرفانی و پاداشی دابە پێشخزمەتەکە و بە سواری هێلینگە بە دوای کاروانەکەدا کەوتەڕێ. گەرماکە زیاتر بووبوو. دار و دیوار ئاوری لێ دەباری. نۆخلیدۆڤ هەستی کرد ئەو دەستگیرەیەی دەستی لە سەر داناوە، دەستی دەسووتێنێ. بارگینەکان بەزەحمەت لۆقەیان دەکرد. یەکێک لە بارگینەکان دەشەلی. عارەبانەچی وەنەوزی دەدا. نۆخلیدۆڤ چاوی لە پێش خۆی کرد. لە بەر بینایەکی بەرز تاقمێک کۆبووبوونەوە. سەربازێکی چەک لە شان لە نێو خەڵکەکەدا وەبەر چاو دەکەوت. هێلینگەکە ڕاوەستا. نۆخلیدۆڤ دابەزی و لە دەرگاوانی بیناکەی پرسی چی ڕووی داوە؟ دەرگاوانەکە گوتی:

ـ بەندییەک لێرە بووراوەتەوە و کەوتووە بەزەویدا.

نۆخلیدۆڤ چووە پێشێ. لە سەر سەنگفەڕەشە ڕەق و پڕ کەندولەندەکە، کەسێک تخێڵ بووبوو. زۆر جحێڵ نەبوو. پیاوێکی شان و مل پان و ڕیش خەنەیی و دەموچاو پەنەمیو بوو. کراسی خۆڵەمێشینی بەندیخانەی لە بەردابوو. کەوتبووە هەناسەبڕکێ و دەینالاند. پاسەوانێک لە ژوور سەری ڕاوەستا بوو. چەند کەس دەوریان گرتبوو، یەکیان نامەبەر و یەکی دیکەشیان نووسیار بوو، پیرێژنێکیش بە چەترێکی هەتاوییەوە، کوڕێکی مێرمنداڵ بە سەری تاشراوەوە و چەند کەسی دیکە.

نووسیار بۆ نۆخلیدۆڤی باس کرد کە «ئەوانەلە زیندان هێز و تەندروستییان لە دەست دەدەن و ئێستاش کەس نازانێ بەم قرچە قرچی گرمایە ئەو خەڵکە نەخۆش و داماوانە بۆ کوێ دەبەن؟» پیرێژنەکە دەستی کرد بە گریان و گوتی:

ـ بێچارە خەریکە دەمرێ!

نامەبەر ئاماژەی بە پاسەوانەکە کرد کە قۆپچەی کراسەکەی بکاتەوە بۆ ئەوەی باشتر هەناسە بکێشێ، پاسەوان بە قامکە ئەستوورەکانی، ملیوانەی بەندییەکەی گرت و قۆپچەکانی کردەوە، ملی سوور و پڕ ماسوولکەی بەندییەکە وەدەرکەوت. پاسەوانەکە داوای لە خەڵکەکە کرد بکشێنە دواوە.

ـ بڕۆنە دواوە، ئێرە چۆڵ کەن، هەواکەی زۆر گەرمە. بڕۆنە دواوە با هەوایەک لێیدا.

نووسیار زانیاریی یاسایی خۆی بەڕووی خەڵکەکەدا دەدا:

ـ دەبێ ڕاوەستن هەتا پزیشکی یاسایی دێ و چاوی پێی دەکەوێ. نابێ ئەو بەندییە کەلەلایە بنێرن بۆ تاراوگە.

پاسەوان دیسان بەرۆکی کراسی بەندییەکەی ئاوەڵاتر کرد و گوتی:

ـ لە سەری مەڕۆ! بڕۆن بە دوای کاری خۆتاندا. ئەوە ئەرکی خۆمانە و دەزانین چ بکەین.

پاسەوانەکە پێی وابوو سەربازی چەک لە شان بڵاوە بە خەڵکەکە دەکات بەڵام سەربازەکە بنی کەوشەکەی کون بووبوو و دایکەندبوو، خۆی پێوە خەریک کردبوو و کاری بە کاری هیچ کەس نەبوو. هەرکەس شتێکی دەگوت.

ـ نابێ بهێڵن خەڵکی ئاوا لەنێو بچن.

ـ هەرچییەک بێ بەندییش ئینسانە.

نۆخلیدۆڤ دەیگوت چۆرێکی ئاوی سارد بدەنی و پاسەوانەکە دەیگوت دەرگاوانی بیناکە چووە ئاو بێنێ. هەر کەس قسەیەکی دەکرد و چەند کەسی دیکەش هاتن و کۆبوونەوە، لە ناکاو هاوارێک بەرز بۆوە. ملازمی ئاسایش بوو.

ـ هۆی! بۆ لەوێ کۆبوونەتەوە و قەرەباڵغتان ساز کردووە؟

تۆزێ هاتە پێشترەوە و لە پاسەوانەکەی پرسی چی ڕووی داوە؟ پاسەوان گوتی ئەو پیاوە لەگەڵ بەندییەکانی تاراوگە بووە، بەڵام لێرەدا بووراوەتەوە و کەوتووە بەزەویدا. فەرماندەری کاروان دەستووری داوە هەر لێرە بمێنێتەوە هەتا تەکلیفی ڕوون دەبێتەوە.

ـ دەبێ بیبەین بۆ پۆلیسخانە. هۆی! هێلینگەیەک بانگ کەن.

نووسیار دیسان دەیویست قسەیەک بکات کە ملازم گوڕاندی بە سەریدا:

ـ پێوەندیی بە هیچ کەسەوە نییە؛ بڕۆن بە دوای کاری خۆتاندا!

بە تووڕەیی چاوێکی لێکرد و نووسیار حسابی کارەکەی هاتە دەست و ئیتر متەقی نەکرد. نۆخلیدۆڤ دیسان پێداگریی دەکرد چۆڕێ ئاو بدەن بە بەندییەکە. ملازم چاوێکی لە سەرتاپای کرد و هیچی نەگوت. لەو کاتەدا دەرگاوان دۆلکەیەک ئاوی هێنا و پاسەوانەکە لێی وەرگرت و سەرەتا دەیویست ئاو بکاتە دەمی نەخۆشەکەوە؛ بەڵام ئەو نەیدەتوانی بیخواتەوە و لە بەر ناڵەناڵ بۆی قووت نەدەچوو. ملازمی ئاسایش ئاماژەی کرد ئاوەکە بکەن بە سەریدا. پاسەوان کڵاوەکەی لە سەری بەندیی نەخۆش داکەند و دۆلکە ئاوەکەی کرد بە سەر بێ تووکەکەیدا. ئاو بە سەر و دەموچاویدا هاتە خوارێ و شان و مل و سنگی خووساند. ئەو داماوە چاوی زەق کردەوە و سەری جووڵاند، بەڵام جەستەی هەروا بێ جووڵە بوو. هێلینگەکەی نۆخلیدۆڤ لەوێ ڕاوەستا بوو. ملازم بانگی عارەبانەچییەکەی کرد:

ـ وەرە پێشێ!

ـ مسافیرم پێیە!

نۆخلیدۆڤ بە ملازمی ئاسایشی گوت کە ئەو هێلینگەیە من گرتوومە و دەتوانن نەخۆشەکەی پێ ببەن. بە ئاماژەی ملازم، پاسەوان و سەرباز و دەرگاوانەکە دەستیان دایە و نەخۆشەکەیان خستە نێو هێلینگەکەوە.

نەخۆشەکە نەیدەتوانی بە دانیشتنەوە خۆی ڕاگریێ. ملازم گوتی وا باشترە لە سەر لاتەنیشت ڕایکێشن، بەڵام پاسەوانەکە ڕێگایەکی باشتری دۆزییەوە و گوتی:

ـ لە پەنای دادەنیشم و دەیگرم، ناهێڵم بکەویێ.

ملازم کڵاوی بەندییەکەی لە سەر شۆستەکە هەڵگرتەوە، دایە دەست پاسەوانەکە و دەستووری بە عارەبانەچی دا وەریێ بکەویێ. سەربازەکەش کەوشە ژێر کونەکەی لەپێ کرد بۆوە و بە دوای هێلینگەکەدا کەوتە ڕیێ. عارەبانەچی جار جار ئاوڕی دەدایەوە و بە چاوێکی تەوساوی لە مسافیرەکانی دەڕوانی. نۆخلیدۆڤیش بە پێیان بەرە و دایرەی پۆلیس ملی ڕێی گرت.

# سی و حەوت

گەیشتنە دایرەی پۆلیس. لە بەر دەرگاکە، فەرمانبەرێکی ئاگرکوژێنەوە و پاسەوانێکی کڵاوخوود لە سەر، کێشکیان دەدێرا. هێلینگە چووە حەوشەی پۆلیسخانە و لە نزیک قاڵدرمەکان ڕاوەستا، لە حەوشەی پۆلیسخانە فەرمانبەرانی ئاگر کوژێنەوە قۆڵیان هەڵکردبوو، خەریکی گاڵتە و جەفەنگ بوون و کەلوپەل و کەرەسەی کارەکەیان ئامادە دەکرد. چەند پاسەوان کە چاویان بە هێلینگەکە کەوت، بە هەڵەداوان چوون بۆ لای و دەست و لاقی بەندییە کەلەلاکەیان گرت و بردیان. ئەو پاسەوانەی سواری هێلینگەکە بووبوو، دابەزی؛ دەستی ماندووی مێروولەی دەکرد، جووڵاندی و خاچی

خۆی کێشا؛ پاشان لەگەڵ نۆخلیدۆڤ بەدوای بەندییەکەدا چوون بۆ نهۆمی سەرێ.

چوار قەرەوێڵەیان لە ژوورێکی چکۆڵ ەو پیسدا دانابوو. لە سەر دوو تەختیان دوو نەخۆش کەوتبوون کە یەکیان سیلدار بوو، ئەوی دیکەشیان سەر و ملی پێچرا بوو. بەندییەکەیان لە سەر تەختێکی تر دانا. پیاوێکی خڕیلانەش لە سووچی ژوورەکە ڕاوەستا بوو چاوی کسکەی دەهات و بڕۆی هەڵدەتەکاند؛ تەنیا ژێر کراسێکی لە بەردا بوو؛ لە پەستا قاقای دەکێشا و تفی دەکردەوە. چاوی لە نۆخلیدۆڤ کرد و گوتی:

ـ دەیانهەوێ بمترسێنن، بەڵام کێ دەوێرێ کاری وابکا؟ سەرۆکی پۆلیسخانە و پزیشکی ڕێگەپێدراو پێکەوەهاتن. پزیشک چوو بۆ لای قەرەوێڵەی بەندییەکە. دەستی زبر و پڕ لە خاڵ و پەڵەی سووری نەخۆشەکەی هەڵێنا و بەری دا. دەستی شلی بەر بۆوە و کەوتە سەر زگی. چاوی لە ملازم کرد و گوتی:

ـ تەواو بووە.

بۆ ئەوەی دڵنیا بێ، کراسە تەڕەکەی هەڵدایەوە و گوێی بە سینگ و زگە هەڵماسیوەکەیەوە ناو چاوی لە ژێر پێڵووی چاوی کرد. چاوەشین و گەورەکانی نە شاد بوون و نە خەماوی. شێتە خڕیلانەکە دیسان هاتە پێشێ، تفێکی کرد و گوتی:

ـ هیچ کەس ناتوانێ من بترسێنێ، ناوێرن بمترسێنن.

سەرۆکی پۆلیسخانە لە پزیشکەکەی پرسی دەبێ چیبکەن؟ پزیشکی ڕێگەپێدراو گوتی:

ـ بیبەن بۆ ژێرخانەکە؛ مردووەکانیان لەوێ کۆکردۆتەوە!

ـ دیسان پشکیننی بۆ بکە؛ ڕەنگە زیندوو بێ.

ـ مردووە؛ من کاری خۆمم کردووە. دوکتۆر ئیڤانۆڤیچیش لە ژێر خانەکە پشکنینی بۆ دەکا.

بە ئاماژەی ملازم چەند پاسەوان هاتن و تەرمەکەیان بردە دەرێ. بە سەربازەکەشی گوت بچێت بۆ نووسینگەی پۆلیسخانە و سووڕەت جەلەسەکە واژۆ بکات. سەربازەکە بۆ ڕێز لێنان دەستی بردە لای لاجانگی و گوتی:

ـ بە چاوان گەورەم!

نۆخلیدۆڤیش بە دوای پاسەوانەکاندا چووە دەرێ و ڕۆیشت بۆ ژێرخانەکە بۆ ئەوەی بزانێ لەوێ چ باسە. بەڵام سەرۆکی پۆلیسخانە پێشی پێگرت و گوتی:

ـ ئێوە چکارەن بەڕێز؟

ـ هیچ جەنابی ملازم.

ـ کەوایە بڕۆ بە دوای کاری خۆتا.

کاتی چوونە دەرێ شێتە وردیلەکە هاتە پێشێ و گوتی:

ـ چاکە وادیارە تۆ لە پیلان داڕێژەکان نیی! کەوایە جگەرەیەکم بدەیە.

نۆخلیدۆڤ جگەرەیەکی پێدا. شێتەکە بۆی باس کرد کە تاقمێک پیلانیان بۆ داڕشتووە و تووشی ئەم دەردەیان کرووە. نۆخلیدۆڤ داوای لێبوردنی لێکرد و بێ ئەوەی گوێ بۆ درێژەی سەربردەکەی ڕاگرێ، لە ژوورەکە چووە دەرێ. هێلینگەکە لە بەر دەرگای دەرێ چاوەڕوانی ئەو بوو. عارەبانەچی وەنەوزی دەدا. خەبەری کردەوە و داوای لێکرد بڕوات بۆ وێستگەی شەمەنەدەفەر. هێشتا سەد هەنگاو دوور نەکەوتبوونەوە. عارەبانەیەکیان دی تەرمێکی دیکەی پێبوو دەیبرد بۆ پۆلیسخانە. پاسەوانێک و سەربازێکی چەک لە شان بە دوای عارەبانەکەدا دەڕۆیشتن. تەرمەکەیان لە سەر تەرکی

عارەبانەکە لە سەر پشت ڕەکێشابوو و کڵاوەکەیان لە سەر دەموچاوی دانابوو.

نۆخلیدۆڤ ئاماژەی بە عارەبانەچییەکە کرد ڕاوەستێ و خۆی دابەزی و بە دوای عارەبانەکەدا ملی ڕێی گرت. دیسان گەیشتنەوە پۆلیسخانە. ئاگر کوژێنەوەی کێشک هەروا چاوەڕوان بوو. لە حەوشەی پۆلیسخانە چەند پاسەوان بە هەڵەداوان هاتن و تەرمەکەیان برد بۆ نهۆمی سەرێ. لە حەوشە فەرمانبەرانی ئاگرکوژێنەوە عارەبانەکەیان شۆردەوە و پاسەوانێک هەوساری ئەسپێکی کوێتی گرتبوو بە حەوشەکەدا دەیگێڕا؛ ئەسپەکە تۆزێ دەشەلی. سەرۆکی پۆلیسخانە پاسەوانەکەی بانگ کرد و جنێو بارانی کرد.

ـ کوڕی کەری لە کەر بووا! ئەو ئەسپە بە قەد دە کەسی وەک تۆ نرخی هەیە؛ چ بەڵایەکت بە سەر هێناوە ئاوا دەشەلێ؟

نۆخلیدۆڤ گوێی بەو شتانە نەدەدا. بە دوای تەرمەکەدا ڕۆیشت بۆ نهۆمی سەرێ. پاسەوانێک لێی پرسی کاری بە کێیە؟ گوێی پێ نەدا و لەگەڵ تەرمەکە خۆی کرد بە ژووری چوار قەرەوێڵەدا. شێتی وردیلە خەریکی کێشانی ئەو جگەرەیە بوو کە نۆخلیدۆڤ پێیدا بوو.

ـ پێیان وایە منداڵم؛ من لە هیچ شتێک ناترسم!

نۆخلیدۆڤ چاوی لە تەرمەکە بوو؛ کڵاوەکەیان لە سەر دەموچاوی لابرد بوو. لاوێکی تازە پێگەیشتوو بوو. سەریان تاشیبوو. نێوچاوانی تەسک و ساف، چاوی بە مۆلەق وێستابوون؛ زۆر جوانچاک بوو. لووتی باریک و گوێچکەی چکۆڵە، ماسوولکەکانی توند و تۆڵ و پتەو، نۆخلیدۆڤ لاوێکی ئاوا جوانچاکی زۆر کەم دیتبوو.

ملازم لە پاسەوانی پرسی:

ـ لە کوێ هێناتان؟

ـ گەورەم! لە جادەی گۆرباتۆڤسکایا.

ـ زیندانییە؟

ـ بەڵێ؛ بەزنجیرەکانی لاقیدا بۆم دەرکەوت زیندانییە.

دوکتـۆر ئیڤـانۆڤیچ ئەمجارەیـان خـۆی تەرمەکەی پشـکنی. ئەو لاوە قەویوقۆڵ و قەڵەو، چاکەتێکی هەوریێشمینی لە بەردا بوو. ماسوولکەی لاقی لە دەرەلنیگـی پـانتۆڵە تەنـگەکەیەوە دەرکەوتبـوو. مـلازم هەوای لە سـینگیدا ڕادەگـرت و زۆر بە نەرمـی دەریـدەدایەوە؛ بەردەوام هەناسـەی قـووڵی هەڵدەکێشا. دوکتۆر چەند جاری دەستی گەنجەکە هەڵێنا و بەریدا.

ـ تەواو بووە!

سەربازی چەک لە شان داوای لە ملازم کرد ڕێگەی پێبدا ئەو زنجیرانە لە لاقی مردووەکە بکاتەوە. ملازم گوتی:

ـ بیبەن بۆ ژێرخانەکە؛ ئاسنگەر دێ هەر لەوێ زنجیرەکانی دەقرتێنێ.

ملازم هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشـا. نۆخلیدۆڤ هۆی مردنـی گەنـجەکەی لە دوکتۆر پرسی. دوکتۆر وەڵامی دایەوە:

ـ گەرماژۆ بووە. بە درێژایی زستان لە شوێنێکی داخراودا بووە و تیشکی خۆری وێنەکەوتووە؛ دیارە بەرگە ناگرێ. هۆی مردنەکەشی ئەوەیە.

ـ ئەو بەندییە بەستەزمانانە بۆ ئاوا لێدەکەن؟

ـ برۆ لە خۆیان بپرسە؛ ڕاستی جەنابت کێی؟

ـ کابرایەکی ڕێبوار.

ـ خۆشحاڵم بە بینینت. بەڵام بەداخەوە دەرفەتم نییە لەوە زیاتر لە خزمەت تۆی ڕێبواری دڵسۆزدا بم.

پیاوێکی زمانخۆش بوو. حاڵی نەخۆشـە سـەر و مل پێچراوەکەی پرسـی. شێتەکەش مژی لە جگەرەکەی دەدا و تفی دەهاویشت.

کۆنت نۆخلیدۆڤ لە پۆلیسخانە هاتە دەرێ. فەرمانبەرێکی ئاگر کوژێنەوە و پاسەوانێکی کڵاوخوود لە سەر نۆبەدار بوون. سواری هیلینگەکە بوو و داوای لە عارەبانەچییەکە کرد بڕوات بۆ وێستگەی شەمەندەفەر.

# سی و هەشت

زیندانییەکانیان سواری ڤاگۆنێک کرد بوو، لاجامەی پەنجێرەکانی پۆڵایین بوون. تاقمێک لە خزموکەسی بەندییەکان لە سووچێک کۆبووبوونەوە و بە هیوا بوون کەسەکانی خۆیان ببینن؛ بەڵام سەربازەکان ڕێگەیان پێنەدەدان و نەیاندەهیشت هیچ کەس لە شەمەندەفەرەکە نزیک ببێتەوە. لە مەودای نێوان بەندیخانە و وێستگەدا پێنج کەس لە بەندییەکان گیانیان لە دەست دابوو، بەڵام نۆخلیدۆڤ تەنیا دوو کەسیانی دیتبوو. سێ کەسەکەی دیکەش یەکیان ڕاگویستبوو بۆ پۆلیسخانە و چوارەمی و پێنجەمیش لە وێستگەکە مردبوون و تەرمەکەیان هێشتا هەر لەوێ لە سەر زەوی کەوتبوو[٧٢].

سەربازەکان گوێیان لەو شتانە بوو و مەرگی ئەو پێنج کەسە بەلایانەوە گرینگ نەبوو. تەنیا شتێک کە بیریان لێدەکردەوە بەڕێوەبردنی یاسا و ڕێسا و ڕێوشوێنە تەشریفاتییەکان بوو. بۆ هەر مردوویەک لەڕێوە سوورەت جەلەسەیان سازدەکرد و ناوەکەیان لە لیستی ئەو بەندییانەدا خەت دەکێشا

72 ـ ئەم ڕووداوە ڕاستەقینەیە؛ ساڵی1880 پێنج کەس لە بەندییەکان لە ڕێگای زیندانی بووتیرکی Boutyrki هەتا وێستگەی شەمەندەفەر گیانیان لە دەست دا.

که دەبــوو ڕادەســتی کاربەدەســتانی نیژنــی نۆگــۆرۆد بکــرێن. لەو گەرمــا تاقەتپڕووکێنەدا، سووکترین کاریش دژواری دەنواند.

نۆخلیــدۆڤ بــۆی دەرکەوت بە ڕێــگەی یاســاییدا نزیــک بــوونەوە لە بەندییەکان ناکرێ، هەر بۆیە بەرتیلی دا بە عەریفێک و مۆڵەتی لێ وەرگرت؛ بە مەرجێـک زوو کـارەکەی جێبەجـێ بکـات و بەرلەوەی ملازمـی فەرمانـدەر پێبزانێ، بگەڕێتەوە شوێنەکەی خۆی.

هەژدە ڤــاگۆن پــڕ کــران لە زینــدانی. ڤاگۆنێکیشــیان بــۆ فەرمانــدەر و هاوڕێکانی دانابوو. نۆخلیدۆڤ هەرواکە بە پاڵ ڤاگۆنەکاندا دەڕۆیشـتە پێشـێ، گـوێی بـۆ بەنـدییەکان ڕاگرتبـوو. زڕەی زنجیـر دەهـات. دەنگـی دەمەقـاڵێ و هەراوهۆریا دەهات جنێوی زۆر خەستوخۆڵیان بە یەک دەدا و کێشـەکەیان لە سەر کۆڵەبار و ئاوی خواردنەوە و جێگەی دانیشتن بوو. هیچ کەسیش باسـی ئەو کەسـانەی نەدەکرد کە لە ڕێگـا مردبـوون. چـاوی لە نێـو ڤاگۆنێـک کـرد. سەربازێک دەستبەندە ئاسنینەکانی بە کلیل دەکردەوە و سەربازێکی تـر کـۆی دەکردنەوە. لە ڤاگۆنی پیاوان تێپەڕی و گەیشـتە ڤـاگۆنی ژنـان. لە ڤـاگۆنێکەوە دەنگی ناڵەناڵ دەهات. لە لای ڤاگۆنی سێهەم ڕاوەستا. بەو ناونیشـانەدا کە لە عەریفی وەرگرتبـوو، هەسـتی دەکـرد ماسـلۆڤا دەبـێ لەو ڤـاگۆنەدا بـێ. هەوای گەرم و هوڵمی هەناسـە و بۆنی ئـارەقەی لەش پێکەوە ئـاوێتە بووبـوون و بە کەلێنـی شیشــەبەندەکاندا دەهــاتە دەرێ. چەنــد ژن کە لە پــاڵ پەنجیــرەکەدا دانیشتبوون،چاویان لە نۆخلیدۆڤ بڕیبوو. ماسلۆڤا لە تەنیشـت پەنـجەرەکەی ڕووبەڕوو بوو. فێدۆزیای لێو بەبزەش بە هەنیشـکی تێـی دەکوتـا. ماسـلۆڤا لە جێـی خـۆی هەسـتا، لەچـکەکەی لە سـەر و قـژە ڕەشـەکەی پێچـایەوە[٧٣].

73 ـ ژنانی بەندی هەقیان نەبوو لەچکە لە سەریان بکەنەوە.

دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو. ئارقەی پێدا دەهاتە خوارێ. هات بۆ بەر پەنجەرەکە، زەردەیەکی گرت و گوتی:

ـ هەواکەی چەندە گەرمە.

ـ ئەو شتانەی ناردبووم، گەیشتن؟

ـ هەمووی گەیشت؛ زۆر سپاس.

ـ هیچی ترت پێویست نییە؟

ـ نا، هیچم ناوێ.

ڤاگۆنەکان وەک تەندوور گەرم داهاتبوون. فێدۆزیا هاتە پێشێ و گوتی:

ـ ئەگەرم چۆڕێکمان ئاو بدەنێ، پیاوەتی دەکەن.

ـ تائێستا ئاویان نەهێناوە؟

ـ هێنایان، لەڕێوە چۆڕەیان لێ بڕی.

ـ دەبێ بە سەربازەکان بڵێم ئاو بهێنن. لێرەوە هەتا نیژنی نووگۆرۆد یەکتر نابینین.

ماسلۆڤا گەشابۆوە؛ بەڵام نەیدەویست وەڕووی خۆی بێنێ.

ـ مەگین ئێوەش دێن؟

ـ بە شەمەندەفەری دوایی دێم.

ماسلۆڤا هیچی نەگوت. هەناسەیەکی هەڵکێشا. کرابلۆڤا کە قەڵافەتی لە پیاوان دەچوو، دەنگیشی وەک پیاوان گڕ و نێر بوو، هاتە پێشەوە و گوتی:

ـ دەڵێن دوازدە کەس لەو بستە ڕێیەدا مردوون. ئەو بێ ویژدانانە سەری هەموومان بە گۆمدا دەکەن.

نۆخلیدۆڤ پرسیی ژنەکانیش گیانیان لە دەست داوە؟ ژنێکی کورتە باڵا بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ ژنـان بە هێزتـرن؛ هەموویـان وەک گـوێزی ئـازا وان، بەڵام ژنێـک لەو ڤاگۆنەی تەنیشتدایە خەریکە منداڵی دەبێ. لە پەستا دەناڵێنێ.

ماسلۆڤا خۆی گرژ کرد و گوتی:

ـ ئەگەر بەر پرسەکان دەناسی، پێیان بڵێ بێن بە هانای ئەو ژنەوە.

ـ هەر ئێستا دەچم پییان دەڵێم.

ـ تاراسی مێردی فێدۆزیا لەگەڵ ئێوە نییە؟

پاســـەوانێک کە لە دوورەوە نۆخلیـــدۆڤی دیبـــوو، هـــات بـــۆ لای و لە ڤاگۆنەکەی دوور خستەوە.

ـ بەڕێز! قسە کردن لەگەڵ بەندییەکان قەدەغەیە.

ئەم پاسەوانە ئەو کەسە نەبوو کە بەرتیلی وەرگرتبوو و ڕێگەی پێدابوو! نۆخلیدۆڤ ناچار گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی تاکوو فەرماندەر بدۆزێتەوە، بەڵکوو بتوانێ مۆڵەت بۆ تاراس وەرگرێ لەگەڵ ژنەکەی بڕوا و بە هانای ئەو ژنەشـــــەوە بچـــــن کە ژان گرتـــــوویەتی؛ بەڵام بـــــۆی نەدۆزرایەوە. سەربازەکانیش تاقەتیان نەبوو وەڵامی بدەنەوە. یەکێک بەندییەکانی بەملاو بەولادا دەبرد، یەکێک دەچوو خواردن و خواردنەوەی دەکڕی، یەکێکی تر کەلوپەلی دەهێنا و دەیخستە نێو ڤاگۆنەکانەوە. هەر کەسەی سەرقاڵی کارێک بوو. چەند سەربازیش لە خزمەتی خانمێکدا بوون کە بڕیار بوو لەگەڵ فەرماندەر هاوسەفەر بێ!

نۆخلیدۆڤ، کاتێک دووهەمین هۆڕنی شەمەندەفەرەکەی بیست، چاوی بە فەرماندەر کەوت بە دەستە قوڵەکانی سمێڵی دەسڕی و جنێوی بە عەریف دەدا. بە بێ ڕاوەستان بە فەرماندەری ڕاگەیاند کە ژنێک لە ڤاگۆنێکدا ژانی منداڵ بوون گرتوویەتی.

ـ دەی دەزێ بابزێ؛ خۆ ئێمە ڕێگەمان لێ نەگرتووە!

شــەمەندەفەر خەریــک بــوو وەڕێ دەکەوت. فەرمانــدەریش ســوار بــوو. بەرپرســی شــەمەندەفەر دوایــین هــۆڕنی لێــدا. تاقمێــک کە لە ســووچێک کۆبووبوونەوە، بێ ئەوەی بتوانن لەگەڵ کەسەکەی خۆیان قسە بکەن دیتیان شەمەندەفەرەکە ڕۆیشت. ژنان دەستیان کرد بە گریان. نۆخلیدۆڤ و تاراس لە لای یەک ڕاوەستابوون و چاویان لە ڕۆیشتنی شەمەندەفەرەکە بڕیبوو. ســەرەتا ڤاگۆنەکــانی پیــاوان بە پێشــیاندا تێــپەرین. بەنــدییەکان بە ســەری تاشــراوەوە لە پشــت شیشــبەندە پۆلایینەکــانەوە دەیــانڕوانی. دوای ئەوە، ڤاگۆنەکــانی ژنــان هــاتنە پێشــێ، هێنــدێکیان لەچکەیــان بە ســەردا دابــوو. هێندێکیشــیان ســەر و قژیــان ڕووت کردبــوو. لە ڤــاگۆنێکەوە دەنگــی نــاڵە و هاواری ژنێک دەهات کە ژانی منداڵ بوون حەجمانی لێ هەڵگرتبوو.

لە سێهەمین ڤاگۆنی ژناندا، ماسلۆڤا لە پاڵ پەنجەرەکەدا ڕاوەستابوو و بە بزەیەکی بەزەیی بزوێنەوە لە نۆخلیدۆڤی دەڕوانی.

# سی و نۆ

شەمەندەفەری دوایی دوو سەعات دواتر وەڕێ دەکەوت. نۆخلیدۆڤ لە بیری ئەوەدا بوو لەو ماوەیەدا بچێ سەرێکی خوشکی بدات، بەڵام ئەوەی لە بەیانییەوە هەتا ئێستا دیتبووی، زۆر وەڕەز و بێ تـاقەتی کرد بـوو. لە سـەر کورسـییەکی ڕیستۆرانی نمرەیەکی شـەمەندەفەرەکە دانیشـت کە تۆزی پشـوو بدات. هەسـتی کـرد پێڵـووی چـاوی قـورس بـووە و هەر بەو جـۆرە خەوی لـێکەوت. کاتێـک وەخەبەر هــات و چــاوی هەڵێنــا، دیتــی پێشــخزمەتێک بە جلــوبەرگی ڕەش و خاولییەک بە دەستەوە، لە هەمبەریدا وێستاوە و بانگی دەکا.

ـ گەورەم! گەورەم! جەنابت کۆنت نۆخلیدۆڤی؟ خانمێک هاتووە و بەدواتدا دەگەڕێ!

نۆخلیدۆڤ دەستێکی بە چاویدا هێنا و ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەی وەبیر هاتەووە؛ دیلەکان، تەرمەکان و ئەو ڤاگۆنانەی لاجامەی پەنجەرەکانیان پۆلایین بوو؛ ژنێک کە بە ژانەوە بوو و هیچ کەس بە هانایەوە نەدەچوو، گریان و هاواری دیلەکان و کەسوکاریان کاتی وەڕێکەوتنی شەمەندەفەر، هەمووی لە زەینیدا ئاوێتە بووبوون. دیسان دەستی بە چاویدا هێنا. ئەوەی ئێستا لە بەر چاوی بوو، لەگەڵ دیمەنەکانی پێشوو زۆر جیاواز بوو. سەر مێزەکانی ئەو ڕیستۆرانە پڕ بوو لە بتڵی هەمە چەشنە و خاولی و دەستەسڕی ڕەنگاوڕەنگ و دەفر و کاسە و کەوچکی جۆراوجۆر. پێشخزمەتە ڕەشپۆشەکان، بە نەرمی و ڕێکوپێکی هەڵدەسووڕان و لەو سەری تەلارەکە تاقمێک لە دەوری مێزێک کۆبووبوونەوە و ساردی و مەشرووبی ئەلکوڵی و نا ئەلکۆڵییان دەخواردەوە.

وردە وردە وەخۆ هاتەوە و هەستا دانیشت. بۆی دەرکەوت هەمووان چاویان لە دەرگای هاتنەژوورەوە بڕیوە. بە کونچکاوی سەری هەڵبڕی. خانمێک بە جلوبەرگ و کڵاوی دوایین مۆدەی ڕۆژەوە لە سەر کورسییەکی تایەدار دانیشتبوو؛ ژنێکی جحێڵ و تەڕپۆش لە پشتەوە پاڵی بە کورسییە تایەدارەکەوە دەنا. چەند خزمەتکار جلوبەرگی ڕێکوپێکی دەرگاوانی لەبەردا و کڵاوی پڕ زریقەوبریقە لە سەردا، بە سەرشانەی شینەوە بە دوایدا دەهاتن و نۆخلیدۆڤ کە تۆزێ لێی خورد بۆوە، ئەو خانمە و هاوڕێ و داروودەستەکەی ناسییەوە. ژینراڵ کوورچاگین سینگی دەرپەڕاند بوو و کڵاوی سەفەری لە سەر نابوو، هێندێک لە دوای ئەویشەوە میسی و میشا و ئووستین دەهاتن. ئووستین ئەو کوڕە گەنجە بوو کە لە وەزارەتی دەروە کاری دەکرد، لاویکی

کز و بەلەباریکە و مل درێژ بوو. گوێزەی بەرملی دەرپەڕیبوو و لە پەستا جگەرەی دەکێشا و لە لای میسی خەریکی جامەلووسکێ بوو. لە ڕواڵەتدا کوورچاگین و بنەماڵەکەی لە ماڵە زۆزانییەکەی خۆیانەوە کە لە ناوچەی مۆسکۆ هەڵکەوتبوو، هاتبوون بۆ وێستگە و دەیانویست بچن بۆ کۆشکی زۆزانیی ژن خوشکی کە لە نزیک جادەی نیژنی نۆگۆرۆد هەڵکەوتبوو. سەروپوتراکی ئەو تاقمەی لەگەڵ خزمەتکار و دەستەودایەرەکەی هاتبوون بۆ وێستگە، جێی ڕێزی هەمووان بوون. هەموو ڕێگایان بۆ دەکردنەوە و کڕنۆشیان بۆ دەبردن. کوورچاگین لە پشت مێزێک دانیشت و داوای ساردیی کرد. میسی و ئووستینیش کە لە لای ئەو دانیشتبوون چاویان بە ناسیاوێک کەوت و لە جێی خۆیان هەستان و چوون بۆلای؛ ئەو ناسیاوە ناتالیای خوشکی نۆخلیدۆڤ بوو، لەگەڵ ئاگراڤنا هاتبوو چاوی بە براکەی بکەوێ. ناتالیا، میسیی ماچ کرد و هەرکە چاوی بە براکەی کەوت، هاواری کرد:

ـ ئەوەتا، چاکم دۆزییەوە.

نۆخلیدۆڤ لە جێی خۆی هەستا، خوشکی ماچ کرد و سڵاوی لە میسی و میشا و ئووستین کرد و چاکوخۆشیی لەگەڵ کردن. میسی بۆی باس کرد کە هاوینەهەوارەکەیان ئاگری تێبەر بووە و دەچن بۆ کۆشکی زۆزانیی پووری لە نیزیک نیژنی نووگۆرۆد. ئووستین دەیویست خۆی شیرین بکا و چۆنیەتیی ڕووداوەکە بگێڕێتەوە، بەڵام نۆخلیدۆڤ دەستی خوشکی گرت و لێیان دووور کەوتەوە.

ـ زۆر بە بینینت خۆشحاڵم!

ـ لە مێژە لێرەم. لەگەڵ ئاگراڤنا هاتووم، زۆرت بە دوادا گەڕام. ئاگراڤنا سڵاوی لە نۆخلیدۆڤ کرد. بەڵام نەهاتە پێشێ؛ چونکە نەیدەویست خەڵوەتەکەیان لێ تێک بدات.

ـ خوشکێ گیان! کارێکی باشت کرد هاتی. دەمویست نامەت بۆ بنووسم.

ـ نامەم بۆ بنووسی؟ مەگین چ بووە؟ شتێک ڕووی داوە؟

ـ دوێشەو بە توندی لەگەڵ مێردەکەت دووام. دەمویست نامەیەک بنووسم و داوای لێبوردنتان لێ بکەم؛ چونکە ئازارم دان؛ حەزم نەدەکرد ئاوای لێ بێ.

ـ دەمزانی نارەحەت دەبێ... دەمزانی... نەیتوانی قسەکەی تەواو بکات؛ فرمێسک بە چاویدا هاتەخوارێ. بەدەم گریانەوە بۆ نۆخلیدۆڤی باس کرد کە ئەگەرچی ئاشقی مێردەکەیەتی، بەڵام لە ناخی دڵەوە براکەشی خۆشدەوێ و گیان و ڕۆحی لەگەڵیەتی.

ـ خوشکی گیان! زۆر سپاست دەکەم لە خوشت دەوێم... بەڵام نازانی ئەمڕۆ چەندەم دیمەنی دڵتەزێن دیوە. بە چاوی خۆم تەرمی دوو کەسم بینی. دوو کەسی دیل؛ لە نێویان بردبوون.

ـ کێ بۆتە هۆی مەرگیان؟ کێ لە ناوی بردوون؟

ـ کێ؟ مەعلووم نییە.

ـ من سەرم لەوە دەرناچێ؛ کێ بووەتە هۆی مەرگی ئەو دیلانە؟

ـ هەر ئەوانەی ئەو چارەڕەش و داماوانەیان بەندکردووە. بەهەیەجانەوە قسەی دەکرد. حەزی دەکرد خوشکیشی هاودردیی لەگەڵ بکات، بەڵام خوشکی هیچ هەستێکی نەبوو.

ـ خوشکێ گیان! ئێمە لە بیری ئەو داماوانەدا نین؛ لە کاتێکدا دەبێ لە بیریاندا بین؛ دەبێ هاودەردییان لەگەڵ بکەین، یارمەتییان بدەین.

چاوی بە کوورچاگینی پیر کەوت، لە دوورەوە ئاماژەی دەکرد بچێت و لەگەڵی ببێتە هاوپیاڵە. نۆخلیدۆڤ داوای لێبوردنی کرد و ڕووی لێ وەرگێڕا.

ناتالیا ڕووی لە نۆخلیدۆڤ کرد و گوتی:

ـ براکەم! دوای ئەو قسانە، پێوەی چبکەی؟

ــ هێشتا بە باشی نازانم؛ هەر ئەوەندە دەزانم دەبێ کارێک بکەم و ڕێزەیەک لە ئازاری ئەو داماوانە کەم کەمەوە.

ناتالیا، میسیی پیشانی براکەی دا و لێی پرسی:

ـ نێوانت لەگەڵیا چۆنە؟

ـ ئیتر نێوانمان نییە. لەو بابەتەشەوە نە ئەو ناڕازییە و نە من.

ــ بە داخەوەم. بە ڕاستی ئەو کچەم خۆشدەوێ... دابڕان لە ئەو گرنیگ نییە بەڵام دەمەوێ بپرسم بۆچی ئەوەندە بۆ ئەم و ئەو خۆت ئازار دەدەی؟

ـ مەبەستت کاتیۆشایە؟ ویژدانم داوام لێدەکا بە دویدا بڕۆم.

لە قسە ساردوسڕەکەی خۆی پەژیوان بۆوە. بە باشی زانی هەموو شتێک بەبێ پەردە بدرکێنێ و ئاگراڤناش کە لە نزیک ئەوان دانیشتبوو، خاترجەم بێ.

ـ خوشکێ گیان! من دەمهەوێ لەگەڵ کاتیۆشا ژیانی هاوبەشی پێک بێنم؛ ئەگەرچی ئەو ڕازی نەبووە، بەڵام ڕازیی دەکەم ئێستاش هەتا ئەو سەری دنیا بە دوایدا دەڕۆم. دەبێ هەرچۆنێکە نەهێڵم زۆر ئازار بکێشێ.

ناتالیا هیچی نەگوت. ئاگراڤنا چاوانی پڕ بوون لە پرسیار. کاتی ئەوە بوو شەمەندەفەر وەڕێ بکەوێ. کوورچاگینی پیر لە جێی خۆی هەستا. بە دوای ئەودا کورسیی تایەداری ژنەکەیان پاڵ پێوەنا. شازادە خانم هەر کە گەیشتە نزیک نۆخلیدۆڤ، بانگی کرد. دەستی گرت و گوشی.

ـ بەڕاستی هەوایەکی گەرمە، من ئیتر پێم تامڵ ناکرێ.

هێندێکی باسی هەوا کرد و پاشان داوای لێکرد حەتمەن بچێت بۆ لایان. بە ئاماژەی ئەو دیسان کورسییە تایەدارەکە وەڕێ کەوتەوە. نۆخلیدۆڤ لەگەڵ خوشکی چوون بۆ لای شەمەندەفەرەکە. هاوڕێکانی کوورچاگین بە لای ڕاستدا بایاندایەوە کە بچن بۆ لای ڤاگۆنە نمرە یەکەکان.

نۆخلیدۆڤ بۆ لای چەپ ڕۆیشت کە مسافیرانی ئاسایی لەوێ سوار دەبوون. تاراسیش لەگەڵ ئەوان بوو.

ـ تاراسی هاوڕێمتان پێ دەناسێنم.

تاراسی بە خوشکی ناساند و بە سەرهاتی ئەو و فیدۆزیای بۆ گێڕانەوە. ناتالیا باوەڕی نەدەکرد براکەی بە ڤاگۆنی نمرە سێ سەفەر بکات.

ـ براکەم! دەتەوێ بە ڤاگۆنی نمرە سێ...

ـ بەڵێ خوشکێ! ئاوا ئاسوودە ترم. تاراسیش لەگەڵمدایە. ڕاستی با ئەوەشت پێ بڵێم، هێشتا زەویوزارەکەی کۆزمینسکۆیەم دابەش نەکردووە. ئەگەر مردم ئەو ملکە بۆ تۆ و منداڵەکانت.

ـ ئەوە چ قسەیەکە دیمیتری!

ـ جگە لەو ملکە ئەوی هەشمە هەمووی بۆ تۆ. چونکە ئێمە زەماوندیش بکەین نامانەوێ منداڵمان ببێ.

ـ تکات لێدەکەم قسەی وا مەکە!

ئەگەرچی لە ڕواڵەتدا نارەزایەتیی دەردەبڕی، بەڵام لە دڵەوە زۆری پێخۆش بوو. ئەو مسافیرانەی درەنگ گەیشتبوونێ، هەڵدەهاتن بۆ ئەوەی خۆیان بگەیەننە شەمەندەفەرەکە. تەقوکوتی کەوشەکانیان دەهات. فەرمانبەرانی وێستگە و شەمەندەفەرەکە داوایان لێدە کردن زووتر سوار بن. نۆخلیدۆڤ چووە نێو ڤاگۆنێکەوە کە زۆر گەرم و بۆگەن بوو. لە ڤاگۆنەکە هاتەدەرێ و لە پشتپەنجەرەی ڕێڕەوەکە ڕاوەستا. خوشکی بە جلوبەرگ و کڵاوی دوایین مۆدەوە لە پاڵ ئاگراڤنا ڕاوەستا بوو. ناتالیا هیچ قسەیەکی نەبوو بە براکەی بڵێ؛ تەنانەت نەیدەویست بڵێ: نامە بنووسە. ئەم جۆرە قسانەی زۆر بەلاوە قۆڕ و بێ مانا بوو. ناتالیا خۆی مات و خەمبار نیشان دەدا، گوتی:

ـ خودا حافیز دیمیتری!

کاتێک شـەمەندەفەرەکە دوور کەوتەوە، ناتالیا تەنیا لە بیری ئەوەدا بـوو چـۆن قسـەکانی دیمیتـری بـۆ مێـردەکەی بگێـڕێتەوە و باسـی مڵـکەکەی کۆزمینسکۆیەی بۆ بکا و خوشحاڵی بکات. باس لە سـەر میرات و بەشـەماڵ بۆ چەند ساتێک پێوەندی پڕسۆزی خوشک و برایەتیی لە نێوانیاندا پساندبوو.

نۆخلیدۆڤیش ئەو ڕاسیتییەی بۆ دەرکەوتبوو. پێی وابوو خوشکی ئیتر ئەو ئـافرەتە بەهەسـت و دڵناسـکەی جـاران نییە و بـۆتە کڵفەتێکی گـوێڕایەڵی ئەو مێردە کـولکن و نـاتەرزەی. کاتێـک سـەبارەت بە ملکی کۆزمینسـکۆیە دەدوا، هەسـتی کـرد خوشـکی لە نـاخی دڵەوە زۆر شـاد و دڵخۆشـە و دەیزانـی زوو دەگەڕێتەوە و ئەو هەواڵە خۆشە و ئەو مزگێنییە بە مێردە ڕەزاتـاڵ و کـانێس ئەسـتووەرەکەی دەدا. لەگەڵ ئەوەی شـادیی لە ڕوخسـاری خوشـکیدا دەدی. خۆی لە ناخەوە خەمبار بوو و خەمێک دڵی ڕێک دەگوشی!

# چل

ڤـاگۆنە نمـرە سـێیەکان پڕبـوون لە مسـافیر، وەهـاش لە ژێـر قـرچەی خۆرەتـاودا گەرم داهـاتبوون کە نۆخلیـدۆڤ تـاقەتی نەهێنـا و پەنـای بـرد بـۆ ڕێـڕەوی سـەر ئـاوەڵای نێـوان ڤاگۆنەکـان. لەوێـش هەواکەی گەرم و قـورس بـوو. هەسـتی بە هەناسەسـواری دەکـرد، بەڵام شـەمەندەفەر لە شـار چـووە دەرێ و وردە وردە هەناسەی بە ئاسوودەیی هەڵدەکێشا. باشتر دەیتوانی بیر بکـاتەوە. وەبیـری هـاتەوە بە خوشـکی گوتبـوو: «ئەوانیـان لە نێـو بـردووە.» ئێسـتا دەموچـاوی جـوان و سەرنجڕاکێشـی دووهەمـین تەرمـی هێنـایە بەر

چاوی خۆی کە لە ژووری چوار قەرەوێڵەی پۆلیسخانە دیتبووی. بزەیەکی شیرین لە سەر لێوی بوو؛ نێوچاوانی تەسک و ساف و گوێچکەکانی چکۆڵە بوون! «بۆ دەبێ ئەو کورە گەنجە و ئەوانی دیکە ئاوا لە گەرووی مەرگ ڕاکەن؟ کێ بەرپرسیاری مەرگی ئەو بێچارانەیە؟ ماسلنیکۆڤ، جێگری پارێزگار ئەو بەرپرسایەتییە لە ئەستۆ ناگرێ. ئەو هەرچی لە مێشکی چکۆڵەیدا هەبوو، دەیهێنایە سەر کاغەز و لەڕێوە حوکمی دەردەکرد، گوێشی لەوە نەبوو ئاکامی کارەکە بە کوێ دەگا. پزیشکی بەندیخانەش ئامادە نییە بەرپرسایەتیی ئەو کوشتن و قەلاچۆکردنە بگرێتە ئەستۆ؛ دەڵێ من ئەوانەم معایەنە کردووە و نەخۆش و لاوازەکانم لە ساغەکان جیا کردۆتەوە، من چووزانم ئەوانە بەرگەی گەرما ناگرن و تین و تاوی خۆر بڕستیان لێدەبڕێ؟ سەرۆکی بەندیخانەش لە ڕواڵەتدا بێ تاوان بوو، لیستەیەکیان بۆ ناردبوو و ناوی چەند دیلیان تێدا نووسیبوو و داوایان لێکردبوو ئەو کەسانە ڕادەستی پاسەوانەکان بکات بۆ ئەوەی بیاننێرن بۆ تاراوگە؛ ئەو ئەرکی خۆی بەجێ هێنا بوو. ملازمی فەرماندەریش دەبوو ئەو تاقمە لە بەندیخانەوە بگوێزێتەوە بۆ وێستگە و لەکاتی خۆیدا بیانگەیێنێتە ئەو شوێنە و کاری خۆی ئەنجام دابوو. کەوایە ئەویش بێ تاوان بوو. تەنانەت بە بیریشیدا نەدەهات ئەو پیاوە بە هێز و خۆڕاگرانە، کە ماوەیەکی زۆر لەبەندیخانەدا دەوامیان هێناوە و تیشک و گەرمایان وێنەکەوتووە، لە هەمبەر قرچەی هەتاودا تاقەت ناهێنن و لە پێ دەکەون. کەوایە هیچ کەس تاوانبار نییە و ئەوانە خۆیان گیانیان لە دەست داوە! بەڵام لە ڕاستیدا وا نەبوو، هەمووان لەو کارەساتەدا تاوانبار بوون.»

نۆخلیدۆڤ لە بیری ئەوەدا بوو ئەگەر ئەم کەسانە، لە دەسەڵاتدار و سەرۆکی زیندان و ئەفسەری فەرماندەرەوە بگرە هەتا سەرباز و

پاسەوانەکان، خاوەنی ئەو پیشە و بەرپرسایەتییە نەبووایەن و کەسانێکی ئاسایی بووایەن، حەتمەن جۆرێکی تر بیریان دەکردەوە؛ حەتمەن کەسێکی باش و بەبەزەیی دەبوون؛ ڕێگەیان بە خۆیان نەدەدا ئەو لێقەوماوانە کە چەندین مانگە لە زیندانی تەنگ و تاریک و شێداردا بوون، بەو قرچە و کۆڵەکۆڵی گەرمایە بێنن بۆ وێستگە و بەرەو قوڕگی مەرگ ڕایاندەن؛ لە مەودای ڕێگادا ئەگەر کەسێک بوورایەوە و لە پێ کەوت، لەڕێوە دەیانبردە بن سێبەرێک و ئاو و شەربەتیان بە گەروودا دەکرد، بەزەییيان بە نەخۆش و بێ هێزەکاندا دەهات و یارمەتییان دەدان؛ بەڵام ئێستا بارودۆخەکە جیاوازە. ئێستا کە خاوەنی پیشە و پلەوپایەن و خزمەت بە دەوڵەت دەکەن، دەسەڵاتدار و سەرۆک و پزیشک و فەرماندەی کاروان و سەرباز و پاسەوانن، جگە لە بەڕێوە بردنی ئەرکی خۆیان بیر لە هیچ شتێکی تر ناکەنەوە. بە چاوێکی مرۆڤانە لە خەڵکی ناڕوانن؛ پێیان وایە داروبەردن؛ هەست و گیانیان نییە. ئەگەر فەرمانیان پێ بدرایە بە جێی ئەو دیلانە چەند خەروار داروبەرد ببەن بۆ وێستگەی شەمەندەفەر،هەر ئەو کارەیان دەکرد و بۆ ئەوان جیاوازیی نەبوو. بەلای ئەوانەوە مرۆڤ و بەرد و دار هەر یەکن و ئەگەر فەرمانیان پێدرا، هەست و سۆزی مرۆڤانە وەلا دەنێن و مێشێکیشیان میوان نییە. نۆخلیدۆڤ لە سەر ئەو باوەڕە بوو ئەگەر فەرمانبەری ڕاگوێستنی دیلەکان، تۆزێ مرۆڤانەتر هەڵسوکەوتیان بکردایە، ئەو کارەساتە ڕووی نەدەدا. نۆخلیدۆڤ وەها لە گۆمی بیر و خەیاڵدا نوقم بووبوو، ئاگای لە گۆڕانی هەوا نەبوو. ماوەی سەعاتێک بوو گەواڵە هەورێکی چڕ بەری خۆری تەنیبوو و هەورێکی تاڵ لەلای ڕۆژاواوە دەهات. دیار بوو لەو دوورە دەستانە، ڕێژنەباران دایکردبوو و کێڵگە و لێڕەوارەکانی پاراو دەکرد، بەڵام هێشتا لە کەلێنی هەورەکانەوە تاڵە تیشکی خۆر دادەڕژان. هەورەگرمە و

هاڕەی شەمەندەفەر پێکەوە ئاوێتە دەبوون. وردەوردە با گەواڵە هەورەکانی ڕادەدا و دەیهێنایە پێشێ، نۆخلیدۆڤ یەکەم دڵۆپەی بارانی لە سەر ڕوومەتی هەست پێکرد. بۆنی گەنمجاڕ و لێڕەواری خووساو و خاکی باران لێدراو وڵاتی داگرتبوو. باخ و مێشەکان بە بەردەمیدا تێدەپەڕین. جاڕە جۆ زەرد هەڵگەڕا بوون. وێنجە و بنجە پەتاتە لە دوورەوە سەوز دەچوونەوە. دەتگوت باران هەموویانی ڕەنگ کردووە. تەڕ و پاراو دیار بوو، بریقەی دەهات، ئەوەی ڕەشیش بوو، تاریکتری دەنواند.

نۆخلیدۆڤ بە دیتنی ئەو دیمەنە تەڕو پاراوەی کێڵگە و ڕەز و باخەکان کەوتبووە نەشە و هەروا لە بەر بارانەکە مات و بێدەنگ ڕاوەستابوو. بارانەکە وردە وردە خاوی کردەوە. با هەورەکانی ڕادا و دووری خستنەوە. زەوی خووسابوو و سروشت لە ژێر دوایین دڵۆپەکانی باراندا تازە و گەش و پاراوی دەنواند.

دیسان خۆر وەدەرکەوتەوە. هەموو شتێک لە ژێر پڕشنگی زێڕینی خۆردا دەدرەوشانەوە و کۆلکەزێڕینەیەک لە لای ئاسۆی ڕۆژهەڵاتەوە سەری هەڵدا و پردێکی ساز کرد بۆ نێو دڵی هەورەکان؛ زۆر جوان و ڕازاوە بوو؛ ڕەنگە بنەوشەکەی لە هەموویان گەشتر بوو.

نۆخلیدۆڤ کە بە دیتنی ئەو سروشتە جوانە سەرسام بووبوو، دیسان کەوتەوە سەر باڵی خەیاڵ: «لە کوێ بووم؟ وەبیرم هاتەوە! لە بیری ئەوەدا بووم کە ئەمانە، لە سەرۆکی بەندیخانەوە بگرە هەتا سەرباز و پاسەوانەکان، خۆیان لە خۆیاندا کەسێکی خراپ و بەدزات نین، بەڵام بۆ ڕێگای خراپ و کاری نەشیاو کەڵکیان لێوەدەگرن؛ ئەوان خزمەت بە خراپە دەکەن و سەر لە پێناوی خراپەکارەکانن!»

«ماسلنیکۆڤ کاتێک بیستی دیلەکان ئەشکەنجە دەدرێن و بە قەمچی لێیان دەدەن، وەڕووی مەبارەکی خۆی نەهێنا و دیاربوو ڕەنج و ئازاری خەڵکی لە سەر دڵی کاریگەر نییە و گوێی پێنادا. هەموو ئەوانە کە لە خزمەتی دەزگای دەوڵەتیدان، وەکوو ئەو وان و بە ڕەنج و ئازاری خەڵکی دڵیان داناچڵەکێ. ئەو کاردانەوانە شوێنیان لە سەر دانانێ و وەک ئەو بەردەی بناری کێو وان کە ئاوی باران کاریان تێناکا و گڵ و خاک دەوریان دەتەنێ و بەرەبەرە چوار دەوریان دادە پۆشرێ و دەبنە تەقتەقە بەردێک کە هیچ دار و گیایەکیان لە سەر ناڕوێ. سەرۆکی بەندیخانە و پارێزگار و عەریف و ملازم و سەرباز و پاسەوانەکان ئەگەرچی لە جێی خۆیدا بوونیان پێویستە و کەڵکیان هەیە، بەڵام جۆرێک ڕاهاتوون کە لە هەمبەر ئازار و مەینەتی خەڵکدا دڵیان وەک بەرد وایە و خەم و چارەڕەشیی خەڵک کاریان تێناکا و دڵیان داناچڵەکێ.»

« ئەوان بە ناوی یاساوڕێساوە، دەست بۆ هەموو زوڵم و زۆر و چەوساندنەوەیەک دەبەن؛ لە حاڵێکدا چەند یاساوڕێسای نەگۆڕ و شیاوی شرۆڤە کردن هەیە و تەنیا یاسایەک کە گۆڕانی بە سەردا نایە یاسای خودا و یاسای دڵسۆزی و مرۆڤدۆستییە، ئەوانیش ئەو جۆرە یاسایانەیان بەلاوە نامۆیە؛ هەر بۆیە من لەو جۆرە مرۆڤانە دەترسم و هەر کاتێک چاوم پێیان دەکەوێ، ڕق و نەفرەت دڵم دادەگرێ. ئەوانە کەسانێکی مەترسیدارن. زۆربەی چەتە و ڕێگرەکان خاوەنی دڵێکی پڕ بەزەیین، بەڵام ئەوانە زۆر دڵڕەقن. دڵێکی بەردینیان هەیە و گیای بەزەیی و خۆشەویستیی لە سەر ناڕوێ. ئەوانە دەڵێن پووکاچۆڤ و ستێنکا ڕازین[٧٤] کەسانێکی مەترسیدار بوون؛ لە حاڵێکدا خۆیان هەزار هێندەی ئەوان مەترسیدارن.»

---

74 ـ پووکاچۆڤ (1775ـ 1726) کازاخێکی شۆشکێر و لایەنگری دابەشکردنی زەویوزار بوو. ستێنکا ڕاسین Stenka Rasine سەرکردەی کازاخە شۆڕشگێڕەکانی ناوچەی Don،

«ئەگەر لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە ئەو مەسەلەیە شی بکەینەوە، ئەو پرسیارە دێتە پێشێ کە چۆن دەکرێ تاقمێک مرۆڤی باش و مرۆڤدۆست و ئیماندار جۆرێک ڕابێنی کە هیچ هەستێکیان نەبێ و هەموو کارێکی خراپ بکەن؟ وەڵامی ئێمە ئەوەیە کە دەبێ سیستەمێکی وەک سیستەمی کۆمەڵگای ئێمە بێتە ئاراوە. بەڵێ ! دەبێ ئەو مرۆڤە باش و ئیماندارنە بکرێنە کاربەدەستی دەوڵەت؛ یەکیان بکەیە پارێزگار، یەکێکی تر سەرۆکی بەندیخانە و ئەوانی دیکەش بکرێنە ملازمی ئەرتەش و سەرباز و پاسەوان. ئەوەیشان پێ بسەلمێنی کە کاربەدەستی دەوڵەت دەبێ دڵڕەق بێ، بەزەیی و هەستی مرۆڤانەی نەبێ و گوێ بە بەرپرسیارێتیی تاکە کەسی و مرۆڤانە نەدات و تەنیا قازانج و بەرژەوەندیی دەزگایەک لەبەر چاوبگرێ کە کاری بۆ دەکا و بۆتە ئەندامی.»

«لەم هاوکێشەیەدا شتێک هەموو حیسابەکان تێکدەدا: مرۆڤ لەگەڵ بەرد و دار جیاوازە؛ دەتوانی دار لە ڕەگەوە دەربێنی، دەتوانی قوڕ سوور بکەیەوە و بیکەی بە کەرپووچ، دەتوانی ئاسن لە کوورەدا نەرم بکەی، بەڵام ناکرێ بە شێوەیەکی بێ بەزەییانە لەگەڵ مرۆڤ هەڵسوکەوت بکەی. ئەگەر خۆشەویستی یەکتری و هەستی مرۆڤدۆستی نەبێ، ژیانی مرۆڤ زۆر دژوار دەبێ. ئەگەر کەسێک دەست بکات بە کونی هەنگەژاڵەدا. هەنگەژاڵەکان بۆ بەرگری کردن لە خۆیان پێوەی دەدەن. ناکرێ بە شێوەیەکی بێبەزەییانە لەگەڵ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ڕەفتار بکەی. چونکە سروشتییە و مرۆڤ ناچارە درەنگ یا زوو وەدەنگ بێت و دژکردەوە لە خۆی نیشان بدات. کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەبێ لە سەر بناغەی دڵسۆزی و خۆشەویستیی دامەزرێ. تاقمێک

---

یەکێک لە خەباتکارانی سەردەمی خۆی بوو و ناوی ئەو دوو کەسە لە گۆرانی و ئەفسانەکانی خەڵکدا ڕەنگی داوەتەوە.

دەڵێن دەکرێ مرۆڤ ناچاربکەی کار بکات بەڵام ناکرێ ناچاری بکەی شتێکی خۆش بووێ. ئەوە وایە؛ بەڵام دەبێ کۆمەڵگا بۆ خۆشەویستن و چاکەکاری ئامادە بکەی. هیچ کۆمەڵگایەک بەبێ خۆشەویستی و بەزەیی ناتوانێ درێژە بە ژیان بدات.»

نۆخلیدۆڤ وەبیری هاتەوە کە دڵی خوشکی و مێردەکەی خوشکی ڕەنجاندووە و بۆ ئەوەش بە داخەوە بوو، تەنانەت حەزی نەدەکرد بەو ڕادەیە ببێتە هۆی نارەحەتیی خەڵکی؛ تەنانەت ئەگەر هەقیشی بە دەست بێ. لە بیری ئەوەدا بوو ئەگەر دڵڕەقی و بێ بەزەییی بوونی مرۆڤ بێ سنوور بێ، کۆمەڵگا چەندە ئازار دەکێشێ و تووشی کێشە دەبێ. هەستی دەکرد وەڵامی زۆربەی مەتەڵە گرانەکانی کۆمەڵگای دیتۆتەوە، بەو هۆیەشەوە هەستی بە شادی دەکرد. فێنک بوونەوەی هەواش دوای ئەو گەرما تاقەتپڕووکێنە زیاتری شاد کردبوو.

# چل و یەک

لە نێو ڤاگۆنە نمرە سێیەکەدا هەموو چەشنە مرۆڤێک هەبوو: خزمەتکار، کرێکار، قەساب، کاسبکار و نووسیاری بازرگانی و سەرباز و چەند ژنی پیر و جحێڵ. سەرەتا لە سەر جێگا هێندێک کێشە و دەمقرەیان ساز کرد، بەڵام زۆر زوو کێشەکە چارەسەر کرا و ئیتر بێدەنگ بوون. هێندێکیان بێدەنگ دانیشتبوون، چەند کەس تووی گوڵەبەڕۆژەیان دەترووکاند، هێندێکیش بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد.

تاراس لە سووچێکی ڕێڕەوەکە دانیشتبوو و جێیەکی بۆ نۆخلییدۆڤ گرتبۆوە و لەگەڵ باخەوانێک کەوتبووە قسە؛ کابرای باخەوان پیاوێکی دەست و مەچەک ئەستوور و چوارشانە بوو، چاکەتێکی ماهووتی لەبەر دابوو. بەرەورووی یەکتر دانیشتبوون و خەریکی دەردەدڵ کردن بوون.

نۆخلیدۆڤ دوای ئەوەی ماوەیەک لە ڤاگۆنە سەر ئاوەڵاکەدا ڕاوەستا، هاتەوە و لە سووچێک دانیشت. پیرپیاوێکی ڕیش سپی کە کراسێکی چیتی لەبەردابوو و لەگەڵ ژنێکی جحێڵی گوندنشین قسەی دەکرد، لە پەنای خۆیەوە جێگای بۆ نۆخلیدۆڤ کردەوە و ئەویش حەزی دەکرد هاوسەفەرەکانی خۆی بناسێ و خێرا لە پەنایەوە دانیشت. کچێکی حەوت ـ هەشت ساڵان کە بەردەوام تووی گوڵەبەڕۆژەی دەترووکاند و تیخوڵەکەی بڵاو دەکردەوە، لە پەنای ژنە گوندنشینەکە ڕاوەستا بوو.

ژنە بۆ پیرەپیاوەکەی باس دەکرد کە مێردەکەی لە شار کرێکاری دەکات. چەند حەوتوو لە لای مێردەکەی بووە و ئێستا دەگەڕێتەوە بۆ گوند، بۆ ساڵی نوێش دەیهەوێ دیسان بچێت بۆ لای مێردەکەی.

پیرەپیاو بە دڵسۆزییەوە گوێی بۆ ڕاگرتبوو، گوتی:

ـ کچم! زوو زوو بچۆ بۆ لای مێردەکەت؛ نەکا هەوایەک لە سەری بدات و بکەوێتە گێژاوی کاری خراپەوە.

ـ نا مامە گیان! مێردەکەی من لەو جۆرە کەسانە نییە؛ وەک منداڵێکی هەشت ـ نۆ ساڵان دڵپاک و ڕاستە. ئەوی پارەی پەیدای دەکات بۆمانی دەنێرێ و دنیارێک بۆ خۆی گل ناداتەوە.

کچۆڵەکە گوێی بۆ قسەکانی دایکی ڕاگرتبوو و تووی گوڵەبەڕۆژەی دەترووکاند و تێخوڵەکەی بە دەمی فڕێدەدا و بە تەرکی قەمارەکەدا بڵاوی دەکردەوە. پیرەپیاو، کرێکارێکی پیشان دا کە لە نزیک ئەوان و لە تەنیشت

ژنەکە دانیشتبوو و قاقای دەکێشا، و بتڵی ڤۆدکای هەڵدەقوڕاند، پیشانی ژنەی دا و گوتی:

- خودا بکا لەو جۆرە کەسانە نەبێ.

- نا نا، مامەگیان! مێردەکەی من نە ئارەق دەخواتەوە، نەجگەرە دەکێشێ. مرۆڤێکی وەک ئەو پاک، لەم دنیایەدا نییە.

ژنە لە پەستا تاریفی مێردەکەی دەکرد و کرێکارەکەش کە وردە وردە سەرخۆش بووبوو، بتڵی ئارەقەکەی دایە دەست ژنە و پێداگرانە داوای لێدەکرد قومێکی لێ بخواتەوە. ژنەش بە پێکەنینەوە چۆڕێکی بە سەری بتڵەکە خواردەوە. کابرای کرێکار کە بۆی دەرکەوتبوو نۆخلیدۆڤ و هاوسەفەرەکانی چاوی لێدەکەن، دای لە قاقای پێکەنین:

- بەڕێز! بۆ چاوم لێدەکەی؟ پێت سەیرە عارەق دەخۆمەوە؟ ئەی ئەو کاتەی ئارەقە دەڕێژین و کار دەکەین، بۆ هیچ کەس چاوی لێمان نییە؛ ئێستا کە دەمانەوێ تۆزێ سەرخۆش بین و خەم و ئازارەکانمان بەبا بدەین، هەمووان چاویکیان کردۆتە چوار چاو و لێمان دەڕوانن. بەڕێز! پارەی خۆمە؛ کارم کردووە، تویخم چووە و پارەم بە دەست هێناوە، ئێستاش دەمهەوێ لەگەڵ ژنەکەم چۆڕێک ئارەق بخۆینەوە و کەیف بکەین.

نۆخلیدۆڤ نەیدەزانی چی بڵێ، سەری لە قاند و گوتی:

- بەڵێ... بەڵێ.

- بەڕێز گیان! ژنەکەم زۆر کەسێکی باش و دڵسۆزە؛ بەردەوام ئاگاداریم لێدەکا و پەرەستاری منە، زۆری لێ ڕازیم. لە خۆی بپرسە... ماورا! بۆ ئەو بەڕێزە باس بکە چۆنم پەرەستاری لێدەکەی!

- دیسان سەرخۆشی و خەریکی وڕێنە دەکەی!

ـ دیتووتانە چەندە ژێر و بە ئەدەبە، چەندە ژنی چاکە، وەک ماین وایە. کاتێک کەژووەکە لە ژێر کلکی دەگیرێ، وەها شێت دەبێ هەر باسی مەکە... ئەرباب ببوورە هێندێک زێدەخۆریم کرد و تێکەڵم کردووە؛ دەبێ تۆزێ لالی بکەم بۆ ئەوەی بێمەوە سەرخۆ.

سەری کردە سەر ڕانی ژنەکەی و خەوت ـ پیرەپیاو باسی ژیانی خۆی بۆ نۆخلیدۆڤ دەکرد؛ دەرکەوت کە زۆپا سازە و ماوەی پەنجا و سێ ساڵی ڕەبەق خەریکی ئەو کارە بووە. بۆشی مەعلووم نەبوو لەو ماوەیەدا چەند زۆپای دروست کردووە، ئێستاش کارەکەی بە بەردەستەکانی سپاردبوو، دەچوو بۆ گوند بۆ ئەوەی چەند حەوتوویەک پشوو بدات و شەکەتی لە لەشی دەرچێ. نۆخلیدۆڤ دوای ئەوەی گوێی بۆ سەربردەی پیرەپیاوی زۆپاساز ڕاگرت، لەوێ هەستا و چوو بۆ لای تاراس کە جێگای بۆ ڕاگرتبوو، تاراس خەریک بوو بەسەرهاتی خۆی بۆ کابرای باخەوان دەگێڕایەوە. باخەوانی فیلەتەن کاتێک نۆخلیدۆڤی دی، خۆی کۆکردەوە و قیت دانیشت:

ـ فەرموو گەورەم...! هەر ئێستا جانتاکە لادەبەم بۆ ئەوەی بە ئاسوودەیی دانیشی.

تاراس پیاوێکی دەست و مەچەک قەویوقۆڵ بوو؛ جانتای سی کیلۆیی وەک چڵە پووشێک هەڵگرت و لەو لاوە داینا.

ـ گەورەم! ئێوە جێگاکەتان تەنگە، بەڵام ناخۆش نییە. خەمی منیشت نەبێ؛ بە پێوە ڕادەوەستم. ئەگەر خەویشم هات، لە سەر جانتاکە ڕادەکشێم!

تاراس کەمدوو بوو؛ تەنیا کاتێک کە جێژنێک دەبوو و چۆڕێ شەرابی دەخواردەوە، کەیفی ساز دەبوو و قسەی خۆشی دەکرد. هێندێ جاریش پێویستی بە شەراب نەبوو، لە خۆڕا کەیفی ساز دەبوو و دەکەوتە قسە. ئەو ڕۆژەش هاوڕێیەکی باشی وەک باخەوانەکەی پەیدا کردبوو و بەسەرهاتی

خۆی بۆ دەگێڕایەوە. باسی فێدۆزیای بۆ دەکرد. نۆخلیدۆڤیش لە کاتی خۆیدا گەیشتێ و گوێی بۆ شل کرد. ئەگەرچی کەمتاکورتێ بە سەرهاتی ئەو و فێدۆزیای دەزانی بەڵام بە وردی لێی ئاگادار نەبوو.

ـ ئەمڕۆ مرۆڤێکی تێگەیشتووم دەست کەوت و حەزم کرد سەربردەی خۆمی بۆ باس بکەم.

ـ تاراس! منیش غەریبە نیم؛ پاشماوەکەی بگێڕەوە،منیش گوێت بۆ ڕادەگرم.

- بەڵێ... دەمگوت فێدۆزیا ژاری کردبووە نێو خواردنەوە و پێی دام. حاڵم تێکچوو و خەریک بوو دەمردم. دایکم هەرکە لە ڕووداوەکە ئاگادار بوو، نانەکەی هەڵگرت و گوتی دەبێ بچم سەرۆکی جەندرمەکان لەو ڕووداوە ئاگادار بکەم. هەرچی باوکم پاڕایەوە ئەو کارە نەکات؛ گوتی بووکەکەمان تەمەنی کەمە و لە ڕووی نەزانییەوە ئەو کارەی کردووە، بەڵام دایکم گوێی پێنەدا. دایکم گوتی ئەگەر وەڕووی خۆمانی نەهێنین، ئەم ژنە هەموومان دەکووژێ. نانەکەی برد و سەرۆکی جەندرمەکانی ئاگادار کرد.

باخەوان کەوتبووە دەریای بیر و خەیاڵەوە.

- بۆچی خۆت پێشت پێ نەگرت؟

- من دەرمانداو کرابووم؛ خەریک بوو جەرگ و دڵم دەهاتە دەرێ، هێزم نەبوو قسە بکەم، چ بگا بەوەی بچم و پێشی پێ بگرم. باوکم ناچار فێدۆزیای سواری عارەبانەیەک کرد و بردی بۆ ژاندارمێری. ئەویان بردبوو بۆ لای لێکۆڵەر؛ هەموو شتێکی گوتبوو. لێیان پرسیبوو بۆچی ئەو کارەی کردووە؟ گوتبووی هێندم ڕق لەو مێردەمە، ئامادەم بچم بۆ سیبیریا، ئامادەم لە سێدارەبدریم، بەڵام لەگەڵ ئەو پیاوە نەژیم.

تاراس بە پێکەنینەوە ئەو بە سەرهاتەی دەگێڕایەوە.

ـ بەڵێ گەورەم! فیدۆزیا ئەوەندی ڕق لە من بوو؛ ئامادە بوو بمرێ بەڵام لەگەڵ من نەژی. دوای ماوەیەک وەرزی دروێنە و هەڵگرتنی حاسڵات بوو. من تەنیابالْ بووم و دایک و باوکە پیرەکەشم نەیاندەتوانی یارمەتیم بدەن. کەوتمە بیری ئەوەی بچم ڕەزایەت بدەم و داوا بکەم فیدۆزیا ئازاد بکەن. بەڵام هەرچی حەولم دا و هەڵسووڕام کەڵکی نەبوو. لە ئاکامدا بەرتیل خۆرێکی زۆڵ و کڵاوچیم دۆزییەوە و گوتی ئەگەر پێنج ڕۆبڵم پێبدەی، کارەکەت بۆ جێبەجێ دەکەم. زۆرم سەر لەگەڵ سوو هەتا بە سێ ڕۆبڵ ڕازیم کرد. چووم هێندێک کەلوپەلی ماڵێم بە بارمتە لە شوێنێک دانا، سێ ڕۆبڵم وەرگرت و دام بەو پیاوە فێڵبازە کە کێچی ناڵ دەکرد. ئەویش پارەکەی لێ وەرگرتم و کاغەزێکی نووسی و گوتی بیبە بۆ بەندیخانە و فیدۆزیا لەگەڵ خۆت ببەوە! نازانم چیی نووسیبوو. بە سواری عارەبانەیەک چووم، لە نزیک شار عارەبانەکەم بە کەسێک سپارد و چووم بۆ بەندیخانە. پاسەوانێک هات کاغەزەکەی لێ وەرگرتم و گوتی ڕاوەستە هەتا دەگەڕێمەوە. نزیک نیوەڕۆ بوو. لە سووچێک دانیشتم و چاوەڕوان بووم هەتا سەرۆک هات و بانگی کردم. گوتی: ڤارگووشۆڤ تۆی؟ گوتم! بەڵێ گەورەم! خۆمم. گوتی: ژنەکەت ئازاد دەکەین لەگەڵ خۆت بیبەوە. دەرگای زیندان کرایەوە و فیدۆزیا هاتە دەرێ. پێکەوە وەڕێ کەوتین. گوتی: بە پییان دەڕۆینەوە بۆ گوند؟ گوتم: نا، عارەبانەکەم لە نزیک شار ڕاگرتووە. چووین سواری عارەبانە بووین. کە عارەبانەکە کەوتەڕێ، فیدۆزیا لێی پرسیم: باوکت ماوە؟ گوتم بەڵێ. گوتی: ئەی دایکت؟ گوتم: ئەویش ماوە. گوتی: گەورەکان لێبوردووترن؛ نەفام بووم بۆیە ئەو کارەم کرد. گوتم: من هەر لە سەرەتاوە لێت خۆشبووم؛ خوداش لێت خۆش بێ! کاتێک گەیشتینە گوند، باوکم زۆر بە مێهرەبانییەوە لەگەڵی بەرەو ڕوو بوو و گوتی: ئیتر باسی ڕابردوو ناکەین؛

ئێستا کاتی دروێنەیە و دەبێ بڕۆین بەلای کاروبارەوە. ڕۆژی دوایی چووین بۆ دروێنە. فێدۆزیا شان بە شانی من کاری دەکرد. ئێمە لەو کاتەدا سێ دۆنم زەویمان بە ئیجارە هەڵگرتبوو، ئەو ساڵە لە سایەی خواوە حاسڵات باش بوو. جۆ و ڕەشەجۆ هەر دووکیان زۆر باش بوون. من دروێنەم دەکرد و ئەو کۆی دەکردەوە. زیاتر پێکەوە و شان بە شانی یەک کارمان دەکرد. من دروێنەوانێکی باشم؛ داوەڵێکم لە دواوە بەجێ نامێنێ. دیتم فێدۆزیا لە من ئازاترە. جحێڵ و توندوتۆڵ، ماندوویی نەناس بوو؛ ئەگەر پێشم پێنەگرتایە داسەکەی دانە دەنا و هەتا تاریکان کاری دەکرد. لە بیری خواردن و خەودا نەبوو. کاتێ دەگەڕاینەوە بۆ گوند، کاروباری ماڵەوەشی دەکرد و سبەینێ کەڕەی بەیانی پێکەوە دەچووینەوە بۆ مەزرا.

باخەوان بە وردی و تامەزرۆییەوە گوێی ڕاگرتبوو، گوتی:

ـ براکەم! باسی هەموو شتێکت کرد، بەڵام نەتگوت هەروا ڕقی لێت بوو یان گۆڕا بوو؟

ـ باسی خۆشەویستییەکەی هەرمەکە؛ وەها ئاشقی من بووبوو ڕۆح و گیانی لەگەڵمدا بوو. بە تەواوی گۆڕابوو. دایکم دەیگوت: ڕەنگە ئەم ژنە فێدۆزیاکەی جاران نەبێ؛ یان بەجێی فێدۆزیا ژنێکی دیکەیان پێداوی. ڕۆژێکیان لە کاتی دروێنەدا لێم پرسی، بۆ ئەو کارەی کرد؟ گوتی چونکە خۆشم نەدەویستی؛ دەمویست یان تۆ بکووژم یان خۆم... گوتم ئەی ئێستا؟ گوتی ئێستا هەر باسی مەکە؛ تۆ لە ناخی دڵمدای و لە ڕۆحی خۆمم خۆشتر دەوێی.

تاراس بە وەبیر هێنانەوەی ئەو ڕۆژانە دەگەشایەوە.

ـ هێشتا دروێنەمان تەواو نەکردبوو، ڕۆژێک عارەبانەکەم پڕ کرد لە تۆوی کەتان، چووم تۆوی کەتانەکە دانێم تەڕی بکەن و بیشۆنەوە. کاتێک

گەیشتمەوە ماڵێ، خوازنامەیەکیان لە دادگاوە هێنا بوو. داوای فیێدۆزیایان کردبوو. ئێمە لە بیرمان چوو بۆوە بە چ تاوانێک دەیانەوێ فیێدۆزیا دادگایی بکەن.

باخەوان لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە هەموو شتێک لە ژێر سەری ئەو بەرتیل خۆرە فیێلبازەدا بووە. دەیویست بە سەرهاتی یەکێک لە هاوگوندییەکانی بگێڕێتەوە کە تووشی کێشەیەکی لەو جۆرە هاتبوو، بەڵام شەمەندەفەرەکە ڕاوەستا. باخەوان لە جێی خۆی هەستا بڕواتە دەرێ و هەوایەکی تازە هەڵمژێ. نۆخلیدۆڤیش دەیزانی شەمەندەفەر چەند خولەکێک لە ویێستگە ڕادەوەستێ، بۆیە لە شەمەندەفەرەکە دابەزی. زەوی بە باران خووسا بوو.

# چل و دوو

کۆنت نۆخلیدۆڤ لە یەکەم ڕوانیندا چەند فەتیوون و هێلینگەی جوان و ڕازاوەی دی، لە بەر ویێستگەی هێلاسن ڕیزیان بەستبوو و دیار بوو چاوەڕوانی مسافیری پلەبەرزن. وڵات بە باران خووسا بوو، لەبەر قاڵدرمەی ڤاگۆنە نمرە یەکەکاندا خاتوونێکی جوان و تەڕپۆش بە کڵاوێکی پەڕدارەوە لەگەڵ گەنجێکی بەلەباریکە کە زنجیری سەگێکی گەورەی بە دەستەوە گرتبوو، چەند خزمەتکاری چەتر بە دەستیش لەگەڵیاندا، چاوەڕوانی دابەزینی مسافیرەکانی خۆیان بوون. لە دەوری ئەوانیش تاقمێک خەڵکی ڕەشوڕووت و دەستەیەک خەڵکی کونچکاو و کەسانێکی کە هەمیشە توونی و سەر لە پێناوی ماڵ و سامانن، کۆبووبوونەوە. لەم کاتەدا سەرۆکی ویێستگە بە

کڵاوێکـــی ســـوورەوە و چەنـــدرمەیەک و کچێکـــی کـــز و بەژن زراو بە ملـوانکەیەکی شووشـەییەوە، تیلگەڕافچـی و چەنـد کەسـی دیـکەی بەرچـاو دەکەوتن. نۆخلیدۆڤ لە دوورەوە هەمـوو شـتێکی بۆ دەرکەوت؛ ئەو گەنـجەی زنجیـری سـەگەکەی بە دەسـتەوە بـوو، کـوڕی کوورچـاگین و خوێنـدکاری دواناوەندی بوو، ئەو خاتوونە کڵاو پەڕەش ژن خوشکی کوورچاگین بـوو و بڕیار بوو بنەماڵەی کوورچاگین بچن بۆ کۆشکی زۆزانی ئەو خـاتوونە. وردە وردە مسـافیرە پایەبەرزەکـان دابەزیـن. سـەرۆکی شـەمەندەفەرکە جزمەکـانی بـریقەی دەهـات، لە هەمبەریانـدا قیـت و وریـا ڕاوەسـتا بـوو. بـاربەرێکیش بە بەروانـکەی سـپییەوە، یـارمەتیی فیلیپـی پێشـخزمەتی دەدا تـاکوو کورسـییە تایەدارەکەی شازادە خانم بە هێواشی بێننە خوارێ. دوو خوشکەکە یەکتریـان ماچکرد و بە زمانی فەڕەنسی لەگەڵ یەکتر دوان، بەرەبەرە دەسـتیان کـرد بە باسـێک کە لە سـەر بـابەتێکی گرنـگ بـوو؛ شـازادە خـانم زیـاتر حەز دەکەن سواری فەتیوون بن یان بە هێلینگەی سـەر ئاوەڵا بچـن بۆ هـاوینەهەوارەکە؟ کوورچـاگین و میسـی و ئەوانـی دیکە هەرکـام بە زمـانی فەڕەنسـی بیـروڕای خۆیـان دەردەبڕی. پێشـخزمەتی تـایبەتی و خزمەتکارەکـانی تـر چەترەکانیـان هەڵدا و لە سەر سەری ئەربابەکانیان گرتیان و کورسـیلەی تـایەداری شـازادە خانم بە سەنسەنە و تەنتەنەیەکی زۆرەوە کەوتەڕێ.

نۆخلیدۆڤ لە سووچێک چوو بووە پشـت کۆڵەکەیەک و ڕاوەسـتا بـوو بۆ ئەوەی بنەماڵەی کوورچاگین نەیبینن و لەوێوە چـاوی لە هەمـوو شـتێک بـوو. شـازادە خـانم بە سـواری کورسـیی تـایەدار و میسـی و پزیشـکی تـایبەت و خزمەتکارەکان لە پێشـەوە دەڕۆیشـتن، کوورچـاگین و ژن خوشکیشـی تـۆزێ لە دواتـرەوە بە دوایانـدا دەهـاتن و بە زمـانی فەڕەنســی پــێکەوە دەدوان.

نۆخلیـدۆڤ گـوێی لە دەنگیـان بـوو. کوورچـاگین کە حەزی بەو پێشـوازییە دەکرد و کەیفی ساز بوو، بە دەنگی گڕ و بەرز بەردەوام دووپاتی دەکردەوە:
- Oh! It est duvrai grand mode![75]

ئەم ڕستەیە لە زەینی کۆنت نۆخلیدۆڤدا دەنگی دەدایەوە. کوورچاگین، بە هـۆی ئەو شـوێنە و دیمەنـی دەوروبەریـیەوە بسـکەی سـمێڵی دەهـات و بەو ڕستەیە هەستی خۆشحاڵیی خۆی دەدەبڕی.

لەو کاتەدا، حەڤدە ـ هەژدە کەس لە کرێکاران کە لەو هەوایەدا جلوبەرگی گەرم و ئەسـتووریان لە بەر کـرد بـوو، کـۆڵ بە کـۆڵ هـاتن بـۆ لای شـەمەندەفەرەکە؛ دەیانویسـت سـواری یەکەم ڤـاگۆن بـن کە چاودێرێـک لە دوورەوە گوڕانـدی و نەهێشـت. چـوونە پێشـترەوە بـۆ ئەوەی سـواری ڤاگۆنەکەی تربن؛ چاودێرێکی تر بە دەست پاڵی پێوەنان بۆ دواوە. بە ناچاری خۆیان گەیاندە ڤاگۆنی سێهەم و سێهەم چاوەدێر گەیشتێ و دەنگی هەڵبڕی؛ بەڵام نۆخلیـدۆڤ بە پەلەچـوو بـۆ لایـان و گـوتی لەم ڤـاگۆنەدا جێگـای هەمووانتان دەبێتەوە، پێشیان کەوت و کرێکارەکان بە دوایدا، وەسـەر کەوتن و هەر کەسەی جێگایەکی خاڵیی بۆ خۆی دۆزییەوە و کەلوپەلەکانی لێ دانا. پیاوێـک کە کـڵاوی نیشـانەداری لە سـەرنابوو، دوو خـاتوونی لەگەڵـدا بـوو، یەکیان جحێڵ و ئەوی دیکەیان گەڕاوە، نـاڕەزایەتیی خۆیـان بۆ سـوار بوونی ئەو کرێکـارانە دەربـڕی. کرێکـاران بە دەموچـاوی تاوەسـووت و لەشـی مانـدووەوە، کاتێـک نـاڕەزایەتیی ئەو چەنـد کەسـەیان دی، وەهـا بە خۆیانـدا شکانەوە کە دەیانویست بچن سواری ڤاگۆنێکی تربن و تەنانەت و تەنانەت بچن بۆ ئەو سەری دنیا بۆ ئەوەی هیچ کەس بە بۆنی لەش و جلوبەرگی

75 ـ پەکوو! چ دیمەنێکی سەیر و سەمەرەیە!

پیس و پۆخڵیان جارز نەبێ. چاوەدێری شەمەندەفەریش لە دەرەوە دەنگی هەڵبڕی:

ـ ئەو پیس و چەپەڵانە حاڵی ئاغا و خانمەکانیان شێواندووە؛ وا باشە دەریان بکەنە دەرێ!

لەو دوو خاتوونە کە یەکیان جحێڵ بوو، بۆ ئەوەی سەرنجی کۆنت نۆخلیدۆڤ ڕاکێشێ، بە زمانی فەڕەنسی گوتی:

ـ Voila encore nouvelle![76]

ژنە گەڕاوەکەش لە جێی خۆی هەستا و چوو بۆ بەر پەنجەرەکە، لچی هەڵقورتاند و مەکرێکی نواند بۆ ئەوەی وابنوێنێ کە زۆر لەو بوونەوەرە هیچوپووچ و چەپەڵ و بۆگەنانە بێزارە.

سەرەڕای ئەوانەش کرێکارەکان وردە وردە لەگەڵ ئەو بارودۆخە ڕاهاتن و لە ناخی دڵەوە ڕازی بوون کە بە هەر لەونێک بوو جێگایەکیان دەست کەوتووە. کۆڵەکانیان نایە بن کورسییەکان بۆ ئەوەی بەر پێی خەڵک نەگرن، خۆشیان لە سەر کورسییە خاڵییەکان دانیشتن.

تاراس هێشتا لەگەڵ باخەوانەکە دانیشتبوو و دەردەدڵی دەکرد. سێ جێگای خاڵی لەو بەریانەوە هەبوو کە کرێکاران گرتبوویانەوە. کاتێک نۆخلیدۆڤ هات بۆ ئەو لایەوە، کرێکارەکان کە چاویان بە سەر و لیباسە ڕازاوەکانی کەوت، لە جێی خۆیان هەستان و ویستیان بچن بۆ سووچێکی تر، بەڵام نۆخلیدۆڤ قۆڵی یەکیانی گرت و لە جێی خۆی دانیشاندەوە و خۆی لە سەر لێواری کورسییەک دانیشت. یەکێک لە کرێکارەکان کە نزیکەی پەنجاساڵی تەمەن بوو، لەگەڵ کرێکارێکی گەنج کە لە تەنیشتی دانیشتبوو، بە ترس و سەرسووڕمانەوە چاوێکی مانادارییان لە یەک کرد. پێیان سەیر بوو

---

76 ـ هەر جارەی یەکێکی تازە دەگاتێ.

پیاوێکی ئاوا پایەبەرز و خانەدان بە جێی ئەوەی جنێویان پێ بدا و بە شەق و چەپۆک لە ڤاگۆنەکە وەدەریان بنێ، یان چاوەدێری شەمەندەفەر بانگ بکا و هەزار بەلایان بە سەر بێنێ، جێگاکەی خۆی پێداون و بەڕێز و خۆشەویستییەوە چاویان لێدەکا. سەرسام بووبوون و پێیان وابوو فێڵێک لە ئارادایە. بەڵام وردەوردە دڵیان حەسایەوە و بۆیان دەرکەوت ئەوەی دەیبینن ڕاستەقینەیە و ترسەکەیان بێ جێیە. بە تایبەت کاتێک دیتیان ئەم پیاوە خانەدانە، بەشێوەیەکی دۆستانە لەگەڵ تاراس قسە دەکات، خاترجەم بوون. کرێکاری پەنجا ساڵان لاقی کۆکردبۆوە نەوەک لە لاقی کۆنت نۆخلیدۆڤ بکەوێ؛ بەرەبەرە کاتێک هەستی کرد شوێنەکە خۆمانەیە، دەستی کرد بە قسە کردن؛ بە سەرهاتی خۆیانی گێڕایەوە و گوتی: ماوەیەکە لە نێو لێڕەوار و زەلکاواندا ئێزنگ و سووتەمەنی کۆ دەکەنەوە و بۆ ئەوەی هەقدەستێکی هەر چەند کەمیش وەرگرن، ئامادەن هەموو کارێک بکەن.

ـ بەڵێ گەورەم! کاکردن لە نێو زەلکاودا زۆر دژوارە؛ ئەو جۆرە کارانە سەرەتا زۆر تاقەتپڕووکێنە، بەڵام دواتر خووی پێدەگری. ئەگەر خواردنێکی باش بدەن، زۆریش دژوار نییە. لێرە سەرەڕای دژوار بوونی کارەکە، خواردنێکی زۆر خراپیشیان پێدەداین. تا وای لێهات هەمووان وەدەنگ هاتن؛ بۆیە خواردنەکەیان باشتر کرد و کارەکەشمان باشتر دەڕۆیشتە پێشێ.

دەیگوت بیست و هەشت ساڵە، ئارەق دەڕێژێ و کار دەکا، ئەوی داهاتی هەشیەتی، بۆ بنەماڵەکەی دەنێرێ. ژن و باوک و برا و لەم دواییانەدا برازاکەشی بە خەرجی ئەو بەڕێدەچن. ساڵانە پەنجا تا حەفتا ڕۆبڵ داهاتی هەیە و هەمووی بۆ ئەوان دەنێرێ و تەنیا دوو - سێ ڕۆبڵ بۆ کڕینی توتن و شتی تر بۆ خۆی گل دەداتەوە، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ تەنیا عەیبێکم هەیە؛ ئەویش ئەوەیە کاتێک زۆر شەکەت دەبم دەبێ چۆڕێ ئارەق بخۆمەوە.

باسی هەموو شتێکی دەکرد؛ دەیگوت ژنان دوور لە پیاوەکانیان زۆر ئازار دەکێشن و ناچارن ئەو ژیانە تاڵە ڕابوێرن و کاروباری ماڵ و ژیان لە ئەستۆی ئەوانە. دەیگوت خاوەنکارەکەیان کاتی هاتنەوە نیوە تەنەکەیەکی ئارەق وەک دەستخۆشانە پێداون. دوای باس کردنی ئەو ماجەرایە گوتی ئەمجارەیان یەکێک لە هاوڕێکانیان لە کاتی کارکردندا گیانی لە دەست داوە؛ یەکێک لە گەنجەکانیش تووشی نەخۆشییەکی قورس بووە. بە قامکی ئاماژەی بە کرێکارێک کرد کە لە سووچێک دانیشتبوو و دەرد و خەم لە سەرتاپای دەباری. نۆخلیدۆڤ چوو بۆ لای. زۆر گەنج بوو، ڕەنگی هەڵبزرکاو و لێوی شین هەڵگەڕابوو. هیچی لێ نەپرسی؛ نەیدەویست نارەحەتی بکات. داوای لەو کرێکارە پیرە کرد دەرمانی یاوکوژەی بدەنێ. ئەو وشەیەی لە سەر کاغەزێک نووسی و دایە دەستی. دەیویست بۆ کڕینی دەرمان پارەی بداتێ بەڵام ئەو کرێکارە قەبووڵی نەکرد و گوتی خۆیان خەرجی دەکێشن.

ئەو کرێکارە دوای چەند خولەک تاراسی بە تەنیا وەگیر هێنا و گوتی:

ـ چەند ساڵە ئاوارەم، دنیام قوونەکەو کردووە و هەموو شوێنێک گەڕاوم. خەڵکی جۆراو جۆرم دیوە، بەڵام تا ئێستا تووشی پیاوێکی ئاوا باش و بەڕێز نەهاتووم. ئەم پیاوە نەک جنێومان پێ نادا، بەڵکوو جێگاکەی خۆشی پێداین؛ دیارە کەسانی باشیش هەن!

نۆخلیدۆڤ خۆی لە دنیایەکی تازەدا دیبۆوە. ئەم دنیایەی ئێستا لەگەڵ ئەوەی دیتبووی زۆر جیاواز بوو. لە ڕوخساری کز و ڕەنگ بزرکاو و تاوەسووتی کرێکارەکانی ڕوانی. هەستی کرد ئەوانە کەسانێکی تازە و جیاوازن. خەم و شادی و کار و ژیانی ئەوان زۆر خۆمانە و ئاوێنەی پاکی و

ڕاســتی بــوو. دنیــای ئەوان لەگەڵ دنیــای ئەو جیــاواز بــوو. ڕســتەکەی کوورچاگینی وەبیر هاتەوە:

Le Voil, Le Vrai grand monde[٧٧] .

ـ بەڵێ! ئەم شوێنە، ئەم پانتاییيە سەرسووڕ هێنەر بوو، لەگەڵ ئەو ژیانە پڕ لە ناز و نیعمەتە زۆر جیاواز بوو کە ئەوی تێدا گەورە بووبوو. وەک گەشتیارێکی جیهان دەچوو کە دنیایەکی نوێ و نەناسراوی دۆزیبێتەوە. هەستی بە شادی دەکرد!

77 ـ تیەح! چ دیمەنێکی سەیروسەمەرەیە!

# یەک

ماسلۆڤا نزیکەی پێنج هەزار کیلۆمەتر لەگەڵ کاروانەکە ڕێگای بڕیبوو. بە شەمەندەفەر و هێندێ جاریش بە پاپۆڕ هەتاگەیشتبوونە پێرم[78].

ئەو هەتا ئێرە لەگەڵ دیلە ئاساییەکان هاوڕێ و هاونشین بوو. لەم شارەش بوو کە نۆخلیدۆڤ بە ڕێنوێنیی خاتوو وێرا، توانایی و دەسترۆیشتوویی خۆی بە کار هێنا و ئەوی بۆ دەستەی دیلە سیاسییەکان ڕاگویست.

سەفەرەکەی هەتا پێرم زۆر پڕ زەحمەت و دژواتر بوو؛ جێگا کەم بوو، نێو ڤاگۆنەکان پیس بوون و مێش و مێشوولە ئاراوقارای لێ هەڵگرتبوون؛ لەوەش خراپتر پیاوانی هەوەسباز دەستیان لە کۆڵ نەدەکردەوە و بەردەوام بە دوایەوە بوون. دەگەیشتنە هەر وێستگەیەکی گرنیگ، پاسەوانەکان دەگۆڕان؛ بەڵام شتێک کە نەدەگۆڕدرا ویست و داواکانی ئەوان بوو. پێوەندیی ژیانی بەندی لەگەڵ هاوڕێیان و پاسەوانەکان شتێکی ئاسایی بوو، ئەگەر ژنێکی جحێڵ نەیویستایە دەست لەگەڵ پیاوێک تێکەڵ کا، ناچار بوو شەو و ڕۆژ وریا بێت و ئاگاداری لە خۆی بکات. ماسلۆڤا کە هەم شۆخوشەنگ بوو و هەم پێشینەی لەشفرۆشیی هەبوو، زیاتر لە ژنانی دیکە خۆیان تیهەڵدەقوتاند و لە مەترسیدا بوو؛ ترسی هەمیشەیی و ئاگاداری لە

78 . Perm شارێکە لە ئۆراڵ، هەڵکەوتەوو لە ڕۆخی ڕووباری کاماس.

خۆ کردن ئازاری دەدا و چونکە ئامادە نەبوو دەست لەگەڵ پیاوان تێکەڵ بکات، دەردەسەرییان بۆ دروست دەکرد و ئازاریان دەدا. تەنیا شتێک کە ئەم سەفەرە پڕ مەترسییەی بۆ ئاسان کرد بۆوە و دەیتوانی تاملّی بکات یارمەتییەکانی فێدۆزیا و تاراس بوو. تاراس کە بۆی دەرکەوتبوو ژنەکەی لەگەڵ چ مەترسی و دەردەسەرییەک سەر دەسوێ، لە نیژنی نۆگۆرۆد بە دواوە چاوپۆشیی لە ئازادی کرد و چووە ڕیزی بەندییەکانەوە و دوای ئەوە وەک بەندییەکی ئاسایی ڕەگەڵ کاروانەکە کەوت.

ماسلۆڤا لەو ڕۆژەوە چووە دەستەی بەندییە سیاسییەکانەوە کەوتە بارودۆخێکی باشترەوە. شوێنێکی باشتریان دەدا بە بەندییە سیاسییەکان و خواردنی باشتریان دەدانێ چونکە ئەوان نەدەچوونە ژێر باری زۆرەملی و بەرەڤانییان لە مافی خۆیان دەکرد. لە ڕوانگەی ڕەوشت و فێرکاریشەوە جیاواز بوون. ماسلۆڤا ئیتر دڵی حەسا بۆوە. هیچ کەس کاری بە سەریەوە نەبوو و نەدەترسا دەستدرێژیی بکرێتە سەر، لە هەمووشی گرنگتر لەگەڵ کەسانێک ناسیاویی پەیدا کرد کە زۆر شتیان فێر کرد و ئاڵوگۆڕێکی باشیان بە سەر بیرو باوڕەیدا هێنا.

لە وێستگەکانی نێو ڕێگادا لەگەڵ دیلە سیاسییەکان لە شوێنێک دەمایەوە؛ بەڵام چونکە مرۆڤێکی تەندروست بوو، مەودای نێوان وێستگە و شوێنی نیشتە جێ بوونی بە پێیان دەبڕی و لە تۆمسک[٧٩] بە دواوە، لەو ڕێگا بڕینەشدا دوو کەسی لە بەندییە سیاسییەکان لەگەڵدا بوو، یەکیان ماریا پاولۆڤنا، کە کچێکی چاونەرم و مێهرەبان بوو، نۆخلیدۆڤ لە کاتی سەردانی بەندییەکاندا چاوی پێی کەوتبوو و چاوە جوانەکانی ئەوی لە بیر نەدەچۆوە؛ ئەوی دیکەیان سیمونسۆن بوو؛ پیاوێکی گەنم ڕەنگ و قژئاڵوزکاو و چاو بە

79 ـ تۆمسک Tomsk لە باشووری سیبیریای ڕۆژاوا هەڵکەوتووە.

قووڵدا چووبوو، بۆ یاکووتسک[٨٠] دوور خرابۆوە. ماریا پاولۆڤنا بە پێیان دەهات؛ چونکە لە نێو عارەبانەکەدا جێگای خۆی دابوو بە ژنێکی دووگیان. سیمۆنسۆنیش نەیدەویست کەڵک لە هەڤیازییەکانی خۆی وەرگرێ و سواری هێلنیگە یان عارەبانە بێ.

ئەم جێگۆڕکێیانە کاتێک کرا کە گەیشتنە دوایین وێستگەی نزیک شاری گەورە و ملازمێکی تازە ئەرکی فەرماندەریی کاروانی لە ئەستۆ گرتبوو.

بەیانیی ڕۆژێکی خەمناکی سپتامبر بوو؛ بایەکی ساردی دەهات و بارِنی دەکرد. بەندییەکان کە چوارسەد پیاو و پەنجاژن بوون، لە گۆڕەپانی نزیک وێستگە ڕاوەستا بوون و چاوەڕوانی فەرمانی وەڕێکەوتن بوون. چەند کەس لە دەوری عەریف کۆبوو بوونەوە تاکوو جیرەی چل و هەشت سەعاتی داهاتوو وەرگرن و تاقمێکیش چوو بوون لەو فرۆشیارە گەڕۆکانە شت بکڕن کە لە ترسی تەزووی کزەبا لە پەنا دیوارێک کەلوپەلەکانیان بڵاو کردبۆوە؛ هەرا و ژاوەژاویان وەڕێخستبوو! فرۆشیارێک بە دەنگی بەرز هەرای دەکرد و بە شتەکانی خۆیدا هەڵدەگوت، یەکیان خەریکی چەنە چەن بوو، یەکێکیش پارەکانی دەژمارد و یەکێکی تر ئەوەی کڕیبووی دەیخستە نێو توورەکەکەیەوە. فرۆشیارە گەڕۆکەکان هەموو شتێکیان پێبوو؛ لە نانی تازەوە بگرە هەتا کولێرە ناسکە و ماسی و ماکارۆنی و کاشا[٨١]، جەرگ و گۆشت و هێلکە و شیر. تەنانەت یەکێک لە فرۆشیارەکان بەرازێکی سوورەوە کراوی بۆ فرۆشتن هێنا بوو. ماریا و ماسلۆڤا پێکەوە چوو بوون بۆ شت

80 ـ یاکووتسکIakoutsk لەو کاتەدا ناوەندی کۆماری سەربەخۆی یاکووتی و یەکێک لە ناوەندەکانی دەرهێنانی ئاڵتوون بوو.

81 ـ کاشا: خواردنی تایبەتی خەڵکی ڕووسیایە و سووپێکە بە هەرزن و گەنمی ڕەش ساز کراوە.

کــڕین. جزمەیــان لە پێــدا و لەچکەیــان بە ســەردا دابــوو و تووپوولیــان[82] لەبەرکردبــوو. سیمۆنســۆن لییــان دوور کەوتبــۆوە و لە ســەر پلیکانێــک دانیشــتبوو. چــاکەتێکی ئەســتووری لەبەردا و کەوشــی لاســیقی لە پێــدا بــوو. گیاخۆرێکی دەمارگرژ بوو. تەنانەت نەیدەویست جلەکانیشی لە پێستی ئاژەڵ بێت. لەو کاتەدا دەفتەری یادداشــتەکەی دەرهێنا بوو و شــتێکی دەنووســی کە لەو کاتەدا بە بیریدا هاتبوو:

«ئەگەر زیندوولەیەک کە بە چاو نابینرێ، بیتوانیبایە کتێبێک ســەبارەت بە نینۆخ بنووسێ، دوای ساڵانێکی زۆر متاڵا و لێکۆڵینەوە دەینووسی گەورەیی و پانتــایی نینــۆخی مــرۆڤ وەســف نــاکرێ و دنیــایەکی گەورە و بێ کۆتــاییە! ئێمەش سەبارەت بە گەورەیی جیهان شتێک دەنووسین و دوای لێکۆڵینەوە و متاڵای زۆر دەڵێین دنیا بێ پایانە و هەڵەی ئێمەش لەو چەشنەیە!»

ماسلۆڤا و ماریا پاولۆڤنا هێلکە و غوراِبی و ماسی و نانی تازەیان کڕی و خســتیانە نێــو توورەکەکانیــانەوە؛ بەڵام لەو کــاتەدا جموجۆڵێــک کەوتە نێــو بەنــدییەکانەوە؛ هەمــوو بێــدەنگ بــوون و ڕیزیــان بەســت. فەرمانــدەر بەرلە ڕادەست کردنی کاروانەکە بە فەرماندەری نوێ، دواییین فەرمانی پێدا.

ناوەکانیــان خوێنــدەوە؛ زنجیرەکانیــان چــاو لێکــرد. دیلەکانیــان دوو- دوو دەستە بەندی کرد و هەموو ئەو شتانە بە شێوەیەکی ئاسایی بەڕێوە چوون. ملازمــی فەرمانــدەر لەو کــاتەدا وەهــا بە تونــدی نەڕانــدی منداڵێک لە ترســانا دەســتی بە گریــان. بــۆ چەنــد ســاتێک هەمــووان بێــدەنگ بــوون و لە ناکــاو ســـرتوخورت کەوتە نێــو بەنــدییەکانەوە، ماســـلۆڤا و ماریــاش بە هەڵەداوان چوونە پێشێ بۆ ئەوەی بزانن چی ڕووی داوە.

---

82 ـ تووپوول Toupoule کەڵپۆسێکی گەرمی زستانە لە پێستی مەڕ ساز کراوە.

# دوو

ماسـلۆڤا و ماریـا لەگەڵ دیمەنێکـی سـەیر و سەرسـوورِ هێـنەر بەرەو ڕووبـوون: ملازمێکـی زرتەبـۆز و فیلەنـتەر بە سـمێڵی درێـژ و بـۆزەوە، دەسـتی ڕاستەی ڕادەتەکاند؛ چونکە زللەیەکی توندی لە بناگویی دیلێک سرەواند بوو و دەسـتی خـۆی ژانـی پێگەیشـتبوو. هەر لەو کـاتەدا ئەوی جنێـوی دەیزانـی بەو چارەڕەشەی دا. دیلی زللە لێدراو کورِێکی کەلەگەت و بەلەباریکە بوو؛ سەریان تاشـیبوو؛ کراسـێکی کـورت و پـانتۆڵێکی قـوڵەی لەبەردابـوو. خـوێنی لـووتی بەر بووبـوو. بە دەسـتێکی بەر لـووتی گرتبـوو بە دەسـتەکەی دیکەشـی قـۆڵی کچۆڵەیەکی گرتبوو کە بە جلوبەرگی شرِۆڵەوە دەگریا و هەنیسکی دەدا.

ـ پیشانت دەدەم سەرپێچی یانی چی؟ هۆی! وەرە پێشێ! ئەو منداڵەی لێ وەرگرە. ئەو خوێرِییە کەلەپچە کەن، دەی!

بەسـەرهاتەکە بەم شـێوەیە بـوو، هاوسـەری ئەو بەنـدییە لە تۆمسـک بە نەخۆشـیی گرانەتـا مردبـوو، سـەر پەرشـتیی کـچە چکۆڵەکەشـیان کەوتبـووە ئەستۆی ئەو و چونکە ناچار بوو منداڵەکە بە باوەش بگێرِێ، سەربازەکان کەلەپچەیان نەدەکردبوو، ئەو ملازمە زەبەلاحەش لە ناکاو بەوەی زانیبوو، بۆ ئەوەی هەر لە سـەرەتاوە چاوترسـێنیان بکـات، لە بەر چـاوی هەمـووان لێـی دابوو.

سەربازێک و دیلێکی ڕیشن نزیکتر لە هەمووان ڕاوەستا بوون و جارێک چاویان لە منداڵەکە دەکرد کە دەگریا و جارێکیش لە ملازمە زەبەلاحەکە. یەکێک لە سەربازەکان دەیویست منداڵەکەی لێ بسێنێ، بەڵام منداڵەکە جارلەگەڵ جار پیرانی دەبەست و گریانەکەی زیادی دەکرد. سرتوخورت کەوتبووە نێو دیلەکانەوە و وردە وردە دەنگیان هەڵدەبڕی.

ـ لە تۆمسکەوە هەتا ئێرە هیچ کەس ئەم چارەڕەشەی کەلەپچە نەکردووە.

ـ ئەوە خۆ تووتکە سەگ نییە، بەچکەی بنیادەمە.

ـ دایکی نییە؛ باوکی دەبێ لە باوەشی بکات.

ـ ئەم دەستوورە بە دژی یاسای دەوڵەتە.

ـ ملازمی زەبەلاح وەک کەسێکی مارانگەستوو دەینەڕاند.

ـ هۆی! کێ ئەو قسەیەی کردووە؟ دەبێ یاسایەکتان پیشان بدەم بستێک ڕۆنی لە سەر بێ. هۆی! کێ بوو باسی یاسای کرد؟... تۆ بووی؟

بەندییەکی خڕپلانە و دەموچاو پان کە لەبەر دەرگاکە ڕاوەستابوو گوتی:

ـ هەمووان ئەوەیان گوت... ئەوە قسەی هەموو...

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو، ملازم مشتێکی بە دەمیدا کێشا.

ـ خەریکی ئاژاوە ساز دەکەی؟ ئێستا پیشانت دەدەم ئاژاوە یانی چی. هەمووتان وەک سەگ بەکلک ڕادەکێشم و پەتتان دەکەم، بۆ ئەوەی دەوڵەت نیشانە و میدالیام بداتێ. ئەو منداڵەی لێ وەرگرن.

دیلەکان بێدەنگ بوون. سەربازێک منداڵەکەی لێ وەرگرت. منداڵەکە قیژاندی. سەربازێکی تر باوکی منداڵەکەی کەلەپچە کرد.

ـ ئەو منداڵە بەرن بۆ لای ژنەکان.

منداڵەکە دەیقیژاند و خۆی بۆ لای باوکی دەکوتا؛ ماریا پاولۆڤنا هاتە پێشێ.

ـ جەنابی ملازم! ئەگەر ئیزن بفەرموون من منداڵەکە دەبەم.

ـ تۆ کێی؟

ـ من بەندییەکی سیاسیم.

دەموچاوی ناسک و چاوی جوانی ماریا پاولۆڤنا کاری خۆی کرد. ملازم تۆزێ خاو بۆوە.

ـ بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە؛ گرنیگ ئەوەیە دیلی ئاسایی دەبێ کەلەپچە بکرێ.

ـ بەو منداڵەوە دەتوانێ بۆ کوێ هەڵێ؟

ـ لەگەڵم دامەبەستن؛ هیچ کەس هەقی نییە قسە لە قسەمدا بکات؛ زوو منداڵەکە ببەن.

ماریا پاولۆڤنا دەستی منداڵەکەی گرت و دەستی بە سەریدا هێنا و لاواندییەوە. دەیویست لەگەڵ خۆی بیبا؛ بەڵام کارێکی سانا نەبوو. ماسلۆڤا هاتە پێشێ و گوتی:

ـ ماریا! ئەو منداڵە خووی بە من گرتووە؛ لێم گەڕێ با قسەی لەگەڵ بکەم.

غوڕابییەکی لە توورەکەکەی دەرهێنا و دای بە منداڵەکە. کچە ماسلۆڤای دەناسی و خووی پێگرتبوو. وردە وردە ئارام بۆوە و دەستی ماسلۆڤای گرت. هەراوهوریاکە دامرکا. دەرگایەکی چکۆڵە کرایەوە و بەندییەکان ڕیز بوون و لەوێ چوونە دەرێ. پاسەوانەکان یەک بە یەکدا هەموویان ژماردن. کیسە و کۆڵەپشتییەکانیان خستە سەر هێلینگە و عارەبانەکان. نەخۆش و بێ هێزەکانیان سوار کرد و ئەوانی دیکە بە پێیان وەڕێ کەوتن. ماسلۆڤا منداڵەکەی لە باوەش کردبوو.

سیمۆنسۆن کە هەتا ئەو کاتە بێدەنگ بوو، بە هەنگاوی توند و پتەو چوو بۆ لای ملازمی زەبەلاح و گوتی:

ـ جەنابی ملازم! کارێکی زۆر خراپت کرد.
ـ دەمت داخە و برۆ بە دوای کاری خۆتدا!
ـ کاری من ئەوەیە پێت بڵێم کارەکەت زۆر ناحەز بوو جەنابی ملازم!

چاوی لە چاوی ملازمی زەبەلاح بڕیبوو. بەڵام ملازم بێ ئەوەی گوێی بداتێ فەرمانی وەڕێ کەوتنی دا و سواری فەتیوون بوو.

کاروانەکە وەڕێ کەوت . ڕێگاکە خاکی و پڕ لە کەندولەند و ئەسکوند بوو. ڕێگاکە بە نێو لێڕەوارێکدا تێدەپەڕی.

## سێ

ماسلۆڤا کە چەندین ساڵی تەمەنی بە خۆشگوزەرانی و ڕابواردن و هەوسبازی تێپەڕاندبوو، چەند مانگیش لە لەگەڵ بەندییە ئاساییەکان هاونشین بوو، لەو کاتەوە چوو بووە کۆڕی بەندییە سیاسییەکانەوە، هەستی دەکرد کەوتۆتە سەر ڕێگایەکی نوێ و باشتر دەیتوانی دژواری و ئازارەکان تامڵ بکات. دوای بڕینی بیست ـ سی کیلۆمەتر ڕێگا و خواردنی باش و حەسانەوەی بیست و چوار سەعاتە، شەکەتی لە لەشی دەرچوو بوو. لەگەڵ دۆستانی تازە ئاشنا بووبوو. ئەوان لەگەڵ هەموو دۆست و ئاشناکانی پێشووی جیاوازبوون. وردە وردە هەستی دەکرد پێی ناوەتە دنیایەکی تازەوە. لە ڕابردوودا لەو جۆرە مرۆڤانەی نەدیبوو و تەنانەت بە بیریدا نەدەهات کە کەسانێکی لەو جۆرە هەبن.

«بۆچی ئەوەندە لە حوکمی دادگا و سزادان دەترسام؟ بۆچی ئەوەندە گریام و کوڕووزامەوە؟ دەبێ شوکری خودا بکەم کە تووشی ئەم بارودۆخە هاتم و ئەو هاوڕێ باشانەم پەیدا کرد!»

زۆر بە ئاسانی بۆی دەرکەوت کە هاوڕێ نوێیەکانی بۆچی ئەو ڕێگایەیان هەڵبژادووە. ئەو ژنێک بوو لە نێو خەڵکەوە سەری هەڵدا بوو، هەر بۆیە زۆر زوو لەگەڵ ئەوان بوو بە هاودڵ و هاوڕێ. تێگەیشت کە ئەوان بە دژی دەسەڵاتدران خەبات دەکەن و سەرەڕای ئەوەی هێندێکیان خۆیان لە چینی خان و ئاغاکانن، دەستیان لەو دەسەڵات و هەڤیازییانە هەڵگرتووە و بۆ ئازادیی خەڵک و ڕزگاریی چینی بێبەشی کۆمەڵگا ڕاپەڕیون و تێدەکۆشن. ماسلۆڤا لە دڵەوە ڕێزی بۆ هاوڕێ نوێیەکانی دادەنا و لە نێو ئەواندا ماریا پاولۆڤنای لە هەمووان خۆشتر دەویست و لە دڵەوە دەیویست کەسایەتییەکی وەک ئەوی هەبێ. دەیزانی ماریا کچی ژینڕاڵێکە، جوان و شۆخوشەنگ و دەوڵەمەندە، بەسێ زمان قسە دەکات و لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا وەک کرێکارێکی ئاسایی دەژی؛ ئەو پارەیەی براکەشی بۆی دەنێری بە سەر هاوڕێکانیدا دابەشی دەکات. دەیدی بە شێوەیەکی ساکار و هەژارانە جلوبەرگ دەپۆشێ، گوێ بە ڕازاوەیی ڕواڵەت نادا و بە خۆی ڕاناگا، ناز و عیشوە بۆ پیاوان ناکات و نایهەوێ سەرنجیان ڕابکێشێ، ئەوەش بەلای ماسلۆڤاوە زۆر گرنیگ و سەرسووڕهێنەر بوو. ماریا دەیزانی ژنێکی جوان و شۆخوشەنگە و حەزی لە جوانی بوو بەڵام نەیدەویست خۆی بنوێنی و پیاوان بخاتە داوی جوانیی خۆیەوە، تەنانەت لە دڵڕفێنی و هەوسبازی بێزار بوو. پێوەندیی ئەو لەگەڵ پیاوان بە شێوەیەکی دۆستانە بوو وەک هاوڕێ چاوی لێدەکردن. ئەوانەی ئەویان دەناسی، پەسنی ساکاری و خاکەڕاییەکەیان دەدا و ڕێزیان بۆ دادەنا؛ بەڵام ئەگەر پیاوێک نەیناسیبایە

و خـۆی تێهەڵقوتانـدبایە، ماریـا دەرهەڵـدەبوو و پیـاوەی وا لێـدەکرد ئیتـر نەوێـرێ لە حانـدی سـەر هەڵێنـێ. زۆر جـار ئەم مـاجەرایەی بە پێکەنیـنەوە دەگێڕایەوە:

ـ ڕۆژێـک، پیاوێـک کەوتە شـوێنم. زۆر سـمنج بـوو. ڕقـم هەسـتا و بـۆی گەڕامەوە. هەردوو شـانیم گـرت و ڕامتڵەکانـد؛ گوڕانـدم بە سـەریدا و وەهـام تۆقاند، بە پڕتاو تێیتەقاند و ئیتر نەیوێرا ئاوڕ بداتەوە.

لە منداڵییەوە ڕقـی لە خـان و ئاغـاوات بـوو؛ حەزی دەکـرد بە شـێوەیەکی ساکاربژی. بە جێی ئەوەی بچێت بۆ کۆشک و تەلاری پڕشکۆ، حەزی دەکرد لەگەڵ نۆکەر و کلْفەت و ئاشپەز و عارەبانەچی هەستێ و دانیشێ.

ـ لە ناخی دڵەوە پێم خۆش بوو لە عارەبانەچی و ئاشپەزەکان نزیک بم. حەزم بە چارەی خـانم و ئاغاکـان نەدەکرد و لێیـان بێزار بـووم. زۆر زوو لە دانیشتن و ئاخافتن لەگەڵیان ماندوو دەبووم. کە هێندێ گەورەتـر بـووم، بۆم دەرکەوت ناتوانم لە چوارچێوەی وشک و فەرمیی مـاڵی باوکمدا بژیم و بۆم تامڵ نەدەکرا. دایکم زۆر زوو مـرد. بـاوکم خۆش نەدەویست. تەمەنـم نۆزدە ساڵان بوو لە ماڵی باکم هاتمە دەرێ و لە کارخانەیەک بووم بە کرێکار.

ماریا ماوەیەک کرێکاریی کردبوو، ماوەیەکیش لە گوند کاروبـاری مەزرای دەکـــرد. دیســـان گەڕابـــۆوە بـــۆ شـــار و لە بینایەکـــدا لەگەڵ هاوڕێیـــانی چاپخـــانەیەکی نهێنییـــان دانـــابوو، هەر لەوێـــش قۆڵبەســـت کـــرا و کەوتە بەندیخانەوە و لە دادگـا حوکمی زینـدانی درێژخـایەنی بە سـەردا سـەپا. ماریـا حاشـای لە برێـک لە ڕاسـتییەکان دەکـرد، بەڵام ماسـلۆڤا لە هێنـدێ کەسـی بیستبوو کە شەوێ لەو ماڵەوە تەقەیان لە پۆلیس کردووە و ماریا بێ ئەوەی لە ماوەی تەمەنیدا دەمانچەی بە دەستەوە گرتبێ، تاوانی یەکێک لە هاوڕێیانی خستە ئەستۆی خۆی.

کاتیوشا هەتا زیاتری دەناسی، زیاتر بۆی دەردەکەوت کە ماریا لە هەر کوێ بێ و لەهەر بارودۆخێکدا بێ، گرنگی بە خۆی نادا؛ بەردەوام لە بیری خەڵکی دایە و دەیهەوێ یارمەتییان بدات، یەکێک لە هاوڕێیانی بە گاڵتەوە دەیگوت: ماریا لە بەیانییەوە هەتا شەوێ خەریکی ئەرکی چاکەکارییە؛ ڕاستیشی دەکرد. هەر وەک ڕاوچییەک کە ماوەیەک لە بۆسەدا دەمێنێتەوە هەتا باڵندەیەک ڕاودەکا، ماریاش هەمیشە لە هەلێک دەگەڕا چاکە لەگەڵ کەسێک بکات و بۆ خەڵک و کۆمەڵگاکەی بە کەڵک بێ. وردە وردە چاکەکاری وەک بەرنامەیەکی ڕۆژانەی لێهاتبوو بۆی و بووبووە ئامانجی ژیانی. وای لێهاتبوو جگە لە چاکەکاری بیری لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە. کاتێک ماسلۆڤا هاتە ڕیزی سیاسییەکانەوە، ماریا پێی دڵگران بوو، بەڵام دوای ماوەیەک چووە دڵییەوە و تەنانەت لە ناخی دڵەوە خۆشی دەویست و بە کەسێکی نزیکی خۆی دەزانی. ئەو خۆشەویستییەش وەها شوێنی لە سەر ژیانی ماسلۆڤا دانا کە ماریا زۆر هۆگری بوو و ئیتر ماسلۆڤا بە ڕۆح و گیانەوە چووە ڕیزی شۆرشگێڕانەوە و بیروباوەڕەکانی ئەوانی قەبووڵ کرد. چونکە ئەویش لە داوێنتەڕی هەوەسبازی بێزار بوو، ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر لە یەک نزیک دەبوونەوە. جیاوازیشیان تەنیا ئەوە بوو، ماسلۆڤا وازی لە هەوەسبازی و لەشفرۆشی هێنا بوو؛ چونکە دووکەڵی ئاکامەکەی بە چاویدا چوووبوو، ماریاش بەو هۆیە لە هەوەسبازی بێزار بوو کە بە کارێکی سووک و بێهوودەی دەزانی و پێی وابوو حەیا و ئابڕووی مرۆڤ دەخاتە مەترسییەوە و تووشی زەلکاو و گەناویکی ڕەش و بۆگەنی دەکات.

# چوار

لەو سەفەرەدا دوو کەس شوێنیان لە سەر ماسلۆڤا دانا بوو؛ یەکیان ماریا بوو کە ماسلۆڤا زۆری خۆشدەویست، ئەوی دیکەشیان سیمۆنسۆن بوو کە ئەو ماسلۆڤای خۆشدەویست.

تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ بە شێوەیەکی ئاسایی پێوەندیی بە دوو شتەوە هەیە؛ یەکیان ئەوەی لە وجوودی خۆیدایە و ئەوی دیکەیان ئەوەی لە خەڵکی وەردەگرێ، ئەو شتەش کەوا دەبێتە هۆی جیاوازیی خەڵک، پێوەندی و نزیکایەتیی نێوان ئەو دوو هۆکارەیە. کەسانێک، یان دەکرێ بڵێین زۆربەی خەڵک، بۆ بیر کردنەوە و سەربەخۆیی ئەندێشە هەوڵ نادەن و خۆی بۆ ماندوو ناکەن؛ وەک تایەیەک وان کە تەنیا بە شێوەی ئاسایی و لە باری خۆی هەڵدەسووڕێ. ئەم دەستەیە لە وتە و ئاکاریاندا خەڵکی دەکەنە سەرمەشقی خۆیان و تەنیا بەو ڕێگایەدا دەڕۆن کە خوویان پێگرتووە و داب و نەریتەکان فێری کردوون؛ بەڵام کەسانێک هەن بەو جۆرە نین و بە ماتۆڕی ئیرادە و بیری خۆیان هەڵدەسووڕێن و ڕچەی بیرۆکە و بیروباوەڕێک دەگرنە بەر کە بە یارمەتیی ئەندێشە و ئەزموون دۆزیویانەتەوە؛ کاتێک ئەندێشە و بیروباوەڕێک وەردەگرن کە لە سەنگی

محەکی بدەن و باری باشی و خراپییەکەی هەڵسەنگێنن؛ سیمۆنسۆن لەو جۆرە کەسانە بوو.

قوتابیی پۆلی دواناوەندی بوو کە بۆی دەرکەوت باوکی ماڵ و سامانەکەی لە کاتی دەسەڵات و پیشە گرنگەکەیدا لە ڕێگای نایاساییەوە بە دەست هێناوە. ڕۆژێک چوو بۆ لای باوکی و ڕاشکاوانە پێی گوت: باوکە! ئەو ماڵ و سامانە وا لە ڕێگای ناڕەواوە بە دەست هاتووە، دەبێ بە سەر خەڵکدا دابەش بکرێ! باوکی تووڕە بوو و ئامۆژگاریی کرد کە ئیتر لەو جۆرە قسانە نەکات. سیمۆنسۆن ئامۆژگاریی باوکی بە گوێدا نەدەچوو. دوای ماوەیەک، ماڵی باوکی بەجێهێشت و دەستی بە ماڵ و سامانی باوکی ڕموده نەکرد، چونکە بە ئەزموون بۆی دەرکەوتبوو، کەموکووڕییەکانی کۆمەڵگا بە هۆی نەزانییەوەیە، دوای تەواو کردنی زانکۆ چوو بۆ گوند و بوو بە مامۆستای قوتابخانە. لەوێش دەرسی بە منداڵان دەگوت و لەگەڵ جووتیارەکان دادەنیشت، قسەی بۆ دەکردن و پەردەی نەزانیی لە بەر چاویان لادەدا. کاربەدەستانی پلەبەرز کە دەیانزانی کرانەوەی چاو و گوێی وەرزێڕەکان مەترسیی بە دواوە دەبێ، قۆڵبەستیان کرد و پەروەندەکەیان دا بە دادگا. کاتی لێپێچینەوەی دادگا، دەنگی هەڵبڕی و گوتی دادگای ئەم وڵاتە شیاوی ئەوە نییە من دادگایی بکات. بەڵام هیچ کەس گوێی بە قسەکانی نەدا. ئەویش لە دانیشتنەکەدا بێدەنگ بوو و ئەوی پرسیاری لێیان کرد وەڵامی نەدایەوە. حوکمی دوور خرانەوە بۆ ئارخانگلسکی بە سەردا سەپا. لەوێ بیر و ئەندێشە لە مێشکیدا گوورا. ڕێسایەکی بۆ خۆی دانا بوو کە بە موو لێی لانەدەدا بە پێی فەلسەفەی ئەو لەم جیهانەدا خوێنی ژیان لە دەماری هەموو شتێکدا دەگەڕێ و شتێکی بێ ڕۆح و مردوو بوونی نییە. تەنانەت ئەو گیانی لە هەموو شتێکی وشک و بێ ڕۆحدا دەدی، هەستی پێدەکرد و لە سەر ئەو

باوەڕە بوو کە سەرجەمی ئەو شتانە جیهانێک پێک دێنن کە زۆر گەورەیە و ئێمەش بەشێکی چکۆڵەی ئەو جیهانەین. کەوایە مافی ئەوەمان نییە شتەکانی دەوروبەری خۆمان لە نێو بەرین و تووشی گەندەڵێی بکەین. دژایەتیی لەگەڵ هەمـوو شـەڕ و سـێدارە و کوشـتن و تەنـانەت ڕاو کردنـی ئـاژەڵ و پەلەوەرەکـانیش دەکـرد؛ دژی خسـتنەوەی بەرە و ڕەگەز بـوو، ئەوەشـی بە کـارێکی سووک و چروک و بێ نرخ دەزانی و لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە مرۆڤ دەبێ بە جێی خستنەوەی بەرە ئاگاداری لە سروشت و ئەو شتانە بکـات کە لە دەوروبەریەتـی و خراپکـاری نەکـات. لە ڕاسـتیدا دەبـێ ڕۆڵـی پاگۆسیت[٨٣] ەکان بگێڕی.

بە بڕوای ئەو مرۆڤە ڕەبەنەکـان دەبێ وەک خـانۆکە چاکەکارەکـان یـان ڤاگۆسـتیەکان بۆ یارمەتیدانی کەسـانی لاواز و لێ قەومـاوی کۆمەڵگا هەوڵ بـدەن و ڕێـگە نەدەن ژیانیـان بکەوێـتە مەترسـییەوە. خـۆی لە سـەرەتای لاویـیەوە خـووی بەوە گرتبـوو کە بەلای هەوس و داوێنتەڕیـدا نەڕوات و لە بیری یارمەتیدانی خەڵکیدا بێ. ئەو و ماریا پاولۆڤنا لەو بوارەدا هـاوبیر و هاوکـار بـوون و هەر دووکیـان ئەرکی خـانۆکە چاکەکارەکانیـان بە ئەنجـام دەگەیاند.

خۆشەویستیی سیمۆنسۆن بۆ کاتیۆشا لەگەڵ فەڵسـەفەکەی دژواز نەبوو؛ چـونکە ئەشـقەکەی ئاسـمانی و ئەفلاتـوونی بـوو و پێوەنـدی بە هەوەسـی جەسـتەییەوە نەبـوو، ئەو چەشـنە ئەشـقەش خـانۆکە چاکەکارەکـان تووشـی مەترسی ناکات!

---

83 ـ Phagocytes ئەو خانۆکـانەی کە زیـاد نـاکەن، بەڵام ئاگـاداری لە خـانۆکە لاواز و نەخۆشەکان دەکەن و یارمەتییان دەدەن.

فەڵسەفەی سیمۆنسۆن تەنیا تایبەتی ئەو بوارە نەبوو، زۆر خۆڕاگر بوو؛ هەر کاتێک بڕیاری دەدا کارێک بەڕێوە بەرێ هیچ شتێک نەیدەتوانی تەگەرە و کۆسپ بخاتە سەر ڕێگەی و هەتا کۆتایی دەچووە پێشێ، ئەو پیاوە بەو تایبەتمەندییانەوە شوێنی لە سەر ڕۆح و مێشکی ماسلۆڤا دانا بوو. خۆشەویستییەکەی ئەو لیڵ و شاراوە بوو، بەڵام ماسلۆڤا هەر بە یەکەم ڕوانین و هەست و خۆماکی ژنانە لە ڕاستییەکە تێگەیشت و خۆی بۆ قەبووڵ کردنی ئەشقی ئەم مرۆڤە جیاوازە ئامادە کرد. نۆخلیدۆڤ بۆ گەورەیی نواندن و قەرەبوو کردنەوەی ڕابردوو دەیویست زەماوەندی لەگەڵ بکات بەڵام سیمۆنسۆن ئەوی وەک خۆی خۆشدەویست، هەر بەو بارودۆخ و ورە و کەسایەتییەوە ئەوی بە ژنێکی شیاو دەزانی. ماسلۆڤاش لەو کاتەوە ئەشقی پڕ لە ڕێزی سیمۆنسۆنی بۆ دەرکەوت، هەوڵی دەدا کارێک نەکات ئەو پیاوە لە خۆی بێ هیوا بکات و هەڵسوکەوتێکی وای نەبێ کە هەستی ئاشقانەی سیمۆنسۆن بڕووشێنی.

ئەم ئەوینە لەو ڕۆژەوە سەری هەڵدا کە بەندییەکانیان ڕیزکردبوو بیانبەن بۆ تاراوگە، ماسلۆڤا لە ڕیزی ژناندا بوو، لە ناکاو دیتی پیاوێک لە نێو بەندییە سیاسییەکاندا بە چاوی شین و مێهرەبانەوە چاوی تێبڕیوە و هەر لەو ساتەوە بۆی دەرکەوت ئەم ڕوانینە مانایەکی قووڵی تێدایە. چاوی لە دەموچاوی مێهرەبان و خەیاڵاوی و قژی درێژ و ئاڵۆزی ئەو پیاوە کرد و هەستێکی سەیر لە ناخیدا بزووت کە لەماناکەی نەدەگەیشت. لە تۆمسک دیسان چاویان بە یەکتر کەوت و بێ ئەوەی شتێک بڵێن، لە دوورەوە نیگایان تێک هەڵەنگوت. سەرەنجیان پێکەوە ئاشنا بوو و لەو ڕۆژەوە کە ماریا پاولۆڤنا و سیمۆنسۆن هاتنە ڕیزی کاروانەکەوە و شان بە شانی ماسلۆڤا چەندین کیلۆمەتر ڕێگایان بڕی، ناسیاوییان زیاتر بوو. دوای ئەوە هەر کاتێک

لە کۆڕێکدا بووایەن و سیمۆنسۆن قسەی بکردایە، وشەی هێندە ساکار و ڕوونی هەڵدەبژارد دەتگوت ڕووی دەمی لە ماسلۆڤایە و دەیهەوێ ماسلۆڤا تێگەیێنێ کە لەو وتانە تێناگا و خوێندەواریی لە ئەوانی دیکە کەمترە.

هەموو شتێک ئەوانی لە یەکتر نزیک دەکردەوە و مانای بەو ئەشق و خۆشەویستییە دەبەخشی.

## پێنج

لە نیژنی[٨٤] هەتا پریم، نۆخلیدۆڤ تەنیا دوو جار توانیی کاتیۆشا ببینێ. لە نیژنی، ماوەیەکی کورت بەر لەوەی بەندییەکان سواری گەمیەی چارۆکەدار بکەن، چەند خولەکێک پێکەوە قسەیان کرد، لە پریم کە دیلەکانیان بە شێوەی کاتی ڕادەستی بەندیخانەی شارەکە کرد، لە نووسینگەی سەرۆک دیسان چاوی پێی کەوت و هەر دوو جارەکە خەمبار و دڵتەنگ هاتە بەر چاوی. زۆریشی لێ پرسی کە پێویستی بە چییە؟ ماسلۆڤا دەیگوت هیچی ناوێ و نۆخلیدۆڤ پێی وابوو دڵی لە ئەو ڕەنجاوە و دەیهەوێ تۆڵەی لێ بکاتەوە.

بەڵام لە ڕاستیدا وانەبوو؛ دژواری و گرفتاریی ئەو سەفەرە پڕ نەگەبەتییە توانا و تاقەتی لێ بڕیبوو. نۆخلیدۆڤیش لە دوورەوە چاوی لێبوو ئەو بەندییە چارەڕەشانە چ ڕەنج و ئازارێک دەکێشن و پاسەوان و کاربەدەستەکان سووکایەتییان پێدەکەن، لەوەش دەترسا ماسلۆڤا دڵتەنگ و هیوا بڕاو بێت و دیسان پەنا بۆ مەشرووب و جگەرە ببات، بەڵام لە تۆمسک کە چاوی پێی کەوت دڵنیا بوو. ئەو چاوپێکەوتنەش دوای ئەوە بوو کە نۆخلیدۆڤ توانیی لە

84 ـ ڕەنگە مەبەستی لە نیژنیNijni ، شاری نیژنی تاگیل بێ لە ناوچەی ئۆڕاڵ.

دەســەڵات و ناوبـانگی خـۆی کەڵـک وەرگـرێ و داوا بکـات ماسـلۆڤا لەگەڵ بەندییە سیاسییەکان لە شوێنێک بێ. ئەم جارەیان ماسلۆڤا ئارام بوو؛ چونکە دەوروبەرییەکـانی ئیتـر ئازاریـان نەدەدا و ناچـار نەبـوو شـەو و ڕۆژ بـۆ ئاگاداری لە خۆی وریا و بەخەبەر بێ. شادی و بڕوا بەخۆبوونی بەدەست هێنـابۆوە و سپاسـی لە کۆنـت نۆخلیـدۆڤ کـرد کە ئەوی بـۆ ڕیـزی بەنـدییە سیاسییەکان ڕاگوێستووە و لەگەڵ کەسانێکی باش ئاشنا بووە کە پێشتر هەر بیریشی لێ نەکردۆتەوە.

دوو مانـگ بڕینـی ڕێگـا و مـانەوە لە بەنـدیخانە و وێسـتگەکانی نێـو ڕێ زۆری شـوێن لە سـەر دانـابوو. هێنـدێ کـز بووبـوو؛ دەموچـاوی ڕەش داگەڕابـوو؛ هەر وەهـا شـەکەت و بـێ هێـز دەهـاتە بەر چـاو. بەر چـاوی و سووچی لێوی چرچولۆچی تێکەوتبوو. لەچکەیەکی لە سەر و قژی پێچابوو و ناز و عیشوە و دڵڕفێنی ئیتر پێیەوە دیار نەبوو. جلوبەرگ و ئاڕایشتەکەی زۆر سـاکار بـوو. ئەو گـۆڕانەش شـادیی لە دڵـی نۆخلیـدۆڤ گێڕابـوو. بە چـاوێکی تـر لێـی دەڕوانـی و هەسـت و سـۆزی سـەبارەت بە ئەو لە چـاو ڕابردوو جیاواز بوو. ئەم هەستە لەگەڵ ئەشقی پاک و ئاسمانیی سەردەمی گەنجی وەک یەک نەدەچوون؛ لەگەڵ ئەو هەوەسە هەوسـار پسـاوەش جیاواز بوو کە ئەوی کێشا بوو بۆ سـەر جێگـاکەی کاتیۆشـا و دەسـتی لەگەڵ تـێکەڵ کردبوو. ئەو هەستی پەشیمانی و دڵسـۆزییەش نەبوو کە دوای ڕووداوەکەی دادگـا، خـۆی لە نـاخ و هەسـتی ئاڵانـد بـوو. زۆر لەگەڵ هەسـتی ئەرکناسـی و قەربـووکردنەوەی تـاوان جیـاواز بـوو. ئەو قسـانەی لە نەخۆشـخانەی زینـدان سەبارەت بە ماسلۆڤا بیستبووی، ماوەیەک تووشی دڕدۆنگی و گومـانی کـرد، بەڵام زۆر زوو تێگەیشـــت ئەو قســـانە بـــێ بنەمـــان و هەمـــووی درۆ و هەڵبەستەیە، بۆیە دیسان ناخی لە هەستی دڵسۆزی و مێهرەبـانی تەژی بۆوە

و ئەم هەستەش وردە وردە وەها بە سەریدا زاڵ بوو و لە ناخیدا ڕەگاژۆی کرد کە دوای ئەوە هەستی دەکرد دڵی تەنیا جێگای ئەشقی کاتیۆشای تێدا دەبێتەوە و بەس، جگە لە خۆشەویستی کاتیۆشا حەزی دەکرد دەرهەق بە عارەبانەچی و سەرباز و تەنانەت سەرۆکی بەندیخانە و پارێزگاریش دڵسۆز و مێهرەبان بێت؛ هەر وەها بە چاوێکی دڵسۆزانەوە لە تەواوی بوونەوەرەکانی دنیا بڕوانێ.

نۆخلیدۆڤ لەو کاتەوە ماسلۆڤای بردبووە ڕیزی بەندییە سیاسییەکانەوە، خۆشی لە هەل و دەرفەتی جۆراوجۆردا لەگەڵ تاقمێک لە سیاسییەکان ئاشنا بووبوو و لەگەڵیان دەکەوتە باس و ئاخافتن. یەکەم جار لە ئیکاترین بۆرگ[٨٥] توانیی قسە لەگەڵ بەندییە سیاسییەکان بکات؛ چونکە لەو شارە شوێنێکی باش و شیاویان پێدا بوون و هاتوچۆ کردنیان تاڕادەیەک ئازاد بوو. دواتر کە ماسلۆڤا لە کاتی ڕێگا بڕنیدا لەگەڵ سیاسییەکان بوو بە هاوڕێ، نۆخلیدۆڤیش لەگەڵ چەند کەسیان ناسیاوی پەیدا کرد و بوو بە هاوڕێیان، هەلیشی بۆ هەڵکەوت سەبارەت بەو گورووپە زیاتر لێکۆڵینەوە و متالا بکات.

لە سەرەتای بزووتنەوەی شۆڕشی ڕووسیادا، بە تایبەت دوای کوژرانی ئەلکساندری دووهەم بە دەستی نیهیلیستەکان، نۆخلیدۆڤ سەبارەت بە شۆڕشگێڕەکان گەشبین نەبوو. بە کەسانێکی دڵڕەق و بێ بەزەیی دەزانین و ڕقی لێیان بوو. دەیگوت بۆچی ئەو گورووپانە کە دەڵێن بە دژی زوڵم و زۆرداری خەبات دەکەین، ئاوا دڕندانە خەڵک دەکووژن؟ لە سەر ئەو باوەڕەش بوو کە زۆربەی شۆڕشگێڕەکان دەمارگرژ و خۆبەزل زانن.

بەرەبەرە باشتری ئەوان ناسی و بۆی دەرکەوت چ ئازار و ئەشکەنجەیەک تامل دەکەن و لە ژێر ئەو جەخت و گوشارانەدا ناچارن

---

85.Ekaterinbourg شارێکە لە پێدەشتی ڕۆژاوای ئۆراڵ.

وەڵامــی تونــدوتیژی بە تونــدوتیژی بــدەنەوە. دیــلە ئاســاییەکانیش لە ژێــر گوشــاردا بوون و ئەو ئازارانەیــان دەکێشــا؛ بەڵام لانیکەم پێش دادپەروری و دوای ئەویش، دیار بوو لە چوارچێوەی یاساکاندا ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرا؛ لە حاڵێکدا بەندییە سیاســییەکان لەم دادپەروەییە ساختە و ڕواڵەتییە بێ بەش بوون. نۆخلیدۆڤ شۆستۆڤای لە بیر بوو، ئەو کچە جوان و جحێڵەیــان چۆن لە داو خستبوو چ بەڵایەکیان بەسەر هێنا بوو. وەک شێتیان لێکردبوو. ئەو کاربەدەستانەی لەگەڵ سیاسییەکان لە پێوەندیدا بوون، کارەیان وەک کاری ئەو ماسیگرانە دەچوو کە هەرچی ماسی بە تۆڕەکانیانەوە دەبێ دەیهێنن بۆ کەناری ڕووبەرەکە؛ ئەو ماسییە گەورانەی نرخیان زۆرە جیایان دەکەنەوە و ماسییە وردەکانیش لە سەر خیز و لمی ڕۆخەکە بەجی دەهێڵن تاکوو خۆیان لە نێو بچن. بەو شێوەیە سەدان مرۆڤی بێ تاوان، کە بۆ کۆمەڵگا جێی مەترسی نین، ساڵانێکی زۆر لە بەندیخانەدا دەمێننەوە، تووشی سیل دەبن، مێشکیان تێک دەچێ، خۆکوژی دەکەن یان بە شێوەیەکی دیکە لە نێو دەچن. هێندێک لە دیلە سیاسییەکان بەو هۆیە لە سووچی زندان پەستێوراون و لەوێدا دەڕزێن چونکە هیچ کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوە، دەنا بە ئاماژەیەک ئازاد دەکرێن. کەسانێک بەو هۆیە بەند دەکرێن کە بتوانن و لە ڕێگەی ئەوانەوە بەندییە سیاسییەکانی پێشوو بناسن یان زانیارییەکیان لێ هەڵکرێنن کە بۆ لێکۆڵەران بەکەڵک بێ.

تەنانەت ئەفسەرەکانی بەندیخانەش بە گاڵتە دەیانگوت ئازادی یان سزادان پێوەندیی بەوەوە هەیە کە لێکۆڵەر یان قازی بەیانی چۆن لە خەو هەستا بێ. ملازمی ژاندارمێری، ملازمی شارەوانی، لێکۆڵەر، باز پرس، دادیار، قازی و پارێزەر و ئەوانی دیکە ئەگەر ڕۆژێک بە ڕێکەوت ڕووخۆش بووایەن یان ڕووناخۆش، کاریگەریی لە سەر چارەنووسی سیاسییەکان دادەنا. ئەوەش

پێوەندیی بە بەخت و شانسەوە هەبوو. ئەگەر فەرمانبەرێک ئەو ڕۆژە لەگەڵ ژنەکەی کێشەی هەبووایە. لەوانە بوو پەروەندەیەکی ترسناک بۆ گیراوێکی سیاسی ساز بکات کە هەتا کۆتایی تەمەنی پێوەی بناڵێنێ و بە پێچەوانەی ئەویش هەبوو. کەسانێکیش کە دەیانویست خۆیان بنوێنن و نیشانە و پلە وەرگرن، تاقمێکیان بە ناوی ئاژاوەگێڕ دەستبەسەر دەکرد و هەڵڵا و هەنگەمەیان وەڕێدەخست و هەموویان بۆ ئەو سەری دنیا دوور دەخستەوە. بەڵام ئەگەر خاتوونێکی جوان و شۆخوشەنگ داواکارییەکی لەو خاوەن پلەوپایە بەڕێزە بووبووایە و قامکی لە سەر هەر کامیان دابنایە بێ سێ و دوو ئازاد دەکرا.

وەک دیلی شەڕ لەگەڵ بەندییە سیاسییەکان هەڵسوکەوتیان دەکرد و سیاسییەکانیش ناچار بوون دژکردەوە لە خۆیان نیشان بدەن. لە بواری سەربازیدا، تەنانەت تاوانی کوشتوبڕیش وەک شانازی بۆ کەسەکان دەهاتە ئەژمار. سیاسییەکانیش بارودۆخێکی لەو جۆرەیان بۆ خۆیان ساز کردبوو. هێندێ لە کردەوە دڕندانە و پڕ توندوتیژییەکانیان بە قارەمانەتی دادەنا و بەم شێوەیە خەباتکارانی سیاسی لە چوارچێوەی ڕێکخراوە و بیروباوەڕی خۆیان نەدەترازان و چونکە بەردەوام لە ژێر زەخت و گوشاردا بوون، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خیشەسەرتر دەبوون و بۆ پاریزگاری لە گیانی خۆیان پەنایان بۆ هەموو کارێک دەبرد و ئازادی و گیانی خۆیان دەکردە فیدای بیروباوەڕەکەیان.

کاتێک نۆخلیدۆڤ زیاتر بەندییە سیاسییەکانی ناسی، پێی سەیر بوو کە بۆچی دەبێ کەسانێکی هێمن و بێ ئازار کە زەڕیان بۆ مێرووولەیەکیش نییە، کاتێک ژان بە جەرگیان دەگا، دەست بۆ کاری پڕ توندوتیژی دەبەن و هەموو

جۆرە تاوانێک بە ڕەوا دەزانن، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەیشان کە ڕزگاریی کۆمەڵگایە، لە هیچ کارێک ناپرینگێنەوە.

ئەوان بۆ گەشتن بە ئامانجی خۆیان ڕێگایەکی دووورودرێژیان لە بەرە. بەردەوام ئازار دەکێشن و دژوارییەکانی ژیان تامڵ دەکەن، لەگەڵ گرفتاری و کێشەکان هەڵدەکەن و لە سەر بیروباوەری خۆیان سوورن و توندوتیژیی زیاتر لە خۆیان نیشان دەدەن.

نۆخلیدۆڤ تاقمێکی زۆر لە بەندییە سیاسییەکانی ناسی. سەبارەت بە ئەوان دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە و زانیاری کۆ کردنەوە و بەو ئاکامە گەیشت کە ئەوان، نە ئەو جۆرەی دژەکانیان دەڵێن تاوانبارن، نە ئەو جۆرەی خۆشیان دیعایە دەکەن، قارەمانن؛ بەڵکوو کەسانێکی ئاساییین. لە نێو ئەواندا باش و خراپ و مامناوەند نییە. هێندێکیان بە عەشق و دڵێکی پاکەوە ئەو ڕێگایەیان گرتۆتە بەر و ئەوەی دەیڵێن ئیمانیان پێی هەیە، تاقمێکیش بۆ یانیها و خۆنواندن وەدووی ئەو کارانە کەوتوون؛ بەڵام زۆربەی خەباتکارانی سیاسی، ئەو جۆرەی کە نۆخلیدۆڤ لە جەنگی کەریمەدا ئەزموو بووی، حەز دەکەن لەگەڵ مەترسی بەرەوڕوو بن و تەنانەت لەو ڕێگایەدا یاری بە گیانی خۆیان دەکەن، زۆربەی خەباتکارە گەنج و چالاک و پڕ وزەکانیش لەو کەسانەن. ئەوان لە ژیاندا بە دوای ئاواتی بەرزتر لە سەر کەوتنە دێمودەکانی ماڵییەوەن، هەر ئەوانەشن کە دەبنە سەرمەشقی خەڵکی؛ سنووری ڕەوشت و ئاکار دەبەزێنن. هەڵبەت لە نێو سیاسییەکاندا زۆرن ئەو کەسانەی لە ڕوانگەی ڕەوشت و ئاکارەوە لە پلەیەکی نزم دان و لە باری دووڕوویی و خۆپەرەستیشەوە سەرباشقەی هەمووانن.

نۆخلیدۆڤ لەم پێوەندییانەیدا لەگەڵ سیاسییەکان، کەسانێکی ناسی کە شیاوی ڕێز بوون؛ تاقمێکیشیان نەکەوتنە بەر دڵی و هۆگریان نەبوو.

# شەش

نۆخلیدۆڤ زۆر هۆگری یەکێک لە دیلە سیاسییەکان بوو کە ناوی کریلتسۆڤ بوو، ئەو کوڕێکی گەنج و تووشبووی نەخۆشیی سیل بوو. لە ئیکاترین بۆرگ لەگەڵی ئاشنا بوو. لە کاتی ڕێگا بڕینی تاراوەکاندا یەک ـ دوو جار لەگەڵی بوو بە هاوڕێ و گوێی بۆ دەردەدڵەکانی ڕاگرت، لە وێستگەیەکی نێو ڕێگاش کە ڕێگەیان دا بەندییە سیاسییەکان بە ئازادی بگەڕێن، ڕۆژێکی تەواو لەگەڵ ئەو بوو. کریلتسۆڤ کە متمانەی تەواوی بە کۆنت نۆخلیدۆڤ پەیدا کرد بوو، سەربردەی خۆی سەرلەبەر بۆ گێڕایەوە.

باوکی یەکێک لە خاوەن زەویوزارە دەوڵەمەندەکانی شار بوو و زۆر زوو کۆچی دوایی کردبوو. ئەو کە کوڕی تاقانە بوو، لەگەڵ دایکی ژیانێکی ئاسوودەی هەبوو. لە قوتابخانەی دوا ناوەندی و زانکۆ زۆر بە باشی خوێندی و لە کۆتایی خوێندندا یەکەمی زانکۆی زانست هاتەوە. دەیانویست لە زانکۆ بیهێڵنەوە و بۆ درێژەپێدانی خوێندن بینێرن بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵام ڕازی نەبوو. دەیویست لەگەڵ کچێک ژیانی هاوبەش پێک بێنێ کە خۆشی دەویست و دەست بکات بە کاری کشتوکاڵ و ببێتە ئەندامی زێمستڤۆ[٨٦]. لە

86. Zemstvo ئەنجومەنی گوندەکە کاری بەڕێوە بەرایەتی لادێکانی بەدەستەوە بوو و لە ساڵی 1864وە ئەم ئەنجومەنە بوو بە یاسایی.

گێرەوکێشەی ئەم دوودڵی و دڕدۆنگییانەدا بوو کە چەند کەس لە هاوڕێکانی زانکۆی هاتن بۆ لای و بۆ جێبەجێ کردنی کارێک داوای قەرزیان لێکرد. سەرەڕای ئەوەی لەو کاتەدا بڕوای بە خەباتی سیاسی نەبوو و دەیزانی هاوڕێکانی ئەو پارەیەیان بۆ چ مەبەستێک دەوێ، قەرزی پێدان، بۆ ئەوەی هاوڕێکانی نەڵێن کەسێکی ترسەنۆکە! دوای ماوەیەک هاوڕێکانی دەستبەسەر کران و دەرکەوت کە خەرجی ڕێکخراوەکەیان کریلتسۆڤ بە قەرز پێی داون. هەر بۆیە قۆڵبەستیان کرد و بردیان بۆ بەندیخانە؛ ئەوەش یەکەم ئەزموونی زیندانی ئەو بوو.

کریلتسۆڤ هەر دوو هەنیشکی لە سەر چۆکی دانا بوو، لەپی دەستی بە سنیگی خۆیدا دەنا. ئازاری سیل بڕستی لێ بڕیبوو. وریایی و مێهرەبانی لە چاوە کز و سوور هەڵگەڕاوەکانیدا شەپۆلی دەدا:

«بەڵێ، لەو بەندیخانەیەدا زەبروزەنگ نەبوو؛ لەگەڵ بەندییەکانی تر لە پێوەندیدا بووین. ئەو کاتانەی لە ژوورەکەی خۆمان بووین، لە دیوارەکەمان دەدا و لەو ڕێگەیەوە یەکتریمان حاڵی دەکرد. هێندێ شەو ڕێگەمان پێدەدرا لە دالانەکە کۆ ببینەوە و گۆرانی بڵێین. خواردنەکانمان پێکەوە بەش دەکرد. من دەنگم خۆش بوو و زۆر جار گۆرانیم دەگوت. تەنیا شتێک کە دڵتەنگی دەکردم خەمی دایکم بوو، چونکە دەمزانی زۆر دڵەدوایە و شەو و ڕۆژ لە تاوی کوڕە تاقانەکەی دەگری؛ دەنا بەندیخانەم پێ ناخۆش نەبوو و لەو ماوەیەدا زۆر شت فێر بووم. لەگەڵ کەسانێکی زانا و وریا ئاشنا بووم، یەکێکیان پترۆڤی بە ناوبانگ بوو کە دوای ماوەیەک بردیان بۆ قەڵای پێتر و پۆل و لەوێ بە شووشە دەماری خۆی بڕێ و گیانی لە دەست دا.

لەو کاتەدا، من شۆڕشگێڕ نەبووم و لەگەڵ هەموو کەس دەبوومە هاودەم. باشترین هاوڕێم دوو کەس بوون کە هەر دووکیان لە شۆڕشی

پۆڵۆنیادا گیرا بوون. ئەو دوو کەسە چونکە لە نێوڕێدا ویستبوویان ڕابکەن و لەگەڵ پاسەوانەکان تێک هەڵچوو بوون، بڕیار بوو دیسان دادگایی بکرێن. یەکیان ناوی لۆزینسکی بوو و بەڕەچەڵەک پۆڵۆنیایی بوو، ئەوی دیکەشیان ڕۆزۆڤسکی[٨٧] جوولەکە، هەر دووکیان بەندەکەیان دیوار بە دیواری من بوو، ڕۆزۆڤسکی مێر منداڵێکی یازدە ساڵان بوو، بەڵام دەیگوت من حەڤدە ساڵم تەمەنە. لاواز و وردیلانە بوو، گورجوگۆڵ و زیرەک. چاوەڕەشەکانی ترووسکەی دەهات. وەک زۆربەی جوولەکەکان بەهرەی مۆسیقای هەبوو. دەنگی تۆزێ دەلەرزی بەڵام زۆر باشی گۆرانی دەگوت. ڕۆژێک سەر لە بەیانی هاتن و هەردووکیان بردن بۆ دادگا. عەسر کە گەڕانەوە، گوتیان سزای لە سێدارەدانیان بۆ بڕیونەتەوە؛ هیچ کەس بڕوای نەدەکرد. بێ تاوان بوون. ماجەرای ڕاکردنەکەشیان زۆر ئاسایی بوو. پاسەوانەکانیان هەڵفریواندبوو و هەڵاتبوون، بەڵام دیسان دەستبەسەر کرانەوە. تێک هەڵچوون ڕووی نەدابوو و هیچ پاسەوانێک بریندار نەبوو بوو. هەموو شتێک بە شێوەیەکی ئاسایی کۆتایی پێ هات. بۆ کارێکی لەو چەشنە، سزای سێدارەیان بۆ کوڕێکی یازدە ساڵان بڕیەوە کە بە ڕاستی ئەو پەڕی بێ ویژدانی بوو. هەموومان پێمان وابوو دەیانهەوێ بیانترسێنن و دواتر حوکمەکە هەڵدەوەشێننەوە. وردە وردە بابەتەکەمان لە بیر چۆوە. خاترجەم بووین. شەوانە لە دەوری یەک کۆدەبووینەوە و گۆرانیمان دەگوت. شەوێک پاسەوانێکی پیر هاتە بەر دەربیجەی بەندەکەی من و بە سرتە پێی گوتم دارتاشەکان خەریکن سێدارە هەڵدەبەستن! سەرەتا لە مەبەستی تێنەگەیشتم؛ لێم پرسی سێدارە بۆ کێ؟ پاسەوانەکە وەڵامی نەدامەوە. هێندێک بیرم کردەوە، لە مەبەستەکەی تێگەیشتم. ئەو هەواڵەم بە هاوڕێکانم ڕاگەیاند.

---

Rozovsky .87

ئەوان لە پێش مندا ئاگادار بووبوون. ئەو شەوە بێدەنگی هەموو بەندەکانی داگرتبوو. بێدەنگی تۆزی مەرگی بە سەر ئێمەدا پرژاند بوو. هیچ کەس گۆرانیی نەدەگوت. هیچ کەس مشتی بە دیواردا نەدەکێشا بۆ ئەوەی هەواڵێک ڕاگەیێنێ. سەعات دەی شەو بوو کە ئەو پاسەوانە پیرە دیسان هات بۆ بەر دەربیجەی بەندەکەم و بە سرتە پێی گوتم جەللاد لە مۆسکۆوە هاتووە. گوێم لە دەنگی لۆزینسکی بوو پرسیی، پاسەوان دەڵی چی؟ گوتم تۆزێکی تووتن هێنا بوو. تێگەیشتبوو درۆ دەکەم. دیار بوو تووشی گومان بووە. پرسیی بۆ چی ئەمشەو هیچ کەس گۆرانی ناڵێ؟ بۆ هیچ کەس لە دیوارەکە نادا؟ لە بیرم نییە چ وەڵامێکم دایەوە. لە دەربیجەکە دوورکەوتمەوە بۆ ئەوەی ناچار نەبم لەوە زیاتری وەڵام بدەمەوە. شەوێکی ترسناک بوو. بەری بەیانی لە خەو ڕاپەڕیم. تەقەیەک هات، دەرگای داڵانەکەیان کردەوە. تەپەی پێ هات؛ تەپەی پێی چەند کەس. چوومە بەر دەربیجەکە، چرایەک لە داڵانەکەدا داییسابوو. سەرەتا سەرۆکی بەندیخانەم دی؛ پیاوێکی قەڵەو و هەمیشە تەڕدەماخ بوو، بەڵام لەو کاتەدا ڕەنگی هەڵبزڕکابوو، مات و خەمبار دیار بوو؛ دەتگوت لە شتێک دەترسێ. لە دوای ئەوەوە جێگرەکەیم دی، ئەویش دڵتەنگ و خەمبار دیار بوو. بەدوای ئەواند چەند پاسەوان بە بەر دەممدا تێپەڕین. گوێم لە دەنگی جێگر بوو؛ دەنگێکی سەیری هەبوو؛ دەنگی هەڵبڕی: لۆزینسکی! هەستە جلوبەرگی خاوێن لە بەر کەو وەرە دەرێ!... خشەخشێکم بیست؛ چوومە پێشترەوە و دەموچاوم بە دەربیجەکەوە نووساند. سەرۆکی بەندیخانەم دی ڕەنگی پەڕیبوو و یەکێک لە قۆپچەکانی چاکەتەکەی هەڵدەگرت و دایدەخستەوە. حاڵەتەکەی ئاسایی نەبوو، لە پڕ تۆزێ کشا دواوە و ڕێگای بۆ لۆزینسکی کردەوە. لۆزینسکی کاتێک گەیشتە بەردەلاقەی بەندەکەی من، ڕاوەستا. دەموچاوی سەرنجڕاکێش بوو. لە پۆلۆنیاییە بەژن و باڵا جوانەکان

بوو؛ خوێن شیرین و نێوچاوان پان. فۆکلەکەی کەوتبووە سەر نێوچاوانە سپییەکەی. چاوی زۆر جوان و شیرین بوو! گەنجێکی شاد و گەشاوە و جوانچاک. زۆرترسا بوو. ڕەنگی بەڕووەوە نەمابوو. گوتی: کریلتسۆڤ! جگەرەت پێیە؟ خەریک بوو جگەرەی بۆ دەرهێنم، جێگری بەندیخانە خێرا هاتە پێشێ و جگەریەکی پێدا و شقارتەی بۆ هەڵکرد. چەند مژی لە جگەرەکەدا. کەوتبووە گۆمی خەیاڵەوە. پاشان وەک ئەوەی شتێکی وەبیر هاتبێتەوە، دەنگی هەڵبڕی: ئەوە زۆر کارێکی بێ بەزەییانەیە؛ زۆر کارێکی بێ ڕەوشتانەیە، خۆمن هیچ کەسم نەکوشتووە، هیچ کەسم ئازار نەداوە... گریان ئەوکی گرتبوو. نەمدەتوانی چاوی لە سەر هەڵگرم. ئیتر هیچی نەگوت و ڕۆیشت. دەنگی قیژەی ڕۆزۆڤسکیم بیست. کاتێک گەیشتە ڕووبەڕووم، ڕاوەستا. سەرتاپای دەلەرزی. هاتە پێشەوە و پێی گوتم: هەموو دەزانن حاڵم باش نییە. خەریکی دەرمان خواردنم. دوکتۆر خۆی دەرمانی پێداوم... هیچ کەس وەڵامی نەدایەوە. هیچ کەس لە مەبەستی تێنەدەگەیشت. جارێک چاوی لە من دەکرد و جارێک لە سەرۆکی بەندیخانە. جێگر بە قەڵافەتێکی جیددییەوە گوڕاندی بە سەریدا: دەی! بڕۆ، واز لەو گاڵتەوگەپانە بێنە. بڕۆ وەپێشم کەوە ڕۆزۆڤسکی!... ڕۆزۆڤسکی زۆری ئازار دەکێشا. مێشکی بە باشی کاری نەدەکرد... لە دوورەوە گوێم لە قیژەی بوو. هاواری دەکرد. دەگریا... دواتر خشەخشی دالانەکەم بیست و بێدەنگی دیسان وڵاتی داگرت. ئەوانیان لە سێدارەدا. هەردووکیان بە تەناف خنکاندن. پاسەوانێک کە گەوجە پیاو بوو و بینەری ئەو لە سێدارەدانە بوو، بۆی باس کردم کە لۆزینسکی زۆری خۆ ڕانەپسکاند و بە شێوەیەکی سادە و ئاسایی تەنافەکەی خستە ملی خۆی؛ بەڵام ڕۆزۆڤسکی زۆری دادوهاوار کرد. جەللاد ناچار بوو بە زۆری

پەتەکە بخاتە ملی و زۆر زوو کارەکە کۆتایی پێ هات. جەللاد کاتێک چووە سەرێ و پەتەکەی توندتر کرد ئیتر جووڵەی نەکرد.

کریلتسۆڤ دەگریا. زوو گریانەکەی خواردەوە و گوتی:

ـ لەو ڕۆژەوە چوومە ڕیزی شۆڕشگێڕانەوە!

پاشماوەی بەسەرهاتەکەی کریلتسۆڤ بەم شێوەیە بوو. دوای ئەوەی لە بەندیخانە ئازاد دەکرێ دەچێتە ڕیزی ڕێکخراوەی «ڕزگاریی خەڵک»وە. سەرۆکی دەستەیەک لە ئاژاوەگێڕان بوو کە لە سەر ئەو باوەڕەبوون دەبێ بە ئاژاوە و خراپکاری دەوڵەت بە چۆکدا بێنن تاکوو دەسەڵات بکەوێتە دەست خەڵک. چوو بۆ پترزبۆرگ، سەفەری هەندەرانی کرد، چوو بۆ کی یۆڤ، سەردانی ئیدسای کرد و هەر ڕۆژەی لە لایەک درێژەی بە خەباتی خۆی دەدا. بەڵام یەکێک لە هاوڕێکانی ڕاپۆرتی لێدا و ئەم جارەیان سزای لە سێدارەدرانی بە سەردا سەپا. بەڵام دوای ماوەیەک حوکمەکەی کەم کرایەوە بۆ زیندانی هەتا هەتایی. لە بەندیخانە ئازاری سیلی گرت و بەو بارودۆخە نالەبارەوە تەنیا چەند مانگێکی تر دەیتوانی بژی و خۆشی لەوە ئاگادار بوو. لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕابردووی خۆی و ڕێبازەکەی پەژیوان نەبوو، دەیگوت ئەگەر تەمەنی دووبارەم پێبدەنەوە، دیسان ئەو ڕێگایە دەگرمە بەر و دژی ئەو سیستەمە خەبات دەکەم.

نۆخلیدۆڤ زۆر شت لەو گەنجە نەخۆشەوە فێر بوو کە پێشتر بیریشی لێ نەکردبۆوە و نەیدەزانی.

# حەوت

ئەو ڕۆژەی ڕووداوی لێدانی زیندانییەک و جیاکردنەوەی لە کچۆڵەکەی ڕوویدا، نۆخلیدۆڤ لە میوانخانەیەکی نێوڕێ بوو. ئەو ڕۆژە زۆربەی کات خەریکی نووسین بوو. یادداشتەکانی ڕێکوپێک کرد و نامەیەکی سەبارەت بە بارودۆخی بەندییەکان بۆ چەند کەسی پایەبەرز نووسی کە سبەینێ بەیانی بیدات بە پۆستە و ئەو شەوە زۆر درەنگ خەوت و بەیانیش دەنگتر لە کاتی ئاسایی هەستا و دیسان بە سواری فەتیوون وەڕێ کەوت. نزیک نیوەڕۆ گەیشتە گوندێک کە کاروانی بەندییەکانی تاراوگە لەوێ ڕاوەستا بوون. چوو بۆ میوانخانەیەک کە ژنێکی زۆر قەڵەو و گۆشتن بەڕیوەی دەبرد. دەستێکی بە سەر و ڕووی خۆیدا هێنا و چوو بۆ سەرسەرای میوانخانەکە کە زۆر خاوێن بوو و دارودیوارەکەی بە وێنەی مریەم و عیسا داپۆشرابوو. لە بیری ئەوەدا بوو بچێت بۆ لای فەرماندەری کاروان و ئیزنی چاوپێکەوتن لەگەڵ ماسلۆڤای لێ وەرگرێ.

کاروانەکە شەش مەزڵی بریبوو و نۆخلیدۆڤ لەو مەودایەدا نەیتوانیبوو ماسلۆڤا ببێنێ؛ چونکە لەو ڕۆژانەدا دەنگۆ داکەوتبوو کە بازرەسێکی تایبەت بەڕێوەیە و لە مەودای گەڕانەکەیدا حەتمەن چاوی بە کاروانەکەش دەکەوێ. هەر بەو هۆیە سەرپەرستەکانی کاروان زۆریان پارێز دەکرد و ڕێگەیان

نەدەدا هیچ کەس بچێتە نێو بەندییەکانەوە. بەختەوەرانە دوێنی هەواڵیان هێنا کە بازرەسەکە گەیشتۆتە ئەو ناوچەیە و بێ ئەوەی کاری بە سەر کاروانەکەوە بێ درێژەی بە ڕێگای خۆی داوە و ڕۆیشتووە. نۆخلیدۆڤ دڵنیا بوو دوای ڕەوینەوەی ئەو مەترسییە، وەرگرتنی ئیجازنامە زۆر دژوار نییە.

خاتوونی قەڵەو و نەرمونۆڵی میوانخانە دەیویست عارەبانەیەک بانگ بکات، بەڵام نۆخلیدۆڤ گوتی بە پێیان دەچێتەوە بۆ شوێنی حەسانەوە کە لەو بەری گوندەکە هەڵکەوتبوو، خانمیش بۆ ئەوەی مسافیرەکە ڕێی لێ هەتڵە نەبێ، گەنجێکی بۆ ڕێنوێنی لەگەڵیدا نارد. گەنجەکە کوڕێکی سنیگ دەرپەڕیوی چوار شانە بوو، قەڵافەتی توندوتۆڵی هێرکۆلی ئەفسانەیی وەبیر دەهێنایەوە. پێڵاوەکانی پەل و گەورە لە پێیدا هەر خشکەی دەهات. لەو کاتەدا تەمومژێکی چڕ وڵاتی داگرتبوو و چاو هەتا سێ - چوار مەتری هەتەری نەدەکرد. تەنیا ڕووناکییەک کە لە پەنجێرەکانەوە دەڕژایە کۆڵان هێندێک لە سووچ و قوژبنەکانی ڕۆشن دەکردەوە. نۆخلیدۆڤ ناچار بوو گوێ بۆ خشپەخشپی پێڵاوی شلوشەوێقی ڕێنوێنە شان و مل پانەکەی بگرێ و ڕێگاکە بدۆزێتەوە و بە دوایدا بڕوا. لە گۆڕەپانی کلێسە تێپەڕین و چوونە کۆڵانێکی زۆر تاریکەوە. تۆزێ چوونە پێشترەوە و گەیشتنە شوێنێکی ئەنگوستە چاو؛ بەڵام چەند هەنگاو چوونە پێشترەوە و لەنتەری شوێنی مانەوەی بەندییەکان وەدەرکەوتن؛ ووردە وردە کۆڵەکە و دیوار و تاپۆی بزۆکی پاسەوانی چەک لە شان لە دوورەوە دەرکەوت.

نزیکتر بوونەوە. پاسەوان فەرمانی ڕاوەستانی پێدان. نەیدەهێشت نۆخلیدۆڤ هەنگاوێک بچێتە پێشترەوە. پاسەوانەکە گوێی بە قسەکانی نەدەبزووت. نۆخلیدۆڤ دەنگی هەڵبڕی:

ــ هــۆی! ئەوە چییــیە ئەو هەراوهوریــایەت وەڕێخســتووە؟ بە جێــی ئەو هاتوهاوارە بڕۆ بەرپرسەکەت بانگ بکە.

پاسەوان هیچی نەگوت، لە بەر شۆقی لەنتەرەکە چاوی لە نۆخلیدۆڤ و ڕێنوێنەکەی بڕیبوو. لە پشت دیوارەکەوە دەنگی چەند ژن دەهات. دوو ـ سێ خولەک دواتــر دەرگــایەک کــرایەوە و عەریفێــک هــاتە دەرێ. نۆخلیــدۆڤ کارتەکەی خۆی پێدا و گوتی دەیــهەوێ بۆ مەبەستێکی تــایبەت چــاوی بە فەرماندەرەکەیان بکەوێ.

عەریفەکە بە پێچەوانەی پاسەوان سەختگیر نەبوو، کونجکاو بوو بوو و دەویست بزانێ نۆخلیدۆڤ بۆ چ مەبەستێک دەیەهەوێ چاوی بە فەرماندەر بــکەوێ. نۆخلیــدۆڤ بە گوێیــدا چرپانــد ئەگەر داواکەی زوو بگەیێنێــتە فەرماندەرەکەیان پاداشتێکی باشی دەداتێ. عەریف کارتەکەی لێوەرگرت و ڕۆیشت. دیسان دەرگاکە جیرەی هات و کرایەوە و ئەمجارەیان چەند ژن هــاتنە دەرێ، زەمبیلە و دەفری گڵین و شتی دیکەیان بە دەستەوە بوو و پێکەوە دەدوان و پێدەکەنین. جلی لادێییان لە بەردا بوو؛ بە دەسماڵ سەر و قژیان پێچابوو. تەنوورەکەیشان زۆر درێژ نەبوو. لە بەر شۆقی لەنتەرەکە چاویان لە نۆخلیدۆڤ و ڕێنوێنەکەی کرد. ڕێنوێنی زەبەلاح و شان و مل پان هەوەسی هەموویانی بزواند بوو. کوڕەش وێدەچوو کەیفی پییان ساز بووبێ. یەکێکیان گوتی:

ـ بۆچی هاتوون بۆ ئێرە؟ نەکا فیل و جادوویەکتان لە ژێر سەردابێ؟

ــ من ئەو بەڕێزەم هێناوە بۆ ئێرە؛ تۆ پێم بڵێ بەو نیوەشەوە لە چی دەگەڕێی؟

ـ نڤشک و قەیماخم هێناوە.

ـ کەوایە شەویّ ڕایان نەگرتی و خیّرا دەریان کردی. وا دیارە ئیتر تلّپاتی تەڕت تیّدا نەماوە.

ـ هەتیوە بیّ تامە! ئیّستا کە ئاغات هیّناوە ئیتر ملی ڕیّ بگرە و بڕۆ، یان لەگەلّ ئیّمە وەرە دەچینەوە بۆ گوند. گەنجەکەش چەند قسەی بە تیّکولّی تیّهالاّندن کە کچەکانیش و پاسەوانەکەش دایان لە قاقای پیّکەنین. ڕیّنویّنی زەبەلاح بە نۆخلیدۆڤی گوت:

ـ ئیشت پیّم نییە؟ خۆ ئیتر ڕیّگاکەت لیّ تیّک ناچیّ؟

ـ بڕۆ خەمی منت نەبیّ؛ ڕیّگاکە دەدۆزمەوە.

ـ کاتیّک گەیشتیە گۆڕەپانی کلیساکە، دوای ئەو مالّە چەند نهۆمە، بە کۆلاّنی دووهەمدا بەلای ڕاستدا بای دەدەیەوە. هانیّ ئەو گۆچانەت پیّ بیّ، بە کارت دیّ.

داردەستیّکی دریّژ و تیفتیفەدراو بوو بۆ ڕیّگا ڕۆیشتنی شەوی تاریک و کەندولەند بەکەلّک بوو. نۆخلیدۆڤ داردەستەکەی لیّ وەرگرت. گەنجەکە لەگەلّ کچەکان بەرە و گوند وەڕیّ کەوت و هەموویان لە تاریکی و تەمومژدا بزر بوون. بەلاّم لە دوورەوە دەنگی قاقا و قریشکە و گالّتەوگەپیان دەهاتە گویّ.

نۆخلیدۆڤ زۆر چاوەڕوان نەبوو. عەریف هات و گوتی دەتوانیّ لەگەلّیدا بچیّت بۆ لای فەرماندەر.

# هەشت

ئێرەش وەک هەموو گرتوخانەکانی سیبیریا، سێ بینای یەک نهۆم بوو، لە هەر چوار لاوە شووورەی بە دەوردا کێشرابوو. بینا گەورەکەیان کە پەنجێرەکانی لاجامەی ئاسنینی پێوە بوو، جێگەی بەندییەکان بوو. بینای دووهەم شوێنی عەریف و پاسەوانەکان بوو و بینای سێهەم شوێنی فەرماندەری کاروان و نووسینگەی تایبەتی ئەو بوو. شۆقی لەنتەرەکان لە پەنجێرە دەهاتە دەرێ و ئەگەر کەسێک لە دوورەوە ئەم بینایانەی بدیبایە کە نوقمی تیشک و ڕووناکین، پێی وابوو چەند بنەماڵەی بەختەوەر لە پشت ئەو پەنجێرە ڕووناکانە دەژین. هەموو شوێنێک ڕووناک بوو. چەند لەنتەریان بە دیوارەکانی هەر چوار لادا هەڵواسیبوو و لە سەر قاڵدرمەکانیش لەنتەریان دانا بوو.

عەریف نۆخلیدۆڤی برد بۆ بینا چکۆڵەکە. لە سێ پلیکان وەسەرکەوتن و لە بەر هەیوانەکەوە چوونە دالانێکی باریکەوە کە چرایەک بە دیوارەکەیدا هەڵواسرابوو. هەموو جێیەک بۆنی دووکەڵی لێدەهات. خزمەتکاری فەرماندەر لنیگە پۆستاڵێکی لە پێدا بوو و بە لینگەکەی دیکەی پشکۆی نێو مەنقەڵییەکەی دەشێواند و فووی لێدەکرد. بۆ ئەوەی زوو سەماوەرەکە ئامادە بکات، کاتێک

چاوی بە کۆنت نۆخلیدۆڤ کەوت، لینگە پۆستاڵەکەی لە پێ کردەوە و چوو بۆ ژوورەکەی تەنیشتی.

- گەورەم! بەڕێزێک هاتووە کاری پێتانە!

دەنگێکی گڕ گوتی:

- پێی بڵێ بێتە ژووریّ!

خزمەتکار هات و بە نۆخلیدۆڤی گوت:

- فەرموو!

دیسان ڕۆیشتەوە بە لای سکڵ و پۆلووکانەوە. لەو ژوورەدا لەنتەرێک بە بنمیچەکەدا هەڵواسرا بوو. فەرماندەر لە پشت مێزێک دانیشتبوو کە هێشتا بەردەماوی چێشتەکەی و دوو بتڵی خاڵیی لە سەر بوو. پیاوێکی شان و مل پان و تێکسمڕاو بوو. دەموچاوی دەتگوت کەرپووچی سوورە و سمێڵە بابڕەکەی زەرد بوو. توتن و عەترێکی هەرزانبایی پێکەوە ئاوێتە بووبوون. ملازم لە جێی خۆی هەستا.

- فەرموو بەڕێز ئیشت هەبوو؟

- بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێت، دەنگی هەڵبڕی:

- هۆی برێنۆڤ! سەماوەرەکە ئامادەیە؟

- هەر ئێستا ئامادەی دەکەم گەورەم.

ـ بۆ ئاوا دەستەوستانی، ئەی کەنگێ چایەکەمان بۆ دێنی؟ برێنۆڤ بە سەماوەرەوە هاتە ژووریّ. ملازم چاوە چکۆلەکانی لە سەماوەرەکە بڕیبوو بۆ ئەوەی بزانی لە شوێنی خۆی دادەنێ. نۆخلیدۆڤ ڕاوەستا هەتا بڕێنۆڤ سەماوەرەکەی لە جێی خۆی دانا و ڕۆیشت، فەرماندەر چایەکەی دەم کرد و لە دۆڵابی سووچی ژوورەکە هێندێک غوڕابی و شووشەیەک کۆنیاکی هێنا و دیسان پرسی:

ـ بەڵێ، هاتووم چاوم بە بەندییەک بکەوێ، ژنێکە.

ـ ئەگەر سیاسی بێ یاسا ڕێگە نادا.

ـ سیاسی نییە...

ـ بۆ دانانیشی؟ فەرموو.

نۆخلیدۆڤ دانیشت و گوتی:

ـ سیاسی نییە؛ بەڵام لە سەر داوای من کاربەدەستانی باڵا ڕازی بوون لەگەڵ سیاسییەکان لە شوێنێک بێ.

ـ دەزانم کام ژن دەڵێی؛ چاوپێکەوتنی ئەو دەگونجێ. جگەرە دەکێشی؟

فەرماندەر دوو پەرداخی پڕ کرد لە چایی و یەکیانی لەبەر دەمی کۆنت نۆخلیدۆڤ دانا.

ـ پەلە مەکە. شەوێکی دووورودرێژە. هەر ئێستا کەسێک دەنێرم بە دوایدا.

ـ تکایە ڕێگە بدەن من بچم بۆ لای ئەو.

ـ ئەوە... بەپێچەوانە یاسایە.

ـ تائێستا چەند جار ڕێگەی ئەو جۆرە چاوپێکەوتنانەیان پێداوم. لە هەموو لایەنێکەوە دڵنا بە، هیچ شتێکی بۆ نابەم. دەستوور بفەرموو بمپشکنن، با خاتەرجەم بی هیچم پێ نییە.

فەرماندەر پێکەنی.

ـ ئەوە ئاساییە هەمووان دەپشکنن. سەری بتڵی کۆنیاکەکەی کردەوە.

ـ لەم هەوایەی سیبیریادا پیاو دەبێ هێندێک خۆی گەرم دابێنێ. فەرموو پێکێک هەڵدە... لێرە زۆر کەم هەڵدەکەوێ پیاو کەسێکی وەک ئێوە ببینێ. ژیانی ئێمە ئەو جۆرەی دەبینی زۆر دژوار و پڕ لە دەردەسەرییە. خەڵکی ملازمەکانی بەندیخانە بە کەسانێکی دڵڕەق و گەمژە دەزانن؛ پێیان وایە ئێمە هەر بۆ ئەو کارە لە دایک بووین.

نۆخلیدۆڤ زۆری ڕق لەو مـلازمە سـوورهوولە و ئەنگوسـتیلە و بـۆنی عەتـر و ئاکـارە گەوجـانەکەی بـوو، بەڵام بە داخەوە لە بارودۆخێکیـدا بـوو ناچار بوو هەموو شتێکی نەشیاو تامڵ بکات و زۆربەی شتەکان وەڕووی خۆی نەهێنێ. بە وردی گوێی بۆ قسە قۆڕەکانی فەرماندەر ڕاگرتبوو کە لە دەست کارەکەی سکاڵای دەکرد و باسی ڕەفتاری دڵسۆزانەی خۆی دەرهەق بە ژێردەستەکانی دەکرد.

ــ بە بـڕوای مـن تـۆ دەتـوانی دڵسـۆزانە و بە مێهرەبـانییەوە یـارمەتیی بەندییەکان بدەی و ڕەنج و ئازارەکانیان کەم بکەیتەوە.

ـ چ ڕەنجێک؟ چ ئازارێک؟ وادیارە تۆ ئەو جۆرە مرۆڤانە ناناسی.

ـ ئەوانە مرۆڤن؛ لەگەڵ خەڵکی تر جیاوازییان نییە. کەسانێکی بێ تاوان لە نێو ئەواندا هەیە.

ــ هەمــوو جــۆرە کەســێک لە نێوانیانــدا هەیە. هەمــوو بە هــۆی ئەو بارودۆخەوە سکاڵا دەکەن بەڵام تەنیا کەسێک کە گوێ بەو سکاڵایانە دەدات و بە هانایـانەوە دەچـێ، مـنم؛ خـۆ ئەوانـی دیـکە گوێیـان پـێ نـادەن. ڕەنـگە هەقیشیان بێ، چونکە یاسا زۆر دژوارە. لەوانەیە لە خۆڕا پاپۆشێکت بۆ ساز بـکەن و وەک ئەفســەرێک بە تــاوانی ســەرپێچی کــردن و لادان لە یاســا گوللەبارانت بکەن. لەگەڵ ئەوانەشدا کەم کەس هەیە وەک من ئاگای لێیان بێ. چای دەخۆیەوە؟

دیسان چایی تێکرد و گوتی:

ـ هەر بە ڕاست ئەو ژنەی دەتەوێ چاوت پێی بکەوێ، چ جۆرە ژنێکە؟

ـ زۆر ژنێکی چارەڕەشە. لەبەر بەدبەختی و بێکەسی پەنـای بـردووە بـۆ خـانەی لەشفرۆشــان؛ لە دادگــاش بە تـۆمەتی دەرمانـداو کردنـی کەسـێک سزادراوە؛ لە حاڵێکدا ئەو لە بیری ئەو شتەدا هەر نەبووە.

ـ لەو جۆرە چیرۆکانە زۆرن. لە بیرمە لە شەڕی غازان ژنێک بوو بەناوی ئێما، مەجارستانی بوو، چاوی دەتگوت چاوی ئێرانییەکانە، زۆر شۆخوشەنگ بوو. ڕواڵەتی لە شازادە دەچوو...

نۆخلیدۆڤ پەڕییە نێو قسەکانی و درێژەی بە وتەکانی خۆی دا:

ـ وەلحاسڵ ئێوە دەتوانن یارمەتیی بەندییەکان بدەن. کارێک بکەن کەمتر ئازار بکێشن. داوا لە فەرمانبەرەکانتان بکەن ئازاریان نەدەن. بەو کارانە دڵتان پڕ دەبێ لە شادی و سەفا.

وەها داناردانار وشە بە وشە قسەی دەکرد دەتگوت لەگەڵ منداڵێک قسە دەکات و دەیهەوێ حاڵیی بکات، یان لەگەڵ بیانییەک قسە دەکات کە زمان نازانێ. ملازم دیسان چووەوە سەر چیرۆکەی ئێما کە ژنێکی مەجارستانی بووە و چاوی وەک چاوی ژنانی ئێرانی جوان و دڵڕفێن بووە. بەڵام نۆخلیدۆڤ دیسان قسەکەی پێ بڕی.

ـ من حەزم لەو جۆرە چیرۆکانە نییە. پێشتر جۆرێکی دیکە بووم، بە جۆرێکی تر دەژیام. بەڵام ئێستا حەز ناکەم وەک ڕابردوو بم. حەز دەکەم بە چاوێکی تر لە ژنان بڕوانم.

هێندە توند و لێبڕاوانە قسەی دەکرد کە ملازم تووشی سەرسووڕمان بووبوو.

ـ چایی مەیل دەفەرمووی؟

ـ نا، سپاست دەکەم.

فەرماندەر خزمەتکارەکەی بانگ کرد:

ـ برێنۆڤ! ئەم بەرێز بەرە بۆ لای کۆلۆڤ. بڵێ دەتوانێ چاوی بە بەندییە سیاسییەکان بکەوێ.

# نۆ

نۆخلیدۆڤ لەگەڵ خزمەتکاری فەرماندەر لەو حەوشەیە تێپەڕین کە بە چەند لەنتەر ڕووناک بووبۆوە و چوون بۆ ئەو بینایەی کە پەنجەرەکانی لاجامەی ئاسنینی لێدرابوو. سەربازێکی چەک لە شان لە خزمەتکاری فەرماندەری پرسی دەچن بۆ کوێ؟

- ئەو بەرێزە دەبەم بۆ خەوگەی ژومارە پێنج.

- دەرگای ئەم لایە داخراوە؛ دەبێ دەور لێدەن و لەدەرگای ئەو لاوە بچنە ژووری.

دەوری بیناکەیان لێدا و گەیشتنە بەر دەرگاکەی دیکە. نۆخلیدۆڤ گوێی لە هەرا و ژاوەژاوەی پشت دیوارەکە بوو. دەنگەکان لە ویزەویزی ئەو پوورە هەنگانە دەچوو کە لە پلوورەیەکەوە دەچن بۆ پلوورەیەکی تر. کاتێک دەرگاکە کرایەوە، دەنگی زەنازەناکە زیاتر بوو. هاتوهاوار و شەڕە جنێو و قاقا و قریشکە تێکەڵ زڕە و تەقەی زنجیر و پاوەن بووبوو و بۆنی پیسی و دەرمانی چڵکبەر ئاوێتە بووبوون و هەوای دالانەکەیان قورس کردبوو.

ئەم گاڵوبوغر و زەنازەنا و جنێو و قیژە و هەرایە،ئەم زڕەزڕی زەنجیر و بۆگەن و بۆسارە، وەهای پەرۆش و خەمبار کرد، بێزی لە هەموو شتێک هەڵدەستا و ئەم بێزاری و دڵ تێکەڵ هاتنەشی لە قووڵایی ناخی خۆیدا هەست پێکرد.

چووه نێو بەندەکەوە. یەکەم شت کە چاوی پێی کەوت، ژن و پیاوێک بوون بەرەوڕووی یەک لە سەر دوو لەگانی گەورە هەڵتروشکابوون. بۆنی گوو دەور و بەریانی تەنیبوو. ژنە بە خۆدا شکاوە و داوێنی کراسەکەی داکێشا و لاقی داپۆشی، بەڵام پیاوەکە تازە پانتۆڵەکەی داکێشا بوو و لە سەر لەگانەکە هەڵترووشکا بوو، چاوێکی لە نۆخلیدۆڤ داگرت و گوتی:

ـ تەنانەت ئیمپراتۆریش ناتوانێ لە کاتی تەنگەتاو بووندا دان بە خۆیدا بگرێ!

گەیشتە دالانەکە. دەرگای ژوورەکان لە سەر ئەو دالانە بوو. ژنانی بەندی و منداڵەبەر لە یەکەم ژووردا نیشتەجێ کرابوون، ژوورەکەی تەنیشتیشی تایبەتی سەڵتەکان بوو. ژووری سیاسییەکانیش لەو سەری دالانەکە هەڵکەوتبوو. ئەو بینایە جێگای سەد و پەنجا دیلی هەبوو، ئێستاش چوارسەد و پەنجا کەسیان تێ پەستاو تبوو. هەموو تێکقژقرابوون و دەرزیت هەڵاوشتیبایە نەدەکەوتە عەرزی. چەند کەس لە ژوورەکاندا جێگایان دەست نەکەوتبوو و لە نێو دالانەکە دانیشتبوون یان خۆیان تخێڵ کردبوو. چەند کەسیش بە کتریی پڕ لە ئاوی کوڵاتووەوە دەهاتن و دەچوون.

تاراس کە کترییەکی پڕ لە ئاوی کوڵاتووی بە دەستەوە بوو، چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوت. هاتە پێشێ و سڵاوی کرد. ڕوانینی وەک هەمیشە گەرم و مێهرەبان بوو، بەرچاوی پەنەمیبوو و شین هەڵگەڕابوو.

نۆخلیدۆڤ لێی پرسی:

ـ تاراس! بۆ ئاوات لێهاتووە؟

تاراس پێکەنی. خزمەتکارەکەی فەرماندەر ئاگاداری ڕووداوەکە بوو.

ــ ئەوە یادگـاری لێـدانە، لە سـەر ژنێـک. لەگەڵ فێـدکای یەک چـاو تێـک هەڵچـوون؛ هەر دووکیـان زۆر باشـیان سـەر و گـوێلاکی یەکتریـان تێـک کردۆتەوە.

نۆخلیدۆڤ هەواڵی فیدۆزیای لێپرسی:

ـ حاڵی باشە؛ خەریکم ئاوی کوڵاتووی بۆ دەبەم دەیهەوێ چایی سازکا.

تاراس چوو بۆ ژووری ژن و منداڵ دارەکان. پڕ بوو لە هەڵم و دووکەڵ. خەریک بوون جلە تەڕەکانیان ویشک دەکردەوە. چەند کەس لە سووچێک ڕاکشا بوون. دەنگی قیژەی ژنان پێکەوە تێکەڵ بووبوو.

ژوورەکەی دیکە تایبەتی سەڵت و ڕەبەنەکان بوو. لە بەر دەرگاکەدا چەند کەس لە دەوری یەک دانیشـتبوون و خەریکـی قومـاربوون. خزمەتکـاری فەرماندەر گوتی:

ــ ئەوانە لە سـەر بژیـوی ڕۆژانە قومـار دەکەن و هێنـدێکیان ئەو چەنـد کۆپکەی خەرجی ڕۆژانەی خۆیان دەدۆڕێنن.

قوماربازەکـان کاتێـک چاویـان بە کۆنـت کەوت، خۆیـان کـۆکردەوە و بە دڕدۆنگی و گومانەوە چاویان لە بەژن و باڵای کرد. لە نێوە ڕاستی داڵانەکە فێدرۆڤی خراپکاری بەناوبانگ ڕاوەستا بوو و گەنجێکی جلّفیش بە بـرۆی کەوانـی و دەموچاوی هەڵاوسـاوەوە ڕاوەسـتا بـوو، هێنـدێک لەو لاتریشـەوە پیـاوێکی بـۆرەکە و خـوێڕی شـێوە پـاڵی بە دیـوارەکەوە دابـوو، دەموچـاوی خولێرکاوی و لووتی بە قووڵدا چووبوو. دەیانگوت ئەو پیاوە جارێک لەگەڵ هاوڕێکـانی لە بەنـدیخانە ڕای کـردووە و پەنـای بـردووە بـۆ تایگـا[88] و لەوێ دوای تامڵ کردنی چەند ڕۆژ برسییەتی یەکێک لە هاوڕێکانی خۆی کوشتووە و خـواردوویەتی. فێـدرۆڤ کە ڕووپۆشـە تەڕەکەی خـۆی بە سـەر شـانیدا

88. Taig دارستانی سەوڵی ناوچە کوێستانییەکانی ڕووسیا.

دابـــوو، لەبەر دەمـــی نۆخلیدۆڤـــدا چەقیبـــوو، ســـەرەڕێی لێگرتبـــوو و بە تەوسەبزەیەکەوە چاوی لە سەرتاپای دەکرد؛ بەڵام ئەو بەهەندی نەگرت و لە پەنایەوە تێپەڕی.

نۆخلیدۆڤ خووی بە دیتنی ئەو جۆرە دیمەنانە گرتبوو. لەم سێ مانگەدا چەندین جار هاتبوو بۆ بەندیخانە و سەبارەت بە ئەم چوارسەد و پەنجا کەسە زۆر شتی بۆ ڕوون بووبۆوە. چەند جار لە نێو ڕێدا لەگەڵ دیلەکان بووبوو بە هاوڕێ. چەند جار لە گرتووخانەکانی نێوڕێ، مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی وەرگرتبوو. چەندین جار بە چاوی خۆی هەڵسوکەوتی ناحەزی بەندییەکانی دیتبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، دیلە ئاساییەکان هەموو جارێ کە چاویـــان بە قەڵافەتـــی ڕازاوە و بۆشـــناغی نۆخلیـــدۆڤ دەکەوت، بە وردی دەیانخستە ژێر چاوەدێری و لە هەڵسوکەوت و کارەکانی ورد دەبوونەوە. نۆخلیدۆڤ لە هەمبەر ئەواندا هەستی بە شەرمەزاری و تاوان دەکرد، ویژدانی ئازاری دەدا و سەرەڕای ئەوەش هەستی بە ترس و نەفرەت دەکرد. ئەگەرچی دەیزانی خراپکارەکان لە چ بارودۆخێکدا بوون و لە چ شوێنێ گەورە بوون و بە چ هۆیەک تووشی ئەم ڕۆژە هاتوون، لەگەڵ ئەوەشدا لێیان بێزار بوو و نەیدەتوانی ئەو هەستە لە خۆی دوور بخاتەوە.

لە پشتەوە دەنگی گڕی کەسێکی بیست جنێوی پێدەدا:

- ئەم بێ شەرەفە هیچوپووچانەتان دیوە؟ کاریان تەنیا ئەوەیە وەک کەر بلەوەڕێن و خۆیان بڕازێننەوە و خەریکی کەیف و نەهەنگ بن! نە ڕێزەیەک ئازار و مەینەتیان دیوە، نە تۆزقاڵە دڵ و غیرەتێکیشیان هەیە.

# ٥٥

لێرەدا خزمەتکاری فەرماندەر نۆخلیدۆڤی بە عەریفێک سپارد. عەریف ئاماژەی پێکرد هەر لەوێ چەند خولەک ڕاوەستێ هەتا دەگەڕێتەوە. ئەو ڕۆیشت. بەندییەک کە پێخاوس بوو و زنجیری لە پێ کرابوو، بۆگەنی چڵک و ئارەقی لێدەهات، خۆی گەیاندە لای نۆخلیدۆڤ و بە سرتە چرپاندی بە گوێی دا:

- گەورەم! تەنیا گوێم بۆشل کە ئاوڕ مەدەوە. دەیانەوێ ئەو چارەڕەشە لە نێو بەرن. سەرخۆشیان کردووە و فێڵیان لێکردووە. کارماتۆڤ جێگای خۆی لەگەڵ ئەو گۆڕیوە؛ تکایە ئەو بێچارەیە ڕزگار بکە. ئەگەر من قسە بکەم، پێستی سەرم دادەماڵن.

بەندیی زنجیر لە پێ زۆر دەترسا. قسەکەی کرد و ڕۆیشت. نۆخلیدۆڤیش لە جێی خۆی جووڵەی نەکرد بۆ ئەوەی هیچ کەس شک نەکا. تاڕادەیەک ئاگاداری ئەو کێشەیە بوو.

کارماتۆڤ ئەو پیاوکوژەی سزای زیندانی بە کاری قورسەوە بۆ بڕابۆوە، جێگاکەی لەگەڵ بەندییەکی تر گۆڕیبوو، کە زۆری شێوەی ئەو دەدا و ئەو سزای دوورخستنەوەی بە سەردا سەپابوو، بەو شێوەیە ئەو بێچارەیە دەبوو بە جێی ئەو پیاوکوژە مەترسیدارە لە کانگا کاربکات. ئەمە جاری دووهەم بوو ئەو بەندییە زنجیر لە پێیە ئەم مەسەلەیەی پێ ڕادەگەیاند. لە ئێکاترین

بۆرگ ئەوی ناسیبوو. داوای لە نۆخلیدۆڤ کرد بوو ئیزن لە کاربەدەستانی بالآ وەرگریێ کە ژنەکەی بنێرن بۆ بەندیخانە و چاوی پێی بکەویێ.

وەرزێڕێکی ساویلکە بوو، سی ساڵی تەمەن بوو، بە قەلافەتێکی مامناوەندییەوە. ناوی ماکار دیۆکین بوو، ویستبووی کەسێک بکووژیێ و هەر بەو تاوانەش گیرا بوو؛ بەلآم خۆی دەیگوت ڕۆحی لەو ڕووداوە ئاگادار نەبووە و شەیتان چۆتە کلێشەیەوە و ئەو کارەی پێکردووە. بە سەرهاتی خۆی بەم شێوە بۆ نۆخلیدۆڤ گێڕایەوە:

ـ بەڵیێ گەورەم! ڕۆژێک ڕێبوارێک هات بۆ گوندەکەی ئێمە، دوو ڕۆبڵی دابە باوکم تاکوو کەلوپەلەکانی بۆ بەرم بۆ گوندێکی تر کە مەوداکەی چل کیلۆمەتر بوو. باوکم پێی گوتم هێلینگەکە ئامادە بکەم و ڕێبوارەکە بگەیەنمە ئەو گوندە. بارگینەکەم لە هێلینگە کرد و هەموو شتێکم ئامادە کرد و هاتم لەگەڵ کابرای ڕێبوار چاییەک بخۆینەوە و وەڕیێ بکەوین. بە قسەکانی کابرای ڕێبواردا بۆم دەرکەوت چەند ساڵ لە مۆسکۆ زەحمەتی کێشاوە و ئارەقی ڕشتووە، پێنجسەد ڕۆبڵی پاشەکەوت کردووە و ئێستا دەیهەویێ بچیێ بۆ ئەو گوندە و لەگەڵ دەزگیرانەکەی زەماوەند بکات. هەستام بچم کەلوپەلەکانی بخەمە نێو هێلینگەکەوە، لە ناکاو غایلەیەک بە دڵمدا هات و دەنگێک پێی گوتم: «گەمژە!ئەمە باشترین دەرفەتە بۆت هەڵکەوتووە! ماتڵی چیی؟ تەورێک هەڵگەرە بۆ ئەوەی لە کاتی خۆیدا کەڵکی لیێ وەرگری!...» بیێ ئەوەی بیر لە شتێک بکەمەوە، بیورەکەم هەڵگرت و لە نێو هێلینگەکەدا خستمە ژێر کولۆشەکەوە و شاردمەوە... لە ڕێگا سەر قاڵی قسە و باس بووین و بیورەکەم لە بیر چووبۆوە، هەتا گەیشتینە شەش کیلۆمەتری ئەو گوندەی دەمانویست بچین. هەورازێکمان لە بەر بوو و دوای ئەو هەورازە دەگەیشتینە سەر ڕێگای سەرەکی. لە ناکاو وەک ئەوەی کەسێک بە گوێمدا

بچرپێنێ ، دەنگێک لە ناخەوە پێی گوتم: «ڕایگرە!» منیش بارگینەکەم ڕاگرت و لە هێلینگەکە دابەزیم. دیسان شەیتان پێی گوتم: «باشترین هەلت بۆ ڕەخساوە؛ ئەگەر بگەیە سەر ڕێگای سەرەکی، هاتوچۆی خەڵکی بە سەرەوەیە و هیچت پێناکرێ. ئێرە چۆڵوهۆڵە، زوو دەست بدە بیورەکە و کارەکە یەکلایی بکەوە!... بە دەست خۆم نەبوو؛ وەک ئەوەی کەسێک دەستم بگرێ و بیکا بەژێر کولۆشەکەدا، دانەویمەوە تەورەکەم دەرکێشا و چوومە پێشێ. کابرای ڕێبوار کە دیتی دەمهەوێ ئاوقای بم. زوو وەخۆ هاتەوە و باوەشی پێدا کردم. زۆر بە هێز بوو. تەورەکەی لێ سەندم و لە نێو بەفرەکەدا خستمی بەزەویدا، هەر دوو دەستی شەتەک دام و بردمی بۆ ژاندارمێری. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەنجومەنی گوند گوتبووی کەسێکی بێ ئازارم و ئاغای گوندەکەشمان بۆ دادگای نووسیبوو ماکار کوڕێکی باشە و تا ئێستا زەڕی بۆ مێروولەیەک نەبووە، دادگا چوار ساڵ زیندانی بۆ بڕیمەوە.

ئێستا کەسێکی ئاوا بەو پێشینەیەوە گیانی خۆی خستبووە مەترسییەوە و نهێنیی ئەو پیاوکوژە مەترسیدارەی ئاشکرا دەکرد. چونکە کارماتۆڤ ئەوەی بزانیبایە، دەستەوبەجێ دەیکوشت.

# یازده

سیاسییەکان لە دوو ژووری ئەو سەری دالانەکە نیشتەجی کرابوون کە بە پەردەیەک لە بەشەکانی تر جیا کرابۆوە. نۆخلیدۆڤ لە ژووری یەکەم چاوی بە سیمۆنسۆن کەوت کە لە پاڵ زۆپاکەدا هەڵترووشکابوو، دانە دانە ئێزنگی سەوڵی دەخستە نێو ئاورکەوە. کە چاوی بە نۆخلیدۆڤ کەوت لە جێی خۆی هەستا، دەستی گوشی و بە چاوانی کە لە ژێر کەپری برۆ پڕەکەیدا بە قووڵدا چوو بوون، لە سەر تاپای نۆخلیدۆڤی ڕوانی.

ـ خۆشحاڵم دیسان چاوم پێت کەوتەوە. چونکە شتێکی زۆر گرنیگ هەیە دەبێ پێتی بڵێم.

ـ چیم پێ دەڵێی؟

ـ پەلە مەکە؛ لە دەرفەتێکدا پێت دەڵێم.

دیسان کوتە دارێکی خستە نێو ئاوری زۆپاکەوە. ئەو بۆ هەموو شتێک فەلسەفەیەکی هەبوو و پێی وابوو زۆپاکە دەبێ جۆرێک بابیسێ گەرماکەی بە هەدەر نەچێ و لەو بوارەشدا بیروڕای خۆی هەبوو! نۆخلیدۆڤ دەیویست بچێت بۆ ژوورەکەی تر کە چاوی بە ماسلۆڤا کەوت گەسکێکی بە دەستەوە هاتە ژوورێ و هەروا دانەویبۆوە و خاک و خۆڵی تەرکی ژوورەکەی دەماڵی. فانیلەیەکی سپی و تەنوورەیەکی کورتی لە بەردا و لەچکەیەکی لە سەری

پێچابوو و قژی قوت کردبۆوە. کە چاوی بە کۆنت نۆخلیدۆڤ کەوت، بزەیەکی هاتێ و دەستی بە تەنوورەکەی سڕی. نۆخلیدۆڤ چاوی لە چاوە شیرین خێڵەکەی کاتیۆشا بڕی و گوتی:

ـ خەریکی گەسک لێدانی؟

ـ دەستم کردۆتەوە بە ئیشەکەی جاران؟ ئێرە هێندە پیسە، خاوێن نەکرێتەوە پیاو ناتوانێ تێیدا هەناسە بکێشێ.

ئاوڕی دایەوە و لە سیمۆنسۆنی پرسی بەتانییەکان ویشک بوونەتەوە؟

ـ بەڵێ، زۆریان نەماوە.

ڕوانینەکەی سیمۆنسۆن مانادار بوو کاتێک چاوی لە ماسلۆڤا کرد، هەر بۆیە نۆخلیدۆڤی تووشی گومان کرد.

ـ کەوایە بەتانییەکان ویشک بوونەتەوە، وا باشترە بچم جلە تەڕەکان بینم.

ئاماژەی بە نۆخلیدۆڤ کرد کە هەمووان لەو ژوورە کۆبوونەتەوە و دەتوانێ سەرێکیان لێبدا. ژوورەکەی تەنیشت چکۆڵە بوو و چرا دەستییەکی چکۆڵە ڕووناکی کردبۆوە و سێبەر کەوتبووە سەر دیوارەکانی. تۆزوخۆڵ وڵاتی داگرتبوو و دار و دیوار بۆنی شێ و بۆچەکی تووتنی لێدەهات. جگە لە دوو کەس کە چوو بوون بۆ هێنانی خواردن و ئاوی کوڵاو، هەموو سیاسییەکان لەوێ بوون. وێرا ئەفرمۆڤنا کە یەکێک لە ناسیاوەکانی نۆخلیدۆڤ بوو، لاواز و زەردەڵ بووبوو. قژی کورت کردبۆوە و چاوانی ترس و خەمیان لێ دەباری. تووتنی لە سەر کاغەزی ڕۆژنامە بڵاو کرد بۆوە، بەلایەوە دانیشتبوو و خەریکی جگەرە پێچانەوە بوو. ئیمیلیا ڕانتسۆڤا زووتر لە هەمووان بە بزەیەکی شیرینەوە نۆخلیدۆڤی بە خێرهاتن کرد. ئەو بەرپرسی ڕازاندنەوەی ژوورەکان بوو و حەزی دەکرد تەنانەت لەو ڕۆژە دژوارانەشدا بەندەکان بڕازێنێتەوە. لەو کاتەدا قۆڵی هەڵماڵیبوو بە خاولییەک

پەرداخ و شەربەکانی وشک دەکردەوە و لە پاڵ یەکدا ڕیزی دەکردن. ئیمیلیا زۆر جوان نەبوو، بەڵام وریا و خاکەڕابوو. نۆخلیدۆڤ لە یەکەم دیداردا بۆی دەرکەوت ئەو ژنێکی ڕۆحسووک و دڵناسکە.

ـ بە خێر بێی! ئێمە پێمان وابوو گەڕاویەتەوە بۆ مۆسکۆ.

ماریا پاولۆڤنا لە سووچێک دانیشتبوو و یاریی لەگەڵ کچۆڵەیەک دەکرد، لە پڕ دیتی نۆخلیدۆڤ وەژوور کەوت.

بە خێر بێی. فەرموو وەرە ژووریَ! وەر منداڵە تازەکەمان ببینە!

ـ منداڵەکەی پیشاندا. کریلتسۆڤ لە پاڵ دیوارەکەدا ئەژنۆی لە باوەش گرتبوو، دەستی کرد بوو بە نێو قۆڵەکانیدا و دەلەرزی. نۆخلیدۆڤ چوو بۆ لای، بەڵام لەو کاتەدا چاوی بە نۆدرۆڤ شۆڕشگێڕی بەناوبانگ کەوت، کوڕێکی قژ سوور و چاویلکە لە چاو بوو، فانیلەیەکی مشەمای لە بەر کردبوو. تۆقەی لەگەڵ کرد. بەڵام لە ناخی دڵەوە حەزی بە دیتنی نەدەکرد. نەیدەزانی بۆچی ڕقی لەو شۆڕشگێڕە ناودارەیە. نۆدۆرۆڤ لە پشت چاویلکەکەیەوە چاوە شینەکانی تێبڕی و بە تیتاڵییەوە گوتی:

ـ وادیارە خۆشی ڕادەبوێری؟ بۆشناغ و ئاسوودە خەریکی سەفەر دەکەی.

ـ تا ئێستا زۆر باش بوو؛ زۆرم شتی سەرنجڕاکێش دیوە.

نۆخلیدۆڤ تیتاڵی و تەوسەبزەکەی وەڕووی خۆی نەهێنا. نەیدەویست وەقسەی بێنێ. چونکە دەیزانی نۆدۆرۆڤ قسەڕەقە و لەم ڕۆژانەدا چزووی زمانی دەوەشێنێ، کاری توندوتیژانە دەکا و لە دڵەوە خەمبارە و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ توورە و تۆسنتر دەبێ.

کریلتسۆڤ دەیویست قسەی لەگەڵ بکات. دەستومشتاخی لەگەڵ کرد.

ـ حاڵت چۆنە؟ تەندروستیت باشە؟

ـ باشم، سپاس؛ بەلاّم سەرما شکاوەتە گیانم. گەرمم نایەتەوە. چاو لەو پەنجێرانە بکە هەمووی شکاوە و سەرما دێتە ژووری. لە مێژە لێمان ناپرسی.

بەرپرسەکان زۆر بێ ڕەزان، هیچیان لەگەڵ ناکری، ئەمشەو دوای ماوەیەکی زۆر ملازمێکی سەروروخۆشم پەیدا کرد و مۆڵەتم لێ وەرگرت. بێم بۆ لاتان.

ــ بۆ ئەوەی بۆت دەرکەوێ ئەو ملازمە چەندە بە ئەدەب و سەرورووخۆشە، لە ماریا بپرسە ئەمڕۆ بەیانی چیی کرد.

ماریا پاولۆڤنا هەروا کە دانیشتبوو، ڕووداوەکەی بەیانیی بۆ گێڕایەوە. وێرا ئەفرمۆڤنا لێبڕاوانە گوتی:

ــ دەبێ بە شێوەیەکی یەکگرتووانە ناڕەزایەتیی دەربڕین. سیمۆنسۆن ناڕەزایەتیی دەربڕی، بەلاّم جێی نەگرت.

هەمووان سەریان هەڵبڕی و بە ترس و پارێزەوە چاویان لێکرد. نۆخلیدۆڤ گوتی:

ـ ناڕەزایەتی دەربڕین زۆر کارێکی باشە، ئەگەر هەمووتان هاودەنگ بن.

کریلتسۆڤ نێو چاوانی گرژ کرد.

ــ ئەوە چ قسەیەکە؛ ناڕەزایەتیی چی؟ ناڕەزایەتی دەربڕین چ کەڵکێکی هەیە؟

ئیتر هیچ کەس لەو بارەوە قسەی نەکرد. کریلتسۆڤ بە نۆخلیدۆڤی گوت:

ــ حەتمەن لە کاتیۆشا دەگەڕێی؟ بەردەوام خەریکی گەسک لێدان و پاکوخاوێنییە. ئێرە زوو زوو خاوێن نەکرێتەوە کێچ و ئەسپێ هەموومان دەخۆن... نازانم ماریا لەوێ خەریکی چییە؟

ئیمیلیا گوتی:

- ماریا خەریکە سەری زڕکچەکەی شانەدەکا و دەیدۆزی.

ــ هەرچی ڕشک و ئەسپێ لە سەری ئەودایە، دەریدەهێنێ و دەیخاتە سەری ئێمەوە.

ماریا کچەکەی دەلاواندەوە.

- مەترسە هاوڕێ! چاکم دۆزیوە، ئەسپی و مێتوولکەی تێدانەماوە.

ماریا دەستی لە دۆزین و داهێنانی سەری کچە هەڵگرت و بە ئیمیلیای سپارد، پاشان چوو بۆ یارمەتیدانی کاتیۆشا و دوای ئەوە بەتانی بهێنێ بۆ کچەکە. ئیمیلیا کچەی لە باوەش گرت و وەک ڕۆڵەی خۆی گوشیی بە سینگییەوە و کولۆیەک قەندی خستە دەمیەوە. دوای ڕۆیشتنی ماریا پاولۆڤنا، ئەو دوو بەندییەی چوو بوون بۆ هێنانی خواردن و ئاوی کولاتوو، گەڕانەوە و هاتنە ژووری.

# دوازده

لەو دوو کەسەی خواردن و ئاوی کولاتوویان هێنابوو، یەکیان وردیلە و گورج و بەنەشە، پۆستاڵی ملدرێژی لە پێدا و دوگمەی پاڵتۆکەی هەتا سەری داخستبوو. کتریی پڕ لە ئاوی کولاتووی لە پاڵ پەرداخەکاندا دانا و نانەکەش کە لە دەسماڵێکی پێچابوو، دای بە ماسلۆڤا.

- چاومان ڕۆشن، کۆنت نۆخلیدۆڤ تەشریفی هێناوە!

پاڵتوکەی داکەند و فڕێیدا سووچیک.

ـ شتی زۆر باشمان وەگیر کەوت. مارکێلی هاوڕێمان شیر و هێلکەی کڕی. ئەمشەو خواردنی باشمان هەیە و جێژنێک ساز دەکەین. ئیمیلیاش وا باشترە دەست لە هونەر و ڕازاندنەوە هەڵگرێ و بێت شوێنە کە ئامادە بکات.

ئەم پیاوە لە هەمووان پڕ جموجۆڵتر و شاد و بە کارتر بوو؛ بەڵام ئەو کەسەی دیکەیان کە خواردنی کڕیبوو بە پێچەوانەی ئەو مات و خەمبار بوو. ئەویش بە قەڵافەت وردیلە و داڵگوشت بوو. گوێزەی بەرملی دەرپەڕیبوو. دەموچاو باریک و ڕەشتاڵە و دەمولێو تەنک، پاڵتۆیەکی شۆڕی لاسیقی لە بەردا بوو. خواردنەکانی لە بەردەمی ئیمیلیا دانا، سڵاوی لە نۆخلیدۆڤ کرد و بە دەستە ئارەقە کردووەکەی، دەستی نۆخلیدۆڤی بە ساردی گوشی؛ خواردن و کەلۆپەلەکانی لە جانتاکەی دەرهێنا و لە پاڵ یەکدا ڕیزی کردن.

ئەم دوو کەسە لە چینی زەحمەتکێشانی کۆمەڵگا بوون. ناباتۆڤ وەرزێڕ بوو، مارکێلیش کرێکاری کارخانە بوو. مارکێل لە تەمەنی سی و پێنج ساڵییەوە بە دیل گیرابوو، ناباتۆڤیش لە هەژدە ساڵییەوە تووشی بەندیخانە بووبوو. ناباتۆڤ وریا و زیرەک و بە دەستوبرد بوو. لە قوتابخانەی گوند دەرسی خوێندبوو، پاشان لە قۆناخی دواناوەندیدا میدالیای زێڕی وەرگرتبوو. بەڵام دوای ئەوە درێژەی بە خوێندن نەدابوو و گەڕابۆوە بۆ نێو جووتیار و گوندنشینەکان. لە گوندێک بوو بە مامۆستای قوتابخانە. چەند مانگی نەخایاند بە تاوانی خوێندنەوەی کتێبی یاساغ و هاندانی جووتیاران بۆ ڕێکخستنی ناوەندێکی زبارەیی وەبەر هێنان و بە کارهێنان، لە سەر ئەوە گرتیان و لە بەندیخانەیان پەستاوت. دوای هەشت مانگ ئازادیان کرد، بەڵام هەر وا لە ژێر چاوەدێریدا بوو. چوو بۆ شارێکی دیکە و دیسان لە گوندێک بوو بە مامۆستای قوتابخانە و درێژدان بە کار و ئامانجەکانی پێشووی. دیسان دەستبەسەر کرایەوە و ئەمجارەیان ساڵێک و دوو مانگ لە بەندیخانەدا

مایەوە. بەندیخانە نەیتوانی بە چۆکیدا بێنێ و لە سەر ئامانج و داوا ڕەواکەی سوورتر بوو. دوای ئازاد بوون، دووریان خستەوە بۆ پارێزگای پریم. لەویش هەڵات. دیسان قۆڵبەستیان کرد. ئەمجارەیان دوای حەوت مانگ دەستبەسەری ناردیان بۆ ئارخانگلیسک، لەوێش ڕای کرد. دیسان گرتیانەوە و ناردیان بۆ یاکۆتیسک. بەم شێوەیە نیوەی تەمەنی لە بەندیخانە ڕابوارد بوو. ئەم هەموو گرفتاری و بەندیخانە و تاراندنە نەیتوانیبوو و بیبەزێنێ و شێلگیرانە تر لە پێشوو هەوڵی دەدا و ئاسۆی هیوای گەشتر و ڕووناکتر دەدی و شاد و لیو بە بزە بوو. لەش ساغ و تەندروست بوو، دەستیشی لە تێکۆشان و شادی هەڵنەگرتبوو. هیچکات بیری لە ڕابردوو نەدەکردەوە و خەمی ئەوەشی نەبوو لە داهاتوودا تووشی چ قۆرت و تەنگژەیەک دەبێت و چ بەڵایەکی بە سەر دێ. ئەو لەگەڵ ئێستا دەژیا و کوڕی زەمانە بوو. توانایی و فکر و هۆشی دەخستە کار بۆ ئەوەی باشترین کەڵک لەو کاتە وەرگرێ کە تیایدا بوو. هەر کە ئازاد دەبوو، ڕووی دەکردەوە کاروباری سیاسی و درێژەی بە چالاکییەکانی دەدا. بە بڕوای ئەو فێرکاری و یەکێتیی کرێکاران و جووتیاران لە هەموو شتێک کرینگتر بوو. ئەو کاتەی لە بەندیخانە بوو، هەوڵی دەدا یارمەتیی هاوبەندییەکانی بدات و پێوەندیی لەگەڵ دنیای دەرەوە نەپسێتەوە و تووشی دوورەپەرێزی و بێدەنگی نەبێ. کۆمۆنیست بوو. هیچ شتێکی بۆ خۆی نەدەویست. گوێی بە حەسانەوە و خۆشگوزەرانی نەدەدا. ئەوەی دەیویست تەنیا بۆ هاوڕێ و کۆمەڵگاکەی بوو. بۆ ئەوەی کەڵکی هەبێ بۆ کۆمەڵگا خۆی بە ئاو و ئاوردا دەدا. وەرزێڕ و خاوەن وزە و دەست و مەچەک بوو. قانع و لە خۆبردوو، ڕێزی بۆ هەست و بیروباوەڕی خەڵک دادەنا. دایکی مابوو؛ ژنێکی ساویلکە و نەخوێندەوار و خورافاتی بوو. ئەو کاتانەی ئازاد بوو، دەچوو بۆ لای دایکی و یارمەتیی دەدا؛ لە مەزرا کاری

دەکرد و لەگەڵ گوندنشینان و هاوڕێیانی لە مێژینەی هەڵدەستا و دادەنیشت، خراپترین جۆری تووتنی لە کاغەزی ڕۆژنامە دەپێچا و لەگەڵ ئەوان دەیکێشا. لە کێبڕکێی شەڕە مستی گوندنشینەکاندا بەشداریی دەکرد. بۆ وەرزێڕەکانی ڕوون دەکردەوە کە چ کڵاوێکیان لە سەر ناون و دەبێ بە خۆدا بێنەوە و داوای مافی خۆیان بکەن. سەبارەت بە ڕاپەڕین و ئاڵوگۆڕییەکانی دوایی بیروڕای تایبەتی خۆی هەبوو. بە بڕوای ئەو ئەگەر شۆڕشێک هەڵگیرسێنی، دەبێ بەشێک لە ئیمتیاز و دەسەڵاتی ئاغاوات و کاربەدەستانی پایەبەرزی دەوڵەت بدرێ بە کرێکار و جووتیاران و لە دادپەروەری نزیک ببنەوە. ئەو پێی وابوو نابێ دەست لە ژیانی بنەڕەتیی خەڵک بدرێ و دەستی تێوەردرێ. لەو بەشەدا نۆدۆرۆڤ و مارکێل هەمیشە لەگەڵیدا خەریکی مشتومڕ و چەلەحانێ بوون. ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینی بە لەبەریەک هەڵوەشێنەری بنچینەی کۆمەڵگا نەدەزانی، بەڵکوو پێی وابوو هێندێک لە وردەکارییەکان و پێوەندییە چینایەتییەکان دەبێ گۆڕانیان بە سەردا بێ، بنەمای کۆمەڵگاش کە پایەدار و لە مێژینەیە نابێ لە بەریەک هەڵوەشێ.

لە بواری مەسەلە ئایینییەکاندا، ئەویش وەک هەموو وەرزێڕەکان دەیگوت نابێ بیر لەو شتانە بکەیتەوە و مێشکی خۆتی پێوە ماندوو بکەی. لەگەڵ ئاراگۆ، بیرمەندی فەڕەنسی هاوبڕوا بوو کە دەیگوت بوونی خودا تەنیا گریمانەیەکە و بەس کە لە ئێستادا پێویست بەسەلماندن ناکا. بۆ ناباتۆڤ گرنیگ نەبوو کە لە ڕازی خیلقەت تێبگا. مووسا و داروین بەلای ئەوەوە جیاوازییان نەبوو؛ کەچی بیرۆکەکەی داروین بۆ هاوڕێکانی زۆر گرنیگ بوو. دەیگوت بەلای منەوە هیچ جیاوازییەکی نییە دنیا بەو جۆرە دروست کرابێ کە داروین دەڵێ یان بەو جۆرە کە حەزرەتی عیسا دەفەرمێ لە شەش ڕۆژدا

دروست کرابێ. ئەم باسانە بە بڕوای ئەو چەشنێک سەر گەرمی بوو و تەنیا بە کەڵکی کات ڕابواردن دەهات.

گرینگیشی بەوە نەدەدا کە ئێمە لە کوێوە هاتووین و بۆ کوێ دەچین. بۆ ئەو تەنیا ئەوە گرنیگ بوو کە ئێستا لە سەر ئەم دنیایەن و دەبێ هەوڵ بدەین ژیانێکی باش ڕابوێرین، قەتیش لە بیری ئەوەدا نەبوو مەتەڵۆکەی«بوون» هەڵێنێ. لە کۆنەوە ئەم بیرە لە زەنییدا گوورابوو کە هیچ شتێک لە دنیادا، لە گژوگیا و ئاژەڵەوە بگرە هەتا مرۆڤ نەمان و فەوتانی نییە، بەڵکوو گۆڕانی بەسەردا دێ. لە خاکدا تۆو دەڕسکێ؛ تۆو گیای لێ دروست دەبێ؛ کلکەتەشییەک دەبێتە بۆق و کرمێک دەبێتە پەپوولە. ناوکێکی چکۆڵە دەبێتە درەختێکی ئەستوور و هەموو شتێک بەو شێوەیە گۆڕانی بە سەردا دێ. مرۆڤیش بە شێوەیەکی نوێ لە جیهاندا دەمێنێتەوە و لە نێو ناچێ، هەر بۆیە هەمیشە مەرگی لە بەردەمی خۆیدا دەدی و پێی وابوو لە ڕەگی بناگوێی لێی نزیکترە. بۆیە دەیگوت ئەو ڕۆژەی مەرگ دێ بۆ لام، شاد و نەترسانە ئامێزی بۆ دەگرمەوە. بەم شێوەیە نەحەزی دەکرد و نە شارەزاییشی لەو بارەوە هەبوو کە لە سەری بدوێ. حەزی دەکرد کار بکات و بۆ کۆمەڵگاکەی بەکەڵک بێ؛ گیان و جەستەی خۆی بخاتە کار و هەوڵ بدات؛ هەمیشەش داوای لە هاوڕێکانی دەکرد بە جێی فەلسەفەڕێسی و شاتوشووت بە کردەوە بێنە مەیدان و چالاکی بنوێنن.

هاوڕێ کرێکارەکەشی واتە مارکێل سەر بەو حیزبە بوو؛ بەڵام سروشت و خەسڵەتێکی جیاوازی هەبوو. لە تەمەنی یازدە ساڵییەوە کاری کردبوو و زۆری ئازار و جەزربە دیتبوو، سووکایەتیی پێکرابوو. یەکەم جار کە تامی تاڵی سووکایەتیی چێشت، لە جێژنێکی سەری ساڵدا بوو. هاوسەری خاوەنکارەکەی ئەو و چەند منداڵی کرێکارەکانی بۆ ماڵی خۆیان بانگهێشتن

کرد و بۆ ئەو دووزەلەیەک و بۆ منداڵەکانی تریش چەند دەنک هەنجیر و گوێز و سێوی وردی لە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ پێچابوو و بە جێژنانە پێی دان، جۆرێک لەیسێتۆکیشی دا بە منداڵەکانی خۆی کە دەتگوت فریشتە لە ئاسمانەوە هێناویانە. دواتر مارکێل تێگەیشت کە هەر کام لەو لەیستۆکانە لانیکەم بایی پەنجا ڕۆبڵ بوون. تەمەنی بیست ساڵ بوو لە کارخانەیەک دامەزرا و لەوێ لەگەڵ ژنێکی ناوداری شۆڕشگێر ئاشنا بوو. ئەو ژنە بۆی دەرکەوت مارکێل خاوەنی مرخ و لێهاتووییەکی شاراوەیە بۆیە کتێب و ناملیکەی شۆڕشگێڕانەی دەدایە و زوڵم و نادادپەروەرییەکانی دەوڵەت و ڕێگای بەربەرەکانێ و تێکۆشانی پێ نیشان دا و چاو و گوێی کردەوە. ئەو لەمێژ بوو لە ناخی گیانەوە زۆربەی ڕاستییەکانی هەست پێکردبوو، وردە وردە زۆر شتی دیکەی بۆ ڕوون بۆوە و تێگەیشت کە چەندە زوڵم لە ئەو و کەسانی وەک ئەو کراوە و بۆی دەرکەوت تەنیا ڕێگەی سەرکەوتن بەرخۆدان و بەربەرەکانییە و بۆ بە دەست هێنانی ئازادی و ڕزگار بوون لە بەندی زوڵم و چەوساندنەوە دەبێ ڕاپەڕێ و بچێتە مەیدانی خەبات و تێکۆشان. هەستی کرد بوو کە ئەوەی زانابێ توانای تواناشە. بۆ ئەوەی زیاتر بزانێ و بەرچاوی ڕوون بێتەوە دەستی کرد بە خوێندنەوە و متاڵای کتێب و بابەتی زانستی. هێشتا نەیدەزانی چۆن ڕێگای ئامانج و ویستی سۆسیالیستەکان بگرێتەبەر. ئەزموون فێری کردبوو کە تێگەیشتن و زانایی پەردەکانی بەر چاوی لادەدا و بەرەو ڕێگای ڕاست ڕێنوێنیی دەکات. ئێتر دەمی بۆ جگەرە و مەشرووب نەبرد. کێشکچێتیی و ئاگاداری کردن لە ئەمبارەکەیان خستبووە ئەستۆی ئەو، ئەو ئەرکەش بۆ ئەو بەکەڵک بوو چونکە دەیتوانی دانیشێ و کتێب بخوێنێتەوە.

ئەو ژنە شۆڕشگێڕە ئەوەی دەیزانی فێری کرد. یارمەتیی دا جەبر و هەندەسە و مێژوو و ئەدەبی سۆسیالیستی متالاّ بکات. ئەم دۆخە درێژەی کێشا هەتا ئەو ڕۆژەی کە ئەو ژنەیان دەستبەسەر کرد. مارکێلیشیان لەگەڵ ئەو قۆڵبەست کرد، چونکە لە ژوورەکەیدا کتێبی یاساغیان دۆزییەوە. لە بەندیخانەوە دووریان خستەوە بۆ ڤۆلۆگدا[89] و لەوێ نۆدۆرۆڤی ناسی، کتێبی تازەی خوێندەوە و لە سەر بیروباوەڕی سۆسیالیستی پێداگرتر بوو. کاتێ لە تاراوگە گەڕایەوە درێژەی بە چالاکیی سیاسی دا و یەکێک لە ڕێبەرانی ئەو مانگرتن و ناڕەزایەتییە بوو کە وێران کردنی کارخانە و کوژرانی بەڕێوەبەرەکەی لێ کەوتەوە.

بە بڕوای مارکێل دەبوو بینای ئابووریی کۆمەڵگا لە بەریەک هەڵوەشێ. لە بواری ئایینیشدا بیرۆکەیەکی توندوتیژی هەبوو. لە بنەماڵەیەکی ئۆرتۆدۆکس لە دایک بوو، لە سەر بنەمای ئایین و بیروباوەڕی مەزهەبی گەورە بووبوو؛ بەڵام وردە وردە تووشی گومان بوو. سەرتا بە ترس و پارێزەوە هێندێک لە بیروباوەڕەکانی دوورکەوتەوە، پاشان لە سەری سوورتر بوو و بەتەواوی وازی لێ هێنا و خۆی لە چوارچێوەکەی دەرباز کرد، دوای ئەوە سووکایەتیی بە ئەژدادی خۆی دەکرد کە ئەم هەموو خورافات و باوەڕە پڕوپووچەیان بە مێشکیدا کردووە. بە قەناعەتەوە دەژیا و باکی لە دژواری و سەختی ژیان نەبوو. لە منداڵییەوە شانی دایە بەر کار. خاوەنی شان و باهۆ و جەستەیەکی بەهێز بوو. لە کار نەدەترسا و دەستی لە متالاّ هەڵنەدەگرت و لێی ماندوو نەدەبوو. لە بەندیخانەش هەر کاتێک دەرفەتی بۆ هەڵکەوتایە متالاّی دەکرد. کتێبی یەکەمی مارکسی لە بەندیخانە خوێندەوە و وەها هۆگری ئەو کتێبە بووبوو، وەک شتێکی نایاب و گرانبایی ئاگاداریی لێدەکرد. لە جانتاکەیدا

89. Vologda شارێکی مێژووییە چەندین ساڵ تاراوگەی دیلە سیاسیەکان بوو.

کتێبەکەی شاردبۆوە بۆ ئەوەی کاربەدەستانی بەندیخانە پێی نەزانن. دوورەپەرێز بوو، زۆر لەگەڵ ئەم ئەو تێکەڵ نەدەبوو. تەنیا ڕێزی نۆدۆرۆڤی لە بەر بوو و ئەوی بە ڕێنوێن و مرادی خۆی دەزانی. لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە نابێ ژنان خۆ لە کارە بنەوەشییەکان وەربدەن، بەڵام ماسلۆڤای زۆر خۆشدەویست. ئەوی وەک ژنێکی چینی بێبەشی کۆمەڵگا دەهاتە بەر چاو کە بۆتە قوربانیی زوڵم و زۆرداریی دەسەڵاتدران؛ هەر بەو هۆیەش چاوی دیتنی نۆخلیدۆڤی نەبوو و بە بێوازییەوە تەوقە و چاکوخۆشیی لەگەڵ دەکرد.

## سێزدە

ئاورەکە بڵێسەی دەکێشا. سۆباکە سوور بووبۆوە و چاییەکە دەمی هێنابوو. نان و غوڕابی و هێلکەی کوڵاو و قەیماخ و سەروپێی گوێرەکەیان لە سەر سەکۆی سووچی ژوورەکە ڕیز کرد بوو و هەموویان دەورەیان دابوو. ئیمیلیا لە سەر سندوقێکی چکۆڵە دانیشتبوو، چایی بۆ هەمووان تێدەکرد و یەکی پەرداخێکی شیر پێدەدان. هەموویان قسەیان دەکرد و خەریکی نان و چایی خواردن بوون. تەنیا کریلتسۆڤ لە سووچێک بەتانییەکی لە خۆی پێچا بوو و بە ڕاکشانەوە قسەی لەگەڵ نۆخلیدۆڤ دەکرد.

دوای ئەو هەموو گرفتاری و گێروکێشەی ڕێگا و تامڵ کردنی سەرما و سەغڵەتی و تەڕوقوڕییە، دڵیان حەسابۆوە. ژوورەکانیان خاوێن کردبۆوە و کەلوپەلەکانیان بە جوانی لە سەر جێگای خۆیان دانا بوو. نانیان دەخوارد و چایی گەرمیان بە سەردا دەکرد و هەموو شتێک باش و شادی بەخش بوو. هەموویان سەروڕووخۆش بوون. ئەگەرچی هەراوهۆریا و قیژە و جنێوی

بەندییە ئاساییەکان دەهات و نەیدەهێشت لە یەک حاڵی بن، بەڵام وەڕووی خۆیان نەدەهێنا و لە هەموو کاتێک زیاتر حەزیان بە هاودڵی و هاونشینیی یەکتر دەکرد.

دەتگوت لە نێو دەریایەکی بەریندا، دوڕگەیەکی چکۆڵەیان بۆ خۆیان دروست کردووە. هەستیان دەکرد دەبێ ڕەنج و چارەڕەشییەکان فەرامۆش بکەن و دڵی خۆیان لێوڕێژ بکەن لە خۆشەویستیی یەکتر. جگە لە باسی گرفتاری و تەنگەژەی بەندیخانە باسی هەموو شتێکیان دەکرد. سروشتییە کاتێک چەند ژن و پیاو ناچار بن ماوەیەک لە شوێنێکی تەنگەبەردا بژین، ئەشق و خۆشەویستی و چەلەحانێ و زویر بوون لە نێوانیاندا سەر هەڵدەدا. چەند کەس پێکەوە خەریکی دەمەتەقێ بوون. نۆدۆرۆڤ،لەگەڵ گرابێت کە ئافرەتێکی جوان و دڵڕفێن بوو، پێکەوە کەینوبەینیان هەبوو. گرابێت خوێندکاری زانکۆ بوو؛ سەری لە شۆڕش و بیر کردنەوە و ئەو جۆرە شتانە نەدەخورا. بەپێی دابی ڕۆژ لەگەڵ چالاکە سیاسییەکانی زانکۆ تێکەوتبوو. لە ڕووداوێکدا دەستبەسەریان کرد بوو و ناردبوویان بۆ تاراوگە. ئێستاش وەک ئەو کاتەی لە زانکۆ بوو، حەزی دەکرد خۆی شیرین بکات و دڵی پیاوان بڕفێنێ، هەر بۆیە لەم گرتووخانەیەدا ئاشقی نۆدۆرۆڤ بووبوو و ئەو ئەشق و خۆشەویستییە سوکنایی بە دڵە خەمبارە و پڕ ئازارەکەی دەبەخشی.

وێرا ئەفرمۆڤنا لە ڕواڵەتدا گوێی بە ئەشق و خۆشەویستی نەدەدا. ڕوخسار و بەژن و باڵاشی ئەوەندە سەرنجڕاکێش نەبوو بتوانێ دڵی داخورپێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا هیوابڕاو نەبوو و جاروبار لەگەڵ ناباتۆڤ و نۆدۆرۆڤ دڵدڵێنەی دەکرد.

کریلتسۆڤ، شەیدایانە حەزی لە ماریا پاولۆڤنا دەکرد؛ بەڵام دەیزانی ماریا بە چاوێکی سوکوچرووکانەوە لە ئەشق و حەزلێکردوویی دەڕوانێ، هەربۆیە

زۆر بە پـارێزەوە هەسـتی ئاشـقانەی خـۆی دەردەبـڕی و لە تـوێی ناسـکی خۆشەویستییەکی یەک لایەنەدا دەیشاردەوە.

خۆشەویستیی ناباتۆڤ و ئیمیلیا ڕانتسۆڤا لە هەمووان سەیروسـەمەرە تـر بوو. ئیمیلیا ژنێکی پاک و بێگەرد بوو. شازدە سـاڵی تەمەن بـوو کە یەکێک لە خوێندکارانی زانکۆی پترزبۆرگ ئاشقی بوو و پێکەوە زەماوەندیان کرد. هەر دووکیان درێژەیان بە خوێندن دا. مێردەکەی کە هاوکـاریی لەگەڵ خوێندکارە شۆڕشگێڕەکان دەکرد، لە ساڵی چـوارەمی خوێندنەکەیدا قۆڵبەسـت کـرا و بـۆ شوێنێکی دوورەدەست دوورخـرایەوە. ئیمیلیـا کە لە سـەرەتاوە مێردەکەی بە وریاترین و باشترین مێردی دنیا دەزانـی، لە سـەر ئەو بـاوەڕە بـوو کە بیـر و بڕوای سیاسیی مێردە زانا و هۆشمەندەکەی باشترین و بـاڵاترین بیروبـاوەڕە و هەر بەو هۆیە دەستی لە خوێندن هەڵگرت و ڕێگەی شۆڕشی گرتەبەر. ئەو بڕوای وابوو دەبێ ئەم سیستەمە پـڕ گەنـدەڵی و نـادادپەروەرییە ژێـرەوژوور بێ و سیستەمێکی سیاسی و ئابووریی نوێ جێگاکەی بگـرێتەوە کە ئـابڕوو و کەسایەتیی مرۆڤ لەوێدا گەشە بکات، ئیمیلیا کە هەستی دەکـرد لەگەڵ مێـردە زانـا و هۆشـمەندەکەی بۆتە هـاوڕێ و هـاوبڕوا، لە نـاخی دڵەوە شـاد و ڕازی بوو.

دوای ماوەیەک بە پێی بەرژەوەنـدیی ڕێکخراوەکەیـان، ئەو ژن و مێـردە لە یەک جیابوونەوە و ئیمیلیا منداڵەکەیانی بە دایکی سـپارد و شـێلگیرانە دەسـتی کـرد بە هەوڵ و چـالاکی سیاسـی. بەم شـێوەیە هەمـوو گرفتارییەکـانی تامـڵ دەکـرد و ئەگەرچـی لە مێـردەکەی جیـا بووبـۆوە، بەڵام ڕۆح و گیـانی لەگەڵـی بـوو و نەیـدەتوانی سـاتێک لە بیـری خـۆی ببـاتەوە. بەڵام لە لایەکـی دیـکەوە دڵخۆش بوو کە ڕێگایەکیان گرتۆتە بەر و بیروباوەڕیان یەکێکە.

ناباتۆڤ هاوڕێی مێردەکەی ئیمیلیا بوو. زۆر پیاوێکی شێلگیر و خاوەن ڕەوشت بوو. وەک خوشکی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئیمیلیا دەکرد، بەڵام هێندێ جار هەستی دەکرد خۆشەویستییەکەی زیاتر لە خۆشەویستیی خوشکێکە و بڕێ جار هەردووکیان هەستیان دەکرد ئەم خۆشەویستی و هاودڵییە لەم بارودۆخە تاڵ و دژوارەدا سوکنایی بە ڕۆحی خەمبار و دڵی پڕ ئازاریان دەبەخشێ.

بەم جۆرە لە نێو ئەم گورووپە چکۆڵەدا ئەم ئەشق و خۆشەویستییە پاک و شاراوانە هەبوون. تەنیا ماریا پاولۆڤنا و مارکێل لەگەڵ ئەشق و خۆشەویستی نامۆ بوون و گرنگییان پێ نەدەدا.

# چواردە

نۆخلیدۆڤ لە دەرفەتێک دەگەڕا بە تەنیایی چاوی بە کاتیۆشا بکەوێ و قسەی لەگەڵ بکات. سفرەکەیان کۆ کرد بۆوە و ئەو هێشتا لەلای کریلتسۆڤ دانیشتبوو و سەرقاڵی قسەوباس بوون. قسەکانیان کێشابوویە سەر باسی جینایەتکارێک بە ناوی ماکار کە لە ساتە وەختێکی ژیانیدا کارێکی قارەمانانەی ئەنجام دابوو. کریلتسۆڤ بە چاوە سوور هەڵگەڕاوەکانی تێیدەڕوانی:

ـ بەڵێ. هێندێ جارکاری وادەکەن. بە داخەوە ئێمە دیوار بە دیواری ئەوانین بەڵام نایانناسین. ئەوانەش بەشێک لەو خەڵکەن کە ئێمە خەباتیان بۆ دەکەین. شتێکی ئەو تۆ لە بارەیانەوە نازانین و هەوڵیش نادەین بزانین،

ئەوانیش ڕقیان لە ئێمەیە و بە چاوی دوژمن لێمان دەڕوانن. بە بڕوای من ئەوە زۆر ترسناکە.

نۆدۆرۆڤ کە ئەوەی بیست، نەیتوانی بێدەنگ بێ و سەری قسەی کردەوە:

ـ کێ دەڵێ ترسناکە، من بە ترسناکی نازانم؛ ئەوانە تەنیا حەزیان لە دەسەڵاتە. ئێستا کە ئێمە لاوازین ڕقیان لێمانە بەڵام سبەینێ دەسەڵات بە دەستەوە بگرین، لە هەمبەرماندا بە چۆکدا دێن و دەمانپەرەستن.

لە خەوگەی بەندییە ئاساییەکانەوە هەڵڵاوبگر بەرز بۆوە. چەند کەس جنێویان بە یەکتر دەدا و چنگاوەشی یەک بوو بوون. کەسێک کە دیار بوو لێی دەدن، هاواری دەکرد و یارمەتیی دەخواست. نۆدۆرۆڤ درێژەی بە قسەکانیدا:

ـ گوێت لێیە ئەو ئاژەڵانە چی دەکەن؟ لە نێوان ئێمە و ئەواندا هیچ خاڵێکی وێکچوون نییە و ئەوانە قەت نابنە بەشەر.

کریلتسۆڤ نەیتوانی بێدەنگ بێ و هەڵدایە:

جیاوازیی ئێمە لەوەدایە، بە بڕوای تۆ ئەوان ئاژەڵن؛ لە حاڵێکدا هەر ئێستا نۆخلیدۆڤی بەڕێز دەیگوت جینایەتکارێک بە ناوی ماکار بۆ ڕزگار کردنی کەسێک گیانی خۆی خستۆتە مەترسییەوە. ئەو قارەمانەش کەسێک لەو مرۆڤانەیە کە بە بڕوای تۆ ئاژەڵن.

ـ دیسان هەڵبووی هاوڕێی بەڕێز! ئەو کەسانە هێندێ جار لەوانەیە بێ ئیختیار کارێکی باش ئەنجام بدەن بەڵام ئێمە دەبێ بە دوای هۆکاری ئەو کردەوە باشەدا بگەڕێین. بێ گومان، هۆکارەکەی یان خۆنواندنە یان هەوەس.

ماریا پاولۆڤنا دەنگی هەڵبڕی:

ـ تۆ هیچکات چاکەی خەڵکیت نایەتە بەر چاو.

ـ شتێک کە بوونی نییە، چۆنی ببینم؟ ئێوە باسی کامە چاکە دەکەن؟

ـ هەموو کەس چاکەی هەیە؛ ئەم جینایەتکارە، ئەو کەسەی ناوی ماکار بووە، گیانی خۆی خستۆتە مەترسییەوە یان نا؟ بە بڕوای ئێوە ئەوە فیدکاری نییە؟

ـ ئەگەر بمانەوێ بە باشی داوەری بکەین، سەرەتا دەبێ شاتوشووت وەلانێین و ڕاستییەکان وەک خۆی ببینین. دەبێ فیداکاری بۆ کۆمەڵ بکەی و چاوەڕوانی هیچ پاداشێکیش نەبی. ئەوان هەتا ئەو کاتەی لە سەر ئەو تەوەرە و بستەیەن بن، مەحاڵە لەگەڵ ئێمە هاوکاری بکەن. کاتێک دەتوانن بێنە ڕیزی ئێمەوە کە ڕێگەی ڕاست بگرنە بەر و بگۆڕدرێن. ئەرکی ئێمەشە دەستیان بگرین و بیانخەینە سەر ڕێگای ڕاست.

جۆرێک دەدوا کە دەتگوت دەیهەوێ مژولیایش بکات. مارکێل کە یەکێک لە شوێن کەوتووانی ئەو بوو، کتێبەکەی نایە ئەولاوە بۆ ئەوەی باشترین لێدوان ببیستێ. کریلتسۆڤ سوور هەڵگەڕا بوو و قسەکانی وەک برێشکە دەتۆقین.

ـ تۆ باسی کامە ڕێگای ڕاست دەکەی؟ کام گۆڕین؟ کام دەستگیرۆیی؟ ئێمە لووتمان هەڵێناوە و خۆمان بە دژبەری زوڵم و بێدادی دەزانین. ئەوەتان لە بیر نەچێ، ئەگەر ئێمەش بیروباوەڕی خۆمان بە سەر خەڵکدا بسەپێنین، لەو زاڵم و سەرەڕۆیانە زۆردار تر و چەوسێنەرترین.

ـ من لەو کارەدا زۆرداری و ملهوڕی نابینم. پیشاندانی ڕێگای ڕاست بە کەسێک، زۆرداری و زوڵم نییە. ئێمە دەڵێین ڕێگای ڕاست دەناسین؛ ڕێگایەک کە خەڵک دەبێ بیگرنەبەر تاکوو بە ئامانجیان بگەن؛ ئەو ڕێگایەش پیشانی هەموو خەڵک دەدین.

ــ بە چیدا دەزانی ئەوە ڕێگا ڕاستەکەیە؟ دادگاکانی پشکنینی بیرورِا، پیاوانی ئایینی مەسیحی و ڕێبەرانی شۆڕشی گەورەی فەرەنساش ڕێگای خۆیان بە ڕاست دەزانی و ئەو هەموو کوشت و کوشتارەیان وەڕێخست. هەر کەس بڵێ تەنیا ئەو ڕێگایە ڕاستە کە من گرتوومەتە بەر و پیشان هەمووانی دەدەم، لە هەموو کەس زاڵمتر و سەرەڕۆترە.

ـ وای دانێین قسەکەی تۆ ڕاستە و دیترانیش زاڵم و سەرەڕۆ بوون، ئەوە نابێتە هۆکاری ئەوەی ئێمەش زۆردار و ملهوڕ بین و ڕێگاکەماتن هەڵەبێ. دەبێ ئەوەمان لە بیر بێ کە دیتران پشتیان بە هێندێک گریمانە و بۆچوونی تایبەت بە خۆیان بەستبوو، بەڵام ئێمە ئەوەی دەیڵێین لە ڕووی زانست و مرۆڤدۆستییەوەیە و پشتمان بە یاساوڕێسای زانستی بەستووە.

نۆدۆرۆڤ پڕ بە ژوورەکە دەنگی هەڵێنا بوو. هەمووان بێدەنگ بوون؛ تەنیا ماریا پاولۆڤنا نارەزایەتی دەربڕی:

ـ هەر قسە و چەلەحانێ، هەر قسە و چەلەحانێ!

نۆخلیدۆڤ لە ماریا پاولۆڤنای پرسی:

ـ بیرورِای تۆ چییە؟ تۆ لایەنگری کێی؟

ــ من لەگەڵ هاوڕێ کریلتسۆڤ هاوڕام. هیچ کەس مافی ئەوەی نییە بیروبڕوای خۆی بە زۆری بە سەر خەڵکدا بسەپێنێ.

نۆخلیدۆڤ بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ کاتیۆشا،تۆ دەڵێی چی؟

کاتیۆشا سوور هەڵگەڕا بوو.

ـ بە بڕوای من خەڵکی چارەڕەش زۆریان زوڵم لێکراوە؛ لە ژێر زەخت و گوشاردا دەناڵێنن.

ناباتۆڤ گوتی:

ـ باشترین بیروباوەڕ ئەوەیە، دەبێ کارەکە لێرەوە دەست پێبکەین و خۆمان لە بەندییە ئاساییەکان نزیک بکەینەوە، دەبێ دۆستانە دەستیان بگرین و یارمەتییان بدەین.

نۆدۆرۆڤ گوڕاندی:

ئەمە زۆر چاوەڕوانییەکی سەیرە لە شۆڕشیان هەیە.

ئیتر هیچی نەگوت و لە پەستا مژی لە جگەرەکەی دەدا. کریلتسۆڤ ڕووی کردە نۆخلیدۆڤ و گوتی:

ـ ئەم پیاوە بۆ ئەوە نابێ قسەی لەگەڵ بکەی.

نۆخلیدۆڤ لە وەڵامدا گوتی:

ـ وا باشترە سەری خۆتان بەو باسانەوە نەهێشێنن.

# پازدە

نۆدۆرۆڤ لە نێو چالاکە سیاسییەکاندا زۆر جێگای باوەڕ بوو. گومانی تێدانەبوو کە پیاوێکی وریا و ڕووناکبیرە. بەڵام نۆخلیدۆڤ لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە پابەندی ڕەوشت نییە و ئەگەرچی خاوەنی هۆش و ئاوەزە، بەڵام خۆی زۆر لەوە بە ئاقڵتر و زاناتر لە قەڵەم داوە کە هەیە، لەو بوارەشدا ژمارەگەلێکی ناڕاستی خستۆتە بەر دەستی هاوڕێیانی کە چەند بەرانبەری ژمارە ڕاستەکانە.

ڕەوشت و ئاکاری ئەو ڕاست بە پێچەوانەی سیمۆنسۆن بوو. سیمۆنسۆن خاوەنی ڕەوشت و خووخدەیەکی پیاوانە بوو و کارەکانی بە پێی ئەقڵ و

مەنتیق بوون. بەڵام نۆدۆرۆڤ بە پێچەوانە خاوەنی خووخدەیەکی ژنانە بوو و هەوساری ئەقڵی خۆی دابووە دەست هەستە دەروونییەکانی.

نۆدۆرۆڤ قسەزان و زمان پاراو بوو. ئەو توانایییەشی هوکاری پێشکەوتنی زیاتری چالاکییەکانی بوو. نۆخلیدۆڤ لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە نۆدۆرۆڤ بۆ خۆدەرخستن و سینگ بردنە پێشی لە کاروباری سیاسیدا کەڵک لەو توانایی و زمان پاراوییەی وەردەگری. نۆدۆرۆڤ لە کاتی خوێندندا زۆر قوتابییەکی بەهرمەند بوو؛ چونکە بیرۆکەی خەڵکانی لە مێشکی خۆیدا کۆدەکردەوە و وەک تووتی دەیگوتەوە، ئاساییە لە قوتابخانە و زانکۆش کەسانێکی ئەوتۆیان خۆش دەوێ و باشترین نمرەیان پێدەدەن؛ بەڵام دوای تەواو کردنی خوێندن، ئیتر ئەو خەسڵەتە زۆر بەکەڵک نایە. ئەویش خووی بەوە گرتبوو هەمیشە سەرە بێ، بۆیە پلانێکی نوێی بەکار هێنا. ـ کریلتسۆڤ کە لەگەڵ ئەو پیاوە هاودڵ نەبوو، ئەم نەقڵەی بۆ نۆخلیدۆڤ گێڕایەوە ـ نۆدۆرۆڤیش هەر لە ڕێوە بیروباوەڕی خۆی گۆڕی؛ یانی ئەو کە هەتا دوێنی لە بیری چاکسازیی کۆمەڵگادا بوو، لە ناکاو وای لێهات لە هەمووان سوورتر بێ لە سەر ئەو باوەڕە و خۆی وەک پەیام هێنەری شۆڕش و ئازادیی خەڵک بناسێنێ و چونکە خاوەنی هەست و زەوقێکی ناسک نەبوو، هەموو شتێکی بێ سێ و دوو قەبووڵ دەکرد و لێبڕاوانە و بەبێ شک و دوودڵی قسەی خۆی دەکرد؛ هێندەشی متمانە بە خۆی هەبوو قەت پێی وانەبوو بەهەڵە دەچێ. بیر کورت و خۆشباوەڕ بوو، هەر بۆیە هەموو شتێک لە بەر چاوی ڕوون و ساکاری دەنواند. هێندە خۆپەرست بوو، چاوەڕوان بوو هەموو دژبەرەکان پێملی قسە و بیروباوەڕی ئەو بن. ئەگەر کەسێک نەدەچووە ژێر باری قسەکانی، بەهەر شێوەیەک بووایە ئەوی لە سەر ڕێگای خۆی دوور دەخستەوە. لاوانی ساویلکە کە حەزیان لە قسەی توندوتیژ و بەڕواڵەت

شۆڕشــگێڕانەیە، لە دەوری کۆدەبــوونەوە و خۆیــان بە شــوێنکەوتووی ئەو دەزانی و لە قسەی دەرنەدەچوون.

خـۆی بـۆ شـۆڕش و ڕۆژانـی دوای شـۆڕش ئامـادە کردبـوو، لە بیـری ئەوەدا بوو کاتێک دەسـەڵاتی وەچنگ دەکەوێ، سـەرانی شۆڕش لە شـوێنێک کۆ بکاتەوە و بەرنـامە و پلانـی خۆی ڕاگەیێنێ، دڵنیـاش بـوو ئەو پلانەی ئەو هەمـوو تەنگـژە و کێشـەکانی کۆمەڵگـا چـارە سـەر دەکـات و تەنـانەت یەک کەسیش دژایەتیی لەگەڵ ناکات.

هاوڕێیانی بە هۆی لێبڕاوی و چاوقایمییەوە ڕێزیـان بۆ دادەنـا بەڵام هـیچ کەس خۆشـــی نەدەویســـت. ئەویـــش هـــیچ کەســـی خـــۆش نەدەویســـت و هەرکەسێک وریا و بیرمەند بوایە و نەچوایەتە ژێر باری وتەکانی، بە نەیـاری خۆی دەزانی. حەزی دەکرد هەموو لاوەکان گەمژە و بێ مێشک بن و سـەری بـۆ دانەوێـنن و ستایشـی بـکەن، ئەگەر کەسـێکیش لە قسـەی دەرچووبـایە و دەمـبەدەمەی لەگەڵ بکـردایە، دانـووی لەگەڵـی نەدەکـوڵا. لە نێـو هاوڕێیانیـدا مـارکێلی لە هەمـووان خۆشـتر دەویسـت، چـونکە سـەرلەپێناوی بـوو، لە نێـو ژنەکانیشدا ڕێزی بۆ گرابێتـی شوخوشـەنگ و وێرا ئەفرمۆڤنا دادەنـا، چونکە هەر دووکیان حەزیان لێدەکرد و سەرەڕای ئەوەی پیاوێکی ژنـانیلە بـوو، زۆر زوو لەگەڵ ژنــان کەینــوبەینی ســاز دەکــرد، بەڵام لە نــاخی دڵەوە خۆشـــی نەدەویســتن. ژنـی بە بـوونەوەرێکی نەفـام و بـێ بـایخ دەزانـی و تەنیـا ئەو ژنـانەی لەو بـازیە دەردەهاویشت کە خۆشیان بوێ. هەر بەو هـۆیە، گرابێتـی بە ژنێکی جیاواز دەزانی و خەسڵەتێکی باشـی لە وجووودی ئەودا دۆزیبـۆوە کە هیچ کەس لێی ئاگادار نەبوو.

پێوەنـدیی جنسـیش بە بـڕوای ئەو وەکـوو هەمـوو مەسـەلەکانی دنیـا زۆر ساکاری دەنواند و لە سەر ئەو بـاوەڕە بـوو ئەگەر پێوەندیی ئازادی جنسیی

نێوان ژن و پیاومان قەبووڵ بێ، لەو بوارەدا کێشەیەکی چارەسەرنەکراو نامێنێتەوە.

تا ئێستا دوو جاری ژن هێنا بوو؛ جارێک بۆ بەرژەوەندیی چالاکیی سیاسی ژنێکی مارە کردبوو و جاریکیش بێ ئەوەی ئەو جۆرە بەرژەوەندییانە لە بەر چاوبگرێ ژنی هێنا بوو؛ بەڵام ئەو دوو هاوسەرگیرییە ئاکامەکەیان تەلاق بوو، ئێستاش لەگەڵ گرابێت کەینوبەینی هەبوو و لە بیری ئەوەدا بوو بە ئازادی پێوەندیی لەگەڵیدا هەبێ.

ڕقی لە نۆخلیدۆڤ بوو؛ وای دەنواند ڕقەکەشی بە هۆی ئەو کارەوەیە کە بە سەر ماسلۆڤای هێناوە، بەڵام ڕاستییەکە شتێکی دیکە بوو. کۆنت نۆخلیدۆڤ کەسێکی هۆشمەند و خاوەن بیر و زانیاری بوو؛ بیروباوەڕەکەی ئەوی پەسند نەدەکرد و لە بواری کۆمەڵایەتیدا شتێکی دەگوت کە لەگەڵ قسەکانی ئەو یەکی نەدەگرتەوە، هەر بەو هۆیەش کە نۆدۆرۆڤ دەیگوت: «ئەو وەک شازادەکان بیردەکانەوە.» نۆخلیدۆڤ دەیزانی ئەو پیاوە سەبارەت بە ئەو چی دەڵی و لەگەڵ ئەوەشدا کە سەفەرە خێرخوازانەکەی خۆی سەلماند بوو، نۆدۆرۆڤ بایەخی پێنەدەدا و ئەویش نۆدۆرۆڤی خۆش نەدەویست. هەرچی هەوڵیشی دەدا نەیدەتوانی خۆی پێمل بکات و لە دڵیدا جێی بۆ بکاتەوە.

# شازده

هەرا و زەنازەنای بەندییە ئاساییەکان کەمتر بۆوە. سەرپاسەوان بۆ سەردانی شەوانە هاتبوو. دوو سەربازی لەگەڵ بوو. سەرپاسەوان هەمووانی بە ئەنگوست ژمارد. هات بۆ بەشی دیلە سیاسییەکان و درێژەی بە ژماردن دا. کە گەیشتە نۆخلیدۆڤ، لێی چووە پێشێ و بە شێوەیەکی زۆر خۆمانە گوتی:

ـ حەزرەتی مەزن! سەردان تەواو بوو؛ ئیتر دەبێ بڕۆی.

نۆخلیدۆڤ کە زۆر باش لە مانای قسەکەی تێدەگەیشت، چووە پێشەوە و سێ ڕۆبڵی خستە لەپی دەستییەوە.

ـ حەزرەتی مەزن! چونکە مرۆڤێکی گەورە و دەستودڵبازی، ماوەکی دیکەش لێرە بمێنەوە.

سەرپاسەوان ڕۆیشت و عەریفێک لەگەڵ بوورزۆڤکین، کە بەندییەکی ئاسایی بوو، هاتەژوورێ. بوورزۆڤکین پیاوێکی لاوازی ڕیش تەنک بوو و چاوێکی ماسیبوو.

ـ هاتووم کچەکەم ببەم.

کچۆڵەکە هەڵات بۆلای.

ـ باوکە!...

ـ کچەکەم. خومم. هاتوومەوە بۆ لات.

ئیمیلیا دەستی بە قژی کچەکەدا هێنا. ماریا پاولۆڤنا و کاتیۆشا تەنوورەیەکی ژنانەیان لە توکوت کردبوو و خەریک بوون جلوبەرگی بۆ بدوورن.

ـ باوکە! دیتووتە؟ ئەو خاتوونە جوانانە خەریکن جلوبەرگم بۆ دەدوورن.

ماریا پاولۆڤنا دڵسۆزانە چاوی لە دەموچاوی ماسیو و برینداری بووزۆڤکین دەکرد.

ـ کچەکەت لێرە ئاسوودە و دڵخۆشە. لێی گەڕێ با لێرە بێ.

ـ کچەکەم! حەز دەکەی لای ئەو خاتوونانە بمێنییەوە؟

ـ ئەری، حەزدەکەم!... بە مەرجێک تۆ لێرە بمێنییەوە.

ئیمیلیا زەردەیەکی گرت.

ـ باوکت ناتوانێ لێرە بمێنێتەوە...

عەریف داوای لە بووزۆڤکین کرد لێی گەڕێ کچەکەی لەوێ بمێنێتەوە؛ خۆشی چووە دەرێ. ناباتۆڤ هەر کە دیتی عەریف چووە دەرێ، خۆی گەیاندە لای بووزۆڤکین و چرپاندی بە گوێیدا:

ـ براکەم! ڕاستە دەڵێن کارماتۆڤ لەگەڵ کەسێک جێگای خۆی گۆڕیوە؟

دەموچاوە مێهرەبانەکەی بووزۆڤکین گرژ بوو و چاوی زیت کردەوە.

ـ ئێمە شتێکی ئەوتۆمان نەبیستووە؛ ئەوە درۆیە!... کچەکەم! قەیناکا، لەلای ئەو خاتوونە شۆخوشەنگانە بمێنەوە!

ئیتر ڕانەوەستا و لە دەرگاکە چووە دەرێ. ناباتۆڤ سوورسوور دەیزانی بووزۆڤکین درۆ دەکا.

ـ هەموویان ترسەنۆکن. هەموویان دەزانن کارماتۆڤ لەگەڵ کەسێکی تر جێگاکەی گۆڕیوە! جەنابی کۆنت نۆخلیدۆڤ! ئێوە دەبێ کارێک بکەن.

ـ کاتێک گەیشتینە شار، لەگەڵ کاربەدەستانی باڵا قسە دەکەم؛ لەو مەسەلەیە ئاگادارم.

هەموو بێدەنگ بوون؛ نەیاندەویست باس و دەمەتەقی ساز بێ.

سیمۆنسۆن کە لەم ماوەیەدا لە سووچێک خۆی کوشمەڵە کردبوو و گوێی دابووە قسەکانیان، هەستا، دەستی نۆخلیدۆڤی گرت و کێشای بۆ سووچێک.

ـ دەمهەوێ شتێکی تایبەتت پێ بڵێم،...کاتت هەیە؟

ـ بەڵێ، کاتم هەیە.

نۆخلیدۆڤ لەگەڵیدا چوو بۆ دالانەکە و کاتیۆشا کە چاوی لێیان بوو، سوورهەڵگەڕا. سیمۆنسۆن دەیویست قسەکەی بکات بەڵام هەرا و ژاوەژاوەکە هێندە زۆر بوو گوێی لە دەنگی خۆشی نەدەبوو. دوو بەندی پێکەوە بەشەڕهاتبوون و جنێویان بە یەکتر دەدا. ماریا پاولۆڤنا کە هاتبوو بۆ دالانەکە، فریایان کەوت و گوتی:

ـ لێرە ناتوانن قسەبکەن؛ ئەو ئەمبارە چکۆڵەیە جارێ بە دەست ئێمەوەیە،تەنیا وێرا ئەفرمۆڤنا لە سووچێکی خەوتووە. ئەویش ژانە سەری گرتووە و گوێی لە قسەکانتان نابێ.

لەگەڵ ماریا چوون بۆ ئەمبارەکە. ماریا ویستی بە جییان بێڵێ و بڕوا، سیمۆنسۆن چووە بەردەمی و گوتی:

ـ ماریا! من هیچ قسەیەکم نییە لە تۆی بشارمەوە؛ حەز دەکەم تۆش گوێت لە قسەکانم بێ.

ماریا پێکەنی و لە سووچێک دانیشت. سیمۆنسۆن زۆر سادە و خۆمانە قسەی دەکرد.

ـ دەمویست لە یەکەم دەرفەتدا ئەو مەسەلەیەت پێ بڵێم. چونکە ئاگاداری پێوەندیی تۆ و کاترین ماسلۆڤام؛ هەر بەو هۆیە بە پێوەیستی دەزانم قسەتان لەگەڵ بکەم.

نۆخلیدۆڤ ئەو سەداقەتەی ئەوی بەدڵ بوو.

ـ چی ڕووی داوە؟

ـ دەمهەوێ لەگەڵ ماسلۆڤا زەماوەند بکەم.

ماریا گوێی لە قسەکانیان بوو، چەپڵەیەکی لێدا و گوتی: هەر مەبارەکیی دەوێ!

ـ بەڵێ؛ دەمهەوێ ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێک بێنم.

ـ دەی ئەو مەسەلەیە پێوەندیی بە تۆ و ماسلۆڤاوە هەیە، ئیتر من لەو ناوەدا چکارەم؟

ـ بەبێ ڕەزایەتی جەنابت ئەو کارە سەر ناگرێ. هەتا ئەو شتانەی لە نێوان تۆ و ماسلۆڤادا هەیە، کۆتایی پێ نەیە، ئەو وەڵامی من ناداتەوە.

ـ ئەو شتانە لە مێژە کۆتایی پێ هاتووە؛ منیش هەوڵ دەدەم ئەو ژیانێکی باشی هەبێ؛ نامەوێ ببمە کۆسپی سەر ڕێگای ژیان و بەختەوەریی ئەو.

ـ ماسلۆڤا حەز ناکا ئێوە لە بەر ئەو ژیانی خۆتان بکەنە قوربانی.

ـ ئەگەر وایە، لەگەڵ خۆی قسە بکە.

ـ حەز دەکا بیروڕای ئێوە بزانێ.

ـ من لە سەر ئەرکی مرۆڤانەی خۆم سوورم، ماسلۆڤاش هیچ بەڵێنێکی بە من نەداوە و خۆی ئازادە چۆن بڕیار دەدا.

سیمۆنسۆن چوو بوو دەماڵی فکرەوە؛ حەزی دەکرد ئەوەی لە دڵیدایە دەربڕێ:

ــ پێت وانەبێ من ئاشقی بووم؛ خۆشم دەوێ. زۆر ژنێکی باش و مێهرەبانە و لە ژیاندا زۆری ئازار کێشاوە. من هیچ چاوەڕوانییەکم لێی نییە؛ تەنیا دەمهەوێ دڵخۆشی بکەم و گڕی ئازارەکانی دامرکێنم.

نۆخلیدۆڤ بە سەر سوورمانەوە گوێی بۆ ڕاگرتبوو. سیمۆنسۆن سوورهەڵگەڕا بوو و دەنگی دەلەرزی.

ـ بەڵێ. دەمهەوێ هێندێک گڕی ئازارەکانی دامرکێنم. ئێستا کە ئێوە ڕازین، قسەی لەگەڵ دەکەم. ئەگەر ڕازی بوو شووم پێ بکات، تکا لە کاربەدەستانی زیندان دەکەم ئیزنم پێبدەن هەتا کۆتایی ئەو چوارساڵەی حوکمەی لە لای بمێنمەوە. چوارساڵ هیچ نییە، تەواو دەبێ.

ـ خۆشحاڵم کە ماسلۆڤا ئاشقێکی وەک تۆی هەیە.

ــ بە بڕوای ئێوە، دەتوانم دڵخۆشی بکەم؟ ئەگەرلە ناخی دڵەوە خۆشم بوێ دڵخۆش دەبێ؟

ـ جادیارە دڵخۆش دەبێ. دڵنیا بە.

ـ کەوایە یەک شت ماوە؛ دەبێ قسەی لەگەڵ بکەم. حەز دەکەم سوکنایی بە ڕۆحە خەمبار و پڕ ئازارەکەی ببەخشم.

نیگای لێوڕێژ لە خۆشەویستی و دڵۆڤانی بوو. دەربڕینی هەست و خۆشەویستی بۆ پیاوێکی تا ئەو ڕادەیە بنەوەشی جێگای سەر سوورمان بوو. سیمۆنسۆن هاتە پێشترەوە؛ بزەیەکی شەرمنانە نیشتە سەر لێوی و ڕوومەتی نۆخلیدۆڤی ماچ کرد.

ـ کەوایە دەچم قسەی لەگەڵ دەکەم.

زەردەیەکی گرت و لە ئەمبارەکە چووە دەرێ.

# حەڤدە

ماریا پاولۆڤنا هەستا سەرپێ، هاتە پێشێ و گوتی:

ـ دەی، ئێستا چی دەڵێی؟ سیمۆنسۆن ئاشق بووە؛ زۆر خراپیش ئاشق بووە. قەت چاوەڕوانیی ئەوەم نەدەکرد کەسێکی وەک سیمۆنسۆن بکەوێتە داوی خۆشەویستی؛ ئەویش ئەشقێکی گەوجانە و منداڵانە... بڕوا کردنی دژوارە. ئەو مەسەلەیە کاسی کردووم و تاڕادەیەک نیگەرانیشم!

ـ ئێستا باسی ماسلۆڤام بۆ بکە؛ شوو بە سیمۆنسۆن دەکا یان نا؟ ماریا کەوتە گۆمی فکرەوە؛ دەیویست وەڵامێکی ڕاست و دروستی بداتەوە.

ـ ماسلۆڤا سەرەڕای ئەو پێشینەیەی هەیەتی، ژنێکی دڵنەرم و ڕەوشت بەرزە، زۆر هۆگری ئێوەیە. ئەو لە بیری بەختەوەریی ئێوەدایە، حەز ناکا ئێوە بە ئاوری ئەوەوە بسووتێن و بە هۆی ئەوەوە پشت لە بەختەوەری و ناز و نیعمەتی ژیان بکەن. ئەو دەزانێ پێکهێنانی ژیانی هاوبەش بە قازانجی هیچ لایەکتان نییە و دەشزانێ ئەم زەماوەندە هیچ کێشەیەک چارەسەر ناکا، ئەوەندەی من بزانم حوزووری هەمیشەیی ئێوە ئازاریشی دەدا.

ـ یانی دەفەرمووی خۆم بکێشمە دواوە.

ـ مەکێشنە دواوە، بەڵام کەمتر خۆتی پیشان بدە.

ـ ئەوە کارێکی ئاسان نییە.

ـ ڕەنگە باش نەبێ، بەڵام بە بڕوای من ئەشقی سیمۆنسۆن، هەم ماسلۆڤا دەترسێنێ و هەم هیواداریشی دەکات. لەوانەیە ئەو ئەشقە توند و لە ناکاوە

بە شتێكی بێهوودە بزانی. ئەگەر چی ئەو لێهاتووییەم نییە سەبارەت بە ئەشق و خۆشەویستی بیروڕای خۆم دەربڕم، بەڵام بە بڕوای من ئەشقی سیمۆنسۆن سەرەڕای ڕواڵەتی جوان و عیرفانی، پڕاوپڕلە هەوسێكی پیاوانەیە و زۆریش دێمودە و بێ ڕەوشتانەیە!

ــ سیمۆنسۆن خۆی بڕوایەكی تری هەیە. بە بڕوای ئەو ئەم ئەشقە ئەفلاتوونییە و بەری لە هەموو هەوا و هەوەسێكە.

ـ بە پێچەوانە، ئەم ئەشقە هەوا و هەوەسە و هیچی تر؛ ڕاست وەك ئەو خۆشەویستیی نۆدۆرۆڤ بۆ گرابێت وایە.

ماریا پاولۆڤنا بە جێی ئەوەی بچێتە سەر كاكڵی بابەتەكە، خۆی بە قسەی دیكەوە دەخافڵاند.

ـ ماریا! ئێستا پێم بڵێ من دەبێ چبكەم؟

ـ وا باشە لەگەڵ ماسلۆڤا قسە بكەی. ڕاشكاوانە بابەتەكەی پێ بڵێ. ڕوون كردنەوەی مەسەلەكان هەمیشە باشترە لەوەی دڵی خۆت بخەیە تەنگژەوە. هەر ئێستا دەچم دەینێرم بۆ لات.

ماریا چووە دەرێ. نۆخلیدۆڤ هەستێكی سەیر مێشكی داگرتبوو. هەستی بە تەنیایی دەكرد. لە سووچێكی ئەمبارەكە وێرا ئەفرمۆڤنا خەوتبوو و ژانە سەر وەناڵە ناڵی خستبوو. لە دەرەوە دەنگی هاتوهاوار و جنێوی بەندییەكان دەهات و نۆخلیدۆڤ كەوتبووە گۆمی بیر و خەیاڵەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا كە خۆشەویستی یان ڕەنگە زەماوەند كردنی سیمۆنسۆن و ماسلۆڤا بەرپرسایەتییەكەی لە سەر شانی لادەبرد، بەڵام ژانێكی قورس و نادیار لە ناخەوە هەڵیدەچۆقاند. دوای ئەوە هەموو شتێك دەگۆڕدرا؛ ئیتر هیچ كەس وەك كەسێكی جیاواز چاوی لێ نەدەكرد؛ چونكە بارودۆخەكە گۆڕابوو. پیاوێكی وەك سیمۆنسۆن دەیویست لەگەڵ ماسلۆڤا زەماوەند بكات.

ویدەچوو جۆرێک ئێرەیی گیانی داگرتبێ! ماوەیەک بوو خووی بە ئەشقی کاتیۆشا گرتبوو، گەڵاڵەیەکی نوێی بۆ ژیانی خۆی داڕشتبوو. دەیویست لە هەموو شوێنێک هاوڕێی کاتیۆشا بێ و ساتێک لێی خافڵ نەبێ ؛ بەڵکوو بتوانێ گڕی خەمەکانی دامرکێنێ و سوکنایی بە ڕۆحی شەکەت و پڕ ئازاری ببەخشێ. ئێستاش دەیدی گەڵاڵەکەی بە جارێ لەبەر یەک هەڵوەشاوە و کاتیۆشا ئیتر پێوستیی بە دڵسۆزی و یارمەتیی ئەو نییە. هەستی بە هیوا بڕاوی دەکرد.

هێشتا زۆر شتی بۆ ڕوون نەبووبۆوە کە کاتیۆشا دەرگاکەی کردەوە.

ـ ماریا گوتی دەتهەوێ چاوت پێم بکەوێ؟

ــ دەمویست قسەت لەگەڵ بکەم؛ سیمۆنسۆن مەسەلەکەی بۆ باس کردووی؟

کاتیۆشا دانیشت. هەر دوو دەستی لە سەر چۆکی دانا بوو؛ ویدەچوو ئارام و بێ دڵەخورپە بێ.

ـ سیمۆنسۆن ؟ چ مەسەلە یەک؟

ـ گوتی دەیهەوێ زەماوەندت لەگەڵ بکا.

کاتیۆشا گرژ بوو؛ سەری داخست.

ـ بەڵام چۆن؟ ... بۆ ئەو هەوایە لە سەری داوە؟

شڵەژانەکەی نۆخلیدۆڤی مات کرد. چەند ساتێک چاویان لە یەکتر بڕی. دەتگوت دەیانهەوێ بە چاو بدوێن. نۆخلیدۆڤ نەیدەزانی چی بڵێ کە ماسلۆڤا زویر نەکات.

ـ کاتیۆشا ! بڕیارەکە لە دەستی خۆت دایە.

ـ چ بڕیارێک ؟ زۆر لەمێژە بڕیاری خۆمم داوە.

ـ دەتهەوێ شووی پێ بکەی یان نا؟

ـ من شوو بکەم؟ ژنێکی بەندی ؛ ژنێکی سزا بە سەردا سەپاو؟ بۆ دەبێ سیمۆنسۆن بەدبەخت بکەم؟

ـ هیوا دارم لە من خۆش بوویێتی.

ـ لێم گەڕێ با لە حاڵی خۆمدا بم؛ ئاوام باشترە.

لە جێی خۆی هەستا و چووە دەرێ.

# هەژدە

نۆخلیدۆڤ و کاتیۆشا پێکەوە چوون بۆ ژووری پیاوەکان هەموویان شڵەژا بوون و تووشی دڵە خورپە بوو بوون. هۆیەکەشی ئەوە بوو ناباتۆڤ هەدادانی نەبوو، سەری لە هەموو جییەک دەدا، هەواڵێکی سەرسووڕهێنەری هێنا بوو. بە هەڵکەوت نووسراوەی بەندییەکی بەدەست گەیشتبوو کە ناوی پێتلین بوو. پێتلین باسی ژیان و بارودۆخی خۆی نووسیبوو: «ڕۆژی بیست و حەوتەمی ئووتە، من و تاقمێک لە بەندییە ئاساییەکان لە کانی ئاڵتوونی کارا[٩٠] کار دەکەین. نێوێرۆڤ کە تا ماوەیەک لەمەوبەر لەگەڵ من بوو، حاڵی وەها تێکچوو ڕفاندیان بۆ نەخۆشخانەی غازان و لەوی خۆی هەڵواسی. من حاڵم باشە. وەرەیەکی باشیشم هەیە. بیر لە داهاتوویەکی باش دەکەمەوە و هیوا بڕاو نەبووم.»

خۆ کوژیی نێوێرۆڤ هەمووانی خستبووە گۆمی فیکر و خەیاڵەوە. هەر کەسەی شتێکی دەگوت. کریلتسۆڤ لە هەمووان زیاتر پێی تێکچووبوو. قسەی نەدەکرد. چاوی لە سووچێک بڕیبوو. ئیمیلیا لە هێندێ شت ئاگادار بوو.

---

90. Kara ڕووبارێکە چەند کانی ئاڵتوون لە دەرەوبەری هەڵکەوتوون.

ـ مێردەکەم ئەو کاتە دەیگوت نیوێرۆڤ لە قەڵای پێتر ـ و ـ پۆل وەک شێتی لێهاتبوو، تاپۆ و تارمایی دەهاتنە بەر چاوی و خەوی لێ نەدەکەوت.

نۆدۆرۆڤ دیسان بابەتێکی دۆزییەوە بۆ لێدوان و مژولیایش.

ـ بەڵێ! ئەو شاعیرێکی خەیاڵاوی بوو. لە خەیاڵی خۆیدا هێندێ توانا و تاپۆی دروست کردبوو و لێیان دەترسا، لە ئاکامدا توانا و تاقەتی لێبڕا، دەستی لە خۆی بەردا و خۆی هەڵواسی. من هەر کاتێک دەکەومە بەندیخانەوە، یەکەم کار کە دەیکەم ئەوەیە وزەی خەیاڵم لە کار دەخەم. زۆر بە باشی و ڕێکوپێکی بەرنامەی خۆم دادەرێژم؛ کاتەکانم دابەش دەکەم و هیچکات بێکار دانانیشم. بەم شێوەیە زۆر بە باشی بەندیخانەم بۆ تامڵ دەکرێ.

نۆخلیدۆڤ بۆ ئەوەی خەمۆکی لە شوێنەکە بتارێنێ، هێندێکی قسە کرد. بەڵام نۆدۆرۆڤ دیسان دەستی پێکردەوە.

ـ دەتوانی بەندیخانە تامڵ بکەی. من هەر کاتێک دەکەومە زیندان دەحەسێمەوە. ئێمە هەتا ئەو کاتەی ئازادین هەزار جۆر خەم و خەفەتمان هەیە. ترسی خۆمان و دەوربەرییەکانمان هەیە و دەترسین ئابڕووی ڕێکخراوەکەمان بکەوێتە مەترسییەوە. بەڵام کاتێک لە داو دەکەوین هەموو بەر پرسایەتی و ترسەکانمان تەواو دەبێ و کاتی حەسانەوەیە. بۆیە لێرە دادەنیشم و جگەرە دەکێشم و جەفەنگ لێدەدەم.

ماریا پاولۆڤنا لەو کاتەدا چاوی بە ڕوخساری هەڵبزرکاوی کریلتسۆڤ کەوت، ترسێک دایگرت و گوتی:

ـ کریلتسۆڤ پێموابێ تۆ ئەوت باش دەناسی؟

کریلتسۆڤ بە توندی دەکۆخی و نەیدەتوانی بە باشی قسە بکات؛ بە هەناسەسواری گوتی:

ـ بەڵێ، نێویێرۆڤ مرۆڤێکی خەیاڵاوی نەبوو. کەسێکی وەک ئەو زۆر بە دەگمەن لە جیهاندا هەڵدەکەوێ. وەک شووشـە ڕوون و بێگەرد بوو. درۆ لە زاتیدا نەبوو. نە هەڕوگیڤی هەبوو، نە خۆی دەنواند. ڕۆحێکی ناسکی هەبوو، بەڵام زۆر بە توانا و خۆڕاگر بوو. خاوەنی سروشتێکی پێچەڵاوپووچ و بێ نیاز بوو. وەک هێندێ کەس نە دەکڕووزاوە و نە خۆی زەلیل نیشان دەدا... ئێمە هەمیشـە لە سـەر ئەوەی چـبکەین خەریکـی مشـتوومڕ و چەلەحـانێین. دەڵـێن سـەرەتا فێرکـاری خەڵـک و پاشـان چاکسـازی و گـۆڕان؛ یـان سـەرەتا دەبێ دەسەڵات بە دەستەوە بگری و پاشان خەڵکی ڕابێنی. دەبێ بە شێنەیی بچیتە پێشێ یان ڕێگای زوڵم و زۆر و تیرۆر بگریتە بەر؟ بەڵام دوژمنانی ئێمە هیچکات پێکەوە چەلەحانێ ناکەن و دەزانن چبکەن. تێکۆشەرانی ئازا و بلیمەت لە ناو دەبەن و دەڵێن باشترینەکان دەبێ سەریان بە گۆمدا بکرێ. هەرزێن[٩١] دەڵێ: «کاتێک دیسامبریستەکان سەرکوت کران، کۆمەڵگا بۆ دواوە گەڕایەوە.» هەرزێن و هاوبیرەکانی لە کۆمەڵگا تەرە کران و ئێستاش نۆرەی نێویێرۆڤ بوو لە نێوی بەرن.

ناباتۆڤ دەیویست هێندێک قسە ڕەقەکانی کریلتسۆڤ پاساو بداتەوە، گوتی:

ـ ناتوانن هەمووان لە نێو بەرن. هەر کارێک بکەن ناتوانن خاشەبڕیان بکەن و تاقمێک هەر دەمێننەوە و بەرەبەرە پەرەدەستێنن.

کریلتسۆڤ بە دەم کۆخینەوە گوتی:

ـ ئەگەر بەزەییمان پێیاندا بێ و دەست لە سەر دەست دانێین، هیچ کەس ناهێڵن... ئێستا جگەرەیەکم پێبدە.

---

91. Herzen ـ1812» 1870» بیرمەندی ڕووسی؛ یەکێک لە پارێزەرانی ئازادی و مافی مرۆڤ.

ماریا کەوتبووە تکاو و پاڕانەوە و داوای لێدەکرد جگەرە نەکێشێ، چونکە دەیزانی دووکەڵ زۆر مەترسیدارە بۆی؛ بەڵام کەڵکی نەبوو. جگەرەکەیان پێدا، چەند مژی لێدا کەوتە کۆخەکۆخ. هێندە کۆخی تفەکەی لە گەرووی گیرا و دڵی تێکەڵ هات، بەڵام هەروا قسەی دەکرد:

ـ واز لەو باس و چەلەحانییە بێنن؛ دەبێ یەک بگرین و هەوڵ بدەین بۆ لە ناو بردنی ئەوان... دەبێ هەموویان بکوژرێن.

نۆخلیدۆڤ لەگەڵی هاوڕا نەبوو.

ـ بەڵام ئەوان هەرچییەک بن، مرۆڤن.

ـ ئەو دڵڕەقانە مرۆڤ نین؛ ئەوانەی کارێکی ئەوتۆیان لێ دەوەشێتەوە و بێ بەزەییانە خەڵک دەکووژن، مرۆڤ نیین. دەڵێن بۆمب و باڵۆن داهێنراوە؛ وا چاکە ئەو باڵۆنانە پڕ بکرێن لە بۆمب و بە سەر ئەواندا بیبارێنین. نابێ بهێڵین یەکیان دەرچێ، ئەوانە بەڵاو ئاپۆری کۆمەڵگان.

دەیویست هەروا لە سەری بڕوا، بەڵام کۆخە پیرانی پێکرد و خوێن لە دەمی هاتە دەرێ. ناباتۆڤ دەرپەڕییە دەرێ بەفر بێنێ، ماریا هەستا کەوچکێک شەربەتی والرینی بداتێ. شەربەتەکەی نەخواردەوە، کەوتبووە هەناسە برکێ، بە ئاوی سارد و بەفر تۆزێ هێوریان کردەوە لە سووچێک خەواندیان و نۆخلیدۆڤ هەستا بڕوات، خودا حافیزیی لە هەمووان کرد و لەگەڵ عەریفێک کە هاتبوو بە دوایدا، چووە دەرێ.

بەندییە ئاساییەکان بێدەنگ بووبوون. زۆربەیان خەوتبوون. هێندێکیان لە سەر بەتانی، هێندێک خۆیان داپۆشیبوو و چەند کەسیش لە سووچێکی دالانەکە تخێڵ بووبوون. چەند کەس جێگەیان دەست نەکەوتبوو و لە سەر زەوی خۆیان ڕاکێشا بوو، جانتا و کیسەکانیان نابووە بن سەریان و خەوتبوون.

له هه‌موو لایه‌كه‌وه ده‌نگی پرخوهۆڕ ده‌هات. هێندێكیان وڕێنه‌یان ده‌كرد، ده‌یاننالاند و به‌ده‌م خه‌وه‌وه قسه‌یان ده‌كرد. له خه‌وگه‌ی ڕه‌به‌نه‌كان چه‌ند كه‌س له سووچێك له ده‌وری گڕی كزی مۆمێك كۆبووبوونه‌وه و قسه‌یان ده‌كرد. پیره پیاوێك له‌به‌ر شۆقی چرا ده‌ستییه‌ك دانیشتبوو و كراسه‌كه‌ی پینه ده‌كرد.

هه‌وای به‌شی به‌ندییه ئاساییه‌كان قورس و بۆگه‌نتر له به‌شی به‌ندییه سیاسییه‌كان بوو. چراكه دووكه‌ڵی ده‌كرد. نۆخلیدۆڤ هه‌ناسه‌ی سوار بووبوو. بۆ ئه‌وه‌ی به نێو خه‌وتووه‌كانی نێو دالانه‌كه‌دا تێپه‌ڕێ و پێ له كه‌س نه‌نێ، به وردی چاوی له به‌ر پێی خۆی ده‌كرد. سێ كه‌س كه ته‌نانه‌ت له دالانه‌كه‌ش جێگه‌یان ده‌ست نه‌كه‌وتبوو، له‌لای ته‌شته پڕ له پیسییه‌كان ڕاكشا بوون. ئه‌و سێ كه‌سه یه‌كیان پیره پیاوێكی كه‌لحۆ بوو كه چه‌ند جار له كاتی ڕێگا بڕینی به‌ندییه‌كاندا چاوی پێی كه‌وتبوو. له پاڵ ئه‌ودا كوڕێكی یازده ساڵان خه‌وتبوو، ده‌ستی نابووه بن ڕوومه‌تی و لاقی نابووه سه‌ر لاقی كابراكه‌ی ته‌نیشتی.

نۆخلیدۆڤ كاتێك له ده‌رگاكه چووه ده‌رێ، گتێكی گرت و هه‌وای فێنكی شه‌وی چه‌ند جار پڕ به سیه‌كانی هه‌ڵمژی.

# نۆزدە

ئەستێرە بە ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە و ڕێگاکە نیوەی بەستەڵەک و نیوەکەی دیکەشی قوڕ و زێلاقە بوو. نۆخلیدۆڤ بە ئاسانی میوانخانەکەی گوندی دۆزییەوە و لە دەرگای دا. ئەو پیاوە سینگ پانەی قەڵافەتی لە هێرکۆڵ دەچوو، دەرگاکەی کردەوە. میوانخانەکە حەوشەیەکی گەورەی هەبوو، لای ڕاست عەرەبانەچییەکان لە ژێر میچی تەویلەکەدا ڕاکشابوون و پرخوهۆریان دەهات، ئەسپ و بارگینەکان پڕمە پڕمیان دەکرد. لای دەستە چەپیش دەرگایەک بوو بەرەو خەوگەی گشتی مسافیرەکان دەکرایەوە. دەرگا کە کەلێنێکی پێدرا بوو و بۆنی ئارەقەی لەش و گوڵەبەڕۆنەی وشک کراو لەوێوە دەهاتە دەرێ و پرخوهۆڕی چەند پاڵەوانیش دەهات! لە سەرسەراش لە پاڵ وێنەی پیرۆزی حەزرەتی مەریەم و عیسادا چرایەکی شووشە سوور هەڵکرا بوو. نۆخلیدۆڤ چوو بۆ ژوورەکەی خۆی، جلەکانی داکەند و لە سەر کورسییەکی دارینی درێژۆکە پاڵ کەوت و بالنجێکی چەرمی نایە ژێر سەری، بەڵام خەو لە چاوی زڕا بوو. ئەوەی دیتبووی دیسان هاتنەوە بەر چاوی و ئازاریان دەدا. ئەو منداڵە دە - دوازدە ساڵانەی لە پەنا تەشتی پڕ پیسی خەوتبوو و لاقی سەر لاقی بەندییەکەی تەنیشتی دانابوو، زیاتر لە هەموو شتێک ئازاری دەدا و لەبەر چاوی لانەدەچوو.

قسەکانی سیمۆنسۆن و کاتیۆشا بۆ ئەو سەیر و دوور لە چاوەڕوانی بوون. هەموو شتێک لەبەر چاوی تێکەڵ پێکەڵ و ئاڵۆز بوو. دەیویست ئەو فکر و خەیالانە لە خۆی بتارێنێ، بەلام هەموویان پێکەوە دەورووژان و هورووژمیان بۆ مێشکی دەهێنا. دیمەنی ئەو چارەڕەشانەی لە نێو گەندوگوودا دەتلانەوە، بۆ چرکە ساتێک لە بەر چاوی لانەدەچوو. دەمووچاوی ئەو کوڕیژگە دە ـ دوازدە سالانە هەروا لە بەر چاوی بوو.

لەم سێ مانگەدا زۆری ڕاز و نهێنی بۆ ڕوون بووبۆوە و بە چاوی خۆی دیتبووی چۆن تاقمێک هاوڕەگەزەکانی خۆیان ئازار دەدەن و دەیانخەنە ژێر زەخت و گوشارەوە؛ لە هەموو شتێکیان بێ بەش دەکەن و هەر بەلایەک پێیان خۆش بێ بە سەریانی دەهێنن. لەم سێ مانگەدا زۆر ئەزموونی تالی تاقی کردبۆوە و زۆر جار لە خۆی پرسیبوو: «بلێی من شێت بووبێتم ئەو شتانە دەبینم و ئازار دەکێشم، یان خەڵکی شێت بوون هەموو شتێک دەبینن و گرنگیی پێ نادەن و ئەو شتانە لە بەر چاویان ئاساییە؟» سەری سووڕمابوو کە کاربەدەستانی بالا و ئەنجامدەرانی ئەو هەموو زوڵم دڵڕەقی و نادادپەروەرییە پێیان وا بوو ئەم کارانە بە کەڵک و پێویستن؛ بێگومان نە ئەوان شێت بوون نەخۆی. کەوایە دەبێ چۆن ڕاستەقینە وەدۆزێ؟

دوای سێ مانگ گەڕان و بیر کردنەوە و بەو ئاکامە گەیشتبوو کە ڕێکخراوەکانی دەوڵەت و دەگای مەزنی داد لە نێو خەڵکدا تاقمێک هەڵدەخەڵەتێنن کە لە کەسانی تر پڕ جموجۆلتر و بەجەرگترن، بەهێز و خۆڕاگرن و فرتوفێڵ نازانن و زیاتر خەریکی شەڕ و ئاژاوەن؛ هەر بۆیە ئەو کەسانە لە داو دەخەن و مۆرێکی تاوانبار و مەترسیدار لە نێو چاوانیان دەدەن و هەمووان دەنێرن بۆ زیندان و تاراوگە و هێز و بڕستیان لێ دەبڕن، سالان و مانگان کۆت و زنجیریان لە لاق و ئەستۆ دەکەن. نان و ئاویان

دەدەنێ کە نەمرن و ئازار بکێشن. ئەو چارەڕەشانە لە بارودۆخێکی خراپدا دەژین و لە سروشت و ماڵ و ژیانیان دابڕاون و لە کەسپ و کار کەوتوون، ئەوەی مرۆڤیش پێویستی پێی هەیە لێی بێبەشن.

ماجراکە لێرەوە دەست پێ دەکا. ڕێک خراوە و دەزگاکانی یاسا و بەڕێوەهێنان، ئەو تاقمە سەرکوت دەکەن، حەیا و ئابروویان بە تالان دەبەن، زەنجیریان لە پێ دەکەن، سەریان لە بێخەوە دەتاشن، جلوبەرگی ناحەزیان لەبەر دەکەن و ناهێڵن بە شێوەیەکی ئاسایی و شەڕافەتمندانە بژین؛ دەزگاکان لەو تاقمە دەترسن، چونکە ئەمانە لە خەڵکی تر لێهاتووتر و بەجەرگتر و پڕ جموجۆڵترن ؛ ڕەنگە هێژا و شایستەتریش بن.

ئەو تاقمە بەردەوام لەگەڵ مەترسی دەژین. ڕووداوی شیمانە کراو وەک هەتاو بردوویی و سووتمان و سێڵاو هێندێ جار بەرۆکیان دەگرێ و مەترسی نەخۆشیی گیرۆ هەمیشە هەرەشەیان لێدەکات. تەنانەت ئەگەر مامۆستایەکی ڕەوشت و بارهێنانیش ماوەیەک لە جێی ئەوان دابنێن، عاسێ دەبن و دەست بۆ کاری شێتانە و مەترسیدار دەبەن.

جگە لەوەش، تاقمێک کە لەم نێوەدا کەمتر مەترسیدارن و بە ڕێکەوت و لە ڕووی ناچارییەوە تاوانێک ئەنجام دەدەن، لەگەڵ چەند پیاوکوژی کارامەکان لە شوێنێک دەستبەسەر دەکرێن و ئەو هاونشینییەش شوێنیان لە سەر دادەنێ و بیانەوێ و نەیانەوێ هەزار چەشنە فرتوفێڵ و خراپەکاری فێردەبن.

ئەم ستەمکارییە بەربڵاوتر دەبێ. منداڵان و ژنان و بەساڵاچووان دەخەنە ژێر گوشارەوە؛ بەندییەکان ئازار و ئەشکەنجە دەدەن؛ فەلاقەیان دەکەن ؛ بە قەمچی لێیان دەدەن، دەست و پێیان لە ڕەنجیردا دەبێ و ئەگەر کەسێک ڕابکات بۆ زیندوو و مردووەکەی خەڵات دادەنێن. ژنان لە مێردەکانیان دادەبڕن و دەیانخەنە باوەشی پیاوانی غەوارەوە، هێندێ جار لەوەش زیاتر

پێ هەڵدەبڕن و تاقمێک گوللەباران دەکەن یان لە سێدارە دەدەن و دەڵێن ئەو کارە پڕ لە توندوتیژی و بێ بەزەییانەیە لە چوارچێوەی یاسادا ئەنجام دەدرێ و دەوڵەت هەموو ئەوانە نەک بە یاسایی بەڵکوو بە پێویست دەزانێ و وەک فێرکاری و ڕاهێنان چاوی لێدەکا. هەر دەڵێی تەواوی ئەم ڕێکخراوە یاسایی و بەڕێوەبەری و یاسا دانەرانە بۆ ئەوە دانراون تاکوو تاقمێک بەرەو ڕێگای گەندەڵی و لاڕێ بوون بکێشن و خراپترین و نەشیاوترین کاریان فێر بکەن و بیانخەنە سەر چەوتترین ڕێگا.

نۆخلیدۆڤ لە بیری ئەوەدا بوو ئەگەر مەتەڵێک داهێنن و بڵێن چۆن دەکرێ لە کەمترین ماوەدا تاقمێک لە ڕێ بەدەرکەی و ڕەوشتی ئینسانییان لێ بستێنییەوە؟ دەبێ لە نێو ئەو بەندییانەدا بۆ وەڵامەکەی بگەڕێی. لە بەندیخانە و گرتووخانەکانی نێو ڕێدا بە چاوی خۆی ئەو ڕاستییانەی دیتبوو. دیتبووی چۆن سەری سەدان و هەزاران کەس لە خەڵکی هەژار و دڵپاکی گوندنشینیان لە قوڕناوە و بێ گومان ئەو کەسانە دوای ئازاد بوون لە هەموو شوێنێک بڵاو دەبنەوە و بە هۆی ڕووخانی کەسایەتی و فێر بوونی ئاکاری خراپەوە لە بەندیخانە، کۆمەڵگا بە زۆنگ و لیتەی خراپەکاری و گەندەڵیدا دەبەنە خوارێ.

لە بەندیخانەی ئەکاترین بۆرگ و تۆمسک و لە گرتووخانەکانی نێوڕێ، نۆخلیدۆڤ پەرجۆکانی ئەو فێرگەی گەندەڵییەی بە چاوی خۆی دیتبوو. دیتبووی گوندنشینە ساویلکە و دیندارەکان لەو شوێنانە چی فێر دەبن و چۆن خوو بە خراپەکاری دەگرن. بە چاوی خۆی دیتبووی چ ستەمێکیان لێدەکرێ و چەندە دڵڕەق و بێ بەزەییانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەن و چۆن ئیمان و دڵپاکییەکەیان لە سەر لاپەڕەی زەنییان دەسڕنەوە.

ئەم تـاقمە کە بەر لە بەنـدکران، کەسـانێکی بـاش و مێهرەبـان بـوون و گوێیان بۆ پەند و مەوعیزەی قەشە و مامۆستای گوندەکەیان ڕادەگرت، لێرە هەموو شتێک لە بیر دەبەنەوە. ئەو پەند و ئامۆژگارییانە کاریگەرییان نامێنێ، خاڵە ڕووناکەکانی دڵیان هەمووی ڕەش هەڵدەگەڕێ.

نۆخلیدۆڤ ئەو گۆڕانەی لە زۆربەی بەندییەکاندا دیتبوو. فێدۆزیا و ماکار گۆڕا بوون و تەنانەت تاراسیش کە بە هۆی ژنەکەیەوە کەوتبووە بەندیخانە، دوای دوومانگ گۆڕا بوو و وردەوردە گەندەڵی و خراپەکاری ڕۆحی داگرت و ڕمـووەدەی کـرد. بیسـتبووی هێنـدێک لەو خراپکـارانە لەگەڵ هاوڕێکانیـان هەڵاتوون و پەنایـان بردووە بۆ تایگا، لەوێش بە هۆی برسـێتییەوە گۆشتی هاوڕێکانی خۆیان خوارد بوو، یەکێک لەو مرۆڤخۆرانە ڕووداوەکەی بۆ گێڕا بـۆوە، ئەو مرۆڤخـۆرییەش بە هەڵـکەوت نەبـوو بەڵـکوو چەنـد جـار دووپـات بووبۆوە.

ئەم فێرگە ڕەش و پڕگەندەڵییە، خەڵکی دڵپاکی گوندی وا لێکرد بوو پەنا بۆ توندوتیژی و کوشتن و بڕین بەرن. **نیچە** بیرمەندی ئەڵمانی دەڵـێ "هەمـوو کارێک بۆ کردن دەبێ و هیچ شتێک یاساغ نییە." لەم فێرگە پڕ گەندەڵییانەشـدا هەموو شتێک دەکرا و هـیچ شـتێک یاساغ نەبـوو. بەندییەکانیش ئەو ئەندێشـە نگریسەیان وەرگرتبوو و لە سەرتاسەری ڕووسیادا بڵاویان کردبۆوە.

بیرمەنـدان و مافناسـان دەڵـێن ئەو جـۆرە سـزادانانە دەبـنە هـۆی ئەوەی تاوانبار تەمبێ بێ و ئیتر دەسـت بۆ ئەو کـارانە نەبـات و دەوروبەرییەکانیش عیبرەت وەرگرن؛ بەڵام لەم فێرگە پڕ لە گەندەڵییەدا ئەوەی وەبەرچاو ناکەوێ پەژیـوانی و چاکسـازیی سـزادراوانە. بە جێـی ئەوەی بیـری جینـایەت لە مێشـکیاندا بسـڕدرێتەوە، بـۆ ئەنجـام دانـی جینـایەتی گەورەتـر هـان دەدرێـن. تاقمێک لە بەرەڵڵا و هەڕەڵڵاکانیش کە جێگەوپێگەی باش و حیسـابییان نییە،

لە بەندیخانە جێگایەکی ئەمن دەدۆزنەوە و بە بیر و ویستی ناپاکی خۆیان دزە دەکەنە نێو ژیان و هەستی دەوروبەرییەکانیانەوە. کەوایە بە سزادانی ئەوان نەک هیچ شتێک ناگۆڕێ، بەڵکوو بێ تاوانەکانیش دەکەونە داوی گەندەڵییەوە و خووی پێدەگرن، شتی وا فێر دەبن کە لە هیچ فێرگەیەک فێر ناکرێن!

نۆخلیدۆڤ لە خۆی دەپرسی: «کەوایە ئەم هەموو سزادانانە چ کەڵکێکیان هەیە؟» هیچ وەڵامێکی بۆی نەبوو.

سەیر ئەوەبوو کۆمەڵگا سەدان ساڵ بوو ئەم ئەزموونەی تاقیکردبۆوە. نە جارێک و نە بە پێی ڕێکەوت و نە لە ڕووی هەڵەوە، بەڵکوو سەدان ساڵ بوو کۆمەڵگا بەبێ چکۆڵەترین گۆڕان ئەو چەشنە سزایەی بە سەر تاوانباراندا دەسەپاند. لە ڕابردوودا گوێچکە و لووتیان دەبڕین و سواری عارەبانە و هێلینگەیان دەکردن و بە نێو خەڵکدا دەیانگێڕان، ئێستاش قۆڵبەستیان دەکەن و بە سواری شەمەندەفەر دەیانبەن بۆ تاراوگە.

هێندێ جار نۆخلیدۆڤ لەگەڵ کاربەدەستانی بالای دەوڵەت دەردەدڵی دەکرد، بڕێ کەس لە سەر ئەو باوەڕە بوون ئەگەر بۆ بەندییەکان بینایەکی باشتر ساز بکەن و جێگاکەیان تەنگەبەر نەبێ هەموو شتێک ڕوو بە باشی دەڕوا؛ بەڵام ئەو دەیزانی باشتر بوونی شوێنی بەندکردنی دیلەکان کێشەکە چارەسەر ناکات. لە ڕۆژنامەکانی دەرەوەدا خوێندبوویەوە: لە هێندێک وڵات زیندانی مودێڕنیان دروست کردووە کە هەموو پێداویستییەکی ئەمڕۆییانەی بۆ جێبەجێ کراوە. «تارد» بیرمەندی فەرەنسی پێشنیاری ئەو جۆرە بینایەی کردبوو، سەیریش ئەوە بوو لەو زیندانە مودێڕنانەدا، توندوتیژی و هەڵسوکەوتی خراپی کار بە دەستان چەند بەرانبەر بووبوو.

دەزگـــای مەزنـــی داد، کارناســـی کارامەیـــان بە مـــووچەی زۆرەوە دامەزرانـدبوو کە کارەکەیـان متـالا و لێکـۆڵینەوە بـوو. ئەم کارناسـانە ئەو کتێبانەیان دەخوێندەوە کە هاوبیرەکانیان نووسیبوویان و بە کەڵک وەرگرتن لەو نووسینانە، تاوانەکانیان دەستەبەندی دەکرد و بۆ هەر تاوانێک شرۆڤە و لێکدانەوەی جیاوازیـان دەنووسـی و لە سـەر داوای ئەم کارناسـانە تاقمێک بەندییان دەنارد بۆ بەندیخا و تاراوگە و دەیاندانە دەست سەرۆکی زیندان و پاسـەوان و سـەربازەکان تـاکوو لە ژێـر قەمچیی تونـدوتیژی و بێ ڕەحمیدا ڕۆح و جەستەیان لە بەر یەک هەڵوەشێنن. نۆخلیدۆڤ بـارودۆخی زینـدان و گرتوخانەکانی لە نزیکەوە دیبوو و دەیزانـی چ سـتەم و نـادادپەروەرییەک بە سـەر زیندانەکانـدا زاڵە، مەسـت بـازی و قومـار و شـەڕ و تێکهەڵچـوونی خوێنـاویی دیلەکـان و تەنـانەت مـرۆڤ خـۆریی ئەوان پێوەنـدیی بە زات و ڕۆحـی خراپکـارانەوە نیـیە و ئەوەی بیرمەنـدانی گەمـژە و دەسـتندەخۆری دەزگـای دەوڵەت سـەبارەت بە جینایەتکـارانی زگمـاک گوتوویـانە هەمـووی وڕێـنەیە و ئەم گەنـدەڵی و خراپکـارییە ئاکـامی داوەری نـابەجێ و ڕەفتـاری دڵڕەقـانەی کاربەدەسـتەکانە. نۆخلیـدۆڤ لە سـەر ئەو بـاوەڕە بـوو کە مرۆڤخـۆری و گەنـدەڵی لە کـاتی ڕاکـردن و برسـێتی و مـانەوە لە تایگـاوە دەسـت پـێ ناکـا. بـۆ دۆزینـەوەی خـاڵی دەسـپێکی ئەم کێشـەیە دەبـێ نێـو وەزارەتخـانە و کۆمیسـۆنی ئیـدارە و نووسـینگەکان بگەڕێـی. ئەم خـاڵەی بە باشـی بـۆ دەرکەوتبـوو کە قازییەکـان و کاربەدەسـتانی فەرمانگەکـان - یەک لەوانە مێردەکەی خوشکی - لە دەرگاوانی خانەی دادەوە بگرە هەتـا وەزیـر خۆی کاریان بە سەر ویژدان و دادپەروەرییەوە نییە و خەم بۆ خەڵک نـاخۆن ؛ تەنیا لە بیری مووچە و پاداشی خۆیاندان کە لە کۆتـایی مانگدا وەریدەگرن،

ئەم پارەیەش هەقدەستی ئەو بەڵایانەیە کە بە سەر خەڵکی چارەڕەشیان هێناوە. لەوەش بە تەواوی دڵنیا بوو!

دیسان لە خۆی دەپرسی: «یانی وا باشتر نییە مووچە و پاداشی ئەم فەرمانبەرانەی دەوڵەت لە سەرەوە تا خوارێ بە تەواوی بدرێ و تەنانەت مووچە و پاداشەکەیان بۆ زیاد بکەن، بەڵام بەو مەرجەی جۆری بیرکردنەوەیان بگۆڕن و باشتر لەگەڵ خەڵک هەڵسوکەوت بکەن؟»

هەر لەو بیر و خەیاڵانەدا بوو کە خەوێکی قورس دایگرت. ئەگەرچی پێشکە و تۆفانە پێوەیان دەدا و لەگەڵ هەر جووڵانێک هەڵدەفڕین، جێگاکەیان دەگۆڕی و هێرشیان دەبرد بۆ سەر و چاوی، بەڵام خەبەری نەدەبۆوە. تەنانەت کەڵەشێری بەیانی دوو جاری خوێند و ئەو لە خەو ڕانەپەڕی.

## بیست

کاتێک نۆخلیدۆڤ لە خەو هەستا، عارەبانەچییەکان کە شەوێ لە میوانخانەی نێو ڕێ خەوتبوون، ڕۆیشتبوون. خانمی بەڕێوەبەری میوانخانەکە، بە خاولییەک ملە قەڵەو و بەرخەبەبە گۆشتنەکەی سڕی و نامەیەکی دا بە نۆخلیدۆڤ کە سەربازێکی هاوڕێی کاروانەکە هێنا بووی. نامەکە ماریا پاولۆڤنا ناردبووی. نووسیبووی: «کریلتسۆڤ حاڵی زۆر خراپتر بووە. هەرچی هەوڵمان دا لێرە بیهێڵنەوە و من لە لای بمێنمەوە قەبووڵیان نەکرد، بۆیە ناچارین لەگەڵ خۆمان بیبەین. دەترسم حاڵی لەوە خراپتریش بێ. ئەگەر بۆت دەکرێ، پێوەندی بە کاربەدەستانی باڵاوە بکە بەڵکوو ڕێگەی پێبدەن لە وێستانگەی دوایی. بمێنێتەوە و من بۆ پەرستاری کردن لە لای بم.

ئامادەشم بە شێوەیەکی فەرمی خۆمی لێ مارەبکەم بۆ ئەوەی ڕێگە بدەن لە لای بمێنمەوە.»

نۆخلیدۆڤ کوڕێکی نارد فەتیوونێک بێنێ و بە پەلە جانتاکەی پێچایەوە. دووهەمین پەرداخی چایی دەخواردەوە کە فەتیوونەکە هات و لە بەر قادرمەکان ڕاوەستا. زڕەی زەنگوڵەی بارگینەکان دەهات. پارەی میوانخانەکەی دا و هاتە دەرێ. فەرمانی بە فەتیوونەوانەکە دا بە زووترین کات خۆی بگەیێنێتە کاروانی بەندییەکان. زۆری نەخایاند بە هێلینگە و عارەبانەی کاروانەکە گەیشتنەوە کە بەلەقەلەق و شەقوکوت دەڕۆیشتن. ملازمی فەرماندەر کەوتبووە پێش کاروانەکەوە. سەربازەکان سەر خۆش بوون و بەدوای کاروانەکەدا دەهاتن و سەرسمیان دەدا و سەرەنگرێ دەبوون. عارەبانەیەک شەش دیلی نەخۆشی لە سەر بوو. عارەبانەی دووهەم نۆدۆرۆڤ و گرابێت و مارکێل سواری بووبوون، عارەبانەی سێهەمیش، ئیمیلیا جێگاکەی خۆی دا بوو بە ژنێکی باداری دەست و پێ پەنەمیو. ماریا پاولۆڤنا و کریلتسۆڤیش لەگەڵ ئەوان بوون. لە تەرکی عارەبانەکەدا کایان بڵاو کرد بۆوە و کریلتسۆڤ لە سەری ڕەهێڵ بووبوو، بالیفێکیان نابووە بن سەری. ماریا پاولۆڤناش لە پاڵیدا دانیشتبوو.

نۆخلیدۆڤ لە فەتیوونەکە دابەزی و چوو بۆ لای عارەبانەکە. سەربازێک کە چاوی پێی کەوت، دەنگی هەڵبڕی. نۆخلیدۆڤ گوێی نەدایە و هەتا لای عارەبانەکە ڕانەوەستا، دەستی بە لێوارەی عارەبانەکە گرت و بە دەم ڕۆیشتنەوە لەگەڵ کریلتسۆڤ قسەی دەکرد. کریلتسۆڤ چاکەتەکەی پێستی بەرخ و کلێتەی هەشتەرخانی لە سەر نابوو و دەسرەیەکی بە بەر دەمیەوە گرتبوو. زۆر لاواز بووبوو. چاوی بەو دەموچاوە کزەیەوە زەقی دەنواند. نۆخلیدۆڤ حاڵی پرسی. ئەو سەری لەقاند. ئەو تۆزە هێز و وزەیەی بۆی

مابۆوە،کۆی دەکردەوە بۆ ئەوەی بتوانێ هەڵتەک هەڵتەکی عارەبانەکە تامڵ بکات. ماریا پاولۆڤنا لە پاڵیدا دانیشتبوو، بە چاوێکی ماناداراەوە نیگەرانیی خۆی نیشان دەدا و بۆ ئەوەی خەم و خەفەتەکە ڕامالێ، گوتی:

ـ ئەمڕۆ ملازمی فەرماندەر دەتگوت لە کارەکەی دوێنێی پەژیوانە و فەرمانی دا دەستی بووزۆڤکین بکەنەوە بۆ ئەوەی بتوانی منداڵەکەی لە باوەش بکات و لەگەڵ خۆی ببیات. کاتیۆشا و سیمۆنسۆن و ئیمیلیا لە ڕیزی ڕێبوارەکاندان و یارمەتیی دەدەن.

کریلتسۆڤ ئاماژەی بە ماریا پاولۆڤنا کرد و شتێکی گوت کە نەدەبیسترا. بە ناچاری تۆزێ خۆی ئەمبارە و بارکرد و دەسماڵەکەی بە بەر دەمیەوە گرت.

ـ ئاوا ئاسوودەترم. ئەگەر سەرمام نەبێ، حاڵم باشتر دەبێ.

نۆخلیدۆڤ و ماریا پاولۆڤنا خەمیان بوو. کریلتسۆڤ بزەیەکی خەماوی نیشتە سەر لێوی و بە نۆخلیدۆڤی گوت:

ـ ئێستا پێم بڵێ ماجەرای سێ گۆی ئاسمانی بوو بە چی؟ وادیارە بارودۆخەکە زۆر ئاڵۆز بووە.

نۆخلیدۆڤ لە مەبەستەکەی تێنەگەیی. ماریا بۆی باس کرد کە لە زانستی ئەستێرەناسیدا مەسەلەیەک هەیە کە پێوەندیی نێوان خۆر و مانگ و زەوی حیساب دەکا و ئەو بە گاڵتەوە پێوەندیی نێوان ئەو و کاتیۆشا و سیمۆنسۆن بەوە دەشوبهێنێ.

ـ ئێستا تێگەیشتم! لەو مەسەلەیەدا ئەوەی گرنیگیی پێ نادرێ منم. ئەو دوو کەسە دەبێ تەکلیفیان ڕوون بێتەوە.

ماریا لێی پرسی کە نامەکەی گەیشتووە و هیوایەک هەیە؟ نۆخلیدۆڤ بەڵێنی دا لەگەڵ گەیشتنە شار، هەوڵی خۆی دەدا و خودا حافیزیی لە

کریلتسۆڤ و ماریا کرد و خۆی گەیاندە لای فەتیوونەکەی. ڕێگاکە هێندە پڕ کەندولەند بوو، بەناچاری لە سەر پێداڵەکە سوار بوو و دەستگیرەی بەردەمی خـۆی گـرت. فەتیـوونەکە وردە وردە خێـراییەکەی زیـاد کـرد و نـزیکەی کیلۆمەترێک وەپێش کاروانەکە کەوت. دیسان باس باسی ڕەنجیر و دەستبەند و ڕووپۆشەکان بوو. لەم نێوانەدا چاوی بە کاتیۆشا کەوت لەچکەی شینی بە سـەردا دابـوو. لە پـاڵ ئەویشـدا وێـرا ئەفرمۆڤنـا بە پـاڵتۆی ڕەشـەوە و سیمۆنسـۆن بە کـڵاوی دەسـتچن و کەوشـی سـەیرەوە. کاتیۆشـا و وێـرا لە دوورەوە سڵاویان لێکرد و سیمۆنسۆن بۆ ڕێز گرت کڵاوە دەستچنەکەی لە سەری داگرت. نۆخلیدۆڤ گتێکی گرت و ملی ڕێگای گرت.

کاتێـک فەتیـوونەکە گەیشـتە سـەر جـادەی سـاف و بـێ ئەسـکوند، خێـراییەکەی تونـد کـرد. گەڵای دارەکـان زەرد و سـوور و ئەرخەوانییـان دەنواند. لە دارستانەکە تێپەڕین و گەیشتنە گێڵگە بەربڵاوەکان و لە دوورەوە گـومبەزیی ئـاڵتوونیی کلیسـای گەورە وەدیـار کەوت. هەورەکـان بە ئاسـمانا پـرژوبڵاو بـوونەوە. ئاسـمان ڕوونـاکیی تێـزا. خـۆر لە سـەرووی دارەکـانەوە پڕشـنگی خۆی دەخسـتە سـەر سـنیگی ڕێگـاکە و گیـاوگژی شـێدار بریقەیـان دەهات و دەترووسکانەوە. پڕشنگی خۆر لە گۆلاوەکانی دەدا و خـاچی زێڕین لە دوورەوە ترووسـکەی دەهـات. ئاسـۆ مەیلەوبـنەوش بـوو و لووتکەکـانیش بەفر داپۆشیبوون.

وردەوردە گەیشـتنە گونـدەکانی دەوروبەری شـار. خەڵـک وەک مێـرووولە ڕژابـوونە کـۆڵان و شـەقام. تاقمێـک بە شـێوازی ڕووسـەکان جلوبەرگیـان پۆشـیبوو و تـاقمێکیش جلـوبەرگی نـاوچەی سـیبیریایان لە بەر دابـوو. دووکانەکـان پـڕ بـوون لە کڕیـار و لە بەر دەرگـای مەیخانەکـان چەنـد کەس

سەر خۆش بوون. هەموو شتێک نیشاندەری ئەوە بوو کە لە شارێکی گەورە و ئاوەدان نزیک بوونەتەوە.

فەتیوونەوان قەمچییەکەی هەڵدێنا و هەڵیدەسووڕاند. ئەسپەکان بە پڕتاو دەڕۆیشتن. فەیتوونەوان بەرەو لای چۆمەکە دەڕۆیشت و ملی وەرسووڕاندبوو و دەیڕوانی. لە کەناری ڕووبارەکە زیاتر لە بیست عارەبانە و فەیتوون ڕیزیان بە ستبوو و چاوەڕوانی پاپۆڕ بوون. پاپۆڕەکە بەڕێوە بوو، سنیگی ئاوەکەی دەبڕی و دەهات بۆ ئەم لاوە، چەند هێلینگە و عارەبانەی بار کرد بوو. پاپۆڕەوانەکان زەبەلاح و توندوتۆڵ بوون. جلەکانیان لە پێستی پەز بوو، چەکمەی مل درێژی لاستیقیان لە پێدا بوو. کاتێک پاپۆڕەکە گەیشتە کەنار، پاپۆڕەوانەکان گورج و خێرا کورسییەکانیان فڕێدا بۆ ڕۆخەکە و لە دەوری کۆڵەکە دارینەکانیان ئاڵاند و بە هێواشی پاپۆڕەکەیان هێنا بۆ ڕۆخەکە. عارەبانە و فەیتوونەکان کە لەو بەرەوە هێنابوویان، لە پاپۆڕەکەیان دابەزاندن و ئەوانەی چاوە ڕوان بوون سواری پاپۆڕەکە بوون. هێلینگە و عارەبانە و فەتیوون لە پاڵ یەکدا ڕیز کرابوون. ئەسپەکان کوڕەگوێ بووبوون لە سەر تەرکی چێوینی پاپۆڕەکە چەپۆکانیان دەکرد. عارەبانەچییەکان هەوساری بارگینەکانیان دەکێشا و دەیانویست هێوریان بکەنەوە. نۆخلیدۆڤیش لەوێ بوو و چاوەڕوان بوو پاپۆڕەکە بەو بارە قورسەوە زووتر بگاتە کەنار.

لرفەی شەپۆل و زرموکوتی چەپۆکانی بارگینەکان لە سەر تەرکی چێوینی پاپۆڕەکە، تێکەڵ بووبوو.

# بیست و یەک

نۆخلیدۆڤ لە سووچێکی پاپۆڕەکە ڕاوەستا بوو و چاوی لە شەپۆلی توند و کەفچڕێنی ڕووبارەکە دەکرد و کەوتبووە گۆمی بیر و خەیاڵەوە. دوو ڕوخسار لە بەر چاوی بوون؛ یەکیان ڕوخساری کریلتسۆڤ کە خەریکی ئاویلکەدان بوو و دڵی پڕ بوو لە ڕق و ئارەزووی خنکاو، ئەوی دیکەشیان ڕوخساری کاتیۆشا کە شان بە شانی سیمۆنسۆن ڕێگای دەبڕی. یەکەمیان ئازاری دەکێشا و لە مەرگ نەدەترسا، دووهەمیش گڕی ئەوینی پیاوێک دڵی گەرم داهێنا بوو و هێشتا لە چارەنووسی خۆی ئاگادار نەبوو، هەر دوو ڕوخسارەکە خەمیان لێ دەباری و بە هیچکامیان دڵی سوکنایی نەدەهات.

لە دوورەوە زایەڵەی بەرزی کەڵەزەنگەکانی کلیسا دەهاتە گوێ. فەتیوونەوان کە هەوساری بارگینەکەی بە دەستەوە گرتبوو و شان بە شانی نۆخلیدۆڤ ڕاوەستا بوو، کڵاوەکەی لە سەری داگرت و خاچی خۆی کێشا. هەموو فەتیوونەوان و عارەبانەچییەکان کڵاویان داگرت،خاچی خۆیان کێشا و لە بەر خۆیانەوە دەستیان کرد بە نزاکردن. لەو نێوەدا تەنیا پیرەپیاویکی وردیلەی جل شڕ کە جووتێ کەوشی کۆن و پینەکراوی لە پێدا بوو، کڵاوەکەی دانەکەند و گوێی بە دەنگی کەڵەزەنگەکە نەدا. فەتیوونەوانەکەی نۆخلیدۆڤ نەیتوانی دان بە خۆیدا بگرێ و گوتی:

- پیرەپیاو! تۆ بۆ خاچی خۆت ناکێشی؟ بۆ نزا ناکەی؟

پیرەپیاو هێور و دانار دانار قسەی کرد و دیار بوو لە هیچ کەس باکی نییە. چاوێکی لە فەتیوونەوان کرد و گوتی:

- خاچی خۆم بکێشم و نزا بکەم؟ بۆ؟ بۆ کێ؟

- بۆ کێ؟ بۆ خودا.

- خودای تۆ لە کوێیە؟ پیشانم بدە.

فەتیوونەوانە چاوی لە چاوی پیرەپیاو بڕی و بۆی دەرکەوت کە پیرەپیاوی شڕۆڵە لەو تێگەیشتووتر و وریاترە؛ لەگەڵ ئەوەشدا لە قسەی خۆی پاشگەز نەبۆوە و وەڵامی دایەوە

- جا دیارە خودا لە کوێیە؛ خودا لەو سەرەیە، لە ئاسمان.

- تۆ تا ئێستا چووی بۆ ئاسمان؟

- پێویست ناکات بچم بۆ ئاسمان؛ هەمووان دەزانن خودا لەوێیە.

- هیچ کەس تا ئێستا خودای نەدیوە؛ تەنیا کەسێک کە دیتوویەتی و باسی کردووە، حەزرەتی مەسیح، تاقانە کوڕی خۆیەتی.

فەیتوونەوان قەمچییەکەی ئەمبارەوبار کرد کە بە نێوقەدییەوە بەستبوو، گوتی:

- دیارە تۆ لە بنەڕەتەوە کافری و ئیمانت بە هیچ نییە.

کەسێک پێکەنی و یەکێکی تر کە تۆزێ دوورتر ڕاوەستا بوو پرسیی:

- پیرەپیاو! تۆ چ مەزهەبێکت هەیە؟

- چ مەزهەبێکم هەیە؟ من هیچ مەزهەبێکم نییە. من پێڕەوی مەزهەبی خۆمم.

توند و لێبڕاوانە قسەی دەکرد. شک و گومان لە قسەکانیدا نەبوو. نۆخلیدۆڤ لێی چووە پێشێ. حەزی دەکرد زیاتر بیدوێنێ و گوێی لە بیر و بۆچوونەکانی بێ. گوتی:

ـ مەگین دەکرێ پیاو تەنیا ئیمانی بە خۆی بێ؟ مرۆڤ بەردەوام تووشی هەڵە دەبێ.

ـ من تووشی هەڵە نابم؛ ڕێگای خۆم دۆزیوەتەوە.

ـ کەوایە ئەم هەموو مەزهەبە جۆراوجۆرە بۆچی هەن و لە کوێوە هاتوون؟

ـ تەنیا یەک هۆکاری هەیە؛ ئەویش ئەوەیە مرۆڤ بەجێی ئەوەی بڕوای بە خۆی هەبێ، حەز دەکا وەشوێن ئەم و ئەو بکەوێ و باوەڕیان پێبکا و ئیمانیان پێبێنێ. منیش ئەو دەورەیەم تێپەڕاندووە. ساڵانێکی زۆرگوێڕایەڵ و سەرگەردان بووم و هێندەش چەواشە بووبووم کە هیوام بە ڕزگار بوون نەبوو. لەم وڵاتەی ئێمە سەدان جۆر بیروباوەڕی مەزهەبی دروست بووە؛ یەکیان تەنیا قسەی قەشەکان دەسەلمێنێ، یەکیان دەڵێ مەزهەبی ئێمە قەشەی پێویست نییە؛ یەکی دیکەیان دەڵێ بە جیی یەکشەممە دەبێ شەممە ڕۆژی پشوودان بێ؛ یەکی دیکە داب و ڕێوڕەسمەکان زیاتر دەکات و یەکیان کەمی دەکاتەوە. یەکی دیکە دەڵێ دەبێ ژیانی هاوبەش پێک بێنین و حەشیمەتی دنیا زیاد بکەین؛ یەکی دیکەیان دەڵێ دەبێ واز لە پێوەندیی جنسی بێنین. هەر کامیشیان خۆی بە بەرهەق دەزانێ و ئەوانی تر بە فێڵباز و ڕیاکار. بەڵام لە ڕاستیدا هەر کەس وەشوێن ئەو تاقم ولایەنانە بکەوێ، وەک تووتکە توڵەیەکی کوێر وایە کە لە بیابانێکی کاکی بە کاکیدا بەرەڵڵا کرابێ. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە جەوهەری دینەکان یەکێکە و ئەم جەوهەرە لە زاتی مندا هەیە، لە تۆشدا هەیە و لە ئەوی دیکەشدا هەیە. کەوایە هەر کەس دەبێ بڕوای بە خۆی و ڕۆحی خۆی و جەوهەری زاتی خۆی هەبێ. هەموومان لە کانییەک هەڵقوڵاوین. هەموومان یەکین و ئەگەر ئەو ڕاستییە بدۆزینەوە، هەموومان یەک دەگرین و دژوازی و ڕقوقین لە ناوماندا نامێنی و بارگەوبنەی دەپێچێتەوە.

پیرەپیاو بە دەنگی بەرز و وشەی دانار دانار و بژاردە قسەی دەکرد و بەردەوام چاوی لە دەوروبەری خۆی بوو. حەزی دەکرد کەسانێکی زۆرتر گوێی لێ بگرن. نۆخلیدۆڤ لێی پرسی:

ـ لە مێژە ئەو بیروباوەڕەت هەیە؟

ــ نزیکەی بیست و سێ ساڵە و لە تەواوی ئەو ساڵانەدا بەردەوام بە دوامەوە بوون و ڕەتاندوویانم.

ـ بۆ بەدواتەوە بوون؟

ـ زۆر ڕوونە. هەر بەو جۆرەی مەسیحیان گرت و لە خاچیان دا، منیش دەگرن و دەمبەن بۆ بەردەمی دادگا. قەشەکان و پیاوانی ئایینی و مەسیحی و کەلیمی چەندین جار لێپێچینەوەیان لەگەڵ کردووم. چەند جاریان ناردووم بۆ شێتخانە. بەڵام هێشتا هیچ شتێکیان وەگیر نەکەوتووە، وەک مەسیح لە دارم بدەن. بەردەوام لە ناو و ناونیشان و دایک و باوک و مەزهەبم دەکۆڵنەوە. حاشام لە هەموو شتێک کردووە، حاشام لە خۆم و لە دایک و باوک و ماڵ و وەتەنم کردووە. لێم دەپرسن ناوت چییە؟ دەڵێم مرۆڤ. دەپرسن چەند ساڵت تەمەنە؟ دەڵێم حیسابم نەکردووە! وەڵامەکەشم ڕاستە. من هەمیشە بووم و هەمیشەش هەر دەبم. هیچ شتێک لە جیهاندا فانی نییە. دەپرسن باوکت کێیە؟ دایکت کێیە؟ دەڵێم باوکم خواوەندە و دایکم خاکە. دەپرسن تێزارت خۆشدەوێ؟ دەڵێم ئەو تێزاری خۆیەتی و من تێزاری خۆمم! دەڵێن قسەکردن لەگەڵ تۆ کەڵکی نییە. دەڵێم من خۆم بە پێی خۆم نەهاتووم بۆ ئێرە لەگەڵ ئێوە دەمەتەقێ بکەم؛ ئێوە منتان بۆ ئێرە ڕاکێشاوە... دیتووتە کاکی خۆم... زۆر دڵڕەقانە جەزرەبەم دەدەن؛ نا هێڵن لە حاڵی خۆمدا بم.

ـ ئێستا دەچی بۆ کوێ؟ بۆ کام شار؟

ـ هەر جێیەک خودا بیهەوێ. کاتێک کارم دەست کەوێ، کار دەکەم و هەقدەست وەردەگرم. ئەگەر کاریش دەست نەکەوێ، سواڵ دەکەم.

پیرەپیاو سەرکەوتووانە چاوی لە دەوروبەری خۆی دەکرد. نۆخلیدۆڤ چەند دراوی دەرهێنا و پێی دا. پیرەپیاو لێی وەرنەگرت.

ـ لە پارە بێزارم؛ ئەگەر نانت پێ بدایەم وەرمدەگرت.

ـ کارەکەم ناحەز بوو، ببوورە.

ـ نا کارێکی خراپت نەکرد؛ سووکایەتیت پێ نەکردم؛ هیچ کەس ناتوانێ سووکایەتی بە من بکات.

کۆڵەکەی دا بە کۆڵیدا. پاپۆڕەکە گەیشتبووە کەنار. نۆخلیدۆڤ پاداشی دا بە پاپۆڕەوانەکان و سواری فەتیوونەکەی بووو درێژەی بە ڕێگاکە دا. فەتیوونەوان گوتی:

ــ گەورەم! تاقەتێکی سەیرت هەیە گوێت بۆ قسەی ئەو بەرەڵڵا و هیچوپووچە ڕاگرت.

# بیست و دوو

گەیشتبوونە هەورازی جادەکە، فەتیوونەوان ئاوڕی دایەوە و لێی پرسی:

ـ تەشریف دەبەن بۆ کام میوانخانە؟

ـ هەر کامێکیان باشتربێ.

ـ میوانخانەی سیبیریا لە هەموویان باشترە. دیاکۆڤیش خراپ نییە.

فەتیوونەوان لاجەولاج دانیشتبوو و قەمچییەکەی هەڵدەسووڕاند بۆ ئەوەی بارگینەکان خێرا تر بڕۆن. گەیشتنە شار. شارێک بوو وەک شارەکانی

دیکە، ماڵ و دووکان و گۆڕەپان و کلیسا و پاسەوانەکانی سەر چوار ڕێیان، وەک شارەکانی تر وابوو. تەنیا لە شتێکدا جیاوازی هەبوو: ماڵەکان دارین بوون و کۆڵانەکانی سەنگفەڕش نەکرابوون. فەتیوونەکە لە بەر میوانخانەی سیبیریا ڕاوەستا. ژووری خاڵیی نەبوو. چوون بۆ میوانخانەی دیاکۆ، ئەو جێی هەبوو. نۆخلیدۆڤ دوای دوو مانگ تامڵ کردنی چایخانە و میوانخانەی نێوڕێ، جێگایەکی ئاسوودەی دۆزیبۆوە کە تەخت و پێخەفێکی باش و خاوێنی هەبوو. یەکەم شانسی ئەوە بوو لە چنگ ئەسپێ ڕزگاری بووبوو. لەو ماوەیەدا هەرچی هەوڵی دابوو نەیتوانیبوو لەو کێشەیە خۆی نەجات بدات. سەر و جلوبەرگی پڕ بووبوون لە ڕشک و ئەسپێ.

جانتاکەی کردەوە و چوو بۆ حەمام، چونکە دەیویست بچێت بۆ لای پارێزگار. دەستێکی بە سەر و ڕووی خۆیدا هێنا، کراسی ئوتوکراو و ملیوانە ئاهاری و قات و پاڵتوی جوانی لە بەر کرد و لە میوانخانەکە چووە دەرێ. دەرگاوان گالیسکەیەکی چکۆڵە و ڕێکوپێکی بانگ کرد کە ماینێکی تەڕلانی قرقیزی ڕایدەکێشا. دوای سەعاتێک لە بەر کۆشکی ڕازاوەی پارێزگاری دابەزی. سەربازێک بە تفەنگەوە و پاسەوانێکی شارەوانی لە بەر دەرگاکە کێشکچی بوون. دەوراندەوری کۆشکی پارێزگاری باخێکی جوان و ڕازاوە بوو، داری بووز و سپیدار سەریان لێک دابوو؛ لەو کاتەدا گەڵاکانیان هەڵوەریبوو و بەڵام داری سەوڵ و کاژ بە گەڵای سەوزی تۆخ، جوانیی هەمیشە بەهاری خۆیان پاراستبوو.

پارێزگار حاڵی باش نەبوو و لەو ڕۆژدا هیچ کەسی وەرنەدەگرت. لەگەڵ ئەوەشدا نۆخلیدۆڤ کارتەکەی خۆی دا بە پێشخزمەتەکە، دوای چەند خولەک پێشخزمەتەکە گەڕایەوە و گوتی جەنابی پارێزگار لە نووسینگەکەی خۆی چاوەڕوانییەتی.

کۆشــکی پارێزگــاری لەگەڵ کۆشــکە دەوڵەتییەکــانی پترزبــۆرگ هــیچ جیاوازییەکی نەبوو؛ هێندێک بریقوباقی کەمتر بوو. خزمەتکار و فەرمانبەر لە هەموو سووچ و پەنایەک ڕاوەستا بوون، تەرکی تەلارەکەیان تیفتیفە دابوو و بریقەی دەهات. هێندێ شوێن و سەرقاڵدرمەکان فەرش کرابوون. پارێزگار جلوبەرگی هەورێشمینی تاتار شێوەی لە بەردا بوو و جگەرەی دەکێشا و لە پەرداخێکی قەدباریکدا. چایی دەخواردەوە. پیاوێکی سوور و سپی بوو، لووتی دەتگوت پەتاتەیە. نێوچاوان و سەرە سافەکەی لە چەند جێوە لوو هەڵێتۆقاند بوو. بەر چاوی چرچولۆچی تێکەوتبوو.

ـ ئەم کاتەت باش جەنابی کۆنتی ئازیز! داوای لێبووردن دەکەم کە بە جلوبەرگیماڵەوە میوانداریت لێدەکەم. ئەمڕۆ حاڵم باش نییە. سەیرە ڕۆژ لە کوێوە هەڵاتووە، ئەمڕۆ بۆ ئەم شارە دوورەدەستە هاتووی؟

ـ لەگەڵ کاروانی بەندییە دوورخراوەکان هەتا ئێرە هاتووم. ژنێک لەگەڵ کاروانەکەیە و پەرۆشی چارنووسی ئەوم. ئێستاش لە بەر ئەو هاتووم و تکایەکم لێتان هەیە و هەر وەها داواکارییەکی دیکەش.

پارێزگار قومێکی لە چاییەکەی خواردەوە و مژێکی لە جگەرەکەی دا، بەڵام چاوی لە سەر نۆخلیدۆڤ هەڵنەگرت. لەو ئەفسەرانە بوو کە لە سەرەتاوە پێی وابوو دەکرێ ئەرکەکانی دەوڵەت بە بیروبڕوای ئازادیخوازانە و مرۆڤدۆستانەوە پیوەند بدەی؛ بەڵام چونکە مرۆڤێکی ئاقڵ بوو، زۆر زوو بۆی دەرکەوت کە ئەم شتە پێکەوە ناگونجێن و بۆ ئەوەی ئەم دژوازییەش ڕۆحی ئازار نەدات، پەنای بۆ مەشرووب خواردنەوە دەبرد و سی و پێنج ساڵ بوو خووی بە خواردنەوە گرتبوو. فەرقی پێنەدەکرد ئەوەی دەیخواتەوە چ جۆرە مەشرووبێکە، تەنیا دەیویست سەر خۆشی بکات. بۆ زیندوو بوون پێویستی بە مەشرووب هەبوو. هەموو ڕۆژێک دوای ئێوارێ سەر خۆش بوو

و وەهای خوو پێگرتبوو تەنانەت لەو کاتەشدا کە وشیار بوو. قسەی بێ مانای نەدەکرد و کاری چەوت و بێهوودەشی ئەنجام نەدەدا. هەندێ جار کە لە پتەی دەردەچوو و قسەیەکی بێ مانا لە زاری دەردەپەڕی، گوێگرەکانی پلەوپایەی بەرزی ئەویان لە بەر چاو دەگرت و هەرزەوێژییەکەی ئەویان وەک گاڵتەوگەپ و جەفەنگ لێدان دەهێنا ئەژمار. ئێستاش بەیانی بوو و پارێزگار وشیار و لەسەرخۆ بوو. زۆر باش لە قسەکانی نۆخلیدۆڤ تێدەگەیشت و بیری لێدەکردەوە. هێندێ جار ئەم پەندە بەناوبانگەی لە سەر زار بوو! «مەستیشە و وشیاریشە، بە هەر دوو سەر باشیشە!» وێدە چوو بەو پەندە حاڵی خۆی وەسف بکات.

کاربەدەستانی باڵا لە خواردنەوەی ئاگادار بوون بەڵام بە هۆی کارامەیی و کارزانییەوە ڕێزیان بۆ دادەنا، چونکە پیاوێکی پڕ هۆش بوو و هەڵسوکەوتیشی زۆر شکۆمەند و سەرۆکانە بوو، بۆیە بەرپرسایەتیی گرنیگی پارێزگاریی ئەم بەشەی سیبیریایان خستبووە ئەستۆی.

نۆخلیدۆڤ بۆی باس کرد کە ماسلۆڤا لە زووەوە دەناسێ و بە بێ تاوان سزای بە سەردا سەپاوە و لە ئیمپراتۆری داوای بەخشینی بۆ کردووە.

ژنیراڵ دەستی کێشا بۆ سەر مێزەکە و قامکە قوڵەکەی بە زەنگەکەدا ناو پێشخزمەتێک هاتە ژوورێ.

- بزانە ئانا ڤاسیلۆڤنا ئامادەیە یان هێشتا کاری ماوە؟ دەورێکی دیکەش چایی بێنە!

نۆخلیدۆڤ درێژەی بە قسەکانی خۆیدا:

- لە پترزبۆرگەوە هەواڵیان داوە کە لەم مانگەدا سەبارەت بە لێخۆشبوونی ماسلۆڤا بڕیار دەردەکەن. تکاتان لێدەکەم ئەگەر بۆتان دەلوێ کارێک بکەن کە ماسلۆڤا هەر لێرە ڕاگرن هەتا فەرمانی بەخشینەکەی دەردەکرێ و دەگاتە

ئێرە. پارێزگار هیچی نەگوت. نۆخلیدۆڤ چووە سەر بابەتێکی دیکە. کاتێک ناوی بەندییە سیاسییەکانی هێنا، ژنیراڵ داچڵەکی.

- سەیرە! سەیرە!

- ئەم بەندییە سیاسییە حاڵی زۆر خراپە. لە حاڵی گیان کەنەشتدایە. ئەگەر دەکرێ ئەویش لە نەخۆشخانەی ئێرە بمێنێتەوە و بیخەوێنن... ژنێکی هاوڕێشی دەیهەوێ لە لای ئەو بمێنێتەوە و ئاگاداری لێ بکات.

- ئەو چ خزمایەتییەکی لەگەڵی هەیە؟

- ئەگەر ڕێگەی پێبدەن لە لای بمێنێتەوە، ئامادەیە شووی پێ بکات.

ژنیراڵ کتێبی کۆمەڵە یاساوڕێسای لە سەر مێزەکە هەڵگرت. قامکی تەڕ کرد و لاپەڕەکانی هەڵدایەوە، هەتا گەیشتە ئەولاپەڕەیەی کە مەبەستی بوو.

- ئەو ژنە چ سزایەکی بۆ بڕدراوەتەوە؟

- زیندان بە کاری دژوارەوە.

ـ کەوایە بە پێک هێنانی ژیانی هاوبەش گرفتەکەیان چارەسەر نابێ؛ تەنانەت ئەو ژنە ئەگەر شوو بە پیاوێکی ئازادیش بکات بارودۆخەکە ناگۆڕێ. ئێستا دەبێ بزانین کامیان سزاکەی قورسترە؟

- هەردووکیان سزای کاری دژواریان بۆ بڕدراوەتەوە.

پارێزگار پێکەنی.

ـ کەوایە هیچیان ئێرەیی بە یەکتر نابەن! یەک تاوان و یەک سزایان بۆ بڕدراوەتەوە. ئەو پیاوە نەخۆشە و حاڵی زۆر شڕە. ئەو دەنێرین بۆ نەخۆشخانە و کارێک دەکەین بە باشی پێی ڕابگەن؛ بەڵام ئەو ژنە ئەگەر شووش بکات، کەڵکی نییە.

پارێزگار گتێکی گرت. پێشخزمەت هاتبوو. هەواڵی هێنا بوو کە خانم قاوەکەی مەیل دەکات. ژنیراڵ سەری لەقاند و داوای لە نۆخلیدۆڤ کرد ناوی

هەر سێ کەسەکە لە سەر کاغەزێک بنووسێ. ناوەکانی نووسی و ئیزنی لێ خواست کە چاوی بە نەخۆشەکە بکەوێ.

ـ بە پێی یاسا ناتوانی چاوت بە بەندیی سیاسی بکەوێ. بڕوای تەواوم بە جەنابت هەیە. دەزانم کەسایەتییەکی مێهرەبان و چاکەکاری و دەتهەوێ یارمەتییان بدەی. ئەو ڕێگایە بۆ جەنابت کراوەیە. پارەت هەیە، دەتوانی کێشە و گرفتەکان چارەسەر بکەی. هەر دەرگایەک حەزت لێیە بیکەوە. لە وڵاتی گەورە و بەرینی ڕووسیادا ناکرێ هەمووان بخەیتە ژێر چاوەدێری. لە هەموو سووچێک تێزارێک هەیە؛ من خۆم یەک تێزارم.

بە دەنگیکی بەرز پێکەنی و درێژەی بە قسەکانی دا:

ـ بەڵێ. حەتمەن تا ئێستا چەندین جار توانیوتە بچیە ملاقاتی بەندییە سیاسییەکان. تەنانەت توانیوتە بچیە بەندیخانەی ژنانیش و لەگەڵ بەندییە سیاسی و ئاساییەکان دانیشی. پاسەوان و دەرەجەدارەکانی ئێمە مووچەکەیان کەمە. ژن و منداڵیان هەیە و دەبێ نان بخۆن و بژین؛ بۆیە دەست بەڕووی ئێوەوە نانێن و پارەتان لێ وەردەگرن. ئەگەر منیش لە جێی ئەوان بوایەم ئەو کارەم دەکرد. بەڵام من کە لێرە دانیشتووم، پلەوپایەیەکم هەیە کە ناتوانم یاساشکێنی بکەم. ڕاستە منیش مرۆڤم، دڵم هەیە، حەزدەکەم مێهرەبان و باش بم، بەڵام چیم پێدەکرێ؟ من دەبێ بەڕێوەبەری یاسا بم. متمانەیان بە من کردووە. چاک یان خراپ دەبێ ڕێز بۆ ئەو متمانەیە دانیم. ئەمە مەسەلەیەکی سادەیە! ئێستا باسی پایتەختم بۆ بکە.لەوێ چ باسە؟

ژنیراڵ حەزی دەکرد بارودۆخی پایتەخت و خەبەر و باسە نوییەکان بزانێ. لە زۆر بارەوە پرسیاری لە نۆخلیدۆڤ کرد. لەم پرسیارانەدا دەیویست هەم خۆمانە بێ و هەم گرنگایەتیی پلەوپایەی خۆی بە چاوی نۆخلیدۆڤدا بدا.

# بیست و سێ

پارێزگار دوای ئەو قسانە، سەبارەت بە جێگای نیشتەجێ بوون پرسیاری لە نۆخلیدۆڤ کرد:

ـ لە کام میوانخانەی؟... حەتمەن لە دیاکۆڤی؟... شوێنێکی زۆر خراپە. ئەوانی تر لەویش خراپترن... چابوو وەبیرم هاتەوە، ئەمڕۆ عەسر وەرە بۆ لامان. ئینگلیزی دەزانی؟

- بەڵێ.

- زۆر باشە؛ جیهانگەڕێکی ئینگلیزی هاتووە بۆ ئێرە و دەیهەوێ سەبارەت بە بەندیخانە و تاراوگەکانی سیبیریا لێکۆڵینەوە ئەنجام بدات. ئەمڕۆ عەسر ئەو لە لای ئێمە دەبێ. حەتمەن وەرە؛ سەری سەعاتی پێنج... ژنەکەی من زۆر گرنیگی بە کات دەدا. هەتا ئەو کاتە باروودۆخی ئەو سێ کەسەش کە ناوەکەیانت پێداوم، ڕوون دەبێتەوە.

نۆخلیدۆڤ لە پارێزگاری هاتە دەرێ و بە هەڵەداوان چوو بۆ پۆستخانە. بینای ناوەندیی پۆستخانە، میچەکەی شێوە گومبەزی بوو. فەرمانبەران لە پشت مێزەکان دانیشتبوون. چەند کەس نامە گەیشتووەکانیان دەدایە دەستی خەڵک. فەرمانبەرێک ملی بەلادا خستبوو خێراخێرا پاکەتی نامەکانی مۆر دەکرد. نۆخلیدۆڤ چوو بۆ لای ئەو فەرمانبەرەی نامە گەیشتووکانی دابەش

دەکرد، ناوی خۆی پێگوت. فەرمانبەرەکە نەختێ دەستی لە کاغەزدانەکەی پاڵ خۆی وەردا، بەستەیەکی دەرهێنا و دایە دەستی . چەند نامە و کتێبێک و دوایین ژومارەی ڕۆژنامەی فەڕەنسیی La patrie بۆ هاتبوو. بەستەکەی هەڵگرت، چوو بۆ سووچێک و لە سەر کورسییەکی چێوین دانیشت. لە نێو نامەکاندا پاکەتێکی جوان هەبوو کە بە لاکی سوور مۆر کرابوو. نامەکەی هەڵپچڕی. نامەکە لە لایەن سێلێنین دادیاری دیوانی باڵای وڵاتەوە هاتبوو، ڕووی نووسی نامەیەکی فەرمیی لەگەڵدا بوو. لە ناکاو خوێن بە گوشار خۆی بە مێشکیدا کرد و کەوتە دڵەکوتێ. وەڵامی داخوازیی بەخشینەکەی ماسلۆڤا بوو. چ وەڵامێکیان دابۆوە؟ ڕەنگە نەرێنی بێ! سێلێنین بە خەتی شکستەی ورد کە زۆر گران دەخوێندرایەوە، ئاوای نووسیبوو:

«هاوڕێی ئازیز! دوایین دیدارمان شوێنێکی سەیری لە سەر دانام. ئەنجومەنی سەنا حوکمی سزاکەی ماسلۆڤای هەڵنەوەشاندبۆوە و تۆ زۆر دڵتەنگ و نیگەران بووبووی. چووم پەروەندەکەم وەرگرت، بە وردی خوێندمەوە و بۆم دەرکەوت ئەو ژنە بێچارەیە نادادپەروەرییەکی زۆری دەرهەق کراوە. تەنیا کومیسۆنی بەخشین و لێبوردن دەیتوانی پەڵەی ڕەشی ئەم نادادپەروەرییە بسڕێتەوە. تۆ داخوازیی لێبوردنت بۆ کومیسۆن نارد بوو و من توانیم ئەندامانی کومیسۆنەکە قانع بکەم کە حوکمی بەخشینی ماسلۆڤا بەرز بکەنەوە و ئیمپراتۆر واژۆی بکات. نامەی بەخشینەکە لە لایەن پارێزگای سیبیریای ڕۆژهەڵاتەوە دەنێردرێ بۆ بەندیخانە. هیوادارم ئەم مزگێنییە بەر لە هەمووان بە ئێوە بدەم. لە دوورەوە بە گەرموگوڕی دەستت دەگوشم. هاوڕێت سێلێنین.»

دەقی نامەی بەخشینەکە بەم شێوە بوو:

«نووسینگەی تایبەتی خاوەن شکۆ ئیمپراتۆر ڕایدەگەیێنیێ کە داخوازیی بەخشین و لێبووردنی کاترین ماسلۆڤا کە لە دادگای تاوانەکان حوکمی دوورخرانەوە و کاری دژواری بۆ بڕدراوەتەوە، بە وردی لە کومیسیۆنە پێوەندیدارەکاندا پێداچوونەوەی بۆ کراوە، گەیشتە دەستی مەبارەکی خاوەن شکۆ ئیمپراتۆر. خاوەن شکۆ ڕای لە سەر ئەوە بوو کە داخوازیی بەخشینەکە پەسند بکرێ و ئێستا ڕای بەڕێزیان سەبارەت بە بەخشین و لێبوردنی کاترین ماسلۆڤا بۆ بەرپرسانی ئەو پەروەندیە و کاربەدەستانی بەندیخانە بەڕێ کراوە و دەبێ هەرچی زووتر ئەو حوکمە بەڕێوە بچێت و ئازاد بکرێ.»

ئەم هەواڵە گرنیگ و خۆشە شایی لە دڵی نۆخلیدۆڤ گێڕا بوو. بەم شێوەیە، چاکەی پێویستی دەرهەق بە ماسلۆڤا ئەنجام دابوو و حوکمی ئازاد بوونی ئەوی وەرگرتبوو؛ بەڵام ئەم ئازادییە، کێشە و گرفتیشی بەدواوە بوو. دوای ئازاد بوونی ماسلۆڤا ئیتر کۆسپێک لە سەر ڕێگای پێک هێنانی ژیانی هاوبەشی ئەواندا نەبوو، بەڵام نۆخلیدۆڤ بۆ ئەو زەماوەندە لە باری ڕۆحییەوە ئامادە نەبوو. لە لایەکی تریشەوە پێوەندیی سیمۆنسۆن و کاتیۆشا خەمێکی دیکەی لە سەر دڵی بار کرد بوو. تەکلیفی ئەوان دەبێ بە چی؟ نۆخلیدۆڤ خێرا ئەو فیکر و خەیاڵانەی وەلا نا و لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەم شتانە پێوەندیی بە داهاتووەوە هەیە و بەرە بەرە خۆی چارەسەر دەبێ. ئێستا دەبێ بچم و ئەو مزگێنییە بە کاتیۆشا بدەم. بە خەیاڵی خاوی خۆی پێی وابوو بە ڕوونووسی نامەی بەخشین دەتوانێ ماسلۆڤا لە بەندیخانە بێنێتە دەرێ.

سواری هێلینگەیەک بوو و ڕۆیشت بۆ بەندیخانەی ناوەندیی شار. پارێزگار مۆڵەتی پێنەدابوو بچێتە ملاقاتی بەندییەکان، بەڵام بە ئەزموون بۆی دەرکەوتبوو کە ساناتر دەتوانێ لەگەڵ فەرمانبەرە ئاساییەکان پێک بێ و هەموو کارێک لە خوارەوە زووتر بە ئاکام دەگا هەتا سەرەوە. لە بیری

ئەوەدا بوو بەختی خۆی تاقی بکاتەوە و مزگێنیی ئازادی بە کاتیۆشا بدات. حاڵی کریلتسۆڤ بپرسێ و ماریا پاولۆڤنا ئاگادار بکات کە کارەکەی ئەو چەتی تێکەوتووە و کێشەی بە دواوەیە.

سەرۆکی بەندیخانە قەڵەو و بەخۆوە بوو. ڕیشی لاجانگی هەتا نزیک چەناگەی داکشابوو. زۆر بە ساردوسڕی لەگەڵ نۆخلیدۆڤ دوا و بەڕاشکاوی پێی گوت بە بێ مۆڵەتنامە ڕێگەی ملاقات بە هیچ کەس نادرێ، نۆخلیدۆڤ هەر چی تکای کرد و گوتی کە لە پایتەختیش چەندین جار چۆتە ملاقاتی بەندییەکان، بەڵام سەرۆکی نەمرچ و ڕەزاتاڵ ڕازی نەبوو.

ـ من ڕێگە نادەم. ئەوانەی لە پایتەختەوە دێن پێیان وایە لێرە کەس لە کەسە و دەتوانن یاساوڕێساکان بخەنە ژێر پێ. نەخێر بەڕێز! ئێمە لە یاساوڕێسای خۆمان شارەزاین و هیچکات یاساشکێنی ناکەین.

ڕوونووسی نامەی بەخشینەکەش بۆ سەرۆکی بەندیخانە گرنیگ نەبوو؛ گوتی هەتا بە شێوەی فەرمی نامەی بەخشینەکە بە دەستمان نەگا، چاوەڕوانی هیچ شتێک مەبە. بەڵام بەڵێنی بە نۆخلیدۆڤ دا ئەو هەواڵەی کومیسیۆنی بەخشین و لێبووردن بە ماسلۆڤا بگەیێنێ. سەبارەت بە کریلتسۆڤیش ئامادە نەبوو هیچ زانیارییەکی بداتێ. تەنانەت گوتی کەسێک بەو ناوە هەر ناناسێ.

ئەم سەختگیرییە هۆکارێکی دیکەی هەبوو؛ چەند ڕۆژ بوو نەخۆشیی گیرۆی گرانەتا کەوتبووە نێو بەندییەکان و زۆری لێ کوشتبوون. عارەبانەچی لە کاتی گەڕانەوەدا دوایین دەنگۆی بۆ نۆخلیدۆڤ گێڕایەوە:

ـ دەڵێن نەخۆشییەکی پیس هاتووە و چەند کەس لە دیلەکانی کوشتووە؟ نازانم ناوی ئەو نەخۆشییە چییە بەڵام دەڵێن ڕۆژی دە ـ پازدە بەندی بەرە و گۆڕستان بەرێ دەکا.

# بیست و چوار

نۆخلیدۆڤ کە لە بەندیخانە دەملەپووش مابۆوە، چوو بۆ نووسینگەی پارێگا تاکوو بزانێ نامەی بەخشینەکە گەیشتووە یان نا؟ لەوێ بۆی دەرکەوت کە هێشتا نامەکەیان بە دەست نەگەیشتووە. گەڕایەوە بۆ میوانخانە و نامەیەکی بۆ سێلێنین و نامەیەکی دیکەی بۆ پارێزەرەکەی خۆی، فانارین نووسی کە بە دووی کارەکەی ماسلۆڤا بکەون. چاوی لە کاتژمێر کرد. کاتی ڕۆیشتن بوو بۆ ماڵی پارێزگار.

لە ڕێگا دیسان لە خۆی دەپرسی: کاتیۆشا دوای ئازاد بوون چیی بە سەر دێ؟ بۆ کوێ دەچێ؟ سیمۆنسۆن چیی بە سەر دێ؟ ئەم ماجەرایە چ شوێنێک لە سەر پێوەندییەکانیان دادەنێ؟ دەتگوت کەسێک بە گوێیدا دەچرپێنێ:

- ئەو شتانە خۆیان بەرە بەرە جێبەجێ دەبن؛ فیکر و خەیاڵ وەلانێ.

کاتێک گەیشتە ماڵی پارێزگار، ئەو فیکر و خەیالاَنەی لە مێشکی دەرکرد بوو. لە ماڵی پارێزگار هەموو شتێک باش بوو. شوێنێکی زۆر خۆمانە بوو. مەشرووب و خواردنی زۆر باش لە سەر مێزەکە چندرا بوو. نۆخلیدۆڤ کە چەند مانگ بوو لەو جۆرە کەیف و ڕابواردنە دابڕابوو، چێژی لە هەموو شتێک وەردەگرت و تامەزرۆیانە دەیخوارد و دەیخواردەوە.

کەیبانووی ماڵێ کە لە سەر دەمی عازەبیدا یەکێک لە لایەنگرانی دەرباری نێکۆلای یەکەم و لە خاتوونە بەناوبانگ و خاوەن فەرهەنگەکانی پترزبۆرگ بوو، زمانی فەڕەنسیی بە باشی دەزانی و زۆر بە جوانیش بە زمانی ڕووسی قسەی دەکرد. زۆر قیت و قۆز هەنگاوی دەنا و قۆڵی بە لاقەبرغەی خۆیەوە دەنووساند. لەگەڵ مێردەکەی زۆر بە نەرمونیانی و ڕێزەوە هەڵسوکەوتی دەکرد و دڵسۆزی و خۆشەویستی لە ڕەفتار و ئاخافتنی دەباری. لەگەڵ خەڵکیش مێهرەبان و دڵنەرم بوو و ڕێزی بۆ بیروباوەڕ و کەسایەتیی هەموو کەس دادەنا. زۆر بەڕێزەوە پێشوازیی لە نۆخلیدۆڤ کرد و گوتی تێدەگەم بۆ چی ڕەگەڵ کاروانی بەندییەکان کەوتووی و هەستی پاکی ئێوە، کە پیاوێکی جیاوازن، بەلای منەوە زۆر بەرز و بەنرخە و شایانی ستایشە.

ئەم قسە شیرینانە و شوێنە خۆمانەیە بووە هۆی ئەوەی نۆخلیدۆڤ خەیاڵ و خەمەکانی لە بیر بچێتەوە و خۆی ئاوێتەی جوانی و پاکیی شوێنەکە بکات. هەموو شتێک باش بوو؛ هەمووان خاوەن فەرهەنگ و باش ڕاهاتوو بوون. قسەکان باش و خواردن باش و مەشرووبیش قسەی لە سەر نەبوو. دەتگوت دوای چەند مانگ خەوتن چاوی هەڵێناوە و خۆی لە پانتایەکی خۆش و شیرین و خۆمانەدا دیوەتەوە و خووی پێگرتووە.

کۆڕێکی باش بوو؛ کچی پارێزگار و مێردەکەی، نووسیارەکەی، جیهانگەڕی ئینگلیزی و لاوێکی ساماندار و خاوەنی کانی ئاڵتوون و قایمقامی یەکێک لە شارە دوورەدەستەکانی سیبیریا لەوێ ئامادە بوون. هەموو شتێک بە خۆشی و شادییەوە دەستی پێکرد. کۆڕێکی خۆش و خۆمانە. جیهانگەڕی ئینگلیزی پیاوێکی کەڵەگەت و چوارشانە و سوور و سپی بوو. زمانی فەڕەنسیی باش نەدەزانی. گەڕیدە و لێزان بوو. زمانی دایکی خۆی زۆر بە

باشــی دەزانــی و بە جـوانی و ڕەوانــی ســەبارەت بە ئەمریکـا و یابـان و هێندوستان و سیبیریا قسەی دەکرد.

ئەو لاوەی کە کانگـای ئـاڵتوونی هەبـوو، لە ڕەچەڵەکـی وەرزێڕەکـان بـوو. جلەکـانی دەسـتکاری لەنـدەن بـوون. قـۆپچەی سـەرقۆڵی ئەڵمـاس بـوون. دەیـانگوت کتێبخـانەیەکی زۆر گەورەی هەیە. دەسـتودڵباز بـوو، یـارمەتیی ئەنجومەنەکانی چاکەکاریی دەدا. بە دابی ڕۆژی ئەوڕووپییەکان بیروباوەڕی لیبرالیزمـانەی وەرگرتبـوو. بازرگـانێکی بـاش و بە غیـرەت بـوو. نۆخلیـدۆڤ ئەوی کەوتبــووە بەر دڵ. مرۆڤێکــی ئەمڕۆیــی بــوو. فەرهەنــگ و ژیــاری ئەورووپای ڕۆژاوای بە تەندروستی و خۆبژیویی وەرزێڕییەوە پێوەنددابوو.

قایمقامێــک کە لە شــارێکی دوورەدەســتەوە هــاتبوو، ســەرۆکی ئەو فەرمـانگەیە بـوو کە نۆخلیـدۆڤ لە پترزبـۆرگ بە سـەر هـاتەکەی بیسـتبوو و پاش ئەو ڕووداوەی کە بۆ باس کردن نـابێ، بۆ ئەو شـارە دوورەدەستەیان ڕاگوێست. پیاوێکی خاوەن زەوق و جوامێر بوو؛ تـووکی سـەری هەڵوەریبـوو، چاوەکـانی شـین و مێهرەبـان بـوون. دڵسـۆزانە زەردەی دەگـرت و ژینڕاڵـی پارێزگـار ڕێزی بۆ دادەنـا؛ چونکە ئەو لە نێوان قایمقامەکـانی ئەو نـاوچەیەدا تەنیـا کەسـێک بـوو کە بەرتیلـی وەرنەدەگرت. کەیبـانووی مـاڵێ زۆر شـەیدای مۆسیقا بوو، چونکە ئەویش یەکێک لە ئاشقانی مۆسیقا بوو و بەباشی پیانۆی دەژەنی، زۆر جـاریش پێکەوە چـوو بـوونە پشـت پیـانۆ و بە دوو قـۆڵی و بە چــوار دەســت ئاوازێکیــان ژنیبــوو؛ هەر بــۆیە ڕێزێکــی زۆری بــۆ دادەنــا. نۆخلیــدۆڤیش ئەوی خۆشدەویســت. بەڵام زاواکەی پارێزگــار لە هەمــووان دڵۆڤـانتر بـوو. شـاد و بە کەیـف بـوو و بە هەمـوو میوانەکـان ڕادەگەیشـت و ڕێزی بۆ دادەنان.

کـچەکەی پارێزگـار جـوان نەبـوو بەڵام زۆر سـاکار و مێهرەبـان بـوو و ژیانی خۆی بۆ دوو منداڵەکەی خۆی تەرخان کردبوو. مێردەکەی لە مۆسکۆ دەرسی خوێندبوو، پیاوێکی خاکەڕا و خاوەن هۆش بوو، لایەنگری لیبرالەکان بوو. سـەبارەت بە عیل و عەشـیرەتە جۆراوجۆرەکانی سیبیریا لێکۆڵینەوەی ئەنجام دەدا و دەیویسـت ڕێگـایەک بـدۆزێتەوە کە ئەو عێل و عەشـیرەتانەی سیبیریا لە نێو نەچن.

هەمـوو شـتێک بەباشـی دەچـووە پێشـێ. هەمـووان بە دیتنـی نۆخلیـدۆڤ هەسـتیان بە شـادی دەکـرد، چـونکە لە نێـو ئەوانـدا ڕوخسـارێکی تـازە بـوو. پارێزگـار جلـوبەرگی ژنێراڵیـی لە بەرکـرد بـوو، خـاچێکی سـپی چکـۆڵەی لە ملیــوانەکەی دابــوو. وەک هـــاوڕێیەکی لە مێــژینەی خــۆی پێشــوازیی لە نۆخلیدۆڤ کرد و داوای لە هەموو میوانەکان کرد بەر لە شێو خواردن ڤۆدکا بخۆنەوە. نۆخلیـدۆڤ لەو دەرفەتەدا بـۆ پارێزگـاری بـاس کـرد کە داخـوازیی بەخشینەکەی ئەو ژنە پەسند کراوە کە باسی بۆکردبوو، داواشی لێکرد کە بۆ چاوپێکەوتنی ئەو ژنە لە بەندیخانە مۆڵەتنامەیەکی بۆ بنووسێ.

ژینـرڕاڵ کە هێنـانە گـۆڕی ئەو جـۆرە مەسـەلانەی لەو میـوانەنییەدا بە دڵ نەبــوو، وەڵامـــی نەدایەوە و بەزمـــانی فەڕەنســـی داوای لە جیهـــانگەڕە ئینگلیـزییەکە کـرد ڤۆدکـا بخـواتەوە. کـابرای جیهـانگەڕ پەرداخێکـی ڤۆدکـا خـواردەوە و گـوتی کە ئەو ڕۆژە چـووە بـۆ دیتنـی کلیسـا و کارخـانە و حەز دەکات چاوی بە بەندیخانەی ناوەندیی شاریش بکەوێ.

ژنێراڵ ئاماژەی بە نۆخلیدۆڤ کرد و گوتی ئیتر لەوە باشتر نابێ، دەتـوانن پێکەوە بچن بۆ بەنـدیخانە. فەرمـانی بە نووسـیارەکەی دا مۆڵەتنامەیەکیـان بـۆ بنووسـێ. نۆخلیـدۆڤ لە جیهـانگەڕەکەی پرسـی کەنگـێ حەزی لێیە بچێـت بـۆ دیتنی بەندیخانەکە؟

زیاتر حەزم لێیە شەوێ بچم؛ چونکە لەو کاتەدا هیچ شتێکی ساختە نییە و بە شێوەی ڕاستەقینە بەندیخانەکە دەبینم.

ژنیراڵ کە سەرخۆش بووبوو، ئەوانی هان دەدا و کارەکەیانی بە باش دەزانی. گوتی:

- زۆر پلانێکی باشە. تا ئێستا چەندین ڕاپۆرتم سەبارەت بە بەندیخانەکان ناردووە بۆ ناوەند، بەڵام هیچ کەس گوێ بەو شتانە نادا. کاتێک ڕاستییەکان لە ڕۆژنامەکانی دەرەوەی وڵاتدا بنووسرێن، ناچار دەبن گرینگیی پێبدەن.

ژنیراڵ هەمووانی برد بۆ لای مێزی خواردنەکە و کەیبانووی ماڵێ جێگای هەمووانی دەستنیشان کردبوو. نۆخلیدۆڤ لە نێوان ئەو خانمە و کابرای گەشتیاری ئینگلیزیدا دانیشتبوو، کچی ژینراڵ و ئەو سەرۆکەی فەرمانگەی دوێنێ و قایمقامی ئەمرۆ کە بە سەرهاتەکەی جێی سەرنج بوو، بەرە و ڕووی ئەو دانیشتبوون!

باس هاتە سەر هێندستان و سیاسەتی بەرتیانییەکان و بە دوای ئەویشدا کێشەکانی دەوڵەتی لە سیبیریا. ژینراڵ باسی گەندەڵی و ئەرک نەناسس فەرمانبەرەکانی دەوڵەتی لە سیبیریا دەکرد. نۆخلیدۆڤیش حەزی لە بیستنی ئەو جۆرە بابەتانە نەبوو.

دوای شێو خواردن نۆرەی قاوە بوو. چوون بۆ تالارێکی دیکە. لێرە باسێکی سەرنجڕاکێش لە نێوان ژنیراڵ و کابرای گەشتیاردا هەڵگیرسا، باسەکەیان لە سەر سیاسەتی گلاستۆن سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا بوو، بە بڕوای نۆخلیدۆڤ هەر دووکیان زۆر باشیان قسە دەکرد و ئاگاداری ڕووداوەکان بوون. کۆنت نۆخلیدۆڤ لە دنیای خۆیدا بوو. خواردن و مەشرووبی زۆری خواردبوو، قسەی باشی بیستبوو و ئێستا لە سەر کورسییەکی نەرم پاڵی دابۆوە و قاوەی هەڵدەقوڕاند، گوێ گرتن لە تاقمێک

کەسایەتیی بەرجەستە و تێگەیشتوو و دەمەتەقێ لەگەڵیان چێژی پێ دەبەخشی. چێژ و خۆشییەکەشی کاتێک بە ئەوپەڕی خۆی گەیشت کە کەیبانووی ماڵێ داوای لە سەرۆکی فەرمانگەی دوێنێ و قایمقامی ئەمڕۆ کرد پێکەوە بچنە پشت پیانۆکە و بە چوار دەست سەمفۆنیای پێنجەی بیتهۆڤێن بژەنن و زۆر بە باشیش هونەری خۆیان نواند. نۆخلیدۆڤ مۆسیقاناس بوو و شارەزای وردەکارییەکانی ئەو سەمفۆنیایە بوو. دەیزانی چەند بە باشی دەیژەنن؛ بەتایبەت کاتێک گەیشتنە بەشی ئاندانتی[٩٢] سەمفۆنیاکە شارەزاییەکەیان زیاتر دەرکەوت.

نۆخلیدۆڤ خۆی ئامادە کرد بوو بڕوات. کچی ژنیڕاڵ هات بۆ لای و گوتی:

جەنابی کۆنت حەز دەکەی منداڵەکانم ببینی؟

خێزانی ژنیڕاڵ پێکەنی و گوتی:

ـ کچەکەم پێی وایە هەموو کەس حەز دەکا منداڵەکانی ببینێ. هەتا ئەو جێیەی من ئاگادار بم بەڕێز کۆنت نۆخلیدۆڤ حەزی لەو شتانە نییە.

- بەپێچەوانە، زۆریش خۆشحاڵ دەبم خانم کەرەم بکات و منداڵەکانم پێ نیشان بدات.

هەستی دایکانەی کچی ژنیڕاڵ شوێنی لە سەر دانا بوو. ژنیڕاڵ چوو بۆ سەر مێزی قومارەکە خاوەنی کانی ئاڵتوون و قایمقامی پیانۆژەن و نووسیارەکەی لە دەوری یەک دانیشتبوون.

- ئێستا دەبێ دانیشین و کارێکی حیسابی بکەین.

نۆخلیدۆڤ لەگەڵ کچی ژنیڕاڵ چوو بۆ ماڵەکەی ئەو و پێکەوە چوونە ژووری خەوی منداڵەکانی، فەڕشی سپی لە ژوورەکەدا ڕا خرابوو و چرایەک

92. Andant نەرم و لە سەرەخۆ.

به ئاباژۆری تۆخەوه له سەر هەر دوو تەختی خەوەکه هەڵکرا بوو. دایەنی منداڵەکان ژنێکی سیبیریایی بوو، به ڕوخسارێکی شیرین و مێهرەبانەوه له نێوان هەر دوو قەرەوێڵەکەدا دانیشتبوو. هەستا سەر پێ و سڵاوی کرد. کچی ژنیراڵ دانەوی و تۆڕی سەر تەختەکەی یەکەمی لادا. کچۆڵەیەک که قژی لوول و زێڕینی به سەر بالیفەکەدا بڵاو بوو بۆوه، خەوێکی شیرین دایگرتبوو.

ـ ئەوه کاتیایه.

کراسێکی شینی ڕێ ڕێی له بەر دابوو و لاقه سپی و جوانەکەی له ژێر لێفەکەوه هاتبووه دەرێ.

ـ زۆر جوانه. تەمەن درێژ بێ، چەند ساڵی تەمەنه؟

ـ دووساڵ.

ـ ئەمەشیان ڤاسیۆکه. باوەگەورەی بەو ناوه بانگی دەکا. زۆر شێوەی خەڵکی سیبیریا دەدا.

ـ زۆر کوڕێکی جوان و شیرینه.

ـ کەوایه له دیتینان پەشیمان نییت؟ پێت جوانن؟

کچی ژنیراڵ له خۆشیی ئەو تاریفانەی نۆخلیدۆڤ پیی وەعەرزی نەدەکەوت. نۆخلیدۆڤ له ناکاو ئەو دیمەنه تاڵ و دڵتەزێنەی وەبیر هاتەوه: زنجیر و سەری تاشراو و منداڵی پاڵ تەشته پیسییەکه، قەمچی و لێدان و دڵڕەقیی کاربەدەستان. کریلتسۆڤی وەبیر هاتەوه که له حاڵی ئاویلکەداندا بوو. کاتیۆشا و ڕابردووی ئەوی وەبیرهاتەوه و له دڵی خۆیدا گوتی بریا ژیان تەنیا دیوێکی هەبووایه و ئەویش جوانی و پاکی و بێگەردی بووایه؛ ئەو جوانی و پاکی و بێگەردییەش بۆ هەمووان بووایه.

دیسان تاریفی منداڵەکانی کرد و دایکیان یەک بە یەکی وشەکانی ئەوی بە دالغەی سپارد. کاتێک گەڕانەوە بۆ تەلارەکە، گەشتیاری ئینگلیزی چاوەڕوانی ئەو بوو کە پێکەوە بچن بۆ سەردانی بەندیخانە.

لە دەرەوە هەوا سارد و تاریک بوو. بەفرەلووکەیەکی ورد دەباری و گەردالێک کۆڵان و سەربانەکانی داپۆشیبوو، بە سەر قاڵدرمە و عارەبانە و یاڵوبژی ئەسپەکاندا دەباری. گەشتیاری ئینگلیزی تەنیا نەبوو، چەند هاوڕێی لەگەڵ بوو. ئەوان بە سواری فەتیوونێک دەهاتن و نۆخلیدۆڤ بە فەتیوونێکی دیکە بە دوای ئەواندا دەهات. بارگینەکان لەو بەفرەدا بە زەحمەت دەچوونە پێشێ. نۆخلیدۆڤ لە بیری ئەوەدا بوو ئەرکی ئینسانیی خۆی بەجێ بێنێ و تاڵی و نارەحەتییەکان قەبووڵ بکات.

# بیست و پێنج

بەفر سەپۆشێکی سپی و خاوێنی بە سەر هەموو شتێکدا کێشا بوو. سەربانەکان سپی بووبوون. بینای بەندیخانە لەو شەوە سارد و سەغلەتەدا شوومتر لە جاران دەهاتە بەر چاو. لە سەر دەرانەکە لەنتەرێکییان هەڵکرد بوو. شۆقی لەنتەرەکان لە پەنجێرەوە دەهاتە دەرێ و لە بەفرەکەی دەدا.

سەرۆکی سەختگیری بەندیخانە کاتێک مۆڵەتنامەکانی بە دەستی نۆخلیدۆڤ و گەشتیاری بەریتانیاییەوە دی، واقی وڕما. خۆی کۆ کردەوە و ڕێنوێنیی کردن بۆ نووسینگەکەی خۆی. لە سەر داوای نۆخلیدۆڤ، کەسێکی نارد بە دوای ماسلۆڤادا؛ خۆشی بەرەوڕووی گەشتیاری بەریتانیایی دانیشت و گوتی ئامادەیە وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە.

نۆخلیدۆڤ بووبە دیلمانجیان. گەشتیارەکە بە وردی پرسیاری دەکرد: ئەم بەندیخانەیە جێگای چەند کەسی هەیە؟ ئێستا چەند کەسی تێدا بەندکراوە؟ چەند پیاو؟ چەند ژن؟ چەند منداڵ؟ چەند کەسیان نەخۆش و چەند کەس لە کەسوکاری بەندییەکان لەگەڵ ئەوان دەژین؟

نۆخلیدۆڤ لە کاتی وەرگێڕانی ئەو بابەتانەدا زۆر شتی بۆ ڕوون بۆوە. شڵەژا بوو. هێشتا پرسیار و وەڵامەکان تەواو نەبووبوو کە ترپەی پێیەک هات. دەرگاکە کرایەوە. ماسلۆڤا بە لەچکە و جلوبەرگی بەندییەکانەوە لە پشت سەری پاسەوانەکە ڕاوەستا بوو. نۆخلیدۆڤ چاوی تێبڕیبوو. دەتگوت فکری ئەو دەخوێنێتەوە: «من، مرۆڤم، دەمهەوێ بژیم، مێردم هەبێ، منداڵم هەبێ و وەک هەموو مرۆڤە ئاساییەکان بژیم!»

لە جێی خۆی هەستا و ڕۆیشت. دەیویست لەو هەستەی ئاگادار بێ. ڕوانینی ئەو سارد و نەیارانە بوو. ڕەنگی هەڵبزرکابوو و بە دەستی لەچکەکەی ڕاستەوپاستە دەکرد.

ـ زانیوتە داخوازیی بەخشینەکەت قەبووڵ کراوە؟

ـ چەند ڕۆژی تر حوکمەکە دەردەکرێ و ئازاد دەبێ. ئەو کاتە چۆنت پێخۆش بوو بژی... دەبێ بڕیار بدەی کە...

کاتیۆشا پەڕییە نێو قسەکانی و گوتی:

ـ بڕیاری خۆم داوە؛ سیمۆنسۆن بۆ هەرجێیەک بچێ لەگەڵیدا دەچم.

سەرەڕای ئەوەی شڵەژا بوو، جوان و لە سەرەخۆ قسەی دەکرد.

ـ کەوایە لە سەر بڕیارەکەت سووری و دوودڵ نییت؟

ـ ئەگەر ئەو ڕازی بێ لەگەڵیدا دەچم و لێی دوور ناکەومەوە... زۆریش خۆشحاڵ دەبم.

نۆخلیدۆڤ بیری کردەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: «یان بەڕاستی سیمۆنسۆنی خۆشدەوێ و دەیهەوێ لەگەڵیدا بڕوا،یان بە پێچەوانە، لە ناخی دڵەوە منی خۆشدەوێ و بۆ ئەوەی باری ئەو دەروەست بوونە لە سەر شانم لابا، ئەو بڕیارەی داوە.» بە شەرمەوە لە کاتیۆشای پرسی:

ـ خۆشت دەوێ؟

ـ خۆشویستن و خۆش نەویستن بۆ من کۆن بووە؛ تەنیا ئەوەندە دەزانم مرۆڤێکی باشە.

ـ مرۆڤێکی باش و جێگای ڕێزە...بەڵام من...

کاتیۆشا دیسان پەڕییە نێو قسەکانی. دەیویست نۆخلیدۆڤ درێژدادڕی نەکات و شیر و ڕێویی بۆ نەهێنێتەوە.

ـ جەنابی دیمیتری ئیڤانۆڤیچ! بمبوورە کە بە پێی مەیلی تۆ ڕەفتار ناکەم؛ چارەنووسی من ئەوەیە. تۆش دەبێ دوای چارەنووسی خۆت بکەوی.

چاوە ڕەشەکانی وەکە هەمیشە شیرین خێلییەکەی پێوە دیار بوو. هێندە لە سەرەخۆ دەدوا، دەتگوت لەگەڵ خۆی قسە دەکا و قسەی دڵی خۆی دەدرکێنێ؛ بەڵام نۆخلیدۆڤ جۆرێکی تر بیری دەکردەوە. وێدەچوو بە داخەوە بێ کە کاتیۆشای لە دەست داوە.

ـ چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد.

ـ ئاوا؛ باشترە. لەمە بەدواوە بە ئاسوودەیی دەژیی و ئەوەندە خۆت ئازار نادەی. لەم ماوەیەدا زۆرت ئازار کێشا.

ـ هیچ ئازارێکم نەکێشاوە؛ لە ناخی دڵەوە ئاشقت بووم و لەگەڵتا بووم، ئێستاش حەز دەکەم درێژە بەو کارە بدەم.

ـ «ئێمە» دەبێ لە بیری ژیانی خۆماندا بین. «ئێمە» دەبێ لە سەر پێی خۆمان ڕاوەستین. لە ناخی دڵەوە سپاست دەکەم کە ئەو هەمووە خۆت ماندوو کرد و لە خەمی مندا بووی.

وشەی «ئێمە»ی جۆرێک دەردەبڕی کە کۆنت نۆخلیدۆڤ بە باشی تێی بگا. دیسان دەیویست قسە بکات بەڵام دڵی پڕ بوو و فرمێسک لە چاوانیدا قەتیس ما.

ـ کاتیۆشا! سپاسم لێ مەکە؛ چونکە ئێمە ئەو شتانەمان لە نێواندا نییە.

ـ خودا خۆی هەموو ئەوانە دەزانێ!

ـ تۆ ژنێکی باش و جیاوازی؟

گەشتیاری بریتانی دەنگی هەڵبڕی:

ـ are you ready؟[٩٣]

ـ Directly.[٩٤]

حاڵی کریلتسۆفی پرسی. ماسلۆڤا گوتی کاتێک گەیشتە ئێرە حاڵی هێندە خراپ بوو ڕفاندیان بۆ نەخۆشخانە. ڕێگەیان بە ماریا پاولۆڤناش نەدا بۆ پەرستاری لە لای بمێنێتەوە.

کاتیۆشا کە دیتی گەشتیاری بەریتانیایی چاوەڕوانی نۆخلیدۆڤە، خودا حافیزیی کرد.

ـ کاتیۆشا! من خودا حافیزی ناکەم؛ دیسان چاومان بە یەک دەکەوێ.

ماسلۆڤا لە ژێر لێوەوە منجاندی: بمبوورە!... پاشان لە دەرگاکە چووە دەرێ.

نۆخلیدۆڤ هەستی دەکرد ماسلۆڤا ئەوی خۆشی دەوێ بەڵام لە بەر بەختەوەریی ئەو ڕووی لە سیمۆنسۆن کردووە. دەنا لە ناخەوە ئەو لێک دابڕانە ئازاری دەدا.

---

93 ـ ئامادەی؟

94 ـ هەر ئێستا.

گەشتیاری بەریتانیایی لە دەفتەرەکەیدا شتێکی یادداشت دەکرد. نۆخلیدۆڤ بۆ ئەوەی نووسینەکەی لێ تێک نەدا. لە سەر کورسییەک دانیشت. هەستی بە شەکەتییەکی زۆر دەکرد. شەکەتییەکەی بە هۆی ئەو سەفەرە پڕ دەردەسەری و دووروودێژەوە نەبوو؛ لە هەموو شتێک بێزار بووبوو؛ لە ژیان ماندوو بووبوو. پاڵی بە کورسییەکەوە دا و چاوی قووچاند؛ دەتگوت خەوی مەرگ دایگرتووە.

سەرۆکی بەندیخانە بانگی کرد:

ـ هەموو شتێک ئامادەیە؛ با بچین سەردانی بەندیخانەکە بکەین.

گەشتیاری بەریتانیایی دەفتەری یادداشتەکەی لێک نا و بە دوای سەرۆکی بەندیخانەدا وەڕێ کەوت. نۆخلیدۆڤ کاس و وڕ و لەش داگیراو بە دوای ئەواندا ڕۆیشت.

# بیست و شەش

بۆگەنێکی پیس و پشوو بڕ داڵانەکانی بەندیخانەی داگرتبوو. دوو کەس لە پاڵ یەکدا ڕاوەستا بوون میزیان بە دیوارەکەدا دەکرد.

سەرۆکی بەندیخانە لە پێشەوە و گەشتیارەکە و نۆخلیدۆڤ بە دوایدا لە داڵانەکەوە تێپەڕین. گەیشتە یەکەم خەوگەی ئەو بەندییانەی سزای کاری قورسیان بۆ بڕابۆوە. حەفتا کەس لەو خەوگەیەدا لە سەر تەختێکی گەورەی چێوین لە پاڵ یەکدا خەوتبوون. هەر کە تەقەی دەرگاکە هات، لە جێی خۆیان هەستان و بە پێی فەرمانی سەرۆکی زیندان لە پەنا یەکدا ڕیزیان بەست. زڕەی زەنجیر ژوورەکەی داگرتبوو و سەرە تا شراوەکانیان لە ژێر شۆقی لەنتەرەکاندا بریقەیان دەهات. تەنیا دوو کەس لە جێی خۆیان هەڵنەستان؛

یەکیان پیر و ئەوی دیکەشیان گەنج بوو، هەر دووکیان تاویاوێکی قورس دایگرتبوون و وەک گڕی تەندوور دەسووتان.

گەشتیاری بەریتایی پرسی ئەو گەنجە لە کەنگێوە نەخۆشە؟ سەرۆکی بەندیخانە گوتی، لە بەیانییەوە. پیرەپیاو زگی دێشا و چونکە نەخۆشخانە جێی نەبوو، هەروا مابۆوە و هیچ کەس بۆی لە خەمدا نەبوو. گەشتیارەکە ناڕەحەت بوو و سەری ڕاوەشاند، داوای لە سەرۆکی بەندیخانە کرد ڕێگەی پێ بدا قسە بۆ بەندییەکان بکات و نۆخلیدۆڤ وەرگێڕێتەوە؛ چونکە بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی لەو چاوپێکەوتنانەدا بەندییەکان ڕێنوێنی و ئامۆژگاری بکات.

نۆخلیدۆڤ وتەکانی ئەوی بەم شێوەیە وەرگێڕایەوە کە مەسیح لە بیری ئەواندا بووە، خۆشی ویستوون و لە بەر ئەوان چۆتە سەر دار، ئەگەر ئەوان بڕوایان بە مەسیح و وتەکانی هەبێ، ڕزگار دەبن.

ـ پێیان بڵێ لەم کتێبەدا شتی وا نووسراوە کە بەکەڵکی هەمووان دێ و بۆ هەمووان سوودمەندە. پرسیشی چەند کەس خوێندەوارن؟ بیست کەس دەستیان بەرز کردەوە. گەشتیارەکە چەند بەرگ کتێبی چاخی نوێی دەرهێنا بیانداتێ؛ دەیان دەستی زبر و بە هێز بە نینۆخی چڵکن و ڕەشەوە هاتنە پێشی بۆ وەرگرتنی کتێبەکان. بوو بە پاڵەپەستۆ و خەریک بوون یەکتر بکەن بە ژێرەوە. گەشتیارەکە دوو کتێبی پێدان و چوو بۆ خەوگەیەکی تر، دیسان ئەو دیمەنە دووپات بۆوە. دیسان ئەو هەوا قورس و بۆگەنە و دیسان وێنەکانی مەسیح و مریەم کە بە دیواردا هەڵواسرابوون. دیسان تەشتی پڕ لە میز و پیسی کە لە لای دەستە چەپی خەوگەکە بوو، دیسان بەندییەکان لە خەو ڕاپەڕین و هەستان قیت ڕاوەستان. لەم خەوگەیەدا نەخۆشەکان سێ کەس بوون. دوو کەسیان هەستانە سەر قوون دانیشتن، بەڵام سێیەم کەس

تەنانەت نەیتوانی چاوی هەڵێنێ. گەشتیارەکە هێندێ قسەی کرد و نۆخلیدۆڤ وتەکانی وەرگێڕایەوە.

لە خەوگەی سێهەم دەنگی هەرا و قاڵمەقاڵم دەهات. بە فەرمانی سەرۆکی بەندیخانە هەموو بێدەنگ بوون و قیت ڕاوەستان، جگە لە دوو نەخۆش و ئەو دوو کەسەش کە بە قەستی کوشتن لە یەکتریان دەدا. یەکیان ڕیشی ڕەقیبەکەی گرتبوو دەیکێشا، ئەوی دیکەشیان چنگی لە قژی بەرانبەرەکەی گیر کرد بوو. سەرۆک چووە پێشێ و گوڕاندی بە سەریاندا. دەستیان لە سەر و ڕیشی یەکتر بەردا. یەکیان خوین بە دەم و لووتیدا دەهاتە خوارێ و بە سەر قۆڵی کراسەکەی دەیسڕی. سەرۆک بەر پرسی خەوگەی بانگ کرد. لاوێکی کەڵەگەت و قەویوقۆڵ هاتە پێشێ.

ـ گەورەم! هەرچی هەوڵمان دا نەمانتوانی لیکیان بکەینەوە.

سەرۆکی بەندیخانە نێو چاوانی تێک نا.

ـ خۆم چاریان دەکەم.

کابرای گەشتیار پرسی:

ـ What did they fight for؟[٩٥]

نۆخلیدۆڤ لە سەرۆکی بەندیخانەی پرسی هۆکاری شەڕەکەیان چییە؟

ــ یەکیان مەچەک پێچی ئەوی دیکەیانی دڕاندووە؛ لە سەر ئەوە چنگاوەشی یەکتر بوون.

کابرای گەشتیار داوای لە نۆخلیدۆڤ کرد وتەکانی بۆ بەندییەکان وەرگێڕێتەوە.

ـ چاو لەم ئینجیلە بکەن. ئەم کتێبە هەموو شتێکی تێدایە. ئێوە لە سەر مەچەک پێچێک شەڕ دەکەن؛ چنگاوەشی یەکتر دەبن و لە یەکتر دەدەن.

95 ـ بۆچی بەشەڕ هاتوون؟

دەزانن مەسیح لە بەر ئێوە چووە سەردار؟ چۆن بەرەڤانیی لە خۆی دەکرد؟ پێم بڵێن ئەگەر کەسێک زللەیەکی لەم لا ڕوومەتەت دا چی دەکەی؟

کەسێک بە تیتاڵییە وەگوتی:

ـ ئەگەر کەسێک بە زللە لێمان بدات سکاڵا لە دژی بەرز دەکەینەوە و سەرۆکی بەندیخانە فەرمان دەردەکا و سزای دەدا.

یەکێکی تر گوتی:

ـ ئەگەر کەسێک زللەمان لێدا، زللەیەکی وای لێدەدەینەوە دەمولووتی پڕ بێ لە خوێن و ئیتر نەوێرێ زللە لە هیچ کەس بدات.

هەموو پێکەنین و دیار بوو قسەکەی ئەویان بە دڵ بووە. نۆخلیدۆڤ هەمووی بۆ کابرای گەشتیار وەرگێڕایەوە.

ـ یاسای مەسیح ڕاست بە پێچەوانەیە؛ دەڵێ ئەگەر کەسێک زللەیەکی لەم لا ڕوومەتەت دا ئەو لایەی دیکەشی بۆ ڕاگرە با لێیدا!

خۆی وەک ئەکتەرێکی شانۆ یاساکەی مەسیحی پیشان بەندییەکان دا. گاڵتە و تیتاڵی دەستی پێکرد. هەر کەس شتێکی دەگوت.

ـ ئەی ئەگەر نا پیاویی کرد و زللەیەکی توندتری لێدای دەبێ چبکەی؟

ـ کوڕینە! وەرن با شەڕە زللە بکەین. کێ ئامادەیە من زللەیەکی لێدەم و ئەو لایەی دیکە ڕاگرێ بۆم؟

هەموو دایان لە قاقای پێکەنین. تەنانەت نەخۆشەکانیش کەوتنە پێکەنین و ئەو کەسەی لێدانی خواردبوو و خوێن بە دەمولووتیدا دەهاتە خوارێ پێدەکەنی. گەشتیارەکە بۆی ڕوون کردنەوە هەتا ئیمانیان نەبێ، زۆر شت لە بەر چاویان وەک تیتاڵ و گاڵتە دەنوێنی؛ بەڵام ئەگەر خاوەن ئیمان بن لە کاکڵ و جەوهەری ئەم دەستوورەی خوداوەند تێدەگەن. پاشان لە بەندییەکانی پرسی:

ـ مەشرووب دەخۆنەوە؟

ـ مەشرووبمان بۆ بێنە جا بزانە کێ دەتوانێ وەک ئێمە بیخواتەوە؟

دیسان گاڵتە و تیتاڵی دەستی پێکرد. خەوگەکەی دیکە چوار نەخۆشی لێبوو. گەشتیار پرسیی بۆ نەخۆشەکان لە شوێنێک کۆ ناکەنەوە؟ سەرۆکی بەندیخانە گوتی پێویست ناکا؛ ئەم نەخۆشییانە گیرۆ نین. پزشکیش بەردەوام دێ پشکنینیان بۆ دەکا. یەکێک لە بەندییەکان هاواری کرد:

ـ دوو حەوتووە کەپۆی قیتی دەکتۆرمان نەدیوە.

لە خەوگەیەکی تریش کابرای گەشتیار هێندێکی قسە کرد و دوو بەرگ کتێبی چاخی نویی دا بە بەندییەکان و چوو بۆ خەوگەیەکی تر دوای ئەویش خەوگەی شەشەم و حەوتەم و ...

چاوی بە هەوو بەندییەکانی سزادراو بە کاری دژوارە و بەندییە سیاسییەکان و دوورخراوەکان کەوت، تەنانەت ئەو بنەماڵانەش کە لەگەڵ بەندییەکانی خۆیان دەژیان. هەموو نەخۆش و برسی و داماو و بێ دەرەتان بوون. وەک ئاژەڵ و جرۆجانەوەر تێک هاڵا بوون و جمەیان دەهات.

کابرای گەشتیار ماندوو بووبوو. ئیتر توانایی نەمابوو. ئیتر نە ئینجیلی بە بەندییەکان دەدا و نە قسەی بۆ دەکردن. دەچوو بۆ هەر خەوگەیەک گوێی بۆ ڕوون کردنەوەکانی سەرۆک بەندیخانە ڕادەگرت. «All Right[٩٦]»ی دەگوت و دەهاتە دەرێ و نۆخلیدۆڤیش ئیتر تاقەتی نەمابوو. ئیتر نەیدەتوانی لەوە زیاتر چاو لە ڕوخساری زەرد و شەکەت و هیوابڕاوی بەندییەکان بکات.

96 ـ زۆر باشە.

# بیست و حەوت

لە یەکێک لە خەوگەکان نۆخلیدۆڤ چاوی بە پیرەپیاوێکی جل شڕ کەوت کە ئەو ڕۆژە لە نێو پاپۆڕەکەدا دیتبووی. کراسێکی درێژی خۆڵەمێشین و پانتۆڵێکی هەر لەو ڕەنگەی لە بەردا بوو. جلەکانی دڕابوون و لە زۆر شوێنەوە لەشی لاواز و چرچولۆچی بە دیارەوە بوو. بە پێخاوسی لە سەر عەرزی دانیشتبوو و بە وردی چاوی لە تازە هاتووەکان دەکرد. سەرۆکی بەندیخانە فەرمانی وریا بنی پێدان. هەموو لە جێی خۆیان ڕاپەڕین و بە ڕیز ڕاوەستان. پیرەپیاو گوێی پێ نەدا. سەرۆک نێوچاوانی گرژ کرد و گوڕاندی:

- هەستە، فەرمانی وریابن دراوە،گوێت لێ نییە؟

پیرەپیاوی جل شڕ پێکەنی و بە تەوسەوە گوتی:

- ئەوانە نۆکەری تۆن؛ خۆمن نۆکەری تۆنیم لە بەر دەمتا قیت ڕاوەستم. ئەو جێ داغە چییە بە تەوێڵتەوە، وادیارە داغی کۆیلەتییە...

سەرۆک نەیهێشت قسەکەی تەواو بکا. چووە پێشێ و هەڕەشەی لێکرد. نۆخلیدۆڤ بوو بە نێوبژاونیان و گوتی:

- من دەیناسم؛ بە چ تاوانێک بەند کراوە؟

بە تاوانی بەرەڵڵایی. سەد جارم بە پاسەوانەکانی شارەوانی گوتووە جێگا و ڕێگامان نییە، بەرەڵڵاکان مەنێرن بۆ ئێرە. بەڵام قسە بە گوێیاندا ناچێ.

پیرەپیاوی جل شڕ ڕووی لە نۆخلیدۆڤ کرد و گوتی:

ـ کەوایە تۆ لە پێڕەوانی جەجاڵی[٩٧] هاتووی بە دژی مەسیح بانگەشە بکەی؟ دیتووتە پێڕەوانی جەجاڵ چۆن خەڵکی ئازار دەدەن؟ دیتووتە چۆن مرۆڤەکانیان وەک بەراز کردۆتە ئەم قەفەسە تەنگ و تارەوە؟ مرۆڤ بۆ کار و زەحمەت هاتۆتە سەر دنیا. مرۆڤ دەبێ زەحمەت بکێشێ و بە نانی ڕەنجی شان و ئارەقەی نێو چاوانی خۆی بژی. ئەوانە خواردنی بەلاش دەدەن بە بەندییەکان و دەیانکەنە دەستتەخۆری خۆیان. ئێرە گەوڕی بەرازە.

کابرای گەشتیار گوێ قۆڵاخ ڕاوەستا بوو. نۆخلیدۆڤ بۆی باس کرد کە پیرە پیاو لە دەست سەرۆکی بەندیخانە سکاڵایەتی کە ئەم هەموو خەڵکەیان لەم ژوورە تەنگەبەرانە ترینجاندووە. گەشتیاری بەریتانیایی گوتی: لێی بپرسە ئەو کەسانەی یاسا پێشێل دەکەن دەبێ چییان لێ بکەن؟ پیرەپیاو هەر کە وشەی یاسای بیست، خۆی گرژ کرد و گوتی:

ـ یاسا! شتێکی قۆڕە. جەجاڵ و دارودەستەکەی هەمووی ڕادەماڵن، دارونەداریان بە تالان دەبەن، شەڕەف و ئابڕوو بۆ هیچ کەس ناهێڵنەوە و هەر کەس لە هەمبەریاندا ڕاوەستێ، بە ناوی یاسا قۆڵبەستی دەکەن و هەر بەڵایەکیان پێخۆشبێ بە سەری دێنن. یاسا تەنیا بۆ بەرژەوەندیی پێڕەوانی جەجاڵە و بەس.

نۆخلیدۆڤ ئەو قسانەی بۆ کابرای گەشتیار وەرگێڕایەوە. گەشتیار پێکەنی و دیسان گوتی لێی بپرسە دز و پیاوکوژەکان دەبێ چی لێبکەن؟ پیرەپیاوی جل شڕ لە وەڵامدا گوتی:

---

97. Antichrist مەسیحییەکان لە سەر ئەو باوەڕەن کە پێش دنیا ئاخر بوون و سەرهەڵدانەوەی مەسیح، بوونەوەرێکی کرێت دێ، بەدژی مەسیح و ئایینی خودا شەڕدەکات.

ـ پێی بڵێ داغی پێڕەوی کردن لە جەجەڵ لە سەر نێوچاوانی پاک بکاتەوە با تێبگا دز و پیاو کوژی ڕاستەقینە کێیە!

گەشتیار پێکەنی و گوتی:

ـ He is Crazy[٩٨].

پیرە پیاوی جل شڕ چاوی لە چاوی نۆخلیدۆڤ بڕی و گوتی:

ـ ئەرکی خۆت بەڕێوە بەرە، هەر کەس بەرپرسی کاری خۆیەتی؛ تەنیا خودا دەزانێ کێ تاوانبارە و کێ بێ تاوان! داوەری کاری ئێمە نییە.

نۆخلیدۆڤ گێژە و واق وڕماو ڕاوەستا بوو. پیرەپیاوی جل شڕ کە چاوی ئاوری ڕقی لێ دەبۆوە، دەنگی هەڵبڕی:

ـ بە چاوی خۆت دیتت ئەو جەجاڵانە چ بەڵایەکیان بە سەر ئەو خەڵکە داماوە هێنا. ئیتر بەسە؛ زووتر لێرە بڕۆ؛ لێرە دوورکەوەوە!

کابرای گەشتیار لەو سەری داڵانەکە ژوورێکی دی دەرگاکەی کرابۆوە و کەسی لێ نەبوو. چووە ژوورێ، لەنتەرێک بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوو. شۆقی لەنتەرەکە زۆر کز بوو. چەند کیسە لە سووچێک لە سەر یەک هەڵچندرابوون و لە سەر سەکۆیەکی پانیش چەند تەرم لەپاڵ یەکدا ڕاکێشرابوون. ئەوێ مردووخانە بوو. مردووی یەکەم کراسێکی کەتانی لە بەر دابوو. کەڵەگەت بوو سەری تاشراو و ڕیشی درێژ و نووک تیژ بوو. دەستی کە شین هەڵگەڕابوو، بە شێوەی حاچ لە سەر سینگی دایان نابوو. لە پاڵ ئەودا پیرێژنێک بە لاقی ڕووت و کراسی خۆڵەمێشینەوە ڕاکێشرا بوو. دەموچاوی زەردەڵ و پڕ لە چرچولۆچ بوو. نۆخلیدۆڤ کە نەختێ دوورتر ڕاوەستا بوو و چاوی لە تەرمەکان دەکرد. شتێکی ئاشنای بە تەرمی سێهەمەوە دی. چووە پێشێ و پەڕۆکەی لە سەر لادا. دەموچاوێکی سەر

---

98. ئەوە شێتە.

نجراکێشی هەبوو. دەمولووت باریک و نێوچاوانی سپی و قژی کەوتبووە سەر تەوێڵی؛ کریلتسۆڤ بوو. باوەڕی نەدەکرد. دوێنێ چەندە گەرموگوڕ و هیوادار قسەی دەکرد. دڵی پڕ بوو لە ئاوات و چەندەی ئازار دەکێشا. بەڵام ئێستا ئارام و بێدەنگ، چەندە جوان و خوێن شیرین بوو.

ئەمە کریلتسۆڤ بوو. هەموو بوونی ئەو تەرمێکی سر و بی گیان بوو. «ئەو هەموو ڕەنج و ئازارەی بۆ چی کێشا؟ بۆ چی هاتە سەر دنیا؟ بۆ چی ئاوا بە ئاسانی مرد؟» وەڵامی ئەم پرسیارانەی نەدەزانی. هەستی دەکرد جگە لە مەرگ هیچ شتێکی تر بوونی نییە. هەستی دەکرد خەریکە بکەوێ بە زەویدا.

لەگەڵ گەشتیارەکە قسەی نەکرد. بە سەرۆکی بەندیخانەی گوت کە حاڵی تێک چووە و پێویستی بە تەنیاییە. لە بەندیخانەکە هاتەدەرێ و بە پێیان ڕۆیشتەوە بۆ میوانخانە.

# بیست و هشت

نۆخلیدۆڤ خەوی لێ نەدەکەوت. ماوەیەک بە نێو ژوورەکەدا پیاسەی کرد. لە بیری ئەوەدابوو کە چیرۆکی ئەشقی ئەو و کاتیۆشا کۆتایی پێ هاتووە و ئیتر هیچ کارێکی لە دەست نایە. هەر بۆیە هەستی بە خەفەت و شەرمەزاری دەکرد. شتێکی دیکەش هەبوو ئازاری دەدا؛ ئەویش چیرۆکێک بوو کە کۆتایی پێ نەهاتبوو و ئارام و ئۆقرەی لێ هەڵگرتبوو.

ئەم چیرۆکە نێوەچڵە ڕەنجێک بوو کە لەم چەند مانگەدا کێشا بووی. لەم چەند مانگەدا ئەم هەموو بێبەشی و چارەڕەشییانەی خەڵکی دیبوو؛ ئەو هەموو زوڵم و زۆر و نادادپەروەرییانەی بە کۆشت و خوێن و ڕۆح هەست

پێکرد بوو. پیاوێکی ڕوحسووکی وەک کریلتسۆڤ و سەدان کەسی تر قوربانیی ئەو زوڵم زۆرانە بوون. لەو نێوەدا ئەو هیچی لە دەست نەدەهات و نەیدەتوانی ڕێزەیەک لەو چارەڕەشی و بەدبەختییانە کەم کاتەوە و پێش بەو دەزگای ستەمکارییە بگرێ.

لە دنیای خەیاڵی خۆیدا سەدان و هەزاران مرۆڤی تێک شکاو و سووکایەتی پێکراوی دەدی کە بوونەتە وەویلکەی دەستی ژنیراڵ و قازی و کاربەدەستان و سەرۆکی بەندیخانەکان. پیرەپیاوی جل شڕ هاتەوە بەر چاوی کە هەموو شتێکی ئەزموووبوو وداغی نەنگی بە نێوچاوانی سەرۆک و خاوەن پلەوپایەکانەوە دەنا و ڕاستییەکانی وەک ڕم دەکرد بە چاویاندا؛ کەچی هەمووان ئەویان بە شێت دەزانی. کریلتسۆڤی وەبیر هاتەوە کە تووڕە و دڵ پڕ لە ڕق دژ بە دەزگای زوڵم و زۆر ڕاپەڕیبوو. بەڵام ئێستا دڵە پڕ هیواکەی لە لێدان کەوتبوو و بەو دەموچاوە جوان و ناسکەوە لە نێوان تەرمەکانی دیکە دا بۆ هەمیشە چاوی لێک نابوو.

دیسان لە خۆی دەپرسی، یانی من شتێم کە هەموو ڕاستییەکان دەبینم و تێی دەگەم، یان ئەوان شێتن کە ئەم شتانە دەبینن و هەموو شتێک بە ڕەوا و مەنتقی دەزانن؟ ئەمجارەیان دەیویست هەر چۆنێکە وەڵامی ئەو پرسیارە بدۆزێتەوە.

لە پیاسە کردن بە نێو ژوورەکەدا ماندوو بوو. لە سەر کورسی سووچی ژوورەکە دانیشت. کتێبی ئینجیل کە گەشتیارەکە پێی دابوو لە سەر مێزەکە هەڵیگرت. «مەگین ناڵێن بۆ وەڵامی هەموو پرسیارێک نێو ئەو کتێبە ئاسمانییە بگەڕێن؟» بەو فکرەوە بێ ئیختیار کتێبەکەی لێک کردەوە. بەشی هەژدەهەمی ئینجیلی مەتا لە بەر چاوی بوو. ئایەتەکانی یەک بە یەک خوێندەوە:

1ـ لەو کاتەدا پێرەوانی مەسیح هاتنە پێشێ و لە خواوەندی ئاسمانیان پرسی: کێ لە هەمووان گەورەترە؟

2ـ عیسا منداڵێکی بانگ کرد بۆ نێو ئاپۆرەی خەڵکەکە و گوتی:

3ـ ڕاستییەکە بە ئێوە دەڵێم: هەتا ئەو کاتەی وەک منداڵێک پاک نەبنەوە، ڕێگاتان نییە بچنە ئاسمان.

4ـ هەر کەسێکیش وەک ئەو منداڵە خۆی بە چکۆلە بزانێ لە ئاسمان لە هەمووان گەورەترە.

ئەو ئایەتە ئەو بێبەش و لێقەوماوانەی وەبیر هێنایەوە کە لە بەندیخانە سووکایەتییان پێدەکرێ و ئازار دەکێشن، هەستیشی کرد هێندێک جار لە ماوەی تەمەنیدا بە خاکەڕایی و خۆبەکەم زانین توانیویەتی شادی و هێمنایەتی دەستەبەر بکات. دڵی ئارام بۆوە و ئایەتی دوایی خوێندەوە:

5ـ هەر کەس بەناوی منەوە منداڵێکی ئاوا قەبووڵ بکات، وەک ئەوە وایە منی قەبووڵ کردبێ.

6ـ هەر کەس ئەو منداڵانە ئازار بدات کە منیان خۆش دەوێ، وا باشە بەرداشێک بە ملیدا هەڵواسن و بیخەنە نێو دەریاوە.

وردتر بۆوە لە ئایەتەکە، بە بڕوای ئەو ڕستەیە «هەر کەس بەناوی منەوە منداڵێکی ئاوا قەبووڵ بکات» زۆری بەدڵ بوو. «بەناوی منەوە» ئەمە چ مانایەکی هەبوو؟ «بەرداشێک بە ملیدا هەڵواسن و بیخەنە نێو دەریاوە.» بە شتێکی ڕاست و دروستی نەدەزانی. لەو ڕستەیەدا هێندێ شتی ناتەکووز هەبوو. چەندین جار ئینجیلی خوێندبۆوە و هەموو جارێک ئەم شتە بێ مانا و ناتەکووزانە خەمبار و هیوا بڕاوی کردبوو. ئایەتەکانی حەوت و هەشت و نۆ و دە سەبارەت بە سزای ئەم دنیایەی کەسانێک بوو کە خەڵکی ئازار دەدەن و سزای ئەو دنیاشیان سووتانە لە ئاگری دۆزەخدا. باسی منداڵانێکیشی

دەکرد کە لەگەڵ فریشتەکان چاویان لە ئاسمان بڕیوە، بەڵام ئەم بابەتانەش ناتەکووزی دەنواند و عەیبێکیان هەبوو. پاشماوەی ئایەتەکانی خوێندەوە:

11ـ مرۆڤ بۆ ڕزگاریی ون بووەکان هاتۆتە سەرزەوی.

12ـ بیهێننە بەر چاوی خۆتان کەسێک سەد مەڕی هەیە و یەکیان بزر دەبێ. نەوەد و نۆ مەڕەکەی تر بە جیدێڵێ و بە دوای ئەو و بزر بووەدا شاخ و کێوەکان دەگەڕێ.

13ـ مەڕە بزر بووەکە دەهێنێتەوە بۆ نێو ڕانەکە و بۆ دۆزنیەوەی ئەو یەک سەرە، زیاتر لەو نەوەد و نۆ سەرەی تر شادی دەردەبڕێ.

14ـ خواوەندی ئێوەش کە لە ئاسمانەکانە، ڕێگە نادات یەکێک لە منداڵەکان بزر بێ.

نۆخلیدۆڤ لە بیری ئەوەدا بوو کە ون بوون و تووشی خراپە هاتنی خەڵک بە ویستی خواوەندە. کەوایە بۆ چی سەدان و هەزاران کەس تووشی نەهامەتی و ڕۆژە ڕەشی دەبن بەڵام ڕێگایەک بۆ ڕزگار بوونی ئەوان نییە؟

21ـ لەو کاتەدا پترس هاتە پێشێ و پرسی: ئەگەر کەسێک دەرهەق بە من ستەمێک بکات، شایانی ئەوەیە زیاتر لە حەوت جار لێی خۆش بم؟

22ـ عیسا فەرمووی: حەوت جار نا، زیاتر لە حەفتا جار، دەبێ لێی خۆش بی.

23ـ لێ خۆشبوونی خواوەند ئەو چیرۆکەت وەبیر دێنێتەوە کە پاشایەک فەرمانی دا بە سەر حیساب و پیتاکی ڕەعیەتەکانیدا ڕابگەن.

24ـ کاتی پێڕاگەیشتنی حیسابەکان، گەیشتنە کەسێک کە دەهەزار قەنتار[٩٩] قەرزدار بوو.

---

. 99 پێستی گا کە پڕ بێ لە ئاڵتوون." فرهەنگی موعین."

25ـ چـونکه هیچـی نەبـوو، پاشـا گـوتی دەبـێ ژن و منـداڵەکانی و دار و نەداری بفرۆشێ و قەرزەکەی بداتەوە.

26. ڕەعیەتەکە چۆکی دادا، سوژدەی برد و دەستی کرد بە گریـان. گوتی: خاوەن شکۆ! مسەبایەکم لێ بگرە هەتا پەیدای دەکەم.

27. پاشا بەزەیی پێیدا هات، هەمووی پێ بەخشی و ئازادی کرد.

28. لە ڕێگا تووشی یەکێک لە هاوگوندییەکان بوو کە شتێکی پێ قەرزدار بوو. بەرۆکی گرت و هەڵیپێچا بۆ قەرزەکەی.

29ــ کـابرا چـۆکی دادا، کڕنۆشـی بـۆ بـرد و داوای لێکـرد لە سـەری ڕاوەستی.

30. خاوەن قەرز لە سەری ڕانەوەستا و خستیە بەندیخانە.

31. هاوڕێکانی ئاگادار بوون و دڵیان پێی سووتا، هەواڵەکەیان برد بۆ پاشا.

32. پاشا بانگی کرد و فەرمووی: ئەی ماریزی زۆردار! لە بەردەمی مندا پاڕایەوە و من بە زەییم پێتدا هات.

33ــ تـۆش دەبـوو ئەو کـارەت بکـردایە و بەزەییـت بە هاوگوندییەکتـدا بهاتبایە و ئازادت کردایە.

نۆخلیـدۆڤ وەک ئەوەی لە نـاخی گیـانییەوە دەنگێکـی بیسـتبێ «ئەمە وەڵامـی هەمـوو پرسـیارەکانە!» شـتێکی نـوێ لەودا سـەری هەڵدابوو. بەرەو شـتێکی نـوێ هەنگاوی دەنـا. بەرەو دنیـای واتـایی و ڕۆحـانی دەڕۆیشـت. ئەو قسانەی کە هەتا ئەو کاتە لەبەر چاوی دژواز و نـامۆ بوون و تەنـانەت وەک قەشمەریش چاوی لێدەکردن، بە ئاسانی لە دڵی نیشت و لە نێوان ئەواندا لە ڕاستییەکان دەگەڕا. دەتگوت دەرمانی هەموو ئازارەکانی مرۆڤی دۆزیوەتەوە: مـرۆڤ دەبێ لە هەمـبەر خواوەنـدا خـۆی بە تاوانبـار بزانـێ و ئەم ڕاسـتییە

قەبووڵ بکات کە مرۆڤی تاوانبار ناتوانێ خەڵکی ڕێنوێنی بکات و چاکسازیی لە دەست نایە. نۆخلیدۆڤ بۆی دەرکەوت کە ئەو کاربەدەستە دڵڕەقانە لە قازییەکانەوە بگرە هەتا پاسەوانی بەندیخانە فکرێکی نەگۆڕ و مەحاڵ لە مێشکیاندا بوو؛ دەیانویست بە سزادان خەڵکی بێننە سەر ڕێ و چاکسازیی کۆمەڵگا بکەن و خراپەکارییکان لە سەر لاپەڕەی وجوودیان بسڕنەوە. مرۆڤێکی نوقمی تاوان و خراپەکاری چۆن دەتوانێ خەڵکی تر بەرە و ڕێگای ڕاست ڕێنوێنی بکات؟ چۆن دەکرێ بە سزادانی جەستە و ڕۆح،کەسێک بگۆڕی؟ تاقمێک مرۆڤی ئاتاج و بە تەماح، قەمچیی سزادانیان بە دەستەوە گرتووە؛ لە حاڵێکدا خۆیان هەتا بینەقاقا بە زەلکاوی خراپەکاری و نەگریسییەکاندا ڕۆچوون.

لەو ئایەتانەدا وەڵامی زۆربەی پرسیارەکانی دۆزیبۆوە. بە تایبەت لەو جێیەدا کە مەسیح بە پترسی فەرموو:

«نەک حەوت جار، بەڵکوو زیاتر لە حەفتا جار دەبی لێی خۆشبی.»
مەسیح دەیزانی مرۆڤی بێ تاوان لە جیهاندا نییە و تاوانبار مافی ئەوەی نییە بە قەستی چاکسازی خەڵکی سزا بدات.

بابەتێکی زۆر ساکار و سەرسووڕهێنەر بوو! نۆخلیدۆڤ هەتا ئەم کاتە پێی وابوو هێندێک لە سزادانەکان پێویست و بە کەڵکن و ئێستا بانگێکی ئاسمانیی لە ئینجیلەوە دەبیست و تێدەگەیشت کە ڕێگای ڕزگاریی مرۆڤ لە لێبوردن و دڵسۆزی و خۆشەویستیدایە. بەڵام دەکرێ خراپکاران سزا نەدرێن و ئازادیان بکەن؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ڕوون بوو. چەندین سەدە بوو خراپکارانیان سزا دەدا و ئەم سزادانانە هیچ کاریگەرییەکی نەبوو؛ ڕادەی تاوانەکانی کەم نەکردبۆوە و خراپکارانی نەهێنا بووە سەر ڕێگای ڕاست. بەڵکوو بە پێچەوانە خراپکاران خوویان بە زەبوونی و گوشار و ئازار گرتبوو

و ساڵ لە دوای ساڵ زیاتر دەبوون و دەزگای داد پەرەی دەگرت و قازی و لێکۆڵەر و دادیار و زیندنەوانیش زیاتر دەبوون. کەوایە باشتر نەبوو دەست لەو کارە بێهوودە و بێ بەزەییانە و نامرۆڤانەیە هەڵگرن؟ ئەگەر سەرەڕای ئەم هەموو خەتا و تاوان و گەندەڵییە، کۆمەڵگای مرۆڤ و سیستەمی کۆمەڵایەتی لە بەر یەک هەڵنەوەشاوە، بە هۆی مەحکووم کردن و سزادانی تاوانبارانەوە نییە، بەڵکوو هۆکارەکەی ئەوەیە هێشتا ڕێزەیەک بەزەیی و خۆشەویستی لە دڵی مرۆڤەکاندا ماوە.

بەو هیوایەی ئینجیل زیاتر ڕێ خۆشکەر بێ بۆی، سەر لە نوێ کتێبەکەی خوێندەوە و گەیشتە مەوعیزەی کوێستان. هەر کاتێک ئەو بەشەی دەخوێندەوە، دەشڵەژا و جوانیی کەلام و مانا گشتییەکانی شوێنێکی شاعیرانەی لە سەر ڕۆحی دادەنا، بەڵام ئەمجارەیان زیاتر لێی ورد بۆوە و لە نێوان ئەو هەموو خاڵە جوان و مانا گشتییانەدا، دەستووورە پێنجینەکانی دۆزییەوە کە دەیتوانی ڕێنمای کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بێ. پێشتر هەر کاتێک ئەو بەشەی دەخوێندەوە، پێی وابوو بەڕێوەبردنی ئەو دەستوورانە لە توانای هیچ مرۆڤێکدا نییە؛ بەڵام ئێستا بە پێچەوانە دەیدی ئەو دەستوورانە زۆر سانا و ڕوون و ساکارن و لە توانایدا هەیە و پیڕەوی کردن لەوان خراپەکاری و نەگریسییەکان لە سەر نێو چاوانی کۆمەڵگا دەسڕێتەوە و مرۆڤ بە پلەیەک دەگەیێنێ کە شایانی خۆیەتی.

دەستووورە پێنجینەکان بەم شێوەیە بوون:

1ـ (ئینجیلی مەتا ئایەتەکانی 21 تا 26) مرۆڤ نابێ مرۆڤ بکووژێ، ئازاری بدا یان سووکایەتیی پێ بکات و ئەو بە بەندە و کۆیلەی خۆی بزانێ. ئەگەر لەگەڵ کەسێک تووشی شەڕ و دەمەقاڵێ بووی، بەر لەوەی

بەرانبەرەکەت نوێژ دابەستێ و لەگەڵ خودای خۆی ڕاز و نیاز بکات، دەبێ لەگەڵی ئاشت ببیەوە.

2. (ئینجیلی مەتا ئایەتی 27 تا 32) نابێ خۆی بداتە دەست هەوەس و تەنانەت دەبێ لە جوانیی ژنان پاریز بکات، ئەگەر لەگەڵ ژنێکیش ژیانی هاوبەشی پێک هێنا، نابێ خیانەتی پێ بکات.

3. (ئینجیلی مەتا ئایەتی 33 تا 37) نابێ بەدرۆ سوێند بخوات و بەڵێنی درۆ بە کەسێک بدات.

4. (ئینجیلی مەتا ئایەتی 38 تا 42) لەگەڵ ئەوەشدا کە قیساس تۆڵە بە تۆڵەیە، ئەگەر کەسێک زللەیەکی لە ڕوومەتی چەپت دا ڕوومەتی ڕاستەشت بەرە پێشێ با لێیبدا. لە خەڵکی خۆش بە، سووکایەتی تامڵ بکەو هەژار و نیازمەندان ناهومێدمەکە.

5ـ (ئینجیلی مەتا ئایەتی 43 تا 48) بوغزلەزگ مەبن، خۆلە شەڕ و تکهەڵچوون بپارێزن. مرۆڤدۆست بن. یارمەتیی خەڵکی بدەن و خزمەتیان پێبکەن.

نۆخلیدۆڤ گرِی لەنتەرەکەی داکێشا و بێ جووڵە دانیشت. هێنایە بەر چاوی خۆی ئەگەر مرۆڤ پیرەوی لەو وتانە بکات، چ پلەوپایەیەکی بەرزی دەبێ. ڕۆحی لێوڕێژ دەبێ لە شادی. دوای هەموو خەم و ئازار و دڵتەنگییەکانی لە ناکاو هەست بە شادی و هێمنایەتی دەکا.

ئەو شەوە هەتا بەیانی بەخەبەر ما. دەتگوت بۆ یەکەم جارە ئینجیل دەخوێنێتەوە. هەر خوێندییەوە و خوێندییەوە و مانای تازەی لەو وشانە هەڵدەکراند کە چەندین جار خوێندبوویەوە. وەک سونگەر خاڵە سوودمەند و ڕەسەن و شادهێنەرەکانی ئەو کتێبەی بە ڕۆح و گیان هەڵدەمژی. ئەوەی دەیخوێندەوە لەگەڵ ڕۆحی ئاشنا بوو. ئەوەی ساڵانێکی زۆر بوو بیری

لێدەکردەوە و ساڵانێکی زۆر بوو لە قووڵایی ڕۆح و ویژدانیدا بوو و ئاگای لێی نەبوو، لەو کتێبەدا دەیدۆزییەوە.

هەستی دەکرد ئەگەر کەسێک پێڕەوەی لەم دەستوورانە بکات، بەو پلە و پێگەیە دەگات کە شایانی خۆیەتی و دەستی بە بەختەوەری هەتا هەتایی ڕادەگا. بە بڕوای ئەو ئەگەر کەسێک پێڕەوی ئەو بیروباوەڕە بێ، تاوانێک ئەنجام نادا کە شیاوی سزادان بێ و دەستی بە کاکڵ و ناوەڕۆکی ئامۆژگارییەکانی مەسیح ڕاگەیشتووە. لە چیرۆکی میوەڕنەکانی باخدا، ڕاستییەکی ئاڵۆز بە زمانی ساکار بەیان کرابوو. کەسێک باخێکی پڕ لە میوەی بوو. تاقمێکی بە کرێ گرت باخەکەی بۆ بڕنن. کرێکارەکان بە جێی ئەوەی لە بیری ئەرکی خۆیاندا بن، میوەکانیان خوارد و باخەکەیان پێپەست کرد و ئەو ڕۆژەیان بە شادی و قەشمەری ڕابوارد، وەک ئەوەی بۆ گەشت و ڕابواردن هاتبێتن و ئەوەی بیریان لێ نەکردەوە ئەنجام دانی ئەرکەکەی خۆیان بوو. بە بڕوای نۆخلیدۆڤ، ئێمەشیان هێناوە بۆ باخی ژیان کە کارێک بکەین و بەهرەی لێ وەرگرین، بەڵام ئێمە بە جێی ئەوەی لە بیری ئەرکی خۆماندا بین، خەریکی پێشێل کردنی ژیان و تەمەنی خۆمانین و جگە لە هەوەس و ڕابواردن بیر لە هیچ شتێکی تر ناکەینەوە؛ لە حاڵێکدا دەستێکی بەهێز ئێمەی ناردووە بۆ ئەو باخە و لێمانی دەوێ پێڕەوی لە دەستووری پێنجینە بکەین تا خواوەند فریشتەی ئاسمانەکان بنێرێ بۆ سەر زەوی و ئێمە بەرز بکەنەوە بۆ تەشقی بەختەوەری. دەبێ بە دوای ڕاستی خواوەندی ئاسمانەکاندا بگەڕێین بۆ ئەوەی بەرەکەتی خوداوەند بە سەرماندا بڕژێ و تامی بەختەوەری بچێژین. ئێمە بێ ئەوەی پێڕەوی لە ویستی ئەو بکەین، بە دوای بەختەوەریدا دەگەڕێین و نایدۆزینەوە.

ئەو شەوە بۆ نۆخلیدۆڤ لە دایکبوونێکی تر بوو. پەسڵان بوو، پەسڵانێکی ڕۆحی. دوای ئەوە ڕێگای ژیانی نەگۆڕی بەڵام بە چاوێکی تازە لە دنیای دەڕوانی. داهاتوو نیشانی دەدا ئاکامی دەورانی ژیانی نوێی چۆن دەبێ.

(تەواو)

سەرچاوە: ڕستاخیز، تۆلستۆی، ترجمەی: محمد مجلسی، نشر دنیای نو، چاپ ششم 1389 تهران.

## فەرهەنگۆک

ئاپۆر: بەڵا، پەتا.

ئاتەگ: شاقەل، داوێنی کەوای شۆڕ.

ئالینک: باداک، جلە، گیایەکە لە دار دەهاڵێ. (پیچک)

ئارمووش: هەورێشم، ئاورێشم.

ئۆناق: گەروو گیران بە هۆی گریان و دڵ پڕ بوونەوە. (بغض)

بابەخێو: پیاوێک بەخێوکردن و سەرپەرەستیی منداڵێک دەگرێتە ئەستۆ. (پدر خوانده)

بنگەڕ: مێرگ و چیمەنی قاراغ چۆم.

بنەوەشی: جیددی.

بۆرەکە: بۆرەپیاو، خوێری. (مردک)

بووکەڵە: بووکۆکە، وەویلکە، بووکە شووشە، بووکەباخە. (عروسک)

بەرەڤانی: بەرگری، بەرخودان. (دفاع)

بەڕیدە: ئاوارە، دەربەدەر. (سرگردان)

بەستۆکە: لەشفرۆش، سەڵیتە. (روسپی)

بەستۆکەخانە: خانەی لەشفرۆشان، قەحبەخانە.

بەلەکپێچ: پووزەوانە، پووزلووخ. (ساقبند)

بەلەمرک: هەنیشک، ئانیشک. (آرنج)

بیور: تەور. (تبر)

پۆپەشمین: تۆڕێک کە بە بەنی ڕەنگاوڕەنگ گوڵی لەسەر دەچنن و وەک جاجم بە سەر لێفە و نوێنیدا دەدەن.

پۆتر: سپیاو، دەرمانی دەموچاو سپی کردنەوە. (کرم)

پەرجۆ: موعجیزە. (معجزە)

پەنەمیو: ماسیو، هەستاو.

پێسیر: یەخە، بەرۆک.

پێشکە: مێشوولە، تۆفانە، موغموغە، مێشەکوێرە. (پشە)

پێگۆڕکە: شوێنی وەرسووڕانەوە لە قالْدرمەدا. (پاگرد)

تۆفانە: مێشوولە، پێشکە، موغموغە، مێشەکوێرە. (پشە)

تەشق: حەوێق، بەرزایی ئاسمان، پەڕپەڕۆچکە. (اوج)

تەوسەبزە: بزەی بە تەشەرەوە. (پوزخند)

تەنەوەکردن: ڕەنگدانەوە. تەنینەوە. (سرایت)

تەیمان: پەرژین، تانۆک. (پرچین)

جانکوش: مجێوری کلیسا.

چزەبزە: بزەی بە ڕقەوە. (نیشخند)

چکووس: ڕژد، سەقیل، مست قووچاو. (خسیس)

چەنەوێرغە: بریتی لە زۆربلێ. چەنەوەر، دەمەوەر.

خاپینۆک: هەڵخەڵەتێنەر، فریودەر.

خانۆک: خانەی لەش. (سلول، یاختە)

خاوبەستن: فریودان، هەڵخەڵەتاندن.

دڵدڵێنە: حەزلێکردوویی، ئەشقێنی، ئەشقبازی.

دایکەخێو: ژنێک بەخێوکردن و سەرپەرەستیی منداڵێک دەگرێتە ئەستۆ. (مادر خواندە)

داوەڵ: ئەو لقە گەنمەی بە پێوە لە دوای دروێنەوان بەجێ دەمێنێ.

دێمۆدە: (مبتذل)

ڕمموودە: خووپێگرتوو، ئالوودە. (آلودە، معتاد)

ڕۆح زل: بەدەهەند، خۆ بەزل زان.

زگهانک: زگ زل، ورگن.

سایلۆح: ساویلکە، گەمژە.

سایەقورس: بریتی لە کەسی توورە و بەسام و مرچومۆن.

سمنج: منجر، پێ چەقێن، خیشەسەر. (سمج)

سونگەر: هەور. (اسفنج)

سەرانشۆ: شوردنی منداڵ بە ئاوی پیرۆز، یەکێک لە نەریتەکانی پەیڕەوانی مەسیح. (غسل تعمید)

سەقاملووس: ڕەش بوونەوە، مەرگی بەشێک لە شانەکانی لەش بە هۆی پێنەگەیشتنی خوێن، کوتران یان چڵک کردن. (قانقاریا)

سێوک: ئێسکی قوتی بەر ملی پیاوان، گوێزە،کەڵبابە. (سیب آدم)

شارۆ: پێداچوونەوە، چاوپێدا خشاندنەوەی دووبار. (تجدید نظر)

فڕووج: کەڵەشێری باڕ، کەڵەبابی یەک ساڵە.

فحێل: بەخشین و تۆمەت لە سەر هەڵگرتن. (تبرئە)

قورساخ: بە وێقار. (مەتین)

قەتحە: قابی وێنە. (قاب عکس)

قەمارە: کووپەی شەمەندەفەر. (کوپە)

کاسکێت: کڵاو پاساری، کڵاوی شەپقەدار.

کاشە: خێشکی سەر بەفر کە سەگ و بارگین ڕایدەکێشن. (سورتمە)

کلکەتەشی: کەوچکەقوڵە،سەرەمێکوتە،بەچکەبۆقی دەست وپێ دەرنەهاتوو.

کولۆش: گەنم و جۆی دووراوەی گێرە نەکراو.
کۆلاس: چەخماخی تفەنگ. (گلنگدن)
کۆماج: سۆبای دیواری، بوغاری. (شومینە)
کوودەڵە: بەچکەی بەراز.
کەچەڵەبوون: وەرینی تووکەمردارە و پەڕوپۆ دەرکردنی باڵندە.
کەرکە: عەبای بێ قۆڵ بە سەر شانیدا دەدەن.
کەلبەدوون: زەڕیدۆزیی پەراوێز و ملیوانەی عەبا و کەرکەی پاشا و شێخ و خانەدانەکەن. (گلابتون)
کەمدوو: نەدوێن، کەم قسە.
گولدووزام: گول. (جزامی)
گوێزە: سێوک، ئێسکی قوتی بەر ملی پیاوان، کەڵبابە. (سیب آدم)
گەمار: پیس، چەپەڵ.
لالی کردن: خەوتن بە زمانی منداڵانە.
لۆزەندەر: زەبەلاح، فیلەتەن، حەیتە. (لندهور)
لووساوک: پلووسک. (ناودان)
ماچڵەکچی: مەقەستچی، فەرمانبەری هێڵاسن. (سوزنبان)
ماریز: مارز، زاڵم، دیکتاتۆر.
مافوورە: ڕاخەر، بەڕە.
مرێس: ڕێکوپێک، تەکووز.
مژوایایش: لێدوان، وتاردان. (سخنرانی)
مسەبا: سەبر، لەسەر ڕاوەستان، «جارێ مسەبایەکم لێ بگرە.»
نەمرچ: مڕومۆچ، خوێنتاڵ، ڕەزاگران.
ناوە: تەشتی قورکێشان، ئەستەمبوڵی.

ناهیر: گەوج، هەپلەگون، گەلحۆ، گەمشۆ.

ورویـرکە: خزمەتکـاری گورجوگـۆڵ و ڕۆحسـووک. فەرمـانبەری وریـا و چوختی. (وردست)

وەویلکە: بووکە شووشە، بووکەڵە.

هەستەدەمار: عەسەب.

هەڤیازی: جۆکەر. (امتیاز)

هێلینگە: داشقە، گالیسکە.

یەکهاوی: یەکڕەواڵ، ڕێکوپێک، تەکووز. (هماهنگ)

## بەرهەمەکانی ئەمین گەردیگلانی

1) **تـاپۆی وەرزێکـی سـەوز**، کۆمەڵەشـیعر، چاپخـانەی شـوعاع تەورێـز، 1997

2) **شەوەژانی ئەستێرەیەک**، کۆمەڵەشیعر۔ تاران، نشر عابد، 2000

3) **مەرگەخەون**، کۆمەڵەشیعر، تاران، نشر پیام امروز، 2003

4) **دیسان لەو شەقامانەوە**، کۆمەڵە چیرۆکی بیژەنی نەجدی، وەرگێڕان، ئاراس، 2005

5) **تەپڵی ئاور**، کۆمەڵە چیرۆکی بیانی، وەرگێڕان، ئاراس، 2005

6) **جێگای بەتاڵی سلووچ**، ڕۆمان، مەحموودی دەوڵەتئابادی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر 2006

7) **خـۆر و لاولاو**، کـۆمەڵە شـیعری منـداڵان، بۆکـان، چاپخـانەی داهـاتوو 2007

8) **یەکگرتن**، چیرۆکـی منـداڵان، قودسـی قـازی نـوور، وەرگێـڕان، ئـاراس، 2007

9) **برایـانی کارامـازۆف**، ڕۆمـان، فیـۆدۆر دۆستۆیۆفسـکی، وەرگێـڕان، موکریانی، هەولێر 2007

10) **خولیای نووسین**، کۆمەڵە وتار۔ ڕەزا بەراهەنی، وەرگێڕان. موکریانی، هەولێر 2008

11) **فەرهەنگی ڕێژگە** (ئەو وشانەی لە هەنبانە بۆرینەدا نەهاتوون)، موکریانی هەولێر 2009

12) **کەڵەشێری ورگن**، چیرۆکی منداڵان، فۆلکلۆر؛ نووسینەوە، بۆکان، ئیزیرتوو، 2009

13) **تازیەبارانی بەیەل**، ڕۆمانی غوڵامحوسێن ساعیدی، وەرگێڕان، موکریانی 2011 هەولێر

14) **مەرگی ئیڤان**، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر 2011

15) **دار وپەپوولە و ڕووبار**، چیرۆکی منداڵان، فەریدە شەبانفەر—وەرگێڕان، 2011

16) **دیلی قەفقاز**، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر 2011

17) **باوکە سێرگی**، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر 2011

18) **ئاغا و نۆکەر**، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر 2011

19) **هاوسەرگیری بەختەوەرانە**، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕان، هەولێر، خانەی کتێبی ئاوێر 2012

20) **نارنجی فڕین**، کۆچیرۆک، وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، 2012

21) **ئانا کارنینا**، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، 2012 هەولێر

22)**سترانی شەپۆلەکان**، شێعری هاوچەرخی فارس، وەرگێڕان. یەکیەتیی نووسەران مەڵبەندی گشتی، هەولێر2012

23) **شنەی پشکووتن**، دیوانی شیعر ناوەندی بڵاوکردنەوەی کۆڵەپشتی، تاران 2013

**ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:**

1) **کازاخەکان**، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان

2) **ڕێگایەک بەرەو هەتاو**، کۆمەڵەچیرۆک، وەرگێڕان

3) **شارەزاییە بنەڕەتییەکانی ژیان**، دووروتی ڕیچ، وەرگێڕان

4) **حاجی موراد**، ڕۆمان، لیۆ تولستوی، وەرگێڕان

5) **شەیتان**، ڕۆمان، لیۆ تولستوی، وەرگێڕان

6) **سۆناتی کرۆتیزێر**، ڕۆمان، لیۆ تولستوی، وەرگێڕان

7) **پۆلیکۆشکا**، ڕۆمان، لیۆ تولستوی، وەرگێڕان